# تەیمووری لەنگ

## وێرانکەری جیهان و ئەتککەری کیژان



نووسینی

کوثبرن ئونیل

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە

شێخ عەلی شێخ محەمەدی بەنا

زۆردارانی مێژوو

# تەیمووری لەنگ

## وێرانکەری جیهان و ئەتککەری کیژان

نووسینی

کوثبرن ئونیل

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە بۆ کوردی

شێخ عەلی شێخ محەمەدی بەننا

سلێمانی ٢٠٠٥

زنجیرەی کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
کتێبی سەردەم ژمارە (٢٩٤)

سەرپەرشتیاری گشتیی زنجیرە
ئازاد بەرزنجی

تەیموری لەنگ
بابەت: یادەوەری
نووسینی: کوثبرن ئونیل
وەرگێرانی: شێخ عەلی شێخ محەممەدی بەننا
بەڕێوەبەری هونەری: شیروان تۆفیق
مۆنتاژی کۆمپیوتەر: سەیران عەبدولڕەحمان
هەڵەچنی: مهاباد رەحیم فەرەج
سەرپەرشتیاری چاپ: فەرهاد رەفیق
تیراژ: ١٠٠٠دانە
ژمارەی سپاردن: ١١١٣ی ٢٠٠٤


www.sardam.info

## بە ناوی خوای گەورە و میهرەبان

### پێشەکی:

خوێندەواری بەڕێز ئەم (یادەوەری)انەی وا لەبەردەستایە، بە ناوی "تەیمووری لەنگ"ەوە ڕاستە و ڕوویداوە و کارێکی مێژووییە و قارەمانەکانی هەموو زیندوون و دروستکراوی بیر و ئەندێشە و ئەفسانە نییە، بەڵکو کەسانێکن هەریەکە لە زەمەن و کاتی خۆیدا ژیاون سەبارەت بە ئێمەی کورد زمانەوە ناوەکانیشیان ناوێکی نامۆ و گران نییە. بەڵکو ئەو ناوانە زۆر زۆرن و لەناو ئێمەدا باون.

بەڕێزان، بۆ وەرگێڕانی ئەم داستانە زۆر خۆم پێوە ماندوو کردووە و سەرپێییانە وەرم نەگێڕاوەتە سەر زمانەکەی خۆمان زیاد لە دوو ساڵی تەواو پێوەی ماندووبووم و هەتا توانیبێتم بە دەستپاکییەوە، وەکو دەقی عەرەبییەکەی و بگرە باشتریش وەرمگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی‌و چۆن لەگەڵ شێواز و ئاخاوتنی زمانەکەماندا گونجاو بێت، بەو شێوەیە وەرمگێڕاوە و ناپاکیشم لەگەڵدا نەکردووە. زۆر بە وردی نە بۆم زیاد کردووە. نە لێشم کەمکردۆتەوە و تا توانیبێتم وشەو ڕستەی گونجاوم بۆ بەکارهێناوە. زۆر گەڕام بە دوای ژیانی نووسەری ئەم کتێبە -کوثبرن نونیل-ە و پرسم بە زۆر نووسەر و شارەزای کوردی کرد. بە داخەوە کەس هیچی دەربارەی نەزانی و پەرتووکە عەرەبییەکەش هیچ پێشەکی و ڕوونکردنەوەیەکی تیا نەنووسیبوو، لەوە زیاتر کە لەسەر بەرگی پەڕاوەکە نووسیبووی.

بەڵام کاتی خۆی لە نووسراوێکدا خوێندمەوە، دەڵێت نووسەری ئەم یادەوەرییەی -تەیمووری لەنگ- ماوەی بیست ساڵی تەواو بە دوای سەرچاوەدا گەڕاوە تا توانیویەتی بەم شێوە جوان و سەرنجڕاکێشە ئەم کتێبەی لەسەر بنووسێت. بەڵام بەداخەوە چەند گەڕام بە دوای ئەو نووسراوەی ئەوەشی نووسیبوو، لێم ونبوو، بۆم نەدۆزرایەوە.

خوێنەری بەڕێز، -تەیمووری لەنگ- کەسێك نییە کە ئێمە ناویمان نەبیستبێت و شتێکی تازە بێت لامان. بەڵکو لە دێرزەمانەوە لە باووباپیرانمانەوە ناویمان بیستووە و باسی نازایەتی ئەویان بۆ گێڕاوینەتەوە.

بەڵام تاكو ئێستا بە نووسراو لەناو پەڕتووكخانەی كوردیدا هیچ شتێكی وای لەسەر نەنووسراوە و پەڕتووكی لەم جۆرەشمان هەر نییە و دەگمەنە. ئەمە زیاتر پاڵی پێوەنام ئەم كتێبە وەربگێڕمە سەر زمانی كوردی. لە خوای گەورە داواكارم توانیبێتم كەمێك خزمەتی زمانی كوردیم پێكردبێت و كەلێنێكم پێگرتبێت. وەك لە نووسینەكەدا دەردەكەوێت كە بە ناوی خۆیەوە نووسراوە و خۆی وەك بیرەوەرییەك بۆ -ئەلمەهدی- كوڕی خۆی دەگێڕێتەوە و ئەویش دەینووسێتەوە.

دەڵێت لە ساڵی ٧٥٥ی كۆچیدا تەمەنم نۆزدە ساڵان بووە. واتە لە ساڵی ٧٣٦ی كۆچیدا لەدایك بووە.

تەیموور مرۆڤێكی موسڵمان بووە و ماوەی دوو ساڵی تەواو لەژێر دەستی ئیمام زەینەدیندا خوێندوویەتی و دەڵێت من لەسەر شارێگەی ڕاست ڕۆیشتووم. واتە خۆی بە موسڵمان زانیوە. گەرچی هەندێ جاریش لەسەر ئەو ڕێگە ڕاستە لادەدات و كردەوەی نابەجێ دەكات.

تەیموور لە مەیدانی شیربازی و تیرهاویشتندا یەكە سواری زەمانی خۆی بووە و ئەم شیربازیو تیرهاویشتنەشی لەژێر دەستی سوارچاكێكی ئەفسەرەكانی باوكیدا كە ناوی "ئیلشی"یە فێردەبێت بە جۆرێك لە كاتی شەڕ و كوشتاردا خۆی بە تەنها دەتوانێت لەگەڵ ژمارەیەكی زۆردا شیربازی بكات.

تەیموور لە ماوەی ژیانیدا ژنی زۆر هێناوە، بەڵام ئەوەی زیاتر لە هەمووان لای ئەو بەڕێزتر بووە و خۆشیویستووە یەكەم ژنێتی كە ناوی "شازادە ئەلجای" بووە. بە شێوەیەك خۆشیویستووە وەكو خۆی دەڵێت ئەگەر ئەلجای زۆر لە ژیاندا بمایە ڕەنگبوو بە هۆی ئەو زێدە خۆشەویستی و گەورەییەوە كە لای من هەیبوو، من نەگەیشتمایە ئەو پلەوپایە و ناووناوبانگە. چونكە هەموو كات بیرم لە خۆشەویستی ئەو دەكردەوە و بیرم لە پلەوپایە و سەروەری نەدەكردەوە. ئەوەتا لە دوا هەناسەی ژیانیدا بە -ئەلمەهدی- كوڕی دەڵێت، نووسراوەكەت بێنە و ئەو بەشەم بۆ بخوێنەرەوە كە لەسەر -ئەلجای- نووسیوتە.

وە نەبێت -تەیموور- هەر لە شەڕ و شۆڕدا شارەزا و بەتوانا بێت بەڵكو لە سیاسەتیشدا شارەزا بووە. ئەوەتا دەبینی كاتێك "شا مالیك"ی شای ئەفغانستان دەگرێت. چۆن بیروڕا و شارەزایی سیاسەتی خۆی بەسەر "كورغان"ی سەرداری تەتەر و -شامالیك- ی شای ئەفغانستاندا دەسەپێنێت و وا لە شامالیك دەكات "شازادە شیرێزا"ی كچی خۆی بداتێ لە كاتێكدا ئەو كاتە -تەیموور- تەنها گەورە ئەفسەرێكی "كورغان"ی سەركردەی تەتەر بووە.

هەروەها لە کاتێکدا "تۆغلوك خان"ی سەرداری مەغۆلەکان نیشتمانەکەی داگیردەکات و هەرچی گەورە و سەرداری تەتەر هەیە لە ترسی تۆغلوك هەڵدێن و ڕادەکەن. ئەم دێت شارەزایانەو نەترسانە فریای نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆی دەکەوێت و لە دواییشدا بە ژیری و زانایانە لەشکری مەغۆل لە وڵاتدا دووردەخاتەوە و خۆی دەکات بە سەردار و گەورەی نەتەوە و وڵاتەکەی خۆی و ناپاکانی وڵاتەکەی خۆشی ڕیسوا دەکات.

لەم بەسەرهاتە مێژووییەدا ئەوەشمان بۆ دەردەخات، مرۆڤ نابێت بە ماڵ و سامان و دەستەڵاتو هۆز بنازێت.

لە کاتی خوێندنەوەی ئەم بەسەرهاتو بیرەوەرییانەدا تەماشای جوانترین و شۆخ و شەنگترین‌و بەڕێزترین ژنی تەتەر بکە و تەماشای ئەلجای ژنە جوانەکەی تەیموور بکە بزانە لە کۆتاییدا چۆن بێکەس و بێناز و ناوونیشان دەمرێت و لە کوێشدا دەمرێت.

-تەیمووری شازادەش لەو ماوەیەدا لەگەڵ کێدا ژیا و ئاخریش چۆن چووەوە سەر تەختی شاهانە و چۆن بووەوە بە سەردار و گەورەی هەموو تەتەر.

-تەیموور- لە شەڕدا نەترس بووە و زۆرجاریش پشتی بە فێڵ و تەڵەکە بەستووە و بۆ ئەم مەبەستەش پشتی بە عەبدوڵڵای نۆکەری بەستووە. لە شەڕ و کوشتاریشدا پلانی جوان و شارەزایانەی داڕشتووە. لەو زەمانەیشدا هەرێمەکان و دەڤەرەکان میرنشین بوون. خۆ ئەگەر میرنشینی جێگایەك بۆی ڕێبکەوتایە و بیزانیایە میرنشینەکەی هاوسێی بێهێزە، هێرشی دەکردە سەر و میرنشینەکەی دەبەست بە میرنشینەکەی خۆیەوە.

گرتنی شاری "کارشی" و داگیرکردنی بەو فێڵە نەترس و ئازایەتی تەیموور ئەوە دەسەلمێنێت.

من نامەوێت باسەکەت بۆ بکەم. حەزدەکەم خۆت بە وردی بیخوێنیتەوە و بە باشی تێیبگەیت.

تەیموور لە جەنگ و کوشتاردا هەردەم خۆی سەرپەرشتی و سەرکردایەتی کردووە و سەرنجی هەڵسوکەوتی دوژمنانی داوە. پلانی جەنگی چاك و شارەزایانەی بەکارهێناوە. لە شەڕدا شازادە و سەرلەشکری ئازا و بە جەرگی هەبووە. ئەمانیش بوونەتە زامنی سەرکەوتنی لەو شەڕو داگیرکردنانەدا.

تەیموور لەدوای ئەمانی "حسێن"ی کچەزای کورغان هەر هەموو شازادە و سەردارانی تەتەر هەڵیانبژارد و بوو بە سەرکردە و گەورەی هەموو وڵاتی تەتەر و فەرمانڕەوایی میللەتەکەی

خۆی. تەیموور لە پێناوی زانینی هێز و جێگای دوژمنەکانیدا ماڵ و سامانی زۆری خەرج کردووە. پێش هێرشکردنە سەر ئەو وڵاتە و ئەو شوێنەی دەیویست داگیری بکات بە وردی لێکۆڵینەوە و سەرنجدانی دەکرد. لە خۆوە و بە لە خۆباییبوونەوە هێرشی نەدەکردە سەر هیچ شوێنێك تا بە تەواوی لە جێ و شوێنی ئەو وڵاتەی نەکۆڵیایەتەوە و بە باشی تێنەگەیشتایە، خۆی نەدەخستە مەترسییەوە. ڕاستی ئەم قسەیەش دروستکردنی "قەڵای دیفون" و دروستکردنی ئەو گوند و قەڵایە بوو کە بۆ "ئالی سۆن" و "شازادە شۆلیان مەلەك"ی ژنی دروستکرد.

بەڕێزان، خەڵقی چی و چۆن دەربارەی تەیمووری لەنگ دەڵێن و دەنووسن ئەوە بیروڕای خۆیانە و هەموو کەسێکیش لە بیروڕا دەربڕیندا ئازادە و بۆچوونی خۆی چۆنە ناتوانرێت ڕێگای لێ بگیرێت.

بەڕێزان، بڕوا بکە کاتێك تەیموور لەسەرەمەرگدا ئەلەهدی کوڕی بانگکرد و وتی: مەهدی ئادەی ئەو بەشەی دەربارەی ئەلجای نووسیوتە بۆم بخوێنەرەوە. و ئەلەهدی هێشتا لە خوێندنەوەی باسەکە نەبوبۆوە، تەیموور بۆ دواجار دڵی لە لێدان کەوت. من وادەزانی من خۆم ئەلەهدی کوڕیم و لەگەڵ تەیمووردا دانیشتووم و خۆم ئەو بەشەی بۆ دەخوێنمەوە و خۆم بە چاوی خۆم دوا هەناسەی ژیانی تەیموور دەبینم.

خوێندەواری بەڕێز، ئەوەش دەڵێم دەگونجێت هەڵەشم هەبێت و هەندێ شت من بە باشی بۆی نەچووبێتم. لە ناخی دڵمەوە داوای لێبووردن و چاوپۆشین لە ئێوەی بەڕێز دەکەم و داوای ڕێنمایی شارەزایانیش دەکەم و کەس لە هەڵە بەدەر نییە، تەنها خوای گەورە و میهرەبان نەبێت.

ئیتر نامەوێت لەمە زیاتر خەریکت بکەم و ماوەت لێبگرم. فەرموو خۆت بیخوێنەرەوە و سەرنجی بدە.

خوای گەورەش پشت و پەنا و ڕێنیشاندەرمان بێت.

وەرگێڕ

شێخ عەلی حاجی شێخ محەمەدی بەنەنا

# شیربازییەکی سەرکەوتوو

من ناوم تەیموورە کوڕی تاراغای ئەمیری شەهری سیبزم. من بە مافی ڕەوای خۆمی دەزانم، بە خۆم بڵێم شای سەمەرقەند و شاهەنشای جیهان. چونکە من هەڵگری بیروباوەڕم و لەسەر ڕێگای درەختی ژیان ڕۆیشتووم. ئەو ڕێگایەی پێویست بوو لەسەری بڕۆم. ئەمەم ئەو کاتە بۆ دەرکەوت کە دوارۆژی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بوو.

ئەوکاتەش تەمەنم نۆزدە ساڵان بوو. واتە لە ساڵی حەوسەد و پەنجاوپێنجی کۆچیدا بوو ٧٥٥ د. ك.

لەگەڵ نۆکەرە لاوەکەم "عەبدوڵڵا" و زیاد لە دە پیاوانی شاری شەهری سیبزدا. لە بەیانییەکی ئەو ڕۆژەدا، لە سێبەری مزگەوتەکەدا دانیشتبووین چونکە بە هۆی ئەو شاخە بەرزانەی کە پەیوەستن بە شاخە بەرزەکانی "یامیر"ەوە تا ئەوکاتە سێبەری بەسەرەوە بوو، تاریك دەینواند. باوکیشم، بەرگێکی لەبەردا بوو هەر لە بەرگی پیاوانی ئاینی دەچوو. لە لای ڕاستی ئیمام "زەینەدین"ی پیرەمێردەوە دانیشتبوو، کە هەندێ سوورەتی قورئانی پیرۆزی بۆ دەخوێندین.

باوکم کە منی بینی وا بە پەرۆشەوە گوێم بۆ قسەکانی ئیمام زەینەدین ڕاگرتووە.. بە خۆشی و دڵنیاییەوە پێکەنی. بەڵام کاتێك عەبدوڵڵای نۆکەرمی بینی لە پشت سەرمەوە ڕاوەستاوە و جووڵە جووڵێتی و لە قسەکانی ئیمام بێزارە. ئەوەندەی نەخایاند ڕووی گرژ کرد و ناوچەوانی دا بە یەکدا. چونکە باوکم بە بڕوایەکی تەواوەوە دەیویست منیش ببم بە یەکێك لە پیاوانی ئاینی ئەویش پاش ئەوەی ماوەی چوار ساڵم لە خوێندندا تەواو کردبوو. هەرچەندە من چاوم لە ڕووی ئیمام بڕیبوو. بەڵام لە ڕاستیشدا گوێم لەو سوورەتە نەگرتبوو کە ئیمام دەیخوێند. بیرم هەر لای گۆڕەپانی یاریی تۆپی بۆلۆو و تیر و کەوان و گەنجینەی چەك زیاتر بوو وەك لەوەی بیر لە مزگەوت و منارە بکەمەوە.

"ئیلشی" سوارچاکێك بوو، سەرکردایەتی سەربازگەیەکی بچووکی دەکرد کە لە نزیك ڕووبارەکەوە هەڵیاندابوو. ئەو سەرپەرشتی فێرکردن و ڕێنمایی بەکارهێنانی چەکی دەکردم. لەوکاتەی من لای ئیمام زەینەدین دەمخوێند. وەك باوکم فەرمانی پێکردم وازم لە شەترەنج و تۆپی بۆلۆ و تیرهاویشتن و بەکارهێنانی شیر نەهێنابوو. پێشکەوتنێکی گەورەتر و شارەزاییەکی تەواوم پەیدا کردبوو بە تایبەت لە دوا ساڵدا لە ژێر ڕێنمایی "ئیلشی"دا. لە سواری ئەسپ و

بەکارهێنانی چەکدا، لە کاتەکانی دوای نیوەڕۆدا کە لە سەربازگەکەدا بەسەرم دەبرد. وەك لەو پێشکەوتن و شارەزاییەی کە لە ئاینی و ئەدەبدا کە لە کاتەکانی بەیانیدا لەژێر دەستی ئیمام و لە مزگەوتە بێدەنگ و بەڕێزەکەدا دەمخوێند.

لەژێر جلەکانمەوە دەستم نووقاند و تۆپەڵم کرد و بیری مشتۆی شیرم کەوتەوە و ماسوولکەی قۆڵم لەرزی کاتێك ئەو بەسەرهاتە دەروونییەم هاتەوە بیر کە مرۆڤ تێیدەکەوێت لە کاتێکدا ژێی کەوانە ڕادەکێشێت و دەیەوێت تیرێك بهاوێژێت بۆ نیشانێکی بچووك (هدف).

ڤین و تووڕەیی لە سینەمدا جۆشی سەند، کاتێك بیری ئەو سوار و جەنگاوەرە لاوانەم کەوتەوە کە جامی گاڵتە و گاڵتەجاڕییان بە سەرمدا ڕژاند و چۆن بە دڵڕەقی و ناشیرینییەوە گاڵتەیان پێدەکردم. بەڵام من لە قووڵایی دەروونمەوە دەمزانی گاڵتەپێکردنی ئەو سوارانە چ نەبوو لەوە زیاتر کە نێوانێکی دروستکراوبوو.

ئیرەیی و چاوپیاهەڵهێنانی خۆیانی لەو هێزە بێ وێنەیەم و ئەو شارەزاییە تەواوەی پێبشارنەوە.

کاتێك، باوکم دەرگی کرد بەوەی من گوێم لە خوێندنی قورئانەکە نەگرتووە، نێوچەوانی گرژکرد و بە تووڕەییەکی زۆرەوە تەماشای چاوی کردم و سەری ڕاوەشاند، کە نیشانەی تووڕەیی بوو لە دەمارەکانیا دەکولا و بە چاوەکانی سەرزەنشتێکی توندی کردم.

شەرمەزارییەکی تەریقی دایگرتم، بە ناچارییەوە هاتمەوە هۆش خۆم و چاوم بڕییە جووڵەی لێوەکانی ئیمام و هەوڵی ئەوەم دا سەرنج لەو سوورەتە بدەم کە لەوەوپێش ناوەڕۆك و ماناکەیم دەزانی، چونکە من خۆم دەمتوانی قورئان بخوێنم.

لەگەڵ ئەوەشدا من نەمتوانی ئەو بیرە لە مێشکی خۆم دەربکەم کە من تەنها کەسێك بووم لەو کۆمەڵە سەربازانەی "شەری سیبز" کە پێشەوا "کۆرغان"[1] بانگی نەکردووە بۆ خزمەتی سەربازی و لەگەڵ مامە "بۆلاس"ەدا نەچوومەتە سەربازگەی هۆزەکانەوە. کە لە دوای شیو و دۆڵەکانەوە هەڵیاندابوو.

کاتێك ئیمام زەینەدین لە قورئان خوێندن بووەوە من و "عەبدوڵڵا"ی نۆکەرەی بەڕێکرد و ئیزنی داین. باوکیشم سەرێکی خوارکردەوە کە نیشانەی خواحافیزی لێکردنم بوو. بۆ خۆشی چووە ناو مزگەوتەکەوە.

---

[1] کورغان: ئەم وشەیە لە بناغەدا "کورخان"ە چونکە ئەم خانی تەتەرە چاوێکی کوێر بووە، لەبەرئەوە پێیان وتووە "خانی کوێر" و بۆ ئاسانی لەسەر زمان پێیان وتووە کورخان واتە پاشاکوێرە.

من و عەبدوللا بەرەو دەرگای مزگەوتەکە چووین و پێلاوەکانمان لەپێ کرد و بەرەو تیشکی ڕۆژەکە، کە لەسەر شاخە بەرزەکانەوە دەبریسکایەوە بۆی دەرچووین.

عەبدوللا لێیپرسیم و وتی: ئەمیرەکەم ئێمە بەرەو ڕووبارەکە دەڕۆین و لێی دەپەڕینەوە؟

تەماشایەکی جل و پێلاوەکانم کرد. بینیم هیچ پەیوەندییان بە سیمای جەنگاوەرەوە نییە.

وەلامم دایەوە و وتم: من وای بە باش دەزانم، بچینەوە بۆ ماڵێ و دوو جووت پێلاوی باشتر لەپێ بکەین.

"عەبدوللا" سەری ڕەزامەندی ڕاوەشاند و وتی: بەڵێ ئەمیری سەروەرم، پێویستە سواری ئەسپەکانیشمان ببین، وا نییە؟

منیش شەرمم دەکرد، سواری ئەو ئەسپە کورتەبالاّیانە ببم کە مامە "بۆلاس"م تەنها ئەمانەی بۆ جێهێشتبووین و ئەوانی تری بۆ هۆزەکەی بردبوو، تاکو لە ناوەکە پێی بپەڕنەوە.

لەگەڵ ئەوەی من قینم لەوە دەبۆوە بە پێ بڕۆم، هەروەها عەبدوللای نۆکەریشم وەك من حەزی نەدەکرد بە پێ بڕوات. بەلاّم گەورەیی و لووت بەرزیم ئەوەی بەسەرمدا سەپاند بە پێ بڕۆم وەك لەوەی سواری ئەو ئەسپە کورتەبالاّیانە ببم من چاوەڕوانی گەورەیی و لووت بەرزیم لە عەبدوللا نەدەکرد. پاشان وەلاّمی عەبدوللام دایەوە و وتم: نەخێر عەبدوللا، نەخێر پێویستە لەسەرمان بە پێ بڕۆین.

ئاوا لە پێش عەبدوللای نۆکەرمەوە بە شەقامە چۆڵەکاندا کە هیچ کەسی پێوە نەبوو دەڕۆیشتم، و عەبدوللاش دوو هەنگاو دوور لە من لە پشتمەوە بێدەنگ و گوێڕایەڵ دەڕۆیشت.

لە کاتێکدا بە ناو شاردا تێپەڕمان دەکرد و بازاڕ و دوکانی خواردن فرۆشەکانمان جێدەهێشت. هەندێ لە فرۆشیارە تەمەڵەکان بە ڕێزەوە قسەیان لەگەڵدا دەکردم. بەلاّم بێپەرۆش و بێپەروا بوون. هەروەها ژنانی دوکانی مەی فرۆشەکانیش لە کاتێکدا لەبەردەمیانەوە تێدەپەڕین، هیچ مەیل و ئارەزوویەکیان لەگەڵماندا نەبوو. چونکە دەیانزانی ئێمە -من و عەبدوللا- هیچ پارەیەك لە گیرفانماندا شك نابەین.

کاتێك گەیشتینە شەقامە پانەکان و ئەو کۆشکە زستانیانەی کە خانەدانە فارسییەکانی دانیشتووی "سەمەرقەند"یان تیا نیشتەجێ بوو. "عەبدوللا" لێم نزیك بۆوە و ڕووی تێکردم و وتی: شازادەی سەروەرم با کارێك بکەین، دایکم نەمانبینێت، چونکە ئەگەر چاوی پێمان بکەوێت، وامان لێدەکات، بە ڕۆژوو بین و لە ماڵەوە تا ڕۆژئاوا بمێنینەوە. منیش حەزدەکەم ئێستا بڕۆین و لەگەڵ سەربازەکاندا نان بخۆین. بەسەر جولاّندن قایلبوونی خۆمم نیشاندا، و وتم:

عەبدوڵلا منیش هەروام دەوێت. لەبەرئەوە پێویستە بە ڕێگایەکی کەدا بڕۆین، تاکو نەهێڵین دایکت بمانبینێت. ئاوا لە بری ئەوەی بەسەر شەقامەکاندا بڕۆین، چووینە ناو باخی دارتووەکانەوە و بە تەنیشت دیواری کۆشکی سپیدا ڕۆیشتین، هەتا گەیشتینە جێگایەك دیوارەکەی ڕووخابوو. ئیتر بە دیوارەکەدا هەڵگەڕاین و چووینە ناو کۆشکە سپیە جوانەکەوە ئەو کۆشکەی، لە ڕابوردوودا بارەگای هۆزی "برلاس" بوو. ئەم کۆشکە ڕۆژێك لە ڕۆژان جێی شانازی و نیشانەی جوانی و فەشەنگی "شەهری سیبز" بوو. بەڵام ئێستا چۆڵ و بێ ڕەونەقە و باخچەکەشی گیای کێوی و درك و داڵ دایپۆشیوە. دارە گەورەکان و دەوەنەکانی هەڵنەپاچراون و حەوز و گۆمە بچووکەکانیشی خاڵین یان ئاویان تیا پەنگ خواردۆتەوە و بۆگەنیان کردووە.

هیچ کەسێك لەم کۆشکەدا گوزەرانی بەسەر نەدەبرد و چۆڵ و هۆڵ بوو. بەڵام دایکی عەبدوڵلا کە لە شاردا مابۆوە، بۆئەوە بوو چاودێری کاروباری من و کاروباری کوڕەکەی بکات. یەکێك لە ماڵی خزمەتکارەکانی کۆشکەکەی بۆ ئەو مەبەستە ئاوەدان کردبۆوە ماڵەکەش بەردەوام خاوێن و ڕێك و پێك بوو.

من و عەبدوڵلا بە دەرگایەکی چەپەی کۆشکەکەدا چووینە ناو ژوورەکەی خۆمانەوە. گوێم لێبوو دایکی عەبدوڵلا لە چێشتخانەکەدا گۆرانییەکی تەتەری کۆنی دەوت. دەنگەکەی بە گوێم ئاشنا بوو، چونکە ئەم کارەکەرە پیرە لە کاتێکدا، منداڵ بووم گشت کات ئەو گۆرانییەی بۆ دەوتم. چونکە هەر ئەو یەکەم دایەن و دایکم بوو. بەڵام دایکی عەبدوڵلا کارەکەرێکی دڵڕەق و بێبەزەیی و زۆردار بوو. لەبەرئەوە وام بە چاك زانی جلەکانم دابکەنم و جلێکی تر لەبەربکەم و بێ ئاگاداری ئەو لە ژوورەکە بچمە دەرێ لە ترسی ئەوەی نەك وام لێبکات نەڕۆم و، ڕێزی ئارەزووەکانی بگرم. چونکە ئەو زۆر بە دڵڕەقی چاودێری دەکردم و بە زۆر لە مانگی ڕەمەزاندا ڕۆژووی پێدەگرتم. ماوەیەکی کەم تێپەڕیبوو عەبدوڵلا هاتە ژوورەکەمەوە بۆی دەرچووین و بەو ڕێگایەی پێیدا هاتبووین گەڕاینەوە. خێرا لە شوێنی دیوارە ڕووخاوەکەوە بەرەو شار بۆی دەرچووین. بە خەندەقە وشکەکەدا تێپەڕین و گەیشتینە سەر ئەو پردەی بەسەر ڕووبارەکەوە کرابوو، بە سەریدا بەرەو ڕێگای سەمەرقەند ڕۆیشتین. ڕێگای سەرمەرقەند لە شەقامە سەرەکییەکانی شەهری سیبز زیاتر قەرەباڵغتر بوو. فرۆشیارەکان بەسەر ڕێگاکەدا کۆمەڵ کۆمەڵ و تاك تاك دەهاتن و دەچوون، و ئاژەڵەکانیان پێش خۆیان دابوو. یا وڵاغەکانیان لێدەخوڕی و کەلوپەلەکانیان لێ بارکردبوو. چونکە وڵات لە نێوان سەمەرقەند و دەروازە ئاسنینەکەی شەهری سیبزدا پڕبوو لە ئێشکگر و پاسەوانان و هیچ ترس و لەرزێك لە دەست دز و چەتە و ڕێگران

نەبوو. وە هەندێ سوارەی قافڵەیەکی گەورە پێشەکی خۆیان ئامادە دەکرد بۆ ئەوەی چادری گەورە هەڵدەن و لە نزیك ڕووبارەکەوە شەو بەرنە سەر. عەبدوڵڵا لە یەکێك لە پاسەوانەکانی قافڵەکە نزیك کەوتەوە و پرسیاری لێکرد و وتی: برای سوارە ئێوە بۆ کوێ دەڕۆن؟

پاسەوانەکە بە وردی سەرنجی دا و پێی وت: ئێمە بەرەو باکوور، بۆ "سەمەرقەند" دەڕۆین.

دووبارە عەبدوڵڵا پرسیاری لێکردەوە: ئێوە لە کوێوە هاتوون؟

-هەندێکمان لە "کوندوز" و هەندێکمان لە "هەرات" و هەندێکی کەشمان لە "کابول"ەوە هاتووین.

-ئایا قافڵەکەتان گەورەیە؟

-بەڵێ قافڵەکە گەورەیە و لە پەنجا حوشتر و دوو سەد ئەسپ پێکهاتووە. قافڵەیەکی زۆر دەوڵەمەندە و چەند کچێکی جوانیشی تێدایە..

-ئایا نانی ئێوارێ لێرەدا دەخۆن؟

-بەڵێ لێرە شێوە فیستیڤاڵێکیش دەکرێت و منیش دەمەوێت هەر ئەمشەو بگەمە سەمەرقەند.

بەڵام کۆیلەکان دەترسن لە شەودا بڕۆن. هەروەها ئەوان لەوەش دەترسن کە نەتوانن لە کاتی گونجاودا کیژەکان بگەیەننە بازاڕ.

-بەڵام ئایا لێرە لەناو شاردا ئەوەندە سەربازگەی زۆری تیا ماوە؟

-بڕوا ناکەم، چونکە لێرە ژمارەی سەربازەکان لەسەد زیاتر نییە. هەرچەند من قسەم لەگەڵ پاسەوانەکەدا نەدەکرد. بەڵام من لە نزیکیەوە وەستابووم و بە خۆشی و شادی و وریاییەوە گوێم لەو قسانەی گرتبوو کە لەگەڵ عەبدوڵڵادا دەیکرد. بەسەر پردەکەدا دەستم بە ڕۆیشتن کردەوە و بەرەو سەربازگەکە کەوتمە ڕێ و عەبدوڵڵاش ئاوڕی دایەوە و پێم گەیشتەوە. هەندێ لە سەربازەکان دەستیان لە کار کێشابۆوە. بۆئەوەی نانی بەیانی بخۆن. هەندێکی تریان ئاگریان لە ژێر مەنجەڵی چێشتلێنانندا کردبۆوە، بۆن و بەرامە و هاڵاوێکی زۆر خۆش و بەردەوامیان لێ بەرز دەبۆوە.

عەبدوڵڵا ڕاوەستا و پاشان بۆ لای چەند سەربازێك چوو کە چادرەکانیان لە نزیك ڕۆخی ڕووبارەکەوە هەڵدابوو. بەڵام من لە ڕۆیشتندا بەردەوام بووم و بەرەو ئەو چادرانە چووم کە لە نزیك سەرکردایەتییەوە هەڵیاندابوو.

پێش ئەوەی بگەمە چادرەکان ئیلشی سوارچاکم لە پێش چادرەکەیەوە بینی، لەژێر ساباتێکدا دانیشتبوو. لە نزیکیشییەوە هەندێ پیاوی نامۆ کە من نەمدەناسین، دانیشتبوون، وامزانی یاریدەدەران و سەرۆکی سەربازە تازەکانێتی. وا خۆم پیشاندا بۆلای "ئیلشی" ناچم و بێئەوەی گوێی پێبدەم یان تەماشای بکەم بە بەردەمیدا ڕەت بووم. بەڵام "ئیلشی بۆ لای خۆی بانگی کردم و پاشان پیاوەکان هەستان و تێگەیشتم کۆبوونەوەکەیان کۆتایی هاتووە.

بەرەو ڕووی "ئیلشی" چووم بە گەرمەوە سڵاوی لێکردم و ڕوویکردە یەکێك لە پیاوەکان و پێی وتم: ئەمە سوارە "ئۆلاتای"یە. پاشان ڕووی وەرچەرخاند بەلای منەوە و بە ئۆلاتای وت: ئەمە تەیموور برلاس کوڕی تاراغای ئەمیری "شەهری سیبز"ە.

لەبەرئەوەی ئیلشی لە خانەوادەیەکی خانەدان نەبوو، زۆر شانازی دەکرد و خۆی بەگەورە دادەنا کە خۆی ئەدی برادەر و ڕێنمایندەی یەکێك لە خانەدانە گەورەکان دەکات.

ئۆلاتای دەستی درێژ کرد، تەوقەم لەگەڵدا بکات، بەڵام هیچ گوێی نەدا بە ناوەکەم و هەروەك هەرگیز ناوی باوکیشمی نەبیستبێت. هەروەها یەکێك لە یاریدەدەرانی "ئیلشی" کە ڕەنگ و ڕووی وایدەنواند هندییەك یان فارسییەك بێت. چونکە ڕەنگ و ڕووی زۆر ڕەش بوو. ڕەشتر لە تەتەرییەك. لچی هەڵقرچاند و دانی جیڕکردەوە کە ناوی باوکمی بیست تفێکی کردە سەر زەوی.

لەگەڵ ئەوەی من لەو زەلامە درێژتر بووم. بەڵام چەکم بە دەستەوە نەبوو، وە بەرگی شارستانیشم لەبەردا بوو. هەستمکرد من بێتوانا و بێ چەکم لە ئاستیا. بە ڤین و سووکایەتی و کەم پێزانینەوە تەماشایەکی کردم و دەستی لەسەر مشتۆی چەقۆ تیژەکەی کە بە پشتێنەکەیەوە بوو توند کرد.

بە سووکی و تووڕەییەوە تەماشایەکی ئەو لاوەم کرد. لەگەڵ ئەوەی ئیرەییم بەو قەڵغانە پۆڵاییەی دەهات کە لەژێر کراسە خەتخەتە ئاوریشمەکەیدا بوو. وە ئیرەیشم بەو شیرە فارسییە ئایابەتبرد کە بە پشتێنەکەیەوە و بە لاتەنیشتیدا شۆڕبۆوە.

لەم کاتەدا "ئیلشی" و "ئۆلاتای" فەرمانیان بە فەرماندەکانی تر دا بڵاوەی لێبکەن. هەروەها ئەو لاوە ڤین لە دڵەش لەگەڵیاندا بڵاوەی لێکرد.

"ئیلشی" بانگی کردم و وتی: شازادە حەزدەکەیت نانی بەیانی لەگەڵماندا بخۆیت؟

-بەڵێ گەورەم!! هەروەها دەشمەوێت پێش ئەوەی بڕۆیت جارێکی تر بتبینمەوە.

-باشە، تۆ و "ئۆلاتای" لێرە دانیشن، منیش دەچم بزانم "غازا"ی نۆکەرم ئەمڕۆ چی بۆ لێناوین، چونکە ژنەکانم گشتیان بۆ سەربازگەی "سالی" ڕۆیشتوون.

پاشان ئیلشی چووە دەرێ و بە تەنیشت خێمەکەیدا ڕۆیشت تاکو خواردن بهێنێت.

پاش ئەوەی لەسەر ئەو فەرشەی لەژێر سایاتەکەدا ڕاخرابوو لەگەڵ "ئۆلاتای"دا دانیشتم.

پرسیارم لێکرد و وتم: وا دیارە دەمێکی زۆر نییە کە لە دیوانی کورغان ەوە هاتوویت؟

-بەڵێ تەنها ماوەی چوار ڕۆژە هاتووم.

-کاروبار لەوێ چۆنە؟

-ئاساییە.. و هەندێك دەنگوباس و ئاژاوە لە دەوروبەری شاری "باداکشان"دا هەیە. بەڵام کورغان دامرکاندنەوەی ئەو دەنگوباس و ئاژاوەیەی خستۆتە سەرشانی خۆی و بڕیاری داوە پێش وەرزی زستان شاریان لێ پاکبکاتەوە. و هەندێك فارسیش هەن، ناوبەناو هێرش دەکەنە سەر ڕۆخی دەریای "ئامۆداریا" و جگە لەوانە هیچ شتێکی شایستە نییە کە باسبکرێت و گوێی پێبدرێت.

پاش کەمێك سوارە ئیلشی گەڕایەوە و نۆکەرەکەی بە دواوە بوو، مەنجەڵێکی پڕ لە خواردنی بە دەستەوە و هەندێ کولێرەی ئاردی جۆ و قۆرییەك چای بە دەستەوە بوو. ئیلشی بەرامبەرمان دانیشت و "غازا" ش خواردنەکەی لە بەردەمیدا دانا. من و "ئۆلاتای" هەردووکمان هەریەکەمان یەکی پارچەیەك نانمان هەلگرت و لە چێشتەکەمان هەڵکێشا. پاشان ئیلشی سوراحییەك ئاوی داینە دەست تاکو ئاوبخۆینەوە.

ماوەیەکی کەم بە سەرماندا ڕابوورد و هەردووکمان بەرامبەر یەکتری هەستمان بە شادی و دڵنیایی کرد.

لەم کاتەدا ئیلشی ڕوویکردە ئۆلاتای و لێی پرسی وتی بە ئۆلاتای ئەو کوڕەی کە لە تەکتدا بوو کێ بوو؟

-لەو کوڕە دەپرسیت کە ناوی "نیهمۆ"یە؟

-بەڵێ ئۆلاتای بە تەواوی پرسیاری ئەو کوڕە دەکەم.

-چاکە، ئەوە کوڕێکە لە میری سەرچیا هەڵاتووە، وا دەردەکەوێت ئەو کوڕە ئەو نهێنییە درۆیەی بەهەشتە درۆکەی ئەو میرەی ئاشکرا کردبێت. ئەو کوڕە ویستوویەتی بە دزی و بێ ئاگاداری ئەو سەردارە بچێتە ناو کۆشکەکەیەوە و چیرۆکی سەرداری کۆنی سەرچیاش چیرۆکێکی

بڵاو و زانراو بوو، لەو کات و شوێنەدا خەڵکی دەماودەم دەیانگێڕایەوە. کە ئیلشی گوێی لەمە بوو چاوەکانی گەشبۆوە و لە ئۆلاتای پرسی و وتی: باشە دەربارەی کۆشکەکە چی وت؟

مەبەستم ئەوەیە، بزانم ڕاستە کچەکانی ئەو کۆشکە وەك دەڵێن زۆر جوانن؟ وە ئایا ڕاستە، شیر و هەنگوین و مەی لە هەموو بەلووعە زیوینەکانی ئەو شوێنەوە دێنە دەری؟

-وابزانم وایە "نیهمۆ" زۆر قسە ناکات. بەڵکو کە شتێکی سەیر و نامۆ دەبیستێت نێوچەوانی دەدات بە یەکدا و تف دەکاتەوە. بێگومان وەك ئەو دەڵێت وایە. چونکە ئەو سەرچاوانەشی کە زانیاریم لێوەرگرتوون جێگای باوەڕن. هەرچۆنێك بێت ئەو کوڕە لاوە حەزی کردووە، بچێتە ناو کۆشکەکەوە و لەو پێناوەشدا قوربانی بە ژیان و گەردنی خۆیداوە.

ئەو کوڕە ماوەیەکی دوور و درێژە لەسەر تلیاك کێشان ڕاهاتووە. وا دیارە ئەندازەیەکی تەواو تلیاکی کێشابێت و دووکەڵەکەی هەڵمژیبێت، ئینجا خۆی کردووە بە کۆشکەکەدا. کە لە بێئاگاییەکەی بە هۆش دێتەوە. زۆر بە وردی تەماشای دەوروبەری خۆی دەکات، و کە بێگومان دەبێت لەوەی چۆتە ناو کۆشکەکەوە و شتە سەرسووڕهێنەرەکانی ئەو بەهەشتەی دیوە، پاشان دێتە دەرێ و بۆی دەردەچێت.

-باشە ئۆلاتای ئەو کوڕەت لە کوێ دەستکەوتووە؟

-ڕۆژێك ئەو کوڕە خۆیکرد بە چادرەکانماندا و هەندێ دەنگەدەنگ و تەنگ و چەڵەمەی لە دیوانی سەرۆك "کورغان"دا خولقاند. لەبەرئەوە سەرۆك "کورغان" ناردی بۆ لای من تاکو بە وردی چاودێری خۆی و کردەوەکانی بکەم. بێگومان کوڕێکی خراپە، بەڵام ڕۆژێك لە ڕۆژان کەڵکی بۆمان دەبێت، چونکە ئەگەر یەك تۆز دووکەڵی تلیاك بچێت بە قوڕگیا خۆی لە هیچ کارو فەرمانێك ناپارێزێت کە داخوازی لێبکەیت.

-بەڵام پێویستە لە سەری، خۆی لە کاری شازادە تەیموور هەڵنەقورتێنێت و دەوروخولی نەدات. چونکە بینیم کە شازادە "تەیموور"ی بینی بەرگی شارستانی لەبەردا بوو، ددانەکانی جیڕ دەکردەوە و نێوچەوانی بەیەکدا دا.

"ئۆلاتای" بە گرژی و مۆنییەکەوە تەماشایکردم. ئەو کاتە زیاد لە هەموو کاتێکی پێشووتر هەستم کرد، من بێ چەکم و جلەکانیشم زیاتر لە بەرگی پیاوانی ئاینی دەچێت وەك لە بەرگی سوارەیەك بچێت. لەو کاتەدا "ئیلشی" ڕوویکردە "ئۆلاتای" و ڕووی قسەی تێکرد و وتی: هەروەها تۆش ئۆلاتای پێویستە لەسەرت، خۆت گێل نەکەیت، چونکە ئەم شازادە لاوە بەردەوام و ڕێکوپێك ماوەی ساڵێکی تەواوە لەگەڵ پیاوەکانمدا بەردەوام بووە لەسەر بەکارهێنانی چەك.

"تەیموور" شارەزاترین کەسێکمە و سوارچاکترین سواریشە. شازادە "تەیموور" خەریکە لە من کارامەتر و پێشکەوتووتر دەبێت.

منیش دەمزانی، قسەکانی ئیلشی ڕاستە، بەڵام تۆزێك هەستم بە شەرمەزاری و سەرلێشێوان کرد. چونکە ئیلشی ئەم قسانەی بۆ بەرپەرچدانەوەی ئۆلاتای کرد. لەو یەکەم پێزانین و ڤین لێبوونەوەیەی، بەرامبەر من کردی، ئاواتەخواز بووم کە نیهمۆ جارێکی تر بهاتایەوە و سووکایەتی پێبکردمایە، تاکو بۆم بسەلماندایە، من لاوێکی بێتوانا و ترسنۆك نیم. چونکە ئەو کاتەش ئەودەم دەدی کە کار لای سەرکردە تازەکان بە شێوەیەکی تر دەگۆڕا. ئۆلاتای گرنگییەکی زۆری بە قسەکانی ئیلشی دا. بەڵام لەڕاستیدا لە قووڵایی دەروونییەوە بڕوای بەڕاستی ئەو وتانە نەبوو. بەڵکو ئۆلاتای هاوبەشی نیهمۆ بوو لەو بە کەم پێزانینەی مندا. منی بە هیچ نەدەزانی جگە لەوە نەبێت کە من لاوێکی بێ چەك و ترسنۆك و هیچ لە دەست نەهاتووم.

پاش ئەوەی لە نانخواردنی بەیانی بووینەوە هەردوو ئەفسەرەکانم بەجێهێشت تاکو دەربارەی کار و پیشەیان گفتوگۆ بکەن و کاری خۆیان جێبەجێ بکەن و بەرەو ڕووی جبەخانەی چەك ڕۆیشتم. سەرنجی سندووقی چەکەکانم دەدا، و هێزی ژێ و تیرە ڕێکەکان و تیرهاوێژە درێژەکانم تاقی دەکردەوە. ئەو شیرە فارسییە جۆراوجۆرە تێکەڵاوە بەناوبانگانەم لەملاو لەولای جبەخانەکەدا بینی. هەروەها هەندێ پیاوی تریش کە لە ژەمی نانخواردن ببوونەوە، دەستیان کرد بە هاتن بۆ ناو جبەخانەی چەکەکان. جەنگاوەر و سوارەکانیش خۆشحاڵ بوون، چونکە ڕێپێدراو و لە حەسانەوەدا بوون بە شادی و ڕووخۆشییەوە لەگەڵ یەکتردا دەدوان. دەچوون بۆئەوەی چەکەکانیان خاوێن بکەنەوە، یان سەری ڕمەکانیان بساونەوە و دەم و ڕووی شیرەکانیان خاوێن و بریسکاوە بکەن.

بەڵام پیاوە پیرەکانیان خۆیان بە یاریی شەترەنج و زارهاویشتنەوە خەریك کردبوو. کاتێك جبەخانەکە پڕبوو لە پیاو، لە نزیك یاریکەرانەوە ڕاوەستام و سەرنجی یارییەکانیان و شارەزاییانم دەدا و چاودێری هەڵەکانیانم دەکرد.

پاش ئەوە کەوتینە گفتوگۆ و وتم: ئەمشەو کاروانێك لە نزیك پردەکەوە و لەوێوە هەڵیانداوە. "نیهمۆ" کە لەگەڵ ژمارەیەك لە پیاوانی ئۆلاتایدا هاتبوو. لێی پرسیم:

-ئەو کاروانە لە کوێوە هاتووە؟

ویستم گوێ بە پرسیارەکەی نەدەم. بەڵام چارم نەبوو هەر دەبوایە وەڵامی بدەمەوە.

-وتم: ئەو کاروانە وابزانم لە باکوورەوە لە "کوندوز" و "هیرات" و "کابول"ەوە هاتوون.

هەمدیسان دووبارە نیهمۆ پرسییەوە و وتی: بەڕاستی ئەو کاروانە لە کابولەوە هاتووە؟

یەکێك لە برادەرانی نیهمۆ وەڵامی دایەوە، وتی: شازادە وا دەڵێت. هیوادارم کە لای هەندێکیان تۆزێك "تلیاك"یان پێبێت. نیهمۆ تەماشایەکی برادەرەکەی کرد و دەستی لەسەر مشتۆی خەنجەری بەرپشتێنەکەی توند کرد و بە هێواشی وەرگەڕایەوە و تفێکی کردەوە سەر زەوی و بەرەو چادرەکەی ئۆلاتای ڕۆیشت.

لەو کاتەدا پیاوێك لەسەر کردەوەکەی نیهمۆ وتی:

نیهمو پیاوێکی بەدخوو شەڕانییە یەکێك لە سەربازەکان وتی: بەڵێ ئەو وایە، بەڵام کاتێك خراپتر و بەدخوتر دەبێت کە پارچەیەك "تلیاك"ی لە دەمدابێت. ئەگەر چاودێرییەکی ورد و بەردەوامی نەکرێت، یەکێك لەو گەنجانە دەکوژێت، بەڵام یەکێك لە پیاوەکان گەڕایەوە و وتی:

-بەڵام ئۆلاتای بۆچی لای خۆی گلی داوەتەوە و چاو لە خراپەکانی دەپۆشێت؟

یەکێکی تر وەڵامی دایەوە و وتی: دیارە "کورغان" ئارەزووی لێیە لە بەر هۆیەك لە هۆیەکان دووری بخاتەوە. ئەو پیاوە پیرە زۆر پیر بووە، لە ساڵی ڕابووردووەوە وەك جاری جاران نەماوە. یەکێك لە سەربازەکان پرسی‌و وتی:

-بەڵام، ئەو بمرێت کێ جێنشینی ئەو دەبێت؟

سەربازێکی تر وەڵامی دایەوە وتی: "لاداخ" یەکێکە لە نەوەکانی بنەماڵەی کورغان. بەڵام "لاداخ" پیاوێکی زۆر لاوازە. هەروەها پیاوێکی تر، ناوی "حسێن"ە ئاواتەخوازە، لەسەر تەختی شاهێنشاهی دابنیشێت. بەڵام حسێن پیاوێکی گێل و بێ مێشکە و بێ ئەزموونە.

بەڵام من بڕوام وایە ڕۆژێك لە ڕۆژان، کەسێکی بەهێز و توانا جڵەوی کار دەگرێتە دەست و ئەو دوو پیاوەش لەسەر ڕێگای خۆیدا دووردەخاتەوە.

-سەربازێکی ڕەش بین وتی: کاتێك کە "کورغان"ی پیرەمێرد دەمرێت. دۆزەخ دەتەقێت و ئاگرەکەی دەهاوێت بۆ وڵاتی تەتەر و شاهێنشای "مەغۆل" وڵاتمان داگیردەکات و ئەو کاتەش کوڕە گێل و بێ مێشکەکەی بە شێوەیەکی تەواو دەکات بە فەرمانڕەوای "سەمەرقەند".

ئێمەش هەمووومان ئەو ڕێکەوتننامە کۆنەمان دەزانی کە لەسەر لاپەڕە پۆڵایینییەکان هەڵکەندرابوون و دەقەکەی تیا نووسرابوو، کە خانەوادەکانی "کابول" (وەچەکانی جەنگیز خان‌و کۆبلای خان) پێویستە وەك شاهینشا و خان فەرمانڕەوایی بکەن و خانەوادەکانی "کابول" کە (کورغان و باوکم لە وەچەکانی بوون) پێویستە وەك سەرکردەی لەشکر و پاراستن و پارێزگاری شا و خانەکان بن. وە هەموووشمان دەمانزانی "ئەلیاس خان" کە لە -سەمەرقەند-

بوو پیاوێکی هیچ و پووچ و کەسایەتییەکی لاوازی هەبوو. بەووە گەمەیەك بە دەست "کورغان"ەوە، چۆنی بویستایە بۆ ئامانج و مەبەستی تایبەتی خۆی هەڵیدەسووڕاند.

وە ئێمەش بڕوامان نەدەکرد و گومانیشمان لەوە بوو لە "تاغلوك شا" پاش ئەو تێکشکاندن و لێدانە پشتشکێنەرەی بە دەستی "کورغان" چەشتی بێ ئەوەی جەنگێکی گەورەتر بەرپا بکات ببێتە سەرۆکی تازەی وڵات.

لەو کاتەدا چادرەکان پڕبوون لە خەڵك و وەك پوورەی هەنگ ژاوەیان لێوە دەهات. تۆزێك چوومە پێشەوە و سەرنجی سەربازەکانم دەدا... وڵاخەکانیان زین دەکرد و لغاویان دەکردن. و ئاڵاو چەکەکانیان بەرزدەکردەوە. ئەوکاتەی فەرماندەکان بەسەر شوێن و جێگای سەربازەکاندا دەگەڕان و تەماشایان دەکردن. منیش بۆ شوێنی نمایشکردن چووم و لەگەڵ عەبدوڵڵادا کە لەگەڵ کۆمەڵانی خەڵکیدا چاوەڕوانی نمایشیان دەکرد بۆئەوەی تەماشا بکەن و چاویان بە دیمەنە جوانەکانیان گەش و زاخاو بدەنەوە یەکمانگرتەوە.

کتوپڕ تەپڵ لێدرا و فوو بە شەیپووردا کرا و سەربازەکان ڕیز بوون و لە کاتێکدا کە سەربازەکان بە نمایشێکی جوان و ڕێکوپێك دەڕۆیشتن و قەڵغانەکانیان دەدرەوشایەوە و چەکەکانیان دەبریسکایەوە و ئاڵاکانیان دەشەکایەوە و ئەسپەکانیش بە سمەکانیان دەیاندا لە زەوی. هەستم بە هەستێکی خۆش کرد و فێنکایەتی بەسەر سینەمدا گەڕا. لەگەڵ ئەوەدا کە سەربازگەکە لە پێش چاومدا بچووك بوو. چونکە بیری منداڵی خۆمم کەوتەوە کاتێك کە سەرنجی باوکم دەدا، لە کاتێکدا نمایشی بە سەربازەکانی دەکرد، بە تایبەت لەم دەشتەدا کە ژمارەیان لە هەزار زیاتر بوو.

دڵم بەردەوام لێی دەدا کە سەربازەکانی "ئیلشی" نمایشیان دەکرد بە تایبەت لەو کاتەی تیپەکەی ڕاوەستا بۆئەوەی سەرلەنوێ بگەڕێتەوە و نمایشێکی تر لەژێر سەرپەرشتی "ئۆلاتای"دا دەستپێبکاتەوە. خەم و بێزاری دڵمی داگرت لە کاتێکدا بۆم دەرکەوت دەورەی سوارە "ئیلشی" لە "شەهری سیبز"دا کۆتایی هات. لەبەرئەوە لە شوێنی نمایشەکە هاتمە دەرێ و بەرەو کاروانەکە کەوتمەڕێ بۆئەوەی لەو کاتەی ڕۆژئاوا دەبێت و کۆتاییش بە مانگی ڕەمەزان دێت شتێك بخۆم لەگەڵ ئەوەی ڕۆژ ماوەیەك بوو کەوتبووە پشت شاخەکانی باشوورەوە تەنها تیشکێکی درەوشاوە لەو دۆڵەوە دەهات کە ڕووبارەکە پێیدا دەڕۆیشت. و چادرە گەورەکانی فارسییەکان بە درێژایی ڕۆخی دەریاکە دەبریسکاندەوە.

ئەو جووتیارە ئێرانییانەی، میوەی تازە و کاڵەکیان لە نێوان چادرەکاندا دەفرۆشت، لەوکاتەی کە دەگەیشتمە لایان و بە تەنیشتیاندا تێدەپەڕیم بە ڕێز و گەورەییەوە ڕێگایان بۆ دەکردم. وە لەبەرئەوەی ئەو جووتیارانە ڕێز و گەورەییان لە ئاستمدا دەردەبڕی و بە شازادە بانگیان دەکردم و ئەو خەڵکانەش بە لامدا ڕەت دەبوون بە گەورەیی و ڕێزەوە تەماشایان دەکردم. وە لەو کاتەی کە بانگی ڕۆژئاوا درا و کۆتایی بە مانگی ڕەمەزان هات. لە زۆر لاوە لە لایەن زۆربەی زۆری بازرگانەکانەوە بۆ نانخواردنی ئێوارە بانگهێشتن و فەرمووم لێکرا.. هەروەها زۆر بانگهێشتنم لەنێو چاوە بە شەرمەکانی کیژە لادێییەکاندا دەخوێندەوە، ئەو کیژە لادێییانەی سەبەتە میوەیان بە دەستەوە هەلگرتبوو. بەڵام من وام دەهاتە پێشچاو، ئەو کیژە لادێییانە خاوێن نین، چونکە پەیڕەوی فەرمایشتەکانی قورئانی پیرۆز ناکەن، لە پێویستی پاك و خاوێنی خۆیان و پاك و خاوێنی جل و بەرگیاندا لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانم بڵێم عەبدوڵڵا کە لە دوامەوە خۆی کێش دەکرد وەك پیشەی خۆی زیاتر لە من بە دەم تەماشاکردنەوەکانیانەوە دەچوو. چونکە کیژەکانم دەبینی بە شادی و ڕووخۆشییەوە چاویان لە عەبدوڵڵای نۆکەرم دەبڕی. ژمارەیەك لە بازرگانەکان پێشانگاکانیان دانابوو تاکو شتومەکە جۆربەجۆرەکانیانی تیا بڵاوبکەنەوە. هەروەك من بە هۆی موگناتیسێکی بەهێزەوە کێش بکرێم ئاوا لە دواییدا لەبەردەم دوکانێکی قەڵفان فرۆشی فارسیدا ڕاوەستام. کە چەکەکانی بۆ پیشاندان لە بەردەم تیپێکی سەربازی نامۆدا ڕێکدەخست.

لەبەرئەوەی ڕۆژئاوا ببوو، بازرگانەکە ژمارەیەك مۆمی بە دەوری پێشانگا بچکۆلەکەدا داگیرساندبوو. ئەو مۆمانە تیشکەکانیان دەدایەوە و دەیدا لە دەمی شیرە ساوەکان و سەر خەنجەرە جۆراوجۆر و سەرقەڵغانە پۆڵایینەکان کە وێنەی جۆراوجۆریان لەسەر هەڵکەندرابوون.

ئا لەم کاتەدا چاوم بە جوانترین شیر کەوت کە لە ژیانمدا شتی وام نەدیبوو چاوم بۆی ئەبڵەق بوو. ئەم شیرەش تەنها شیرێك بوو کە لە ژیانمدا چاوم لێی تێر نەدەبوو، ئارەزوومەند بووم کە دەستم بکەوێت، شیرەکە مشتۆیەکی جوانی هەبوو بە گەوهەر ڕازابۆوە و کیفێکی هەبوو بە وێنەی جوان ڕازابۆوە. لە جوانیدا بە جوانترین و نایابترین و شارەزاترین و وردترین دروستکراوی چەکی فارسی دەژمێرا.

کتوپڕ بازرگانەکە بۆ ئەو شیرە هەستی بە حەز و ئارەزووەکەی کرد. هەرکە زانیشی من پیاوێکم لە چینە خانەدانەکان، چونکە عەبدوڵڵا گشت کات وەك نۆکەرێکی گوێڕایەڵ لە

پشتمەوە دەوەستا. بازرگانەکە زۆری لێدەکردم و سوور بوو لەسەر ئەوە هەر ئێستا شێرەکە بەرم، مشتۆی شێرە جوانەکەم بەدەست گرت. بە تەواوی لەگەڵ لەپی دەستمدا دەگونجا. بە پەنجەی بەرزەلووتەم لە دەمەکەیمدا. ئەو ڕەنگە و دەنگدانەوەیەی نیشانەی ئەوە بوو کە ئەو شێرە لە باشترین پۆڵای جیهان دروستکراوە. بازرگانەکە زۆری لێکردم کە شێرەکە ببەم. و پێی وتم: بەڕێز شازادە ئەم شێرە شایانی تۆیە. تەماشای کیفەکەشی بکە دەبینی کە ئەوە شتێکە و مافی خۆتە. لەبەردەم "خان"دا هەڵیگریت و شانازی پێوە بکەیت.

لەگەڵ ئەوەشدا نرخەکەی هەرچەندێکیش بوایە من نەمدەتوانی شێرەکە بکڕم. بە دلگەرمییەکەوە لە بازرگانەکەم پرسی:

-نرخی ئەو شێرە چەندە؟

بازرگانەکە بە تەماشاکردنێکی قووڵەوە سەیری کردم، چونکە وایدەزانی، من لە نرخەکەیدا سەودای لەگەڵدا دەکەم.

-وتی: بەڕێز شازادە نرخەکەی هەزار دینارە.

شێرەکەم بە دەستەوە گرتەوە و سەرنجێکی چاکی شێرەکەمدا.

وەڵامی بازرگانەکەم دایەوە:

-ئەمە نرخێکی زۆر گرانە..!!

-من لەبەر خاتری شازادەی "شەهری سیبز" دەتوانم نرخەکەی دابشکێنم بۆ هەشت سەد و پەنجا دینار.

-نەخێر!! من ناتوانم هەشت سەد و پەنجا دینار بدەم.

-هەرچەندیش کە من لە فرۆشتنیدا زەرەریش دەکەم. قەیناکە من نرخەکەی دەکەم بە تەنها هەشت سەد دینار.

-بەڵام ڕێم بدە با بە شێوەیەکی باشتر سەرنجی بدەم. پاشان هەڤاڵە سەرکردەکەم دەهێنم تاکو بیبینێ و خۆشم بیری لێدەکەمەوە.

بە داخەوە شێرەکەم لە شوێنەکەی خۆی دانایەوە و ڕووم وەرگێڕا بۆئەوەی شوێنەکە جێبهێڵم. بەڵام ئەوەندەی نەخایاند بازرگانەکە ڕووی تێکردم و وتی:

-شازادەی گەورە و بەڕێز!! داوای لێبووردن دەکەم. پێشەکی تکات لێدەکەم ئەم خەڵاتەم لێوەربگریت.

خێرا خەنجەرێکی فارسی کەوانەیی بێ نرخی دەرهێنا و وەك خەڵاتێك خستیە دەستمەوە و پێی وتم:

-بەڕێز شازادە بیری لێبکەرەوە و دوای نوێژی ئێواریٚ بۆ ئێرە وەرەو ئەگەر هەڤاڵە سەرکردەکەت شیرەکەی بە دڵ بوو، ئەوا من نرخەکەی دەکەم بە حەوت سەد و پەنجا دینار. لەوکاتەدا دەنگی بانگدەری ئێوارە بە هەوا ساردەکەدا بەرزبۆوە. خێرا ئیمانداران بە چۆکدا هاتن و دوعایان کرد و نوێژەکانیان دابەست و دەستیانکرد بە نوێژکردن.

منیش عەباکەم ڕاخست و عەبدوڵڵاش مێزەرەکەی سەری ڕاخست و لەگەڵ کچێکی لادێییدا بەشیان کرد تاکو نوێژی لەسەر بکەن. سەرم سووڕما لە عەبدوڵڵای نۆکەرم ڕووی نوێژی و داواکارییەکانی لە کێ دەکات.!!

پاش چەند چرکەیەك پیاوانی کاروانەکە ئەوانەی عەمامەی گەورەیان لەسەردا بوو، پاسەوانەکانیش کە خودەی پۆڵاییان لەسەردا بوو خێرا بۆ لای شاگری خێمەکانەوە چوون، بۆئەوەی نانی ئێوارە بخۆن و ڕۆژووەکانیان بشکێنن و کۆتایی بە ڕۆژووگرتن بهێنن. چونکە ئەو ڕۆژە دواڕۆژی مانگی ڕەمەزان بوو. بە تەواوی عەبدوڵڵام لێ ون بوو، بەڵام بێگومان بووم لەوە کە لە یەکێك لە چادرەکاندا خواردنی تەواو دەخوات. بەڵام من بەسەربەستی لە نێوان چادرەکاندا دەڕۆیشتم لەملا شیشێ گۆشتم وەردەگرت و لەولاشەوە لەگەڵێ چێشتی بەتام و لەزەتم وەردەگرت. و لە هەموو لایەکیشەوە پێکە عارەقم وەردەگرت. لای هەموو ئەوانەی کە میوانداریان دەکردم خواردنێکی کەمم دەخوارد. وە بە دەستی ئەنقەست جار لە دوای جار بە بەردەم چادری چەك فرۆشەکەدا دەڕۆیشتم بۆئەوەی چاوم تێر بکەمەوە بە تەماشاکردنی شیرە جوانەکە و دڵنیا بم لەوەی کە هەر لای فرۆشیارەکە ماوەتەوە. و بە لایەنی کەمەوە تاکو سەرکردە ئیلشی دێت و بەڵگەیەکی ترم دەبێت، جارێکی تر ئەو شیرە بە دەستمەوە بگرمەوە و چاوەکانم بە تەماشاکردنی بڕێژم، یان بە دەست لێدانی و هەڵگرتنی. لە دواییدا ئیلشی و ئۆلاتای سواری ئەسپەکانیان بوون و پاشان لە نزیك پردەکەوە بەستیاندنەوە و منیش پێشوازی هەردوو سوارەکەم کرد و بەرەو چادری چەك فرۆشەکەم بردن. پاشان ئاماژەم بۆ ئیلشی کرد کە تەماشای شمشێرەکە بکات. لێمپرسی و وتم: ئایا ئەمە جوانترین شیر نییە کە لە ژیانتا بینیبێتت؟

"ئیلشی" شیرەکەی لە دەست بازرگانەکە وەرگرت و بە سەرنج و تێڕوانینێکی وردەوە تەماشای کرد. پاشان بە هێمنی و لەسەرخۆوە، وەڵامی دامەوە و وتی:

-تەیموور بەڕاستی ئەمە شیرێکی زۆر جوان و نایابە..!!

بە پەلەپیتکە کێشای بە دەمی شیرەکەدا و بە کەیف و ئارەزووەوە گوێی بۆ دەنگەکەی گرت، تۆزێك بۆ دواوە کشایەوە و سەرنجی ڕوویم دەدا کە شیرەکەی هەڵدەسووڕاند بەلای ڕاست و بەلای چەپ و بۆ خوارەوە و بۆ سەرەوە و بۆ پێشەوە و بۆ دواوە. هەرکە نیشانەی ڤایلبوون و شادی لەسەر ڕوویدا وێنەی کێشا. من هەستم کرد ئەو خۆی بە ڕاستی و شانازییەوە ئەو شیرە بە شازی شمشێر دادەنێت.

ئۆلاتای لە تەنیشتمانەوە بێ ئارام ڕاوەستابوو. تاکو ئیلشی سەری دانەواند و نووکی شیرەکەی گرت و مشتۆکەی بەرەو لای ئۆلاتای درێژکرد بۆئەوەی تەماشای بکات و لێی وردبێتەوە. خێرا ئۆلاتای وەرگەڕایەوە و مشتۆی شیرەکەی بە شادی و ئارەزووەوە وەرگرت. و پاش ئەوەی بە وردی تەماشای کرد. دەمی شیرەکەی ڕاوەشاند و وتی:

-بەڕاستی ئەمە شیرێکی دانسقەیە!!

ئەوکاتەش ئیلشی سەری خوارکردەوە و قسەکەی ئۆلاتای پەسەند کرد. و ئەوەندەی نەخایاند ئۆلاتای شیرەکەی بۆ لای من درێژ کرد. بە گورجی و کتوپڕییەکی بێ وێنەوە دەستم ڕاکێشا و بە ئارەزوویەکی زۆر زیاد لە ئارەزووی ئیلشی و ئۆلاتای شیرەکەم وەرگرت و منیش دەستم کرد بە تاقیکردنەوەی شیرەکە. تاقیکردنەوەکەم بە جووڵاندنێکی زۆر شارەزایانە کۆتایی پێهێنا. کە ئیلشی خۆی لە بەکارهێنانی شیردا فێری کردبووم.

ژمارەیەکی زۆر لە پیاوانی ئیلشی لە دەورمان کۆببوونەوە و دەوری کابرای فرۆشیاری چەکیان دابوو. زۆر بە گرنگی و سەرسووڕمانەوە تەماشای شیر و خەنجەرەکانی کابرایان دەکرد.

ئیلشی بۆئەوەی ئارەزووی خۆی و ئارەزووی منیش تێربکات و حەز و ئارەزوومان دەبەرکێنێتەوە شیشێکی لەسەر زەوی هەڵگرت و بەدەست بەرزیکردەوە بۆ سەرەوە و تۆزێك بۆ دواوە گەڕایەوە و بە جووڵەیەکی شارەزایانەوە شیرەکەی ڕاوەشاند و پاشان لە شیشەکەی دا و لە چاوتروکاندنێکا دوو کەرتی کرد.

لە دواییدا ئیلشی پاش ماوەی شیشەکەی بەرزکردەوە و لێیدا و کەرتی کرد. ئاوا یەك لە دوای یەك کەرتی کرد. تا هیچی لە دەستدا نەمایەوە پارچەیەکی بچووك نەبێت. و دواترین شت کە کردمان "ئیلشی" پارچە شیشە بچووکەکەی لەسەر خودەکەی دانا. و منیش شیرەکەم بە شارەزاییەکی تەواوە لە پشتی سەرییەوە ڕاوەشاند و بە خێراییەکی بێ وێنە و شارەزاییەکی تەواوەوە لە پارچە بچووکەکەم دا و کردم بە دوو کەرتی وەك یەکەوە و لەسەر سەری ئیلشی خستمە خوارەوە، بێ ئەوەی لە خوودەکەی بدەم یان زیانی بە هیچ جۆرێك پێبگەیەنم.. لەم

کاتەدا ئیلشی سەری دانەواند و بە سەرسامی و حەپەساوییەوە دەستی کرد بە ژماردنی پەنجەکانی و هەناسەیەکی هەڵکێشا و ددانی جیڕکردەوە و بە ئۆلاتای وت:

-ئەم پیاوە وەك من باوەڕم پێیەتی پاشەڕۆژێکی گەورەی هەیە. ئۆلاتای بە دڵنیاییەوە وەڵامی دایەوە و وتی:

-بێگومان ئەمە پیاوێکی بەختەوەر و گەورەی لێ دەردەچێت. زۆرم پێخۆش بوو، لەم کاتەدا ئیلشی بە ڕێزەوە تەماشای دەکردم. وەك ئەو ڕێزگرتنەی لەوەوپێش کە بۆ نانخواردنی نانی بەیانی لەگەڵ خۆیدا بانگی کردم لە چاوەکانیدا ڕێزگرتنێکی نوێم دی. بەڵام نەمتوانی بزانم ئایا ئەو ڕێزە ڕاستە یان درۆیە. کۆمەڵبوونی سەربازەکان لە دەوری چەك فرۆشەکە لەو تەنگوچەڵەمە گرانە ڕزگاری کردم. چونکە بێگومان دەبوو دووبارە ددان بەوەدا بنێم کە من ناتوانم شیرەکە بکرم. لە کاتێکدا سەربازەکان بە دڵبوونی خۆیان بۆ چەکەکانی فرۆشیارەکە دەردەبڕی، لەو کاتەدا کە فرۆشیارەکە بە تەواوی سەرگەرمی سەربازەکان بوو. من و ئیلشی و ئۆلاتای لە نێوان چادرەکانەوە بۆی دەرچووین و ڕۆیشتین.

ئاوازی مۆسیقای خۆش و دەنگی لێدانی تەپڵە بچووکەکانی ڕایانکێشاین بۆ ئەو کۆڕی پیاوانە کە بە چوارمەشقی لە بەردەم خێمەی بازرگانێکی کۆیلەفرۆشدا بەستبوویان. لەناو کۆڕەکەدا دوو کەنیزەکی فارسی نیوەڕووت لە سەمایەکی سەرنجڕاکێش ئارەزووبزوێندا خۆیان بادەدا پێش ئەوەی بچمە ناو تەماشاکەرانەوە، تەماشایەکی کوڕەکەم کرد تاکو بزانم کەسیان لێدەناسم. چونکە باوکم لەمەوپێش نەیدەهێشت نزیك کاروان بکەومەوە، لە تەماشاکردنی کەنیزەکەکان و ئەو شتانەی کە کۆیلەفرۆشەکان دەیانفرۆشتن دووری دەخستمەوە. بڵێسەی ئاگرەکانیش لە نزیك کۆڕی پیاوەکانەوە داگیرسابوون. لەناو کۆڕەکەدا "نیهمۆ"م دی بە شارەزایی دوو کەنیزەکەکە بێهۆش و سەرمەست ببوو. کە بڵێسە ئاگرەکان بە شێوەیەکی باشتر ڕووناك کرانەوە توانیم هاڵاوسانێك لە گوویی "نیهمۆ"دا ببینم. هەروەها بینیم پارچەیەك تلیاك کاوێژدەکات و دەیمژێت. و لیکەکەی بە سەر چەناگە و دەمیدا دەهاتە خوارەوە. لەو کاتەدا ئیلشی فەرمانی بەسەر پیاوەکاندا دا، بۆ دانیشتن جێگامان بۆ چۆڵ بکەن.

لە ڕیزی پێشەوە دانیشتین. خۆجووڵاندنی دوو سەماکەرەکە کاری لە هۆش و ئارەزوومان کردبوو، لە کاتێکدا، ناوقەد و سمتیان بە ئاسانی و شارەزاییەکی بێ وێنەوە دەلەرزاند. پیاوەکانی دەوروبەرم دەیانقیژاند و هەندێ وشەی نابەجێشیان دەوت. و بە توندی پێدەکەنین و چەند قسەو قسەلۆکیشیان دەدا بە ڕووی دوو سەماکەرەکاندا. لە کاتێکدا کچەکان لەبەردەمیانەوە

تێدەپەڕین. بە خێرایی و توندییەوە لەبەردەم چاوە داپچڕاوەکانیان و دەمە داچەقاوەکانیاندا لەشیان دەلەرزاندەوە. پیاوەکان پارە و خشڵی بێبەهایان بۆ فڕێ دەدانە ناو کۆڕەکەوە و مافی کەنیزەکەکە بوو کە ئەو خشڵ و پارە کەمانەی فڕێدەدرانە ناو کۆڕەکەوە بۆ خۆیانی هەڵبگرن. بەڵام کابرای کۆیلەفرۆشی خاوەنیان بە ئارەزووی خۆی هەڵیدەسووڕاندن و پارەیەکی زۆریشی دەست دەکەوت کە دەیدان بە.. ن ئاوا، هەرکە سەماکە کۆتایی پێهات هەندێ پیاو هەستان و چوون بۆ لای کابرای کۆیلەفرۆش کە لە بەردەم چادرەکەیدا ڕاوەستابوو. دەستیانکرد بە سەوداکردنی دوو کچەکە. ئەو دوو پیاوەی پارەی زۆرتریان دا هەریەکەیان کچێکیان بردە ناو چادرێکی بچووکی کابرای کۆیلەفرۆشەوە!! ئاوا بۆ جاری دووەم هەستم بە پێوەدانی هەژاری و نەبوونی کرد.

هەروەك نەمتوانی شیرەکە بکڕم ئاواش لە توانامدا نەبوو، یەکێك لە کچەکانم دەستبکەوێت. ئاوا گشت مەدالیایەك لە من قەدەغە بوو.

کە سەماکە کۆتایی هات و دوو کەنیزەکەکە ڕۆیشتن تەماشاکەران داوای سەمای زیاتریان دەکرد. کۆیلەفرۆشەکەش چووە ناو چادرەکەیەوە و هاتە دەرێ و لە پێش خۆیەوە کچێکی تری پاڵ پێوەنا. ئەم کچە هیچ چارشێوێکی بە ڕووەوە نەبوو. وا دیار بوو کە کۆیلەی یەکێك لە خێڵەکییە شاخاوییەکان بێت کە لە سەرووی "باداکشان"دا جێنشین بوون لە کاتێکدا، بە شەرم و ترس و خەجاڵەتییەوە بەرەو کۆڕی سەماکردنەکە دەڕۆیشت، ئەو کچە بە دەستەکانی چاو و ڕووی دادەپۆشی. وا دیار بوو، زۆر منداڵ بێت و تەمەنی بە هیچ شێوەیەك لە چواردە ساڵان زیاتر تێنەپەڕیبوو. لەو کاتەدا کابرای خاوەنی بە ڕەقی و تووڕەییەوە بەسەریدا خوڕی. کچە بە دوودڵییەوە دەستەکانی لەسەر سەری لادا و دەستیکرد بە لاساییکردنەوەی دوو کچە گەورەکەی، تۆزێك لەمەوپێش سەمایان دەکرد. بەڵام سەرلێشێواو و ترسنۆك دەینواند و دوو مەمکەکانی هێشتا باش پێنەگەیشتبوون و سمتە ناسکەکانی شێوە و ڕەنگێکی تایبەتیان لە سەماکەیدا دەنواند. لە چاو ئەو ڕێکوپێکییە جوانەی دوو کچە سەماکەرە شارەزاکەی پێشوو دەیانکرد، لە سەماکەی ئەمدا نارێکییەکی جیاوازی تەواوی هەبوو.. هەرچۆنێك بێت، کچەکە دەیزانی لە دواییدا چی چاوەڕوانی دەکات. لەبەرئەوە دەستیکرد بە بادانی لەشە بچووکە ناسکەکەی و جووڵاندنی لەشە ڕووتەکەی و لەبەردەم کۆڕی پیاوەکانەوە تێدەپەڕی. لەڕاستیدا ئەم کچە ئارەزووی پیاوانی نەبزواند. لە ئاستیا بێدەنگ و هێمن بوون. و کەسیش پارەی بۆ هەڵنەدەدا. جگە لە نیهمۆ نەبێت، کە زۆر زیاد سەرنجی ڕاکێشابوو. کەسیش هەڵنەستا سەودا لەسەر لەشی بکات!!

"نیهمۆ"ش به چاوه تیژەکانی هەر بە دوایەوە بوو. هەر کاتێکیش کچەکە لەبەردەمییەوە تێپەڕیایە پارەی فڕێ دەدایە بەر قاچەکانییەوە. وە بۆ دواجار مستیلەکەی لە پەنجەی داکەند و بۆی هاویشت. کیژەکە ئەو شێتییەی لەچاوو پاشماوەی تلیاکەکەی لەسەر چەناگەیدا دی، ترسا و خۆی لێ دووردەخستەوە و بە بەردەمیدا تێنەدەپەڕی و تەماشای نەدەکرد.

بەڵام بەهەر هۆیەك بێت هەموو ئارەزوو و ڕووپێدانی خۆی بە من دابوو. پاشان لەبەردەممدا ڕاوەستا و بە شێوەیەکی پێکەنیناوی و خۆشویستنەوە دەستیکرد بە لەرزاندنی لەشە ناسکەکەی. کونە لووتمی پڕ لەو بۆنە گرنمە عەتراوییە کرد کە لەشی پێ چەور کردبوو. کاتێك خۆی بەسەرمدا چەماندەوە سنگە ناسکەکەی و مەمکە بچووکەکانی خشاند لە نێوچەوان و قژی سەرم. حەز و ئارەزوویەکی تەواوم، بۆی جووڵا. بەڵام ئەو ئازارەی لە جەرگ و هەناومدا بوو، وەك ئەو ئازارە وابوو کە لە دڵمدا بوو. چونك نەمتوانی شیرەکە بکرم. و لە ڕاستیشدا من نە شیرەکە و نە کچەکەشم نەتوانی بەدەستبهێنم.

بەڵام ڕۆڵوپێدانی کیژەکە بە من و تەماشاکردنی بۆم و پێکەنینی تەماشاکەران، هەڵیاندەنام کە کیژەکە بگرمە باوەشم، ئارەزووی "نیهمۆ"ی گۆڕی بە پەرۆشییەکی ناهەموار و ئیرەییەکی نابەجێ. بەڵام پێش ئەوەی بزانم چی ڕوویداوە.

"نیهمۆ"ی ڤین لەدڵ بەدەستی چەپی خەنجەرەکەی دەرهانی و بۆ پێشەوە دەرپەڕی. پاشان بینیم مەچەکی کیژەکەی گرت و بە توندی بۆ پێشەوە ڕایکێشا و لە هەمان کاتیشدا زریکانی و ڕوویکردە کیژەکە و وتی:

-کاتی خۆی بە تەماشاکردنی ئەم بێعەقڵە خەڵەفاوەوە بە فیڕۆ مەدە!!

پاشان خەنجەرەکەی بەرەو ملم هاویشت. بەڵام کیژەکە، هەرکە هەستیکرد زەلامێك لە پشتەوە گرتی ڕاچڵەکی و بە گورجی وەرگەڕایەوە ڕێکوپێکی نیهمۆی تێکدا و ژیانی منی ڕزگار کرد. بە گورجی خەنجەرەکە بە پێش سەرمدا ڕەت بوو، پێی پیاوێکیش لە پشتەوە کێشای بە پشتمدا. ئاوا چەمامەوە و لە ژێر باڵی "نیهمۆ"وە بۆی دەرپەڕیم. لە نێوەندی کۆڕەکەدا لەسەر قاچەکانم ڕاستبوومەوە، و بە دەستم خەنجەرەکەم هەڵکێشا.

نیهمۆ وەرگەڕایەوە تاکو بەرەنگارم بێتەوە و بەرهەڵستیم بکات. بەڵام کە دی من خەنجەرەکەم دەرهێناوە، کیژەکەی بەردا و بە خێرایی بەدەستی ڕاستی شیرەکەی دەرهێنا و بەرزی کردەوە. لەو کاتەدا ئیلشی هاواری بۆ کردم و وتی:

-تەیموور ها ئەوە شیرەکەم بیگرە!!

لەوکاتدا پیاوان گشتیان بە پێوە ڕاوەستابوون. تەماشای "ئیلشی"م کرد بینیم خەریکە بە گورجی قایشی شیرەکەی دەکاتەوە. و بە گورجی لە کالانەکەی دەرهێنا و بۆی هاویشتم. خەنجەرەکەم فڕێدایە سەر زەوی و بەرەنگاری نیهمۆ بوومەوە. و لە هەمان کاتیشدا بە گۆشەنیگام سەرنجی شیرەکەی ئیلشیم دا کە بەرەو ڕووم دەهات.

هەستمکرد نیهمۆ وا دەزانێت، من بۆئەوەی شیرەکە بگرم بۆ پێشەوە خۆم دەچەمێنمەوە. بەڵام من لە بری ئەوەی وا بکەم. یەك هەنگاو بۆ دواوە کشامەوە و لەو کاتەی کە لە نزیك ناوەڕاستی لەشمەوە تێپەڕی مشتۆی شیرەکەم گرت.

ئەگەر من بۆ پاشەوە نەگەڕامایەوە و بۆ پێشەوە بچەمامایەتەوە ئەوا دەمی شیرەکەی "نیهمۆ" بەرم دەکەوت و دەیکوشتم. لەگەڵ ئەوەشدا نیهمۆ تا ئەوکاتەش کۆنترۆڵی هەڵوێستەکەی کردبوو. چونکە من ئەوکاتە ڕێك وەستانی خۆمم لەدەست دابوو. وە نەمدەتوانی هێشتا ڕێك ڕاوەستم و بە شێوەیەکی باش شیرەکەم بەکاربهێنم.

خێرا نیهمۆ بە هۆش خۆی هاتەوە و بەرەو پێشەوە هات و دەستی چەپی خستە سەر سنگی بۆئەوەی بە دەمی خەنجەرە چەماوەکەی بەرهەڵستی لێدانەکەم بداتەوە و ڕێگا بە شیرەکەشی بدات و بیکات بەسەر دڵمدا. چونکە من نەشڵەژابووم هەستم بە هێمنایەتییەکی تەواو کرد و نیهمۆش لە تووڕەییەکی سامناکدا دەکوڵا. لە ناوەڕۆکی تووڕەییەکەی و مەبەستی قینەکەی تێگەیشتم. کەوا بەشێك لەو ڕاهێنانەی ئەو و دۆستەکانی فێری بوون ئەوە بوو پێویستە لەسەریان، بە تووڕەیی و قینەوە لەگەڵ کەسانی دوژمنانیاندا شیربازی بکەن.

هەتا ئەوکاتە ئەوەی من دەمتوانی بیکەم ئەوە بوو هەر بۆ پاشەوە بگەڕێمەوە. بۆئەوەی لە توانامدا هەبێت ماوەی تەواو بە شیرەکەم بدەم بۆ جووڵان و قوتاربوون. کە شیرەکەم دەجووڵاند غیرەتی ئەوەم نەبوو، هەنگاو بۆ لاتەنیشت بنێم. وە مشتۆی شیرەکەشم وەرنەدەگێڕا بۆئەوەی دەمە تیژەکەی هەر لە بۆ پێشەوە و بۆ ناوەندێکی فراوانتر درێژ بێتەوە. هەر کە شیرەکەم بۆ سەرەوە بەرزکردەوە "نیهمۆم" دی دەستی چەپی دەجووڵێنێ تاکو خۆی لە لێدانی شیرەکەم دووربخاتەوە دەمی خەنجەرە چەماوەکەی بۆ ماوەیەك لەبەر تیشکی ئاگرەکەدا دەبریسکایەوە. بەڵام جووڵەی نیهمۆ هێواش بوو. لەو کاتەدا نووکی شیرەکەم و دەمە تیژەکەی دای لە نووکی خەنجەرەکەی و تا مشتۆی خەنجەرەکە چوو، دای بە مەچەکی نیهمۆدا و دەستی قرتاند و کەوتە سەر زەوی و لەسەر خۆڵەکە کەوتە سەماکردن.

بە خێرایی بۆ لای ڕاست هەنگاوم نا تاکو لە نووکی شیرەکەی نیهمۆ دووربکەومەوە، پاشان پاشەوپاش بۆ دواوە کشامەوە، لە دەوروبەرم و هەموو لایەکەوە دەنگی دەستخۆش بەرز بۆوە. بەڵام من هەستم بە ترسێکی زۆر سامناك کرد کە بە خوێنەکەمدا دەگەڕێت و هەموو دەمارەکانی گرتمەوە. چونکە زیاد لەوەی، من دەمویست ئازارم بە نیهمۆ گەیاند. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو لاوە تلیاك خۆرە، وا دیاربوو وەك هەست بە ئازار نەكات. و نەمیزانیبێت کە دەستی پەڕیوە وەرگەڕایەوە، زۆر زیاتر لە یەکەمجار بە شێوەیەکی ترسناك تەماشای کردم. منیش لەو کاتەدا هەمدیسان خۆم ئامادە کردەوە و "نیهمۆ" مەجبوری کردم کە شیرەکەم بەرزبکەمەوە تاکو خۆم بپارێزم. بەڵام لە کاتێکدا، بێهۆشانە دەستی چەپی بەرەو سنگی ڕاکێشا، بۆ یەکەم جار بینی خوێن لە دەستە فرتاوەکەی دەتکێت. ڕاچڵەکی و بە ترسێکەوە تەماشای منی کرد. پاشان تەماشای کۆڕی ئەو پیاوانەی کرد کە چاویان لە تێکشکاندنەکەی بڕیبوو. چاوەکانی بڕییە کەنیزەکە بچووکەکە، کەوا لەناو کۆڕی پیاوەکاندا لەسەر زەوییەکە لەو شوێنەی کە نیهمۆ پێش شیربازییەکە تێی فڕێدابوو دەلەرزی و بە چۆکدا هاتبوو کە بەو جۆرەی بینی دیار بوو شێتگیرییەکی تەواو بە خوێنیدا گەڕا. پاشان وەك گورگ و بەراز فڕیشکاندی و شیرەکەی بەرەو کیژەکە هاویشت، من تەنها کەسێك بووم کە لە توانامدا بوو، لە شوێنی خۆیدا رایگرم، ئەگەرچی ئەویش تۆزێك دوورە دەستم و دوور لە شیرەکەشم بوو. خێرا بەرەو ڕووی چووم و بەرگری کوشتنی کیژەکەم لێکرد.

شیرەکەم بۆ درێژکرد تاکو شیرەکەی ڕاگرم. خیلافی ئەو دەنگ و باسانەی کە بڵاوکراونەتەوە دەستەکەی تریشم نەپەڕاند. و ئامادەش نەبووم کە بیپەڕێنم. بەڵکو دەستیم شکاند و نووکی شیرە تیژەکەم لە کیژەکە دوورخستەوە. نیهمۆ لەو شوێنەی کە لێی کەوتبوو، ڕاکشا و دەستیکرد بە گریان، پاشان بە توندی و خیزەخیزێکی قایمترەوە کە لە سینەیەوە دەهات بە کوڵ گریا. پاشان لە خۆڵەکەدا لاشەکەی تۆپەڵ بوو. ئۆلاتای لەناو کۆڕی تەماشاکەراندا ڕاپەڕی و بەرەو لاشەی هەڤاڵەکەی هات. پاشان بە تووڕەییەکی شێتانەوە تەماشای کردم و مشتۆی شیرەکەی گرت. بەڵام دوو پیاوی ئازا لە پیاوەکانی ئیلشی ڕاپەڕین و لە تەنیشتمەوە وەستان و شیرەکانیان دەرهێنا بۆ ئەوەی بە ئازایەتی و دڵسۆزییەوە پارێزگاریم لێبکەن.

ئیلشی بەرەو ئۆلاتای دەرپەڕی و قۆڵی گرت و پێی وت:

-ئۆلاتای، تووڕە مەبەو لەسەرخۆ بە، ئەو لاشەیە هەڵگرە و دلگرانیش مەبە، تۆ پێویستیت بە پیاوێك نییە کە نەتوانێت بەرگری لە خۆی بکات.

پێویستیشە لەسەرت ئەوە بزانیت نیهمۆ شەڕەکەی هەڵگیرساند و ئەویش هەڵمەتی بردە سەر شازادە تەیموور. ئۆلاتای بە هێواشی چنگی خاوبۆوە و دەستی لەسەر مشتۆی شیرەکەی لابرد هەندێك پیاوی بانگ کرد تاکو یارمەتی بدەن و لەگەڵیدا نیهمۆ هەڵبگرن. ئیلشی شیرەکەی نیودرگرتم، و لەگەڵ سێ هەڤاڵەکەمدا، بەناو جەماوەرە هەڵچوو و شڵەژاوەکەدا ڕەت بووم. لە کاتێکدا بەسەر پردەکەدا دەڕۆیشتم. ئیلشی بە شێوەی ئاگادارییەوە دوواندمی، وتی: من بۆ تۆ وای بە باشتر دەزانم، تۆزێك چاوەڕوان بکەیت، و جارێ بۆ شاخەکان نەچیت تاکو لەگەڵ "کورغان"دا پەیمانێك دەبەستم. من ناشزانم ئۆلاتای چی دەکات. بەڵام ئێمە دەتوانین لەوە دڵنیات بکەین، هیچ کەسێکیش جارێکی کە ناتوانێت دەستدرێژی بکاتە سەرت.

هیچ شتێکم نەوت. لە کاتێکدا بە بەردەم چادری چەك فرۆشەکەدا ڕەت دەبووین. تەماشایەکی لای شیرەکەم کرد... بەڵام نە شیرەکەم دی و نە بازرگانەکەش، چونکە ڕۆیشتبوو. سەرسام مام لەوەی کە ئایا یەکێك شیرەکەی کڕیوە. یان بازرگانەکە لەگەڵ خۆیدا بردوویەتی؟

هەستم بە پەژارە و بێتاقەتی کرد، چونکە من شیرەکەم لەدەست چوو نەمتوانی بۆ خۆمی بکڕم. بەڵام دەربارەی نیهمۆ خۆشم نەمدەزانی هەستم دەربارەی ئەو چییە؟ بەڵام دەمزانی ئیتر لەمەدوا مزگەوت دانم پیانانێت و نامخاتەوە باوەشی خۆی. چونکە من ڕێگای چەك و شمشێرم گرت. هەرکەسێکیش ڕێگەی چەك و شمشێر بگرێت، ئەو کەسە ڕێگای بەزەیی ئایینی ناگرێت.

ئاشکراشە من ڕێگای چەك و شمشێرم بە ئارەزوو و دەستی خۆم هەڵنەبژارد. بەڵکو قەدەر ڕێکەوت خۆی خستمیە سەر ئەو ڕێگایە. شتێکی بێگومانیشە کە هیچ کەسێك بۆ یەکەمجار حەزناکات، ئارەزووش ناکات، ببینێت خوێن لە ئەندامێکی لەشی دێت.

ئیلشی لغاوی ئەسپەکەی خۆی، کە لای پردەکەوە بە گوڵ مێخێکەوە بەسترابۆوە کردەوە، ئەسپێکیشی بۆ من خواست تاکو سواری ببم و بچمەوە بۆ کۆشکی سپی. لە کاتێکدا کە بەرەو ماڵەوە دەڕۆیشتین. ئیلشی زۆر ئامۆژگاری کردم و ئاماژەی بۆ کردم چۆن لە شاخەکاندا خۆم بشارمەوە.

ئیلشی زۆر لە کۆشکی سپیدا نەمایەوە. و منیش چوومە ژوورەکەمەوە و بۆئەوەی ئەو شتانە کۆبکەمەوە کە بۆ کاتی ڕاکردنەکەم پێویستم پێی دەبێت.

پاش کەمێك هەستم بە جموجووڵی عەبدوڵڵا کرد و لێم ڕوون بوو کە ئەویش هاتووە لە ژوورەکەیدا بۆ ئەو شتانە دەگەڕێت کە پێویستی پێی دەبێت.

پاش چەند چرکەیەکی کەم گوێم لێبوو لە نزیك پەنجەرەکەمەوە فیکەیەکی کێشا، بە چرپە پێی وتم:

-بەڕێز شازادە من دوو ئەسپەکە ئامادە و تەیار دەکەم و لای باخی دارتووەکانەوە چاوەڕێت دەکەم.

عەبدوڵڵا خێرا ڕۆیشت و بەرەو تەویلەکان کەوتەڕێ.

* * *

## شێرە دزراوەکە

هەرکە کازیوەی بەیان دەرکەوت و درێدا بە تاریکایی شەو من و عەبدوڵڵا زۆر چووبووینە ناو ئەو شاخانەوە کە کەوتبوونە سەرووی ڕووبارەکەوە. شنەی شەماڵی ساردی بەیانی، لەو ڕۆژەی مانگی شەوالەدا بۆنی پاییزی لەگەڵ خۆیدا دەهانی. هەروەها ئەو شادی و خۆشییەی لەو بەرزاییەوە دەهات، هەستی بێتاقەتی و دڵتەنگی لە مێشکمدا نەهێشت.

ئەو بێتاقەتی و دڵتەنگییەی کە شەوی ڕابووردوو خەوی لێ زڕاندبووم هەتا ئێسترە تووك زبرەکان و ئەسپەکانمان کە پێویستییەکانمانی هەلگرتبوو، وا دەیاننواند کە بەو شنەبای بەیانە شاد و خۆشحاڵبن، و هیچ گوێیان نەدەدا بەو توولەڕێ سەخت و خوار و خێچ و ڕێگا لێژانە. وە لەو تەمومژە چڕەش نەدەترسان کە لەو ڕێگا و بانە تەسکانەی بەسەریدا دەڕۆیشتن، یان لە کاتی سەرکەوتنماندا دەمانبڕی و بەرەو ڕوومان دەهات. ماوەی هەفتەیەکی تەواو لە ڕەوکردنەکەماندا بەردەوام بووین. وە بە ڕێکی دۆڵی ڕووبارەکەدا دەڕۆیشتین. ڕۆژانە کەش و با وەك یەك وابوو، بەڵام شەوانە، شەو لە دوای شەو ساردتری دەکرد. ئەویش هەرکە مانگی شەوال کورتتر دەبۆوە و بەرزایی شاخەکانیش زیاتر بەرز دەبوونەوە.

لە ڕۆژانی یەکەمدا بەردەوام دەوەستاین و بێدەنگ دەبووین و گوێمان دەگرت، تاکو بزانین کەس شوێنمان نەکەوتووە، و ئاگری کەم و بچووکیشمان دەکردەوە، بەم هۆیە شەوێك پڵنگ هەڵمەتی بردە سەر وڵاغێکمان و کوشتی و لە دەستمان چوو.

دوای ئەوە بە درێژایی شەو ئاگری گەورەمان دەکردەوە. لە ڕۆژی پێنجەمدا، لە کاتێکدا بە ڕێگایەکی خوار و خێچی دەربەندێکی تەسکدا و لە لێواری دۆڵێکی زۆر قووڵەوە سەردەکەوتین لە لوتکەی شاخەکەوە تاشەبەردی زۆرمان بەسەردا درا. نەمانتوانی بۆ دواوە بگەڕێینەوە. هەروەها دەشترساین کە بەرهەڵستی ئەو پیاوانە بکەینەوە کە تاشەبەردەکانیان بۆ دەهاویشتین. چونکە

نێمە بە تەواوی ژمارەی ئەو پیاوانەمان نەدەزانی. هیچ ڕێگاچارەیەکمان لەبەردەمدا نەبوو، جگە لەوە نەبێت زۆر بە ئاگا و وریاییەوە بڕۆین و داهاتوومان بدەینە دەست قەدەر، ڕێکەوت و ژیانمان بخەینە بەردەستی بەختەوە، دەربەندەکە زۆر تەسك بوو. هەروەك لەملا و لەولایەوە بە تاشەبەرد، دیواری بۆ کرابێت وابوو.

هیچ بەرهەڵستییەکیش نەبوو کە لەو بەردانەی کە بە سەرماندا دەهاتنە خوارێ بمانپارێزێت. و دەربەندەکەش هیچ فراوان نەدەبۆوە. پیاوە شاخاوییەکانیش ڕێگای هیچ کەسێکیان نەدەدا کە بەو ڕێگایەدا بڕۆن. لەسەر ئەوەشەوە وڵاخەکانمان سەرنجی ئەو پیاوانەی ڕاکێشابوو، وە لە پێش چاویانا یەکسان بوون بە ژیانی دوو کەسی نامۆ.

پاشان قایشی زینەکەم کردەوە و خۆمم پێ پاراست و بە ئاگاییەوە بەرەو پێشەوە چووین. و لە دواییدا گەیشتینە سووچێکی دیوارە بەردانییەکە و ڕێڕەوێك کە پانتاییەکەی باری وڵاخێکی زیاتر هەڵنەدەگرت. ڕێڕەوەکە لای چەپییەوە فراوانتر بوو. "عەبدوڵڵا"م لەگەڵ وڵاخەکاندا بەرەو ڕێڕەوەکە نارد و خۆشم لە جێگایەکدا، کە دەیڕوانی بەسەر ڕێڕەوی دەربەندەکەدا و بەسەر لوتکەی شاخەکەدا دامەزراند. پاش چەند چرکەیەك گوێم لە دەنگی پیاوەکان و تەقە تەقی بەردەکان بوو کە لەژێر سمی ئەسپەکانیاندا لە ڕێڕەوەکەدا تەقەتەقی دەهات. کتوپڕ سەرکردەی ڕێگرەکان و پیاوەکانی دەرکەوتن و بە پێکەنینەکانیاندا زانیم، ئەمانە لە تیرەیەکی "تییست"ی ناوەڕاستی شاخی "بامیر"ن. ژمارەیان پانزە پیاو بوو. هێندەی ژمارەشیان وڵاخی بارهەڵگر و ڕاکێشانیان پێبوو. بە یەك ڕیز لە بەردەممەوە تێپەڕ بوون.

هیچ گوێیان بە دەربەندەکە نەدا و تەماشای دەوروبەریان نەکرد. جگە لە لاوێکیان نەبێت کە لە دوای قافڵەکەوە دەڕۆیشت. پاشان ئەو لاوەش لغاوی ئەسپەکەی لە گەرووی دەربەندەکەدا گرت و بە سێبەرەکەدا دەستی بە ڕوانین کرد. تیرەکەم لە ژێی کەوانەکەمدا بە ڕێکی ڕاکێشا، تا ڕیشەکەی نزیك گوێم بۆوە. تیرەکەم بەرەو ملی لاوەکە ڕێك ڕاگرت. تاکو بتوانم وای بکوژم کە هیچ دەنگێکی لێوە نەیەت. هەرچەندە برادەرەکانیش نەیاندەتوانی لە دەربەندە تەسکەکەدا وەرگەڕێنەوە.

بەڵکو نەشیاندەتوانی لە ئەسپەکانیان دابەزن و بۆ دواوە بگەڕێنەوە و یارمەتی بدەن. وا دیاربوو کوڕە لاوەکە لەوە دەترسا نەتوانێ لە ڕێڕەوە تەسکەکەدا تێپەڕێت. دوایی ئەسپەکەی تۆزێك بۆ دواوە گەڕاندەوە و بە ڕێڕەوە تەسکەکەدا دوای سەرکردەکەی کەوت.

پاشان کەوانەکەم بە هێواشی خاوکردەوە، تا هاتەوە سەر دۆخی خۆی. و لە حەشارگەکەمدا، خۆمدا بەسەر دیوارە تاشەبەردەکاندا. هەرکە دەنگی سمی وڵاخەکان نەما. "عەبدوڵڵا"م بانگ کرد و دەستمان کردەوە بە ڕۆیشتن. پاش ئەو تەنگوچەڵەمە ترسناکە، ئیتر بە ڕێڕەوە نزیکەکانی دۆڵی ڕووبارەکەدا دەڕۆیشتین و لە کۆتاییدا گەیشتینە دەربەندێك کە دەیڕوانییە سەر ڕووبارەکە. ئیتر لەو دەربەندەوە نەمتوانی چاوم بە کەسانێك بکەوێت کە بۆ سەربازگەکەی "مام برلاس"م دەچوون.

دەشبوو لە هەڵوێستێکدا بم، ئەگەر کتوپڕ لە بەرزاییەکانەوە بەردیان بەسەرماندا بباراندایە بمتوانیایە لە کاتی ڕۆیشتنماندا بە دەربەندەکەدا خۆمان بپارێزین و خۆمان دەرباز بکەین. لە دوای نیوەڕۆی ڕۆژێکدا سەربازگە و چادرەکانی مامە "برلاس"م لێدەرکەوت. لە دوورەوە ژمارەیەکی زۆر زۆر چادری پڕ لە جەنگاوەر لە پێش چاوماندا بڵاوببوۆوە. لوتکە "قوببە" سپێکانی چادری تەتەرییەکان، لێرەولەوێ دەدرەوشانەوە و نزیکیش بوون لە چادرە ڕەنگاوڕەنگەکانی ئەوەی "برلاس"ەوە. ئەو ئەوانەی کە کچە فارسییەکانیان مارە کردبوو. وە لەو چادرە خەت خەت و ڕەنگاوڕەنگانەی میللەتی ژنەکانیاندا بوون. ئەو ئەسپ و ڕانە مەڕانەش کە لە دەشتاییەکەدا بڵاوببوونەوە، ئەوەندە بچووك بوون وەك مێرووله دەیاننواند. و ئەو ڕێگایەش کە پێیدا دەڕۆیشتن زۆر لە ڕێگای مێرووله بچووکتر بوو.

وڵاخەکانم زۆر ئارەزووی ئەو گیا سەوزانەی ناو دەشتاییەکەیان دەکرد، گەرچی بای مانگی شەوالیش زۆر سارد بوو.

عەبدوڵڵاش هەستی بە ئارەزوویەکی زۆر کرد کە بینی لە کاتی نیوەڕۆدا دووکەڵ لە ئاگری ناو چادرەکانەوە بەرزدەبێتەوە. بەڵام من بە پەلە نەبووم و نەشمدەویست کتوپڕ بچمە ناو چادری سەربازگەکەوە.

من پێشەکی هەستی مام "برلاس"م بەرامبەر بە خۆم دەزانی. منیش دەمویست پێشەکی بە هۆی هەندێ کەسی خێڵ و خزمانمەوە پەیوەندی بە مامەوە بکەم و داوای پاراستنی خۆمی لێبکەم. لەبەرئەوە هەوڵماندا، لە دوورەوە نەکەوینە بەرچاویان. و هەوڵی زۆریشمان دەدا، ئاگر زۆر نەکەینەوە ڕووناکییەکەش لە دوورەوە دیار نەبێت.

لە ئەشکەوت و چاڵاییەکی نزمی دەربەندەکەدا بار و بنەمان دانا و کردمانە بنکەی خۆمان. و هەوڵی ئەوەشمان دا، لەبەردەم چادرەکانەوە دیارنەبین.

چەند ڕۆژێك چاودێری چادرەکانم دەکرد. هەتا دڵنیابووم لەوەی کار ئاساییە و هیچ شتێکیش لە سەربازگەکە و چادرەکاندا نییە. پاشان ڕۆژانە دەستم کرد بە گەڕان و تەماشاکردن بە دەوری ئەو شوان و ئاژەڵانەی، لە دەشتاییەکاندا بڵاوببوونەوە. تەنها هیوام ئەوە بوو، مامە بچووکەکەم "جاکۆ برلاس" ببینم. ئەم مامە "جاکۆ"یەم منی خۆشدەویست و هەڵوێستێکی باشی بەرامبەرم هەبوو. لەگەڵ ئەوەی ئەم مامەم هەندێ جار بە ئاشکرا بەرهەڵستی مامە گەورەکەمی دەکرد. ئەم مامە دەستەڵاتێکی بەرفراوانیشی لە ناو تیرەکەماندا هەبوو ئاخرێکەی نەسەبە عەرەبییە ڕەسەنە گەورەکەیم دی، بە غاردانێکی سووك و لۆقەکردن بەرەو مێگەلە مەڕێك دەچوو کە لەولای دەشتەکەوە دەلەوەڕین. کتوپڕ هەستام و پێش ئەوەی بگاتە ڕەشماڵی شوانەکان و خێرا بەرەو ڕووی چووم. پاشان هەردوو دەستم بۆ سەر سەرم بەرزکردەوە، بۆ ئەوەی پیشانی بدەم، من چەکم پێ نییە و هاوارم کرد و وتم: جاکۆ!! جاکۆ!!

-کێ؟ تەیموور؟ ئەمە تۆی تەیموور؟

ئێمە چاوەڕوان بووین کە تۆ بێیت.

-وتم، بەڕاستە؟ چ باسە؟

-کورغان دەیەوێت بتبینێت.

وتم: من لەوە دەترسام، کورغان ئەوەی نەوێت.

-چاکە، ئیلشی نامەیەکی بۆ ناردووم و تیایدا پێی وتووم ئەو ڕێکەوتننامەیەکی لەگەڵ کێبرای پیردا مۆرکردووە و هەموو تۆمەتێکی لەسەر لابردوویت. هیچ لۆمە و تۆمەتێکت لەسەر نەماوە.

-باشە، بۆچی؟

-بە پێی ئەوەی ئیلشی پێی ڕاگەیاندووم، "کورغان" وایدەوێت، لەبەرئەوەی، تۆ پیاوێکت کوشتووە کە لە باشترین جەنگاوەرە گەنجەکانی بووە. لەبەرئەوە کەمترین شتێك تۆ بیکەیت ئەوەیە کە جێگای ئەو جەنگاوەرە بگریتەوە.

-چی؟. من جەنگاوەرێکم کوشتووە؟

-بەڵێ، ئۆلاتای نیهمۆی هەڵناوە بۆ مردن.

کار هەرچۆنێك بێت، سەربازێك بە یەك دەستەوە سوودی بۆ هیچ شتێك نییە.

بەرەو ڕەشماڵی شوانەکان دەستمان بە ڕۆیشتن کرد.

بەڵام من نەمتوانی بێدەنگ ببم. لە "جاکۆ"م پرسی و وتم:

-بەڵام دەربارەی ئەم کارە باوکم هەستی چۆنە؟ هیچ شتێکی لەو بارەیەوە بیستووە؟

وتی: -ئۆهـ.. ئەمە قەدەرە. باوکت ناتوانێت بەرهەڵستی قەدەر بکات.

-هەستی مام حاجیم چۆنە؟

-وەك پیشەی خۆی، ئەو هەر بەگومانە، خۆشت باش دەزانی ئەو بەرامبەرت هەستی چۆنە؟

ئەو لە تۆ دەترسێت و ترسی ئەوەی هەیـە کە تۆ گەیشتیتە تەمـەنی تـەواو، و گونجاو، لێی هەستیت و داوای سەرداریێتی تیرەکە بکەیت. ئـەو ئـەوەی پێباشـترە تـۆ ژیـان و کـاتی خـۆت بـۆ کاروباری ئایینی تەرخان بکەیت.

بەڵام تۆزێك دڵنیا دەبێت، تۆ ببینێت لە خزمەتی کورغاندا کاردەکەیت.

-بەڵام تەیموور پێویستە ئەوە باش بزانیت ڕۆژێك لە ڕۆژان هەر دەگوڕێت.

-بەڵێ من ئەوە باش دەزانم.

-چاکە، بـەڵام پێویسـتە لەبـەر هۆزەکـەمان ماوەیـەك خـۆت بشـاریتەوە و دەرنەکـەویت. لـە ڕاستیشدا تۆ ئێستا فارەمانی لاوەکانیت و باسی هیچ شتێك ناکەن باسی تۆ نەبێت. هـەتا ژنـانیش لەناو خۆیاندا دەڵێن:

-تەیموور دەستی ئەو پیاوەی بڕی کە وێرای دەست بۆ کچۆڵەکەی بەرێت.

-بەڵام تەیموور پێم بڵێ، ئەو کیژە جوان بوو؟

-من نازانم، ئەو کیژە تەنها کەنیزەکێکی بچووکی شەرمن بوو. لەوە پێشیش نـەمدیبوو. دوای ئەو بەسەرهاتەش هەر نەمدییەوە. کیژەکەش بناغەی بەڵاکە نەبوو.

بەڵکو نیهمۆ هۆی بەڵاکە بوو. نیـهمۆ تلیاکی زۆر خواردبوو. ئـارەزووی لێبـوو بەرهەڵستیم بکاتەوە شەڕم لەگەڵدا بکات.

-چاکە، گومانی خراپ بە ئەوەی برلاس مەبە، ئێستا ئەوان بە ڕاسـتی شـانازیت پێـوە دەکـەن. بەڵام ئەوە قین و تووڕەیی بە حاجی دەگەیەنێت و پێشی ناخۆشە.

لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە لەسەرم بە ڕاستی ددان بەوەدا بنێـم، لـە کـاتێکدا ئـەو دەبینـم ئـازار دەچێژێت، من هەست بە شادی دەکەم.

پاشان لغاوی ئەسپەکانمان لەبەردەم ڕەشماڵی شوانەکاندا ڕاکێشا و لـە ئەسـپەکانمان دابـەزین، جاکۆ چەند چرکەیـەك لەگـەڵ شوانەکاندا قسەی کرد و پاشان دوانیـانی نـارد کـە عـەبدوڵلایان دەناسـی و داوای لێکــردن، چادرەکــەم بپێچنــەوە و بنەوبارخانــەم لەگــەڵ خۆیــاندا بــۆ نــاو

چادرەکانیان بێنن. پاشان من و جاکۆ سواری پشتی ئەسپەکانمان بووین. بۆ ناو بنکەی خێڵەکە گەڕاینەوە.

هەروەك جاکۆ بۆی باسکردم، لە لایەن خێڵەکەمەوە زۆر بە گەرمییەوە پێشوازییان لێکردم. بەڵام لە ماوەی ئەو سێ ڕۆژەدا کە لە سەربازگەکەدا بووم مامە حاجیم بێ مەیل و هەڵوێستێکی سارد و سڕی لەگەڵمدا هەبوو.. بە پێچەوانەوە پیاوانی خێڵەکەم بڕیاریاندا، خەڵاتێکی باشی گران بەهام پێشکەش بکەن. ئەویش ئەوە بوو دوو ئەسپ لە باشترین ئەسپ، دوو قەڵغانی شیاوی چاك، یەکێکیان بۆ من و ئەوی تریان بۆ عەبدوڵڵا. وە باشترین تیروکەوان و جەعبەی تیر. لەو دروستکراوانەی کە چەکسازەکان دەتوانن بیکەن و پێشکەشمی بکەن. هەروەها چاکترین شیری سەربازگەکەیان پێشکەش کردم، بەڵام کاتێك دەستم کرد بە تاقیکردنەوەی شیرەکە. خەم و پەشیمانی و پەژارەی شیرە جوانەکە دایگرتم. ئەو شیرەی ئاواتم بوو لە چەك فرۆشی قافڵەکە بیکڕم.

ئاوا، کاتێك، بەرەو خزمەتی کورغان ڕۆیشتم. بەرگێکم لەبەردا بوو شیاوی جەنگاوەران بوو. وە چەکێکیشم هەڵگرتبوو شیاو بوو بە شان و شکۆی شازادەیەکی تیرەی "برلاس". من و عەبدوڵڵا سەربەرزانە و بە شانازییەوە بەرەو دەروازە ئاسنینەکە کەوتینە ڕێ.

لە دەربەندێکی تەسکی بەردەڵانی بۆری وەك خۆڵێ بەرزاییەکەی لە شەش سەد پێ زیاتر بوو، تێپەڕبووین، کاتێك گەیشتینە بەردەم هەندێ تیرهاوێژەوە کە لە سووچێکی بەرزەوە دامەزرابوو و بەسەر ئێمەدا دەیانڕوانی پێم وتن:

-من تەیمووری کوڕی تاراغام.

ئەوکاتە ڕێیان پێدام، سەربەستانە تێپەڕم.

بەڵکو ئەو پاسەوانانەی لە حەشارگەکەیاندا دامەزرابوون هەرکە گوێیان لە دەنگەکەم بوو، زۆر بە گەرمییەوە بەڕێیان کردم.

پێش ڕۆژئاوا لە دەربەندەکە هاتینە دەرێ و گەیشتینە کۆتایی خوارووی ڕۆژئاوایەوە، چادرێکمان لەژێر سێبەری هەندێ داربەڕووی پیردا هەڵدا، ئەو داربەڕوانەی، بۆ ژیان زۆرانبازیان لەناو ئەو خۆڵە نەرمانەدا دەکرد.

کاتێك عەبدوڵڵا شەو لە چادرەکەدا پاڵکەوتبوو. شتێکی دایە دەستم کە لە کراسە شاڵێکی کۆنی دایکییەوە پێچرابۆوە. پاشان پێی وتم:

-بەڕێز شازادە، من بۆ تۆ وا بە چاکتری دەزانم کە سبەینێ ئەمە هەڵبگریت.

کراسە شاڵەکەم کردەوە، شیرێکم، تیادا دی بە گەوهەری جوان ڕازابۆوە، لەبەر تیشکی ڕۆژە ئاوابووەکەدا ئەدرەوشایەوە. حەپەسام، بینیم ئەم شیرە هەر ئەو "شاشمشێرە" بوو کە لە بەردەم چادری چەك فرۆشەکەدا دیم. نەمتوانی سەرسامی و حەپەساوی خۆم بشارمەوە بە سەرسووڕمانەوە لە عەبدوڵلام پرسی، وتم:

-عەبدوڵلا ئەم شمشێرەت لە کوێ دەستکەوتووە!!؟

-بەڕێز شازادە، ئەوکاتەی تۆ لەگەڵ نیهمۆدا شەڕت دەکرد.. من چووم شیرەکەم دزی..!!

-ئایا لەبەر من دزیوتە؟

-نەخێر شازادەی بەڕێز بە تەواوی نا. لەبەر خاتری خۆم دزیومە. چونکە ئەگەر تۆ قایل بوویتایە و بچوویتایە مزگەوتێکەوە و ژیانی خۆت بۆ کاروباری ئایینی تەرخان بکردایە، منیش بیرم لە هەڵاتن کردبۆوە و دەچوومە پاڵ یەکێك لە سەرکردەکانەوە.

-بەڵام خۆت چاك دەزانیت ئەوکاتە ئەمهێنایتەوە و بە هۆی ئەو کردەوەیەشتەوە ئەمکوشتی.. وا نییە؟

-نەخێر، ئەگەر ببوویتایە بە پیاوی ئاینی تۆ نەتدەتوانی من بکوژیت. ئەی ئەگەر من یەکەم جار تۆم بکوشتایە و ڕامبکردایە چی دەبوو؟

-ئەوکاتە کەسێکی تر دوات دەکەوت و دەیدۆزیتەوە و دەیکوشتی.

-بەڕێز شازادە، بیرم لەوە کردبۆوە. ئەوە شیرەکە و دامێنێ. تۆ دەبێت بە پیاوێکی بەناوبانگ، هەروەها منیش، من ئێستا ناتوانم خۆم وا نیشانبدەم، شتێکم و لە ڕاستیشدا ئەو شتەش نەبم.. بۆ خۆم وا بە چاکتری دەزانم کە ڕانەکەم.

-عەبدوڵلا هیچ کات بیرم لەوە نەکردۆتەوە تۆ هەڵبێیت. بەڵام لەبەرئەوەی خۆت ئەمەت ئاشکرا کرد، هەتا ماوم ئەم قسەیەتم بیرناچێتەوە.

ئەو شەوە شیرەکەم خستە ژێر بەتانییەکەمەوە، هەستمکرد دەنگێك بە گوێمدا دەچرپێنێ.. عەبدوڵلای نۆکەر و کۆیلە شیرەکەی بۆ خۆی دزیوە، بەڵام لە ترساندا داوێتی بە تۆ. تۆش ڕۆژێك لە ڕۆژان دەتوانیت بەو شمشێرە گشت جیهانی پێ داگیر بکەیت!!

# ئامۆژگاری بەسوود

لە بەردەم دەروازە ئاسنینەکەوە بەرەو خوار وەرگەڕاینەوە. بەرەو بەرزاییەك چووین کە بەرزاییەکەی نزیکەی چوار هەزار پێ بەرز دەبوو. کورغان "شاهەنشا" دیوانی ڕەشماڵی لەسەر هەڵدابوو. لە دەوروبەری دیوارەکانی کۆشکی "سالی"دا بوو.

ڕۆژێکیان پێش ڕۆژئاوابوون گەیشتینە دەشتاییەکی بەرز و بەسەر کۆشکی سالیدا دەمانڕوانی.

بەڵام من وام بە چاك زانی چەند میلێك دوور لەو کۆشکەوە خێوەتێك هەڵدەین. تاکو پێش ئەوەی بچمە ناو ئەو کۆشکە جوانەوە کاروباری خۆم ڕێك بخەم، ئاوا لە کاتی نیوەڕۆدا لە نزیك رووبارەکەوە خێوەتێکمان هەڵدا. و جلەکانمان شت و لە ناوە سەهۆڵاوە پاکەکەدا خۆمان شت. وڵاخەکانیشمان بەردا کە لەو قەرسیل و گیایەدا بلەوەڕێن. لغاوی وڵاخەکانمان چەور کرد و زینەکانیشمان تاس و لووس دا.

پێش ئەوەی ڕۆژ ئاوابێت گوێمان لە دەنگی شەیپوورە درێژەکان و تەپڵە گەورەکان بوو کە دەنگ و سەدایان ئەو ناوەیان پڕکردبوو. ئەوەمان دەهێنایە پێش چاومان کە ئێستا جەنگاوەرانی کورغان کە ژمارەیان زیاد لە دوو هەزار جەنگاوەر دەبێت. کڵاو خوودە یان عەمامەیان لەسەردایە. و بە نمایشێکی جوان بە بەردەم کورغاندا دەڕۆن. ئاڵای پیاوە شاخاوییەکانم دەبینی، با دەیشەکاندنەوە، ئەو ئاڵا ئاوریشمە نەرمانەم دەدی، جەنگاوەرانی تیرە بیابانییەکان هەڵیاندابوو. لە دڵی خۆمدا وتم:

-منیش بەم زووانە دەبم بە یەکێك لەو جەنگاوەرانە.

هەرکە کازیوەی بەیان دەرکەوت. لە خەو هەستاین و کەلوپەلەکانمان بۆ دواجار خاوێن کردەوە و خۆمان بۆ ناو کۆشکی "سالی" ئامادە کرد. ئەسپەکانمان زین کرد و لەسەر زینەکانمانەوە، سەرزینی دروستکراوی ئاوریشمی نەرمو جوانمان دانا. و بەرگی جوانیشمان لەبەر کرد. سواری پشتی ئەسپەکانمان بووین و بە فیز و گەورەییەوە بەرەو سەرکەوتن غارمان دا.

هەرکە گەیشتینە کۆشکی سالی ڕێکوپێکی خۆمم بیرچۆوە. جوانترین و خۆشترین شوێنێك کە لە ژیانمدا بینیبێتم، ئەو شوێن و سەربازگەیە بوو. سەربازگەکە لە پێش چاومدا لەناو ئەو دەشتە پان و بەرینەدا بڵاوببۆوە تا گەیشتبووە دامێنی گردە دارستاناویەکان و دەوروبەری دیواری شارەکە شەقامە پان و درێژەکانی بەردەم خێوەتە بەرزەکانی میرانی تەتەر و

خانەدانــەکانی فارســەکان و مــیرە هیندییــەکانی لــە خزمــەت کورغــاندا کاریــان دەکــرد، زیــاتر فراوانتریان کردبوو.

پاش ماوەیەکی کەم گەیشتمە بەردەم دیوەخانی کورغان دیوەخانەکە خێوەتێکی زۆر گەورە بوو، قوببەیەکی بەرزی هەبوو. پڕ لە فەرش و کەلوپەل و پێویستییەکانی بوو.

جوانترین دروستکراو و داهێنانی دەستە شارەزاکانی فارسەکانم تێدا دی. لەگەڵ ئەو کزە با ساردەش کە لە شاخە بەرزەکانەوە دەهات، دیـواری ژووری نووسـتنەکەی لایدابوو "کـورغـان"یـش خۆی لەسـەر تـەختێك دانیشـتبوو، لە عـاج و داری ئەبـەنۆس دروستکرابوو. گوێی لـە دوو پیـاو ڕاگرتبـوو لـە تەنیشـتییەوە دانیشـتبوون و پـەرتووکێکی یاسـایان بـۆ دەخوێنـدەوە. هەرکـە برگەیـەکییان بـۆ دەخوێنــدەوە و هەڵەیـەکی تێـدا بوایـە سـەرنج و بۆچوونـی خـۆی بـۆ ڕوون دەکردنەوە.

لـە ئەسـپەکەم دابـەزیم و دامـە دەسـت عـەبدوڵڵا و هەرکـە خـۆم پێشـکەش سـەرۆکی پاسەوانەکانی بەردەم دیوانی کورغان کرد وەڵامی دامەوە وتی:

-پێویسـتە چـاوەڕوان بکـەیت هـەتا کورغـان لەگـەڵ ئـەو دوو پیـاوەدا لـە کۆبوونەوەکـەی دەبێتەوە.

مـاوەی یـەك کاتژمێری تـەواو ڕاوەسـتام و سـەرنجی ئـەو پیرەمێردە ڕیش سپییەم دەدا، کـە چوارمەشقی لەسـەر تەختـە عاجەکـەی دانیشـتبوو. گـەرچی ئـەو پـیرەمێردە، ماوەیـەکی زۆر لەمەوپێش لە شەڕێکدا کە لـە سەرەولێژاوییە بەرزەکاندا کردبووی، چاوێکی لەدەست دابوو. دەیتوانـی ئـەو هەڵـە و نـاڕێکی و کارانـەی دەخرانــە پێشـیەوە، چارەسـەر بکـات. و بڕیـاری دادوەریانەو قایلبوون دەربارەی دەربکات.

هەرکە دوو پاسـەوانەکە باڵیـان گـرتم و کردیانمـە ژوورەوە. لەبـەردەم شاهێنشـادا بـە ڕێـز و گەورەییەوە چەمامەوە خۆم پێشکەش کرد و وتم:

-شاهێنشای هێژام، مـن تـەیمووری کوڕی تاراغـام. لەسـەر داواکـاری بـەڕێزت بـۆ خزمـەتت هاتووم.

ئەوکاتـە ئیتر کورغـان ئـەمری پـێ فـەرمووم، سـەر بڵندبکەمـەوە و ڕێـك ڕاوەسـتم. و دوو پاسەوانەکەش ڕۆیشتنە دەرەوە.

شاهێنشا ڕووی تێکردم و وتی:

-من زۆر شادومانم، پێشوازی لە کوڕی هەڤاڵی دێرینم "تاراغا"ی دەکەم. وەرە بچینە ژوورەکەمەوە. باسی باوکتم بۆ بکە!!

هەستاو بە دەرگایەکدا کە باشترین و جوانترین پەردەی پێوە بوو، بردمی بۆ ناو جوانترین و قەشەنگترین ژوورێك کە لە ژیانمدا چووبێتمە ناویەوە. لە دوایەوە بەسەر فەرشێکی عەجەمی نایاب و دانسقەدا ڕۆیشتم کە لەمبەری دیواری ژوورەکەوە بۆ ئەوبەری دیواری ژوورەکە ڕاخرابوو. لەسەر دۆشەکێکی نەرم دانیشت و تاوڵەیەکی شەترەنجی جوانیشی تێکەڵ بە دارێکی عاجی گرانبەهای لە تەنیشتەوە بوو. داوای لە منیش کرد، لەسەر دۆشەکێك لە بەرامبەرییەوە دانیشم.

پاشان لێیپرسیم، وتی: ئێستا، دەنگوباسی تاراغای باوکت چییە؟ ئایا باوکت لەخۆشیدایە؟

-بەڵێ گەورەم، باوکم لە بەختیاری و خۆشیدایە.؟

-بەختیاری؟ خۆشی هەیە، نەك بەختیاری.

من باشم لەبیرە، ڕۆژانێك، من و باوکت پێکەوە هەڵمەتمان دەبرد و بە ئەنجامی سەرکەوتن شادومان دەبووین و بە سەرنەکەوتنیشمان ئازارمان دەچێژت. ئەوکات باوکتم لەگەڵدا بوو، تیرێکی تووند دای لێرەم..

کورغان ئەمەی وت و ئاماژەی بۆ نیتکەیەك کرد کە لەسەر بیبیلەی چاوی بوو. نەمتوانی زۆر تەماشای نیتکەکەی ناو چاوی بکەم. چونکە زۆر بەهێز و تیژییەوە بە چاوە ساغەکەی تەماشای کردم، هیچ چاوێك نەیدەتوانی تەماشای چاوە ساغەکەی بکات. ئیتر کابرای پیرەمێرد هەناسەیەکی هەڵکێشا و دەستی پێکردەوە، وتی:

-جارێك باوکتم بینی لەگەڵ چوار کەسدا شەڕی دەکرد و بەفریش تا سەرپشتی ئەسپەکەی هاتبوو. ئایا پاش ئەو هەمووە باوکت تەرکی دنیای کردووە و ژیانی خۆی بۆ خزمەتی مزگەوت تەرخان کردووە؟!!

-بەڵێ گەورەم، بە ئارەزووی خۆی ئەوەی هەڵبژاردووە.

-من دەمزانی، ئەو هەڵێدەنایت، ژیانت بۆ هەمان مەبەست تەرخان بکەیت. ئەگەر ئەوە نەبوایە دەمێك بوو من بە دواتا دەمنارد. هەرچۆنێك بێت من ناتوانم ڕێزی "تاراغا"ی نەگرم و حەز و ئارەزووەکانیشی جێبەجێ نەکەم. بەڵام نامەکانی نیلشی وای بۆ من دەردەخست — گەرچی بۆ ماوەیەکیش بێت- کە تۆ پیاوێك بیت و سیمای پیاوی ئاینیت پێوە نەبێت.

زەردەخەنەیەکی ناسکی کرد و تەماشایەکی کردم هەرکە تەماشای رووی کردم هەستم بە تیژی چاوی کرد نەمتوانی وەڵامی قسەکانی بدەمەوە. بەڵام خۆی لەم تەنگوچەڵەمەیە رزگاری کردم و دەستی پێکردەوە وتی:

-من بە ڕاستی نازانم، هەرچی "ئیلشی" وتوویەتی باوەڕی پێبکەم، یان نا، خۆشت دەزانیت ئەو ئەفسەرە بچووکانە چۆنن.

-بەڵێ گەورەم، من باشیان دەناسم.

-بەڵام ئیلشی دەڵێت تۆ زۆر شارەزاییت لە یاریی "بۆلۆ" و سوارچاکیدا، کەس لە تیپەکەیدا لە شەڕە شیردا هاوتاییت ناکەن. و دەشڵێت، تۆ دەتوانیت تیری ناوژێی کەوانە تا بناگوێت ڕاکێشیت. هەروەها لەسەر قەربووسی زینی ئەسپەکەتەوە کە زۆر خێراییش غاربدات، دەتوانیت سێ تیر بۆ نیشانی جیاجیا بهاوێژیت گەرچی نیشانەکانیش بجووڵێنن. ئەوە شتێکە من بڕوای پێ ناکەم. بەڵام بە ڕاست دەتوانیت ئەمانە هەموو کاتێك بکەیت؟

-گەورەم هەموو کاتێك نا.

-بەڵام هەندێ جار دەتوانیت.. وانییە؟

-بەڵێ گەورەم هەندێك جار دەتوانم وەك "ئیلشی" پێی فەرموویت.

-کەواتە تۆ زۆر پێش دەکەویت ئەگەر ئەمە بە ڕاستی و بەڵگەوە بسەلمێنێت، و خاوەنی ئەم شارەزاییانە بیت..!!

-بەڵگەی ڕاست؟ ئەو بەڵگە و ڕاستییانە چییە؟

-بەڵێ!! بەڵگەی ڕاست ئەوەیە کە دەستنیشانی نێوان جەنگاوەرێکی ئاسایی —زۆر جەنگاوەر هەن لەم شارەزاییانەدا وەك تۆن- و داگیرکەرێکی جیهانی گەورە دەکات.

-گەورەم بڕواناکەم ئەوەی تۆ دەفەرموویت من تێی بگەم.

-دەربارەی پیاو ئەوەی کە پێویستە بیکەیت، بیکە، یان لە پێناویدا چی دەکەیت بیکە، بێ ئەوەی گوێ بدەیتە هەستی هیچ کەسێك یان هەستی خۆت بەرامبەری. چونکە برادەری و ڤین و پەرۆش و گشت جۆرەکانی سۆز و بەزەیی ڕێگە لە توانات دەگرن. کە ئەوەی دادوەری و تێگەیشتوانە پێویست بێت بیکەیت. تەیموور لە قسەکانم دەگەیت؟

-گەورەم هێشتا بە تەواوی تێنەگەیشتووم و هەوڵدەدەم لە قسەکانت بگەم.

-سۆز و بەزەییت دەربارەی ژن هەبێت. ئەمەیان لایەنی سۆزە. ژنت خۆش بوێت و خۆشیشت نەوێن. ڕابوێرە لەگەڵیاندا و ئەشکەنجەشیان بدە. لە دەروونتا هەر سۆز و خۆشەویستی و

بەزەییەکت بەرامبەریان هەبێت، دەریبڕە، بەڵام نەهێڵیت یەك تۆز ئەم هەستەت کاربکاتە سەر بەشێکی ترت.

هەروەك چۆن لە تەنها یەك "خوا" زیاتر هیچ خوایەکی کە نییە. ئاواش بزانە هیچ شتێك‌و هیچ خۆشییەکیش لە ژن خۆشتر نییە. سامان و ناو و ناوبانگ و خواردن و خواردنەوە و مەی هیچ نین جگە لەوە نەبێت کە پێشەکین بۆ ئارەزوو و ڕابواردن لەگەڵ ژندا.

باش ئەمەت لەبیر بێت، لە ژندا بۆ خۆشی و شادیت بگەڕێ، لە هیچ شتێك و جێگایەکی تردا بۆ شادی و بەختیاری مەگەڕێ. هەوڵ بدە، مێشك و خەیاڵی پیاوەکانت بۆ خۆشی و بەختیاری بە سەروەت و سامان و دەسەڵات پربکەیت. بەڵام بۆ شادی و بەختیاریی خۆت لەو شتانەدا مەگەڕێ. کەواتە ئەم خەیاڵانە لە پێناوی جەنگ و سەرکەوتندا بەکاربهێنە.

تەیموور ئێستا لە وتەکانم گەیشتیت؟

-گەورە و سەروەرم، زۆر نا.

ویستم لە مانای وتەکانی بگەم. پاشان تێگەیشتم و بۆی چووم بۆچی ئەم قسانەی کرد. دەمویست بە شێوەیەکی باشتر لە هەموو شتێکی وتەکانی بگەم. چونکە دەرکم بە سوود و کەڵکی وتەکانی کرد بە درێژایی تەمەنم وتە ڕاستەکانیم بیردەکەوتەوە، ئەو وتانەی کە زۆر کاریگەری لە هەموو ڕێبازی ژیانمدا هەبوو.

پاشان ڕووگرژەکەی نەما و ڕووی گەشایەوە و هەناسەیەکی شادی هەڵکێشا، و دەستی کردەوە بە قسە و وتی:

-بەڵام لایەنی خواپەرست و ئایینی -ئەو لایەنەی کە "تاراغا"ی نابینا و کوێر کردووە، هەروەك چۆن لایەنی سۆز و خۆشەویستی حسێنی کچەزامی لە خشتە بردووە- من لێی نازانم، ڕەنگە لەو لایەنەشەوە ڕاستی تێدابێت. بەڵام وام بۆ دەردەکەوێت، ئایین شتی زۆر نادیاری تێدابێت و زۆرجار ڕاست نییە و عەقڵیش نایگرێ بەڵکو بۆچوونێکی واقیعییە.

هەستم کرد "کورغان" بۆ من قسە ناکات. بەڵکو بۆ خۆی و لەگەڵ خۆی دەدوێت و قسەش بۆ خۆی دەکات. لە ڕاستیدا لە تەنگوچەڵەمەیەك و گرێکوێرەیەکی کۆن و گران دەدوێت و بە شێوەیەکی زۆر ڕاستیانە دەدوێت.

پاشان وتی: هەندێ لایەنی ئایینی بە سوودە نەك تەنها هەموو کاتێك بۆ لایەنە ئایینیەکەی، بەڵکو بۆئەوەی بۆ مەبەستی تایبەتی خۆت بەکاری بهێنیت. ئەگەر دەتوانیت پیاوان

هەڵخەڵەتێنیت، هەڵیانخەڵەتێنە. بەڵام ئەکەی باس و ئەفسانە کۆنەکانی پیاوانی ئایینی کارت تێبکەن.

گشت کات پشت بە هێز و بازووی پیاوان ببەستە و پشت بە دووعا و نزای شێخ و مشایەخ نەبەستیت.

-ئایا ئەمە بەرهەڵستی رێبازی ئیمام زەینەدینی پیرەمێرد دەکات؟!

-گەورەم من باوەڕەم وایە.

-چاکە، بەڵام بەرهەڵستی ژیان و کردەوەی ناکات.

زەینەدینی پیرەمێرد بە هۆی شمشێری منەوە پابەندی ئایین و خواپەرستی و لەسەرخۆیی بووە. هەڵگری بیروباوەڕی ئایینی پێویستە جێنشین بێت و ئاگاداری ئەو ماڵ و سامانە بێت کە بە ناوی مزگەوت و ئاینەوە کۆدەکرێنەوە. من وا تێدەگەم، زەینەدین ئەوەی من دەیبینم و باوەڕم پێی هەیە، ئەویش وەك من دەیبینێ و باوەڕی پێی هەیە.

کورغان پاڵی بە سەرینەکەوە دا، و باڵەکانی لەسەر تاوڵەی شەترەنجەکە دانا. پاشان دەستی پێکردەوە، و وتی:

-دەربارەی تۆ لە لایەن زەینەدینەوە، نووسراوم پێگەیشتووە منیش پشت بەو ڕێز و پیاهەڵدانەی دەبەستم کە دەربارەت هەیەتی. منیش بڕوام وایە، پیرەمێردی ئیمام بووە بە هەڵگری بیروباوەڕ.

پاش ئەوەش لە "ئیلشی" شەوە نووسراوم پێگەیشتووە وام لێهات، بڕوا بە قسەکانی زەینەدین بکەم. و ئەم فرسەتەم دایتێ. و ئەمەش بوو بە هۆی ئەوەی ئەم وتە کورتەم بۆ وتیت.

-سەروەرم، من سوپاست دەکەم.

-تەیموور سوپاسم مەکە. هەرچییەکم داویتێ و پێم وتوویت تەنها هەوڵێك و هەندێ ئامۆژگاری بوو بۆت دەبێت ئەوەشت بیرنەچێت، تۆ دەتوانیت ببیت بە سوارەیەکی دەرەجە یەك و ڕەنگیشە ببیت بە شاهێنشاش. من ناتوانم ئەوەت بدەمێ بەڵکو پێویستە لەسەر خۆت، خەباتی بۆ بکەیت و هەوڵی بۆ بدەیت تاکو ئەوەت دەستبکەوێت.

"لاداخ"ی کوڕم مافی ئەوەی هەیە، ببێت بە جێنشینی من. بەڵام "حسێن"ی کچەزام بەرهەڵستی و ناکۆکی ئەو مافەی دەکات. بەڵام لاداخ ناتوانێت تێبگات. و حسێن پێشوەخت هەموو شتێك دەرك پێدەکات. ئەگەر من لە جێی تۆ بوومایە گرنگی و چاودێری کردەوەکانیم دەکرد. ئەوەشت بیرنەچێت من چاودێری گشتان دەکەم.

-بەڵێ سەرومرم گرنگی پێدەدەم.

ئیتر ئاماژەی ڕۆیشتنی بۆ کردم و منیش هەستام.

پاشان زۆر بە ڕاشکاوییەوە پێی وتم:

-زەینەدین پێی وتووم، تۆ زۆر حەز بە قسە و چەنەبازی ناکەیت.

-بەڵێ سەرومرم، چەنەبازی زۆر سوودی نییە.

-بۆ فەرماندە "ئیلشی" دەنووسم بتخاتە ڕیزی جەنگاوەرەکانییەوە و ئاگاشی لێت بێت و پێشی دەڵێم، من لە تیپەکەیدا دامناویت.

-سەرومرم لە کانگای دڵەوە سوپاست دەکەم. زۆر شادومان بووم بەم دامەزراندنە. خێرا بەرەو تیپی هەڤاڵەکەم چووم تاکو بچمە ناو تیپەکەیەوە.

* * *

لەبەرئەوەی من لەمەوپێش جەنگاوەرانی "ئیلشی" سوارەم دەناسی، بە ئاسانی لەگەڵیاندا گونجام و ڕێککەوتم، شارەزایان و ڤاڵبووانی جەنگ و ئەو سوارانەی، لە من گەورەتر بوون، گوێم لێدەگرتن و لێیانەوە فێری گەلێ شت دەبووم، دەمتوانی ئەو چیرۆك و بەسەرهاتانە لە بێژنگ بدەم و ڕاستی و ناڕاستی ئەو سوارە لە خۆباییبوانەم لە سەرکەشیەکانیاندا کە دەیانگێڕایەوە بۆ دەربکەوێت.

سەرنج و گوێڕاگرتنم بۆ ئەو چیرۆك و بەسەرهاتانە، "کە هەندێکیان بروایان پێدەکردن" وای لێدەکردن، خۆیانی پێوە هەڵبکێشن و شانازی و فشەی پێوە بکەن، واشی لێکردبوون، زۆر گوێیان بە من دەدا و سەرنجی منیان بۆ لای خۆیان ڕادەکێشا.

لە سەرەتاوە هەندێ لەو پیاوانەی لەمەوپێش لەگەڵ "ئیلشی" و لە "شەهری سیبز"دا نەبوون. دەیانویست سادەیی من بە هەل بزانن. ئەم هەڵوێستەیان منی زۆر تووڕە کردبوو. بەڵام دانم بە خۆمدا دەگرت و هەوڵم دا لە ئامۆژگارییەکانی "کورغان" دەرنەچم، کە پێی دەوتم: کارێ بکە هەستی کەسایەتی خۆت کارنەکاتە سەر ڕێڕەوی ژیانت. جارێکیان پاشماوەی برینداریەکم لە ڕوومەتی سوارە "بێرکا"دا دی و لێمپرسی:

-بێرکا ڕوومەتت چۆن وا بریندار بووە؟

-چی؟ پرسیار لەو برینداریەی سەر ڕوومەتم دەکەیت؟

-بەڵێ، من دەمەوێت بزانم، ڕوومەتت چۆن بریندار بووە؟

-نۆها! ڕووممتم لەو کاتەدا بریندار بوو. لە کاتێکدا شەڕێکی قورس و گرانم لەگەڵ دێوێکی گەورەدا دەکرد، دێوەکە سواری پشتی گایەکی گەورە ببوو.

بڕوام بە قسەکانی نەبوو، دانم جیڕکردەوە. پێموت:

-دەتوانیت ئەو بەسەرهاتەم بۆ بگێڕیتەوە.

-بەڵێ، ئەم شەڕە گەورەیە لە وڵاتی تاریکستاندا ڕووی دا. کە کەوتۆتە ناوچەی باکوورەوە، لە پشت ڕووباری "سیر"ەوەیە، شەش مانگ ڕۆژە و شەش مانگی شەوە.

سەرەتا کە چیرۆکەکەی گێڕایەوە، حەزم لە شێوە ئەفسانەییەکەی نەبوو. لەگەڵ ئەوەدا، زۆر سەرخۆشیش بوو هەستم بە چاوەکانی کرد، گاڵتە ناکات و بە ڕاستییەتی. کابرا هەناسەیەکی هەڵکێشا و دەستی پێکردەوە، وتی:

-لە ناوچەی باکووردا ئەم دێوە پەیدابوو، زۆر دەوروخولی دەدام و دەمویست شەڕ و زۆرانبازی لەگەڵدا بکەم. چارناچار ئاوا لەگەڵیدا کەوتمە شەڕەوە. لە کاتی ڕۆژهەڵاتەوە هەتا کاتی ڕۆژئاوابوون، واتە ماوەی شەش مانگی تەواو. هەرچۆنێك بێت چەند هەفتەیەکی مابوو، تاریکایی باڵبکێشێت بەسەردا، ئەسپەکەم لە برساندا مرد. ئاوەها پێویست بوو، بە پێوە ڕاوەستم و شەڕ بکەم. لە کۆتاییدا شیرێکم لە سنگی دێوەکە دا و بە پێشدا کەوت، ویستم خۆم لە لاشە گەورەکەی لادەم ئیتر ئەو کاتە شاخە گەورەکەی گایەکە بەر ڕوومەتم کەوت برینێکی گەورەی تێکرد.. من وتم، دێوەکە سواری پشتی گایەکی گەورە ببوو. نەك سواری پشتی ئەسپ. دەستم کرد بە پێکەنین و هەموو بەو سەربازانەی کە گوێیان لە قسەکانی گرتبوو دەستیان کرد بە پێکەنین. بەڵام بە پێکەنینەکانیاندا ناپاکی و ناڕاستییەکم بەرامبەر بە خۆم هەستپێکرد، نەك بەرامبەر چیرۆك و بەسەرهاتەکەی (بێرکا). هەستم کرد، لە پێکەنینە چەپەڵەکانیاندا گاڵتەیان بە من دەکردو قەشمەرییان بە من دەهات.

لە دڵی خۆمدا بە خۆمم وت: هەستی تایبەتی خۆت بخەرە لاوە، جەنگاوەری ڕاست ناهێڵێت، خەڵکی گاڵتەی پێبکەن و پێی پێبکەنن.

بە ڤین و تووڕەییەکی زۆرەوە بە (بێرکا)م وت:

-ڕاستم پێبڵێ و نەگەرنا. من لەو باوەڕەدام کۆیلەیەك بە چەقۆ لێیداویت و ڕوومەتی هەڵدڕیویت. "بێرکا" لەسەرپێ ڕاست بۆوە و برینەکەی کە لە ژێر چاوی ڕاستییەوە هەتا سەرووی سمێڵییەوە درێژببوّوە، سوورهەڵگەڕا و بە تەواوی لە بەردەم ئەو تیشکە زەردەی لە ئاگری ناو چادرەکانەوە بڵاوببۆوە بە باشی دەدرەوشایەوە.

بە تووڕەییەوە لێی پرسیم، وتی: سەگەکە، گومانت لە بەسەرهاتەکەم هەیە.

منیش برینێکی ڕاستی دەکەمە ڕوومەتت و وات لێدەکەم، ئەو بەسەرهاتە بە ڕاستی بۆ خەڵك بگێڕیتەوە.

منیش هەستامە سەرپێ و شیرەکەم دەرهانی و وەڵامم دایەوە و پێم وت:

-من لە درۆکردندا ناتوانم بەتۆ بگەم. بەڵام برینێکی وا دەکەمە ڕوومەتت، لە برینەکەی خۆت جوانتر بێت. وات بۆ دەکەم کە چارەناشیرینە چەپەڵەکەتی پێ جوان بکەم.

لەم کاتەدا بە گوڕ بەرەو ڕووم هات و لە ڕاستیشدا لە ڕاستی ئەو تووڕەبوونە گەیشتم کە لە رووی دوژمنەکەمدا دیاربوو. منیش باوەڕی تەواوم بە مێشکی خۆم هەبوو. دەمزانی دەتوانم بە ئاسانی ئەو پیاوە بکوژم. ئەو پیاوەی، زۆرجار شەڕی قورس و گرانی لە زۆر هێرش و هەڵمەتدا کردبوو. بۆئەوەی، زۆر زۆر تووڕەی بکەم. بە گاڵتەپێکردنەوە لەژێر هەڵمەتی شیرەکەیدا ڕامکرد پاشان شیرەکەی بۆ ملم داوەشاند و منیش زۆر بە شارەزایی و ژیرانەوە خۆم کرد بە ژێر باڵیدا و بێ ئەوەی شیرەکەم بەکاربێنم بۆی دەرچووم.

"بێرکا" زۆر ڤینی هەستابوو، شیروەشاندنەکەی ئەوەندە توند بوو کە وەرگەڕایەوە خەریك بوو بکەوێت. ئەمە وای لێکرد، هەلێکی باشی بۆ ڕەخساندم لە پشتەوە بە شیرەکەم لێیبدەم و ملی ببەڕێنم. بەڵام لە بریتی ئەوەی ئەم هەلە بە فرسەت بزانم لێی گەڕام و ماوەم پێدا تاکو خۆی ڕاستکاتەوە و بەرەو ڕووم بێتەوە.

بەڵام یەکێك لە تەماشاکەران بە گاڵتەپێکردنەوە ڕوویکردە "بێرکا"، وتی:

-بێرکا، ئەو گەمەت لەگەڵدا دەکات!! ئەم سوارەیەی، تۆ ناوی دەبەیت بە سەگ. ڕێوییەکە بۆ خۆی.

هەلێکی ترم دا بە بێرکا، دووبارە بەرەو ڕووم بێت و بە شیرەکەی لێمبدات بێکەڵك بوو.

ئا، لەم کاتەدا ڕووم تێکرد و پێموت:

-بێرکا ئەم لێدانە لەسەر ڕوومەتی چەپدا بگرە. بە شێوەیەکی شارەزایانە و هێواشی بە نووکی شیرەکەم لێمدا تەنها ویستم ڕوومەتی بریندار بکەم و نەمویست ملی ببەڕێنم یان سەری دووکەرت بکەم پاشان کە برینەکەی سارێژ بۆوە و چاك بۆوە، پاشماوەی برینێك لە ڕوومەتی چەپیدا دیاربوو.

تەواوەتی و کتومت لە پاشماوەی برینەکەی سەر ڕوومەتی ڕاستی دەچوو. بەڵکو، وەك بە دەستی پزیشکێکی زۆر شارەزا و بە چەقۆیەکی تیژ بۆی کرابێت وەها بوو.

پاش ئەوە ئیتر هیچ کەسێك غیرەتی ئەوەی نەدەکرد گاڵتەم پێبکات یان خۆی بەسەرمدا بنوێنێت. هەتا وای لێهات زۆربەی ئەو سوارانەش کە زۆر شەڕانی و بێنابڕوو بوون بە شێوەی ڕاست وەڵامی پرسیارەکانمی دەدایەوە و بەسەرهاتەکانیان بە ڕاستی و بێ زیاد و کەم بۆ دەگێڕامەوە.

کاتێك، بووم بە سەرتیپی سەد سەرباز و پێشەنگی سەربازەکانم دەکرد، "بێرکا"ش لە ڕیزی سەربازەکانمدا بوو. لە ڕاستیشدا بێرکا یەکێك بوو لە ئەفسەرە ئازاکان. سیما و چارەیەکی ناشیرینی پێوە بوو هەر لە مەیموون دەچوو، ئەو پاشماوە برینداریانەش کە لە ڕوویدا بوو بە زەقی دیاربوو، وای لێکردبوو، سەربازەکانم ترس و لەرز بچێتە دڵیانەوە و لێی بتۆقێن و کەسیان نەیاندەوێرا لە قسەی ئەو و فەرمانی من دەربچن. منیش هیچ گرنگییەکم پێنەدەدا. لە دڵسۆزیی و ڕێزگرتنی شمشێرەکەشم هیچم لێ نەدەپرسی.

هەروەها، لە کاتێکدا لەگەڵ سوارە "ئیلشی"دا هەڵمەتمان بۆ سەر دوژمن دەبرد. من توانایەکی بێپایانم لە جەنگدا دەردەخست. ئیلشی ماوەی بەو سەربازانەم دەدا کە ئاڵاکەی منیان هەڵگرتبوو لە کاتی شەڕ و کوشتاردا، فەرماندەیی هەموو تیپەکان بکەن. وە بە هۆی سەری ساڵی تازەوە، کە سەردار و سەرۆك خێڵ و هۆزە دوورەکان دەهاتن، بۆئەوەی باج بدەن و لە دیوانەکەی "کورغان"دا ئاهەنگ بگێڕن.

منیش یەکێك بووم لە کۆمەڵی شووراداا.

هەروەها ڕێیان پێدام، دانیشم و هاوبەشی و لێکۆڵینەوەی ئەو پلان و ڕایانە بکەم کە بۆ هەڵمەتی بەهار دادەنرا و گەورە پیاوان و سوارانی وڵاتی تەتەر هاوبەشیان تێدا دەکرد. ئەوکاتە دەستمکرد بە تێڕوانین و لێکۆڵینەوەی هەموو تایبەتمەندێکان و ڕەوشتی ئەو تیرە و خێڵە جۆراوجۆرانە لە دەریای "باکۆ" تاکو چیاکانی "بامیر" و لە نشێوییەکانی "کیرغیزیا" تاکو دەشتاییەکانی "لوت". زۆر سەرم لە کورغان سووڕمابوو، ڕێز و گەورەیی زۆرم بۆ زانایی کورغان دانا، کەوا توانیویەتی ئەو هەموو هۆز و خێڵ و تیرانە بکات بە یەك و بیانخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. لەو کاتەوە کە دژی "خاقان" هەستا و شۆڕشی بەرپا کرد.

لە کاتی یەکێك لەو کۆبوونەوانەدا بۆ یەکەمجار سەرکردایەتی هەڵمەتێکیان پێسپاردم، سەربەخۆ خۆم پێی هەڵسم. ئەویش لە کاتێکدا بوو، شازادە و سەردارە گەورەکانی وڵات سەرقاڵی لێکۆڵینەوەی تەنگوچەڵەمە و کاروباری ئیمپراتۆریەت بوون. یەکێك لە پۆستەچی و نامەبەرەکان خۆی کرد بەناو پیاوەکاندا و بەرەو کۆڕەکە هات و ڕایگەیاند کۆمەڵێك چەتە و

دەستدرێژکەری فارسی ڕووباری "ئاموردایا"یان بڕیوە و تاڵان و بڕۆی چەند دێ و کێڵگەی جووتیارەکانیان کردووە.

"کورغان" تەماشایەکی ئەفسەرە دانیشتووەکانی کرد و بانگی کرد و وتی:

-تەیموور. هۆ تەیموور برلاس:

لە دواوە لە شوێنەکەی خۆم هەستام و وەڵامم دایەوە، وتم:

-بەڵێ گەورەم. من لێرەم..

-تەیموور سەد سەرباز لەگەڵ خۆتدا بەرەو ئەو ئەسپانە بێنەرەوە.

-گەورەم، ئامادەی فەرمان و ئارەزووی بەڕێزتم. خێرا بە جۆش و خرۆشەوە بەرەو دەرگا ڕۆیشتم. بۆ ئەو کارە ئەشیا کە "حسێن"یان سەرکردەیەکی شارەزا بۆ ئەو کارە هەڵبژێرێت.

بەڵام دەرکم بەوە کرد، کورغان بۆ ئەم هەڵمەتە مەبەستێکی لەم کارەدا هەیە و دەیەوێت سەرنجی سەرۆك و سەرکردەکان کە لەو شوێنەدا کۆبوونەتەوە بۆ لای من ڕاکێشێت.

منیش زۆر هەستم بە گەورەیی کرد و شانازیشم بە خۆمەوە دەکرد کە بۆ ئەم مەبەستە دەستنیشان کرام. هەر ئەوکاتە فەرمانم بە شەیپوور لێدەرەکان دا فوو بە شەیپوورەکانیاندا بکەن و بە تەپڵ لێدەرەکانیشم وت، بۆ کۆبوونەوەیەکی کتوپڕ و خێرا لە تەپڵەکانیان بدەن.

پێش نیوەشەو ئەو تیپەی من فەرماندەیم دەکرد لەگەڵ دوو ئەفسەرە فارمانەکەمدا (کایدۆ) و (بێرکا) بە گورجی بەرەو سنووری فارسەکان کەوتینە ڕێ و بە درێژایی شەو بەسەر ئەو بەفرە نەرمەی، لە سەرەولێژییەکاندا باریبوو. لەبەر تیشکی مانگە شەوەکەدا، بە جوانی دەدرەوشایەوە دەڕۆیشتین.

لە بەرەبەیاندا گەیشتینە دامێنی گردەکان و شۆڕبووینەوە بۆ دەشتاییە نزمەکان کە ئاوی ڕووبارەکە دایپۆشیبوو. بەو ڕێگایەدا کە دەستدرێژیکەران پیایدا ڕۆیشتبوون، هیچ تەنگوچەڵەمەیەکمان نەهاتەڕێ. لە هەموو شوێن و ڕێگاکاندا پیاوانی داماو و ژنانی چاو بەگریان و ڕێنمایی ئەو ڕێگایەیان دەکردین کە چەتە فارسەکان گرتبوویانە بەر. پاش ئەوەی، بەنرخترین شت و جوانترین کیژ و بەهێزترین لاوی لادێکانیان بە تاڵان بردبوو.

ڕۆژێکی تەواو بە شوێن جێپێیاندا ڕۆیشتین و بەدوایانەوە بووین. هەتا گەیشتینە ئەو شوێنەی، لە ڕووبارەکەوە پیادا پەڕیبوونەوە و گەیشتبوونە بیابانەکە، تاکو بۆ ناو هۆزەکەی خۆیان بچنەوە.

پاشماوەی دەستدرێژیکەران لەسەر لی بیابانەکە بە ئاشکرا لەبەر تیشکی مانگەشەوەکەدا دیاربوو. بە درێژایی شەوێکی تەواو بەردەوام بەڕێوەبووین هەتا گەیشتینە ئەو مێرگەی، خێڵە چەتەکان خێوەتەکانیان پێش ماوەیەك تیادا هەڵدابوو. ئیتر ئێمەش لەوێدا وەستاین و ئاومان خواردەوە و پشوومان بە وڵاخەکانمان دا. و ماوەی کاتژمێرێکی تەواو بۆی نووستین. کە لە خەو هەستاین ئەسپەکانمان زین کرد، بەسەر لی بیابانەکەدا زۆر بە خێرایی غارمان دا و بۆی دەرچووین. پێش کەمێك بۆ نیوەڕۆ تۆزوگەردی کاروانەکە لە دوورایی چەند میلێکەوە لە پێشمانەوە دەرکەوت.

ئەوکاتە ئیتر فەرمانم بە سەربازەکانم دا بوەستن و دوو ئەفسەرەکەمم بۆ کۆبوونەوەیەکی کتوپڕی بانگکرد (کایدۆ) زۆر بە پەرۆش و پەلەوە وتی:

-یاڵا با زۆر بە زوویی و خێراییەوە بە دوای کاروانەکەدا غاربدەین. لەسەرخۆ وەڵامم دایەوە:

-نەخێر، کایدۆ!! پێویستە یەکەمجار ئەو جەنگاوەرانەی، دێن و بەرهەڵستیمان دەکەن لەناویان بەرین. ئیتر ئەو کاتە پیاوەکانی تری کاروانەکە ڕادەکەن، ئەوکاتە بێ بەرهەڵستی دەتوانین دەست بەسەر کەلوپەلی کاروانەکەدا بگرین.

بەڵام بێرکا بەرپەرچی قسەکەمی دایەوە و وتی:

-ڕەنگە جەنگاوەرەکان ڕابکەن و کاروانەکە لەگەڵ خۆیاندا ببەن و ئەم فرسەتە زێڕینەمان لەدەست بچێت.

بە بڕوایەکی تەواودوە وەڵامم دایەوە، وتم:

-ئێمە دەتوانین دوایان بکەوین و بیانگرین. خۆ ئەگەر یەکەمجار دەست بەسەر کاروانەکەدا بگرین. ئەوکاتە جەنگاوەرەکان ڕادەکەن و لە دواییدا دەگەڕێنەوە و لە کاتی گەڕانەوەماندا بە درێژایی ڕێگاکە هەڵمەت دەبەنە سەرمان.

لەبەرئەوە یەکەمجار، پێویستە لەسەرمان جەنگاوەرەکان تەفروتونا بکەین گشتیان لەناو بەرین. ئایا لەمەدا شتێك هەیە تێی نەگەیت؟ و ئایا لە پلانەکەم گەیشتی؟

ئیتر ئەوکاتە هەردوو ئەفسەرەکەم وەڵامیان دایەوە: سەرکردەی بەڕێز لە پلانەکەت گەیشتین و قایلین پێی.

ڕوومکردە (کایدۆ) و پێم وت:

-کایدۆ ئێستا سەربازەکانت بکە بە دوو بەشەوە، پاشان نیوەیان بەرەو لای چەپ ببە و نیوەکەی تریشی بەرەو لای ڕاست. و خۆشت لە نێوان هەردووکیاندا چاوەڕوان بە. هەتا من

هێرش دەکەم و ئەوکاتە تیروکەوانەکانتان بکەنە دوژمنان. پاشان بۆ لای ئەفسەرەکەی ترم بێرکا وەرگەڕامەوە و پێم وت:

-تۆش بێرکا پێویستە ماوەی سەد شەقاو دوور لە سەربازەکانی منەوە بوەستیت و سەربازەکانت وەك هێزێکی یەدەك ئامادەبن. هەرکە من هەڵمەتم برد، ئەوکاتە فەرمان بدە بە سەربازەکانت تیرە درێژەکان و تیرە دوورهاوێژەکانیان بەسەر سەرماندا بتەقێنن تاکو گشت فارسەکان تەفروتونا دەکەین و لەناویان دەبەین.

-بێرکا تێگەیشتیت؟

بێرکا وەڵامی دامەوە وتی:

-بەڵێ سەرداری بەڕێزم تێگەیشتم.

ئیتر بۆ لای سەربازەکانی گەڕایەوە و منیش سەربازەکانی خۆمم بەرەو پێشەوە برد.

پاش چەند چرکەیەك فارسەکان ئێمەیان دی. کە زیاتر چووینە پێشەوە، جەنگاوەرەکانیانم دەدی ئاوڕیان بۆ دواوە دەدایەوە و لە کاروانەکە جیادەبوونەوە، هەروەك من لەمەوپێش وتم دەیانویست بەرهەڵستیمان بکەن. لەسەرخۆ و هێواش بەرەو پێشەوە دەچووین، و بە ئەنقەست تۆز و خۆڵێکی کەممان لە زەوییەکە هەڵدەستاند بۆئەوەی وا تێبگەن، ئێمە تیپێکی بچووك و کۆمەڵێکی کەمین. کە بە تەواوی لە جەنگاوەرەکان نزیك بووینەوە بینیمان، ژمارەیان زۆر لە ژمارەی ئەو سەربازانەمان کەمتر بوو کە کایدۆ سەرکردایەتی دەکردن. سەرەك هۆزەکەی فارسەکان لە پێش جەنگاوەرەکانییەوە بوو، سواری ئەسپێکی سپیی ڕەسەنی عەرەبی ببوو. سەرۆکەکەیان، وایزانی ژمارەی هێزەکەمان لە ژمارەی جەنگاوەرەکانی زیاتر نین ڕووی گەشایەوە و شمشێرەکەی بەسەر سەریدا هەڵدەسووڕاند. بە توندی و تووڕەیی بەسەر پیاوەکانیدا قیژانی و تێیان خوڕی، دەستیانکرد بە هێرشکردن، شەیپوور لێدەری هێزەکەی ئێمەش لە هەمان کاتدا فووی کرد بە شەیپوورەکەیدا، و هێرشکردنی ڕاگەیاند.

پێشەنگی سەربازە نەبەردەکانم کرد بە ئازایەتییەکی بێوێنەوە هەڵمەتمان بۆ بردن. هەرکە دەنگی شەیپوورەکە بەرزبۆوە کایدۆ و سەربازەکانی لە دۆڵی ڕووبارەکەوە دەرپەڕین و لە هەردوولاوە دەستیان بە تیربارانیان کرد. هەروەها سەربازەکانی بێرکاش کە لە دواوە ئەڕۆیشتن دەستیانکرد بە تەقاندنی تیرە دوورهاوێژەکانیان و هاویشتنی تیرە درێژەکانیان.

تیر و ڕم هاوێژەکانمان نەیانهێشت ژمارەیەك لە سوارەکانمان هەڵمەت بەرن، چونکە لاشەی پیاوە بیانییەکان نیشانەیەکی باش بوو بۆ تیر و ڕمەکانیان.

تیرهاوێژ و ڕمهاوێژەکانمان سەرسامی و سەرلێشێواوی خستبووە ناو دەروونی فارسەکانەوە و ڕێگای بەکارهێنانی شمشێرەکانیانی لێگرتبوون. ئەوکاتە منیش پێشەنگی سەربازەکانی خۆمم کرد و بەناو جەنگاوەرانی دوژمناندا ڕەم پێدان و بەرەو سەرەك خێڵەکەی دوژمن هەڵمەتم بردو بۆی کشام.

لە کاتی هەڵمەت بردنمدا چۆنم بۆ ڕێبکەوتایە بە شمشێرەکەم لە دوژمنانم دەدا. بەڵام من نەمدەویست، بوەستم و شیربازییەکی درێژخایەن لەگەڵ دوژمناندا بکەم. چونکە مەبەستی من بە پلەی یەکەم سەرۆك خێڵەکە بوو. کاتێك هەڵمەتم دەبرد و بۆ پێشەوە دەچووم بەرهەڵستی شاڵاوێکم کرد کە سەرکردەی دەستدرێژیکەرەکان ئاراستەی منی کرد. بەڵام هیچ کەسێك لە ئێمە لەو شاڵاوەدا زەرەرمەند نەبوو. لەبەرئەوەی تیرهاوێژ و ڕم بە دەستەکانمان نزیکی کۆڕی شەڕەکە بوون. سەربازەکانی "کایدۆ" لەهەر چوارلاوە گەمارۆی دوژمنانیان دا.

هەروەها هەندێ لە سەربازەکانی "بێرکا" خێرا بۆ پێشەوە چوون تاکو بەرهەڵستی کشانەوەی هێزە سەرەکییەکەی فارسەکان بکەن.

منیش دەستم کرد بە گەڕان بە دوای سەرۆکی دەستدرێژیکەراندا تاکو تینوێتی خۆم بە خوێنی ئەو دابمرکێنمەوە. بینیم لەگەڵ یەکێك لە سەربازە ڕم بە دەستەکانمدا لە شەڕدایە.

خێرا بەرەو پیری چووم و شمشێرەکەم بۆ سەرەوە بەرزکردەوە و پیامداکێشا و پێش ئەوەی هەتا هەست بە هێرشەکەشم بکات، سەریم لە لەشی جیاکردەوە. دوای ئەوە ئیتر بە تەواوی شەڕەکە کۆتایی پێهات. ئاماری کوژراوەکانی دوژمنم کرد، ژمارەیان چل کوژراو بوو. هەروەها "بێرکا"ش وتی، خۆی و سەربازەکانی ئەو هەشت پیاوەی دوژمنیان کوشتووە کە هەوڵی ئەومیان داوە لە شەڕەکەدا ڕابکەن. منیش یانزە سەربازم لەدەست چوو. وە شەش سەربازیشم بریندار بوون. بەڵام هیچیان برینەکانیان کاریگەر نەبوو، وە گشتیان بە ئاسانی دەیانتوانی سواری ئەسپەکانیان ببن.

داوام لە عەبدوڵڵا کرد، کەللەسەری سەرۆکی دوژمنەکان خاوێن بکاتەوە چونکە دەمویست لە ئاڵتوونی بگرم و وەك کاسەیەك پێشکەش "کورغان"ی بکەم.

پاشان سەرۆکایەتی تیپەکەم کرد بۆئەوەی دەست بەسەر قافڵەکەدا بگرین. هەروەك لەمەوپێش بۆ ئەفسەرەکانم ڕوون کردبۆوە، پیاوە کاروانچییەکان ڕایانکرد بۆ گردەکان و هیچ بەرهەڵستییەکیان بەرامبەر نەکردین. بێجگە لە وڵاخە دزراوەکان و منداڵە دیلەکانی جووتیارەکان کاروانەکە بریتی بوو لە دە حوشتر و هەشتا ئەسپ و بیست چادری گەورە و

ژمارەیەك چادری بچووك و خوارنێکی زۆر تالانییەکی ئێجگار زۆر کە لە هەڵمەتەکانی پێشوودا دەستیان کەوتبوو. هەروەها بیست ژن، لە نێوانیاندا هەشت ژنی سەرۆك هۆزەکە و دەست و پێوەندەکانی تێدا بوو.

ماوەی دوو رۆژی ویست هەتا توانیمان تالانییەکان جیابکەینەوە و بیدەینەوە دەست خاوەنەکانیان و کچە دیلەکان و لاوەکان ببەینەوە و بیدەینەوە دەست دایك و باوکیان. لەم هەڵمەتەدا عەبدوللا بە درێژایی رووبارەکە و بە شێوەیەکی فراوان ناووناوبانگی منی لە ناو دەستوپێوەندەکانی کورغاندا بلاوکردبۆوە.

ئاوا من لەناو ئەو خەڵکە هەژار و سادانەدا وەك رزگارکەرێکم لێهات.

لەبەرئەوەی هەڵمەتەکە هەڵمەتێکی کتوپڕ و لە پێناوی تۆڵەدا بوو. هیچ رێگام بە تالان و برۆ و ئەتکردن نەدا. هەرچی ماڵ و دەستکەوتێکی هۆزە فارسییەکە هەبوو بە تەواوەتی لە بەردەم دیوانی "کورغان"دا دامنا.

"کورغان" لە بەردەم کۆمەڵی میر و سەردارەکاندا پیرۆزبایی لێکردم و پێی وتم:

-تەیموور کارێکی چاکت کرد!! ئەم سەرکەوتنەت دەکەین بە بەشێکی ئاهەنگەکانی سەری ساڵی تازە. هەر کە نوێژ تەواو بوو، وەرەوە بۆ لام تاکو پاداشتی خۆت وەربگریت.

کورغان فەرمانی دا، تالانییەکان جیاجیابکەنەوە و رێکیان بخەن.

ژنە دیلەکانیشی نارد بۆئەوەی خۆیان بشۆن و عەتر لە خۆیان بدەن. منیش پیاوەکانی خۆم ئێزن دان و چووم بۆ ناو چادرەکەی خۆم.

لەبەر ئەو کارە قورس و گرانە زۆر ماندوو و شەکەت ببووم. جلەکانم داکەند و کراسێکی ئەستوورم لەبەر کرد و چووم بۆ خۆشتن. و لەسەر کورسییەکی دلر دانیشتم ناتری گەرماوەکە دەستیکرد بە رژاندنی ئاوی گەرم بەسەر بەردەکاندا، تاکو وایلێهات ژوورە بچووکەکە پڕ بوو لە هاڵاوی گەرم. پاش ئەوە منیش لەسەر جێگاکە ماوەیەك نووستم و گەرمی بە هەموو گیانمدا گەڕا.

پاش کاتژمێرێك ناترەکە خەبەری کردمەوە و چوومە ژوورێکی تردوە. ناتری گەرماوەکە بە ئاوێکی ساردی روون کە لە رووبارەکەوە بۆی هاتبوو دەستی کرد بە شتنی لەشم و ماسوولکەکانمی باش شێلا و بووژامەوە و بە تەواوی حەسامەوە. پاشان چوومەوە بۆ ناو خێوەتەکەی خۆم و بەرگێکی کەتان و کراسێکی جوانم لەبەرکرد. و هەرکە بە تەواوەتی حەسامەوە و هیلاکیم دەرچوو. بەرەو دیوانی کورغان کەوتمەڕێ بۆئەوەی هاوبەشی ئەو دەعواتو ئاهەنگە بکەم کە بە بۆنەی سەری ساڵی نوێوە ساز دەکرا.

لەبەردەم ئەو ئاگرە گەورانەوە تێپەڕیم کە چێشتلێنەرەکان کردبوویانەوە. بەسەر ئاگرەکەوە بە ساغی مەڕیان دەبرژاند و ئەمدیو و ئەودیویان پێدەکرد. هەروەها ئەو ڕانی حوشترە گەورانەیان لە شیش دابوو لەسەر ئاگرەکان ئەمدیو ئەودیویان پێدەکردن. لە لایەکی ترەوە گۆشتی ئەو گۆلکە قەڵەوانانەیان لەسەر مقەڵی گەورە دەبرژاند و نانەواکانیش لە ئاردی گەنم و جۆ کولێرەی گەورەگەورەیان دەکرد و لە تەنوورە سەربەتاڵەکاندا دەیانبرژاندن. خۆشی و شادی هەموو لایەکی گرتبۆوە. هەرکە بە بەردەمیاندا ڕەت دەبووم جەنگاوەران و کۆیلەکان وەك یەك سڵاویان لێدەکردم و لەبەرم هەڵدەستان.

بە ڕاستی لام شتێکی زۆر خۆش و جوان بوو چونکە من دەکرێم بە فارەمانی ئەم ساڵە نوێیە.

دیوەخانەکەی کورغان فەرشی گەورەی تیادا ڕاخرابوو. زۆر بە جوانی بە بڵێسە ئاگر ڕووناك کرابۆوە. هەروەها مۆمدانی جوان جوان بەسەر دیوارەکاندا هەڵواسرابوون و زنجیری زێڕینی پیادا هاتبووە خوارێ.

پێشتر گشت سەرکردەکانی ئیمپراتۆرییەتی تەتەر کۆبوونەوەیان کردبوو.

لەم کاتەدا میر و سەرداران لەسەر دۆشەکی خوری دانیشتوون و پاڵیان دابوو بە سەرین و پشتی و ئەو سەکۆیانەی لەملاو لەولای چادرەکەوە دانرابوون و لە دەوری مقەڵی گەورە و مێزی نزم دانیشتبوون. هەر کە من چوومە ژوورەوە، سەرداران گشتیان ڕوویان گەشایەوە و شاد و خۆشحاڵ بوون.

"کورغان"یش ئیشارەتی بۆ کردم، لە تەنیشتییەوە و لەسەر فەرشە شاهانەکەی خۆی دایینیشاندم.

بە خۆشی و شادییەوە سڵاو و پێشوازی لێکردم و داوای لێکردم، هاوبەشی سەر سینییەکەی خۆی بکەم کە پڕ بوو لە خواردەمەنی هەمەجۆرەی باش و پڕ لە مەیش بوو.

پێی وتم: بەخێربێیت ئەی فارەمانی ئەم کاتە. بە ڕوویەکی گەش و خۆشەوە لەگەڵمدا دەستی بە قسەکردن کرد. هەموو سەرکردەکان و شازادەکانیش بێدەنگ و بێ چپە گوێیان ڕاگرتبوو.

کورغان شەوێ ئەسپە سپییە ڕەسەنەکەی سەرۆك خێڵە فارسییەکەی هێنا و بە بۆنەی ئەو هەڵمەتە سەرکەوتووانەوە وەك پاداشتێك پێشکەشی کردم.

هەروەها فەرمانیدا، دیوەخانێکم بۆ برازێننەوە و باشترین و جوانترین کەلوپەل و پێویستی بۆ دابین کردم. داوای لە عەبدوڵڵا کرد، هەرچییەکم هەیە بیباتە ناو دیوەخانە نوێیەکەمەوە. پاشانیش ژمارەیەك گەوهەری گرانبەهای پێشکەش کردم و لە خواردن و خواردنەوە تایبەتییەکەی خۆشی هەموو جۆرێکی بۆ ناردم. هەر پاداشتێکی دەدا بە من پاداشتێکی وەك ئەوەی من یان کەمتر لەوەی منیشی بە میرە ئامادەبووەکانیشی دەدا.

وا دیاربوو، حسێن زۆر تووڕە بوو لەوەی کورغان بەو شێوە تایبەتییە گرنگی بە من دەدا. ئیرەیی حسێن و ئەو پێناخۆشییە زۆرەی وای لە من کردبوو، لەو کاتەدا زیاتر داوا بکەم لەوەی کە شایانی خۆم بێت. لە نیوەشەودا کورغان پێی وتم:

-تەیموور دەمەوێت دیارییەکم لێداوا بکەیت. بڵێ بزانم چیت دەوێت؟

-سەرداری گەورەم، جێبەجێکردنی ئەو هەڵمەتە سەرکەوتووە لەژێر ئاڵای تایبەتی مندا بوو.

-ئاڵای برلاس- من کە تیپەکەم بۆ ئەو شەڕە گەورەیە بردبوو ئەو ئاڵایەم هەڵگرتبوو. لەبەرئەوە دەمەوێت، هەزار سەربازم بدەیتێ و بمکەیت بە فەرماندەی "شەهری سیبز" و دەوروبەری.

-تەیموور برلاس تۆ کەڵەشێری باڕی، وا نییە؟ دەزانیت بۆ ڕاگرتن و بەڕێوەبردنی هەزار پیاو، ئەگەر لە جەنگدا نەبیت چەند پارەی دەوێت؟

-بەڵێ گەورەم، بەڵام بەو هەزار سەربازە دەتوانم دەست بەسەر شاری (کارشی)دا بگرم.

بەڵام شاری "کارشی"، "لاداغی" کوڕم فەرمانڕەوایی دەکات و کاروباری بەڕێوەدەبات. ناتوانم ڕێت پێبدەم شارەکەی تاڵان بکەیت.

-کەواتە دەتوانم "بالخ" داگیربکەم. من دەتوانم بە هەزار سەرباز شاری "بالخ" بگرم و تاڵانی بکەم.. وا نییە؟

-بەڵام "بالخ" سەر بە (شای بالخ)ە "شامالك" ئایا تۆ دەتوانیت بە تەنها هەزار سەربازەوە شەڕ لەگەڵ "مالك"دا بکەیت؟ چاکە، من لەو بڕوایەدام تۆ بتوانیت.

-بەڵێ گەورەم، زۆر بە باشی دەتوانم.

-نەخێر، تەیموور من ڕێنادەم، ناخۆشی و شەڕوشۆڕ بکەوێتە نێوان من و "شامالك"ی شای "هیرات"ەوە.

-بەڵام گەورەم ئەو دەستدرێژیکەرانەی، لەمەوپێش لە ناوم بردن لە پیاوانی ئەو بوون.

-بەڵێ تەیموور، بەڵام من و "شامالك" دەبێت ئەو دەستدرێژییە و ئەو هەڵمەتە تۆڵەسەندنەوەیەی تۆ بە کارێکی دژایەتی دانەنێین.

-بەڵام (شامالك) ئەو دەستدرێژیکەرانەی ژێردەستی خۆی عاقڵ ناکات و سزاشیان نادات، من لەو باوەڕەدام ئەم هەڵمەتانە ئاگری شەڕ لە نێوانماندا هەڵدەگیرسێنێت.

-نەخێر، تەیموور، منیش سزای تۆ نادەم، ئەمەش جۆرێکی کەیە لە جەنگ، پێویستە تۆش ئەم جۆرە جەنگانە بزانیت و فێری ببیت.

ئێستا با بێینەوە سەر داواکارییەکانت. تۆ ئەگەر جەنگ نەبێت، ناتوانیت فەوجێك سەرباز رابگریت. بەڵام دوایی تیپێك سەرباز و شتی تریشت دەدەمێ.

پاشان ئەفسەرێکی خۆی بانگکرد و شتێکی بە گوێدا چرپاند دوای ئەوەی ئەوەی مۆسیقاژەنەکان دەستیانکرد بە لێدانی ئامێرەکانیان. و ئەو ژنە فارسییانەیان هێنا کە لە هەڵمەتە تۆڵەسەندنەوەکەدا دیلم کردبوون.

ژنەکان جوانترین و باشترین بەرگیان لەبەردا بوو. ڕووی خۆیان بە پەچەی ڕەش داپۆشیبوو. هەموویان بە بەردەم گشت میوانەکاندا ڕۆیشتن و لە دواییدا لە بەردەم "کورغان"دا ڕاوەستان. کورغانیش فەرمانی پێدان، وتی:

-خۆتان ڕووت بکەنەوە.

ژنەکانیش بۆئەوەی شەرم بکەن و تەریق ببنەوە دەستیان کرد بە ڕووتکردنەوەی خۆیان، بێجگە لە پەچەکانیان و هاتنە پێشەوە، دووبارە کورغان فەرمانی پێدان، وتی:

-سەمابکەن.

ژنەکان بە ڕووتی، بە پەچەکانیانەوە دەستیانکرد بە سەماکردنێکی ژنانەی تایبەتی خۆیان.

ژنەکان چونکە دەیانزانی، ئایانبەن بۆ بازاڕی کۆیلەکان و لەوێ بیانفرۆشن بە شێوەیەکی جوان و ڕێکوپێك دەستیانکرد بە سەماکردن و دانەوینەوە و لەش و ناوقەدە ناسك و باریکەکانیان بە شێوەیەکی شارەزایانە و لەسەرخۆ بادەدا و دووربوون لە بادانی سمتیان بەو شێوە ناشیرینەی ژنانی بازاڕی دیل فرۆشەکان دەیانکرد.

کورغان بە شێوەیەکی زۆر گەرمەوە پێی وتم:

-تەیموور، بە ئارەزووی خۆت دوو ژنیان بۆ خۆت هەڵبژێرە.

-چی؟.. گەورەم دوو ژن؟

-تەیموور، بێگومان تۆ بۆ ئەو هەڵمەتە دوور و دژوارە لە پێناوی تاکە ژنێکدا نەڕۆیشتوویت. وا نییە؟

یان ڕەنگە تۆ لە دوو ژن زیاترت بوێت؟

-نەخێر گەورەم، ناتوانم لە دوو ژن زیاترم بوێت.

هەرچەندە لەناو ژنەکاندا، ژنێکی فارسی جوان و ڕێکوپێك و سپی پێست و چەند ساڵێکیش لە من گەورەتر بوو، زۆر سەرنجی منی بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو. بە تەواوی ئارەزووی هەڵساندبووم و حەزم لێدەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا بە ڕاستی نەموێرا، ئەو ژنە هەڵبژێرم. هۆکەشی ئەوە بوو من دوودڵ بووم لێی چونکە لەوە دەترسام، ئەم ژنە شارەزایی زۆری لە ژنێتیدا هەیە و لە خۆشم گەورەتر بوو، لەوەش دەترسام پاشەڕۆژ خۆی بەسەرمدا زاڵ بکات، و زۆرم لە خۆم کردو هەرچۆنێك بوو، ڕووم لە مەمکە جوان و خڕ و پڕ و گەیوەکانی و سمتە بەرز و پڕەکەی وەرگێڕا.

دەستم کرد بە تەماشاکردنی دوو کیژی فارسی تر، ئەو دوو کیژە چاوەکانیان زۆر جوان بوو، دەمیشیان سەرنجی پیاوی ڕادەکێشا. یەکێکیان لە تەمەنی خۆمدا بوو. ئەوی تریشیان دوو ساڵ یان سێ ساڵ لە من بچووکتر بوو. هەردووکیان لەشیان نەرم و شل و پڕ و باڵاشیان بەرز و ڕێکوپێك بوون. وا دیاربوو، پاشەڕۆژ ببن بە دوو ژنی شۆخ و شەنگ و جوان. لەبەرئەوە بە کورغانم وت:

-گەورەم ئەو دوانەم هەڵبژاردووە.

کورغان فەرمانی دا، بیانهێننە بەردەممان، هەرکە پەردەیان لە دەوریاندا گێڕا پێی وتن:

-پەچەکانتان لە ڕووتاندا لابەن. و ناوی خۆتان بە ئەمیرە نوێیەکەتان بڵێن.

پەچەکانیان لابرد و لەبەردەمماندا ڕاوەستان، دەموچاویان وەك لەشە ناسکەکانیان جوان و ناسك بوون.

پاشان گەورەکەیان بە هێواشی و نەرمییەوە وتی:

-ناوم لەیلایە.

بچووکەکەشیان وتی:

-ناوی منیش زیبایە.

هەرکە ناوەکانی خۆیان وت، کورغان پێی وتن:

ئێوە بۆ من نین. بەڵکو بۆ ئەم شازادە لاوەن کە فارەمانی ئەم سەری ساڵە نوێیەیە.

کورغان هەرکە شادی و دڵخۆشی لە ڕووی دوو کیژەکەدا دی بە کوڵ دەستی کرد بە پێکەنین.

دوو کیژەکەش گەشانەوە و زۆر شادومان بوون، چونکە دران بە من، نەك بەو پیاوە پیرە ڕیش سپیە کە چاوێکی کوێر، و ئەوی تریشیان دەرپۆقیبوو.

کورغان فەرمانی دا، جلی جوان و گرانبەهایان بۆ بێنن. هەرکە دوو کیژەکە بەرگەکانیان لەبەرکرد و لە پشت پەردەکە چوونە دەرێ. "کورغان" منیشی بەرێکرد و ڕوویکردە ئامادەبووان و وتی:

-میوانەکەمان ئارەزوو دەکات، تۆزێك سەرپەرشتی کاروباری ماڵەکەی خۆی بکات.

سەردارەکان و میرەکان هەرکە بینیانم بەرەو دەرگاکە دەڕۆم و دوو کچەکەش بەدوامەوەن. بە گاڵتە و گەمەپێکردنەوە تەماشایان دەکردم. یەکێك لە پیاوەکان بە دەنگی بەرز وتی:

-بەیانی تەیموور خەبەری نابێتەوە و ناشیەت بۆ بارەگای تیپ.

قسەخۆشێکی تر وتی:

-بەڵێ.. تەیموور سبەینێ حەزیش ناکات چاویشی بە ئەسپ بکەوێتەوە.

ئامادەبووان تا توانیان دەستیانکرد بە قاقای پێکەنین. هەرکە گەیشتمە بارەگا نوێیەکەم. بینیم چادرێکی زۆر جوانم بۆ ڕازاوەتەوە و ژووری نووستنەکەی گەرم کرابوو چونکە عەبدوڵڵا چەند مقەڵییەکی ئاگری تیادا دانابوو. هەرکە ڕووناکی و گەرمی پشکۆکان دامرکانەوە جلەکانم داکەند و هەردوو ژنەکەمم ڕاکێشا بۆ سەر جێگای نووستن، چەند کاتژمێرێك لە شەو تێپەڕی نەمدەزانی لە کام ژنیان زیاتر خۆشیم لێدیوە. لەیلا شارەزاییەکی تەواوی هەبوو لە هونەری ڕابواردن و ژنێتیدا. بەڵام ئەو ئارەزووە گەرمە و بە پیرەوەچوونە و کەفوکوڵە ئاگرینە و لەشە گەرمەکەی زیبا زاڵتر بوو بەسەر شارەزاییە زۆرەکەی کچە گەورەکەدا.

لەو شەوەدا بە تەواوی ڕاستی ئامۆژگارییەکانی کورغانم بۆ دەرکەوت دەیوت: "ئەگەر تەنها خۆشییەك هەبێت ئەویش هەر ژنە".

لە کازیوەی بەیاندا و لەو کاتەدا، ئەو دوو لەشە نەرم و گەرمە ناسکانە لەژێر لێفە ئاوریشمەکەوە، لە لەشمەوە ئاڵابوون. هەستم کرد، ئیتر بەسە و تێربووم، بیرم لەوە کردەوە، ئێستا من تیپێکی تایبەتی و ئەسپی ڕەسەن و چادری شاهانە و پێویستی زۆر نایاب و دوو ژنی جوانم هەیە.

هیچ شتێك لەم شتانەشم نەکڕیوە، بەڵکو بە هۆی شمشێرەکەمەوە دەستم کەوتوون. بیرم لە شتی تر دەکردەوە کە تەنها بە هۆی شیرەکەمەوە دەستم دەکەوێت.

* * *

# مارەگردنی شازادەیەك

لەیلا سەلماندی، لە بەڕێوەبردنی کاروبار و چاودێریکردنی دیوەخانەکەمدا خانمێکی زۆر چاکە. زۆر شارەزا بوو لە چەندوچۆنێتی لەگەڵ بازرگان و فرۆشیاری خواردەمەنییەکاندا و جێبەجێکردنی ئیشوکاری عەبدوڵڵا و هەڵسووڕاندنی ئەو نۆکەرە پیرەی، لە دیوەخانەکەمدا ڕامگرتبوو. زمانە پاراو و قسە خۆشەکانی وایکردبوو ژیانمان ژیانێکی هێمنانە و پڕ لە خۆشی و شادی بێت.

کاروباری تایبەتی زیباش ئەوە بوو، چاودێری کاروباری تایبەتیم و حەسانەوەم بکات. و خواردن و خواردنەوەی بۆ ئامادە دەکردم و بەرگ و چەکەکانمی بە خاوێنی و چۆنم بەپێویستایە بە ڕێکوپێکی ڕایدەگرت. لەگەڵ ئەوەی، من حەز و ئارەزوویەکی زۆرم هەبوو، ژنێکی شازادەی ڕاستیم هەبێت و ببێت بە ژنم و لەگەڵ خۆمدا بیبەم بۆ کۆشکی شاهانە. هەرچەندە من لە تێکەڵاویمدا شادی و خۆشی تەواوم هەبوو لەگەڵ ئەو دوو ژنە کەنیزەکەی لە دیوانەکەمدا بوون. وە هەردووکیان مۆسیقازانێکی باش و گۆرانیبێژێکی باشیش بوون و هونەری ڕابواردن و سەرنجڕاکێشان و ئارەزووی باشیان هەبوو.

هەرچەندە لەیلا زۆر بەهێز و زیرەکتر بوو لە زیبا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من هەر پادشێك، هەبوایە لە وەرزی زستاندا چوون یەك بەسەریاندا دابەشم دەکرد بۆ ئەوەی هەردووکیان ڕازی بن و بەختیاریان بکەم.

هەندێ جار هێرشی کورت کورت و هەڵمەتی پارێزگاری هەبوو، وای لێدەکردم، تیپەکەم و فەرماندەیم لە جەنگدا باش و ڕێك بخەم. بەڵام من تۆزێك لەوە بێزار و دلگران بووم، کورغان هێزێکی تایبەتی نەدەدا بە خۆم. چونکە حسێن لەوەرزی زستانیشدا هەر بەردەوام بوو لە بەهێزکردن و دروستکردنی هێزەکەی لە کابولدا.

هەروەها حسێن، (باداکشان) و (کونـدوز)یشی درابوویە و بەدانپیانانی هەمووان ببوو بە سەردارو فەرماندەی هەموو ئەو ناوچەیە کە لە کۆشکی (سالی)یەوە درێژببۆوە تا دەگەیشتە دەربەندی (خەیبەر).

لە ڕاستیدا حسێن سەرکردەیەکی لێهاتوو، وە لە جەنگاوەرە پلە یەکەکان بوو. گەرچی، هێشتا تەمەنی لە بیست و پێنج تێپەڕ نەببوو. هەر لەو کاتەوە بە تایبەت هەستم دەکرد، ئەو یەکەم بەرهەڵستیکەری سەرەکیمە لە ئیمپراتۆریەتی تەتەردا. هەروەها منیش دەستمکرد بە گەڕان بە دوای قورس و گرانترین کاردا و هەوڵێکی زۆر و بەردەوامم دەدا، وا لە "کورغان" بکەم ددان بە

هـێز و توانـامدا بنـێ و بـڕوای بـه شایسـتەییم هـەبێت. هـەروەك چـۆن لەمـەوپێش دەستدرێژیکەرەکانی فارسیم لەناوبرد. وەهاش دەستمکرد بە قەڵاچۆکردن و لەناوبردنی چەتە و ڕێگرەکان، هەڵمەتم دەکردنە سەریان و تەفر و توونام دەکردن و لەناوم دەبردن.

هەر ژن و شتومەکێکم دەست بکەوتایە بە ساغ و سەلامەتی ئەمهێنایەوە بۆ بارەگای شاهانە.

لەم بارەیەوە (عەرەب شا) بۆ "کورغان"ی نووسی و پێی وت من بیستوومە تەیموور لـە کاتی هەڵمەتبردنیدا بۆ سەر دوژمـن، هیـچ ڕەحـم و بەزەییـەکی نییـە، ئەوکاتـە عـەرەب شـا منـی نەدەناسی. پاش تێپەڕبوونی چـەند ساڵێك ئینجا منی ناسی. لەڕاستیدا ئەوکاتـە مـن گـەنجێکی خوێنگەرم و لەخۆبایی بووم، ئەوەی کردم و دەمکـرد بـۆ ئـەوە بـوو، لـە دڵ و دەروونـی کورغـاندا سەرنج و تێڕوانینێکی تایبەت ڕابکێشم.

لەڕاستیشدا ئەوکاتە نە زۆردار و نە دڵڕەق و نە سەرکێشیش بووم.

کورغان لـە لایـەن خۆیـەوە چاودێری دەکردم و ئاگاداری هـەموو هەڵسـوکەوتێکم بـوو. لـە بەیانییـەکی ڕۆژێکی بـەهاردا کورغـان بردمییـە ئـەو ژووره تایبەتییـەی خۆیـەوە کـە یەکـەمجار پێشوازی تێدا کـردم و خستمیە نـاو ڕیزەکانی خۆیـەوە. پاشان بـە شادی و ڕێکوپێکییـەوە ڕووی تێکردم و وتی:

-تەیموور دانیشە، من تـەماشای تۆماری تایبـەتیتم کردووە، لـە بـەردەم پـیرەمێردا دانیشتم و هەوڵم دا، لە ڕوویدا بیری بخوێنمەوە. چونکە لەو هەفتانەی پێشوودا هیچ شتێکی گرنگم ئـەنجام نەدابوو. لەبەرئەوە نەمتوانی ئەو هەست و ترسەی لە دڵمـدا بـوو بشارمەوە. ڕەنگـە تیپەکـەم لـە دەست بچێت پێش ئەوەی لە هەڵمەتـە گەورەکـەدا، تاقیکردنـەوەی ڕاستـی بێتـە پێشـەوە. منیش هیچ دڵنیا نەبووم لەو خێر و خۆشییەی، لە کاتی ئاهەنگەکانی ساڵی تازەدا بەرم کەوتبوو.

کورغانیش لەڕاستیدا پیاوێکی ئاڵۆز بوو، مرۆڤ بە ئاسانی تێینەدەگەیشت بە شێوەیەك لێی پرسیم، هیچ نیشانەی دۆستایەتی پێوە نەبوو، وتی:

-کوڕە لاو دەتوانیت بە کورتی کاروباری وڵاتەکەمم پێبڵێیت و تێمبگەیەنیت؟

-ڕەنگە تا ئەندازەیەك بتوانم. بەڵام بۆچی؟

-چونکە تۆ ئاگاداری قسەوباسی سەربازگەیت. خۆ ئەگەر بە ژنەکانتەوە خەریك نەبوویت.

-گەورەم دوو ژنـەکەم هەر لە چادرەکەمدا دانیشتوون.

-بەڵام عەبدوڵڵای نۆکەرت زۆر سەربەستانە بە دەوری چادرەکاندا دەسووڕێتەوە. تـۆ ئـەمـەت پێ وتووە؟

-گەورەم من ناتوانم ڕێگای ئەو هاتووچۆ و سووڕانەوەیەی لێبگرم.

-کار هەرچۆنێك بێت، پێویستە لەسەرت، بە کورتی، ژیان و کاروبارم پێبڵێیت و شێوەیەکی ڕاست و ڕەوانم بدەیتێ.

-باشە، حسێن جێ و ڕێی خۆی لە ناوچەی خوارووودا بەهێزکردووە و دەسەڵاتی خۆی بەسەردا سەپاندووە.

-ئایا حسێن بۆ من دەبێتە جێگای ترس و لەرز؟

-هیچ ترس و بیمێکی بۆ تۆ نییە، تاکو بێهێزی و ناتەواویت دەربخات. ئەو دەیەوێت، هێزێکی هەبێت بۆ ڕاگرتن و ئاسایشی وڵات یارمەتیت بدات. بۆئەوەی دوای تۆ بتوانێت بچێتە جێگات.

-چاکە، لەسەر قسەکانت بەردەوام بە.

-"لاداغ"ی کوڕت بە تەواوی زاڵە بەسەر ئەو ناوچەیەی کە لە (بخاری)یەوە دەستپێدەکات تاکو دەگاتە (باڵخ).

هەروەها "سەیفەدینی پیرەمێرد" پیاوێکی بێتوانایە و توانای بەسەر سەمەرقەنددا نییە.

بەڵام نورەدینی کوڕی دەتوانێت هێز و توانا و گەورەیی خۆی تا (تاشقەند و نوتڕار) ڕابگەیەنێت. بەڵام دەربارەی سەرکردە و سەرداری تیپە دوورەکان جگە لە شتێکی زۆر کەم نەبێت هیچی تر نازانم.

گەورەم ئەمەی، پێم وتی شتێکی زۆر دیار و زانراوە.

-زۆر باشە تەیموور، بەڵام دەزانیت، (بایەزید جالیر) -کە ئەمە ئەفسەرێکە لە بنەماڵەکەم- خەریکی پیلانە لەگەڵ (حاجی برلاس)ی مامتا. بۆئەوەی ئەمساڵ باجم نەدەنێ؟

هەردووکیان لەمەوپێش باجیشیان داوە.

-نەخێر گەورەم، من هیچ ئاگاداری ئەم کارەیان نیم.

-بەڵام تۆ بۆ ئەم مەبەستە چی دەکەیت؟

-من دەستدەکەم بە زۆرکردنی تیپەکانی شەهری سیبز و گەمارۆی ئەو دوو پیاوە و ئەو خێڵ و تیرانە دەدەم کە لە گرد و چیاکاندا لەژێر فەرماندەی ئەواندان وایان لێدەکەم سەر بۆ مەرجەکانم شۆڕ بکەن.

-تەیموور، بێگومان تۆ دەتەوێت ببیت بە سەرکردەی ئەو هێزە، وا نییە؟

-بەڵێ گەورەم، ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی، ئەوەی "برلاس" لەناو خۆیاندا دووبەرەکییان تێبکەوێت. مەبەستی بوونی ئەم هێزەش ئەوەیە، ئامادە بێت و هەر هەڵگەڕانەوە و پیلانێك کە رووبدات تێکوپێکی بدات و لەناوی بەرێت.

-وابزانم تۆ لە قسەکانتا تا ڕادەیەك ڕاست بیت. دیارە، تۆ باش هەست بە شت دەکەیت.

دەفتەری تۆمارەکەت ئەوە دەسەلمێنێت، کات و ڕۆژ چی پێویست بکات ئەوە بکەیت و پێویست چۆنی بوێت وا بکەیت؟

-بەڵێ گەورەم..

-من بە قسە و بیری تۆ دەکەم، بەڵام پێش هەموو شتێك تۆ پێویستت بە ژنێکی شازادە هەیەو پێویستت بە سامانێکی زۆر زیاتر هەیە لەو سامانەی تاراغای پەرەمێرد بۆتی جێدەهێڵێت.

هەستم بە نائومێدییەك کرد. چونکە نەمدەزانی چ سەردارێك قایل دەبێت، کچەکەی لە من مارە بکات. چونکە من بە دوای ژنێکدا دەگەڕێم و ژنێکیشم دەوێت لە چینی شازادەکان بێت.

بەڵام ئەوەندەی نەخایاند کورغان ئەو تەمومژ و نائومێدییەی لەسەر ڕەواندمەوە و ڕووی تێکردم وتی:

-بەڵام من ئەم کارەتم بۆ جێبەجێ کردوویت و لە ڕۆژی یەکەمی مانگی جەمادی یەکەمدا، ئەلجای شۆخ و شەنگی کچەزام لە تۆ مارە دەکەم. ئەلجای خوشکی حسێنە و من دەتوانم مارەییەکی بۆ دابین بکەم کە یەکسان بێت بە هەموو ئەو سامانەی حسێن تاکو ئێستا کۆیکردۆتەوە.

-گەورەم. زۆر زۆر سوپاست دەکەم.

-من جگە لە سوپاس، شتێکی ترم دەوێت، ئەمە وا مەزانە و وای تێنەگەیت، شتێك بێت بەرامبەر برادەری باوکت بێت یان بەرامبەر بە خۆت بێت. من پێویستیم بە دڵسۆزی و ڕاستی پیاوێك هەیە کە کەسی خۆم بێت و پاشان لە ڕاست و چەپ و باکوور و باشووری وڵاتەکەمدا ببێت بە سەرکردە و سەردار، لەناو نەوەکانمدا. منیش لە پاشەڕۆژدا هەست بە دڵنیایی و ئاسایش بکەم. چونکە تۆ و حسێن یەکسانن لە هێزدا.

-تۆ دەتەوێت، من و حسێن هەردەم ئامادەبین لەگەڵ یەکتردا بجەنگێین.. سەرداری گەورەم، وانییە؟

-ئەگەر ئەتانەوێت پێکەوە یارمەتی یەکتر بدەن، ئەوکاتە گشت کات لە دژایەتی یەکتردا دەبن.

منیش هەمووکات دەتوانم یارمەتی یەکێکتان بدەم بۆ ئەوەی لەنگەر لە نێوانتاندا ڕابگرم.

بەڵام من لە ڕاستیدا دەمەوێت، وەك دوو هەڤاڵی خۆشەویست بن و یەك یارمەتی یەکتر بدەن. حسێن جەنگاوەرێکی سەرکەشە و تۆش سەرکردەیەکی هەڵمەتبەری شارەزا و ڕەند و لەسەرخۆیت. دەتوانن یەك لەیەکتر کەڵك وەرگرن، منیش سوود لە هەردووکتان وەرگرم.

-گەورەم، وا بزانم من تێدەگەم، تۆ چی دەڵێیت. و من پێی قایلم و قبووڵیشمە.

-تەیموور، تۆ خەریکە شت تێبگەیت و فێریش بیت. و هیچ چاریشت نییە دەبێت قایل بیت و گوێڕایەڵی فەرمانەکانیشم بیت چونکە من ئێستا هەر شاهێنشام.

بەڵام ئێستا بڕۆ کاروباری خۆت بۆ زەماوەند و ژن هێنانەکەت ئامادەبکە.

-گەورەم ئەوەی، فەرمانی تۆ بێت جێبەجێی دەکەم و زۆر بە شادی و دلگەرمیشەوە بەرەو پیرییەوە دەچم.

-هەروەها پێویستە، ئەوەشت پێبڵێم و خەبەریشت بدەمێ "خاتوو ئەلجای" جوانیشە و دەوڵەمەندیشە!! پاشان فەرمانی ڕۆیشتنی پێدام.

بۆ ناو دیوانەکەی خۆم گەڕامەوە بۆئەوەی سەرنج و بیر لەم پلە تازەیەی ژیانی خۆم بکەمەوە.

لەیلا یەکەم کەسێك بوو، هەستی بە نائارامی و شێواندنی بیرم کرد.

لە کاتێکدا لە نزیك مێزی شەترەنجەکەوە دانیشتم و بە بەردەکانی دەستم بە گەمەکردن کرد. لەیلا لێی پرسیم وتی:

-ئەمیرەکەم بێتاقەتە، وانییە؟

-نەخێر لەیلا من بێتاقەت نیم.

-کورغان هیچ دەنگوباسێکی ناخۆشی پێنەوتوویت؟!

-من نازانم، بەڵام لە ڕۆژی یەکەمی مانگی جەمادی یەکەمدا ئەلجای کچەزای مارە دەکەم.

-شازادەی گەورەم تۆ حەزدەکەیت، ئەلجای جێی من بگرێتەوە و ببێتە خانم و گەورەی ئەم دیوانە؟

لە ڕاستیدا هیچ ناخۆش نەبوو، ئەلجای ببێتە گەورە و خانمی دیوانەکەم. بەڵام هەستم کرد، هیچ زیان ناکەم ئەگەر دڵنەوایی لەیلا بکەم و خاتریشی ڕابگرم. وەڵامم دایەوە و وتم:

-من بۆ دیوانەکەم کەس لە تۆ بە باشتر و شایستەتر نازانم. هەروەها هیچ کەسێکیش لە تۆ جوانتر نابینم. بەڵام لەیلا ئەوەشی خستە سەر وتەکانم و وتی:

-هەتا هیچ ژنێکیش نییە لە من دڵسۆزتر بێت بۆ تۆ و زیاتریش تۆی خۆشتر بوێت.

پاشان دەستی بە گریانێکی توند و زۆر بە کوڵ کرد. هەوڵم دا، ئێشوئازار و ئەم خەبەرە کتوپڕییەی بڕەوێنمەوە. پێم وت:

-بەڵام پێویستە ئەوە بزانیت، قسەی کورغان یاسایە و کەس ناتوانێت لە قسەی دەربچێت و بەرهەڵستی بکات.

لەیلا لە کاتی ئامادەکردنی کار و پێویستی زەماوەند و ژنهێنانەکەمدا هەندێ جار زۆر شاد و دڵخۆش بوو. بەرامبەرم زۆر هەستی خۆشەویستی دەردەبڕی، بە هەموو شێوەیەك هەوڵی دەدا، خۆشی و شادی بخاتە دڵمەوە. هەندێ جاریش کە لەگەڵمدا، دادەنیشت زۆر بێ زەوق و بێتاقەت بوو. بە تەواوی غەم و پەژارە و بێزاری لە ڕوویدا دیاربوو. لەگەڵ کارەکەر و ژێردەستەکانیدا زۆر تووڕە و دڵڕەق بوو، بە ڕەقی لەگەڵیاندا هەڵسوکەوتی دەکرد. بەڵام زیبا وا دیاربوو هەستی دەکرد، هیچ زەرەر ناکات و هیچیشی لەدەست ناچێت چونکە دەیزانی، گەورەی دیوەخان نییە و حەزیشی لەو کارە بوو چونکە لەژێر سایەی خاتوو ئەلجای دا لەگەڵ لەیلادا چوون یەك دەبێت.

لەبەرئەوە کە بیستی من "خاتوو ئەلجای" دەهێنم هیچ ناخۆشی و بێزاری و بەرهەڵستییەکی بەرامبەرم دەرنەبڕی.

بەڵام زۆرجار زیبا بە گوێیدا دەچرپاندم و دەیپرسی:

-ئایا خاتوو ئەلجای دەوڵەمەندە؟

-بەڵێ وەك هەموو ژنە شازادەیەکی وڵاتی تەتەری دەوڵەمەندە.

-پێکەوە لەگەڵیدا لە کۆشکێکی پڕ گۆم و باخچەدا دەبین؟

-من هیوادارم، وا بێت. گشتمان پێکەوە لە کۆشکەکەی خۆمدا لە کۆشکی سپی شاری شەهری سیبزدا بژین.

-ئایا ئەو کۆشکە خۆشە؟

-ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەو کۆشکە زۆر خۆش بوو. هیوادارم ئێستاش هەر بەو خۆشییە مابێتەوە.

دەستمکرد بە باسکردنی کۆشکی سپی لە کاتێکدا من منداڵ بووم، ئەو کۆشکە چەند خۆش و دڵگیر بوو.

نازانم زیبا بۆچی ئەوەندە دڵخۆش و شادومان بوو لە کاتێکدا، پێمدەوت، زۆر بە خۆشی و بەختیارییەوە لەو کۆشکەدا ژیان دەبەینە سەر. هەتا وای لێهات کەفوکولێکی سۆز و خۆشەویستی بە هەموو لەشیدا گەڕا. ئەو کەفوکوڵ و خۆشەویستیە وای لێکردم، هەست بە تام و لەزەتێکی نوێنە بکەم، لە کاتێکدا بە تەنها پێکەوە پاڵکەوتین و لەگەڵیدا.. بێگومان زیبا لەو کەفوکوڵ و خۆشییەدا زۆر بە تەواوی لەگەڵمدا ڕاست بوو.

دەیویست بە هەموو شێوەیەك کەیف و شادی بە دڵم بکەینێت. چونکە لە کاتێکدا، من خەیام دەکرد و شك و گومانم لا نەدەهێشت کە بە خۆشی و نارەزووی دڵی خۆی دەژی نارەزووی جنسی بە شێوەیەکی گەرم و بێوێنەوە نەگرا، تام و لەزەتێکی بێوێنەی پێدەبەخشیم.

ئیتر لەو کاتەوە تێگەیشتم، پیاوان بۆچی وەك شەیتان شەڕ دەکەن و هەوڵدەدەن سامان و دراییەکی زۆر کۆبکەنـەوە تاکو دڵی ژنـەکانیان بخەنـە نـاو شادی و کەیف و خۆشییەوە. لەگەڵ ئەوەی من نەشمدەزانی، کەی کورغان دەمکات بە سەرکردە و سەرداری شاری شەهری سیبز. وام بە باش دەزانی بە زیبا بڵێم بەم زووانە دەگوێزینەوە بۆ کۆشکی سپی.

عەبدوڵڵاش هەرکە بیستی بەم زووانە بۆ شارەکەمان دەگەڕێینـەوە زۆر شاد و دڵخۆش بوو، عەبدوڵڵام ئاگادار کرد هیچ دەنگوباس و زانیارییەك بڵاونەکاتەوە، لەوە زیاتر کە مـن نیازم وایە کچەزاکەی کورغان بهێنم.

عـەبدوڵڵا فەرمانەکەمی جێبەجێ کـرد، هـەتا لـە کـاتی ژن گواسـتنەوەکەشمدا، کـەس لـە ناوەڕۆکی ئـەو ڕێکەوتننامـە سەربازییەی نێوان مـن و کورغـان ی نـەدەزانی. کورغـان ناردی بـە دوای هەموو سەردار و سەرکردەکانی گشت تـیرە و خێڵەکانی، ژێردەسـتەڵاتی خۆیـدا. تێگەیشـتن، کورغان دەیەوێت ئـەم ئاهـەنگی ژنهێنانـەی مـن بۆ ئـەوە بەکاربـهێنێت تـاکو بـۆ هەڵمـەتی بەهار پلانی کۆتـایی دابنێـت. یـان دەیـەوێت، شـادی و خۆشی بـە نـاو سـەردار و سـەرکردەکاندا بڕژێنـێ چونکە دەیزانی نرخی یەکخستنی مەسەلەی سەربازی و ئاهەنگە گشتییەکان چەندە.

لەگەڵ ئەوەشدا من بەرامبەر ئەو مەبەستانەی هیچ هەستم بە بێزاری نەکرد.

هەروەها منیش دووبارە لە هەردوو ئەنجومەنەکەدا دەبمـە تـەوەرەی سـەرنجدان، ئەنجومـەنی سـەرداره گەورەکان و ئەنجومەنی پیاوماقووڵ و تێگەیشتووەکانی ئیمپراتۆرییەتی تەتەر.

ئاوەها دیوانی کورغان لە یەکەم ڕۆژی مانگی جـەمادی یەکەمدا، پڕبوو لـە خـەڵك، هەروەك چۆن لە کاتی ئاهەنگـەکانی سـەری سـاڵی ڕابـوردوودا ئەدرەوشایەوە. ئاوەهاش لـەو یەکـەم ڕۆژەدا دەدرەوشایەوە و بە درێژایی ڕۆژ میوانەکان لە مێزە پڕ لە خـواردن و خواردنەوەکانـەوە دەچوون

بۆ ئەو مێزانەی، لەژێر سێبەری درەختەکاندا ڕازێنرابوونەوە. یان ئەو خەڵکانە کۆمەڵ کۆمەڵ تێکەڵ بە یەکتر دەبوون کە لەسەر گیا سەوزەکاندا چوارمەشقی دانیشتبوون و گوێیان لە گۆرانیو حەیرانی شارەزاترین گۆرانیبێژەکان دەگرت، کە لە هەموو ناوچەیەکی جیهانەوە بۆ ئەم بۆنە تایبەتیە هێزابوون. لە کاتی بەیانیدا بە تەنها لە بەردەم قازییەکانی شەرعدا ئامادەبووم بۆئەوەی ڕێ و ڕەسمی مارەکردنی ژنەکەمم گوێ لێبێت و ناوی خۆم و ناوی ژنەکەمو ناوی شاهیدەکان لە تۆماری ڕەسمیدا ببینم.

تا ئەوکاتە من ئەلجایم نەدیبوو. چونکە تا ئەو کاتە هەر لەژێر دەستی ئەو ژنانەدا بوو، وە زۆربەی کاتیان بە جوانکردن و ئامادەکردنییەوە خەریك کردبوو، بۆئەوەی بە جوانی و ڕێکوپێکی ئامادەی ڕێ و ڕەسمی مارەکردن و گواستنەوەی بکەن.

لە کاتی نیوەڕۆدا ئەلجای دەرکەوت. ئیتر لەو کاتەوە ئەو دەرکەوت هیچ شتێکم لە ئاپۆرەکەو ئاهەنگەکە و دەوروبەری خۆمدا نەدی. کەژاوەکەی.. لە خێمەکەی خۆی هاتە دەرێ و بە هێواشی بەسەر ئەو فەرشە درێژەدا دەڕۆیشت کە یەکسەر ڕاخرابوو دەیبرد بۆ ئەو شانشینەی، لە بەردەم دیوانەکەی کورغاندا سازکرابوو. ئەو دیوانەی کە من لەگەڵ شاهێنشادا تیایدا دانیشتبووم.

ئیتر لەو کاتەدا تەپڵ لێدەرەکان دەستیان کرد بە کوتانی تەپڵەکانیانو تەپڵەکان زۆر بە توندی دەنگیان دەدایەوە. هەر لەوکاتەشدا شەیپوور لێدەر و زوڕناژەنەکانیش فوویان کرد بە ئامێرەکانیاندا و ئەو ناوەیان بە دەنگ و ئاوازی مۆسیقا خۆشەکانیان پڕکرد لە بەزم و شادی.

کەژاوەکەی "ئەلجای" بە هێواشی لە نێوان ئالآی شەکاوەی تیرە و هۆزەکانەوە جوولا کە سەردار و شازادەکان بەرزیان کردبۆوە و لە تەنیشتیانەوە پاسەوانەکان بە بەرگی تایبەتییەوە ڕاوەستابوون.

"ئەلجای" کراسێکی گوڵی هەناری بێ قۆڵی لەبەردا بوو، بە ڕەنگی ئالتوونی وێنە و گوڵی لەسەر نەخش کرابوو. لەسەر کراسەکەشەوە کراسێکی تری تەنکی ئاوریشمی سپی لەبەردا بوو. ملێکی زێڕینی بەرزی هەبوو. دامێنەکەی زۆر درێژ بوو. لە دوایەوە شەش کارەکەر بۆیان هەلگرتبوو. قژە ڕەشە درێژە جوانەکەی بە کڵاوێکی جوان کە لە داوی زێڕ دروست کرابوو ڕازانلبۆوە.

کە پەچە ڕەشەکە لەسەردەم و لووت و گوێکانی لابرا هەستم کرد بە ڕاستی شەیدای جوانییە بێوێنەکەی بووم. بە ڕاستی شازادەیەکی شۆخ و شەنگ و بێوێنە بوو. بەڵام هەروەك ڕۆژگار، دەریخست ئەگەر "ئەلجای" کەنیزەکێك بوایە، وام دادەنا جوانترین ژنێك بێت، خودا

دروستی کردبێت و بۆ منی ناردبێت بۆ ئەوەی شاد و بەختیارم بکات. ڕەنگ و ڕووی گەنم ڕەنگ بوو. هەروەك خەڵکانی ژووروی وڵات دوو کولمەکانی بەرز و قوت بوون. چاوەکانی لە چاوی کچە فارسەکان زۆر گەشتر و جوانتر بوون. بەڵام لە سەرنجدان و سەرنج ڕاکێشانیدا لە چاوەکانی ئەوان کەمتر نەبوو.

جووڵاندنی لێوە ناسکەکانی وا سەرنجی ڕاکێشابووم، نە ئاگام لە خۆم مابوو، وە نە گوێشم لە هیچ وشەیەکی ڕێ و ڕەسمی مارەکردنەکە بوو. جگە لە پیرۆزباییەکەی زەینەدین، نەبێت لە کاتێکدا، وتی: "خوا خێر و خۆشی و ئارامی و بەرەکەتی خۆی بەسەر ئەم دوو کەسەدا بڕژێنێ".

چونکە کە زەینەدین ئەو وتانەی وت، ئیتر ئەلجای جێی هێشتم و بە تەنها گەڕایەوە ناو چادرەکەی خۆی. پاش نوێژی ئێوارە، و لەو کاتەی، چراوگەکان و چراکان داگیرسێنران و دەعوات دەستی پێکرد. ئەلجای گەڕایەوە و هاتەوە ناو ئاهەنگەکە. پۆشاکەکانی پێشووی داکەندبوو، بەرگێکی ئاوریشمی سپی لەبەرکردبوو. قژی بە هیچ شتێك نەڕازاندبۆوە، جگە لە هەندێ مرواری نەبێت، دابووی لە قژی.

لەو شەوەدا، لە نێوان میوانەکاندا دەهات و دەچوو، وەڵامی پیرۆزباییەکانیانی دەدایەوە، بە ڕاستی ئەوەندە جوان بوو هەر لە مانگی چواردە دەچوو. باڵایەکی بەرز و شۆخ و شەنگی هەبوو هەر لە نەمامێکی سپی چنار دەچوو.

لە کاتی ئاهەنگەکەدا هیچ ماوەم نەبوو، قسەی لەگەڵدا بکەم. کورغان لە کاتی ئاهەنگەکەدا شتی بە نرخی پێشکەش بە میوانەکان دەکرد. لەوانە جلوبەرگی گرانبەها و شمشێر و خەنجەری ڕازاوە بە مرواری و پشتێنی نایاب و شاڵی نایاب و گران بەها".

وە لەوکاتەی، خزمەتکارەکان شتومەکەکانیان هەڵگرتبوو، لە نێوان میوان و ئاهەنگ گێڕەکاندا دەهاتن و دەچوون و دابەشیان دەکردن و لەبەرئەوەی ئەو شتانەی پێشکەش بە میوانەکان دەکران بە ناوی منەوە بوو، پێویست بوو منیش لەگەڵ شاهێنشا کورغاندا بێم و بچم.

لە کۆتاییدا کورغان فەرمانی بە شەیپوورلێدەرەکان دا، بە خەڵکی ڕابگەیەنن، ئاگاداربن و گوێڕایەڵ بن. ئیتر لەو کاتەدا یاریدەدەرەکەی بەیانێکی خوێندەوە تیایدا ئاشکرای کرد، من بەرزکرامەوە بۆ پلەی عەقید و کرام بە فەرماندەی شاری شەهری سەبز هەرکە سەردار و شازادەکان گوێیان لەو بەیانە بوو، هەندێ لە شازادە و سەردارەکان دەستیان بە هەلهەلە لێدانێکی توند کرد. بەڵام "بایەزیدی جالیرو حاجی برلاس" کە نەیانتوانی بە دەم بانگەوازەکەی کورغانەوە بۆ ئاهەنگی ژنهێنانەکەم نەیەن. زۆریان پێ ناخۆش بوو. بە تایبەت لەوکاتەدا کە

یاریدەدەرەکەی کورغان پێی ڕاگەیاندن، پێویستە هەریەکەیان تیپێک لە تیپەکانیان ئامادە بکاتو بیخاتە ناو ئەو لەشکرەی بۆ من ئامادە دەکرێت. وە دەستنیشانی (موسا جالیر) و (جاکوبرلاس) کران بۆ سەر تیپی ئەو دوو تیپە.

ئەم ئاشکراکردنە گڕی ڤین و تووڕەیی تەواوی لە سنگی بایەزید و حاجی برلاس دا بە تینتر کرد. چونکە (موسا و جاکۆ) زۆر دیار و ناسراو بوون لە بەرهەڵستیکردنی ئەو دوو سەردارە خێڵەکییانەدا. وە لە کاتی خوێندنەوەی بەیانەکەدا حسێنیش زۆری پێ ناخۆش بوو، وە زۆریش ڕووی گرژ بوو.

منیش لە نزیکیەوە ڕاوەستابووم و مافی خۆشی بوو کە لە ڕیزەکانی پێشەوەدا ڕاوەستێت. چونکە یەکێك بوو لە خانەوادەکانی بۆوکێ. ئا لەو کاتەدا بە حسێنم وت:

-حسێن من هیچ زەرەر و زیانێکم بۆ تۆ نابێت. و من ڕێزی تەمەن و پلە و پایەی سەربازیشت دەگرم.

وە لەبەرئەوەی، من ئێستا خوشکەکەتم مارە کردووە، تەنها ئەمەندەم دەوێت، ببم بە هەڤاڵت.

-بە ڕاستی ئەوە ڕاستە، من تا ئێستا نەمبیستووە، تۆ هیچ قسەیەکی خراپت دژی من کردبێت و هیچ هەڵمەتێکی خراپیشت بۆ سەر من نەبردووە.

-هەروەها پاشەڕۆژیش هیچ شتێك لەو بارەیەوە نابیستیت و من تەنها ئەوەم دەوێت بە پاکی خزمەتی کورغان بکەم و تۆش پێویستە بە پاکی خزمەتی بکەیت. براکەم لەم بارەیەوە دەتوانین هەردووکمان پێکەوە خزمەتی بکەین.

-زۆر چاکە، براکەم.

کە خوێندنەوەی بەیانەکان کۆتایی هات. عەبدوڵڵا ئەسپە سپییەکەم کە سەراپا بە ڤوماشێکی ئاوریشم داپۆشرابوو. وە تا سەرزەوی پیادا هاتبووە خوارێ، هێنایە بەردەم ئەو تەختەوە کە ئەلجای لەسەری دانیشتبوو.

"ئەلجای" لە شوێنەکەی خۆی هەستا و منیش لە تەنیشتییەوە ڕاوەستام. وە لە کاتێکدا، دەستم بەر لەشی کەوت لە شەرماندا هەموو لەشم کەوتە لەرزین بەرزم کردەوە و لەسەر پشتی ئەسپەکە دامنیشاند. پاشان ئەسپەکەم بەسەر ئەو ڕێگایەی بە فەرش داپۆشرابوو، بۆ بەر دیوانەکەی خۆم ڕاکێشا. ئەفسەرانی تیپەکەم لە بەردەم چادرەکەمدا ڕووبەڕوو ڕاوەستابوون و شیرەکانیان دەرکێشابوو، سەقفێکی کەوانەییان لە بەردەم دیوانەکەمدا دروستکردبوو.

ئەلجایم لەسەر پشتی ئەسپەکە داگرت و لەو کاتەی دامگرت، هەستم کرد هەموو لەشی بە توندی دەلەرزێت. پاشان پێکەوە بەو ڕێگایەی، بە شمشێر سەری گیرابوو ڕۆیشتین. لەو کاتەشدا سەربازەکانم سڵاویان بۆ کردم و پاشان بڵاوەیان لێکرد.

لەناو دیوانەکەدا بەربووکەکانی "ئەلجای" پێداویستیەکان و ئەو شتانەی پێویست بوو بۆیان هێنا و ئەو جێگا نووستنەی کورغان پێشکەشی کردبووین، عەتر و گوڵاو پرژێنیان کرد و هەرچیمان پێویست بوو بۆیان ئامادە کردین و چادرەکەمانیان بەجێهێشت. لەیلا و زیباشیان لەگەڵ خۆیاندا برد. ئەمە یەکەمجارم بوو، بە تەنها لەگەڵ ئەلجایدا بمێنمەوە.

چوومە ژووری نووستنەوە، بۆ ماوەیەك لە بەردەم ژنە شازادەکەمدا ڕاوەستام و سامێکی گەورە دایگرتم. گەرچی لە ڕاستیدا ئەلجای یەکەم کەسێك بوو لە ژیانمدا، بە ترس و لەرزەوە لە بەردەمیدا ڕاوەستابم. نەمدەزانی چی وای لێکردم، لە بەردەم (ئەلجایدا هەست بە ترس و لەرز بکەم.. لە خۆمم دەپرسی:

-ئایا خانەدانییەکەی بوو، یان گەورەیی کەسایەتییەکەی خۆی بوو، یان جوانی باڵابەرزە جوانەکەی بوو؟!!

بۆم دەرکەوت، ئەلجای وەك هەموو ژنێکی تر نەبوو. هەروەها لە ژیانیدا کارێکی واینەکرد، ببێتە تێکدانی ئەو ژیانەی، پێکەوە دەژیاین.

لە ڕاستیدا، لەگەڵ ئەوەی چوار ساڵ لە من بچووکتر بوو، وە چەند پەنجەیەکیش لە من کورتتر بوو، هەستم دەکرد، لە کاتێکدا تەماشام دەکرد و قسەم لەگەڵدا دەکرد، لە بەردەمیدا زۆر خۆمم بە کەم دەزانی. ئەلجای بە شەرمێکی زۆر تەواوەوە دوواندمی، وتی:

-ئەمیرە خۆشەویستەکەم وەرە پێشەوە..

بەرەو ڕووی چوومە پێشەوە و چاوم لەو وێنە پەری ئاساییەی بڕیبوو کە لەبەردەممدا ڕاوەستابوو. وەڵامم دایەوە، وتم:

-ئەمیرەکەم سوپاسی ئەو هەستە بەرزەت دەکەم.

-ئایا تۆ بە من دڵخۆش و شادمان نیت؟!

-شازادە بەنرخەکەم، بێگومان بە شێوەیەکی گەورەییو سەیرەوە من زۆر دڵخۆش و شادومانم پێت. هەروەك لەناو هەزارەها ژندا هەڵمبژاردیت وایە و تا پلەی پەرستنیش پابەندم پێتەوە..!!

-چاکە، بەڵام ئەوەم لێت دەوێت، ئیتر پێم مەڵێ شازادە من زۆرم پێخۆشە، پێم بڵێیت ئەلجای یان ژنەکەم. منیش زۆر دڵخۆش و شادومانم پێت.

هەرکاتێك دەستم لە لەشی دەدا، لە بەرامبەریدا هەستم بە شەرم و ڕێزێکی زۆر دەکرد.

لەشی جوانترین نەرمترین لەشێك بوو، لە جوانی و نەرمیدا هیچ ژنێك لەو ژنانەی لەمەوپێش دیبوومن و ناسیوومن لەشی وەها جوان و نەرمیان پێوە نەبوو. بە ڕاستی لە پەرییەك دەچوو لەو پەریانەی، لە بەهەشتی یەزداندان. زۆر شۆخ و بەهێز و لەش ماسوولکاوی بوو، لەشی ڕێك و پڕ و جوان بوو. مەمکەکانی زۆر بە قوتی و پڕی لە هەرەتی لاوێتیدا لەسەر سنگییەوە بەرز ببوونەوە.

کاتێك، تامی خۆشی و شادی لەشیم چەشت هێز و توانا و سەرنج ڕاکێشانمی زۆرتر کرد. ئاوەها پاش ئەو شەوە، و پاش ئەوەی بۆ یەکەمجاریش تام و چێژێکی زۆرم لە لەشە پاراوەکەیدا چێژت. بە پەرۆش و دڵەڕاوکێوە لێی پرسیم:

-ئەمیرەکەم ئایا لەگەڵ مندا شاد و بەختەوەریت..؟!! ئایا هەروەك لەیلا و زیبات خۆشدەوێت منیشت وەها خۆش دەوێت؟!!

-ئەلجای، من تۆم خۆشدەوێت و بە شێوەیەکیش خۆشم دەوێیت ناتوانم بیر لەوە بکەمەوە، تۆ بخەمە تای تەرازووی بەراوردکردنی هیچ ژنێکەوە!!

-تەیموور، تۆش، خۆشەویستێکی شۆخ و شەنگی منیت. ئەمە تەنها وەڵامی منە.!!

پاشان بە خۆشی و گەمەکردنەوە گازی لە گوێم گرت و خۆیدا بەسەرمدا بۆئەوەی لە باوەشمدا بنوێت.

ئەو وەڵامەی، دامەوە ڕاستبوو، چونکە پاك و ڕەوانی و بە پێرەوەچوونی تەواوی ئارەزووەکانی، گشت پاشماوەی بیرەوەری و ئارەزوویەکی کەنیزەکەکانمی لە مێشکمدا سڕییەوە.

ئەوەشم بیرچوو، بڵێم لە ڕۆژی زەماوەند و ژنهێنانەکەمدا بوومە جێگای هیوای هەموو وڵاتی تەتەرییەکان. و بوومە قیبلەی هیوا و ئاواتەکانیان. و بیرم لەو بەرزکردنەوەیە نەدەکردەوە کە بەرزکرابوومەوە بۆ پلەی عەقید و بیرم لە مارەییەکەی ئەلجای نەدەکردەوە کە وای لێدەکردم، تیپەکەم بەهێزبێت و شکۆدارتر بێت.

ئەمە ئەو ترس و بیمە بوو کە بووکەکەم لە شەوی زاوایەتیدا تووشی کردم و بۆی هێنام. و ئەوەشی لەگەڵ خۆیدا بۆ هێنام کە وای لێکردم بەسەرمدا زاڵبێت تێك و پێکم بدا. و ئەم شتەش هەر هەمان شت بوو کە ئادەمی لە بەهەشتدا پێ دەرکرا.

ئەگەر ئەلجای زۆرتر بژیایە، ژیانم زۆر جیاوازتر دەبوو. وە شمشێرەکەم نەیدەتوانی بۆ وەدیهێنانی ویستەکانی خوا هیچ شتێك بكات. چونکە ئەو خۆشەویستییەی من بەرامبەری ئەو هەبوو، بێگومان نابینای دەکردم و لەسەر ڕێگای ڕاست لایدەدام..!!

* * *

## کوڕی چاوەڕوانکراو

ساڵەکانی یەکەمی فەرمانڕەواییم لە شەهری سیبزدا نموونەیەکی جوانی شادی و بەختیاری کەسایەتی و لەخۆبایی بوونم بوو. ئەوکاتەی، دەستم کرد بە چاککردنەوە و ڕێکوپێکردنی کۆشکی سپی و "ئەلجای"یش لەگەڵمدا بوو، خۆش و شادییەك بەسەرمدا باڵی کێشا وایلێکردم. ڕێگای ڕاستی لێ ون کردم. ئیتر ئەوکاتە تێگەیشتم و هەستم پێکرد، خۆشی و ڕابواردن لەگەڵ ژندا تەمەنی کورتە. هەروەها ئەو خۆشی و شادییەی، لەوکاتەدا بووم بە سەردار و سەرکردەی شەهری سیبز و باڵی بە سەرمدا کێشا، هەتاهەتایی نیە و بەردەوام نابێت و نامێنێت. لەبەرئەوە پێویستە بە هەموو سادەیی و ڕاشکاوییەکەوە ئەوە بڵێم من گەنجێکی سەربەرز و سەرگەرم بوومو بۆ ماوەیەکی کەم لە ڕێگای ڕاستی لامدا. ڕێگای پاشەڕۆژ و سەروەریم. من بە هۆی ئەو مارەییە زۆرەی ئەلجای بۆی هێنابووم، و بە هۆی ئەو دیارییە زۆرانەوە کە کورغان و سەردارەکانی پێشکەشیان کردبووم، توانیم، کۆشکەکەم بگەڕێنمەوە بۆ گەورەیی و سەروەری چاخی جارانی.

من و ئەلجای ئەوەمان بینی، چۆن دووبارە دیواری کۆشکەکە چاککرایەوە و دیواردکانی بۆیە کرا و وەك بەفری سپیی لێهات. هەروەها ئەوەشمان بینی، چۆن هونەرمەندانی سەمەرقەند و هیرات. ناوەوەی کۆشکەکەیان جوان کردەوە و گەڕاندیانەوە بۆ چاخەکانی هەرەتی و جوانی و ڕێکوپێکی و شکۆداری جاری جارانی. هەروەها بینیمان، چۆن باخچەکانی سەرلەنوێ پڕبوونەوە لە گوڵی جوان و گەشاوە و چۆن حەوزە مەرمەرە سپیەکان و گۆمە بچووکەکانی پڕبوونەوە لە ئاوی پاك و خاوێن و تیشکی مانگەشەوی زیوینیان تیا دەدرەوشایەوە.

لە ڕاستیدا تەنها لە ماوەی دوو ساڵدا بەهەشتێکی زۆر جوانمان دروستکرد.

کاتێك درەختەکان سەرلەنوێ بووژانەوە و پێگەیشتنەوە، ئەلجای بە ڕوویەکی خۆشەوە ڕووی تێکردم و وتی:

-تەیمووری خۆشەویستم، من گەورەی ئەم کۆشکەم و ئەوەی من ئاواتی بۆ دەخوازم و هەستم بۆی دەجووڵێت، ئەوەیە ئێستا تۆ چۆنیت هەر وابیت و منیش ئێستا چۆنم هەروا بمێنمەوە. جگە لەوە زیاتر گرنگی و گوێ بە هیچی تر نادەم.

-خۆشەویستەکەم من ناتوانم، هەروا بمێنمەوە.

-بۆچی؟ تۆ گەورە و سەرداری شەهری سیبزی بەناوبانگی و گشت فەرمانێکت جێبەجێ دەکرێت و ئەسپی ڕەسەنت هەیە و سەربازی ئازاد و ئەبەردت هەیە. خۆشەویستەکەم من زۆر شانازیت پێوە دەکەم. بەڵام دەزانیت ئەم هەموو گەورەیی و سەروەرییە زۆر کارم تێناکات و دڵم پێی خۆش نییە؟

-بە ڕاست؟.. دوای ئەوە، ئەمانەی دەبینی هەمووی بە هۆی شیرەکەمەوە، وەدەستم هێناوە؟

کار هەر چۆنێك بێت من بە هۆی شیرەکەمەوە تەنها یەك گەوهەرم دەستکەوتووە. کە وێنەی نییە لە جوانیدا. ئەو گەوهەرەش بێگومان تۆیت.

پاشان سەری لووتیم ماچکرد. تۆزێك بێزاری نیشاندا. وەك ئەوەی وام پیشان بدات، گوایە لە ماچەکەم بێزارە. بەڵام لە ڕاستیدا سەرزارەکی وا خۆی پیشاندەدا.

پاشان بە نازێکەوە وتی:

-بەڵام پێویستە، ئەوە باش بزانیت، من تۆش و شمشێرەکەشتم وەدەست هێناوە و بردوومەتەوە.

-ئەوە ڕاستە.. ئەوە ڕاستە..

-سەرداری گەورەم تۆ بە هۆی شیرەکەتەوە سوودی تەواو وەردەگریت و مەدالیایەکت دەست کەوتووە. بەڵام من ئا ئێستا خەریکم بەری ئەو مەدالیایە بدەم.

-خۆشەویستەکەم ئەو بەرە چییە..؟

-ئەوە، هەروەك ئاواتمە، کوڕە بۆ تۆ.!!

کاتێك ئەمەی وت پشتی تێکردم و بەرەو دیواری باخەکە ڕۆیشت. بە دوایدا ڕامکرد تاکو پێی گەیشتم لێم پرسی:

-چی..؟ کوڕ بۆ من..؟ ئایا تۆ سکت پڕە..؟

-بەڵێ.. تەیمووری خۆشەویستم من دەمێکە سکم پڕە!!

-بەڵام بۆچی ئەوکاتەی، هەستت کردووە، سکت پڕە پێت نەوتووم؟

-تۆی.. ژن پێویستە لەوە بێگومان بێت، پێش ئەوەی شانازی پێوە بکات. هەرچۆنێك بێت تۆ سەرقاڵی نمایشی سەربازەکانت و ئاڵا شەکاوە جوانەکەت بوویت.. لەبەرئەوە وام بە چاك زانی، چاوەڕوان بکەم، تا کاتی گونجاو دەڕەخسێت.

بەڵام تۆ نابینیت سکم گەورە بووە؟

-بەڵێ.. بەڵام نەدەچووە ئەقڵمەوە، سکت پڕبێت.

-باشە، تەیموور.. هەرخۆشت دەوێم؟.. تەنها کەمێك ماوەمان ماوە پێش ئەوەی کە..

-بێگومان.. بێگومان من هەر خۆشم دەوێیت.

پاشان دەستی ئەلجایم گرت و بردمەوە بۆ ناو کۆشکەکە کار بۆ ماوەیەك بە شێوەیەکی ئاسایی بەڕێوە دەچوو. هەر کە دەچووم بۆ ڕاو لە شاخ و گردۆڵکە دوورەکاندا، و لە دەرودەشت و باخەکاندا بەردەوام ئەلجای لەگەڵمدا بوو. لەڕاستیدا ئەلجای سوارچاکێکی زۆر شارەزا و لێهاتوو بوو. هەروەها ڕاوچییەکی بێوێنەش بوو. بازەکانی بۆ ڕاوکردن و نێچیرگرتن باش ڕاهێنابوو. بەڵام کە سکی تەواو بەرز بۆوە، ئەو جوانییەی جارانی وەك کچێك نەما.

من زۆر کەم لای دەبووم. چونکە حەزم نەدەکرد، بەو شێوەیە بیبینم. و حەزیشم نەدەکرد، بزانێت، ئەو جوانی و سەرنجڕاکێشانەی لە پێش چاومدا نەماوە.

بە ڕۆژ خۆم لەگەڵ جاکۆ و موسا و ئیلشی و ئەفسەرەکانی کەدا سەرقاڵ دەکرد.

شەوانیش بە دوای لەیلا و زیبادا دەگەڕام کە لە مانگی یەکەمی هێنانی ئەلجایەوە پشتگوێم خستبوون. لەگەڵ ئەوەشدا ئەلجای سەربەستی تەواوی دابوو بە لەیلا کە کار و باری خزمەتکارو کارەکەر ببات بەڕێوە. و هەرچی پێویستی ماڵ هەبێت لە فرۆشیارەکان بکڕێت.

بەڵام لەیلا وەك جاری جارانی نەمابوو. لەیلا پێویستی سەرشانی بەرامبەرم وەك فێرم کردبوو، لە هونەری زەوق و ڕابواردندا، بە تەواوی بەجێ دەهێنا.

بەڵام وا دیاربوو پەرۆش و ئارەزووە زۆرەکەی جاری جارانی کەم بووبێت و نەیمابێت.

بەڵام زیبا کەوتبووە ناو ئەو خۆشی و شادی و سامانە زۆرەوە، کە ئاواتی بوو بە دەستی بهێنێت. ئەو زیاتر بە کەیفتر و زەوقتر بوو وەك لەمەوپێش.

ئەگەر ئەلجای ئەو ئارەزووە زۆرەی بەرامبەر بە ژن هەمبوو نەیتوانیایە دابمرکێنێتەوە ئەوا زیبا دەیتوانی ئەو تین و کڵپە.. زۆرەم دابمرکێنێتەوە، کە هەموو پیاوێك هەیەتی و هەستی پێدەکات.

هەروەها زیبا لە شەوە درێژەکانی زستاندا بەردەوام هاوبەشی جێگای نووستنی دەکردم.

زۆری ئەو پیاوانەی برلاس کە کورغان داوای لێکردبوون، پەیوەندی بە هێزەکەمەوە بکەن. بەردەوام بۆ خزمەتکردنم دەهاتنە ناو ڕیزی تیپەکانمەوە.

زۆربوون و گەورەبوونی ئەو تیپانەی لە دەوروبەری ڕووبارەکە مۆلگایان بەستبوو. وای لە جالیر و حاجی برلاس کرد بێدەنگ دانیشن و هیچ کارێکی نابەجێ نەکەن کە ساڵی نوێ هاتە پێشەوە وای لێکردن، بەشە باجەکەی خۆیان بدەن.

هەروەها واشی لێکردن، ئامادە بن و لەگەڵمدا بێن بۆ ئەو ئاهەنگانەی لە کۆشکی سالیدا دەکران.

-کورغان کە بیستی ئەلجای سکی پڕە زۆری پێ خۆش بوو. بەڵام زۆریشی پێ ناخۆش بوو کە زانی ناتوانێت، هاوبەشی لە ئاهەنگەکانی سەری ساڵی نوێدا بکات.

کاتێک کورغان ماوەی ئەوەی بوو، بە تەنها بمبینێت، ڕووی تێکردم، وتی:

-ئاوا تۆ توانیت، وا لە بایەزید و حاجی برلاس بکەیت، بێتە ژێر ڕکێفتەوە و باجیان لێوەربگریت.

-بەڵێ گەورەم، ئەوان نەیانتوانی هیچ کەسێک هان بدەن، یان بتوانن هیچ ئاژاوەیەک بنێنەوە.

ئێستا ئەوان لەژێر دەستمدان و لەگەڵیشمدا ڕێکن.

-تەیموور.. ئەوان ئێستا لەگەڵ منیشدا ڕێکن.

بەڵام من بڕوام بەم دوو کەسە نامۆیە نییە. بەڵام کاروباری پاسەوانەکانت و سەربازەکانت پشتگوێ نەخەیت. چونکە تۆ لە هێمن ترین بەشی وڵاتەکەم دایت و تیپێکی گەورەت هەیە، دەتوانیت ئەو بەشەی خاکی وڵاتەکەم بە چاکی بپارێزیت.

-گەورەم من لەوە دڵنیام. چونکە نورەدین لە باکوورەوە دەمپارێزێت و تۆش لە بەشی باشوورەوە دەمپارێزیت.

-تەیموور ئەمساڵ هیچ هەلێکت بۆ نەڕەخسا بتوانیت لە ناوچەکەتدا بێیتە دەرەوە.

-بەڵێ گەورەم..

-پێویست بوو لە سەرت، بە درێژایی سنوور زیاتر تێکۆشانی خۆت زیاد بکردایە. گەرچی لەگەڵ ئەوەشدا دەروازەی ئاسنینی دەستنیشانی سنوورتی بۆ کردوویت. لەگەڵ ئەوەشدا، من داوای هیچ یارمەتییەکم لێنەکردوویت. وای پێویست دەکرد، ساڵی ڕابوردوو، هێرشێکی تەواو بکەیتە سەر هەندێ ناوچە..

بەڵام وا دیارە ئەلجای نەیهێشتووە، وا بکەیت. تەیموور.. وا نییە..؟

-نۆهـ. نەخێر گەورەم، من پێویستم بە چەند کاتێك هەبوو تاکو بتوانم جێگا و ڕێگای خۆم پتەو بکەم و شارەکە سەرلەنوێ بنیات بنێمەوە.

-تەیموور.. تەبیعەتی بێهێزی پیاوان وایە زۆر بە دڵرەقی و ئازایەتی و هەوڵێکی زۆرەوە بجەنگن لە پێناو شتێکدا کە لەمەوپێش دەستیان نەکەوتووە. وەك لەوەی بجەنگن لە پێناو شتێکدا کە لەمەوپێش دەستیان کەوتبێت. بە تایبەت کە ئەو شتەشیان زۆر بێت.

-بەڵێ گەورەم.. زۆربەی زۆری پیاوان بەوە قایلن. لە کاتێکدا، سەروەت و سامانیان هەبێت و بە ئاسایشیش بژین.

-تەیموور.. بەڵام تۆ نابێت وەك ئەوان بیت.

-بەڵێ.. من لەوانە نیم..

-تەیموور.. تۆ ئێستا دەوڵەمەندیت و ئاسایش باڵی بەسەرتا کێشاوە..، ئەویش بە هۆی ئەو جێگا و ڕێگایەوەیە، نزیکیت لەناو جەرگەی ئیمپراتۆریتەوە کە بەردەوام سنوورەکەی ئاژاوەی تیادا ڕوودەدات.

ئاسایش تەنها لە ناوجەرگەی وڵاتدا هەیە..!!

ئەویش بە هۆی ئەو پیاوانەوەیە، سنوورەکەی دەپارێزن و هەردەم ئامادە و هوشیارن. ئەویش یا لە ترسایە، یا ئەو تەماعەیە، بە هۆی شەڕەوە، ڕانە مەڕ و دەستکەوتیان لە دراوسێکانیاندا دەستدەکەوێت.

بەڵام ئەم جۆرە پیاوانە، ناتوانن سەردارێك بپارێزن، یان ژنەکانیان بپارێزن، لە کاتێکدا ژنە ناسك و نازدارەکانیان باڵیان کێشابێت بەسەریاندا و زاڵیش بن بە سەریاندا.

-بەڵێ گەورەم.. قسەکەت ڕاست و قسەی ژیرانەیە. لە وتە و ئامۆژگارییە بە سوودەکانی، تێگەیشتم و بۆم دەرکەوت، پیاوێکی زانا و تێگەیشتووە.

کاتێك هاتمەوە بۆ شەهری سیبز چەکی هەڵمەتبردنم ساز و ئامادە کرد. چونکە ویستم بۆ "کورغان"ی بسەلمێنم من شایانی ئەو بەرپرسییەم کە داویەتی بە من و خستوویەتیە سەرشانم.

-جاکۆم کرد بە سەرکردەی تیپی سوارەی قودس. هەروەها لەبەرئەوەی موسا شارەزاییەکی بێوێنەی هەبوو، لە بەکارهێنانی تیر و، هاویشتنی تیرە دوورهاوێژەکاندا. من ئامنا بە فەرماندە و سەرکردەی تیپی سوارەی سووك. دەمویست، بیکەم بە هێزێکی جیاواز بۆ پاراستنی باڵی چەپ. سەرکردایەتی باڵی ڕاستیشم دا بە داود.

خۆشم بۆ خۆم باشترین شیر بەدەست و چاکترین سوارەم هەڵبژارد، بۆئەوەی بیانکەم بە هێزێکی هەڵمەتبەری گەرۆك و خێرا و ئەو تیپەم ڕاهێنا بۆ کاری هێرشبردن و گەڕانەوە بۆ ناو تیپە قورسەکەی جاکۆ کە بنکەکەی لە ناوەڕاستدا بوو.

بەڵام ئیلشی زۆر باشم دەناسی و لە هەمووان زیاتر ڕێزم دەگرت. کردم بە سەرکردەی تیپی ڕمە درێژە دوورهاوێژەکان و هێزی یەدەکی. و پێمڕاگەیاند، لە پشت تیپەکەی جاکۆوە خۆی دابمەزرێنێت. چونکە هەموو کات لە توانایدا دەبوو، لە منەوە نزیك بێت بە هانامەوە بێت.

کاتێك تیپە سووکەکەی من لە نێوان ڕیزەکانی ناوەندەوە بکشایەوە. لە کاتێکدا، هێزەکەم بە گشتی لەو زەوییە دەشتاییەدا مەشقی سەربازییان دەکرد و ناڵای تیپەکان لە هەوادا دەشەکانەوە و شریخ و هووڕی چەکەکانیان دەهات. ئەو هێزە —واتە هێزەکەم- وا دیاربوو کە بە ڕاستی لەگەڵ دوژمندا لە هەڵمەتێکی راستدان. ڕۆژ بە ڕۆژو یەك لە دوای یەك بەردەوام مەشق و نمایشی سەربازیمان دەکرد. هەتا وای لێهات، هێزەکەم و چەکەکانم و سەربازەکانم بوون بە هێزێك، هەرگیزاو هەرگیز نەشکێن و نەبەزن.

ئەلجایم هێنا، کە سکی پڕبوو بەرزببۆوە بە کوڕەکەم. بۆ ئەو دەشتە تاکو چاودێری و تەماشای ئەو نمایش و مەشقکردنە سەربازییانە بکات. من دەمویست، جۆش و خرۆشی ئەم شەڕە لەشی بسمێت و بچێتە ناوگیانی ئەو منداڵەوە کە لە سکیدا ڕاکشاوە.

بەڵام من هەڵە بووم لە کاتێکدا، وام دەزانی ئەلجای چاودێری و تەماشای ئەوە دەکات، سەرباز و چەکەکانم دەتوانن ئەنجامی بهێنن. چونکە ئەو واتە ئەلجای لە نێوان یاریدەدەرەکانیدا لە چادرێکی تایبەتییەوە نزیك شوێنی خۆنواندنەکە دانیشتبوو.

بۆئەوەی بیر لەو پلانە جەنگیانە بکاتەوە، کە دامدەنا و لەگەڵ ئەفسەر و سەربازەکانمدا جێبەجێم دەکردن و چاوی پێیکەوێت کەچی ئەلجای زیاتر بیری لە سڕینی ئەو عارەقە دەکردەوە کە بە نێوچەوانمدا دەهاتەخوارێ. ڕۆژێك لە ڕۆژان لە کاتێکدا پێکەوە لە کەژاوەکەیدا دانیشتبووین و پاش خۆپیشاندانێکی سەربازی سەرکەوتوو. لێم پرسی:

-ئەلجای گەورە و بەڕێزم بیر و ڕات چیە دەربارەی هێزەکەم؟ زۆر بە ڕێز و دڵنەرمییەوە، وەڵامی دامەوە، وتی:

-تەیموور سەرکردەی گەورەم، ئەوە هێزێکی گەورەیە، بەڵام تۆزێك خۆت بخە بەلامدا، چونکە خوودەکەت دەم و چاوتی داپۆشیوە و لێمەوە دیارنییە..!

خۆم خست بە لایدا و سەرنجی دەموچاویم دا. کە لەو ماوەی سك پڕییەیدا زۆر جوان ببوو. لەوکاتەدا ئەویش چاوی لە خوودەکەم بڕیبوو. ئیتر سەرنجم دا چۆن لەشی گەورە بووە. چونکە بەسەر سك پڕییەکەیدا شەش مانگ تێپەڕیبوو.

پاشان ئاماژەم بۆ سکی کرد و وا خۆم پیشاندا، تووڕەم، چونکە بە ڕاستی ڕێز و شانازی و هەڵسەنگاندنی تەواوی نەدا بە هێزەکەم.

پێم وت:

-من زۆر شادومان دەبم کاتێك ئەم مەیموونە بچووکە لێرەدا دێتە دەرێ و گرمو دەکەم، چاوەکانی لە سەربازەکانی باوکی دەبڕێت و نایتروکێنێت.

ڤایشی خوودەکەم کە بە ژێر چەناگەمەوە بەسترابوو ساز کرد و وەڵامی دامەوە وتی:

-منیش بەوە شاد و بەختیار دەبم. هەروەها ئەو کاتە لەوپەڕی خۆشی و شادیدا دەبم کە باوکی تەماشام دەکات، و لەش و لارم نەرم و نیان و ڕێك دەبێتەوە، وەك لەش و لاری زیبا. زۆر بە پەرۆشەوە دەستیکرد بە تەماشاکردنی سەربازەکانم کە هێرشی خەیاڵی و ناڕاستیان دەکردە سەر، سەربازگەکانی دوژمن. بێگومان تەماشاکردنم هەست و نەستی منی دەردەخست. وە لەبەرئەوەی، بە هیچ شێوەیەك نەمدەویست ئەلجای تووڕە و زویر بکەم. بڕیارم دا هێز و توانای سەربازەکانم بەرەو سنوور بەرم، و بیانوویەك بدۆزمەوە، دژی فارسەکان و هێزەکەمی تیا تاقی بکەمەوە. ئیتر بەو هۆیەوە دەتوانم، بۆ ماوەیەك لە ئەلجای دووربکەومەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کورغان ئاگاداری کردبوومەوە کە "بالخ" داگیر نەکەم و تەنگوچەڵەمە بۆ "شامالك" دروست نەکەم. منیش بێگومان بووم لەوەی هەندێك لە شێخانی بیابانەکان، کەوا لە درێژایی سنوورەکاندا ژیانیان دەبردە سەر. دەوڵەمەند بوون و ماڵ و سامان و دارایی زۆریان هەیە. ئەوەی دەهێنا کە پیاو هەڵمەتیان بۆ بەرێت و دەستیان بەسەردا بگرێت.

بێگومان لەبەردەم پیاوانی تیپەکانیشمدا شتێك هەبوو، پاڵی پێوە دەنان و ئارەزوو و خۆشییەکی زۆر بە دەمارەکانیاندا دەسووڕا. و لە پێشیاندا ماوەیەکی فراوان هەیە تاکو ژنی نوێیان دەستبکەوێت. چونکە هەر ژنان بۆ سەربازێکی ئاسایی، تەنها مەدالیای سەرەکی بوو.. جا ئەو ژنانە بە ئارەزووی خۆیان هەڵیبژێرن، یان داگیریان بکەن، یان بیانکڕن و دەستیان بەسەردا بگرن.

لەبەرئەوە بینیم، بیری ژنانی نوێ، یان بیری تاڵانی و دەستکەوتی نوێ، کە سەربازەکان لە ماڵ و چادرەکانیاندا پێشکەش ژنە تایبەتییەکانی خۆیانی بکەن ئەوە بەهێزترین پاڵپێوەنەرە،

بتوانم به هۆیەوە پاڵ بە سەربازە تازەکانمەوە بنێم و هانەهانەی جەنگاوەرە شارەزاکان بدەم، هەڵمەت و هێرشی تازە بکەنە سەر دوژمن.

ئەم ڕاستییە و ئەو توندکردن و جۆش و خرۆشدان و بەهێزکردنەوەی ئەفسەرەکانم. کاری تەواوی کردە سەریان و جۆش و خرۆشیانی جووڵاند.

ئا ئەم ڕاستییە بوو، بڕوای پێهێنام و ئیمانی بەهێزکردم کە پێویستە هەر ئێستا بەرەو سنوور بکەومە ڕێ.

لە گەڕانەوەمدا بۆ کۆشکی سپی بە ئەلجایم وت:

-دەنگوباسێك هەیە، دەڵێن هەراوهوریا و ناکۆکی و دووبەرەکییەك لە درێژایی سنووردا هەیە. منیش وای بە چاك دەزانم، هەفتەی داهاتوو تیپەکەم بەرەو ئەوێ بەرم.

-بەڵام من بە هیچ شێوەیەك ئەو دەنگوباسەم نەبیستووە!!

-ئەوە هەیە.. بەڵام تۆ وەك من ئەو زانیاری و سەرچاوانەت نییە. وەك من هەمە.

-ئۆهـ، زانیاری..!! بەڵام منیش زیرەکم و وەکو تۆ لە شت دەگەم!!

-ئەلجای تۆ تێدەگەیت، من چی دەڵێم. من زۆر جاسووس و خەبەرهێنەری ئەهێنیم هەیە.

-بێگومان من لە قسەکانت دەگەم، چی دەڵێیت. تۆ ئێستا من بە ناشیرین دەزانیت و خۆشت ناوێم لەبەرئەوە دەتەوێت وازم لێبێنیت و لێم دوورکەویتەوە..

من هیچت پێناڵێم لەوە زیاتر، بۆ کوێ دەڕۆیت.. بڕۆ.. من تێدەگەم، هەرکاتێکیش هاتیتەوە من لێرەم.

بەڵام هەوڵبدە پێش ئەوەی منداڵەکەم ببێت بگەڕێیتەوە.

-ئۆهـ.. ئەوکاتە بێگومان لێرە دەبم.

-بەڵێ من بڕوای تەواوم هەیە، دەتوانیت بگەڕێیتەوە.

هیچ شك و گومانیشم لەوەدا نییە، تۆ هەردەم دەتوانیت کۆتایی بەو هەراوهوریایەی سنوور بهێنیت.

ئەلجای ئەوەندە زیرەك بوو. بە شێوەیەك توانی بزانێت چی لە مێشکمدایە و ئەو پلانەش بخوێنێتەوە کە پاڵی پێوە ناوم بەڵام بۆنەوەی هەست و نەستی بریندار نەکەم، من هەموو کاتەکانی بێکاریم لای ئەو بەسەر دەبرد و لە ماوەی ئەو ڕۆژانەدا کە سەرقاڵی ئامادەکردن و خۆڕێکخستن بووم. بۆ ئەو هەڵمەتەی وا لە پێشمەوەیە. هیچ کات هەوڵی ئەوەم نەدەدا لەیلا و زیبا ببینم.

سەربازەکانیشم زۆر سەرگەرم و ئارەزوومەندی پلان و بیروڕاکانم بوون.

هەروەها پێویستییە جەنگییەکانم و ئەسپەکانم و چەکەکانیشم لە باشترین حاڵەتدا بوون.

لەبەرئەوە من زۆر سەرقاڵی کاروباری ئەم هەڵمەتە بووم. هەتا هەندێ جار لە سەرەتادا خۆم ئەوەم بیر دەچۆوە چی پاڵی پێوە ناوم، بەرەو سنوور بکەومە ڕێ.

لە ڕاستیدا خۆشم باوەڕم بەوە کرد، هەراو هوریا و ناکۆکی و هەڵمەتی فارسەکان لە سنوورەکەماندا هەیە..

* * *

## دیلێکی گەورە

بێگومان کاتێك بە دۆڵەکەدا و لە دەروازە ئاسنینەکەوە ڕەت بووین و پاش ئەوەی لە کۆتاییدا بنەوبارگەی سەربازیمان لە نزیك ڕووبارەکەوە هەڵدا، نزیکەی پەنجا میل لە سەرووی ڕۆژئاوای "بالخ"ەوە دوور بوو. دەنگوباس و قسە لەناو خەڵکیدا بڵاوبۆوە. کە هەزارەها پیاو هەڵمەتی هێناوە. ئەو دەنگوباسە سەریهەڵدا، تا وای لێهاتبوو بە داستانێکی دوور و درێژ.

ئاوەها من خێمەکەی خۆمم لەناو ڕەزێکی دارمێوی پشتگوێخراوی وێرانەدا هەڵدا. چواردەوری ڕەزەکە بە داری چنار گیرابوو.

هەموو ڕۆژێك هەواڵ فۆزم دەنارد و بۆئەوەی لە دۆڵی ڕووبارەکەدا ئاگایی و چاودێری بکات. زانیاریم دەدانێ و پێم ڕادەگەیاندن بە ئاشکرا بگەڕێن بە دوای دەستدرێژکەراندا. و ئاگاداری جووتیار و وەرزێرەکان بکەن زۆر وریا بن و هەردەم ساز و ئامادە بن.

عەبدوڵلاش لەگەڵ هەندێ پاسەواندا ڕۆیشت و ترس و لەرزیان خستە ناو دڵ و دەروونی ژێردەستەو کۆیلەکانەوە. هەتا دۆڵەکە وردە وردە وای لێهات، لە دووری چەند میلێکەوە لە حاڵەتێکی ئائارامی و دڵە خورپەی زۆردا بوون. دەنگوباسم پێگەیشت، لە دووری بیست میلەوە لە خوارووی ڕووبارەکەوە چادری گەورە گەورە هەیە.

کەسیش نەیدەزانی خاوەن و گەورەی ئەو چادرانە کێن، دەشیانوت جموجوولێکی ئاناسایی و ئەسپی زۆریشی لێیە.

ئاوەها گشت ئەوانەی لە چادرەکانماندا بوون، بڕوایان هێنا بەوەی من پێشبینیم دەکرد و پێم ڕاگەیاندبوون.

بەڵام چەند ڕۆژێك بەسەردا ڕابوورد و هیچ نیشانەیەكی دەستدرێژی و دوژمنایەتییەك دیاری نەدا.

لەگەڵ ئەوەی من بێگومان بووم لەوە، هیچ كەسێك —هەتا كشتیار و جووتیارەكانیش- لە توانایاندا نەبوو، ڕاستی توانای هێزەكەم بزانن گومانكەرەكانیش، كە گومانیان لە پاسەوانەكان بوو، وایاندەزانی ئەم پاسەوانانە چەند كەسێك زیاتر نین، لەو كۆمەڵە سەربازە كەمانەی كورغان پاراستنی سنووری پێ سپاردوون. لە كۆتاییدا هەندێ لەو سەربازانەم كە هەواڵ قۆزییان دەكرد. ئەومیان ڕاگەیاند. پۆلێكی كەم لە فارسەكان لە ڕووبارەكە پەڕیونەتەوە، بەرەو باڵخ و لەوێشەوە بەرەو دامێنی شاخ و گردەكان دەكشێن.

ئەمە هەلێكی باشی بۆ ڕەخساندم "كایدۆ"م لەگەڵ سەد پیاودا نارد و زانیاری تەواوم دایە، چی بكاتا!

پاش چەند كاتژمێرێك هەواڵم پێگەیشت "كایدۆ" بەرهەڵستی ئەو دەستدرێژكەرانەی كردووە و لە ڕووبارەكەوە تا ناو بیابانەكە ڕاوی ناون.

خێرا تیپەكەم بانگكردن و كۆمكردنەوە و لە تاریكی شەودا كەوتینە ڕێ. و جێ پێی كاروانەكەی "كایدۆ"مان دۆزییەوە و دوایكەوتین. تاكو گەیشتینە شوێنێك لەوێوە دەمانتوانی چادرەكانی كایدۆ ببینین. ئیتر ئەوكاتە فەرمانم دا بە هێزە سەرەكییەكە، لە پشت گردەكانەوە خۆیان حەشار بدەن و ئەو شەوە بنكە و بارگەی سەربازی لەوێدا دابمەزرێنن.

بە پێی ئەو پلان و زانیارییەی دابووم بە كایدۆ، كایدۆ بەردەوام دەستدرێژكەرانی ڕاودەنا هەتا وای لێهات، چەند میلێك لە چادرەكانی دوژمنەوە دوور بوون.

ئیتر تەنها سێ كەس لە پیاوانی دەستدرێژكەران كوژران و ماوەی دا بە وانی تر، خۆیان قوتار بكەن و ڕاكەنە ناو چادرەكانی خۆیانەوە.

من بێگومان بووم لەوەی، پەلێكی گەورەی سوارە لە چادرەكانەوە ڕادەپەڕن بۆئەوەی تۆڵەی كوژراوەكانیان بكەنەوە.

لە ڕاستیشدا بۆچوونەكەم ڕاستبووە لە بەیاندا پیاوە هەواڵ قۆزەكانم پێیان ڕاگەیاندم، هێزێك پێكهاتووە لە نزیكەی پێنج سەد كەس لەناو تۆز و خۆڵێكی زۆردا بەرەو سەروو بەڕێكەوتوون. ئیتر خێرا فەرمانم دا بە شەیپوور لێدەرەكانم بە توندی فوو بە شەیپوورەكانیاندا بكەن و داوا لە سەربازەكانم بكەن بە خێرایی ڕاست ببنەوە و ئامادەبن. چەند چركەیەك بە سەردا تێنەپەڕی، هەتا گشت تیپەكەم ڕاستبوونەوە و ساز و ئامادە بوون.

موسا و داود هەردوو تیپەکەیان بەرەو پێشەوە برد. بۆئەوەی خۆیان دابمەزرێنن و لە حاڵێکی وادا بن، پێش ئەوەی ئەو هێزەی من سەرکردایەتیم دەکردن لە دوژمن نزیکبێتەوە و لەگەڵ دوژمندا بکەوینە شەڕێکی سەخت و گرانەوە.

و بتوانن لە هەردوولاوە گەمارۆی هێزی فارسەکان بدەن.

ئەوکاتەی تیپە قورسەکەی جاکۆ لە دوژمن نزیکبۆوە و دەیتوانی هەڵمەت بەرێت. تیرهاوێژ و تیرهاوێژە درێژەکانیش لە هەردوولاوە ئاگریان بەسەر دوژمندا داباران.

یەکێك لە پیاوانی کاروانەکەی فارسەکان ئیشارەتی دا بە هێزەکەی و دەست بۆ ڕاوەشاندن کە هێرش بکەنە سەر هێزە سووکەکەی من.

بەڵام سەرکردەی کاروانە فارسییەکە کاتێك تێگەیشت ئەو هێزەی، بەرەنگاری دەبنەوە فەوجێکی تەواوە. هێزە سەرەکییەکەی کۆکردەوە بۆئەوەی هەڵمەت بەرنە سەر پیاوەکانی جاکۆ.

ئەو وایدەزانی دەتوانێت بە هۆی ئەو جووڵان و هەڵمەتە خێراییەیەوە دەتوانێت هێزەکەی جاکۆ بشکێنێت و پاشان دەگەڕێتەوە هێرش دەکاتە سەر ئەو تیپەی لە لای ڕاست و چەپەوە دامەزراون و بە تەواوی بەسەریاندا زاڵ دەبێت و لە ناویان دەبات. پێش ئەوەی دوژمن بتوانن هێرش بکەن، جاکۆ پێشڕەوی تیپەکەی بڵاوە پێدا و پیاوەکانی ئیلشی بەسەر سەری ئێمەدا دەستیانکرد بە تیرهاویشتن و هاویشتنی تیرە درێژەکانیان بۆ ناو ڕیزەکانی فارسەکان. لە کاتێکدا دوژمن بڵاوەیان دەکرد بۆئەوەی خۆیان لەو هەوڵی گەمارۆیە بپارێزن کە سوارەکانی جاکۆ دەیانویست بیکەن.

ئا لەوکاتەدا منیش هێزە سووکەکەی خۆمم بەناو ڕیزەکانی سوارە و سوارە قورسەکاندا برد و زۆر بە خێرایی غارم دا بۆئەوەی بە هێزەکەمەوە هێرش بەرمە ناو جەرگەی دوژمنەوە. چونکە من کتوپڕ ئەم هێرشە کتوپڕییە ڕاماڵینیەم کردە سەر فارسەکان.

فارسەکان هیچ کاتێکی وایان نەما، بتوانن پلانەکانیان بگۆڕن کە بەرەو ڕوو، و دژی تیپی سوارە فارسەکانیان کردبوو.

سەربازەکانم زۆر بە ئاسانی بەناو ڕیزەکانی فارسەکاندا ڕەت بوون و چوونە پێشەوە، و دوو چەندانە پیاویان لێ کوشتن لەچاو ئەو کوژراوانە کە لە یەکەم هێرشدا دەکوژرێن. لە بێبەختیمدا من سەرکردەی فارسەکان و یەکێك لە یاریدەدەرەکانیم تووش بوو. لە سەرەتا وای پێویست دەکرد، یاریدەدەرەکەی بکوژم. لە ڕاستیشدا یەکەمجار یاریدەدەرەکەیم کوشت. بەڵام لەبەرئەوەی سەرکردەکە دەیویست من وەك مەدالیایەك بۆ خۆی وەدەست بهێنێت. گورج جڵەوی ئەسپەکەی

ڕاکێشا و لەسەر چەقی ڕێگای ئەسپەکەمدا ڕاوەستا. لەبەرئەوەی من لەسەر پشتی ئەسپەکەم بە هۆی ئەو لێدانەوە کە دام لە پاریدەدەرەکەی و لەسەر پشتی ئەسپەکەی خستمە خوارەوە، لەنگەرم تێکچووبوو. ئیتر ماوەی تەواوم نەبوو، دووبارە شیرەکەم بەرزبکەمەوە و لێی بدەم.

لەبەرئەوە هیچم پێنەکرا لەوە زیاتر نەبێت، سەرنجی سەرکردە فارسەکە بدەم لە کاتێکدا شیرەکەی بەرزکردبۆوە و دەیویست بیدات بەسەرمدا. ئەسپەکەشم لەو کاتەدا تەواو زۆر بە شێتانەوە بازی دەدا. لە جیاتی ئەوەی زیادڕەوی بکەم و ژیانی خۆم بخەمە مەترسیەوە و هەوڵی ئەوە بدەم، بە شیرەکەم بەرهەڵستی لێدانەکەی بکەم. من ڕێک لە سەر پشتی ئەسپەکەم دانیشتم و بە دەستی ڕاستم توند خۆمم گرت و بە دەستی چەپیشم قەڵغانەکەم بەرزکردەوە. قەڵغانەکەم لەوکاتە ناهەموارەدا لەسەر سەرم بڵند کرد. ئیتر لەوکاتەدا شمشێری، سەرکردە فارسەکان دای لە قەڵغانە پۆڵاینییەکەم و بۆ لای شانم خواربۆوە. بە تەواوی لەو کاتەدا سەری ڕمە فورسە بریسکاوەکەی جاکۆم بینی لەسەر سەری ئەسپەکەیەوە –ئەسپی سەرکردە فارسەکە- چوو بە سنگی سەرکردە فارسەکەدا. جاکۆ ئەوەندە ڕمەکەی بە توند داوەشاند، بە شێوەیەك لاشەی سەرکردە فارسەکەی لەسەر پشتی ئەسپەکەی بەرزکردەوە.

جاکۆ سەرکردە فارسەکەی بەرەو پێش خۆی ڕامالی. هەروەك چۆن گورگ مەڕ پێش خۆی ڕاددەدات. زۆر لە دوژمنان، ئەوانەی لە لێدانی شیری پیاوەکانم قوتار ببوون بۆ پێشەوە ئاوزەنگیان لە ئەسپەکانیان ژەند. بەڵام کەوتنە ژێر بەزەیی داباریینی ڕمی تیپە فورسەکەی جاکۆوە.

هێزە یەدەکییەکەی –ئیلشی- و هێزەکەی من، کە لە هەردوو لاوە دامەزرابوون. نەیانهێشت هیچ یەکێك لە دوژمنان قوتاری ببێت. چەند چرکەیەك بەم شێوەیە ڕانەبوورد، فارسەکان ئەوانەی مابوون سەریان لێشێوا و بەیەکدا هاتن و لەسەر پشتی ئەسپەکانیان ورەیان بەردا.

هێزەکەی من لە هەموو لایەکەوە گەمارۆیان دان.

دیلەکان و ئەو ئەسپانەی، سوارەکانیان کوژرابوون، کۆمان کردنەوە و بەرەو چادرەکان بردمانن.

جاکۆی فارەمانیش تا ئەوکاتەش لاشەی سەرکردەکەی ڕادەکێشا، بە سواری لە تەنیشتمەوە بوو.

لە ناو چادرەکاندا تەنها دوو سەد پیاوی تێدابوو. چونکە ئێمە کتوپڕ گەیشتینە سەریان و ئەوانیش سواری ئەسپەکانیان نەببوون هەر کە ئەو هێزە زۆرەی ئێمەیان بینی بە جارێ ڕمان و ورەیان بەردا و هێزی ئەژنۆیان شکا. هیچ بەرهەڵستییەك و خۆڕاگرتنێکیان نەکرد. گشت

پیاوانی ناو چادرەکان سەریان سووڕما، لە کاتێکدا من و جاکۆ بەرەو چادری گەورەی تیرەکە چووین و لاشەی سەرکردەکەیمان فڕێدایە بەردەمییەوە.

لە خێمەکەدا پیاوێکی فارسی بە هەیبەت و بەرێزی ریش درێژ هاتە دەرەوە و چەند کەسێکیش لە یاریدەدەرەکانی لەگەڵدا بوو. تەماشایەکی ئەو لاشەیەی کرد، کە لەسەر لەکە فڕێدرابوو و هەموو لەشی لە خوێندا نوقوم ببوو.

ئا لەم کاتەدا زۆر بە ئازایی و نەترسییەکی بێوێنەوە رووم تێکرد و پێم وت:

-من تەیموور برلاس و شازادە و سەرداری شەهری سیبزم. ئا ئێستا لاشەی ئەو ئەفسەرە چەپەڵەت دەدەمەوە، کە وێراویتی هێرش بکاتە سەر پیاوەکانم. چونکە پیاوەکانم دوای هەندێك پیاوی دز و جەردە و دەستدرێژکەر کەوتبوون لە نێوان رووباری "ئاموداریا"[٢]دا.

من هەرچی سەروەت و سامان لەم چادرانەدا هەیە داوا دەکەم. ئەمەش لە بریتی ئەو زەرەرو زیانانەی، کەوتوون لە دەست و پێوەندەکانی کورغان و لە سەروەری کۆشکەکەی کۆشکی سالی من دەست بەسەر تۆدا دەگرم و بە شێوەی دیلێك دەتبەم بۆ دیوەخانی کورغانی شاهێنشام.

بەڵام کابرا پێکەنینێکی ناشرین و قێزەونی کرد و وەڵامی دامەوە وتی:

-من مالك.. شای هەرات و سوڵتانی ئەفغان و هەلگری بیروباوەڕم. من هیچ کات گوێ لەو چەنەبازییە پیسە و ورێنە چەپەڵییەت ناگرم.

ئەم کارەشتان بۆ مەبەستێك کردووە. من ئێستا لێرەدا فەرمان دەدەم بە بەندکردنی تۆ و بەندکردنی سەربازەکانیشت. تاکو کورغانی هاوڕێم ئەم کردەوە دوژمنایەتییەی تۆ دەبیستێت کە کردووتە. و سەروەری سنووری وڵاتەکەمت بەزاندووە. هەتا شایەکەت زەرەر و زیانێکی باشم بۆ دەژمێرێت.

لە ڕاستیدا زۆر حەپەسام کە ڕاستی دیلەکەم تێگەیشتم و بێگومان بووم لەوەی من بەم کردەوەیەم قین و تووڕەیی کورغانم بەسەر خۆمدا ڕژاندووە.

بەڵام من هیچ ترسێکی گەورەم لە مالك شا نەبوو. پاش ئەوەی ئەم ئازایەتی و کردەوە گەورەیەم لە لەشکرەکەم بینی کە دەتوانن ئەنجامی بدەن.

بەڵکو ویستم ئەو نیشانەی ترس و لەرزە بشارمەوە کە لە ڕوومدا دیاربوو.

---

[٢] ئاموداریا: دیارە ئەم وشەیە لە بناغەدا "دەریای ئامو"یە و نووسەر بە تەواوی ماناکەی نەزانیوە. وە وشەی "ئامو" و وشەی "دەریا"ی کردووە بە یەك وشە و بە ئاموداریا ناوی بردووە. وە ڕەنگە ناوی "ئاموون"یش بێت. چونکە کورد دەڵێت (ئاوی ئا‌موون و توونی بابا چێت).

پاشان بە شانازی و ڕێز و گەورەییەوە، پێم وت:

-من ڕێز و سڵاوم پێشکەش شامالك سوڵتانی ئەفغان دەکەم. بەڵام من ئەفسەرێکم لە خزمەت کورغاندا و پاراستنی سنووری پێ سپاردووم. بەڵام پیاوەکانی تۆ ڕێزی سنووری کورغانیان بەزاندوە سەدەها کەسانی ژێردەستی ئەو، و ژێردەستی تۆ بە درێژایی دەریاکە، گەواهی ڕاستی و حەقیقەتی قسەکانی من دەدەن کە بە تۆی دەڵێم.

ماوەیەکی زۆریشە ئەو خەڵکانەش بە ترس و لەرزەوە دەژیان. لەگەڵ ئەوەشدا من ئەوە ڕانابینم، تۆ هێزێکی وات لابێت بتوانێت فەوجێك لە لەشکری شاهەنشا بە تەواوی بەند بکەیت.

بەڵام شامالك وا دیاربوو، قسەکانم هیچ کاری تێنەکردبێت و هیچ گوێی پێنەدا.

پاشان بە پێکەنینێکی گاڵتەپێکردنەوە، پێکەنی و وەڵامی دامەوە، وتی:

-هیچ هەڵمەت و دەستدرێژیکردنێك لە ئارادا نەبووە، تەنها من و دەستوپێوەندی شاهانە هەڵساوین بە ڕاوکردن.

خۆ ئەگەر ڕاست بێت و هەندێ لە پیاوەکانم سنووریان بەزاندبێت. ئەوە دیارە دوای ئاسکێکی قەڵەو کەوتوون و من بڕوای تەواوم هەیە، کورغانی بەڕێز ئەم کردەوەیە بە سووکایەتی دانانێت. و تۆ بتوانیت بەو هۆیەوە زیاد لە نیوەی پاسەوانەکانی چادرەکەم بکوژیت.

ئێستاش فەرمان بدە بە گشت پیاوەکانت، خۆیان بدەن بە دەستمانەوە و هیچ کەسێکیش ئازار نادەین تاکو تەتەرمان دەنێرین بۆ لای کورغان و لەو بارەیەوە وتووێژی لەگەڵدا دەکەین.

وەرگەڕامەوە بۆ لای جاکۆ و پێم وت:

-گەمارۆی هەموو چادرەکان بدە و هەرچییەکی تێدایە بیانگرە و ئەم فەرمانەش بەسەر گشت ئەفسەرەکانمدا بڵاوبکەرەوە و داوایان لێ بکە، دەست بەسەر گشت چادرەکاندا بگرن و پشتێنەیەکی پاسەوانی بە دەوری هەموو سەربازگەکەدا بگرن.

ڕێگا بە هیچ کەسێکیش مەدەن، دەرچێت یان بێتە ناوەوە. بینیم شامالك هەستی بە بێزاری کرد و زۆری پێناخۆش بوو. وە تێگەیشتم لەو فەرمانەی من دەرم کرد سەری سووڕما. هیچ هیوایەکی نەما لەوەی، دەیویست جێبەجێی بکات. بەڵام هەر بیرم لە کورغان دەکردەوە. نەمدەوێرا هیچ شتێك بکەم، پێش ئەوەی مەسەلەکەی لەگەڵدا باس بکەم.

نەشمدەتوانی واز لە شامالك بهێنم، بە ڕێگای خۆیدا بڕوات. وە نەشمدەتوانی بیشیگرم، ببمە هۆی ئەوە هەموو وڵاتی فورس بووروژێنم و پاڵیان پێوە بنێم دژی کورغان ببنەوە و ڕووبەڕووی بوەستن.

پاشان ئیلشیم بانگکرد و ڕووم تێکرد و وتم:

-ئەسپی زۆر چاك بۆ من و بۆ شامالك ئامادە بکە و سەد پیاویش بۆ پاسەوانی کردنمان هەڵبژێرە. دیلەکەمان دەبەم بۆ کۆشکی سالی.

ئیتر ئەو کاتە بەرەو شامالك وەرچەرخامەوە بە شێوەیەکی ئاشکرا و ڕەوان و ڕەقییەوە پێم وت:

-بەڕێز.. تۆش لەسەرت پێویستە خۆت وا دابنێیت، دیلێکی لای من. هەروەها پێویستە لەسەرت بۆ ئەم سەفەرە خۆت ئامادە بکەیت.

لە کاتی نیوەڕۆدا من و دیلەکەم شوێنەکەمان جێهێشت و کەوتینە ڕێ..

بەردەوام دەڕۆیشتین و هەرکاتێك ئەسپەکانمان هیلاك ببوایە دەمانگۆڕین. بە ڕووبارەکەدا ڕەتبووین و بۆ ڕۆژی دوایی گەیشتینە کۆشکی سالی.

یەکسەر دیلەکەم بۆ کۆڕی کورغان برد. کە لەو کاتەشدا کۆبوونەوەی سەرکردایەتی هەبوو.

هەرکە گەیشتمە ناو شوێنی کۆبوونەوەکە، ڕوومکردە کورغان و پێم وت:

-گەورەم ئەمە ئێستا دیلە لای تۆ، ئەمە لە دوای بالْخ ەوە هەڵمەتی دزی و تێکدانی بە درێژایی سنووری وڵاتەکەت سازداوە.

کتوپڕ کورغان ئەو دیلەی ناسییەوە. ئەمە یەکەمجار بوو ئەو پیرەمێردە ببینم بە شێوەیەکی سەیر سەری سووڕبمێنێت. پاشان بە شێوەیەکی شڵەژاوییەوە پرسی، وتی:

-مالك.. هەڤاڵە باشەکەم، ئەم شازادەیە تۆی بۆچی بۆ ئێرە هێناوە؟ هەڤاڵەکەم. شای هێرات، تەیموور بۆچی تۆی دیل کردووە؟ بێگومان ئەم ئەفسەرە دلگەرم و بە پەرۆشەم هەڵەیەکی گەورەی کردووە.

شامالك زۆر بە نەرمی و ڕێز و لەسەرخۆییەوە وەڵامی دایەوە، وتی:

-نا ئەوەم بەم ئەفسەرەت وتووە. هەموو ئەم کارەش ئەوە بووە، کۆمەڵێك لە ڕاوچییەکانم بە هەڵە لە ڕووبارەکە پەڕیونەتەوە و دوای ئاسکێکی قەڵەو کەوتبوون. بەڵام "لاداخ" کە لە شاری "کارش"ییەوە بەو ڕێگایەدا هاتبوو. بەرهەڵستی قسەکانی شامالك ی کرد و وتی:

-لەم کاتانەی ساڵدا لە نزیك ڕووبارەوە ئاسك نییە و دەگمەنە. بە تایبەتی لە دوای شاری "بالْخ" یشەوە. زۆربەی زۆری سەردار و شازادەکانیش، زۆر شادومان بوون و لە دڵدا پێخۆشحاڵی خۆیان دەردەبڕی. پشتگیری قسەکانی "لاداخ" یان کرد.

پاشان شامالك تەماشای کورغانی کرد و بە شێوەیەکی دۆست و هاودەمییەوە پێکەنی، وتی:

-دیاره، پیاوەکانم سەرگەرمی دواکەوتنی ئاسك بوون. لەبەرئەوە، بە هەڵە هاتوونەتە خاکی هاوڕێی باشم -کورغان-ەوە ئیتر ئەوکاتە کورغان بە جۆرێك وەڵامی دایەوە، نیشانە و مانای ڕاستی تیادا دیاربوو، وتی:

-تۆ لەگەڵ پیاوەکانتدا بە شێوەیەکی ڕەسمی لە ڕاوکردندا بوویت ئەمە بیرێکی زۆر باشە. ڕەنگە منیش بێم لەگەڵتدا هاوبەشی ئەو ڕاوکردنەت بکەم.

ئیتر شامالك ڕەنگ و ڕووی گەشایەوە و هەستی بە شادی و خۆشییەك کرد و وتی:

-دەبوایە و پێویست بوو، تۆ هاوبەشی ئەو سەفەر و ڕاوەت بکردایە. من دەمویست نامەیەکی میواندارییت بۆ بنێرم و ئیتر لەو کاتەدا ئەو بەسەرهاتە ناخۆشەی سنوور ڕوویدا. بەڵام کار هەرچۆنێك بێت، ئێستا تۆ دەتوانیت، لە گەڵمدا بێیت و هاوبەشی ڕاوکردنم لەگەڵدا بکەیت.

کورغان سەری ڕاوەشاند و قایلبوونی ڕاگەیاند و وتی:

-باشە داواکارییەکەتم قبووڵە.

پاشان وەرگەڕایەوە بۆ لای هەندێ لە شازادەکانەوە کە لە نزیکییەوە ڕاوەستابوون و ڕووی تێکردن و وتی:

-سەرداران ئێوەش هەر ئێستا خۆتان و کاروانتان ئامادە بکەن. چونکە ئێوەش لەگەڵمدا دێن بۆ سەربازگەکەی شامالك. پاش ئەوەی شازادەکان بڵاوەیان کرد و ڕۆیشتن، کورغان من و دیلەکەمی بانگکرد بۆ ژوورەوە و پێی وتم:

-من وا تێدەگەم، تۆ نەتویستووە شامالك دیل بکەیت وا نییە تەیموور..؟

-بەڵێ سەروەرم من نیازی ئەوەم نەبووە. من تەنها ئەوەم دەویست، هاوبەشی ئەو پیاوانەی بکەم کە خەریکی ڕاوی ئاسك بوون. ئیتر ئەوکاتە ئەو بەسەرهاتە ناخۆشە ڕوویدا منیش بێگومانم لەوە هێزا شامالك چاو لەو کارە هەڵەیە دەپۆشێت کە لە کاتی ڕاوەکەدا، لە نێوان تیپەکەی خۆی و تیپەکەی ئێمەدا ڕوویدا.

هەروەها شامالك چاویشی لەو بەسەرهاتە ناخۆشەی سەری ساڵی ڕابوردوو دەپۆشێت. کە لە کاتی ئاهەنگی سەری ساڵی ڕابوردوودا ڕوویدا.

-تەیموور... ئەوەی وتت ڕاستە، من بە تەواوی دڵنیام لەوە، شامالك چاو لەو بەسەرهاتە ناخۆشانە دەپۆشێت. پاشان وەرگەڕایەوە بە لای شامالکەوە و لێپرسی:

-شای بەڕێز.. وا نییە؟ لەمەوپێش چاومان لە زۆر هەڵە پۆشیوە، کە بە دەستی ئەنقەست ڕووی نەدابێت.

-شامالك زەردەخەنەیەكی ساردی كرد و بە چاوە تیژەكانی سەیرێكی كردم و پاشان وەڵامی كورغانی دایەوە.. وتی:

-بەڵێ خاوەن شكۆ، من ئەم ڕووداوەم لا گرنگ نییە. لەگەڵ ئەوەشدا، تەیمووری لاو، سەری چوار سەد كەسی لە پاسەوانەكانم پەڕاندووە، ئەوانەش لە چاكترین جەنگاوەرانی فارس و -ئەفغان- ی بوون. منیش زۆر پشتم پێدەبەستن.

منیش دەمویست شامالك هەست بەوەم كات، من بە تەواوی دەمزانی ئەو، و كورغان چ جۆرە فێڵ و تەڵەكەبازی و گەمەیەك دەكەن. پاشان پێم وت:

-ژمارەی كوژراوەكان كەمن و شتێكی هیچ و بێبایەخن.

لە ڕاستیشدا هەریەك لە كورغان و شامالك هێزەكانیان بە هێزتر دەكرد و ژمارەیان زیاتر دەكردن. دژی یەكتر خۆیان ئامادە دەكرد. گەرچی لەو كاتەدا هیچ كامێكیان نەیاندەوێرا هەڵمەتی شەڕكردن بكەنە سەر یەكتری.

كتوپڕ هەستم كرد من لە هەردووكیان بە توانا و بەهێزترم وە فێنم لێیان دەبێتەوە. وە بڕوای تەواوم هێنا بەوە من دەتوانم ڕووبەڕوویان بوەستمەوە، یان بەرهەڵستیان بكەم. گەرچی ئەو دوو پیاوە بەهێزترین پیاوی هەموو ئاسیا بوون.

لە كاتی ڕۆیشتنمان بۆ ناو چادرەكانی شامالك و گەڕانەوەمان بۆ دیوەخانەكەی خۆی. هەستم كرد كورغان و شامالك هەردووكیان ڕاستی هەڵوێستی من دەزانن و گرنگییەكی زۆریان پێداوە.

وە لە كاتێكدا، لە نزیك ئەو شوێنەوە تێپەڕمان كرد، كە هەڵمەتم تیادا بردبووە سەر هێزەكەی شامالك و ئەو شارەزایی و لێزانینە چاكەی بەكارم هێنابوو. وە تیایدا باشترین سوارەی شامالكم لەناوبردبوو.

لە دڵ و دەروونی كورغان و شامالك و تەواوی سەردار و شازادەكاندا سەرنج و سەرسووڕمانی ڕێكێشا.

لەبەرئەوە من دەمزانی، هەلێكی ڕەخساوی جەنگی باشم بۆ ڕەخساوە. چونكە سەربازەكانی من ژمارەیان، لە ژمارەی سەربازەكانی شا و سەربازەكانی ناو سەربازگەكەی كورغان زیاتر بوون. وە سەربازەكانیشم تا ئەم كاتە هەر مەستی ئەو سەركەوتنە نوێیە بوون.

لەبەرئەوە هیچ دوودڵ نەبووم لە دەرخستنی هێز و دەربڕینی بیروڕا و مەبەستمدا.

وه "کورغان"یش به تەواوی نەیدەتوانی، سزای ئەو هێرشەم بداتەوه که کردبوومە سەر شامالك چ جای ئەوەش شامالك خۆی هیچ دانی نەدەنا بەوەی ئەو هێرشە کاریگەرییەکی گەورەی هەبووبێت.

هەروەها شازادەکانی کورغانیش له ناوەڕۆکی ئەم گەمەیه نەگەیشتبوون که دەمکرد. زۆر بە خۆشی و شادییەوه پێشوازی کاره قارەمانییەکەمیان دەکرد، که دوژمنی سەرەکی سەرکردەکەیانم دیل کردبوو.

له هەمان کاتیشدا شامالك کەوتبووه هەڵوێستێکەوه نەیدەتوانی لەوه زیاتر دەربڕێت که هیچ له من نیگەران و تووڕه نییە.. و نەشیدەتوانی خۆی خۆی بە درۆ بخاتەوه و بە شێوەیەکی ئاشکرا و دیار لۆمەم بکات و ددان بەوەدا بنێت خۆی بۆ شەڕێکی گەوره ئامادە دەکات.

ئاوەها که بینیم من له ناوجەرگەی گیروگرفتەکه قوتارم بووه، بێئەوەی تووشی هیچ جۆره سزایەك یان پاداشتێك ببم. ئیتر منیش هەوڵی ئەوەم دا بە هۆی ئەو کاره سەرکەوتووەمەوه هەندێك دەستکەوتم، دەستکەوێت. وەك مەدالیایەکی ڕێزلێنان و پێزانین بۆ ئەو قوربانییەی که دابووم.

شەوێك له شەوان، له کاتێکدا من لەگەڵ دوو ڕاوچییە گەوره ڕەسمیەکاندا، نانی ئێوارەم دەخوارد و ڕوومکرده ئامادەبووان و لەسەرخۆ وتم:

-سەربازەکانم وایان لێهاتووه، له دڵەڕاوکێدا دەژین و هیچ دڵ ئارام نین. وه شارەزایشیان له هەموو کاروبار و هونەرێکی جەنگیشدا هەیه. وه له بیروڕا و گوماندان چونکه هیچ پاداشتێك و مەدالییەکیان وەرنەگرتووه که شایەنی ئەو سەرکەوتنە مەزنه و نوێیه بێت.

له رووشیاندا نیشانەی تووڕەیی و ڤین دەبینم.

کورغان به سەرسووڕمان و حەپەساوییەوه لێی پرسیم:

-تەیموور.. ئەوه به ڕاستته؟

تۆ دەبوایه ئەو کارەیان به شێوەیەکی دوور و درێژ و ڕاستییەوه بۆ باس بکردنایه.

کتوپڕ وەڵامم دایەوه، وتم:

-گەورەم من هەوڵی ئەوەم داوه و هەوڵیش دەدەم. بەڵام ئەوان وا گومان دەبەن شامالك لای تۆ دیلە و هاوڕێی ڕاوکردنت نییە.

منیش نامەوێت، ڕاستی بزانن. چونکه له پاشاندا هەست بە دڵ برینداری و نائومێدییەکی زۆر دەکەن. وا بزانن که شاهێنشاکەیان و سەرکردەکەیان، ئەو سەرکەوتنە سەربازییەیان بە

کارێکی هیچ و بێبایەخ دابنێن. ئەوانیش ئاوات و ئارەزوو دەکەن، ژن و سامانیان دەستبکەوێت. و منیش نەمهێشتووە تالانی و ڕاوڕووت بکەن و دەست بۆ هیچ ژنێك بەرن.

بەڵام شامالك بە دوای وتەکانی مندا وتی:

-ئەگەر ئەو دەنگوباس و هەیتوهوتەت ڕاست بێت، من لەو باوەڕەدام، پیاوەکانی تۆ لە کاتێکدا گەمارۆی چادرەکانمیان دابوو، بێ ژن نەبوون!!

منیش هیچ چارێکم نەما لەوە زیاتر، وەڵامی بدەمەوە، وتم:

-ڕاستە سەربازەکانم تۆزێك خۆشیان لە ژنی ئەو جەنگاوەرانە دیوە، کە مێردەکانیان کوژراون. ئەو ژنانەش خۆیان بە کەنیزەك و دیلی جەنگ دەزانن. لەگەڵ ئەوەشدا من بە تەواوی لەو باوەڕەدام، هیچ جۆرە جەنگێك لە نێوانماندا نیە بەڵام پیاوەکان داوای ژنی زیاتر دەکەن.

پاشان سەرنجی دەموچاوی کورغان و شامالکم دا لە دوایدا کورغان زۆر بە گەورەیی و مەندییەوە دووانمی وتی:

-بەڵام ئەمە تەنگوچەڵەمەیەکی گەورە و ترسناك دروست دەکات.. وانییە..؟

من هیچ کات نازانم پاداشتی فەوجێك بە تەواوی بدەمەوە، ئەویش بە هۆی هەڵمەتێکەوە کە کردوویانەتە سەر هەڤاڵ و دراوسێکەم. وە ئەگەر هەر پاداشتێك و پێزانینێکی خۆم ئاشکرا بکەم، مانای وایە، من ئەو هێرشە بە هێزێکی چاك و ڕەوا دادەنێم.

کاری وەهاش لە پاشاندا دەبێتە تووڕەبوونی هەڤاڵی بەڕێزم شامالك و گشت لایەنگرانی ئەو.

شامالك هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی:

-هەروەها من ناتوانم هیچ باجێك بدەم، چونکە ئەگەر من هەر باجێك بدەم، مانای ددان پیادانانمە بەوەدا من بە دیلی کەوتوومەتە ژێر دەستی کورغانی هەڤاڵمەوە.

ئەوکاتەش میللەتەکەم بە دیل گرتنی من بە سووکایەتی بۆ خۆیان دەزانن و دەبێتە بەڵگەیەکی تەواو بۆیان جەنگ و کوشتار لە نێوانماندا هەڵبگیرسێنن.

ئێمەش وا هەمووان لێرەین و تەنها ئاشتیمان دەوێت.

ئەوکاتە کورغان و مالك بە تەواوی سەرنج و هۆشیان لای من بوو.

ئیتر ئەو کاتە سەرسام مام و نەمدەزانی ئایا من بە ڕاستی هەڵیاندەخەڵەتێنم یان پێیان ڕادەبوێرم؟

یان من بووم بە گەمەیەك و بە دەستی ئەوانەوەم.!!

پاشان وتم:

-من چارەسەری ڕاستی کێشەکە دەزانم. لەبەرئەوە وا من دەیخەمە بەر دەستی دوو پیاوەوە کە لە من گەورەتر و زیاتر بە هۆشتر و شارەزاترن. منیش ناتوانم واز لە پیاوەکانم بهێنم، ڕێگایەکی تر بگرن..!! واتە دەست بەسەر هەرچی کەلوپەلێك و شتێکی ناو چادرەکاندا بگرن و بە تەواوی زەوتی بکەن. منیش لەو باوەڕەدام، ئەو زەوتکردن و دەستبەسەرداگرتنە سەرنجی گشت کەسێکی وڵاتی تەتەر و وڵاتی فورسەکان ڕادەکێشێت.

وە ئەگەر خوانەخواستە، کتوپڕ و بە هەڵە شاهێنشا و شای گەورە بە دەستی تیپەکەی منەوە بکوژرێن، ئەوا من لە داخ و ترساندا، بە هۆی ئەو بەسەرهاتە ناخۆشەوە کە ڕوودەدات ئۆقرەم لێدەبڕێت و زیرە دەکەم و چوارپەلم دەشکێت. پاشان پێکێك مەیم خواردەوە و قاشێك شووتی شیرینی چاکیشم بەسەردا کرد.

کورغان و شا بە بێدەنگی تەماشایان دەکردم. ئیتر ئەو کاتە دەستم پێکردەوە.. وتم:

-هەر بەسەرهاتێکی ناخۆش، بەسەر ئێوە بێت، ئەوا من دەخاتە تەنگوچەڵەمەیەکەوە، ڕزگاربوونم بۆ نییە. ئێوە خۆشتان باش دەزانن ئەم سەربازگەیە لە شارەکانەوە دوورن و ماوەی هەفتەیەك دەبێت هاتوچۆکردنیان پچڕاون و هەر جۆرە دەنگوباسێك بڵاوبکرێتەوە ئەنجامێکی خراپی دەبێت.

کورغان بە جۆرێك پێکەنی کە نیشانەی ترس و شێواندنی تیادا تێکەڵ بوو.

پاشان پێی وتم:

-بە ڕاستی تۆ کەڵەشێرێکی شارەزایت.

کتوپڕ مالکیش بە ترس و شێواوییەکی زۆرەوە لێی پرسیم:

-تەیموور، ئایا تۆ ناتوانیت جڵەوی پیاوەکانت بگریت و زاڵ بیت بەسەریاندا و دایانبمرکێنیتەوە؟ بە بڕوایەکی تەواوەوە وەڵامم دایەوە:

-بەڵێ.. من دەتوانم..!! چەند چرکەیەك لە قسەکردن وەستام بۆئەوەی سەرنجی چاوی کورغان و شا بدەم کە بە تیژی تێیان دەڕوانیم. پاشان دەستم پێکردەوە و وتم:

-ئەوەی لەسەر من پێویست بێت کە بیکەم، ئەوەیە بارودۆخەکە بە تەواوی و ڕاستی دەربخەم و هێوری بکەمەوە. داوا لە ئامادەبووانی شازادەکانی ئێرە دەکەم، کۆبوونەوەیەکی ڕەسمی لەگەڵ کورغاندا بکەن بۆئەوەی تیایدا، بڕیار لەسەر ئەوە بدەن، چی لە شامالك بکەن؟

هەڵوێستی ئەو شازادانەش کە لەگەڵ شادا هاتبوون زۆر ڕوون و ئاشکرا بوو. هەموو بە خۆشی و ئارەزووەوە چاویان لە سەروەت و سامانی شاری هیرات بڕیبوو. هەندێکیشیان بە ئاشکرا داوای کوشتنی شامالك و دابەشکردنی موڵك و ماڵیان دەکرد.

منیش بۆئەوەی مەبەست و ئاوات و ئارەزووی ڕاستیی خۆم بشارمەوە. وتم:

-من هیوادارم، ئەنجومەن بڕیارێك دەربکات، سۆز و بەزەیی تێدابێت!!

کورغان و شامالك هەردووکیان پێکەوە دەستیانکرد بە پێکەنین.

سیمایەکی سەیرو خۆشی و شادی لە پێکەنینەکانیاندا دیاربوو. شامالك تەماشای کورغانی کرد و ڕووی دەمی تێکرد و وتی:

-کورغان.. هەڤاڵی گەورەم، ئەم کوڕە لاوە کچەزاکەی تۆی مارە کردووە.. وا نییە؟

-بەڵێ!!.. تەیموور زاوای منە.

-من ڕێگا بە خۆم دەدەم و دەڵێم تەیموور بە ڕاستی شایانی زاوایەتیتە!! ئەگەر تۆ دوژمنی من بوویتایە، دەبوو لەم پیاوەی وا لە گەڵتایە و بە هۆی کچەزاکەت و مارەییە زۆرەکەیەوە، خزمایەتی لەگەڵتا بەستوویت، بترسامایە!!

لە ڕاستیشدا کچەزاکەت دیارییەکە و نرخی بۆ دانانرێت!! زۆر ڤینم هەستا کە باسی ئەلجای کرد و ئاماژەی بۆ کرد!! گەرچی ئەو ئاماژەکردنەش ڕاست و ڕەوان و دروستیش بوو. نەمتوانی، وەڵامی نەدەمەوە، وتم:

ئەلجای گەورەترین دیارییەکە، پیاو پێشکەش بە پیاوی تری بکات. منیش هەتا هەتایە خۆم بە ڤەرزداری کورغانی سەروەرم دەزانم و هەتاهەتاش بە وەفا و بچووکی ئەو دەبم.

ئیتر سەرنجی ئەو دوو پیاوەم دەدا کە بیریان لە کێشەکەی من دەکردەوە. من خۆشم نەمدەزانی، چاوەڕوانی چییان لێدەکەم. لە ڕاستیدا خۆم هیچ مەبەستێکم نەبوو، تەنها ئەوە نەبێت سوود لە بێهێزی ئەو دوو پیاوە ببینم کەوا لەبەردەستمدا دۆش داماون.

کورغان مەبەستی بە من ئەوە بوو من بەربەرەکانی حسێنی وەچە و کچەزای خۆی بکەم. وە منی بە ڤەڵایەکی سەخت و سەرکەش دادەنا بۆ هێزەکانی و جێنشینی چاوەڕوانکراوی پاشخۆی.

شامالك سەرنجی هەموو ئەمانەیدا و تێگەیشت و بینی من بەرهەڵستیارێکی بەهێز و جەنگاوەرێکی بە توانام. منیش هێز و توانای خۆمم سەلماندبوو. وە توانای خۆمم لە جەنگ و کوشتاردا بۆ دەرخستن و بۆم سەلماندبوون.

لەبەرئـەوە مـن ئـەم دوو بـەڕێزە گەورەیـەم کورغـان و "شـامالك"م خسـتبووە نـاو تەنگوچەڵەمەیەکەوە، دەرچوونیان لێی شتێکی زۆر گران بوو. ئیتر لەو کاتەوە، هەردووکیان بۆ هەموو کارێك حسابی گەورە و تایبەتیان بۆ دەکردم.

لەبەرئەوە بڕیاری یەکەمیان، بڕیارێکی کتوپڕی و خێرابوو. چونکە نەیاندەزانی هێزەکەی من کە لە هەزار کەس زیاتر پێکهاتبوون، لە ڕۆژانی داهاتوودا چی دەکەن.

من لە کاتێکدا، چاودێری ئەو دوو پیرەمێردەم دەکرد. هیچم نەگوت. هەریەکەیان بە گومانەوە تەماشای یەکتریان دەکرد و سەرنجی ڕووی منیان دەدا. و دەیانویست بە لایەنی کەمەوە مەبەست و وەڵامم بزانن.

ڕەنگە واشیان بزانیایە، چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە لای من بێت. شامالك زەردەخەنەیەکی ساردی کرد و ڕوویکردە کورغان و بە شێوەی گاڵتەپێکردنەوە پێی وت:

-ڕەنگە من ئەم گەمە و فێڵەی ئەملاوە ڕێوییە تێبگەم، من وا تێدەگەم تەیموور بیستویەتی شازادە شێرێزای کچم جوانترین وەچەی فاتمە و دەوڵەمەندترین شازادەی ئاسیایە!!

"منیش لە ڕاستیدا ناووناوبانگی شازادە شێرێزام بیستبوو، شازادە شێرێزا ئەو مەدالیایە بوو کە دەیهێنا مرۆڤ لە پێناو بەدەستهێنانیدا، گیانی خۆی بۆ بخاتە گشت مەترسی و ناخۆشییەکەوە. لەگەڵ ئەوەی کەس تاکو ئێستا نەیتوانیبوو، بیبینێت و باسی جوانی بکات. بەڵام هەموو هاشە و هووشەیەکیش ئەوەی دەگەیاند، مارەیی و سامانە زۆرەکەی شایانی تەماع تێکردنە".

کورغان ناوچەوانی دا بە یەکدا و ڕووی گرژ کرد. چونکە لە مەبەستی قسەکەی شامالك گەیشت.

پاشان بە ڕووگرژی و مۆنییەکەوە، وتی:

-من ناتوانم بڕوا بکەم لە کاتێکدا تەیموور لە ڕووباری ئامۆداریا پەڕیبووبێتەوە، بیری لە هیچ ژنێك کردبێتەوە.

بەڵام شامالك باوەڕی بە قسەکەی کورغان نەهێنا. لەبەرئەوە بە شێوازێکی پێ لەسەرداگرتنەوە پێی وت:

-نۆها! بێگومان تەیموور بیری لەوە کردۆتەوە کە پێم وتیت. بەڵام بە شێوەیەکی زۆر شارەزایی و ژیرییەوە ئەمە دەردەبڕێت. کە ئێمەی بەساڵاچوو تێی ناگەین. باشە کەواتە بۆچی

دەبێت ئێمە بخاتە ناو تەنگوچەڵەمەیەکی سەرسوورمێن و ئاڵۆزەوە و خستووینییەتە هەڵوێستێکەوە ڕێمان نادات بگەینە چارەسەرێکی گونجاو..؟

کورغان تۆزێك بە تووڕەییەوە لێی پرسیم:

-تەیموور.. ئەوە ڕاستە؟

کتوپڕ و بە شێوازێکی کورت وەڵامم دایەوە:

-"گەورەم من کێشەکەم لەبەردەمتاندا بڵاوکردۆتەوە. لەبەرئەوەی ئێوە لە من گەورەتر و زیاتر تێگەیشتوو و هۆشیارترن، من بەو چارەسەرییەی شامالك قایلم" پاشان وەرگەڕامەوە بە لای شامالك دا و پێم وت:

-شای بەڕێز تکایە لەسەر قسەکانت بەردەوام بە..!!

شامالك هەناسەیەکی هەڵکێشا و دەستی پێکردەوە و وتی:

-ئێستا بە تەواوی کارەکەم بۆ ڕوون بۆوە. من شازادە شێرێزای کچم پێشکەش بەم جەنگاوەرە لاوە چەلەنگە دەکەم.

هەروەها دیاریی بەنرخیش پێشکەش هەموو پیاوەکانی دەکەم و ژمارەیەکیش ژنی جوان دەخەمە ژێر دەستیانەوە، بۆئەوەی ئارەزووی خۆیانی پێدابمرکێننەوە و لەگەڵیاندا ڕابوێرن.

جا لەبەرئەوە پێویستە لەسەرمان، ڕێ و ڕەسمی ڕاوکردن، بە ڕێ و ڕەسمی مارەکردن و ژنهێنانەوە کۆتایی پێبهێنین. پاشان هەریەکەمان بە ڕێگای خۆیدا بڕوات.

ئایا ئەمە چاکترین و تەواوترین چارەسەر نییە..؟

هەستم بە دڵنیایی و شادییەك کرد و چاوەکانم پڕبوون لە فرمێسك ڕووم تێکرد و پێم وت:

-شای بەڕێز ئەوە باشترین چارەسەرکردنە. پیاوەکانیشم ئەوکاتە، بڕوا دێنن کە شازادە شێرێزای شۆخ و شەنگ و مارەیی و دیارییە زۆرەکەی ئەو خەڵات و قەبڵانەیە کە کورغان لە دیلەکەی وەرگرتووە. وە پیاوەکانی تۆش ئەوکاتە لە ڕاستی ئەم هاوسەرییە دەگەن و بە گەورەترین و باشترین و دیارییەکی دادەنێن کە شایەکی گەورە پێشکەشی بکات.

لە ڕاستیشدا من ناتوانم لەوە زیاتر بڵێم، ئەوە خەڵاتێکە و هیچ خەڵاتێکی تر نایگاتێ.

کورغان بە ڕەقی و تووڕەییەوە وتی:

-"بە ڕاستی ئەوە چارەسەرێکی باش و ژیرانەیە!!"

بەڵام شامالك کتوپڕ وەڵامی دایەوە:

-"بەڵێ، ئەوە تەنها ڕێگای چارەسەرییە".

وە بۆ ئەوەی لەو خێر و خۆشی و خەڵاتەی پێشکەش تەیموورت کردووە لەگەڵتا یەکسانبم، لەوە زیاتر ناتوانم هەزار سەربازی فارسی زیاد بکەم و لەژێر فەرماندەیی کوڕە بچووکەکەم شێخ عەلیدا خەڵاتی بکەم و بیخەمە ناو تیپەکەی شازادە تەیمووری چەلەنگەوە.

کورغان هیچ نقەی لە دەم نەهاتە دەرێ، تەنها ئەوە نەبێت بە توندوتیژییەوە تەماشای کردم.

لە ڕاستیشدا شامالك بە هەمان ژمارەی سەرباز یاریدەی دام کە کورغان لەمەوپێش پێشکەشی کردبووم. ئیتر هەستم بە دڵنیایی تەواو کرد. وە ئیتر هیچ یەکێك لەم دوو پیاوە هەرگیزاوهەرگیز ناتوانن پشتم تێبکەن و وازم لێبهێنن.

هەتا هەردووکیان لە ژیاندا بن منیش زنجیرەی بە یەکگەیاندیان دەبم. خۆ ئەگەر یەکێکیشیان مرد، ئەوا من دەبم بە هاوتایەکی بە توانای ئەوی دیکە!!

خۆ ئەگەر کورغان لەوە دلگران و تووڕە نەبێت، هەزار سەربازی ئەفغانی و فارسی لەناو سنوور و ناوچەکەیدا، جێگیر ببن. ئەوا ئێمە، ئەم سیانە لە شادی و خۆشییەکی بێ وێنەدا دەبین.

خێرا شامالك دەستیکرد بە جێبەجێکردن و خۆئامادەکردن و پلان و تەرتیباتکردن بۆ ئاهەنگی ژن گواستنەوەکە. منیش ئەو پلان و تەرتیباتەم پێخۆش بوو وە حەزیشم دەکرد زوو جێبەجێ بکرێت.

پاشان شامالك وتی:

-سبەینێ پەیامبەر دەنێرم بۆ شاری هیرات بۆ خۆئامادەکردن بۆ ئەم شایی و ژنهێنانە.

وە فەوجەکەی شێخ عەلیش با ئاگادار و پاسەوانی خاتوو شێرێزا بن و لە دواییشدا لەگەڵتا لێرەوە پێکەوە بکەونە ڕێ.

-بەڵام تەنها سەد پیاو لە هێزەکەی شێخ عەلی بەسە بۆئەوەی لەگەڵ شازادە شێرێزادا بێن و منیش سەد پیاو لەگەڵ نوێنەرتدا، دەنێرم بۆئەوەی فەرمانی بەرێزت بە تەواوی جێبەجێ بکەن و لە هاتنەوەشدا لەگەڵ خاتوو شێرێزادا بگەڕێنەوە.

سەد پیاو لە چاکترین هەڵبژێردراوانی هێزەکەم و سەد پیاو لە چاکترین هەڵبژێردراوانی هێزەکەی تۆ، دەتوانن لەگەڵ قافڵەکەی خاتوو شێرێزادا بن و بە تەواوی بیپارێزن.

شای بەرێزم وا نییە..؟

-بەڵێ ئەم ژمارەیە بە تەواوی بەسە.

وا دیاربوو شا هیچ مەبەستێکی خراپەکاری نەبوو تاکو پەنا بەرێتە بەر فێڵ و تەڵەکەبازی.

منیش لەو باوەڕەدا بووم شامالك دەیزانی، مارەکردنی خاتوو شێرێزا لە من کارێکە، هەندێ قازانجی تایبەتی بۆ خۆی تێدایە. بە تایبەت وای لێدەکات کە لەگەڵ کورغاندا یەکسان بنەوە.

بەڵام من بە هەموو هێز و توانامەوە نەمدەویست هێزەکەی من لەناو خاك و وڵاتی ئەودا بکەونە شەڕ و ململانێیەوە. کورغانیش سەری ڕاوەشاند و پێشنیارەکەی منی پەسەند کرد.

ئیتر ئەو کاتە شامالك دوواندمی، وتی:

-کەواتە لەبەرئەوەی ڕێککەوتین یالاّ دەی کەسێکی خوێندەوار و شارەزا بانگ بکە بۆئەوەی ڕێکەوتننامەکەمان تۆمار بکات. بەڵام من بە شانازی و بە خۆدا ڕابینینەوە وتم:

-من خوێندنەوە و نووسینی زمانی عەرەبی زۆر باش دەزانم. تۆ چیت دەوێت بیڵێ و منیش دەینووسم و لە دواییدا کاغەزەکەت دەخەمە بەردەست و خۆت مۆری لەسەر بکە.

شامالك تا نیوەشەو خەریك بوو. پاش زنجیرەیەك گۆڕان و زیادکردن، بە یارمەتی من تەواوی کرد.

پلان و تەرتیبات و ڕێ و شوێنی بۆ ئاهەنگی ژن گواستنەوەیەکی زۆر جوان و ڕێکوپێکی قەشەنگ ساز و ئامادە کرد. وە لە بەیانی ڕۆژی دواییدا شامالك لەگەڵ یەکێك لە شازادەکانیدا. سەد پیاوی لە باشترین سەربازەکانی هەڵبژارد و لەژێر فەرماندەیی ئیلشی و داود دا ناردنی بۆئەوەی بچن بۆ هیرات، ئیتر ئاهەنگی شایی و ژن گواستنەوەمان ئاشکرا کرد. سەردار و شازادەکانی کورغان ئەم ڕێکەوتننامەیەیان بە گەورەترین سەرکەوتنی من دانا.

منیش ڕێگام دا بە شامالك لەگەڵ ئەو سەرباز و شازادانەی کە مابوون. بە ئامادەبوونی من و لەژێر چاودێری مندا کۆببێتەوە بۆئەوەی بە ڕێگای تایبەتی خۆی ئەم کارەیان تێبگەیەنێت. وە لەبەرئەوەی کورغان ئامادەی ئەو کۆبوونەوەیە نەبوو کە سەردار و شازادە ئەفغانییەکان بەستیان. من هیچ بەرهەڵستییەکم دەرنەبڕی لە کاتێکدا شا بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا ئەوپەڕی گرنگی ناوەڕۆکی ئەم ڕێکەوتننامەیەی نێوان من و خۆی دەرخست.

* * *

# کوشتنی کورغان

گەرچی ئەو نوێنەر و یاریدەدەرانەمان نزیکەی مانگێك دەبوو، چووبوون بۆ هێرات.

بەڵام ئەو کاروانەی شازادە شێرێزای دەهێنا، هێشتا نەگەیشتبوو. چونکە دەبوو بە ڕێگای "خۆراسان"دا بڕۆیشتنایە، کە درێژاییەکەی چوار سەد میل دەبوو.

وە لەو کاتەشەوە، نوێنەران بۆ هێرات ڕەوانە کرابوون، بەردەوام چادرەکانی شامالك بە جوانترین ڕازاندنەوە، دەڕازاندرانەوە، هەروەك لە شایی و زەماوەندێکی هەمیشەییدا بن. سەربازە ئەفغانییەکان و فارسەکانیش، سەربازەکانی منیان بە دۆست و برادەری خۆیان دادەنا و بە چاوی دوژمن و داگیرکەرەوە تەماشایان نەدەکردن.

ژمارەیەك سەربازم نارد بۆ ئەو چادرانەم کە لە نزیك ڕووبارەکەوە هەڵمدابوو. بۆئەوەی ئەو کەلوپەل و پێویستیانەم بۆ بهێنن کە من پێویستم پێیان بوو.

کار هەرچۆنێك بێت من لەو کاتانەدا نابڵووقەیەکی توونـدم بە دەوری چادرەکاندا لێدابوو. گشت پەیوەندی و هاتوچۆیەکم لەگەڵ دەرەوەدا بڕیبوو. مـن لـەوە دەترسـام، ئـەو سـەفەرەی شامالك کە بە ناوی ڕاوەوە کردبووی. دەستپێشکەرییەك بێت، بۆ پلانێکی خراپەکاری. زۆر بە ئاگا بووم لە کاتێکدا شامالك پەیامبەری خۆی بۆ هێرات نارد.

فەرمانم دا بە داود بە وریایی و وردییەوە چاودێری پەیامبەرەکەی شامالك بکات. کە ئایا پەیامەکەی کە نووسراوە، وەك خۆی دەگەیەنێت یان نا؟!!

پەیامبەرەکەش خۆی دوای ئەوەی، پەیامەکەی گەیاند، بە ئـارەزووی خـۆی، هەندێ لە ئەفسەرەکانمی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ ناو هێرات تاکو هەندێ شوێنی جوان و خۆشیان پیشان بدات، بەڵام لەو کاتەدا هەندێ کەسی نەناسراو شاڵاویان بردە سەری و کوشتیان. سەربازەکانی منیش زۆر چەلەنگانە بەرگریان لێکرد، پێش ئەوەی بکەوێت و بمرێت.

پیاوەکانم ئەمەیان دوای گەڕانەوەیان بۆ گێڕامەوە.. سەربازی پاسەوانم بە هەموو ناوچەکە و گشت لایەکدا بڵاوکردبۆوە. پیاوەکان پێش ئەوەی کاروانی شازادە شێرێزا بگات، هەموو کات و دەمێك زۆر وریا و بە ئاگا بوون. بەڵام ئـەو هەواڵقۆزانـەی لـە سواریدا، سوارچاك بـوون. پێیان ڕاگەیاندم، وا کاروانی شازادە شێرێزا گەیشت و دەوڵەمەندترین و بە بەهاترین قافڵەیەکە، لە ژیانیاندا دیبێتیان و بـە دیمـەن وا دەگەیـەنێت، زۆر دەوڵەمـەند و شـکۆدار بێـت. ئیـتر لـە چادرەکانمـەوە کـەیف و شـادی و خۆشـییەکی زۆر بـەرزبۆوە، و هیـچ بەڵگـە و نیشـانەیەکی

دوژمنایەتیش بە دوای کاروانەکەوە نەبوو، یان لە شوێنێکی تەرەوە نەبوو کە بەرەو چادرەکانی شامالك بڕوات.

ئیلشی و داود بۆ ئەو هەواڵقۆزانەی، شەو هاتبوونە ناو چادرەکانیانەوە، ئەوەیان پێراگەیاندبوون، چۆن پلانیان دانابوو، وەك خۆی جێبەجێ کراوە.

شێخ عەلی و گشت پیاوانی دەستوپێوەندیشی ڕەزامەندی خۆیان پیشان دابوو. وە قایلیش بوون بە شووکردنی شازادە شێرێزا بە من. وە ئەمەیان بە پەیمانێکی دۆستانە و ئاشتیانە دانابوو لە نێوان شامالك و کورغاندا. وە وایان دانابوو، ئەمە سەرکەوتنێکی دیبلۆماسیە بۆ خودی شا خۆی. کتوپڕ ڕۆژێك لە ڕۆژان تۆز و خۆڵی کاروانەکە وەك سەرپۆشێکی گەورە لە ئاسمانی ڕۆژئاواوە دەرکەوت و بەرەو ڕوومان کشا. زۆر بە کەیف و خۆشییەوە گوێم بۆ ئەو پیاوە ڕاهێشت کە بانگی ڕاهێشت و وتی:

"ئا ئەوە تۆز و خۆڵ لە ڕۆژئاواوە بەرزبۆوە."!! لە ڕاستیدا خەڵاتێکی باشی ئەو پیاوەم کرد کە لە پێش هەموو کەسێکدا کاروانەکەی بینی و ئەو بانگەی ڕاهێشت.

ئیتر بۆ ماوەی کاتژمێرێکی تەواو لەگەڵ هەندێ لە شازادەکاندا ڕاوەستام و سەرنجی ئەو تۆز و خۆڵە زۆر و پڕەم دەدا کە لە کاروانەکەوە بەرزدەبۆوە. لەم کاتەشدا هەموو تیپەکەم بە شێوەیەکی جوان و ڕێکوپێك، و لە شێوەی سەربازیدا ڕێك لەبەردەم چادرەکاندا ڕیز بوون. بۆ پێشوازی و بەخێرهاتنی کاروانەکە. ئەو حوشترەی کەژاوەکەی شازادە شێرێزای هەڵگرتبوو، لە پێش قافڵەکەوە دەڕۆیشت و کۆمەڵێکی هەڵبژاردەی چاك لە چاکترین پاسەوانی سەربازەکانی شێخ عەلی پارێزگاری دەکرد. پاشان بەرەو ڕووی چادرەکان چوو.. یەکسەر بە ڕێکی بۆ لای چادرەکەی شامالك ڕۆیشت.

کاروانەکە زیاد لە نیو سەعات بەردەوام لە بیابانەکەوە هەر دەهات. زیاد لە سەد حوشتریش یەك بە دوای یەکدا بە دوای ئەو حوشترەدا ڕۆیشتن کە کەژاوەکەی شازادە شێرێزای هەڵگرتبوو. ئەو حوشترانەش قوماشی ئاوریشم و فەرشی نایاب و کەلوپەلی گرانبەهایان هەڵگرتبوو. بۆ ڕازاندنەوە و جوانکردنی ئەو بەشەی شازادە شێرێزا لە کۆشکەکەمدا -کۆشکی سپی- تیادا نیشتەجێ دەبێت.

بە دوای ئەو حوشترانەشەوە سەدەها ئاژەڵی بارهەڵگرتن دەڕۆیشتن "لە ئەسپ و بارگیر و ئێستر و گوێدرێژ". ئەوانەش لەژێر ئەو بارە قورسانەی گەوهەر و زێڕ و زیو و جلوبەرگ و فەرشدا دەیانناڵاند. ئاژەڵەکان، پاش ئەوەی بارەکانیان لێداگیران. یەکسەر بردیانن بۆ سەر

ڕووبارەکە بۆ ئاوخواردنەوە. چونکە ئەو بیرانەی پیاوەکانم ماوەی دە ڕۆژ زیاتر بوو لە نزیک چادرەکانەوە خەریکی بوون و هەڵیانکەندبوون. نەیاندەتوانی تینوێتی ئەم هەموو ئاژەڵانە بشکێنێت.

گەرچی ئەو پیاوانەی، لەگەڵ کاروانەکەدا هاتبوون. زۆر هیلاك و ماندووبوون. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تا دەمەوبەیان، یارمەتی و هاوبەشی پیاوەکانمیان کرد، لە دروستکردنی دیوانێکی گەورەو جواندا بۆ شازادە شێرێزا و بۆ پێکهێنانی چادری تر بۆ ئەو ژنانەی، لەگەڵ شازادەدا بوون. ئیتر ئاوەها تۆز و خۆڵ نەنیشتەوە تا ڕۆژی دووەم کە ڕۆژهەڵات و تیشکەکەی بەسەر ئەو چادرانەدا پەخش کردەوە کە لە هەوای ساردی شەوی بیاباندا هەڵدرابوون.

لە بەیانیدا لەگەڵ شامالکدا چوومە بەردەم ئیمام و قازی شەرعەوە. بۆئەوەی ڕێ و ڕەسمی مارەکردن مۆر بکەم و ناوی خۆم ببینم کە لە تەنیشت ناوی شازادە شێرێزاوە لە دەفتەری ڕەسمیدا تۆمار دەکرێت.

لە نێوان ئەو ئاگرانەوە ڕەت بووم کە لەناو چادرەکانەوە کرابوونەوە و بۆن و بەرامەی ئەو گۆشت و دووگ و چەوریيانە،یان لێ بەرزدەبۆوە، کە لەو گۆشتە زۆرانەی ئەو مەڕانەوە کە بۆ ئاهەنگی شایی و زەماوەندی ژنهێنانەکەی من سەربڕابوون.

سەرنجی ئەو خەڵکانەم دەدا، پێکی مەییان دەخواردەوە و خواردنیان دەخوارد و پێکە پڕەکانیان بەرزدەکردەوە و دەیاندا بە یەکدا بە ژیان و تەمەن درێژی من. بەڵام من دەمزانی تەنها لەبەر من ناخۆن و ناخۆنەوە، بەڵکو لەبەر خاتری ورگی خۆیانە. چونکە خواردن و خواردنەوەکە بە تام و بەلەزەت و خۆشبوو. منیش پێکم بە ژیانی بووکێ هەڵدا کە هەرگیز تا ئەوکاتە هەر نەشمدیبوو. هەرکە تیشکی گەرمای ڕۆژ زیادی کرد و سەروسیما و لەشی ئاهەنگ گێڕانی گەرم کرد و ئارەقیان پیادا هاتە خوارەوە. منیش ئەو لە سەرخۆیی و مەندییە جوان و شۆخ و شەنگییەی "ئەلجای"م بیرکەوتەوە کە لەسەرەتاوە دەهات بەلامەوە و منیش لەژێر سێبەری دار بەرووەکانی کۆشکی سالی دا ڕاکشابووم. زۆر شاد و پێخۆشحاڵ نەبووم لە کاتێکدا شازادە شێرێزا لە دەرگای چادرەکەیەوە هاتە دەرێ و بە کەژاوەیەکی ڕەسمی بە بەردەم سەرداران و گەورەپیاوانی هێزەکاندا ڕۆیشت.

دەم و لووتی بە پەچە داپۆشیبوو. جوانترین جلوبەرگی لە بەردا بوو کە شیاوی گەورەترین شازادەیەك بێت. هەروەك لە پەیکەرێکی زۆر جوان دەینواند کە بە جوانترین و قەشەنگترین

قوماشی ئاوریشم ڕازابێتەوە. کارەکەرەکانیشی جلوبەرگەکانی بە جوانترین گەوهەر و مرواری بۆ ڕازاندبۆوە.

شەرواڵێکی ژنانەی فراوانی گەورەی لەبەرکردبوو (ئەمە وەك ئاولکراس جلی کوردی ژنانە بووە. و) چونکە ژنە فارسییەکان حەزیان بەوە دەکرد شەرواڵی گەورە لەپێ بکەن بۆئەوەی ڕانیان بە قەڵەوی و سمتیشیان بە گەورەیی و پانی دەرکەوێت. چونکە شازادە و مێردەکانیان حەزیان لە سمتی گەورە و خڕوپڕ دەکرد. هەروەك باوەڕیان پێیبوو، دەیانوت: سمتی گەورە و پڕ خۆشی و شادی و ئارەزووی زۆرت هەڵدەستێنێت، لە کاتێکدا، لەگەڵ ژنەکانیاندا دەچنە ناو جێگای نەرم و نیانەوە.

ئەوکاتەی کە هاوسەرەکەم هات بۆ لام و چووە بەردەم قازییەکانی شەرع، چاوەکانیم بینی — ئەوکاتە تەنها چاوەکانیم دی- گەورە و خڕ بوون زۆر جوان و سەرنجڕاکێش بوون. کە دەستەکانیشی دەرکەوتن زۆر بچووك و نەرم و شل بوون و پەنجەکانیشی زۆر جوان و ڕێکوپێك بوون.

لە کاتێکدا ئیمام دوعا و بەرەکەتی خوای بەسەردا دەخوێندین فەرمانی پێدام، دەستی بگرم. دەستەکانیم بینی خڕبن و زۆر فێنك و بەهێز بوون. لەو کاتەدا دەستەکانمی دەگوشی. پاش ئەوەی بووکەکەم گەڕایەوە بۆ ناو چادرەکەی خۆی. ئیتر منیش لەگەڵ شامالکدا دەستم کرد بە دابەشکردنی ئەو خەڵاتە بەنرخ و گرانبەهایانە بەسەر میوانەکاندا. لە کۆتاییدا پیاوەکانم پاداشتی خۆیان وەرگرت و بە تەواوی قایل بوون.

هەروەها ئەو سەد کچەی شامالك فەرمانی دابوو بە هێنانیان بۆ خۆشی و شادی فێستیڤاڵەکە و بۆ جوانکردن و ڕازاندنەوەی ئاهەنگی ڕۆژی شایی و گواستنەوەکە. ئەو کچانە بە ئارەزوو، و سوپاسەوە پێشوازی ئەو پیاوانەی منیان کرد کە هیچ ڕایاننەبواردبوو لەگەڵ ژنانی ئەو جەنگاوەرانەی لەمەوپێش کوژرابوون.

هەرکە بۆ جاری دووەم کەژاوەی شازادە شێرێزا لە دەوری مێزی نانخواردندا دەرکەوت. هەمووان خرۆشان بە هەرا و چەپڵەلێدانەوە پێشوازییان لێکرد، و پێکەکانیان بۆ سەرەوە بەرزدەکردەوە، تاکو بە ژیانی من و شێرێزا بیخۆنەوە.

من لەبەرئەوەی، دەمزانی، میوانەکان ئارەزوویانە، ئاهەنگەکە کورت و کەم بێت. چونکە حەز و ئارەزوویان لەوە بوو، زوو بچنەوە بۆ ناو چادرەکانیان تاکو پشوو بدەن و هیلاکی سەفەرەکەیان دەرکەن، و لەگەڵ ژنەکانیاندا ڕابکشێن..!!

"لـه ڕاستیشـدا خۆشـم هـەمان ئـارەزووم هـەبوو. چونکـە مـاوەی شــەش حەفتــە زیــاتر تێپەڕیکردبوو، خۆشم لە ژنەکانم دوورکەوتبوومەوە".

ئیتر خێرا حەز و ئارەزووی خۆمم دەربڕی بە کۆتاییهێنانی ئاهەنگەکە و شازادە شێرێزاش بە زەردەخەنە و چاوداگرتنەوە، پشتگیری کردم.

ئیتر زۆری نەخایاند، چووم بۆ نزیك مینبەرەکە و سواری پشتی ئەسپە سپییەکەم بووم.

لەو کات و لەو شەوەدا هەوای ساردی بیابـان بـە نـەرمی بـەرەو چادرەکـان هـەڵیکردبوو. ئەسپەکەم بەو تووڵەڕێیـەدا بـرد کە ڕم بـە دەسـتەکان لـەملاو لـەولایدا ڕیـز ببـوون و شـازادە شێرێزام لەگەڵ خۆمـدا بۆ نـاو چادرەکـەم هێنـا. دوای ئـەوەی شـازادە شـێرێزا کارەکـەرەکان و یاریدەدەرەکانی ئیزن دا. هیچ ترس و لەرزێکی نەبوو. وەك ئەلجای وەختی خۆی هەیبوو. بـەڵکو خێرا جلەکانی داکەند و خۆی ڕووت و قووت کردەوە و بە نەترسی و خۆنواندنەوە لەبـەردەممدا ڕاوەستا و لێی پرسیم، وتی:

-ئایا نـابینیت، هـەردوو سمتـەکانم چـەند گـەورەن و سـنگم بـە دوو مـەمکی سـەرنجڕاکێش و جوان ڕازاوەتـەوە!!؟ هەسـتم کـرد، لـە ژیـانمدا مـن پـاك نـەبووم. چونکـە شـێرێزا لـە ئـەلجای بالابەرزتر نەبوو. وە تەمەنیشی لە تەمەنی خۆمدا بوو. زۆر دەمێکش بـوو پێگەیشتبوو و بـالق ببوو. چونکە کچانی ناوچـە ژووروومـکان زۆر زوو پێدەگەن و دەگەنـە تەمـەنی بـاڵقبوون. پاشـان وەڵامم دایەوە و وتم:

-خۆشەویستـەکەم بێگومان دەیبینـم، و بێشك بەو تەماشاکردن و بینینـەش شادومان دەبم.

-من خواردنم زۆر کەم خواردووە، و زۆریش ڕۆن زەیتوونم خواردۆتــەوە. بۆئـەوەی سمتـەکانم گەورە ببن و ناوقەدیشم زیاتر باریك ببێتەوە!!

سینە و مەمکیشم بەخشندەیی و خەڵاتییـەکی گـەورەیی خوایـە. ئایـا تـۆ بـڕوا دەکـەیت مـن بتوانم منداڵ و کوڕی بەهێزم ببێت و بە شێوەیەکی باش و تەواو مەمکیان بدەمێ، ئایـا تـۆ هیـچ گومانێکت لەوە هەیە؟

-نەخێر من هیچ کات گومانی وا ناکەم!! بێگومان تۆ ئەو ژنەیت مرۆڤ هیوا و ئـاواتی پێبێـت کە ببیت بە دایکی کوڕ و منداڵەکانی.

پاشـان بـە هێواشـی خۆی وەرچـەرخاند، بۆئـەوەی هـەموو جوانـی و شـۆخ و شـەنگی لەشـیم پیشان بدات.

دوای ئەوە بە خۆشی و دڵنیاییەوە بەرە و ڕووم هات و کەیف خۆش بوو بە وەی من مەدحم کرد و زۆر بە ڕێزەوە ڕێزم لێگرت. بەڵام کتوپڕ بە دڵە خورپێوە لێیپرسیم:

-ئایا لەمەوپێش هیچ منداڵێکت هەبووە؟

-نەخێر تاکو ئێستا هیچ منداڵێکم نییە.

-کەواتە ڕەنگە من یەکەم کوڕم ببێت و بۆت بەرهەم بهێنم.

ئایا بەوە شادومان دەبیت؟!!

-بێگومان، من زۆر شاد و بەختەوەر دەبم و هیواداریشم بەوە، لە سیمایدا نیشانەی شادییەك گەشایەوە و لە ڕوویدا پرشنگی جوانییەك درەوشایەوە کە لەمەوپێش پێوەی دیار نەبوو. پێستی لەشی وەك پێستی دەستەکانی جوان و نەرم و شل بوو، لەش و باڵایەکی جوان و گۆشتن و پڕی هەبوو. جوانییەکەی پڕبوو لە سەرنجڕاکێشان.

بۆم دەرکەوت، شتێکی برسی لە هەناویدا دەهەژێت و دەقیژێنێت و ئەو شتەش دانامرکێتەوە و ناشهێڵێت منیش بحەسێمەوە تاکو لەناو هەناویدا تۆوێك نەڕوێنم وای لێبکات، ئەو تۆوە پێبگەیەنێت و خواردنی بداتێ!!

لە ڕاستیشدا شێرێزا بیری لەوە دەکردەوە، کوڕێکم بۆ وەدی بهێنێت تا سپێدەی بەیان دەرکەوت، ئێمە، من و شێرێزا تا ئەو کاتە هەر بە خەبەر بووین. هیچ هەڵێکی بە فیڕۆ نەدەدا و هەرکاتێك بۆی ڕێك بکەوتایە پێی لەسەر ئەوە دادەگرت، تاکو دڵنیابێت لەوە، من تۆوێکم تێدا چاندووە کە بڕوێت و نەشونما بکات. منیش هیچ کات ئەو پێ لەسەر داگرتنەیم پشتگوێ نەدەخست و بە هەموو تین و توانایەکمەوە هەوڵم دەدا و دەمویست تینوێتی بشکێنم و ئارەزوو و ئومێدەکەی بۆ وەدی بهێنم.

گەرچی ئێمە لە حاڵەتێکدا بووین، زۆر ماندوو شەکەت بووین! بەڵام هەرچۆنێك بێت هەستاین و جلەکانمان لەبەرکرد و خۆمان ئامادە کرد. تاکو ئیتر سەربازەکان چادرەکان هەڵگرن و بیپێچنەوە. کاروانەکەمان بە ڕێگای دیاریکراوی خۆیدا دەستیکرد بە ڕۆیشتن. کاروانەکەی کورغان یەکەمجار شوێنەکەی خۆی جێهێشتبوو. بەڵام ئەو سەردار و شازادانەی لەگەڵ کورغاندا بوون، زۆر تووڕە و ناقایل بوون، و لەسەر ئەوە نارەزابوون گوایە کورغان کێشەکەی بە باشی چارەسەر نەکردووە. و لە پێش چاویاندا خەریکبوو هێرات داگیر بکەن و بکەوێتە دەستیانەوە بەڵام ئەوەندەی نەخایاند ئەو هەلەی لەدەست دان. وە ڕەنگە وایان زانیبێت لە بێهێزی کورغانەوە بووبێت وای لێ کردووە، وا بکات، بۆئەوەی هەندێ سوود و دەستکەوت بۆ خۆی

مسۆگەر بكات بەڵام من خەڵاتی گەورەی خۆمم دەستكەوتبوو. هەروەها هەموو پیاوەكانیشم ڕازی بوون بەو خەڵاتانەی، وەریانگرتبوو. هەتا شامالك خۆشی لەو ڕێكەوتنە كەڵك و سوودێكی باشتری وەرگرتبوو. وە زۆر زیاتر بوو لەو كەڵك و سوودەی كورغان دەستی كەوتبوو.

ئاوەها كۆمەڵێك ڤین لە دڵی ئەسپ سوار، سەرەتا لە چادرەكانەوە هاتنەدەری.

پاش ئەوە كاروانی شازادە شێرێزا لە خێمەكەی منەوە دەرچوون و بە باكووری ڕووبارەكەدا ڕۆیشتن. زۆربەی زۆری سەربازی تیپەكەم و پۆلێك لە سەربازەكانی شێخ عەلی پێشەنگی كاروانەكەی شێرێزا بوون.

ئیلشی و دوو سەد سەربازم لە پیاوەكانی خۆم جێهێشت بۆئەوەی لە ڕێی گەڕانەوەیاندا بۆ شاری هیرات ئێشكی كاروانەكەی شامالك بگرن.

منیش زۆرم كرد و پێم لەسەر ئەوە داگرت، كە دەبێت شێخ عەلی لەگەڵ مندا بێت. شێخیش خۆی حەزی بەوە بوو. وە ڕەنگە شامالك وا تێگەیشتبێت، من بۆیە حەزدەكەم شێخ عەلیم لەگەڵدا بێت، وەك دیلێك یان بارمتەیەك، بێت لە لام. بەڵام لە ڕاستیدا من بە هیچ جۆرێك بیرم لە شتی وەها نەكردبۆوە. شێخ عەلی بە سواری ئەسپەكەیەوە لە تەنیشت منەوە بوو. لە پێش كاروانەكەوە و لە بەردەم ئەو حوشترەی كەژاوەكەی خوشكەكەی هەڵگرتبوو دەڕۆیشت.

شێخ عەلی ساڵێك یا دوو ساڵ لە من گەورەتر بوو. زۆر زۆر و كتومت لە خوشكەكەی دەچوو. دەموچاوە جوانەكەی و ڕووخۆشییەكەی نیشانەی زیرەكییەكی زۆر و ئازایەتییەكی بێ وێنە بوو.

ئەو جەنگانەی لەمەوپێش كردبووی، ئەو ئازایی و نەترسیەی سەلماندبوو. لەشولاری ئەوەی دەردەخست ئەگەر لە گەڵمدا تێكبچێت و تووڕە ببێت. ئەوا دەبوو بە دوژمنێكی سەرسەخت و ترسناكم. بەڵام من گشت كات ئاواتەخواز بووم كە هەردەم دۆست و برادەرم بێت.

وە لە كاتێكدا پێكەوە دەڕۆیشتین بە پەرۆشەوە لێی پرسیم وتی:

-باشە!! تۆ شێرێزات چەند خۆش دەوێت؟

-من زۆر شاد و بەختیار بووم بە مارەكردنی شێرێزا ڕۆح و دڵم شاد و گەشایەوە پێی. بە ڕاستی شێرێزا وەچەیەكی مەزن و شكۆدارە.

-بێگومان منیش خۆم زۆرم خۆشدەوێت. وە لەو كاتەوەی كە لەگەڵ ژناندا لە شوێنە تایبەتییە جۆربەجۆرەكانی خۆیدا... منیش زۆرم نەدیووە. بەڵام كە مناڵ بووین پێكەوە من زۆر زۆرم خۆش دەویست، ئەویش هەرچەندە بە تەمەن لە من بچووكتر بوو، زۆر چاودێری كارەكانمی دەكرد و پێویستییەكانمی بۆ ڕێكدەخستم.

-وا ئێستا شێرێزا بووە بەماڵی من و وەك خەڵات و مەدالیایەكی گرانبەها دەستم كەوتووە.

-بەڵێ من ئەوە دەزانم، باوكم بە درێژی و تەواوەتییەوە ئەوەی بۆ باسكردووم و پێشی وتووم، ئەو كارە چۆن بووە!! بە سەرسوورمانێكی سەیرەوە تەماشام كرد. بەڵام بینیم پێدەكەنێت و لەسەر قسەكانی بەردەوامە و، وتی:

-ئۆهـ..!! مەترسە باوكم بەم رێككەوتنە زۆر پێخۆشحاڵە.

-بەڵام من دڵنیا نیم لەوە، ئایا كورغان پێخۆشحاڵە بە شووكردنی شازادە شێرێزا بە من یان نا.

-ئەمە لای باوكم گرنگ نییە و بێزاری ناكات. باوكم بڕوای وایە كورغان تۆی بۆیە هەڵبژاردووە، چونكە تۆ لای ئەو چاكترین كەسێكی. وە دوای ئەوەی، ئەو كێشەیەت بەو شێوەیە چارەسەر كرد. كورغانیش زیاتر تۆی بەدڵدا چوو.

-بەڵام شێخ عەلی ئایا تۆ وا بە چاكتری دەزانیت كە وڵاتی خۆت جێبهێڵیت و بێیت لە خزمەتی زاواكەتدا كاربكەیت؟

-من وام دەزانی، تۆ بەم كارەم پێخۆشحاڵ دەبیت، بەهەرحاڵ چەند هۆكارێك بۆ ئەم مەبەستە هەیە. بە پلەی یەكەم بۆیە من هاتم بۆ لات چونكە من ناتوانم لە هەراتدا بمێنمەوە چونكە غیاپ الدین برا گەورەی منە.

-شامالكیش نایەوێت دووبەرەكی لە هەراتدا ببێت.. ئایا وا نییە..؟!

-بەڵێ.. چونكە من ناتوانم دووبەرەكی و ململانێ لەسەر تەختی پاشایی لەگەڵ غیاپ الدین دا بكەم. من و باوكم لەو باوەڕەداین، تۆ ڕۆژێك لە ڕۆژان هەموو كاروباری وڵات دەگریتە دەست و فەرمانڕەوایی هەموو وڵاتی تەتەر دەكەیت!! خۆ ئەگەر منیش هێز و توانا و شارەزایی خۆمم سەلماند. ئەوا منیش لە پاداشتی ئەو خزمەتەدا دەستكەوتێكی گەورە لەژێر سایەی ئاڵاكەتدا وەدەستدێنم.

-تۆش دەتوانیت، ببیت بە جێگر و جێنشینی من، بێ ئەوەی شەڕ و ئاژاوە لە ڕووی براكەتدا بكەیت و میللەتەكەت دژی ئەو، هان بدەیت و تێكی بشكێنیت؟!

-نەخێر سەروەرم، من ناتوانم ببم بە جێگر و جێنشینی تەختی پاشایی تۆ..!! چونكە من پیاوێكی تەتەری نیم.. نەخێر.. بەهەرحاڵ تەنها ئەوەندە هەیە تۆ دەتوانیت پشت بە من ببەستیت.

وە خۆشم لەو باوەڕەدام، چاكتر وایە و زیاتر بە سوودترە، بۆ خۆم لەگەڵ تۆدا ڕێگای ڕاست و شەرەفمەندێتی بگرمەبەر.

-چاکه.. من بڕوای تەواوم هەیە، ئێمە هەردووکمان بە تەواوی یەکین و لەگەڵ یەکتریشدا هەردەم تەیا دەبین.

-منیش تەنها هەر ئەوە هیوامە و بێگومانیشم لێی. دوای ئەوە ئیتر زیاتر لە یەکتری گەیشتین و بڕوای تەواو توند و تۆڵ لە نێوانماندا پەیدابوو. منیش دڵنیابووم، ئەفسەر و سەرکردەیەکی شارەزا و بەتوانام چنگ کەوتووە.

ئیتر وردە وردە هەستم بە دڵنیایی و هێز کرد و بڕوام بەوە هێنا بە تێکەڵبوونی تیپەکەی شێخ عەلی بۆ ناو تیپەکەی شەهری سیبزم ڕێ و شوێنم زیاتر بەتین دەکات، و هێزم بەهێزتر دەکات و توانام زیاتر دەبێت. ئەگەر کورغان تووڕە بێت و بیانووم پێبگرێت و بیەوێت جێگام لە وڵاتی تەتەردا پێ لێژ بکات.

بەڵام ئەوە هەرگیزاوهەرگیز ڕووی نەدا!!

چونکە هەرکە گەیشتینە ئەو شوێنەوە کە دەیڕوانی بەسەر ئەو چادرانەمدا کە لە دوای ڕووباری "ئامۆداریا" وە هەڵدرابوون. سوارێك بە پڕتاو لە کاروانەکەی کورغانەوە هات و گەیشتە بەردەم کاروانەکەم پێی وتم:

-دوو شازادەی ڤین لە دڵ شالاویان بردۆتە سەر کورغان کوشتوویانە و ڕایانکردووە بۆ ئەو شاخ و گردانەی لە ڕۆژهەڵاتی شاری باڵخ دایە. بەڵام شازادەکانی تر، بە هەموو لایەکدا بڵاوەیان کردووە و چوونەتە ناو قەڵاکانی میرنشینەکانیانەوە. لە ترسی ئەوەی، دوای کوشتنی سەرداری وڵاتی تەتەر چی دەقەومێت؟! ئەو سوارە بۆ شاری کارشی غاری دەدا و دەیویست بچێت بۆ لای لاداخی کوڕی کورغان و خەبەری کوشتنی باوکی پێڕابگەیەنێت. و پێشی ڕابگەیەنێت پێویستە بە زووترین کات بێت و لەسەر تەختی شاهینشاهی وڵات لە دوای باوکی دابنیشێت.

ئیتر منیش ئەوکاتە موسام بانگ کرد و فەرمانم پێدا زۆر بە گورجی و خێرایی کاروانەکە لێخوڕێت و خۆی بکات بە دەروازە ئاسنینەکەدا و، بچێت ئاسایش و ئارامی شاری شەهری سیبز بپارێزێت.

دوای ئەوە خۆشم خێرا سواری ئەسپ بووم و بەرەو چادرەکانم غارم دا. و فەرمانم دا بە پاسەوانەکانم، زوو چادر و باروبارگەکان بپێچنەوە و بگەنە کاروانەکەی موسا، دوای ئەوە پێنج پیاوم لە باشترین پیاوەکانی شێخ عەلی و دە پیاوم لە باشترین پیاوەکانی خۆم هەڵبژارد و چەند ئەسپێکی زۆر باشم گلدایەوە بۆ بەکارهێنانیان لە کاتی زۆر زەرور و پێویستی کتوپڕی چاوەڕوان

نـەکراودا. ئیتر دوای ئـەوە و لـە هـەمان کاتیشدا مـن و شێخ عـەلی و سوارە هـەڵبژاردەکانمان بـە هەموو تین و توانایەکمانەوە بە خێرایی بەرەو شاری باڵخ غارمان دا و بۆی دەرچووین.

ماوەی شەو و ڕۆژێك بەردەوام بەسەر ئەو زیخ و لـە گەرمـەدا غارمان دەدا و تۆز و خۆڵ و گەردەلوولی بیابانمان بڕی کە هەموو سەروملمانی سووتاندبوو. گونە لووتەکانمان پڕببوو لە تۆزو خۆڵ و دەربەندە بەرداویەکانمان دەبڕی، ئەو دەربەندانـەی کـە لاقـی ئەسپەکانمانیان دەشکاند و بەناو دڕك و داڵ و دڕکەزێیەکاندا دەڕۆیشتین کە هەموو جل و بەرگەکانمانی دەدڕاند و لـەشمانی ڕووت و قوت دەکردەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئێمە دەگەیشتینە هەر چادرێك لە بیابانەکەدا و دەگەیشتینە هەر گوندێکی نـاو شاخەکان، ئێمـە ئەسپەکانمان دەگۆڕی و سواری ئەسپی تـر دەبووینـەوە، و سـەرلەنوێ لـە غـاردانـدا بـەردەوام دەبووینـەوە.. بـەڵام هیـچ نـەمانتوانی بگەینـە پیاوکوژەکـان. و هیـچ پاشماوەیەکیشمان لێنەبینین. بەڵام پاش ئەوەی ماوەی شەو و ڕۆژێکی تـەواوی ترمـان بـە غـاردان بڕی و شاری گوندۆزمان جێهێشت. گەیشتینە دەربـەندە سـەهۆڵبەندانەکانی چیای هندوکۆش و ئاخری توانیمان بگەینە پیاوکوژەکان.

پیاوکوژەکان تەنها دوو پیاو بوون. بینیمان لـەناو بەفرەکـەدا هەڵدەلـەرزین و نوقمـی نـاو بەفرەکە ببوون. زۆریان لە ئەسپەکانیان دەکرد کە لە سەرما و هیلاکیدا خەریك بوون بمرن. وە لەبەرئـەوەی دوو پیاوەکە زۆر هیـلاك و شـەکەت بـوون و زۆریـش دەترسـان. نـەیانتوانی هیـچ بەرهەڵستییەك لە خۆیان بکەن. من یەکێکیانم کوشت و شێخ عەلیش ئەوی تریانی کوشت.

پاشان سەرەکانیانم بڕی و فەرمانم دا بە هەندێ لە سوارەکانم یەکێك لە سەرەکان بەرێت بۆ لاداخ و فەرمانیشـم دا بـە ژمارەیـەکی تـر، سەرەکەی تریشیان بـەرن بـۆ کـابول بـۆ حسـێن و دوو نامەشم بۆ ناردن و تیایاندا ئەوەم بۆ ئاشکرا کردبـوون. مـن تۆڵـەی کورغـانم سـەندەوە و مـن بـە غەم و پەژارەیـەکی زۆرەوە، غـەمباری و پێناخۆشـی خـۆم دەردەبـڕم لـەو زیانـە گەورەیـەی، بـە کوشتنی کۆڵەکەی نەتەوەکەمان کورغان تووشمان هات، خوا سەبووری بە گشت لایەکمان بدات.

پاش ئەوە لەگەڵ شێخ عەلیدا گەڕاینەوە بۆ شاری شەهری سیبز.

* * *

# ئابلۆقەیەکی خەتەرناک

کاتێك گەڕامەوە بۆ شەهری سیبز بینیم کاروباری شار زۆر تێکچووە، و خەڵکی زۆر شڵەژاون. لە ڕاستیدا کاروباری وڵاتی تەتەر بۆ ماوەی مانگێك لە ناخۆشی و شڵەژاویدا بوو. لاداخ لە شوێنی کورغانی باوکی دانیشت. و شاری سەمەرقەندی کرد بە پایتەختی شاهێنشاهی چونکە وەختی خۆی لە بناغەشدا هەر بارەگای خان بوو.

وە بە هێزترین قەڵایەکیش بوو لە هەموو وڵاتی تەتەردا سەردار و سەرانی گشت عەشیرەتەکان لەناو خۆیاندا کەوتبوونە دەمەقاڵێ و ناکۆکییەوە، لەسەر ئەوەی گوایە لە ئاخریدا کێ وڵاتی خان دەگرێتە دەست و دەیپارێزێت. چونکە کەس بە بیریدا نەدەهات لاداخ ئەوەندە بمێنێ و بۆ ماوەیەکی زۆر فەرمانڕەوایی وڵات بکات.

دەنگوباسم پێگەیشت، دەیانووت: بایەزید جالیر و حاجی برلاس پلان دادەنێن و بە گورجی خۆیان کۆ و ئامادە دەکەن تاکو هێرش بکەنە سەر شەهری سیبز.

نەمدەزانی، چەند سەردار و شازادەی تر چاویان بڕیوەتە پایتەختەکەم چونکە وایان دادەنا، تەنها بنکەیەکی پێشەوە بەهێزە کە دەتوانن لێوەی هێرشی تووندوتیژ بکەنە سەر سەمەرقەند لە کاتێکیشدا من چاوەڕوان بووم لە هیراتەوە ئیلشی و تیپەکەی شێخ عەلی بگەڕێتەوە.

خۆم دەستمکرد بە دابەشکردن و دامەزراندنی پیاوەکانم بە سەر شوێنە گرنگ و ستراتیژییەکاندا.

داود و تیپەکەیم نارد بۆ لای دەروازە ئاسنینەکە بۆئەوەی لە باشوورەوە بمپارێزێت. موسام نارد بۆ بەشی ڕۆژئاوا تاکو پارێزگاری ئەو ڕێگایە بکات، لە "کارشی" و "بوخارا"وە دەهات. "جاکۆ" و سەربازەکانی و یەکێك لە سەرکردە ئەفغانییەکان کە ناوی "موفا" بوو، لەگەڵ تیپەکەیدا ناردمن بۆ ڕۆخی ڕووبارەکە تاکو شوان و مێگەلە مەڕەکانم لە هەڵمەتی ئەو پیاوانەی حاجی برلاس بپارێزن کە لەناو گردۆڵکەکاندا بوون.

بەڵام شێخ عەلی لەگەڵ خۆمدا مایەوە. و هەندێ لە پیاوانی خۆی گلدایەوە وەك هێزێکی یەدەکی بۆئەوەی ئەو کون و کەلەبەرانەی بیگرێت کە هێزەکانمان پارێزگاری لێدەکردن. هەروەها بۆ یاریدەدانی ئەو هێزە تایبەتییەی خۆم و دەستبەسەراگرتنی ڕێگای سەمەرقەند.

هەروەها ژاوەژاو و هەراو هوریاش لەناو کۆشکی سپی کۆشکەکەم دا لە هی دەرەوە کەمتر نەبوو. کاتێك لە هندۆکوش گەڕامەوە بینیم خاتوو شێرێزا زۆر سەرقاڵی جوانکردن و

ڕازاندنەوەی ئەو بەشەی خۆیەتی کە لە کۆشکەکەدا درابوویەتی، بە جوانترین قوماش دەیڕازاندەوە و پڕی کردبوو لەو ڕاخەر و فەرشە نایابانەی لە هیراتەوە لەگەڵ خۆیدا هێنابوونی.

بەو سەربەستییەی، هەیبوو زۆر دڵخۆش بوو. بە تایبەت کاتێک کە بوو بە خانمێکی فەرمانڕەوا لەو بەشەی کۆشکەکەدا، کە درابوویە و دەیتوانی بە سەربەستی پەیوەندی بە هەموو ئەو کەسانەوە بکات کە لە کۆشکەکەدان.

چونکە لەو کاتەدا لە هەموو وڵاتی تەتەردا هیچ کۆشکێکی تر نەبوو لە جوانیدا شان بدات لە شانی کۆشکەکەی من.

بێگومان شێرێزا هەرکە ئەلجای بینی، چەند مانگێکە سکی پڕە. زۆری پێخۆش نەبوو. شێرێزا ئاوات و ئارەزووی بۆ ئەو ڕۆژە دەخواست، سکی وەك ئێستای ئەلجای پڕ و بەرزبێتەوە. وە دەشیزانی، وەك ئەلجای سکی پڕ و بەرزنابێتەوە هەتا چەند مانگێکی بەسەردا ڕانەبووریت. بەڵام زۆر هیوای بەوە بوو، وە لەسەر ئەوەش زۆر سوور بوو. بەڵام شازادە ئەلجای ئەو کاتانە زۆر تووڕە و ئێجگار دلگران بوو، لە ژیانمدا بەو شێوەیە نەمدیبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، لەگەڵ شێرێزادا زۆر باش و نەرم و نیان بوو.

بەڵام لە من زۆر تووڕە و قین لەدڵ بوو. تووڕەبوونێکی ئاگراوی. کاتێك گەڕامەوە لە ڕاوەنانی ئەو پیاوکوژانە، کە باپیرەیان کوشتبوو بینیم لەسەر جێگاکەی ڕاکشابوو.

بە گرژ و مۆنییەکەوە ڕووی تێکردم و پێی وتم:

-ئاوەها ڕۆیشتی و چوویت شازادەیەکی پەچەسەوزی پیرۆز و سنگ پانێکی ڕازاوە بە دوو مەمکی فرووپڕی جوانت مارە کرد؟

-ئەلجای خۆشەویستم، شازادە هەموو شازادەیەك مافی خۆیەتی کە چوار ژنی شازادە بهێنێت.

-چاکە..!! ئاوەها خاتوو شێرێزات خستە سەر سێ ژنەکەی ترت. بەڵام قەیناکات.

شازادەی گەورەم، هەرچۆنێك بێت ئەم کارە پەیوەندی بە خۆتەوە هەیە. تەیمووری خۆشەویستم ئێستا وەرە لامەوە و تۆزێك دەست بکەرە ملم. ئەگەر لە پێش چاوتدا ناشیرین نەبووبێتم.

ئەو ماوەی مانگە کە لێم دوور بوویت، زۆر زۆرم بیردەکردیت.

-ئەلجای خۆشەویستم تۆ لە پێش چاومدا هەرگیز ناشیرین نیت و هەرگیز،هەرگیز ناشیرینیش نابیت.

پاشان لە نزیك جێگاكەیەوە بە چۆكدا هاتم و گرتمە باوەش. ڕاستبوو بە هۆی سك پڕییەكەیەوە، سكی بەرزببۆوە و ئاوسابوو بەڵام هێشتا هەر ئەلجای جوان و دلگیر بوو. گەرچی فرمێسكیش لەسەر كوڵم و ڕوویدا ئاسەواری خۆیان جێهێشتبوو. دوای ئەوە وەڵامم دایەوە، وتم:

-خۆشەویستەكەم منیش ئێجگار بیرم دەكردی. بڕوات بێت، ئەو بیركردن و ئارەزووەم بۆت. زۆر زۆر زیاترە لەوەی، تۆ بیری لێدەكەیتەوە، وە بە خەیاڵتا دێت.

-تەیمووری خۆشەویستم بڕوام بە قسەكانت هەیە. من كاتێك دەزانم، تۆ منت خۆشدەوێت كە دەستم تێوە دەدەیت. چونكە خۆشەویستی تۆ لە دەستتدایە و بەدەستتدا دیارە.

پاشان تۆزێك كشامەوە و ئەو تۆپەڵە قژەیم لەسەر نێوچەوانی لابرد، كە بە شێوەیەكی جوان بەنێوچەوانیدا هاتبووە خوارێ. و حەزم كرد، هەردوو لەپی دەستم بخەمە سەر كوڵمە خڕپنەكانی و بە پەنجەكانیشم نەبزی نێوچەوانی بگرم. بەڵێ خۆشەویستیم، لە دەستەكانمدا بوو، لە دڵمدا بوو، لە مێشكمدا بوو، وە لە چاوەكانیشمدا بوو بۆی لە ڕاستیدا ئەلجای وەك هەموو ژنێكی تر نەبوو. ئەگەر ببوایە زۆر بژیایە ئەو هەست و خۆشەویستییەم كە بەرامبەری هەمبوو. گشت دەرگایەكی لێدادەخستم و بێگومان دەیفەوتاندم و لەناویشی دەبردم. چونكە خۆشەویستی (جا خۆشەویستییەكە، پیرۆز بێت یان خۆشەویستییەكی ناپاكانە بێت) دەتوانێت، مرۆڤ بێهێز بكات و بیكوژێت و لە ناوی بەرێت. وەك ئەو نەخۆشییە ترسناكانەی خودا دەیدات بەسەر خەڵكیدا.

ئەلجای هەركە حەسایەوە و هەناسەبڕكێی نەما، بە نەرم و نیانی و لەسەرخۆییەوە پێی وتم:

-خۆشەویستەكەم، تەنها چەند هەفتەیەكی تر چاوەڕوان بكە، هەتا منداڵەكەم دەبێت. هەر، منداڵەكەم بوو، ئەوكاتە چۆنت ئارەزوو لێبوو لەگەڵمدا ڕابوێرە، و دەگەڕێینەوە بۆ ڕۆژانی ڕابووردوومان و دەبینەوە بە خۆشەویستەكەی جاری جاران. بۆ هەتاهەتایە.

-بەڵێ.. سەرلەنوێ سواری ئەسپ دەبینەوە و پاشان پێكیشەوە ڕاودەكەین و لە ڕووباریشدا مەلە دەكەین.

-سەرلەنوێ و دووبارە یەكتریشمان خۆشدەوێتەوە.

-ئەلجای.. پێویست، شتی وەها نەڵێیت..!! چونكە ئێستا و لەمەوپێشیش هەر یەكتریمان خۆشویستووە. من ئێستا زیاترم خۆش دەوێیت وەك لەمەوپێش.

من لە قسەکانمدا راست و رەوان و بێغەش بووم. بەڵام ئەلجای بە شێوەیەکی ترس و گومانەوە لێیپرسیم و وتی:

-ئایا شازادە شێرێزا و لەیلا و زیباشت هێندەی من خۆشدەوێت. وە هاوبەشمن لەو خۆشەویستییەدا؟

-ئەلجای خۆشەویستیم بەرامبەرت وەك گڕ و بڵێسەی چراوگێك وایە، ئەو گڕ و بڵێسەیە دەتوانێت هەزار چراوگی تر دابگیرسێنێت. لەگەڵ ئەوەشدا یەك تۆز، بگرە هێندەی گەردیلەیەکیش لە گەرمییەکەی بەرامبەر بە تۆ کەم نابێتەوە.

-کەواتە ئێستا گڕ لە خاتوو شێرێزا بەردە و هەر کاتێکیش منداڵەکەم بوو هێز و توانا و تەندروستی و ئارەزووم چاك بوو. ئەو کاتە ئەو گڕ و بڵێسەیەی لێبکوژێنەوە.

بەڵام پاش چەند رۆژێك یەکێك لە هەواڵقۆزان بە خێرایی لە لای دۆڵی رووبارەکەوە گەیشتە لام و پێی راگەیاندم، کۆمەڵێك لە پیاوەکانی حاجی برلاس لە حەشارگەکانی خۆیان، لەناو گردۆلکەکانەوە، لاساریيان کردووە و هێرشیان بردۆتە سەر هەندێ لەو شوانانەم کە مێگەلە مەرو ئەسپەکانیان لە لەوەڕگاکانی دەوروبەری رووبارەکەدا دەلەوەڕێنن.

دوای ئەمە پارێزگاری شاری شەهری سیبزم سپارد بە شێخ عەلی و خۆشم پێشەنگی تیپێك لە سەربازە یەدەگییەکانم کرد و چووم بۆ یاریدەی جاکۆ کە لە دۆڵەکەدا بوو، ئەو ناوچەیەی دەپارست تاکو ئیلشی لە شاری هیرات دەگەڕێتەوە.

کاتێك گەیشتمە ناو لەوەڕگاکان، هیچ ماندووبوون و تەگەرەیەکم نەهاتە پێش بۆ دۆزینەوەو دواکەوتنی کاروانی دەستدرێژیکەرەکان. چونکە بینیمان لە ئاسماندا ئەو هەڵۆیانە دەسووڕانەوەدو هەڵمەتیان دەبردە سەر ئەو گورگانە و دەیانترساندن کە لە لاشەی ئەو ئاژەڵ و مەرە سەربڕاوانە ئاڵابوون، لەو جێگایەدا کە پیاوەکانی حاجی برلاس هەڵمەتیان تیادا بردبووە سەر و تاڵان و بڕۆیان تێدا کردبوو چییان توانیبوو هەڵیبگرن بردبوویان و گەڕابوونەوە بۆ بارەگای سەرۆکەکەیان. ئەو هەڵۆیانە بوونە رێنیشاندەرمان. ئەو شوێنەم بینی کە جاکۆ و موفا هەڵمەتیان تیادا بردبووە سەر دەستدرێژیکەران. چونکە لاشەی پیاوەکان لە نزیك ئاژەڵە تۆپیوەکانەوە کۆمەڵە ببوون. و داڵە کەرخۆرەش لە لاشەکانیان وروکابوون و لێکی هەڵدەوەشاندن.

یەکسەر دوای پیاوانی کاروانەکە نەکەوتین. بەڵکو بەرەو ئەو دەربەندە رێکەوتین کە دەستدرێژیکەرەکان پیادا رۆیشتبوون.

زۆر لەو دەربەندەوە ڕەت نەبووین، کتوپڕ گەیشتینە جاکۆ و نەیاندەتوانی بەرەو پێشەوە بڕۆن. چونکە تیرهاوێژ و تیروکەوانە درێژەکانیان، لەژێر سێبەری دەوەنەکانی ئەملاوئەولای دەربەندە تەسکەکەوە، لە کەمیندا بوون بۆیان، و قین و تووڕەیی خۆیان بەسەر جاکۆ و پیاوەکانیدا دەڕشت. لەبەرئەوە هێزەکەم کرد بە دوو بەشەوە.

خۆم پێشەنگی کۆمەڵێکیانم کرد و بەرەو لایەکی دەربەندە بەرزەکانم بردن. "موفا" شم لەگەڵ ئەوانی تردا بۆ لایەکەی تر نارد. بۆئەوەی گەمارۆی دواوەی تیرهاوێژەکان بدات کە لەناو دەوەنە بچووکەکاندا خۆیان حەشار دابوو.

هیچ نیو سەعات زیاتری نەخایاند، توانیمان، دەربەندە خوار و خێچ و تەسکەکان ببڕین و سەرنجی تیرهاوێژەکانمان بۆ لای خۆمان ڕاکێشا.

ئاوەها جاکۆ توانی بە هۆی ئەو یارمەتییەوە کە لە سەربازە یەدەکییەکانی فارسەکانەوە بۆی هات. هێرش بکاتە سەر پیاوەکانی حاجی برلاس و وایان لێبکات، لە بەرزاییەکاندا بۆ جێگایەکی تر بگەڕێن. هەر کە تیرهاوێژەکانی حاجی برلاس خۆیان دەرخست، و لەناو دەوەنەکاندا هەستان. ئیتر پیاوەکانی من و پیاوەکانی موفا پێکەوە ژمارەیەکی زۆر تیری ئاسایی و تیری گەورەیان بەسەردا باراندن. هیچ نیوەڕۆی نەخایاند توانیمان ناوچەکە لە تیرهاوێژی دوژمنەکان پاك بکەینەوە. بەڵام ئێمە نەمانتوانی، پاشماوەی دەستدرێژیکەران بگرین و ئەو کەلوپەلانەی پێیان بوو لێیان بسێنین و تاڵانیان بکەین. کاتێك جاکۆ هات و پەیوەندی پێوەکردم، بۆئەوەی ئاماری کوژراوانی دوژمنان بکەین. لێمپرسی وتم:

-جاکۆ.. ئا ئەوە یەکێکە لە پیاوەکانی تۆ.. وا نییە..؟

-بەڵێ گەورەم.. ئەمە تەنها کەسێك نییە، هەڵاتبێت و دابێتی بە پاڵ حاجی برلاس!!

-ئەوە چی دەڵێیت.. جاکۆ..؟!!

لە ڕاستیدا، هەر حەپەسام، چونکە من کاتێك ئەو هەڵمەتە سەرکەوتووەم لە بیابانەکەدا کردو تیایدا سەرکەوتم، من وامدەزانی پیاوەکانم باوەڕی تەواویان پێمە و بە چاکی و دڵسۆزییەوە پشتیان پێ بەستووم.

بەڵام جاکۆ بە شڵەژاوییەکەوە تەماشایکردم و لێی پرسیم:

-شازادە دەپرسیت بۆچی؟ پێویستە نە سەرت لە لات شاراوە نەبێت و ڕاستی ئەوەی "برلاس" بزانیت.. و تۆش یەکێکیت لە ئێمە.. حاجی برلاس پەیمانی زیاتر داوە بە سەربازەکانی، وەك لەوەی تۆ دەیاندەیتێ..!! و هەڵیشیان دەخەڵەتێنێت!!

-پەیمانیان دەداتێ و هەڵیاندەخەڵەتێنێت؟

باشە بە چی؟ بۆ من پاداشتم نەداونەتەوە و شتی بە نرخم نەداونەتێ..؟

-حاجی برلاس خۆی هەڵدەکێشێت.. و لافوگەزاف لێدەدات، کە لەم هەفتەیەدا شاری شەهری سیبز داگیردەکات و هەرچی سامان و دارایی و جیازییەکی شازادە شێرێزا و دەستوپێوەندەکانیشی هەیە، بەسەر ئەفسەر و سەربازەکانیدا دابەش دەکات.

-تێگەیشتم..!! زۆر چاکە، من ئامادەم ببینم و پێشوازییەکی گەرمی وای دەکەم لایەقی خۆی بێت!

-چاکۆ.. تۆ دەتوانیت لێرە بمێنیتەوە هەتا ئیلشی دێتەوە و تیپەکەی شێخ عەلی لەگەڵ خۆیدا دێنێتەوە.

-بەڵێ.. ئەوە دەتوانم.. چونکە حاجی برلاس هەر سەرباز کۆدەکاتەوە و زەخیرە و پێویستی ئامادە دەکات.. ئەو جارێ هەڵمەت ناهێنێت، تاکو ژمارەیەکی زۆر پیاو کۆنەکاتەوە.

بەڵام پێویستە ئەوەش بڵێم، تاکو ئێستا خواردن و زەخیرەیەکی ئێجگار زۆری جەنگی کۆکردۆتەوە.

-چاکۆ.. کار وا پێویست دەکات، فەرمان بدەیت بە شوانەکان ئاژەڵ و وڵاخەکان بەرنەوە ناو شاری شەهری سیبز هەروەها من خۆشم دەگەڕێمەوە بۆ شەهری سیبز تاکو خۆم ئامادەی گەمارۆکە بکەم. هەرکە شوانەکان نزیك شەهری سیبز بوونەوە، خۆشت پێویستە بگەڕێیتەوە بۆ دواوە و پاشەکشە بە سەربازەکانت بکە.

-باشە.. من دەمێنمەوە و توانای سەرپەرشتی و ڕاگرتنی سەربازەکانم هەیە و دەتوانم بەسەر ئەم کارەشدا زاڵ ببم.. بەڵام وەك بزانیت کەی ئیلشی دەگەڕێتەوە..؟

-من وای بۆ دەچم، لە ئان و ساتدایە، بگەڕێتەوە.

دوای ئەوە سواری ئەسپەکەم بووم و بە ڕێگای دۆڵەکەدا گەڕامەوە ئاوەها، لەبەر خۆئامادەکردنم بۆ بەرگریکردن لە شەهری سیبز وایلێکردم، زۆر گرنگی و گوێ نەدەمە جێبەجێکردنی داواکارییەکانی شازادە شێرێزا و ئەلجای و کەمتر گوێشم بە خۆیان دەدا. ئەلجای بەردەوام هاواری بێبەختی و چارەڕەشی خۆی دەکرد و بێزار و تووڕە بوو. بەڵام شێرێزا داواکارییەکانی خۆی وەستاند و داوای هیچی نەدەکرد.

وە ئەو کاتانەی دەچوومە لای شێرێزا و دەچوومە باوەشە گەرم و نەرمەکەیەوە. ئەو ئارەزووە زۆرەی کە هەمبوو بۆ وەدەستهێنانی کۆرپەلەیەك. هەموو هۆش و هەستێکی دادەپۆشی و

بە سەریدا زاڵ دەبوو. ئاوەها سەرم خستە ناو مەمکەکانی و هەموو هێز و توانایەکم بەکارهێنا و هەوڵمدا بۆئەوەی ئاواتەکەی بۆ وەدیبێنم.

ئینجا پاش ئەوە دەستمکرد بە پلان دانانی بەرگری و گفتوگۆکردن و تەگبیرکردن لەگەڵ شێخ عەلیدا و سوارەیەکی ترم نارد بۆ لای دەروازە ئاسنینەکەوە بۆئەوەی دەنگوباسی ئیلشیم پێرابگەیەنێت.

ناوبەناویش دەچووم بۆ لای ئەلجای تاکو کاتژمێرێك بە هێمنی لەگەڵیدا بەرمە سەر و ئەو بێتاقەتییەی کەم بکەمەوە ئەو کاتە ئیتر دەستەکانیم دەگرت و ئەو تۆپەڵە قژانەم لەسەر نێوچەوان و ڕوویدا لادەبرد و ترس و لەرز و خەم و خەفەتیم نەدەهێشت.

حاجی برلاس هێرشەکەی کردە سەر شەهری سیبز منیش فەرمانم بە کشانەوەی هێزەکەم دا، بۆ ناو ئەو شوورانەی بە دەوری قەڵاکەی کۆشکی سپیدا کرابوو. لە ڕووبارەکەشەوە ئاوم ڕاکێشا بۆ پڕکردنی ئەو خەندەقەی بە دەوری قەڵاکەدا کرابوو.

ماوەی هەفتەیەکی تەواو، شەو و ڕۆژ بەردەوام پیاوەکانی حاجی برلاس هێرشیان هێنا و تیرە ئاگراوییەکانیان بەسەر دیوارەکاندا دەهاویشت بۆ ناو شار و ئاگریان دەخستەوە و خەڵقیان دەتۆقاند و ترس و لەرزیان دەخستە دڵی دانیشتوانەوە.

لەبەرئەوەی پیاوەکانی من لە دوای سەنگەرەکانیانەوە بوون و شوێنەکانیشیان قایم بوون هیچ ترسیان نەبوو، بە دڵنیاییەوە وەڵامی تیرە ئاگراوییەکانیانم بە تیری ئاگراوی دەدایەوە. وە هەندێ جاریش ئەو تیرە ئاگراوییانەی کە دوژمنان بۆیان دەهاویشتین، سەربازەکانم هەڵیان دەگرتنەوە و بە گڕەکانیانەوە بۆ ناو ڕیزەکانی دوژمن دەیانهاویشتنەوە.

کاتێك، زەخیرەی جەنگیمان کەمبۆوە. ئیتر ئێمە زۆر بە وردی و هۆشیارییەوە تەنها شوێنە دەستنیشانکراوەکانمان تیرهاوێژ دەکرد کە مەبەستمان بوو.

ئا لەم کاتانەدا پیاوەکانی حاجی برلاس فرسەتیان دەستکەوت پردێکیان بەسەر خەندەقەکەدا دروستکرد پیایدا پەڕینەوە و دەستیانکرد بە دانان و بەرزکردنەوەی پەیژە بۆ سەر ئەو دیوارانەی بڵند نەبوون و بە باشی شووراyan بۆ نەکرابوو وەك دیوارەکانی شاری کارشی و سەمەرقەند شووراکانیان سەخت نەبوون.

ئێمەش ئیتر بە گورجی لەو کاتانەدا دەستمانکرد بە ڕژاندنی زەیت بەسەر هێرشبەران و بەسەر پەیژەکانیاندا و ئاگرمان تێبەردان. ئاوەها و لە ڕۆژی شەشەمی گەمارۆکەدا شاری شەهری سیبز لە هەموو لایەکییەوە بە ئاگر دەورە درابوو. و ئەو ئاگرە بچووکانەش کە بەملاو بەولایدا

بڵاوببوونەوە لەناو شارەکەدا دەسووتان. وە لەناو ئەو پیاوانەی حاجی برلاسدا کە توانیبوویان بەسەر دیوارەکاندا هەڵگەڕێن ژمارەیەك لە پیاوانی "جالیر"مان بینی. لەوەوە تێگەیشتین بایەزیدییش بە فریای حاجی برلاسەوە گەیشتووە و یاریدەی دەدات بۆئەوەی زەربەیەکی کوشندەمان لێبدەن.

شەڕ لە شەقامەکاندا دەستی پێکرد. بەڵام پیاوەکانی من کە لە باشترین و چاکترین کەسانی شیربەدەست و ڕم بە دەستی وڵاتی تەتەر بوون. لە شوێنەکانی خۆیاندا، خۆیان ڕاگرت و بەرگرییان کرد و نەجووڵان. و کەس لە هێرشبەران قوتار نەبوو، لەو تیر و تیرە درێژ و دوورهاوێژانەی پیاوەکانم، کە لەو شەوەدا لە کۆشکەکەوە بەسەریاندا دایاندەباراند، بەڵام کۆتایی خەریکە نزیك بێتەوە.

لەو کاتەدا دەنگوباسم پێگەیشت کە ئەلجای هێشتا کاتی منداڵبوونی نەهاتووە و ژان دەیگرێت و لە ترساندا خەریکە بتۆقێت و بەراویتە ببێت و منداڵەکەی لەبار بچێت.

سەرکردایەتیم دایە دەست شێخ عەلی و بە گورجی بەرەو ژووری نووستنەکەی ئەلجای بۆی دەرچووم. بینیم لەسەر چەرپا تەختەکەدا بە دەم نێش و ئازارەوە دەتلێتەوە و دەقیژێنێت پیرێژنە دایەنەکەش خەریکە هەندێ ناو لەسەر مەقەڵییە خەڵووزەکە، گەرم دەکات.

باوکم و زەینەدینیش، پەنایان هێنابوو، هاتبوونە ناو کۆشکەکەوە. ئەلجایان بە دەست گرتبوو. لەو کاتەدا بە شێوەیەکی ترسناك هاتبووەوە یەك و کرژ و تۆپەڵە ببوو. پاشان بەرەو جێگاکەی هەنگاوم ناو ویستم تۆزێك ترس و لەرزی بڕەوێنمەوە و دەست بە گیانیدا بهێنم. زریکەیەکی کرد لە ڕوومدا و بە هەردوو دەستی پاڵی پێوەنام و بە قین و تووڕەییەوە وتی:

-تەیموور برلاس.. ئەمە دواکاتمە، دەستم تێوە مەدە، وەحشی..!! چونکە تۆ ئەمەت بەسەرهێناوم و تووشت کردووم..!!

چاوەکانی زەق ببوونەوە و ئاگریان لێدەباری، قسەکانی زۆر ڕەق و ناخۆش بوون. منیش بە قین و تووڕەییەکی زۆرەوە پاشەوپاش کشامەوە. کە باوکم بینیمی هەستم بریندار بووە. لەسەرخۆ پێی وتم:

-ئەلجای بێهۆشە و ئاگای لە خۆی نییە، نازانێت چی دەڵێت بێگومان مەبەستیشی هیچ نییە..!!

هاتمەوە پێشێ و چوومەوە بە لایەوە و ویستم دەستی بگرم. بەڵام هەمدیسان زریکاندی و خۆی بۆ ئەودیوی جێگاکە وەرسووڕاند. تاکو لێم دوورکەوێتەوە. پاشان بە شێوە تۆقینێکی

کوشنده و ترسناکییەکی زۆرەوە چاوی تێبڕیم. خێرا زەینەدین ڕایکردە ئەو دیوی چەرپاکەوە، تاکو نەهێڵێت بکەوێتە سەر زەوییەکە. ئەوەندەی نەخایاند، بە شێتانەوە تەماشای ئەویشی کردو وتی:

-تۆش هیچ کات دەستم تێوە نەدەیت.

لەوکاتەدا موچڕکێکی ئازاراوی پێدا هات و دەستی بە تەپاو تل کردن کرد. ئەویش لەبەر ئێش و ئازاری ژانکردنەکەی بوو. ئیمام زەینەدین و باوکم شان و ئەژنۆیان گرت و بە هەوڵ و کۆششێکی زۆر پاڵیان خست. منیش بە ترس و لەرز و سەرگەردانییەوە ڕاوەستابووم و تەماشام دەکرد.

پاشان باوکم بە غەم و پەژارەیەکی زۆرەوە سەری ڕاوەشاند و وتی:

-تەیموور.. دایکیشت کە تۆی بوو، هەر هەمان ئێش و ئازار و ناخۆشی چەشت. لەم ئازارەی دەیبینی زیاتری چەشت. منیش ئەوەم بیرکەوتەوە کە دایکم منی بوو، بەسەر منداڵبوونەکەیەوە.. مرد..

بە ترس و لەرز و پەژارەوە، وەڵامی باوکمم دایەوە:

-"هەروەها هەر منیش بووم بە هۆی مردنی دایکم.."!!

باوکم لێوی خوارووی خۆی گەست و هیچی نەوت.

بە بێزاری و بێدەستەڵاتییەوە وتم:

-"ئەگەر ئەلجای بمرێت.. ئەمشەو منیش دەمرم".

بەڵام دایکی عەبدوڵڵا کە لەو کاتەدا لە ژووری چێشتخانەکە هاتە دەرێ و بە هێواشی وتی:

-ئەلجای سەروەرم نامرێت و تەندروستیشی چاك دەبێت. پێویستە ئەوەتان بیرنەچێت.. ئەلجای کچە و ئەمە یەکەم سکێتی و یەکەمجاری منداڵبوونییەتی. ج ژنێك هەیە ئێش و ئازاری نەبێت، کە یەکەمجار منداڵی دەبێت..

ئەلجای پاش ئەوەی ئەو ئازارەی پێشووی نەما، لەسەر قسەکانی پیرێژنەکە، بە هێواشی و لەسەرخۆیی و مەندییەکەوە وتی: "هەروەها ئەمە دواجاریشم دەبێت کە منداڵم ببێت تەیموور.. برۆ.. وا لە گەوهەری تاجەکەت خاتوو شێرێزا بکە، لەمەولا منداڵی ببێت و بۆتی بەرهەم بهێنێت. بەڵام من ئیتر لەمەودوا شتی وا ناکەم.

ئۆف.. ئۆف.. ئای.. ئای.. ئەی ئاوەها بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك ئێش و ئازاری هەبوو.. وە هەر دەیزریکاند و دەیقیژاند.

لەو کاتەشدا لە دەرەوە شەڕ و پێکدادان زۆر قورس و گەرم بوو. هەیوان و ژووری نووستنەکەی لە پەنجەرەکانەوە بەو تیشك و بڵێسە ئاگرانەی، لە دەرەوە دەسووتان، بە تەواوی ڕووناك ببوونەوە. منیش لە نزیك ئەلجایەوە دانیشتبووم و وازم لە دوژمنان هێنابوو. کە شوورا و قەڵاکەمیان وێران دەکرد.

ئەلجای هیچ ڕێگای پێنەدەدام و نەیدەهێشت بە هیچ جۆرێك دەستی تێوەبدەم.

کاتێك ئێش و ژانەکەی گەیشتە پلەی کۆتایی "قەمە"کەم دەرهێنا و لێم نزیك کردەوە بۆئەوەی بە دەست بیگرێت و توند بیگوشێت و منداڵەکەی منی ببێت و ژیانی پێببەخشێت. پاشان هاتەوە سەر خۆی و پشوویەکی پێدا هاتەوە و غیرەتی دایە بەر خۆی و تین و توانای پێدا هاتەوە.

پاشان زەردەخەنەیەکی بۆ کردم. و زەردەخەنەیەکی غەم و پەژاراوی و کەساسی لە ڕوومدا خوێندەوە.

ئیتر ئەو کاتە منیش هەستم کرد، ئەو خۆشەویستییە جوان و نەرم و نیانەی جارانی کە لە دڵیدا بەرامبەرم هەیبوو.. بۆ هەتاهەتایە لە دەستم چوو..

هەرکە ڕۆشنایی یەکەم کازیوەی بەیانی دەرکەوت و تیشکە زێڕینەکەی پەخش و بڵاوکردەوە. منالەکە لەدایك بوو.. دوای ئەوە ئەلجایش لەبەر ئێش و ئازار و هیلاکی خەوێکی خۆش و گرانی لێکەوت.

دایکی عەبدوڵڵا منالەکەی شۆرد و دایە دەست ئیمام زەینەدین بۆئەوەی بەرەکەتی خوا و دوعای خێری بەسەردا بخوێنێت.

کاتێك باوکم هەستا و بە سەیرێکەوە تەماشای منالە سوور و سپییەکەی کرد.. لێیپرسیم، وتی:

-تەیموور.. ئەم منداڵە ناودەنێیت چی..؟

بە ساردییەکەوە وەڵامم دایەوە:

-لە دواییدا من ناوی دەنێم.. جیهانگیر(٢)..

---

[٢] جیهانگیر لە ڕۆمانەکەدا نووسەر نووسیویەتی "جاهانجیر" بەڵام دیارە مانای ناوەکەی بە تەواوی نەزانیوە. لە بناغەدا دیارە ناوەکە جیهانگیرە واتە ئەو کەسەی کە جیهان دەگرێت. وە وشەکەش لە بناغەدا کوردییە لەبەرئەوە من بە جیهانگیرم نووسی. وەرگێڕ.

من وام دانەدەنا، ئەم منداڵە کارێك بکاتە سەر من و وام لێبکات لە ئەلجایم زیاتر خۆشبوێت و لام مەزنتر بێت. یان بکەوێتە بەر ـپڕی ئەو سۆز و خۆشەویستییەی ئەلجای کە لە دەستم چووە. باوکم بە شادی و ڕووخۆشییەکەوە ناوەکەی وتەوە.. جیهانگیر و وتی: واتە جیهان داگیرکەر.. بە ڕاستی ئەمە ناوێکی خۆش و مەزنە بۆ کەسێك کە لە کەروێشکێکی بچووك گەورەتر نییە. بەڵام پاشان پێبگات و وردە وردە گەورە ببێت، بەڵام تۆ لەو باوەڕەدایت، ئەم کوڕەت گەورە بێت و بتوانێت جیهان داگیربکات و جڵەوی جیهان بگرێتە دەست؟

ئەو قسانە هۆشی پیاهێنامەوە بۆ حاڵی حازری و بۆ جیهانی دەرەوە و بۆ ئەو پایتەختەم کە ئابلۆوقە دراوە و دەسووتێت و لە چواردەوریدا ئاگر و بڵێسە گەمارۆی داوە. ئەوەندەی نەخایاند، گوێم لە دەنگی چەند شەیپوورێکی سەیر بوو، بە توندی لە دۆڵەکەوە دەهات. ماوەیەکی تەواو ترس و لەرز دایگرتم.. چونکە من هیچ کات لەمەوپێش ئەو جۆرە مۆسیقایەم گوێ لێنەبووە. کتوپڕ و دوای ئەوە بۆم ڕوونبۆوە و تێگەیشتم، ئەمە هیچ نییە، لەوە زیاتر کە ئەمە دەنگی شەیپوورەکانی تیپەکەی شێخ عەلییە. چونکە ژمارەیەکی زۆر لە سەرباز و پیاوەکانی گەڕابوونەوە بەرەو شەهری سیبز بۆ پێشەوە دەکشان.

بە خێراییەکەوە گورج تەماشایەکی ئەلجایم کرد کە لەسەر جێگاکەی ڕاکشابوو "ڕەنگە مردبێتیش". لە ژوورەکە بە گورجی هاتمە دەرێ و ڕامکردە سەر شوێنێکی بەرزی دیوارەکە. و جەنگ و پێکدادان هەر لەناو شووراکاندا بەردەوام بوو. بەڵام بینیم، پیاوەکانم زۆر بە نەترس و ئازایەتییەکی بێوێنەوە خۆڕاگرن و دەجەنگن.

ڕاستە، شێخ عەلی وەك من بۆ پلاندانان بە توانا نەبوو. بەڵام بۆ کاروبار بەڕێوەبردنی شەڕ و کوشتار هیچی لە من کەمتر نەبوو. هەر ئەویش بوو، کاروباری بە جوانی و ڕێکوپێکییەوە هەڵدەسووڕاند و بەڕێوەی دەبرد. لە کاتێکدا، من کاروبار و پێویستییەکانی سەرشانی خۆم پشتگوێ خستبوو. وە لە تەنیشت ئەلجایەوە دانیشتبووم.

لەو دەشتەی کەوتبووە لای ڕووبارەکەوە، بە بەردەوامی هێزەکەی شێخ عەلی بۆ پێشەوە دەهات. ئەم هاتنە پێشەوەیان لە پشت شووراکانەوە هەموو شتێکی بە تەواوی گۆڕی.

تیپەکەی ئیلشی سەرەتا هەستا بە گەمارۆدانی شارەکە. سوارە و پیاوە ئازاکانی فارسیەکانیش هێرشیان کردە سەر هێزەکەی حاجی برلاس و بایەزید جالیر و دەستیان کرد بە کوشتنی ئەوانەی لەسەر پشتی ئەسپەکانیاندا دابەزیبوون و پیادە بوون. بەڵام ئەوانەشی کە بەسەر پشتی ئەسپەکانیانەوە بوون، هەر زوو ئەوانەش کەوتنە بەر شاڵاوی قەمە و شیر و

ڕمەکانی هێزەکەی شێخ عەلی و ئیلشی و ئەوانیش لەسەر پشتی ئەسپەکانیان خرانە خوارەوە و تێك و پێکیان دان و لەناویان بردن. پاش نیو سەعات ڕۆژهەڵاتن لە کاتێکدا، لەسەر قولەکانەوە ڕاوەستابووم و تەماشام دەکرد. بینیم دوژمنان لەناو و دەرەوەی شووراکانەوە، یان کوژرابوون یاخود هەوڵی ڕاکردنیان دەدا و خۆیان قووتار دەکرد و پەنایان بۆ گرد و شاخە دوورەکان دەبرد. ئیتر دوای ئەوە هەموو شتێك وەستا و کۆتایی پێهات و ئاگرەکان کوژێنرانەوە و سەربازە ماندوو بووەکان لە شەکەتیدا هەر لەو شوێنەی تێیدابوون و جەنگ و پێکدادانی تیا کۆتایی هات. خەو دایگرتن و خەویان لێکەوت.

ئیتر خەڵقانی دانیشتووی شار ترس و لەرزیان نەما و گەڕانەوە بۆ ماڵەکانی خۆیان. تاکو پشوو بدەن و ئەو ماندووبوونەیان دەرچێت کە تووشیان هاتبوو.

باوکم و ئیمام زەینەدینیش گەڕانەوە بۆ مزگەوت و پەرستگاکەی خۆیان. لە دواییدا بۆ ماوەی دە دەقیقە لەگەڵ ئەفسەرەکانمدا کۆبوومەوە. پاشان ئیزنم دان.

دوای ئەوە بینیم شارەکە بێدەنگی و هێمنی تەواو باڵی کێشابوو بەسەردا و هەروەها دەنگە دەنگ و هەراوهوریاش لە دەرەوەی شاریش کپ بوو، نەما.

هەستم کرد دڵ و دەروونم زیاتر دەهەژێت و لێدەدات وەك لەمەوپێشی. ئا ئەوەتانێ جەنگ و کوشتار کۆتایی هات و دەنگ و هەرای نەماوە. ئا ئەوەتانێ هەوڵ و کۆششی ئەلجایش کۆتایی هات و ئەو دنیایەش لەگەڵیدا بەش بەحاڵی من کە ئەو مەبەستی بوو وا کۆتایی هات. چووم بۆ ژوورەکەی ئەلجای بینیم هەر نووستووە و مناڵەکەشی لە تەنیشتیەوە ڕاکشابوو. دایکی عەبدوڵلا ئیشارەتی بۆ کردم و پێی وتم، هەموو شتێك چاك و لەسەرخۆیە..

بەڵێ هەموو شتێك باش و لەسەرخۆیە!! گەرچی لەگەڵ ئەوەشدا پایتەختەکەم بۆتە وێرانەو گیانم بە تەواوی تێکچووبوو، چونکە ماوەی حەوت ڕۆژی تەواو بوو تامی نووستن و حەسانەوەم نەکردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، مێشکم زۆر هیلاك بوو، بە جۆرێك نەمدەزانی چۆن پشوو بدەم یان چۆن بنووم و چی بکەم. لەگەڵ ئەوەی مێشکم شێوە بەنج بوونێك سڕبووبوو. مێشکم هەستی بە هیچ نەدەکرد و لەسەرخۆ نەمابوو. من ئەوکاتە تەنها بیرم لە شتێك دەکردەوە.. ئەویش ئەو بیرەی شازادە شێرێزا بوو کە مێشکمی تێکدابوو. خەو و خۆراکی لێ هەراسان کردبووم. ئەوەش ئەو کۆپەلەیە بوو کە شێرێزا بەردەوام بیری لێدەکردەوە و داوای لێدەکردم و دەیویست لە لەشیدا تۆوی بڕوێنم. کتوپڕ ئەو کاتە چووم بۆ لای ئەو جێگاو بەشەوە

کە شازادە شێرێزای لیٚ نیشتەنییە. شێرێزام بینی ساردو سڕ و بێدەنگە. زۆر بە سارد و سڕی و گویٚ بە هیچ پێدانێکەوە خۆی دا بە دەم ماچکردن و باوەش پیاکردنەکەمەوە.

گەرچی ئەم شازادەیە لەمەوپێش زۆر بە زەوق و خۆشییەوە، شادی و خۆشی دەخستە دەروونمەوە، وە زۆریش ڕازی بوو لێم، لەو شتەی بە تەواوی پێیم ڕازی دەکرد.

بەڵام وا ئێستا ئەو ئارەزووە ناگراوییە و برسێتییە زۆرەی دامرکابۆوە. هەندیٚ جار بە زۆر و هەندیٚ جار بە ئارەزوویەکی زۆرەوە، و هەندیٚ جار بە دەست پیاداهێنانی و ماچکردنی و هەندیٚ جاریش بە تووڕەییەوە دەمویست ئەو کەف و کوڵ و ئارەزووە شەهوانی وزە و قسە زۆرەی هەڵبسێنم کە لەمەوپێش هەیبوو. کەچی لەگەڵ ئەمانەشدا بە هیچ جۆرێك سەرکەوتوو نەبووم. وا بیٚ زەوق ببوو، هەر حەزی نەدەکرد دەستیشی تێوە بدەم.

کتوپڕ شازادەم بینی دەیەوێت قسەم بۆ کات لام سەیر نەبوو. بە هێواشی و بێدەنگ لە نزیکییەوە دانیشتم و بە خۆ نازینێك و گەورەیی و شانازییەکەوە وتی:

-تەیموور منیش کوڕێکم بۆت دەبێت.

-بەڵیٚ خۆشەویستەکەم تۆش ڕۆژێك لە ڕۆژان کوڕت دەبێت.

-نەخێر.. بەم زووانە دەمبێت و دووریش نییە، ئێستا وا بەڕێوەیە..!!

-گەورە و بەڕێزم شازادە چۆن ئەوە دەزانیت..؟

-دەپرسیت، ژن ئەوە چۆن دەزانیت؟ بە ڕاستی تۆ زۆر گێلی..!! لە کاتێکدا تۆ هەفتەی ڕابوردوو سەرقاڵی کاروباری شەڕەکەت بوویت. من ئەوکاتە زانیم و لێی دڵنیا بووم. من بە هەموو باوەڕێك و دڵنیاییەوە دەڵێم.. سکم پڕە..

-ئەمیرەکەم زۆر چاکە، بێگومان ژنان هەر زوو دەتوانن بەم کارانە بزانن.

منیش ئەو کارانەم وەك ئەو باش دەزانی.. و دەشمزانی لە داهاتوویەکی نزیکدا کوڕەکەم لەدایك دەبێت.

بەڵام لە قووڵایی دڵمەوە هەستم کرد، قینم لێیەتی و خۆشم ناوێت.

چونکە جێگای ئارامی و حەسانەوەمی لە لەشی کچی فاتمە واتە —خاتوو شێرێزادا لیٚ داگیر کردووم. وە خۆشەویستیمی لە دڵیدا دزیوە و نەمدەتوانی ئیتر ئەو تام و لەزەتەیان ئەو خۆشەویستییەی جارانم، تیایدا دەستکەوێت بۆ ئەتاهەتایی.

کەواتە ئایا من لەسەر حەق نەبووم کە قینم لە کوڕەکەم بێت؟

## لە دایکبوونی دووانە –جمکە

بەیانی ڕۆژی دوایی زوو لە خەو هەستام –گەرچی هێشتا تامی خەویشم نەکردبوو- زۆر بێتاقەت و خەمبار و هیوابڕاو بووم. گەرم و گوڕی جارانم نەمابوو، بەردەوام تێبکۆشم و خەبات بکەم دژی ئەو پیس و چەپەڵ و شەڕخوازانەی، جیهانیان پڕکردووە لە خراپە و خراپەکاری. سەرکەوتمە سەر سەربانی سەنگەرە بەرزەکان، بۆئەوەی چاوێك بگێڕم بەو وێرانکاریی و کاولبوونەی، بەسەر هەموو ئەو جێگا و شتانەدا هاتبوو، کە بە هێزی شیرەکەم پەیدام کردبوو. بەسەر شووراکاندا دەستم کرد بە گەڕان. کە تا ئەو کاتەش پڕ بوو لە لاشەی کوژراوان.

بۆنێکی ناخۆشیان لێدەهات. لاشەکانیان ئاوسابوون و تێکچووبوون.

ئەو سەربازانەشی کە مابوون، هیلاك و ماندوو، شەڕ برشتی لێ بڕیبوون. لە تەنیشت برادەرەکانیانەوە کە لە جەنگدا کوژرابوون، پاڵکەوتبوون و نووستبوون. ئەو لاشانەش شێوابوون و بۆگەنیان کردبوو.

هەر هەمان شێوەی خەمباری لەودیوی شووراکانیشەوە بەرەو چیاو گردەکان درێژ بوویووەوە.

گەلە گورگ لە لاشەی سەربازە کوژراوەکانم ئالابوون زۆر بە خێرایی لاشەکانیان لێك هەڵدەوەشاند و دەمیان تێژەندبوون تێریان لێدەخواردن و لەگەڵ خۆرهەڵاتندا بەرەو چیای بامیر بۆ ناو کونەکانیان دەگەڕانەوە. هەروەها پۆلە هەڵۆ و باڵندە گۆشتخۆرەکانیش بە ئاسمانەوە دەسووڕانەوە و لەپڕ هەڵمەتیان بۆ سەر ئەو لاشانە دەبرد، لێکیان هەڵدەوەشاند و تێروپڕیان لێدەخواردن و خۆیان لێ مڕ دەکرد.

سەرم لێشێوابوو نەمدەزانی چی بکەم..

باشە بۆچی دەبێت من لە خەباتدا بەردەوام بم؟ هیچ پیاوێك و هیچ ژنێك و هیچ کەسێکیش گرنگی بە بەردەوامبوون و خەباتم نەدەدا. هەتا ئەلجایش هیچ گوێی بە خەباتم نەدەدا، لاشی گرنگ نەبوو، چونکە وای لێهاتبوو، قینی لێم بێتەوە.

هەروەها شازادە شێرێزاش هیچ گوێی بە کاروبارم نەدەدا، چونکە ئەو کۆرپەلەیە کە لە سکیدا بوو هەموو هۆش و گۆشێکی لێسەندبوو.

سەربازەکانی تیپەکەی شێخ عەلی لە دەوروبەری ڕووبارەکەدا کاروباری سەربازی وەك نەریتێکی ئاسایی خۆیان جێبەجێ دەکرد. منیش هەستم بە خۆم کرد، پێویستە وەك

سەرکردەیەکی زانا و تێگەیشتوو هەڵسوکەوت و خەبات بکەم. لەبەرئەوە یەکسەر بۆ بارەگای کۆشکەکەم چووم. بیرم لەوە دەکردەوە، چۆن رێز و سەروەری بۆ میللەتەکەم پەیدا بکەمەوە.

لە بارەگاکەدا تا نیوەرۆ مامەوە، وەڵامی پرسیاری خەڵکیم دەدایەوە کاروباریانم جێبەجێ دەکرد، فەرمانم دەردەکرد و گوێم لە سکاڵای خەڵکی دەگرت و بیروڕام وەردەگرتن. پلانی کتوپڕو خێرایم دادەنا بۆ ئەوەی تۆزێك ئێش و ئازاری ئەو کارەساتانە و پاشماوە خراپەکانی قەلاچۆو بنبڕ بکەم. لەسەر ئەو زەرەر و زیانە زۆرەشدا، کە خۆم هەستم پێدەکرد. من هیچ کارێکی وام نەدەکرد زیاتر هەژاری و کەساسی و خەم و پەژارەی خەڵکی زیاد و گەورە بکەم. هەستم کرد سۆزێکی بەهێز پاڵم پێوە دەنێت، بۆ لای ئەلجای بڕۆم و چاوم پێی بکەوێت. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر دەترسام ببینم، زیاتر لەوەش دەترسام، دووبارە گوێم لێبێتەوە پێم بڵێتەوە: وەحشی دەستم لێمەدە!! چونکە تۆ ئەم هەموو ناخۆشی و کەساسییەت بەسەر مندا هێنا. هەستم نەدەکرد، کوڕە بچووکەکەم ئەو هەموو ئێش و ئازارە دەهێنێت کە بەسەر ئەلجای دایکیدا هێنابووی. هەرچۆنێك بێت هێز و غیرەتم بەرخۆمدا. دوای نیوەرۆ بارەگاکەم لە کۆشکەکەدا جێهێشت و بەرەو ژوورەکەی ئەلجای کەوتمە ڕێ و دڵیشم ترس و لەرز دایگرتبوو.

کاتێك، چوومە ژوورەکەیەوە بە ڕوویەکی خۆش و گەشاوەوە ڕووی تێکردم و پێی وتم:

-تەیمووری خۆشەویستم وەرە ئێرەوە، تەماشاکە بزانە چیم بۆ بەرهەم هێناویت؟

لێی نزیك کەوتمەوە و تۆزێکیش هەستم بە ترس دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا هەستم بە خۆشیو شادییەکیش دەکرد.

ئەلجای منداڵە بچووکەکەی لە بەتانییەکی سپییەوە پێچابوو، بەسەر دەستییەوە گرتبووی. پاشان بە هێواشی ڕووپۆشەکەی لە دەموچاو و دەستی منداڵەکە لابرد و بە ڕوویەکی خۆشی و شادییەوە لێی پرسیم:

-تەیموور جوان نییە؟!

بێ ئەوەی هیچ گوێی پێبدەم تەماشای منداڵە سوور و سپییەکەم کرد و وەڵامم دایەوە:

-بەڵێ ئەلجای زۆر جوانە.

بە ڕوویەکی گەش و خۆشییەوە پێی وتم:

-تەیموور، من وابزانم ئەم منداڵە جوانترین منداڵێکە لەم جیهانەدا، وە هیچ شتێکیش لەم جیهانەدا لەم جوانتر نییە، بێجگە لە تۆ.

دووباره بە دڵێکی زۆر خۆشی و شادییەوە تەماشای جیهانگیری بچووکی کردەوە، بە جۆرێک بوو، وێنەی نەبوو. ئا لەم کاتەدا هەستم بە خۆشی و شادومانییەکی بێ وێنە کرد، باڵی بەسەر هەست و دڵمدا کێشا.

چونکە ئەلجای بەرامبەرم وەك جاری جارانی لێهاتەوە زۆر بە دڵخۆشی و گەشاوەییەوە، لە رووبدا پێکەنیم. پێم وت:

-ئەلجای، جیهانگیر جوانە بەڵام کاتێك لەدایك بوو..

-هەستم بە ئێشوئازارێکی زۆر دەکرد.. بەڵام تەیموور کەی نووستیت؟ ئیسراحەتت کرد؟

-نازانم..

-تەیموور.. جلەکانت پیسە و هیلاك و ماندوو و بێتاقەت دیاریت.. لەوە دەچێت نەخۆش بیت. دە وەرە لامەوە ڕاکشێ و تۆزێك بنوو، با تۆزێك ماندوویەتیت دەرچێت و بحەسێیتەوە.

وەرە تەنیشتمەوە جێگات دەبێتەوە. پاشان تۆزێك خۆی جووڵاند، بۆ ئەولای جێگاکەوە و منداڵەکەی بە دەستەوە گرت.. منیش لە تەنیشتییەوە ڕاکشام..

ئەلجای نێوچەوانمی بە لایەکی بەتانییەکەی منداڵەکە سڕی. کاتێك خەبەرم بۆوە، دایکی عەبدوڵڵا خۆی بەسەرمدا چەماندبۆوە و شانی ڕادەوەشاندم و بە ڕوویەی خۆش و پێکەنینەوە دەیوت:

-تەیموور.. هەستە، بۆ پیرێژنێکی وەکو من گرانە بتوانێت خزمەت و چاودێری سێ کەس بکات. کە لە یەك جێگادا نووستبن..!!

چاوم هەڵگلۆفت و ڕاستبوومەوە. پاشان ئەم پیرێژنە کارەکەرە سینییەکی خستە ناو باوەشمەوە کە لەناو ئەو سینییەدا قاپێکی پڕ لە تشریبی گۆشتی گەرمی لەسەر بوو. پەرداخێکی پڕ لە چای رەشی کوڵاویشی لەسەر بوو.

ئەلجای سینییەکەی خۆی بە دەستەوە بوو. لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو. بە ڕوویەکی خۆشەوە سڵاوی لێکردم و وتی:

-خۆشەویستەکەم بەیانیت باش. ئایا چاك نووستی؟ بە تەواوی حەسایتەوە؟

-ئەلجای خۆشەویستم وەك منداڵێك خەوم لێکەوت، بە تەواوی هەستم بە حەسانەوە کرد.

-بێگومان تۆ وەك جیهانگیر نەنووستیت. جیهانگیر بەردەوام سەری دەجووڵاند و دەیقیژاند. بەڵام تۆ هەر سەریشت نەجووڵاند..

پاشان تەماشایەکی جێگاکەی جیهانگیری کرد، زۆر بە گەرم و شادی و ڕووخۆشییەوە دەستی کرد بە پێکەنینێك، لەمەوپێش ئەو خەندە و پێکەنینەم هەرگیز لە ڕوویدا نەدیبوو. پاش ئەوەی قاپە تشریبەکەم خوارد. بینیم ئەلجای ڕووە خۆشەکەی جارانی لە ناستمدا گەشاوەتەوە و ڕووخۆشە. هەر ئەوکاتە بە دڵ ئارەزووی خۆشتنم کرد. ماوەی دوو سەعاتم لەو هەڵم و هاڵاوی ئاوە گەرمەدا بەسەر برد و بە تەواوی حەسامەوە، خۆم شوشت و ماسوولکەکانی لەشم شێلاو لە دواییدا بۆ سەرکار و فرمانەکانم چوومەوە. دەستم کرد بە گەڕان بەناو هۆڵ و ژوورەکانی کۆشەکەدا و تەماشای ئەو شتانەم کرد کە تێیدا بوو. لە حاڵ و ئەحواڵی خەڵکانی ناو کۆشکەکەم پرسی. بۆم دەرکەوت و تێگەیشتم گشت ئەو شتانەی، لەناو ژوورەکاندایە و ئەو ڕاخەر و پێویستیانە هەموویان ساغ و سەلامەتن، هیچ زیانێکیان پێنەگەیشتووە. هەروەها گشت دار و دیوارەکانیش هیچ زیانیان پێنەگەیشتبوو، هیچیشیان نەڕووخابوون و درزیشیان تێنەببوو.

پاش ئەوەی تێگەیشتم، دڵی خاتوو ئەلجای بەرامبەرم چاك بۆتەوە و لەگەڵمدا ئاشتبۆتەوە. هەستم بە هێز و توانایەکی زیاد کرد، دوای ئەو نووستن و حەسانەوە و خۆشتن و شێلانەم. ئیتر بە بڕوای تەواوەوە بڕیارم دا، هەمدیسان شەهری سیبز چاك بکەمەوە و دووبارە سازی بکەمەوەو پارێزگاری لێ بکەم، هەرچی کار و فرمان و هەوڵدان و پارە و تێچوونێکی بوێت لە پێناویدا بیکەم.

پاش ئەوەی بایەزید جالیر و حاجی برلاس لە هێرشەکەیاندا بۆ گرتنی شارەکەم تووشی ئەو تێکشکاندنە گەورەیە بوون. دەستیان کرد بە هێزکۆکردنەوە و لەشکرکێشی بۆ دەوروبەری شاری سەمەرقەند.

لەم لەشکرکێشییەدا، زۆر لە سەرکردە و سەرۆك تیرە و هۆزەکان دایانە پاڵیان. هەروەها زیاد لە نیوەی پیاوەکانی منیش هەڵاتن و چوونە پاڵ هێزەکانیانەوە. هێزەکەی شێخ عەلی لە پارێزگاری و پاراستنمدا منی دڵنیا کردبوو. منیش زۆر بە هێواشی و لەسەرخۆ و دڵنیایی و باوەڕی تەواوەوە دەستم بە چاککردنەوەی شارەکە کرد.

لە کۆتایی مانگی -ژیل حەجەدا- شاری سەمەرقەند کەوتە ژێر دەستی هێزەکانی بایەزید و حاجی برلاسەوە و بە تەواوی داگیریان کرد.

دەستیار کرد بە تالان و برۆ و ئەتککردنی ژنانی ناو شارەکە، ئیتر بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك ئاوارەکان و هەڵاتووەکان پەیتاپەیتا لە ڕێگای سەمەرقەندەوە بۆ شاری شەهری سیبز دەهاتن.

ڕۆژێك لە ڕۆژان نوێنەرێك هاتە ژوورەکەمەوە، پاش ئەوەی زۆر بەڕێز و گەورەییەوە سڵاوی لێکردم، ڕووی تێکردم، وتی:

-سەرداری گەورەم، ژنێك دەیەوێت چاوی پێت بکەوێت و قسەت لەگەڵدا بکات. ئەو ژنە دەڵێت من دۆستێکی دێرینی ئەوم.

لە مێشکی خۆمدا بیرم دەکردەوە، هۆی چی بێت ئەو خانمە هاتبێت؟

پاشان خۆم گۆڕی و جلم لەبەرکرد و بۆ بارەگای ڕەسمی کۆشکەکە چووم. لەوێ ژنێکی زۆر جوانم بینی، جلی زۆر گرانبەهای لەبەردا بوو. چاوەڕوانی هاتنی منی دەکرد. ئەو ژنە هەرکە منی دی، بەرەو ڕووم هات و پەلاماری دەستی دام و ویستی ماچی بکات و ڕووی تێکردم، وتی:

-گەورەم شازادە تەیموور، ئەی پارێزەری شەهری سیبز.

-خانمەکەم چیت دەوێت؟

-بەڕێز شازادە! نامناسیت؟

-بە داخەوە خانمە بەڕێزەکەم من ناتناسم.

-من کارین ڕەشیدم تۆ لە پێناوی مندا دەستی پیاوێکت پەڕاند!! ئەوەت بیرنایەت؟

بیری نیهمۆ و کەنیزەکە فارسییە بچووکەکەم کەوتەوە.. پاشان زۆر بە سەرسامی و سەیرەوە لێم پرسی:

-ئەمە تۆی!!؟

چی تۆی گەیاندە ئێرە؟! بە ڕاستی ئەوە تۆی؟!

-بەڵێ.. گەورەم.. خەڵکی وا ڕاهاتوون بە "کارین"ی نەفرەت لێکراو بانگم دەکەن!! بەڵام من بە خۆم دەڵێم کارین ڕەشیدی پیرۆز.

-بۆچی خەڵکی پێت دەڵێن کارینی نەفرەت لێکراو؟

-چاکە.. هۆی ئەوەت بۆ باس دەکەم. لە کاتێکدا کابرای کۆیلەفرۆش منی بۆ سەمەرقەند برد. دەنگوباسێکی سەیر لەناو خەڵکدا بڵاوببۆوە. ئەو دەنگوباسە بەو شێوەیە بڵاوببۆوە، کە هەر کەسێك دەستم بۆ ببات دەستەکانی دەپەڕێت.

ئا ئەمە بوو نەفرەت لێکردنەکەم. کابرای کەنیزەك فرۆش بە هیچ جۆرێك نەیدەتوانی من بفرۆشێت، هیچ پیاوێکیش نەیدەویست کەنیزەکێك بکڕێت کە خودا نەفرەتی لێگرتبێت.

-ئاوەها کابرا..

-ئاوەها کابرای کۆیلەفرۆش هیچ شانسێك و قازانجێکی لە من نەدی. نەشیدەتوانی وازم لێبێنێت و ئازادم بکات. هیچ پیاوێکیش مارەی نەدەکردم، تاکو هەندێ پارەی دەستبکەوێت. لە کۆتاییدا هەمدیسان بۆ بازاڕی بردمەوە..

تەماشای پاڵتۆگران بەهاکەی و ئەو خشڵانەیم کرد کە پیایدا هاتبوونە خوارێ و لەسەرخۆ وەڵامم دایەوە.

-دیارە تۆ پارەیەکی زۆر زۆرت پەیدا کردووە؟

-بەڵێ من کچێکی منداڵ بووم، سەرنجی خەڵکانێکی زۆرم بۆ لای خۆم ڕاکێشا، وا خۆم پیشان دەدا، من کچێکی هەژار و بێدەستەڵاتم. وردە وردە خۆمم پیشاندەدان و داوای پارەی زیاترم لێدەکردن. تاکو ئەو نەفرەتیەم لەبەرچاویاندا نەمێنێت. پاش چەند وەختێك خۆمم بینی سەروەت و سامانێکی زۆر و شادی و خۆشییەکی زۆرم بەسەردا باری.

پیاوە ئازا و نەترسەکانیش ناوبانگی منیان بیست، دەهاتن بۆ لام و ئارەزوو و خۆشیان لە گیانم دەبینی و ماوەیەك لەگەڵمدا ڕایاندەبوارد و ململانێی ئەو نەفرەت لێکردنەیان دەکرد. منیش وا خۆم پیشان دەدا هەرکەسێك نزیکم بکەوێتەوە و دەستم بۆ ببات تووشی ئەویش دەبێت.

-تێگەیشتم.. لە دواییدا شەیدایەکی دەوڵەمەندت دەستکەوت.

-سەردار و گەورەم تەیموور!! ڕێگا زۆرە بۆئەوەی ئینسان شەیدایەك پەیدا بکات. کە دە هەزار دیناری هەبێت. یان دە، شەیدا پەیدا بکات کە هەر یەکەیان هەزار دیناری هەبێت. یان هەزار شەیدا پەیدا بکات کە هەریەکەیان دە دیناری هەبێت.

-باشە ئێستا تۆ چیت لە من دەوێت؟

-پاراستن.. بەڵام بۆچی داوام لێناکەیت لەشولاری خۆمت پیشان بدەم؟!!

-زۆرباشە.. ئێستا لەشولاری خۆتم پیشان بدە.!! هەستایە سەرپێ و پاڵتۆکەی داکەند و، پاشان وردە وردە بە هێواشی، هەموو جلەکانی داکەند!! خۆی وەرگێڕا تاکو هەموو ئەندامی لەشی ببینم. بە ڕاستی لەشولارێکی جوان و ڕێکوپێکی هەبوو. ببوو بە ژنێکی شۆخ و شەنگ، لاوازییەکەی جارانی نەمابوو، لەشێکی خڕوخەپان و پڕ و نەرم و نۆڵی هەبوو. هەر لەو کاتەدا پێم وت:

-دەبینم تۆ ئێستا وەك جاران نەماویت، زۆر گۆڕاویت.

-گەورەم تەیموور، من هەرگیز سەما فێر نەبووم، فێریش نابم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو کەسەی لەناو جێگادا لەگەڵمدا پاڵبکەوێت خۆشی و ئارەزووی تەواوی پێدەگەیەنم.

-کارین حەزدەکەیت، لەگەڵ منیشدا بێیتە ناو جێگاوە پێکەوە رابوێرین؟

-بەڵێ شازادەی گەورەم، منیش زۆر حەز بەو ئارەزووە دەکەم. چونکە تۆ یەکەم کەس بوویت لە ژیانمدا، منت پاراستووە و پارێزگاریت لێکردووم. ئێستاش داواکارم وەك جاران بمپارێزیت.

-چۆن؟ بۆچی؟

-من ئێستا بیست کچم لەگەڵدایە، ئەو کچانە ئێستا وان لە نزیك پردەکەوە دامناون. گەورەم دەزانیت کام پردە دەڵێم؟

بە تەواوی پردەکەم بیرکەوتەوە.

پاشان کارین هەناسەیەکی هەڵکێشا و تەماشایکردم و دەستی کردەوە بە قسە و وتی:

-من بەرتیلم بە یەکێك لە ئەفسەرەکان دا. بۆئەوەی لە سەمەرقەند فووتارمان بکات. داگیرکەرە نوێیەکان، کە هێرشیان بۆ سەمەرقەند کرد، دەیانویست هەموومان بۆ سەمەرقەند بگەڕێننەوە منیش لەوە زیاتر نەمدەویست بە کەنیزەکی بمێنمەوە. ئێستا دەمەوێت لێرە خانوویەك بە کرێ بگرم و بێمە ژێر سایەی بەزەیی تۆوە. تۆش لە من چیت دەوێت، دەتوانیت لێم داوا بکەیت. تۆش جارێك لە جاران دۆست و هاوڕێی من بوویت. منیش ئێستا لێت دەپاڕێمەوە، دووبارە ببینەوە بە دۆست و هاوڕێکەی جارانم.

-باشە کچەکانت جوانن؟

-شازادەی گەورەم، کچەکان جوانترین و شۆخترین کچانی سەمەرقەندن لە خۆشی و شادی زیاتر هیچی کە لە ئێمەدا نابینیت.

-زۆر چاکە کارین کۆشکێکی زستانەم هەیە، لەمەوپێش دەوڵەمەندێکی فارسی تێدا نیشتەجێ بوو. لە کاتی گەمارۆدانی شارەکەدا کوژرا. من ئەو کۆشکەت دەدەمێ بۆ خۆتان تێیدا بژین.

پاشان ناردم بە دوای عەبدوڵڵای نۆکەرمدا.

لە کاتێکدا کارین جلەکانی لەبەر دەکردەوە، هەستم بە خۆشی و دڵنیایی کرد. چونکە شەهری سەبز وای لێهات کە ژمارەیەك سۆزانی و کەنیزەکی شۆخ و شەنگ بگرێتە خۆی. ئەو کاتانەم بیردەکەوتەوە کە لە حوجرەی مزگەوتدا دەمخوێند. بیری ئەو کیژە خەمبار و هەژارانەم دەکەوتەوە کە لەمەوپێش وا ڕاهاتبوون لەو شوێنە پیس و چەپەڵانەدا لە نزیك بازاڕەکانەوە ژیانیان بەسەر دەبرد.

ئێستاش زۆر زۆرم پێویست بەو کیژانەی کارین هەیە. چونکە دەمویست ئەو شوێنانە چاك بکەمەوە کە هێرشە دوژمنکارییەکان وێرانیان کردبوو. سەربازەکانی شێخ عەلیش ماوەی ئەوەیان نەبوو، ژنی تازەیان دەستکەوێت و کات و کاری خۆیانی لەگەڵدا بەرنە سەر. لەبەرئەوە تێگەیشتم و لام ڕوون بوو، ئەو کیژانەی لەژێر دەستی کاریندان خۆشی و شادی دەبەخشن بەو سەربازانەی پارێزگاری لە میرنشینەکەم دەکەن. ئەگەرچی ئەو کیژانەش تەنها نیوەی کارینیش جوانبن.

کاتێك عەبدوڵڵای نۆکەرم هات، کلیلی کۆشکی پیاوە کوژراوەکەم دایە، و داوام لێکرد یارمەتی کارین بدات و لەگەڵیدا بچێت و بیگەیەنێتە کۆشکەکە.

کارین هەروەك من خانی گەورە بم بۆم چەمایەوە و زۆر بەڕێز و سوپاسەوە دەستی ماچ کردم. لەگەڵ عەبدوڵڵادا چوونە دەرەوە. عەبدوڵڵا کە لەگەڵ کاریندا چووە دەرەوە، دوای هەفتەیەکی تەواو ئینجا عەبدوڵڵام بینییەوە..!!

وردە وردە ڕێگای سەمەرقەند لە ناوزە و هەڵاتووەکان هێمن و ئارام بۆوە، و وەك جاری جارانی لێهاتەوە و بێدەنگ بوو. کاروباری وڵات باش بەرێوە دەچوو. ڕێز و حورمەتی تایبەتی خۆی هەبوو. بایەزید و حاجی برلاس سەرقاڵی دامرکاندنەوەی ئاژاوە و سەرکوتکردنی لێهەڵگەڕاوەکان و ئاژاوەچییەکان بوون. هەروەها بەرامبەر ئەو شەڕ و شۆڕ و ناکۆکیانە ڕاوەستابوونەوە کە لە ناوچە جۆربەجۆرەکانی تری وڵاتدا ڕووی دەدا. ئەمەش هۆیەك بوو کە نەیاندەپەرژایە سەر ئەوە جارێکی تر هێرش بکەنەوە سەر میرنشینیەکەی من. وە کاتێ: سەری ساڵی نوێ هاتەوە، گەرچی من خۆم بۆ هاوبەشیکردنی ئەو ئاهەنگە نەچووم. بەڵام باج و خەراجی خۆمم بۆ سەمەرقەند نارد. وە وام دادەنا ئەم باج و خەراجە نرخێکی ڕەوای ئەو ژیانەیە کە من لە شەهری سیبزدا بەسەری دەبەم. ئەو کاتانە ژیانم زۆر شاد و بەختیار و ئارام بوو.

ئەلجایش وەکو جاری جارانی لێهاتبۆوە و لەگەڵمدا تەبا بوو. گەرچی هەندێ جار کە لەگەڵیدا .. م دەکرد تۆزێك بێزاری و تووڕەیی دەردەبڕی و قینی لێم دەبۆوە.

ئەلجای زۆر زۆر هۆگری جیهانگیر ببوو.؟ هۆگرییەکەی بێوێنە بوو.

با ئەوەش بڵێم ئەلجای بەردەوام دەترسا، ترسەکەشی زیاتر لەوە بوو، جارێکی تر تووشی ئێش و ئازارێ منداڵبوونێکی تر ببێتەوە. ئەم ترس و لەرزەی کاتێك دەردەکەوت کە پێکەوە جووت دەبووین و دەمانویست بە تەواوی بە لەش و ڕۆح لە یەکتر تێربببین و حەز و ئارەزووی

تەواومان لەیەکتر بشکێت. گەرچی ئەلجای ئەو ئارەزووە زۆرە بەردەوامەی جارانمی لە کیس دابوو. بەڵام من بەردەوام دەمویست ئەو خۆشی و ئارەزووەم کە هەمبوو، هەر بە کاری بهێنم.

جا لەبەرئەوە بەردەوام زیبا بێدڵی نەدەکردم و هەموو کاتێك بە دەور و خولدا دەهات. زیبا ئەو خۆشی و شادی و بەختیارییەی لە کۆشکەکەدا دەستی کەوتبوو، مەستی کردبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کەفوکوڵی دانەمرکاندبۆوە.

لەیلاش کە خەم و خەفەتم نەدەما و بیر و هۆشم ئارام دەبوو، خۆشی و لەزەتی تەواوی پێدەبەخشیم، ئەو خۆشی و لەزەتە کەمتر نەبوو، لەو دەست لەملکردن و سەرخستنە ناو مەمکە جوانەکانی شازادە ئەلجایەوە.

شازادە شێرێزا گەرچی زۆر جوان و سەرنج ڕاکێش بوو. هیچ کات داوای جووتبوونی لێنەدەکردم، تەنها بەو دەست لەملان و دەستبازی و ماچکردنە کەمە قایل بوو. چونکە سکی پڕ بوو، چاوەڕوانی منداڵبوونی دەکرد. بۆئەوەی شێرێزا تووشی ئەو ناخۆشی و ئێش و ئازارە نەبێت کە ئەلجای تووشی هات. ناردم بە شوێن سەرۆکی پزیشکانی شاری سەمەرقەندا بۆ ئەوەی لە شازادە شێرێزا بڕوانێت. پزیشکەکە دوای تێڕوانین وتی:

-"شێرێزا" لە کاتی منداڵبوونەکەیدا هیچ ئازارێکی زۆری تووش نایەت.

وە زۆر زۆریش دڵخۆش و شادومان بووم کە لە ئەلجای ڕوانی و وتی:

-شازادە ئەلجای ئیتر منداڵی نابێت.

هەرکە بیری سك پڕبوون و ترس و لەرزی منداڵبوون لە مێشکی ئەلجایدا نەما. ئەو شەوە من و ئەلجای پێکەوە بە جۆرێك ڕامانبوارد. خۆشی و تام و لەزەتی هیچ لە شەوی یەکەمی بووك و زاوایەتیمان کەمتر نەبوو، کە لە کۆشکی "ساڵی"دا بە یەکەوە بەسەرمان برد!!

ئەلجای جوانییەکەی وەك هەرەتی گەنجێتی لێهاتبۆوە ئەوەندە جوان بوو وەك مانگ دەدرەوشایەوە.

ئەلجای وەك خوشکێك دەیڕوانییە شێرێزا هەموو کات بە ناوی خاتوونە خۆشەویستەکەمەوە بانگی دەکرد. بەهەرحاڵ و کار هەرچۆنێك بێت، قسەکانی ئەلجای دەربارەی شێرێزا بێ ڤین نەبوو کاتێك ژان دەیگرت و خەریکبوو منداڵی ببێت.

ئاشان ئەلجای بە خۆشی و ئارەزووەوە پێی وتم:

-حەزدەکەم شێرێزا ببینم، و بزانم چۆن منداڵی دەبێت. زۆریش حەزدەکەم هەڵسوکەوتی شێرێزا ببینم لە کاتێکدا ژانی منداڵبوونی بەسەردا دێت. لەبەرئەوە خێرا پێکەوە بەرەو بەشی

خۆرئاوای کۆشکەکە چووین. لە کاتێکدا لە دەرگای ژوورەکەی خاتوو شێرێزامان دەدا. ئەلجای بە گوێمدا چرپاندی و وتی:

-تەیموور، ئاواتم ئەوەیە لە کاتی منداڵبووندا شێرێزا ببینم زۆر بە ئێش و ژانەوە بێت.

هەر پاش ماوەیەکی کەم پەشیمان بووەوە و وتییەوە:

-بەڵام هیوا و ئاواتم ئەوە نییە و حەزیش ناکەم شێرێزا ببینم زۆر بە دەم ئێش و ئازارەوە بێت. بەڵکو تەنها تۆزێك و هیچی تر. هەرکە ئێمە نزیك جێگاکەی شێرێزا بووینەوە پزیشکەکە منداڵێکی بە دەستەوە گرتبوو. بە دەنگێکی گڕ دەگریا. زۆر سەریشمان سوورما کاتێك پزیشکەکە وەرگەڕایەوە بەلای شێرێزادا و پێی وت:

-شازادەی گەورەم تکایە تۆزێك یارمەتیم بدە، چونکە ئەمە منداڵی یەکەمە و هێشتا منداڵێکی ترت ماوە بتبێت.. ئەو کاتەی ئیمام زەینەدین و باوکم گەیشتنە ناو کۆشکەکە دوو شازادەی بچووك لەناو ئاوەکەدا دەشۆران و بە قوماشێکی سپی خاوێن قومات دەکران.

لە کاتێکدا هەموو چاوەکان تەماشای ئەو دوو منداڵانەیان دەکرد. ئەلجای ڕوویکرد بە لامەوە و بە گوێیدا چرپاندم وتی:

-کاتێك پزیشکەکە منداڵی دووەمی داینەوە دەست زۆر بە شادیو خۆشییەوە پێدەکەنی.. تەیموور، بە ڕاست ئەو دوو منداڵە زۆر گەورەن، هەریەکەشیان لە ڕۆژی یەکەمی لەدایکبوونی جیهانگیر زۆر گەورەترن.

لە ڕاستیدا شێرێزا تەنها بۆ یەك منداڵیان پێدەکەنی بە ڕەحم و دڵ دەیزانی، کامیان ئەو منداڵەیە کە یەکەمجار بوویەتی. شێرێزا لە ژیانیدا هەموو پێکەنینێکی تەنها بۆ ئەو منداڵە زیاتر نەبوو. هیچ کات کەسی بە گەرم و گوڕ و پەرۆشەوە لە باوەش نەگرتووە، جگە لەو منداڵەی یەکەمجاری نەبێت. کە ناومان نا میران شاه، بەڵام منداڵی دووەمی ناومان نا شێخ عومەر.

شێخ عومەر کاتێك گەورە بوو، سەروسیمای دەرکەوت بە ڕاستی کتومت لە خاڵە قارەمانەکەی شێخ عەلی دەچوو کتومت دەتوت هەر ئەویشە.

من شێخ عومەرم خۆشدەویست و شێرێزاش میران شای خۆشدەویست.

من میران شام زۆر خۆشنەدەویست. چونکە ئەو منداڵی یەکەمی خاتوو شێرێزا بوو. کە بوو بە هۆی پچڕان و تێرنەبوونم، لەو برسێتی و ئارەزووە زۆرەم کە بەرامبەر شێرێزا هەمبوو.

شەهری سیبز لەوکاتەدا وەك مێرگێکی هێمن و ئارام وابوو، لە نێوان بیابانێکی پڕ لە گەردەلوول و ڕەشەبادا. کاتێك ئەو تیرە و هۆزانەی دەوروبەری ئێمە تێکوپێك دەدران و تووشی وێرانکاری دەهاتن. میللەتەکەی من بە خۆشی و بەختیاری دەژیان. جووتیار و وەرزێرەکان لە وڵاتەکەی مندا، دەوڵەمەند و پارەدار دەبوون. چونکە کێڵگەکانیان لەژێر سایەی پیاوەکانی من و تیپەکەی شێخ عەلیدا بوون و بە چاکی دەیانپاراستن زۆربەی زۆری کاروانەکان لە نزیك ڕووبارەکەوە هەڵیاندابوو. زۆر بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی کۆژاندنەوە و نەمانی ئەو شەڕ و ئاژاوانەیان دەکرد، کە لە گشت لاو دەوروبەری ناوچە هێمنەکەی منەوە ڕووی دەدا. بازرگانەکانیش بەردەوام کاڵایان دەفرۆشت و پارەیەکی زۆریان دەستدەکەوت. کە لەمەوپێش ئەو پارەیەیان زۆر بە گران و چەندساڵێك ئینجا دەستدەکەوت.

ئیمام زەینەدین زۆر قەڵەو ببوو، وە زۆریش لە خۆی ڕازی بوو. چونکە مزگەوتەکەی دەوڵەمەند ببوو. سندووقەکانی لە سامان و پارە پڕببوو.

منداڵەکانیشم وردە وردە گەورە بوون و پێگەیشتن. بەڵام هێشتا وەرزی زستان نەهاتبوو. بەفر و باران نەباریبوو، باوکم لە مزگەوتەکەدا نەخۆشکەوت. منیش زۆربەی کاتی خۆمم بە لایەوە بەسەر دەبرد. و زۆربەی کاتەکانیش خۆمان بە یاریی دامەوە سەرقاڵ دەکرد. باوکیشم بەو نەخۆشییەوە ڕێنمایی ڕێگای ڕاستی ژیانی دەکردم و زۆر ئامۆژگاریی بە سوودی کردم. ڕۆژێکیان باوکم ڕووی تێکردم، وتی:

-من بۆ ئەوە ژیاوم کە تۆ ببینم لە کاتی لاوێتیدا بە خۆشی و ئارامی بژی. منیش پیاوێکی پیر بووم و نەمدەزانی تۆ هیوا و ئاواتت چییە و چیت دەوێت؟

-باوکی بەڕێزم، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ڕەزامەندی تۆ و ئامۆژگارییە بەنرخەکانت.

-کوڕم بێگومان خودا ئەمەی لێ پیرۆز کردوویت. چونکە تۆ لەسەر ڕێگای ڕاست و ڕەوا ڕۆیشتوویت. لەبەرئەوە خودا ناوچەکەت دەپارێزێت. ئێستاش من وا بە دڵنیاییەوە دەمرم و دەچمەوە بەر بارەگای خودا و نەوەکانم لەژێر ڕەحمەت و ئاگاداری خودادا جێدەهێڵم. هەفتەیەك تێنەپەڕی باوکم کۆچی دوایی کرد.

خزم و کەسوکار و دۆستان پەیتا پەیتا، بۆ پرسە گەیشتنە شەهری سیبز.

هەتا حاجی برلاس و بایەزید جالیر خۆیان و دەستوپێوەندێکی قەشەنگ بۆ شەهری سیبز هاتن.

زۆر بە چاکی باسی ناوچـە و دەوروبـەری مەڵبەندەکەیان کـردم. شـانازییان بـە دەوڵەمـەندی پایتەختەکەمـەوە دەکـرد. بـە شێوەیەکی بێوێنـە باسـیان کـرد و پابـەندی تـەواوی خۆیـان بـە پایتەختەکەمەوە دەربڕی.

شۆخ و شەنگی و جوانی ژنە شازادەکانم و ژیانی ڕۆژانـە و بـەختیاری کۆشکی سپی کارێکی زۆری تێکردن.

لەژێر سێبەری مزگەوتـە ساردەکەدا، ئیمام زەینـەدین ڕێ و ڕەسمـی جەنازەکـەی جێبـەجێ کردو لەسـەر تەرمـە پیرۆزەکـەی بـاوکم نوێـژی کـرد و لاشـەکەیان خستـە نـاو دوامەزارییـەوە. لـە خـاکی پیرۆزی مزگەوتەکـەدا ناشتیان. بـە مردنـی بـاوکم هێمـن و ئاسـایش لـە جیـهاندا نـەما. هەرچۆنێك بێت، ناوچەکەی من خوا نەیپاراست[٤]. بەڵکو شێخ عەلی و هێزەکەی پاراستی.

* * *

## کاروبارێکی خەتەرناك و ئیشێکی نوێ

سەرانەی ساڵانەم بۆ سەمەرقەند نارد و خۆم هاوبەشی ئاهەنگی سـەری ساڵم لەگـەڵ حـاجی برلاسدا نەکرد. ئیتر لەو دەنگوباسەی بڵاوببۆوە، زانیم حاجی بـرلاس بـەیانێکی بڵاوکردۆتـەوە و لەو بەیانـەدا، بـەناو و سـەرزارەکی داوای سـەرۆکایەتی گشت هـۆزی برلاسـی کـردووە. منیـش لـە ناوەڕۆکی مەبەستەکەی گەیشتم و دەمزانی چی دەوێت.

پێش بـە خـاك سـپاردنی تەرمەکـەی بـاوکم.. لـە کـاتێکدا جوانـیو خۆشـی و بـەختیاری پایتەختەکەمم پیشاندا، لە چاوەکانیدا ئەو تەماع و چاوچنۆکییەیم بە چاکی دەبینی و سـەرنجی ڕاکێشابووم. بە چاکی و زۆر بـە خـێرایی بـۆم دەرکـەوت، هـەموو جیـهان پارچەیەکـە و لێـك جیانابێتەوە. هیچ کاتێکیش لە ناوچەیـەکدا ئاشتی بەرقـەرار نـابێت، کە لـە هـەموو لایەکییـەوە شەڕ و شۆڕ و هەرا بەردەوام بێت.

وەرزی بەهار هێشتا نـەهاتبوو، کە لـە باکوورەوە گوێـم لـە تەقەتـەقی چـەك و قـەڵغان بـوو. چونکە خاقـان تۆغلوك یـان شاهێنشاه وەك هـەندێك ناویـان لێنـابوو. بـە لەشـکرەکەیەوە بـەرەو شاری سەمـەرقەند دەکشان. ترسی گەورە لـە لایـەن حـاجی برلاسـەوە ڕووی تێنـەکردم. بـەڵکو لـە نەتەوە مەغۆلییەکانەوە بوو. کە لە بیابانە ساردەکانەوە بەرەو پیرم دەکشان.

---

[٤] ئەمە بێباوەڕی دەگەیەنێت. چونکە هیچ شتێك بێ ڕەزامەندی خوا نابێت.

خاقان تۆغلۆك سەرۆكایەتی لەشكرەكەی وەك نەتەوە درندەو دەشتەكییەكان دەكرد. ئەو نەتەوانەی كە ئازاترین جەنگاوەری لە باوباپیرانمانەوە لەدایك هێنا. واتە نەتەوە و لایەنگرە سەرەكییەكانی جەنگیزخان و قوبلای خان.

كاتێك بە تەواوی ڕوونبۆوە، ژمارەی سەربازەكانی هێزی لەشكرەكەی تۆغلوك دوانزە هەزار سەربازن. حاجی برلاس و بایەزید جالیر بڕیاریاندا بە هیچ شێوەیەك بەرهەڵستی ئەو لەشكرە نەكەن. بایەزید جالیر پیاوەكانی بۆ بنكەكەی لە "خوجند" بردەوە، كە دەروازەی باكووری وڵاتی تەتەر بوو. بیارییەكی زۆری دا و ملكەچی تەواوی بۆ خاقان دەربڕی. حاجی برلاسیش هەموو هۆز و نەوەكانی برلاسی كۆكردەوە و نامەیەكی بۆ من نارد و لە نامەكەیدا پێیڕاگەیاندم، كەوا بڕیاریداوە دەیەوێت خۆی و هۆز و دەستوپێوەندی بەرەو باشووری ڕووباری ئامودەریا ڕەو بكەن. داوای لێكردبووم منیش خۆم ئامادە بكەم، لە كاتێكدا لە نزیك شەهری سیبزەوە ڕەت دەبێت بچمە پاڵی و پەیوەندی پێوە بكەم.

تەماشامكرد و بیرم لە حاڵ و وەزعی خۆم كردەوە. لەبەرئەوەی ئێستا باوكم و كورغان هەردووكیان مردوون. هیچ پێویستییەك نەبوو، سەر بۆ هیچ كەسێك دانەوێنم و خۆم بەژێر دەستەی بزانم. بەڵام خاقان تۆغلۆك تەنها داوایەكی مێژوویی هەیە، ئەویش ئەوەیە ملكەچی بم و یارمەتی بدەم.. بەڵام داواكاری مێژوویی هیچ كاتێك لەو هێزە بەهێزتر نەبووە كە پارێزگاری لێ بكەیت. بەڵام دەربارەی دوو جێنشینەكانم كورغان و حسێن ئەوە یەكێكیان مردووە و ئەوی تریشیان حسێن (واتە براكەی ئەلجای) ئەمیش بە دوژمن دانانرێت لەو ناكۆكییەی پاش ماوەیەكی تر خەریكە شاخ بەرز دەكاتەوە.

مامە حاجی برلاسم لە بەربەرەكانی كردنیدا بۆ سەركردایەتی هۆزی برلاس و پیاوەكانی منی بە دوژمنێكی گەورە و سەرسەختی خۆی دادەنا.. بەڵام مامەكەی ترم، جاكۆ كە جەنگاوەرێكی زۆر ئازا بوو. هیچ مەبەستێكی خراپی بەرامبەرم نەبوو. مامە جاكۆم دۆست و برایەكی ڕاستی باوكم بوو. جێی هەموو باوەڕ و متمانەیەكی بوو. هەروەها بۆ منیش وەك دۆست و مامێكی بە وەفا و دڵسۆزیش دەبێت.

بەڵام شێخ عەلی "براكەی شێرێزا" لە حسێنی برای ئەلجای بە كەڵكتر و چاكتر نابێت.

ئێستاش حاجی برلاس دەیتوانی هێزەكەی لەگەڵ هێزەكەی بایەزید جالیردا بكات بە یەك و بە فەرمانڕەوایی سەمەرقەند بكات و گورە بێتوانا و كەسایەتییەكەی كورغان لە سەركار لابەرێت. بەڵام كێشەی ڕاوەستان و بەرەو ڕووبوونەوەی خاقان ئەمە كێشە و باسێكی ترە.

گشت ئەفسەرەکانی خۆم بۆ کۆبوونەوەیەکی گشتی کتوپڕ بانگکرد.

لەو کۆبوونەوەیەدا بارودۆخی جیاوازی ئەم کاتەم بۆ باسکردن ڕوومتێکردن، وتم:

-"من دەمەوێت لێرە بمێنمەوە"

-ئیلشی بە گەرموگوڕییەکی بێوێنەوە وەڵامی دامەوە. "من لەگەڵتدام" هەروەك چۆن لەمەوپێش بەرەنگاریمان کردووە، ئێستاش دەتوانین بەرەنگاری و بەرهەڵستی دوژمن بکەین.

جاکۆش بە زمانێکی ڕاست و ڕەوان وەڵامی دامەوە: "منیش لەگەڵتاندا دەمێنمەوە" و لەو باوەڕەشدام ژمارەیەکی زۆر لە نەوەکانی برلاس لە دواییدا وا بە چاکتر دەزانن لێرە بمێننەوە. بەڵکو زۆریش لەو "برلاس" یانەی لەگەڵ حاجی دان، ئارەزوو دەکەن و دەیانەوێت بێن بۆ ئێرەو لەگەڵماندا بمێننەوە.

-جاکۆ باشە دەتوانین پشتیان پێبەستین؟

-پشتیان پێببەستین؟! نەخێر، بەڵام کە هاتنە ناو شووری شارەکەوە دەتوانین سوودیان لێببینین و بەکاریان بهێنین.

-نەخێر، من ناتوانم ئەو جۆرە پیاوانە ئێستا وەربگرم و بیانخەمە کارەوە و ناشتوانم لە پیاوی بە وەفا و دڵسۆزیش زیاتر بهێڵمەوە.

-کەواتە لێیان گەڕێ، با لەگەڵ حاجی برلاسدا بڕۆن. هەر لەوکاتەدا بۆ لای شێخ عەلی وەرگەڕامەوە، لێم پرسی:

-شێخ عەلی تۆ چی دەڵێیت؟

بە شێوەیەك وەڵامی دامەوە، لە خۆبایبوون و دووروویییەکی تێدابوو. وتی:

-گەورەم تەیموور، من شەخسی خۆم، دڵسۆز و بەوەفاشتم، بەڵام من لەو باوەڕەدام وام پێباشترە خۆم و پیاوەکانم بگەڕێنەوە بۆ هێرات.

هەستمکرد، دڵم خەریك بوو دەربێت و شەق دەبات.

لەمەوپێش بە هێزی کورغانەوە ژیابووم و مابووم. پاشان شێخ عەلی بۆ ماوەی دوو ساڵ بەرگری لێکردم و ژیانمی پاراست.. و ئێستاش نەوەتانێ دەڕوات. ئینجا هەستم کرد و بۆم دەرکەوت، پێویستە مرۆڤ هەموو کات لە کاروباریدا پشت بە خۆی ببەستێت و پشت بە کەسی تر نەبەستێت.

بە ڤین و تووڕەیی و نەفرەت لێکردنەوە لە شێخ عەلیم پرسی، وتم:

-خۆت و پیاوەکانت بۆچی بۆ هێرات دەگەڕێنەوە؟

-باوکم لە تۆغلوك خان ترسی هەیە، لەبەرئەوە داوای لێکردووم بگەڕێمەوە و لە کاتی پێویستیدا یارمەتی بدەم. ئێمەش ناتوانین قوربانی بە پیاوەکانمان بدەین و بەرهەڵستی دوانزە هەزار جەنگاوەری مەغۆلی بکەین. هەروەها ناشتوانم ڕێ لە سەربازەکانم بگرم، ئەگەر بیانەوێت بچنە ناو لەشکرەکەی خانەوە.

-باشە، تۆ لەو باوەڕەدایت کە من لەگەڵتا دێم؟

-نەخێر، شامالکیش لەو باوەڕەدا نییە.

-شامالك زۆر باوەڕی بە دیبلۆماسیەتی تۆ و شارەزاییت هەیە، لەو باوەڕەدایە، چارەسەرێك بۆ فوتاربوون دەدۆزێتەوە. منیش خۆم هەر لەو باوەڕەدام.

-باشە تاکو حاجی برلاس لێرە ڕەتدەبێت، تۆ لێرە دەمێنیتەوە؟

-بەڵێ، من ئەم شوێنە جێناهێڵم تا نەزانم لە نێوانتاندا چی ڕوودەدات.

-چاکە، ئایا پاشەڕۆژ بۆ لام دێیتەوە؟

-بەڵێ، هەرکاتێك تۆ پێویستت بە من بوو، وە هەر کاتێکیش بۆم ڕێکبکەوێت، دەگەڕێمەوە بۆ لات.

-سوپاست دەکەم، منیش کاتی پێویست بە دواتا دەنێرم.

ئاوڕێکیشم لە موسا دایەوە و پێم وت:

-موسا تۆ چی دەکەیت؟

-من، لە تۆ بگەم، پلانەکەت تەواو بووە. حسێن وا خەریکە لە کابوول دەگەڕێتەوە. منیش بۆ خۆم وای بە چاك دەزانم، هێزەکەم بخەمە ناو هێزەکەی حسێنەوە. و ئێمەش لە دەوروبەری کۆشکی سالی دامەزرێنین و چاوەڕوانی بین تاکو بزانین تۆ چی دەکەیت؟ ئێمەش ئەوکاتە وەك شێخ عەلی دەتوانین لە کاتی پێویستیدا یارمەتیت بدەین.

-زۆر چاکە، منیش چونکە ئیلشی و جاکۆم لەگەڵدایە دەتوانم بەرامبەر دوژمن خۆم ڕاگرم. منیش خاتوو شێرێزا و دەستوپێوەندەکەی و هەرچییەکی هەیە لەگەڵ شێخ عەلی برایدا ڕەوانە دەکەم و ئەلجای و دەستوپێوەندەکەی و هەرچییەکی ئەو هەیەتی لەگەڵ تۆدا بۆلای حسێنی برای ڕەوانە دەکەم.

ئیتر دوای ئەوە دەستم کرد بە جێبەجێکردنی کاروبار بۆئەوەی خانەوادە و خێزانەکەم ڕەوانە بکەم.

دەرگای ژوورەکانی کۆشـکەکەم ـکۆشکی سپی ـ داخست. جگە لـە هۆڵە گەورەکەی و هەندێ ژووری ئەملاو ئەولای نەبێت. هەرچی سەروەت و سامان و کەلوپەل و پێویستییەکانی ژنـەکانم هەبوو، کۆمکردنەوە بۆئەوەی بەرەو باشوور بیانگوێزمەوە.

شێخ عەلی و موساش باروبارخانەی کاروانەکەیان کۆکردەوە و خۆیان ئامادە کرد.

بەڵام هەموو شتێکمان لـە شوێنی شاردراوەدا شاردەوە تـاکو دەنگوباسمان پێگەیشت حاجی برلاس شاری سەمەرقەندی جێهێشت.

ئیـتر ئەوکاتـە هەموو پیـاو و جەنگاوەرەکانم بـە درێژایی ڕێگـای سـەمەرقەند دابەشـکرد و خۆمان بۆ شەڕ ئامادە کرد. لە دووری چەند میلێکەوە لـە یـاگووری شـەهری سیبزەوە چاوم بـە حاجی برلاس کـەوت و بـەرەو ڕووی بوومـەوە. کاتێك لغاوی ئەسپەکەی ڕاگرت و لەبەردەممدا ڕاوەستا. لێی پرسیم، وتی:

-تەیموور، ئایا تۆ ئامادەی بۆ ڕۆیشتن؟

بە ئازاییەکی بێوێنەوە وەڵامم دایەوە:

-"نەخێر!! من ناڕۆم!!".

زۆر تووڕە بوو، هەر بە تووڕەییەوە، وتی:

-بـە سیفەتی ئـەوەی مـن سەرداری هۆزی برلاسم مـن فـەرمانت پێـدەدەم، هـەرچی مـاڵ و سامان و کەلوپـەلت هەیـە کۆیبکـەرەوە و لـە کشانەوەماندا بـدەوە پاڵمـان. گۆشـەنیگایەکم بـە هێزەکەیدا گێڕا، بینیم زۆر لەوە کەمترە، کە من چاوەڕوانیم دەکـرد. بینیـم زۆر بـە تووڕەییـەوە تەماشای منی دەکرد و بە ڤینیشەوە سەرنجی هێزەکەی منی دەدا، کە بـە درێژایی ڕێگاکە تیـایدا دامـەزرابوون. ژمارەیـەك ئەفسـەریش کـە چـەکی سـووکیان هـەڵگرتبوو لـە تەنیشـتییەوە ڕاوەستابوون و پاسەوانی تایبەتی حاجیان دەکرد و دەیانپاراست.

هەر لەو کاتەدا جاکۆ و ئیلشی بـە هێزێکی گەورەی جەنگاوەرانـەوە دەستبەکار و ئامـادە بـۆ جەنگ هاتن و لە تەنیشتمەوە ڕاوەستان و پشتگیرییان کـردم و جێ پێ و ڕێ و شـوێنیان پتـەو کردم.

ویستم هێزی حاجی برلاس و ئازایەتییەکەی تاقی بکەمەوە گورج هەر ئەوکاتە بـە دەنگێکی بـەرز و خۆ بـە زل زانینـەوە و بـە شێوەیەك، وتـەکانم بگاتـە گوێی پیـاوانی کاروانەکـەی ڕووم تێکردو پێم وت:

-من تەیمووری کوڕی تاراغام، هەر منیشم سەرۆك و سەرداری هۆزی برلاس داوات لێدەکەم هەرچی ماڵی و سامان و شتێکی هۆزەکەت لا هەیە بیدەیتەوە بە من، بۆئەوەی بیپارێزم و لە پایتەختی هۆزەکەدا چاودێری بکەم و بیپارێزم. ئەو خزم و کەسوکارە ترسنۆکانەشم، کە دەیانەوێت هەڵبێن با بڕۆن و چۆنیان دەوێت با وا بکەن. بەڵام ئەمڕۆ پێویستی سەرشانمە، نەهێڵم سەروەت و سامان و ماڵ و دارایی هۆزەکە بە هەڵاتنێکی ترسنۆکانە و ناپیاوانە لە بیاباندا لەناوبچێت.

حاجی برلاس حەپەسا و سەرسامییەکی زۆر سەیر باڵی کێشا بەسەریدا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بە لە خۆباییبوون و خۆبەزلزانینەوە وەڵامی دامەوە، وتی:

-تووتکە سەگ ئەوە تۆ وڕێنە دەکەیت..؟ من فەرمانت پێدەکەم کە..

نەمهێشت قسەکەی تەواوبکات ڕوومکردە جاکۆ و زۆر بە جەرگانەوە پێم وت:

-جاکۆ دەی خێرا بۆ ڕیزەکان، و فەرمان بدە بە سەربازەکان، دەست بە چەك و ئامادەبن.

جاکۆ زۆر بە گورجی بەرەو شەهری سیبز کشا. بۆئەوەی فەرمان بدات بە سەرباز و ئەفسەرەکانم و داوایان لێبکات گورج شیر و ڕمەکانیان بە دەستەوە بگرن و ئامادەی جەنگ بن..!!

حاجی برلاس بە تەواوی ڕووخا. ئەو لێدانە جەرگ بڕەی بیرکەوتەوە کاتی خۆی هێزەکەی شێخ عەلی لێی دا، لە کاتێکدا، ئەو ئابلووقەیەی شکاند، کە بە چواردەوری پایتەختەکەمدا کردبووی و پشتی شکاند.

وتەکانی خاو بۆوە و پێی وتم:

-با ئەم مەسەلەیە بە درێژی و باشتر، شی بکەینەوە و لێی بدوێین و چارەسەری بکەین. بێگومان تۆ ناتەوێت ماڵ و دارایی میللەتەکەت بە فیڕۆ و تاڵانی ببرێت.

-بێگومان، هەموو کەسێك دەتوانێت ماڵ و سامانی خۆی پێبێت، بێجگە لەو پارەیەی داوات لێدەکەم و لێتی دەستێنم، لە بریتی ئەوەی، کاروانەکەت تا دەروازە ئاسنینەکە دەپارێزم.

بەڵام هەرچی ماڵ و سامانێکی هۆزەکە هەیە و منیش بێگومانم لێی، هەمووی لای تۆیە. پێویستە بیگەڕێنیتەوە و بیدەیتەوە دەست من.

ئیتر دوای ئەوە نۆبەی من هات، بحەپەسێم و سەرم سووڕبمێنێت. چونکە حاجی برلاس زۆر بە زوویی بە هەموو داواکارییەکانم قایل بوو. هەروەها زۆریش بە پەلە و بە ئارەزوو بوو، بڕوات و قوتاری ببێت.

ئەو ئاژەڵانەی کە باروبارخانە و ماڵ و سامان و شتیان لەسەر بوو، هەموویم لێوەرگرتن و ناردمن بۆ شەهری سیبز.

لەهەر یەکێکیش ماڵ و سامانی پێبوو، بیست دیناری زێرم لێوەرگرتن و چوار سەد، سەرباز لە پیاوەکانی شێخ عەلی بە فەرماندەیی "موفا"م لەگەڵدا ناردن.. بۆئەوەی لەگەڵ قافڵەکەدا، برۆن و هەتا دەروازە ئاسنینەکە بیانپارێزن.

ئەمە لە دڵی جەنگاوەرەکاندا تۆوی بڕوایەکی باش ڕواند. وایلێکردن زیاد لە نیوەی پیاوەکانی حاجی برلاس. ئارەزوویان کرد لەگەڵمدا بمێننەوە. بەڵام من ئامۆژگارییەکەی جاکۆم بیرکەوتەوە، زۆر بە خۆزلگرتن و ڕاشکاوییەوە داواکارییەکانم قبووڵ نەکرد و ئیزنم دان و داوام لێکردن لەگەڵ قافڵەکەدا برۆن.

ژمارەیەکی زۆریش لە پیاوەکانی من ئارەزوویان بوو بدەنە پاڵ حاجی برلاس و لەگەڵ کاروانەکەیدا برۆن. کاتێك کاروانەکەی حاجی برلاس لە شارەکەم —واتە شەهری سیبز- ڕەتبوون. هیچ سەربازی لا نەما تەنها دوو سەد پیاو نەبێت. لەگەڵ ئەو پیاوانەی بڕیار بوو لەگەڵ شێخ عەلی و موسادا برۆن.

بۆ ڕۆژی دوایی شێخ عەلی باروبنە و چادری پیاوەکانی و خۆی لێك نا..!! بە دوای ئەو هێزەدا کەوتنە ڕێ کە پێمڕاگەیاندبوون لەگەڵ کاروانەکەی حاجی برلاسدا برۆن و تا دەروازە ئاسنینەکە بیانپارێزن. هەروەها پێشم وتن:

-کاتێك کاروانەکەی حاجی برلاس تێپەڕ دەکات، پێویستە لای دەروازە ئاسنینەکەوە ڕاوەستن و چاوەڕوان بکەن شازادە شێرێزا زۆر بە پەرۆشەوە، حەزی دەکرد بچێتەوە بۆ هیرات زۆر بە کوڵ دەگریا و دەپاڕایەوە و داوای لێدەکردم لەگەڵیدا بۆ هیرات برۆم. بەڵام پاش ئەوەی دڵنیام کرد کە پێویست وا بەسەرمدا پێویستی دەکات، لە شەهری سیبزدا بمێنمەوە. بینیم خەم و پەژارەی بیرچۆوە، تەنها بیری لە ساغ و سەلامەتی و پاراستنی دوو منداڵەکەی دەکردەوە، بەڵام شازادە ئەلجای بەرهەڵستییەکی ئێجگار زۆر بەهێزی کردم، لەگەڵمدا کەوتە قسە و گفتوگۆ وتی:

-تەیموور، من لە هیچ شتێك ناترسم کە تۆ لێی نەترسیت.

-ئەلجای، من لە هیچ شتێك ناترسم، بەڵام ئێستا ئەم شوێنە لەبار نییە و باشیش نییە بۆ تۆو جیهانگیر لێرە بمێننەوە. تاکو ڕاو ە ڕووت و ەزی و تاڵانی و جەردەیی نامێنێت.

-قەیناکە، باشە تەیموور لە دواییدا دەتوانم بێمەوە؟

-بێگومـان، کـاتێك ئـاژاوە و ڕاو و ڕووت نـەمێنێت و دنیـا هێمـن و ئـارام بێتـەوە، ئەوکاتـە دەتوانیت بۆ ئێرە بێیتەوە.

-تەیموور، شتێکی تریش هەیە، وا چاکتر نییە ڕێم بدەیت، زیبا و لەیلاش لەگەڵ خۆمدا ببەم.

-بێگومان، ئەگەر ئەمە، بۆیان بە ڕاست و دروست دەزانیت.

-من، وام پێباشە، چونکە تا من لە ژیاندا بم، نامەوێت لەخۆم زیاتر هیچ ژنێکی تر ببێتە گەورەی ماڵەکەت.

-باشە، ئەی چی لە دایکی عەبدوڵلای نۆکەرم دەکەیت؟

-ئەو تەندروستی چاکە، لێی بگەڕێ با لە کۆشکەکەدا بمێنێتەوە و چاودێری بکات. ئەو، وەکو من بزانم هەروا فێرە، و پێویست ناکات کۆشکەکە جێبهێڵێت.

ئاوەها موسا و پیاوەکانی و ژنەکانم، لەگەڵ کاروانەکەی شێخ عەلیدا ڕۆیشتن و ڕەویان کرد.

هیچ کەسی ترم لا نەمایەوە لە هێزە تایبەتییەکەی خۆم زیاتر و ئەو مەڕوماڵات و سامان و دەستکەوتانە نەبێت کە لە حاجی برلاسم سەندبوو.

فەرمانم دەرکرد، دەبێت کاروبار چۆن لەمەوپێش ڕۆیشتووە هەروەها بڕوات. ژیانیشمان وەك لەمەوپێش با ئاسایی بێت. نەمهێشت هیچ هێزێکی تایبەتی لە هیچ شوێنێکدا بوەستێت. کە ببێتە جێی شك و گومان. حەزم کرد شەهری سیبز بە ئارامی ببینم و هەروەك هیچ هەڕەشەیەك و هەڵمەتێکی داگیرکردنی لەسەر نەبێت.

حەزیشم نەدەکرد کۆشکی سپی کەسی تێدا نەبێت و چۆڵ و هۆڵ بێت.

لەبەرئەوە هەر یەکەم شەو، ئەو کاروانەی ژن و منداڵەکانی لەگەڵ خۆیدا بردبوو، ڕۆیشتن. چووم بە شوێن کاریندا کۆشکەکەی کارین گەرچی لە کۆشکە سپیەکەی من بچووکتر بوو، بینیم لە بەزم دا جمەی دەهات و پڕ لە کەلوپەلی جوانی ناوماڵ بوو. ئەمەش ئەوەی دەگەیاند کارین خاوەنی زەوق و ئارەزوویەکی تەواوە. کاتێك زانی، بۆ لای هاتوومەتە کۆشکەکەیەوە، لە هۆڵە گەورەکەیدا بەوپەڕی شادی و خۆشی و دڵنیاییەوە پێشوازی لێکردم.

بەڵام بە خەمبارییەکەوە وتی:

-ئاە، تەیمووری سەردارم!! من دەمزانی تۆ نائومێدم ناکەیت. لەبەرئەوەی زۆربەی پیاوەکانت ڕۆیشتوون من نەشمدەزانی ئێستا چی بکەم.

-باشە تۆ ناتەوێت بۆ ماوەیەك ببیت بە دۆستی شازادە؟

-چۆن نا؟ من هیوادارم بۆ هەتاهەتایە ببم بە دۆست و خۆشەویستی شازادە. ئێستا وەرە با بچینە ژووری نووستنەکەمەوە..!!

-نەخێر، ئێستا من دەمەوێت بێیت بۆ کۆشکەکەی من و هەرچی کچێکیشت لایە و هەر شتێکیشت هەیە لەگەڵ خۆتدا بیهێنە.

-گەورەم ئەمە بە ڕاست دەڵێیت؟ بە ڕاست دەتەوێت لەگەڵتدا بێم، و لەگەڵ خێزانەکەتدا بژیم؟

-تۆ و هەرچی کچێکیش لەگەڵتایە، پاشان دەبن بە خێزانم.

-کەواتە هەموو ژنە شازادەکانت جێیان هێشتوویت. بێگومان گشتمان دێین. ئەمەت زۆر درەنگ داوا لێکردم.

پاشان کارین باوەشی پێداکردم و خۆی خستە ناو باوەشمەوە و فرمێسکی خۆشی لە کوڵمەکانیدا هاتە خوارێ منیش دانم بە خۆمدا گرت و بێدەنگ بووم و نەمویست ئەو تێگەیشتنە ناڕاستەی بۆ ڕاست بکەمەوە.

لە شەوی ئەو ڕۆژەدا کارین گواستییەوە بۆ کۆشکی سپی و ژمارەیەکیش لەو کچە جوانانەی لایبوو لەگەڵ خۆیدا هێنای. ئەو کچە شۆخ و جوانانەی، هەموو پیاوێکی گەورە ئارەزووی دەکردن بە دەستیان بهێنێت. منیش هەندێ جار هیوا و ئارەزووم بوو، کچەکان بۆ هەتاهەتایە بۆ خۆمیان بهێڵمەوە. چونکە ئەو کچانە لەم ڕۆژانەدا تەواو سەربەست بوون. لە کۆشک بە ئارەزووی خۆیان دەچوونە دەرەوە و لەگەڵ مندا لەسەر مێزی نانخواردن دادەنیشتن بەرم لەوە دەکردەوە، ئەوەیان کە من بیری لێدەکەمەوە لە پاشەڕۆژدا ببێت بە ژنی من. بێگومان زۆر کەسانی تر پێش من ناسیونی و لەگەڵیدا ڕایبواردووە.

لەبەرئەوە حەزم نەکرد خەڵکی گاڵتەم پێبکەن، یان بە سووکی تەماشام بکەن. ئیتر، هەر لە هەفتەی دواییدا بووم بە نێرەی ژمارەیەك ژنی تر و بە ئارەزووی خۆم لەگەڵیاندا ڕامدەبوارد.

هیچ کاتێك داوام لە کارین نەدەکرد سەما بکات.

بەڵام بینیم لە کاتێکدا لەناو جێگادا لەگەڵمدا ڕادەکشێت ئەوەندە شارەزایە وێنەی نەبوو.

بێ دوودڵی و زۆر بە ئازایەتییەوە پێی وتم:

-گەورەم، شازادە تەیموور، من ئێستا زۆر شاد و بەختیارم شازادە، یەکەمجار منت بینی زۆر لاواز و لات و پووت و شەرمن بووم. هونەری ڕابواردن و مەکر و خۆنواندنم نەدەزانی شتێکی زۆر کەم نەبێت. بەڵام ئێستا دەتوانم وات لێبکەم خۆشی و ئارەزووی باش و تەواو لە لەشم ببینیت.

لە ڕاستیدا شتێکی زۆر گران بوون پیاو بڕوابکات ئەم لەشە جوانە پڕ و نەرم و نۆڵەی ئێستای کارین لەشولاری ئەو کەنیزەکە شەرمن و لاتوپووتەی ئەوکاتەی لەمەوپێشی کارین بێت. کە بە شێوەیەك حەز و ئارەزووی نیهمۆی هەستاند، لە پێناویدا دەستێکی خۆی پەڕاند.

ئەو مەمکانەی لەمەوپێش بچووك و لات بوون، ئێستا جوان و گەورە و سەرنجڕاکێشن. هەروەها ئەو سمتانەی لەمەوپێشی لات و پووت بوون، ئێستا خڕوپڕ بوون و لە دوو سمتی پەرییەکی زۆر جوان دەچوون.

بەڵێ ئێستا دەتوانێت حەز و ئارەزووم هەستێنێت و تام و خۆشیم پێبگەیەنێت. هەروەها ئەو کچانەش کە لەگەڵیدا بوون، ئەوانیش دەیانتوانی ئەو حەز و ئارەزوو، و خۆشییەم پێببەخشن. ئەمە وایلێکردم، خەریکبوو ئامانجی ڕاستەقینەم بۆ پێکهێنانی خێزانێکی ڕاست و ئەو پەیوەندییە تایبەتییەم بە شازادەکانەوە بیربچێتەوە. ئیتر هەمدیسان هاتمەوە هۆش خۆم و مەبەستی سەرەکیم بیرهاتەوە، کاتێك ئەو لێشاوە بەردەوامەی ئاوارەکان و ڕاکردووەکان و جەنگاوەرانم بینی لە ڕێگای سەمەرقەندەوە دەکشێن و بەرەو لای من دێن.

کۆمەڵ کۆمەڵ جەنگاوەر و بازرگان و گەورەپیاوان و دەوڵەمەندان، کە ئەسپی جوان و ژنە جوان و خۆشەویستەکانیان و سامانەکەیان، کە بریتی بوو لە زێڕ و زیوو گەوهەر و ئاژەڵی زۆر و زەوەند. دەهاتن.

منیش داوام لەو سەربازانەی خۆم کرد، ئەوانەی لەگەڵمدا مابوونەوە، جوانترین جلوبەرگی ڕەسمی لەبەر بکەن. بۆ ئەوەی وا بنوێنن کە پاسەوان و هێزی تایبەتی منن. خۆ ئەگەر یەکێکیش پرسیاری لە حاڵ و گوزەرانمان کرد. پێیان بڵێن سەربازەکانمان سنوورمان دەپارێزن ی ئێمەش هیچ کات لە کەس ناترسین.

باج و گومرگم لەوانە نەدەسەند کە بە دۆڵ و ناوچەکەی مندا تێپەڕیان دەکرد. زۆریش لەوانە دەهاتن بۆ کۆشکەکەم و لێم دەپاڕانەوە ڕێگایان بدەم لە دۆڵ و ناوچە هێمنەکەی مندا بمێننەوە. بەڵام من زۆر لەسەر بڕیاری خۆم توندوتیژ بووم. بە شانازی و لووتبەرزییەوە داواکارییەکانیانم دەدایە دواوە و لێم قبووڵ نەدەکردن و پێمدەوتن:

-من پیاوێك وەرناگرم و پێشوازی لێناکەم، کە لە ترسی خاقان هەڵاتبێت.

ئەوانیش بە دڵشکاوی لە کۆشکەکەم دەردەچوونە دەرەوە و بە شەوق و ئارەزووەوە ئاوڕیان بۆ دوای خۆیان دەدایەوە و پابەندبوونی خۆیان بەرامبەر ئەو دەموچاوە جوان و ڕووە خۆش و لەسەرخۆیانەی ژنە جوانەکانم دەردەبڕی. وە بەو شادی و خۆشییەی باڵی کێشابوو بەسەر ئەو

ژوورەی کە هاتنە ناوییەوە و بە چاوانی خۆیان بینیان ئیرەییان دەبرد. سواری ئەسپەکانیان دەبوون و خەم و پەژارە، دڵیانی دەگرت و بەو کێڵگانەدا دەڕۆیشتن کە جووتیارەکان بە ڕووی خۆش و شادییەوە ئیشیان تیادا دەکرد. کەسیش لە خۆم زیاتر نەیدەزانی ئەم دیمەنە دیمەنێکی درۆ و دروستکراوە. سەرم سووڕما لەوە لە تەمەنی دروستبوونی شەهری سیبزەوە تاکو ئێستا، وەك ئەم جۆرە هاتووچۆ و کارە درۆزنانەی بە خۆیەوە، نەبینیبوو. سەریشم لەوە سووڕمابوو، ئایا ئەم بەهەشتەی ئێستا، تێیدام ڕاستییە..؟

کتوپڕ ڕێگای سەمەرقەند هیچ هاتوچۆکردنێکی تیادا نەما. و هیچ سوارەیەکی نامۆ، ئەندازەی گەردیلەیەك تۆز و خۆڵی لە باکوورەوە هەڵنەستاند.

بەسەر دۆڵ و ناوچەکەمدا بێدەنگی و کشوماتی باڵی بەسەردا کێشا. جووتیار و وەرزێرەکان دەستیان لە کاروبار هەڵگرت و تەماشای گوڵەگەنمەکانیان دەکرد کە لە کێڵگەکانیاندا پێگەیشتبوون و شەپۆلیان دەدا. بازرگان و دووکاندارەکان، دووکانەکانیان داخست و لە بازاڕەکاندا نەمان و بە شەقامەکاندا دەهاتن و دەچوون و چاویان بڕیبووە باکوور. ژنانیش لە سەربان و دیواریماڵەکانیان بە ترس و لەرزەوە لە باکوور و ڕۆژهەڵاتیان دەڕوانی هەموو کەسێك هەستی بە دڵگرانی و ترس و لەرز دەکرد و کەس دڵنیا و ئارام نەبوو. ئەویش بە هۆی ئەو بێدەنگی و کشوماتییە نائاساییەوە بوو کە باڵی بەسەر هەموو ناوچەکەدا کێشابوو.

منیش چوومە لای ئیمام زەینەدین بۆئەوەی بزانم چ ئامۆژگارییەکم دەکات. کاتێك گەیشتمە لای لێم پرسی:

-ئایا ئەم کار و کردەوەیەی من ڕاست و بەجێیە؟

-تەیموور، من لەو باوەڕەدام، تۆ ڕاستیت، ئەوەش هیچ شك و گومانی تێدا نییە، مزگەوت و شارەکەش لەژێر سایەی فەرمانڕەوایی تۆدا، تا ئێستا بە شادی و خۆشییەوە ژیاوە.

-کورغان و باوکیشم تا ئەم دواییەش پێیان دەگوتم:

سەربۆ خاقان نەوی نەکەم. ئێستاش دەتوانم ڕابکەم و پاشان بە هێزێکی گەورەترەوە بگەڕێمەوە.

-نەخێر، تەیموور، نەخێر.. ئەمە سوود و داهاتی هیچت نادات. ئەنجامەکەشی بە خراپی دەگەڕێتەوە، ماڵ و سامانت تاڵان دەکرێت و سامانی مزگەوتەکانیش تاڵان دەکرێت. ژن و کچانی شارەکەشت ئەتك دەکەن. و بە تاڵانی دەیانبەن.

-بەڵام پاشان دەتوانم هەموو شتێك بە دەست بێنمەوە و پەیدای بکەمەوە.

-نەخێر، تۆ ناتوانیت کچێنی کچان و شەرەف و نامووسی ئەو ژنانە بەدەست بێنیتەوە کە ئەتك دەکرێن و حەیایان دەڕژێنرێت. هەروەها ناشتوانی ئەو پیاوانە بژێنیتەوە کە دەکوژرێن!! تۆش باج و سەرانەت بە سەردارانێکی زۆرداوە.. بە کورغان.. بە حاجی برلاس.. ئێستاش دەتوانیت ئەو باج و سەرانەیە بە یەکێکی تر بدەیت. هەروەك چۆن لەمەوپێش خزمەتی هەندێ شاهێنشاشت کردووە. ئێستاش دەتوانیت خزمەتی خاقان بکەیت.

-ئیمامی بەڕێزم، بەڵام تۆغلوك جۆرە پیاوێکی ترە..!!

-من ئەوە دەزانم.. ئیمان و بڕوای بە محەممەدی پێغەمبەر نییە. بەڵکو پەیڕەوی یاسای جەنگیزخان دەکات.

ئەگەر تۆ و سەربازەکانت هەڵبێن، ئەوکاتە پیاوەکانی تۆغلوك، شەهری سیبز تاڵان دەکەن و هەرچی ماڵ و سامانێکی مزگەوت و خەڵقی هەیە، دەیدزن و بە تاڵانی دەبەن.

-باشە ئەگەر بمێنمەوە، چی ڕوودەدات؟

-بێگومان هیچ میوانێك ناتوانێت، خاوەن ماڵ ئازاربدات، ئەگەر خاوەن ماڵەکە بە باشی میوانداری، میوانەکەی بکات و خەلات و دیاریی باش و بە نرخیشی پێشکەش بکات.

-کەواتە وا دەکەم، ئیمامی بەڕێزم وەك خۆت دەزانیت بۆئەوەی شەهری سیبز بپارێزم و پارێزگاری لێبکەم پلانی منیش هەر ئەمەیە.. هەرچی سامانێکم هەیە لەو پێناوەدا دەیبەخشم.

-بەڵکو لەوەش زیاتر. منیش سنووقەکانی مزگەوتت بۆ دەکەمەوە و هەرچی تێدایە دەیخەمە بەردەستت. ئێمە هەردووکمان پێکەوە دەتوانین خاقان هێوربکەینەوە و بە ڕێگاچارەی ئاشتیانە شارەکەمان ڕزگار بکەین.

ئیمام زەینەدین لە قسەکانیدا ڕاست بوو. دەرگاکانی ژێرزەمینی مزگەوتەکەی کردەوە، بە درێژایی شەو، ئەو پیاوانەی جێگای باوەڕمان بوون، کیسە زێڕ و گەوهەر و ملوانکەی بەنرخ و سامانی زۆریان لە مزگەوتەکەوە بۆ کۆشکەکەم گواستەوە.

زێڕ و زیو و گەوهەر و سامانێکی زۆر زۆرم شاردەوە، و زۆریشم زێڕ و زیو و گەوهەر خستە بەردەست بۆئەوەی بیدەم بە بەرتیل، بە یەکەم کۆمەڵی تۆغلوك کە دەگەنە لامان.

لە کازیوەی ڕۆژی دواییدا نوێنەری خۆم بۆ دیوانی خاقان نارد و نامەیەکم پێدا نارد و ملکەچی خۆمم بۆ دەرخست و تیایدا، دەستنیشانم کردبوو، کە چاوەڕوانی بانگهێشتی ئەوم تاکو بچم بۆ دیوانەکەی و چاوم پێی بکەوێت. سوێندم بە شەرەفم خواردبوو، من بە ڕاست و بێ درۆ،

گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەوم. لە نامەکەشمدا ئەوەم دووپات کردبۆوە، هەرچی هەمە و نیمە بە پێی یاسای گوێڕایەڵی و ژێردەستەیی لە خزمەتی ئەودایە..

هەروەها ژمارەیەك پیاوانی هەواڵقۆزم نارد هەموو ڕاوتەگبیرێکم دانا بۆ پێشوازیکردنی میوانەکان. کتوپڕ دوو سەد پیاو لە باشترین و نازاترین داگیرکەران گەیشتنە لامان. ماڵ و تالانییەکی زۆریان پێبوو. ئەسپەکانیان ئەوەندە گەنمی کێڵگەکانیان خواردبوو، ورگیان ناوسابوو. هەواڵقۆزەکانم پێش دوو سەعات بە دەرکەوتن و بە گەیشتنی ئەو هێزە خەبەریان دامێ. هەرکە ئەو هێزە نزیك دەوروبەری شارەکەم بوونەوە لە چێشتخانەکانمدا، گۆشت دەبرژا و چێشت لێنەرەکانم خۆیان بۆ بانگهێشتنێکی نایاب نامادە دەکرد و خزمەتکارەکانیشم جوانترین و نایابترین جلوبەرگیان پۆشیبوو، کە شایانی نایابترین ئاهەنگ و دەعواتی ناوازە بێت.

پاسەوانەکانم لەبەردەمی دەرگای شارەکەدا، هیچ شیر و چەکێکیان هەڵنەگرتبوو. لەناو شاری شەهری سیبزدا زۆر بە جوانی و خۆشییەوە پێشوازی میوانەکانیان کرد. لەبەرئەوەی سەرکردەکەیان دەترسا لەوەی، ئەمە پیلانێکی نهێنی بێت. هێزە سەرەکییەکەی لەسەر شووراکاندا، دانا و لەگەڵ دە کەس لە باشترین ئەفسەرەکانیدا زۆر بە ئاگاهی و وریاییەوە هاتنە ناو کۆشکەکەمەوە منیش لە کانگای دڵمەوە زۆر بە گەرمی لە بەردەرگای دەرەوەدا پێشوازیم کردن و ڕێز و شانازی تەواوی خۆمم پیشاندا.

ئیتر هەر ئەوکاتە بە زمانێکی دۆستانەوە ڕوومتێکردن و پێم وتن:

-برایان من لە کۆشکەکەی خۆمدا زۆر بە گەرم بەخێرهاتنتان دەکەم. من زۆر بێئارامانە چاوەڕوانی نوێنەرانی سەرداری خۆشەویست و گەورەی بەڕێزم خاقانی گەورەم دەکرد. منم تەیموور سەردار و سەرۆکی هۆزی برلاس و فەرمانڕەوا و میری شەهری سیبز فەرموون وەرنە باخچەی کۆشکەکەمەوە.

سەرۆکی نوێنەران زۆر سەری سووڕما، بەو پێشوازییە و میواندارییە جوان و چاکەم. سواری ئەسپەکەی بوو لە تەنیشتمەوە بەرەو دەرگای کۆشکەکەم جما، بێ ئەوەی وتەی لێوە بێت.

کیژەکانی کارین زۆر بەڕێز و ئەدەبەوە بۆ پێشوازی میوانەکان ڕاوەستابوون. هەریەکەشیان سووراحی پڕ لە مەی و پێکە عارەق و خواردنەوەی بەتام و لەزەتیان گرتبوو بە دەستەوە. کیژەکان پێش ئەوەی میوانەکان لەسەر پشتی ئەسپەکانیان بێنە خوارێ. پێکەخواردنەوەیان پێشکەش کردن منیش فەرمووی میوانەکانم بۆ خواردنەوە کرد. پێم وتن:

-ئەی برایانی بەڕێز، بخۆنەوە و دەروونتان فێنك بكەنەوە، با، ئەو هیلاكی ڕێگا دوور و درێژو تۆزاوییەتان دەربچێت.

سەركردەی نوێنەرەكان لەبەرئەوەی خۆی وەك میوانێك بینی، هەستی بە هیوابڕانێك كرد. چونكە ئیتر نەیتوانی و ماوەی تالآنكردنی شەهری سیبزی نەما. وەلآمی دامەوە وتی: خاقانی گەورە ڕێز و سلآوی بۆ شازادەی شەهری سیبز دەنێرێت. منیش ئیبیكۆم یەكێكم لە سەركردەكانی خاقانی گەورە، هەست بە خۆشی و شادییەكی گەورە دەكەم و وا ئێستا بە خۆشی و سەلامەتی شازادەم تەیموور دەخۆمەوە.

منیش پێكی خۆمم خواردەوە و پێموت:

-وا منیش بە خۆشی و دروستی سەری خاقان دەخۆمەوە ئەمەش پێكێكی تر دەخۆمەوە بە خۆشی و شادی سەركردە ئیبیكۆی خزمەتكاری خاقان.

ئیبیكۆ پێكی سێیەمی گرت بەدەستەوە و پێی وتم:

-ئەمەش پێكی دروست و سەلامەتی سەری تەیموور تەیمووری خزمەتكاری خاقان.

ئیتر ئەوكاتە بەو سەركردەیەم وت:

-تكایە، پیاوەكانت بانگ بكە بۆئەوەی هاوبەشی تۆ و ئێمەش، لەم میواندارییە گەورەیەدا بكەن. تەماشایەكی ئەو سەد سەربازانەی كرد كە پاسەوانی كۆشكەكەیان گرتبوو. لەبەردەم دەرگاكانی كۆشكەكەدا ڕاوەستابوون و سەرنجیان ڕادەكێشا. بە حەزەرێكەوە لێی پرسیم:

-بەڕێز شازادە، ئەی كوا لەشكرەكەت؟

منیش زۆر بە نەترسی و خۆبەزلزانینەوە، وەلآمم دایەوە:

-لەشكرەكەم سنووری باشووری خاقان دەپارێزن.

ئێستاش من هیچیانم لا نییە جگە لە هێزی تایبەتی خۆم. چونكە من لە باكوورەوە لە هیچ شتێك ناترسم و خاقانی گەورەش لە هەموو دەستدرێژكەرێكی چەپەڵ دەمپارێزێت.

-شارەكەت لە هێمنی و ئاسایشدایە.. وانییە؟

-بەڵێ سایەی فەرمانڕەوایی تۆغلوكی گەورەدا شارەكەم هێمن و ئاسایشە.

ئێستاش تكایە پیاوەكانت بانگبكە با هاوبەشی ئەم ئاهەنگ و خۆشییەمان بكەن. جێگاش زۆرەو جێی هەمووانیش دەبێتەوە. دەستم بۆ باخچە جوان و ڕازاوەكە ڕاكێشا. لە باخچەكەشدا ئاگركرابۆوە و گۆشتی مەڕیان لەسەر دەبرژاند. یان مەنجەڵی گەورەی پڕ لە گۆشتی مەڕیان لەسەر دەكوڵا. پیاوەكانی خاقان لێویان بۆ تەڕ دەكرد و، دەمیان ئاوی بۆ كردبوو، تفیان بۆ ڕێت دەدا.

ئاخری کابرای سەرکردە، ئەفسەرێکی نارد بۆ لای پیاوەکانی تاکو لە سەر دیوارەکان بیانهێنێتە خوارەوە. و لەگەڵ خۆیدا بیانهێنێت بۆ ئاهەنگ و میوانداریيەکە.

هەندێك خزمەتکار و مەیتەرم بانگکرد بۆئەوەی ئەسپی میوانەکان بگرن و بیانبەن بۆ تەویلەکان. بە ئیبیکۆم وت:

-فەرموو، ئێستا لەگەڵمدا وەرە بۆ هۆڵی میوانداری. لەبەرئەوەی هێشتا هەر بە گومانبوو، زۆر بە ترس و ئاگاهییەوە پێش پیاوەکانی کەوت و بەرەو ئەو شوێنەی من پیشانم دا، ڕۆیشت. وە لەو جێگایەشدا ژنە کاتێکانم دووبارە پێشوازییان لێکردنەوە و پێکی پڕ لە مەی و قاپە حەڵوا و شیرینیان پێشکەش کردن. بە ڕاستی کیژەکانی کارین تیپیکی میوانداری وا جوانیان پێکهێنابوو، لە جوانی و ڕێکوپێکی و شارەزاییدا لە تیپە میوانداریيەتێکەی خاقان کەمتر نەبوو.

ئیتر ئەوکاتە ئیبیکۆ و ئەفسەرەکانی و سەرکردەکانی منیش کە جاکۆ و ئیلشی یان تێدابوو، هەستیان بە دڵنیايیەکی تەواو کرد و لە دەوری ئەو مێزە ڕازاوانەی دەوری هۆڵەکەدا دانیشتن. منیش ئەوکاتە پێکەکەم بەرزکردەوە و ڕوومکردە ئیبیکۆ و پیاوەکانی وتم:

-بەڕێزان با بە سەلامەتی سەری خاقانی گەورە، پێکەکانمان بخۆینەوە..

پاشان بەدەست چەپڵەیەکم لێدا و عەبدوڵڵای نۆکەرم بانگکرد و پێم وت:

-ئادەی هەر ئێستا دیاری بۆ جەنگاوەرە ئازاکانی خاقان بهێنن. پاش تۆزێك عەبدوڵڵا هاتەوە و ڕیزێك کارەکەری پێش خۆی دابوو، هەریەکەیان دیاریی گرانبەهایان هەڵگرتبوو، کە لە سنوورەکانی حاجی برلاسەوە هێنابوویان. منیش بە تەواوی نەمدەزانی ئەو دیارییانە چین. لە دواییدا زانیم کە جلی گرانبەها و زین و سەرزین و چەك بوون. کە بەشی هەموو پیاوە ئامادەبووەکانی دەکرد. منیش هەر ئەوکاتە بەهەر پیاوێك کیسەیەك زێڕم دانێ. و بۆ هەر سەربازێکی ئاسایی کە لە دەرەوە ئێشکیان دەگرت. پێنج دیناری زێڕینم بۆ ناردن. بەڵام بۆ ئیبیکۆ خۆم بە دەستی خۆم ژمارەیەك گەوهەرم پێشکەش کرد.

زۆر بە وردی سەرنجی سەرکردە ئیبیکۆم دەدا. ئەوکاتەی مەی زۆر خواردەوە بینیم تۆزێك پێڵووی چاوەکانی لێکنا. هەستمکرد هێشتا تێر عارەق نەبووە.

خواردنی زۆر زۆر خوارد و زۆریش عارەقی تری خواردەوە. و ژمارەیەکی تر دیاری وەرگرت. بەڵام ئەو دوو سمێڵە باریکەی، کە بەسەر لێوەکانیدا شۆڕبووبوونەوە.

پێکەنینێکیان لێدەرنەکەوت. شێوەی قسەکانیش چاوچنۆکی و برسێتییەکی تەواویان پێوە دیاربوو. هەر بەردەوام سەرنجی ئەو چاوە بچووکانەم دەدا. کاتێك کچەکان سینییە خواردنیان بە

دەستەوە بوو. لەناو میوانەکاندا دەهاتن و دەچوون. هەتا کارینیش کە لە جێگای خاوەن ماڵدا دانیشتبوو. لەگەڵ ئەو هەموو قسە خۆشانەیدا نەیتوانی تەنها پێکەنینێکی لێ هەڵبخرێنێت. لە ڕاستیدا ئیبیکۆ زۆر زیاتری دەویست لەوەی وەریگرتبوو.

پاشان بە دەستەکانی چەپڵەیەکی لێدا و، وتی:

ئێمە بۆ میوانەکان سەمامان دەوێت، ئێمە هەموومان سەمامان دەوێت. کچەکان لە شوێنەکانی خۆیاندا ڕاوەستان و تەماشای منیان کرد. منیش سەرم ڕاوەشاند و ڕەزامەندی خۆمم نیشاندا کچەکان بە شێوەی بازنەیەکی جوان ڕیزبوون.

لەگەڵ ئەو مۆسیقایەدا کە تیپی تایبەتی کۆشکەکەم لێی دەدا دەستیان بە سەماکردنێکی ئاسایی و گونجاو کرد.

ئیبیکۆ بە تەماشاکردنێکی گورگانەوە سەیری دەکردن و لەگەڵ خۆجووڵاندنەکانیاندا چاوەکانی دەگێڕا. هیچ زۆری نەخایاند بە سەریاندا قیژاندی و وتی:

-ئێستا جلەکانتان دابکەنن. و لەشولارتان دەربخەن!! ئەوکاتە هەستمکرد، ئەو شتانەی ئاوێت کە دەستی کەوتووە، بەڵکو شتی زۆر لەوەش زیاتری دەوێت. لەبەرئەوە بە شێوەی سەرزەنشت وەڵامی داواکارییەکەیم دایەوە. و لێم پرسی:

-ئایا ئەمە شتێکی ئاسایی و ڕاستە؟

-بەڵێ، ئەمە شتێکی ڕاست و ئاساییە.

-پیاو لە وڵاتی ئێمەدا، ڕێگەنادات بە ژنەکانی، خۆیان ڕووت بکەنەوە و لەشی خۆیان دەربخەن. بەڵام من ئەوەم بیستووە، کە هەندێك لە تیرە و هۆزەکانی ناوچەی باکوور، ئەم جۆرە کارانە بە شتێکی ئاسایی دادەنێن. هەروەها پیاوانی ئەو ناوچانە ڕێگا بە پیاوی تر دەدەن، لەگەڵ ژنەکانیاندا ڕابوێرن، ئەگەر ئەمە ڕاست بێت..

-بەڵێ، ئەوە ڕاستە، و ئێمەش لەو تیرە و هۆزانەین.!! تەماشای کچەکانم کرد بە قین و توورەیی و بێزارییەوە، پێم وتن:

-چاکە، کەواتە جلەکانتان دابکەنن و خۆتان ڕووت بکەنەوە. ئیتر کتوپڕ کچە سەماکەرەکان جلەکانیان داکەند و منیش دەمزانی و بێگومان بووم لەوە کە ئیبیکۆ و پیاوەکانی هەرگیزاوهەرگیز ئەم ..ۆرە ..رانەیان بە خۆیانەوە نەدیبوو.

لەگەڵ ئەمەشدا ئیبیکۆ بە پەنجەی دەستی ئاماژەی بۆ کارین کرد، کە لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو. زۆر بە ناپیاوی و شوورەییەوە وتی:

-خانمەکە، تۆش جلەکانت دابکەنە و خۆت ڕووت بکەرەوە!!

کارینیش زۆر لە سەرخۆیانە، کە قسەکانی بە تەواوی لە ئەلجای دەچوو، وەڵامی دایەوە وتی:

-سەرکردەی بەڕێز، خاوەن ماڵ لە پێشچاوی میواندا هەرگیز خۆی ڕووت ناکاتەوە.

بەڵام ئیبیکۆ بە ڕووگرژی و مۆنییەکەوە، کە شێوەی هەڕەشەکردنی پێوە بوو، وتی:

-من لەوە بێگومانم و باوەڕی تەواویشم هەیە، کە شازادەی شەهری سیبز میوانەکانی بێبەش ناکات لە بینینی لەشولاری جوانترین ژنەکانیدا.

منیش بە ڕوویەکی خۆش و زمانێکی شیرین لە کارینم پرسی و وا خۆم پیشاندا، کە شەرەف و کەرامەتم بریندار کراوە و پێموت:

-ئایا دەبێت ئیبیکۆ پیاوەکانی بێبەش بکەیت لە بینینی لەشولارت؟

لە ڕاستیشدا من هیچ هەستم بە سووکایەتی نەدەکرد ئەگەر کارین ئەوەی ئیبیکۆ داوای لێدەکرد، بیکردایە. ئایا دەبێت شەرم لە کارێك بکات کە لە ڕاستیدا، ئەو کارە بەشێك بێت لە کارەکەی خۆی؟

کارینیش لە لایەن خۆیەوە لێی پرسیم:

-گەورەم، ئەوەی ئیبیکۆ دەیەوێت بیکەم؟

وەڵامم دایەوە، وتم:

-بەڵێ خۆشەویستەکەم، ئەگەر ئەمە عادەت و ڕێ و ڕەسمی خاقانە بیکە، ئایا ئەمە هیچ ناخۆشی و شەرمەزارییەکی بۆ تۆ تێدایە؟

کارین لە شوێنەکەی خۆی هەستا و چووە ناو کچەکانەوە لە ناوەڕاستی هۆڵەکەدا ڕاوەستا. زۆر بە جوانی و ڕێکوپێکییەوە لەسەرخۆ، وەك شازادەیەك دەستیکرد بە داکەندنی جلەکانی. پەچەکەی دایە دەست یەکێك لە کچەکان. ئینجا بە ترس و دوودڵییەوە گرێی سەدرییەکەی مەمکی کردەوە، و مەمێکی دەرخست و ڕاوەستا وەك بڵێت شەرم بکات لەوەی مەمکەکەی تری دەربخات. لەگەڵ ئەوەی منیش مەستی ئەو خۆجووڵاندنە سەرنجڕاکێشەی کارین بووم. کاتێك ئاوڕم بۆ لای ئیبیکۆ دایەوە بینیم بۆ داکەندنی جلەکانی کارین یارمەتی دەدات و لێوی خۆی دەلستەوە. کارین تۆزێك وەرچەرخا و بۆ ماوەیەکی کەم بە لاتەنیشتەوە ڕاوەستا. دوای ئەوە هەمان کاد هەنگاوێکی ناو سەرێکی ئەو شاڵەی بەدەستەوە گرتبوو، کە بەسەر ناوقەدیا هاتبو خوارێ، سەرەتا لایەکی سمتە خڕ و پڕەکەی دەرکەوت و کتوپڕ دایپۆشییەوە و هەمدیسان پاش ئەوەی تەنوورەکەی بەستەوە، دووبارە دەرکەوتەوە. کە چرچی لایەکی کراسەکەی بەرزکردەوە،

ئەو هێڵە ڕاست و ئاشکرایە دەرکەوت، کە پێکدێت لە بەیەکگەیشتنی و نووساندنی کۆتایی سەرووی ڕانەکانییەوە.

پاشان لایەکی کراسەکەی بەردا و کراسە ئاوریشمەکەی بەسەر لەشیدا هاتەخوارێ و شاڵەکەی لەبەردەمیدا شۆڕبۆوە و دووبارە دایپۆشییەوە. کتوپڕ یەکێك لە کیژەکان بە جووڵەیەکی زۆر شارەزا و جوان مەشقێکی گونجاو ڕێکوپێك شاڵەکەی لەسەر کارین لابرد. کارینیش قاچێکی بەرزکردەوە و لەسەر قاچەکەی تری ڕاوەستا و بە هێواشی بۆ سەرەوە بازێکی داو هاتووچوو، ڕووت و قووت بۆوە. پاشان بە شەرمەوە سەری شۆڕکردەوە و زۆر بە شەرمەزارییەکی بێگوناهانەوە چاوی بۆ زەوییەکە داخست. و هەتا بۆ ماوەیەك وای لە من کرد پەشیمان بوومەوە لەوەی ڕێم پێدا خۆی ڕووت بکاتەوە. بەڵام لەسەرەتاوە ئەمە پلانی من بوو.

ئیتر ئەو شەوە، چەند لە شەو مابوو، من وازم لە بەرپرسیاری زەوق و ئارەزوو، ڕابواردنی میوانەکانم هێنا. کاتێك ئەفسەرە مەغۆلییەکان ئەو بێئابڕوویی و بێتەربێتییانەیان لەگەڵ ژنەکانمدا دەکرد جاکۆ و ئیلشی لە پێکەنیندا کولابوون.

تەنها ترسی سەرەکی من ئەوە بوو، کە پیاوەکانی خاقان ئەو ژوورە پڕ فەرش و شتوومەکانەی ناو کۆشکەکەم پێببزانن و بیدۆزنەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من دەمزانی و بێگومان بووم لەوە ئەفسەرەکان هیچ گرنگی و گوێیەك نادەن بە دەوروبەری خۆیان. چونکە دەمزانی ئەو کچانە چی دەدەن بە ئەفسەرەکان و چییان لەگەڵدا دەکەن. منیش زۆر ئیرەییم بە ئیبیکۆ دەبرد لە کاتێکدا خێرا کارینی برد بۆ ناو جێگای نووستنەکەی خۆی. بۆ بەیانی ڕۆژی دوایی هەموو شتێك بۆ ڕۆیشتنم بۆ دیدەنی دیوانی تۆغلوك ئامادە بوو. ئیتر ئەوکاتەش میوانەکان خۆیان لە باوەشی دۆستەکانیان کێشایەوە، ئەو دۆستانەی هەرچی گەوهەر و زێڕ و زیوێکم دابوو، بەو پیاوانە هەموویان لێکێشابوونەوە. هەرکە ڕۆژهەڵات ئەو میوانانەی بە درێژایی شەو جوێنیان دەدا و ژاوەژاویان بوو، لە شاری شەهری سیبزم بردنە دەرەوە.

هەر ئەوکاتە ئیبیکۆ و پیاوەکانی بە ڕاستی لەو باوەڕەدا بوون کە ئەوان بە تایبەتی نێردراون بە دوامدا بۆئەوەی من ببەن بۆ دیوانی خاقان ئەفسەر و پیاوەکانیان لەگەڵ پاسەوانە تایبەتییەکانی مندا، کە سەد سەرباز بوون و پڕچەکیش بوون، سواری ئەسپەکانیان بوون، بار و وڵاخەکانمیان پاراست کە دیارییان بۆ تۆغلوك هەلگرتبوو. بە ڕاستی لەو کات و شوێنەدا زۆر گران بوو. بزانرێت کێ سەرکردەیە. ئایا ئیبیکۆیە یان منم؟

له ڕاستیدا ئیبیکۆ و ئەفسەرەکانی گاڵتەیان بە من دەکرد و وەکو مێردێکی گێل سەیریان دەکردم و پیاوەکانی منیش بە ئیبیکۆ و ئەفسەرەکانی پێدەکەنین و سەریان لەو فێڵ و تەڵەکەبازییە سووڕمابوو کە میوانەکانم پێی هەڵخەڵەتاندبوو. وە لە دوایشدا لە دیوانی شاهانەدا ئیلشی باسی ئەو بەخشندەیی و میواندارییە باشەی منی بڵاوکردەوە، کە لەگەڵ ئیبیکۆ و ئەفسەرەکانیدا کردبووم. لەگەڵ ئەوەشدا ئەفسەرەکانی تر بە ئیبیکۆ و پیاوەکانی پێدەکەنین و گاڵتەیان پێدەکردن. بەڵام کاتێك کاروانەکەی من نزیك سەمەرقەند بۆوە. هێشتا مێشکم ساف نەببوو، بێ زەوق و بێ ئارام بووم چونکە هێشتا کۆسپ و تەگەرەی تر مابوو ڕێگای پێدەگرتم کاتێك گەیشتینە سەر ڕووباری "فرفشان"ی نزیك شاری سەمەرقەند دوو سەرکردەی پیاوەکانی خاقان ڕایانگرتم، کە دوو فەوجی سەربازی تەواویان لەژێردەستدا بوو. یەکێك لە ئەفسەرەکان بە توورەییەوە پێی وتم:

-قەدەغەیە و ڕێگا بە هیچ تەترییەك نادرێت لەم سنوورە زیاتر تێپەڕێت.

منیش بە بڕوایەکی تەواوەوە پێم وت:

-من تەیموورم سەرداری هۆزی برلاسم و لە لایەن خاقان خۆیەوە بانگکراوم و هەڤاڵی باشم "ئیبیکۆ"م لەگەڵدایە و پارێزگاریم دەکات.

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئیبیکۆ زۆر گێل و وڕ و کەللەپووچیش بوو، بینیم سەرکردەکان دەیانناسی لەسەر قسەکەم ڕۆیشتم و وتم:

-من دیاری گرانبەهام پێیە و بۆ تۆغلوکی گەورە و بەڕێزم هێناوە. دوو سەرکردەکە قەناعەتیان نەکرد بەو قسانەی پێم وتن. بەڵام کە ناوی دیاریم هێنا سەرنجی ڕەنگ و ڕوویانم دا.. ئیتر کتوپڕ عەبدوڵڵای نۆکەرمم بانگکرد و خێرا دوو کیسەی قورسی پڕ لە زێڕی هێنا و منیش گورج بە دەنگێکی بەرزەوە دووبارە وتمەوە:

-هەروەها دیاریشم بۆ سەرکردە نازاکانیش هێناوە.

بۆ هەریەکەیان کیسەیەکی پڕ لە زێڕم دانێ. کە زۆر لەوە زیاتری تێدابوو کە لە خاقانیان وەردەگرت ئەگەر هەردووکیان بیانگرتمایە و کێشیان کردمایە بۆ لای خاقان لە کاتێکدا ئەوان بەو دیارییە زۆرەی کە دابوومنێ حەپەسابوون فەرمانی ڕۆیشتنم بە کاروانەکەم دا، و ئەو سنوورەم بڕی کە نەیاندەهێشت ئێمە بۆ دیوانی تۆغلوك پیایدا بڕۆین. پاش ئەوەی چەند کاتژمێرێك بە بەردەوامی ڕۆیشتین. کتوپڕ ئەو چادرە گەورانەمان لێدەرکەوت کە بە دەوریا، ڕانەمەڕی زۆر و شوان و ئاژەڵ و ئەسپی زۆریان بە دەورەوە بوو. بەرەو بارەگای خاقان ڕۆیشتم.

خاقان لەگەڵ کۆمەڵێك شازادەدا، لە بەردەمی دیوانەکەیدا دانیشتبوو، وەك بڵێیت چاوەڕوانی هاتنی من بکات.

زۆر بە گورجی و نەترسییەوە لە ئەسپەکەم دابەزیم و لەبەردەم تۆغلوکدا چەمیمەوە. و چەند جارێك سەلامی ڕەسمی سەربازیم کرد و وتم:

-ئەی باوکی گەورە، خاقانی بەرێز و گەورەی هەموو جیهان!! من تەیمووری کوڕی تاراغام، سەردار و شازادەی هۆزی برلاسم. من لەبەرئەوە هاتووم، ملکەچی و دڵسۆزی و گوێڕایەڵی خۆمت پێشکەش بکەم. و دیاری شیاوت بۆ بێنم و پێشکەشی بەرێزتان بکەم. ئەی تۆغلوکی گەورە، بە ڕاستی من زۆر شاد و بەختیارم بەوەی، هاتوومەتە خزمەت و دیدەنیت. ئیتر چاوەڕوانی ئیشارەتێکی خاقانم دەکرد کە هەستم. لەوکاتەدا پیاوەکانم کیسەکانیان کردەوە و ماڵ و سامانی مزگەوتی شەهری سیبزیان واڵا کرد و هەرچی تاڵانییەکی حاجی برلاس هەبوو لەبەردەم و بەرپێی خاقاندا، دایاننا. لە ڕاستیدا دیارییەکان زۆر جوان و نایاب و گرانبەها بوون. و زۆر زۆریش بوون. خاقان تەماشای دیارییە نایابەکانی دەکرد و سەری سووڕمابوو. زۆریش حەپەسابوو لە حەپەساویدا دەمی داچەقاندبوو.

لەوکاتەدا بە شێوەیەکی قین و تووڕەییەوە بەرەو ڕووی خاقان و زۆر بە قینەوە ڕووم وەرگێڕا بەلای ئیبیکۆوە وتم:

-خاقانی گەورەم، دیاریی زۆرترم هەبوو، دەمویست پێشکەشی بەرێزتی بکەم. بەڵام ئەم سەگە، کە پێی دەڵێن ئیبیکۆ کۆشکەکەمی تاڵان کرد و ژنەکانیشمی ئەتك کرد و نامووسی بردم. هەروەها دوو سەرکردە لە سەرکردە دزەکانت، لە کاتێکدا لە نزیك ڕووباری "فرفشان"دوە تێپەڕم دەکرد. دوو کیسەی قورسی پڕ لە زێڕیان لێسەندم. پاشان بە قێزێکەوە تفێکم کردە سەر زەوییەکە. و زۆر بە تووڕەیی قسەکەم کردەوە و وتم:

-گەورەی بەرێزم، بە ڕاستی من هیچ کات ئەوەم نەزانیوە کە سەگی وەکو ئەمانە لە خزمەتی تۆدا کاردەکەن. و هیچ کاتێکیش بە خەیاڵمدا نەهاتووە کە خاقانێکی وەکو تۆ ببینم قایل بێت سەرکردەی وەك ئەمانە لەناو سەرکردەکانیدا جێگابکاتەوە.

پیرەمێردە مەغۆلییە دەموچاو قەڵەوە گۆشتنەکە دووچاوە چنۆکەکەی لەسەر دیارییە نایاب و ناوازەکان بەرزکردەوە و بە پەشۆکاوییەوە تەماشای کردم. پاشان بۆ یەکەمجار پێی وتم:

-کوڕم تەیموور تۆ ڕاست دەکەیت. لە ڕاستیدا ئەو سەرکردانەی تۆ باست کردن، ئەوانە سەگن، دزن. بەڵکو ئەوانە دڕکن و لە گیانی من چەقیون بۆئەوەی خۆشی و ئارامیم لێ تێکبدەن

من زۆر سوپاست دەکەم، چونکە کارە نابەجێ و چەپەڵەکانیانت بۆ دەرخستم. هەروەها، شازادەی گەورە من زۆر سوپاسی ئەو دیارییە نایاب و ناوازانەشت دەکەم.

دوای ئەوە بە دەستەکانی چەپڵەیەکی لێدا و خێرا، شەش کەس لە شازادەکان لەبەردەمیدا ڕاوەستان. پاشان بە تووڕەییەوە سەرنجیدان و پێی وتن:

-هەرچی ڕوتبە و نیشانێك هەیە لە ئیبیکۆی بکەنەوە و هەرچی تاڵانییەکیش هەیە لە کیسەکانیدا دەریبهێنن و بیدەنەوە بە هۆزی برلاس و هەموو تاڵانییەکان هەر ئێستا بنێرنەوە بۆ هۆزی برلاس بۆئەوانەی کە ئێستا لەژێر دەستی حاجی برلاسدایە.

منیش لە مەبەست و بۆچوونی خاقان گەیشتم. پاش ئەوەی دیارییەکانی منی وەرگرت. نەیدەتوانی تاڵانییەکان لای خۆی بهێڵێتەوە. و بە ناردنەوەی ئەو تاڵانییانە بۆ حاجی برلاس کە ئێستا لە ژێر چنگیدا ڕایگرتووە، لە دواییدا دەتوانێت داوای ئەو تاڵانییانەی لێ بکاتەوە لە کاتێکدا حاجی برلاس لە شەڕدا بەرامبەری دەشکێت. منیش کارەکەیم زۆر پێ جوان بوو. بە تەواوی لە مەبەستی پلانەکەی گەیشتم و زانیم بوومەتە جێگای ڕێز و خۆشەویستی و پشتپێبەستنی تۆغلوك خان.

بەڵام هەر لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو، بە شازادەکانی وت:

-ئەو دوو سەرکردەیەش کە ئەو دوو کیسە زێڕەیان لە لای ڕووباری فرفشان موە لەم شازادەیە سەندووە لە کار دەرکەن و هەرچی پلەو پایەیەکیان هەیە لێیان بسێننەوە و هەردووکیانم بۆ ئێرە بۆ بێنن. چونکە پێویستە فەرمانیان پێبدەم، ئەو زێڕانە بدەنەوە بەم شازادە دڵسۆزەی ئێمە. منیش بەرهەڵستی قسەکانیم دایەوە، وتم:

-من دەمەوێت ئەو زێڕانە پێشکەش بە خودی خاقانی گەورە و بەڕێزم بکەم. وە هەرچی ماڵ و سامانێکم هەیە لەژێر سایە و دەستی بەڕێزتایە. من هیچ نیم تەنها خزمەتکارێکی ژێردەستت نەبێت. وەڵامی دامەوە وتی:

-نەخێر، تەیموور، ئەوەی لە تۆیان سەندووە پێویستە بیدەنەوە بە خۆت. چونکە ئەم دیارییانەت لە ڕاستیدا دیارییەکی زۆر زۆرە. تۆ هەرچی شتی بەنرخت هەبووە پێشکەشت کردووین.

لەگەڵ ئەوەی وتەکانی وای دەگەیاند ڕاست و دۆستانەیە، بەڵام بە تەواوی هەستم دەکرد قسەکانی هیچ نییە تەنها قسەی هیچ و پووچ و درۆ و دەلەسە نەبێت. بەڵام من دڵم بەو تێڕوانینەی خۆشبوو کە سەیری سەروسیمای دەکردم، چونکە دیاربوو ڕێز و خۆشەویستیم لە

چاوەکانیدا وردە وردە زیاد دەکات. مەدح و ستایشەکەی زۆر لەو ستایشەی کورغان دەچوو، لە کاتێکدا یەکەمجار کارە سەربازییەکەی پێسپاردم. دووبارە بە دەستەکانی چەپڵەیەکی لێدایەوەو فەرمانێکی تری دا وتی:

-من فەرمان دەدەم میواندارییەکی قەشەنگ و شایان بۆ ڕێزلێنانی ئەم کوڕە دڵسۆزەمان "تەیموور" سازبکەن. ئێمە هەموومان لەم شەوەدا پێویستە زۆر بە ڕێزەوە پێشوازی و میوانداری باشی بکەین. و هەموو پیاوێکیش پێویستە وەك برای خۆی ناوی بەرێت و هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکات.

دوو ڕۆژی تەواو، و بەردەوام لە میوانداری و ئاهەنگ گێڕاندا بووین. سەرکردە و سەرداران و شازادەکانی تۆغلوك پێشوازییان لێدەکردم و بانگیان دەکردمە کۆڕ و کۆمەڵەکانی خۆیانەوە.

جاکۆ و ئیلشیش زۆرێك لە فێڵ و تەڵەکەبازی و شارەزاییەکانمیان بۆ مەغۆلەکان گێڕایەوە.

مەغۆلەکانیش زیاد لە هەموو شتێك شەیدای فرەفێڵ و تەڵەکەبازی بوون. ڕێ و شوێن و ڕێزم لە پێش چاوی جەنگاوەرەکاندا زۆر بەرزبۆوە. پیاوەکانی تۆغلوك زۆر بە ئیبیکۆ پێکەنین و گاڵتەیان پێکرد. کاتێك لەو لێدانە گورجك بڕە کەیشتن کە لە شامالکم دابوو. بەو هۆیەوە توانیم شازادە شێرێزا لە جنگ و باوەشی باوکیدا بۆ خۆم بەدەستبهێنم. هەموویان دەستیانکرد بە هەلهەلە و چەپڵەلێدان بۆم.

تۆغلوکیش سەرنجی ئەو ڕێز و گەورەییەی منی دا کە سوارەو شازادەکان بەرامبەر من هەیانبوو. بەمەش زۆر لە ڕێز و شانازی و سەرنجی تۆغلوکم بۆ خۆم ڕاکێشا، هەر لەوکاتانەدا دەنگوباسمان پێگەیشت کە دوو سەرکردەکەی لە نزیك ڕووباری "فرفشان"ەوە مۆڵگەیان بەستبوو خۆیان نەدابوو بە دەستەوە و فەرمانی تۆغلوکیان جێبەجێ نەکرد و لەگەڵ فەوجە سەربازەکانیاندا بەرەو ناوچەی ئەلمالیك هەڵاتبوون. و لە ڕێگای هەڵاتنیاندا، دەستیان کردبوو بە دزی و ڕاووڕووت و وێرانکاری ئەو زەوی و زارانەی پێیدا تێپەڕیان کردبوو.

ئیبیکۆش شەوێ لەگەڵ پیاوەکانیدا هەڵاتبوون بۆ ئەوەی بچنە ناویانەوە و پەیوەندییان پێوە بکەن.

ئاژاوە و ئانارامی لەناو هەموو سەربازگەکەدا ڕوویدا.

ئیتر لەبەرئەوە تۆغلوك تەختی شاهێنشاهی گواستەوە بۆ ناو سەمەرقەند، چونکە سەمەرقەند شوورا و دیوارەکانی زۆر قایم بوون.

زیاد لە نیوەی جەنگاوەرەکانی نارد، بۆئەوەی دوای هەلگەڕاوە چەتەو ڕێگرەکان بکەون. مـن و پیاوەکانیشمی لەگەڵ خۆیدا بردو تیپەکەم —واتە تیپەکەی شـەهری سیبزـی کـرد بـە پاسـەوانی تایبەتی خۆی و فەرماندەیی ئەو تیپەی دایە دەست من. ماوەی ئەو هاوینە و تاکو نیوەی پایزیش من لە سەمەرقەندا بە شادی و خۆشی ژیام و تامی ژیانی بەختیاریم کرد.

بەختیاری و خۆشییەکی وا کە بە خەیاڵمدا نەدەهات لەسەر گۆی زەویدا هەبێت.

دیوان و عەرشی خاقان پڕبوو لـە شادی و خۆشی و بـە جوانـترین شتی جـوان و نـاوازە و هونـەری شاز، کـە بـەناوبانگترین هونەرمـەندە جیهانییـەکان هێنابوویانـە کایـەوە و دروسـتیان کردبـوو و ڕازاندبوویانـەوە. بـە ڕاسـتی ئـەو کۆشـك و دیوانـە ئـەوەندە جـوان و نایـاب و سەرسووڕمێن بوو، لە جوانی و قەشەنگیدا ببوو بە شتێکی شاز و سەرسووڕهێنەری ناوازە.

ڕێگاگر و هەلگەڕاوەکان لە باکوورەوە دەستیانکرد بـە کۆکردنـەوەی هێـزی زۆر، وایـان لێهات هەڕەشەیان لە تەخت و پایتەختی تۆغلوك دەکرد.

پێش ئەوەی وەرزی زستان بێت تۆغلوك زۆر شڵەژاو تووشـی دڵەڕاوکێی زۆر بـوو. لەبەرئـەوە داوای لە ئەنجومەنەکەی کرد، کۆبوونەوەیەکی فراوان پێکبهێنن.

لەو کۆبوونەوەیەدا بۆ شازادەکانی دووا و وتی:

-وەکو پێم ڕاگەیەندراوە و بیستوومە هەراوهوریا و ناکۆکی لە نیشتماندا پەیدا بووە، منیـش ئەی زانایان و جەنگاوەرە دلێرەکان دەمەوێت پرس و ڕاتان پێبکەم و گوێم لـە ئامۆژگارییـەکانتان بێت. یەکێك لـە شازادە پیرەکان، کاتێك نـاوی نیشتمانی هێنـا، چاوەکانی پڕبـوو لـە فرمێسـك و خەیاڵی شادی. وەڵامی دایەوە و وتی:

-ڕێمان پێبـدە پێش ئـەوەی زستان دابێت و بـەفر ببارێت با بگەڕێینـەوە بـۆ نیشـتمانمان و شازادە ئەلیاس وەك لەمەوپێش فـەرمانڕەوایی ئـێرەی کـردووە ئێسـتاش دەتوانێـت فـەرمانڕەوایی ئێرە بکات.

خاقانیش بە شێوەی پرسەوە تەماشای دەوروبەری خۆی کرد و وتی:

-بەڵام کێ لێرە دەتوانێت بمێنێتەوە و بیپارێزێت و پارێزگاری لێبکات؟

سوارچاکێکی چینـی کـە پیـاوێکی کورتـەباڵای ماسوولکە گـەورە و بـەهێز بـوو، لـەناو وڵاتـی چین و شووورای چینی گەورەوە هاتبوو. وەڵامی دایەوە وتی:

-بێگومان هەر تەیموورە کە پیاوی شایستەی ئەم کارە بێت. چونکە لە کاتێکدا گشت سـەردارو شازادەکانی شاری سەمەرقەند وەك باڵندەی مراوی کە سێبەری هەڵۆیەکی چنگ تیـژ بەسـەریاندا

ڕادەبووریێت، پەرشوبڵاومیان لێکرد. هەر تەنها تەیموور ئەو پیاوە بوو بە چاکی و ڕاستی و خۆڕاگرییەوە لەسەر ملکەچی و جێبەجێکردنی کار و فرمانەکانی مایەوە و خۆی ڕاگرت و هەڵنەهات.

تۆغلوکیش زۆر ڕێزی قسە و بیروڕاکانی ئەم سوارە چینییەی دەگرت و بڕوای بە ڕاست و دروستی پەند و ئامۆژگارییەکانی هەبوو. دەشیزانی کە پیاو دەناسێت و شارەزایی تەواوی هەیە لە ڕاستی و ناسینی پیاواندا. وەڵامی دایەوە و وتی:

-بەڵێ تەیموور ئیسپاتی کرد کە کوڕێکی دڵسۆزی ئێمەیە و بە ڕاستیش گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئێمەیە. شازادەیەکی تر وتی:

-شازادە تەیموور زۆر زۆر زیرەکە و لە ئازایەتیشدا وێنەی نییە.

ئیتر تۆغلوك ڕووی تێکردم و لێی پرسیم وتی:

-کوڕی گوێڕایەڵم، شازادە تەیموور بۆ ئەم کار و مەبەستە چی دەڵێیت؟!

-ئۆهـ باوکی گەورە و بەڕێزم تۆ لە هەردوولاوە گەمارۆ دراویت. لەبەرئەوە بڕۆ، بۆئەوەی بە هانای پایتەختەکەتەوە بچیت. بەڵام من لە باشوورەوە، وەك کوڕێکی دڵسۆز و گوێڕایەڵ دەتپارێزم و بەردەوامیش گوێڕایەڵ دەبم بۆ خانەوادەی خاقانی گەورە.

-کوڕی باشم تەیموور تۆ قسەی ڕاست و باش دەکەیت کاریش هەروا دەبێت. ئاوەها تۆغلوك کردمی بە سەرکردەی گشتیو فەرماندەی دە هەزار سەرباز و مۆری ڕەسمی دامێ کە لە سەر پارچە پۆڵایەك هەڵکەندرابوو. ئیتر پاش ئەوە ڕۆیشت و لەگەڵ دەستوپێوەندەکانیدا گەڕانەوە و ڕەویان کرد منی وەك پارێزگارێکی دەست پاك بۆ پاراستنی سەمەرقەند جێهێشت.

* * *

## هەوڵدان بۆ کوشتنم

کاتێك کاروباری فەرمانڕەواییم لە "سەمەرقەند"دا بە تەواوی جێگیر بوو. نامەیەکم بۆ حسێن نووسی بۆئەوەی "ئەلجای"یم بۆ بێنێتەوە و بەڵێنی ئەوەم پێدا شەهری سیبزی بدەمێ و بیکات بە بارەگای خۆی چونکە شازادەیەکی مەغۆلی کە لە "تیبت"دوە هاتبوو کابوولی لێسەندبووە و داگیری کردبوو. لەسەر تەخت و جێگا و ڕێگای حسێندا دانیشتبوو. حسێنیش بە داواکارییەکەم قایل بوو. خێرا لە کۆشکی سالییەوە بۆ لام هات.

هەروەها داواشم لە شێخ عەلی کرد، بێتەوە بۆ لام. بەڵام لەو کاتەدا شامالك تووشی ئێش و ئازارێکی زۆر ببوو، لەبەرئەوە پێویستی زۆری بە شێخ عەلی هەبوو، نەیتوانی بێتەوە بۆ لام. شامالك وایدەزانی کاروباری ژیانم هێشتا بە باشی جێگیر نەبووە و چاك نییە.

خاتوو شێرێزا نامەیەکی جوان و ئاسکی بۆ ناردم و لە نامەکەیدا ئەوەی دەربڕیبوو، کە زۆر بیرم دەکات و حەزدەکات بێتەوە بۆ لام و پەیوەندی بە بارەگای شاهانەمەوە بکات.

بەڵام لە نامەکەشیدا ئەوەی دەرخستبوو، لەبەر منداڵەکانی لە هیرات دەمێنێتەوە. چونکە لێرە هەست بە دڵنیایی زیاتر و ئاسایشی باشتر دەکەن.

هەرکە بیستم حسێن خەریکە بگاتە دەروازەی ئاسنین و پیایدا ڕەت دەبێت. منیش لە شەهری سیبزەوە لەگەڵ تیپە تایبەتییەکەی خۆمدا کە جوانترین جلوبەرگیان لەبەردا بوو بۆ پێشوازییان بەرەو پیری ئەو سەربازانەی کە شاری کابولیان لە دەستدا بوو، چووین. تۆزێك بەفریش باریبوو، دۆڵی ناوچەکەمی داپۆشیبوو. سەربازەکانی من بە خۆشی و شادییەوە، وەك لە ئاسمانەوە نێردرابن بۆ لای جەنگاوەرەکانی حسێن کە هیلاك و ماندو و جل وبەرگ دڕاوبوون چوون و پێشوازیان لێکردن. بەهەرحاڵ لە چاوەکانی حسێندا ڕەنگدانەوەیەکی تێکەڵ بە ڕێز و ئیرەیم خوێندەوە، کاتێك بە سەرسامییەوە تەماشای من و جوانی و ڕێکوپێکی تیپەکەمی دەکرد.

بەڵام ئەلجای هەروەك عادەتی خۆی زۆر بە دڵگەرمی و پەرۆشەوە، تەماشای دەکردم، کاتێك بە یەك گەیشتین ئەسپەکەی ڕاوەستاند و لەسەر پشتی ئەسپەکەیەوە خۆی خوارکردەوە بۆ لام و باوەشی پیادا کردم و زۆر بە کوڵ و گەرمییەوە سڵاوی لێکردم. هەرکە لەشولاری ئەلجای بەر لەشم کەوت، هەستم بە کەفوکوڵ و خۆشی و شادییەکی بێ وێنە کرد بە گیان و هەست و دەمارەکانمدا ڕەت دەبێت.

ئەوکاتەی بەرەو کۆشکی سپی دەڕۆیشتین. نەمتوانی هیچ بکەم لەوە زیاتر کە دەست بخەمە ناو قژی و دەست بە شان و مل و سنگیدا بێنم.

بە حسێنم وت، دیاریی زۆر زۆرم بۆ ئامادە کردووە و ئەو پلان و ڕاو و تەگبیرانەم پێ وت، کە ئامادەم کردبوو، بۆی تاکو لە دواییدا پشتی پێببەستێت.

دڵشاد[٥] ژنی حسێن و کچی مامی ئەلجای کە هەر لە خوشکی بچووکی ئەلجای دەچوو. لە تەنیشتمانەوە بە سواری دەڕۆیشت و چاوەکانی جوان تێبڕیبووم. یاخود زۆر سەرقاڵی

---

* لە دەقەکەدا ناوەکە نووسراوە –دیلشاد– بەڵام من وا بە ڕاست دەزانم کە ناوەکە دڵشادە نەك دیلشاد لەبەرئەوە من دڵشادم نووسی و ناوەکەشی لە ناوێکی کوردییەوە زۆر نزیکە.

تەماشاکردنم بوو، کە من بەو شێوەیە بە زۆری گرنگیم بە ئەلجای دەدا و ڕێزم دەگرت. تەماشای هەموو جووڵانێکی دەستەکانمانی دەکرد.

بەو دەستبازی و خۆشەویستییەی من و ئەلجای هۆش و گۆشی لا نەمابوو. دڵشاد بە دڵ هاوبەشی ئەو خۆشی و شادییەی ئەلجای دەکرد، کە گەڕابۆوە بۆ ماڵ و حاڵی خۆی. ئاوەها ئەلجای و کچە مامەکەی ئەوەندە یەکتریان خۆشدەویست بە پلەیەك بوو، کە هەرکامێکیان لە خۆشیدا بوونایە، ئەوی تریان بە هی خۆی دەزانی.

کاتێك گەیشتینە کۆشکی سپی و لە ئەسپەکانمان دابەزین دڵشاد خۆی جیهانگیری بۆ هێنام و پێشکەشی کردم. جیهانگیر منی نەناسی. وا دیار بوو کە تەماشای دڵشاد و ئەلجای دەکرد وایدەزانی یەك ژن و یەك کەسن.

بەڵام لەو شەش مانگەی ڕابوردوودا، وشەی زۆر فێرببوو هەر دەیوتەوە و زۆر درێژ و لاوازیش ببوو.

کاتێك عەبدوڵڵای نۆکەرم دیارییەکانی دەهێنا و بەسەر ئەفسەرەکانی حسێندا دابەشی دەکرد. منیش ژمارەیەك دیاریم پێشکەش بە ژنەکەم و کوڕەکەم کرد. وردە وردە کوڕەکەم لەگەڵمدا ڕاهات و دووبارە بووینەوە بە هەڤاڵی یەکتری. ئەلجای بە زۆر شێوەی جۆراوجۆر خۆشی و شادی خۆی بە گەڕانەوەی بۆ ماڵ و حاڵی خۆی دەردەبڕی، جارێك بە کوڵ پێدەکەنی و هەندێ جاریش فرمێسك لە چاوەکانیدا بە خوڕ بەسەر کوڵمەکانیدا دەهاتەخوارێ.

ئەو شەوە لە ژووری نووستنەکەمدا، شەوێکی یەکجار خۆشمان ڕابوارد.. ئەلجای لە جێگاکەی مندا ڕاکشابوو، جیهانگیریش لە جێگاکەی خۆیدا نووستبوو. دایکی عەبدوڵڵاش خزمەت و چاودێری دەکردین. و خۆی بۆ گشت خزمەتێکی ئێمە تەرخان کردبوو.

بۆ ڕۆژی دوایی بە شانازی و گەورەییەوە، ئەوەم پیشان ئەلجای دا، کە چۆن وڵاتەکەمم لەو وێرانکارییە پاراست. ئەوەش بەوەی کە دانم نا بە خاقاندا کە گەورە و سەرداری منە. هەروەها ئەو عەمار و گەنجینانەم پیشاندا کە تایبەت بوون بۆ گەنم و دەغڵودان. و پڕبوون و جمەی دەهات لە گەنم و جۆ و دەغڵودان. هەروەها ئەو منداڵە تێروپڕ و لەش ساغانەشم پیشاندا کە بە خۆشی و شادییەوە لەسەر ئەو بەفرەی ڕێگای سەمەرقەندی داپۆشیبوو خلیسکانە و یارییان دەکرد. هێمنی و ئاسایش باڵی کێشابوو بەسەر وڵاتەکەمدا و خۆشی و شادی لە هەموو لایەکدا و لە ڕووی هەموو کەسێکدا دیار بوو.

بەشبەحاڵی منیش ئەوەی جێگای دڵنیایی و خۆشی بێت تەنها ئەلجای بوو. ئەلجای لە کاتێکدا لەگەڵ مندا سواری ئەسپەکەی ببوو، تەماشای کردم و پێی وتم:

-من زۆر شادومانم چونکە ڕۆژانی ناخۆشی و نەهامەتی تێپەڕ بوو، کۆتایی هات. وا منیش دووبارە گەڕامەوە بۆ ماڵ و حاڵی خۆم.

-ئەلجای تۆزێك لەسەرخۆبە و پەلە مەکە، چاوەڕوان بکە تاکو سەمەرقەندت پیشاندەدەم و دەیبینیت.

-تەیمووری خۆشەویستم من چاوەڕوان دەکەم، ماڵ و نیشتمانی من ئەو شوێنەیە کە تۆی تیا نیشتەنیت. من جارێکی تر هەرگیز لێت دوورناکەومەوە.

منیش سوێندم بۆ خوارد هەتا لە ژیاندا بین ئەویش هەرگیز لە بەهەشتەکەی من جیانابێتەوە.

ئەوکاتەی سواری ئەسپەکانمان بووین و بە شەقامە پانەکانی سەمەرقەندندا دەڕۆیشتین ئەلجای لە چاوەکانی منەوە سەمەرقەندی دەبینی. منیش بەدەست ئاماژەم بۆ بازاڕ و دووکانەکان کرد و پیشانم دا. ئەو دووکانانەی کە پڕبوون و جمەیان دەهات لە قوماشی ئاوریشمی ڕەنگاوڕەنگ و ڕازاوە بە گوڵی ڕەنگاوڕەنگ و جوان. پڕبوون لە خشڵی زێڕ و زیو و مرواری و یاقوت. و بەڵێنم بە ئەلجای دا کە هەرچییەکی بوێت و ئارەزووی لێیەتی، لە کاڵای ناو دووکان و شاردکەدا بۆی دێنم و پێشکەشی دەکەم، چونکە شارەکە و هەرچی تێدایە هەمووی هی منە. کاتێك گەیشتینەوە ناو کۆشکەکەمان، هەرچی شتێکی ویست دامێ و بەڵکو هەرچی شتێکیش کە من ویستم و حەزم لێکردبێت دامێ و پێشکەشیم کرد. لەگەڵ ئەو خۆشی و شادییەو ژیانە خۆشەی کۆشکەکەمدا و ئەو سەروەت و سامانە زۆرەمدا هەموو کاتێکیش بیری ئەلجایم دەخستەوە کە چۆن ژیان بە خۆشی و بەختیاری دەبەینە سەر. ئەلجای ئەو کاتە هەستی زیاتر بە شادی و خۆشی دەکرد، کە پێکەوە دووبەدوو لەگەڵ جیهانگیردا لەناو جێگەدا ڕادەکشاین.

ماوەی پێنج ساڵی تەواو پێکەوە چاودێری جیهانگیرمان کرد وردە وردە گەورە بوو. لەو ماوەیەدا زۆر دیاری و شتی یاریکردنم پێشکەش کرد و شیرێکی بچووکیشم دایە، هەر لە شیرەکەی خۆم دەچوو. هەروەها ئەلجای زۆر تووتکە سەگی بچووك و پشیلەی بۆ هێنا تاکو یاریو شەڕیان لەگەڵدا بکات. جیهانگیریش زیاتر دیارییەکانی دایکی حەز لێبوو وەك لە دیارییەکانی من. چونکە ئەو زیاتر هاوڕێی بوو. بەڵام من زۆر گوێم بەوە نەدا. لەوەش دڵنیابووم

کە پێویستی بەوە نییە، فێری شیربازی و ڕێگای بەکارهێنانی ببێت. بەڵام ئەو جوانووە بچووکەی کە دابوومێ زۆری خۆشدەویست.

زۆر جار پێکەوە هەرسێکمان سواری ئەسپەکانمان دەبووین و لە سنووری دیوارەکانی شاردا پیاسەمان دەکرد. هەندێ جاریش پێکەوە لە گرد و دۆڵە نزیکەکاندا ڕاومان دەکرد. لە کاتی گەڕان و ڕاوکردنەکەماندا زۆر دوور نەدەکەوتینەوە، چونکە دەمزانی لەودیوی شووراکانی "سەمەرقەند"دا چی ڕوودەدات و چی دەکرێت.

هەموو ساڵێك ژمارەیەکی کەم لە شازادەکان باجیان بۆ دەناردم، منیش لەو باوەڕەدا بووم بۆ پاراستنی دەستەڵاتی خۆم پێویستە زۆر فشار و داواکاری و شتی زۆر نەسەپێنم بەسەر ژێردەستەکانمدا.

زۆریش لەو سەرکردانەی خاقان لە شارەکاندا داینابوون، بە زۆری بازوو و باج و گومرگیان لە خەڵك دەسەند.

زۆر دەنگوباس و قسەم دەبیستەوە کە دەیانوت، ئەو سەرکردانە هەندێ جار هێرش دەکەنە سەر دراوسێکانیان و شارەکانیان تاڵان دەکەن و دەستدرێژی دەکەنە سەر ژنەکانیان و ئەتکیان دەکەن. بەڵام زۆربەی زۆری ئەو سەرکردانە و دراوسێکانیشیان لە دەستوپێوەندەکانی خاقان بوون.

من تەنها لە سەمەرقەند بەرپرسیار بووم.

سەردار و شازادەکانی تەتەر وردە وردە بەهێز و توانابوون و هێزیان زیادی کردو دەستکەوتو داهاتیان زۆر بوو. یەك لە دوای یەك بەرامبەر ئەو کردەوە ئاسایی و ڕەفتارە باشەم لەگەڵیاندا. لووتیان بەرزکردەوە و لە خۆبایی بوون. و خۆیان بۆ ناو قەڵا و سەنگەرەکانیان کێشایەوە و هەرچی هێزێکیان کە لە خزمەت من و لەناو هێزەکانی مندا بوون کشانەوە.

منیش لە لایەن خۆمەوە خاقانم دەپاراست و لە قسەی دەرنەدەچووم و ژیانێکی خۆش و گەورەیی و سەروەریم لە بارەگای شاهانەیدا هەبوو. تاکو ئەو ڕۆژە هات کە تیپێکی تەواوم لە پیاوان و جەنگاوەران بۆ خۆم پێکهێنا. بەڵام بە داخەوە پێویستە دان بەوەدا بنێم ڕۆژانی شادیو بەختیاریم زۆر بە خێرایی دەڕۆیشت و تێپەڕی دەکرد. ئیتر ڕۆژانە سواری پشتی ئەسپەکەم دەبووم و مەشقی سەربازیم بە سەربازەکانم دەکرد. نوێنەری تایبەتیم نارد بۆ لای ئەو خێڵو هۆزانەی کە تا ئەو کاتە منیان خۆشدەویست و لەگەڵمدا دۆست بوون و دووبارە داوای ملکەچیو

دەرنەچوونیان لە فەرمانەکانی خۆم لێکردن. و داوای ئەوەم لێکردن کە پیاوەکانیان گوێڕایەڵی فەرمانەکانی لەشکرەکەم بن.

حسێنیش لەسەر گوێڕایەڵی و دەرنەچوونی لە فەرمانەکانم مایەوە و زۆر بە شارەزایی و چاکییەوە ناوچەکەی دەپاراستم. لە "کارشی"دا موسا ملکەچی خۆی و دەرنەچوونی لە فەرمانەکانم ڕاگەیاند.

بایەزید و حاجی برلاس داوایان لە هێزەکانیان کرد، لەو خێمانەی کە لە ڕێگای شەهری سیبزدا هەڵیاندابوو کۆببنەوە. لەبەرئەوەی بایەزید و حاجی برلاس لەمەوپێش سەردار و شازادەی سەمەرقەند بوون. وتیان ئێمە ناوێرین ئێستا بێینەوە ناو شارەکە. لەبەرئەوە داوایان لە منیش کرد کە لە چادرەکانیاندا لەگەڵیاندا کۆببمەوە. منیش بە ڕەزامەندی خۆم قایل بووم کە لەگەڵیاندا کۆببمەوە.

هەر ئەوکاتە ئەلجای وتی:

-منیش دەمەوێت لەگەڵتا بێم، چونکە بایەزید مامەمە و دەمەوێت بیبینم.

-ئەلجای زۆر باشە حاجی برلاسیش مامی منە و ئەمەش دەبێتە کۆبوونەوەیەکی خێزانی.

-با جیهانگیریش لەگەڵ خۆماندا ببەین و پێش گەڕانەوەمان سەرێکی حسێن و دڵشادیش دەدەین.

لەسەر داواکارییەکانی قایل بووم. چونکە منیش دەمویست چاوم بە حسێن بکەوێت و قسەی لەگەڵدا بکەم. جاکۆم لە شوێنی خۆم دانا و کردم بە فەرماندەی گشتی سەمەرقەند و تیپە تایبەتییەکەی خۆمم پێش خۆم دا و کەوتمە ڕێ. تاکو لەگەڵ هەردوو سەرداری هۆزی برلاس و جالیردا کۆببمەوە. کاتێك گەورەیی و فراوانی چادرەکانیانم بینی تێگەیشتم لە ژیانێکی خۆشی و هێمنیدا دەژین. پیاوی زۆر و سەروەت و سامان و موڵك و ماڵاتێکی زۆریان هەبوو. مێگەلە مەڕی قەڵەو و زۆریان هەبوو لەو پاوەنانەدا و لە دەوروبەری جۆگەکاندا دەلەوەڕین و بە دەوروبەری چادرەکانیانەوە بوون. ئەسپی ڕەسەنم بینی دەلەوەڕین و بە کەیف و زەوقەوە غاریان دەدا.

منیش زۆر کەیف خۆش بووم کاتێك ئەم دوو هاوپەیمان و پشت و پەنا بەهێزانەم بینی!!

ئیلشی تیپەکەمی برد بۆ نزیك ڕووبارەکەوە و ئەلجای جیهانگیری لەگەڵ عەبدوڵلادا ڕەوانە کرد.

ئێمەش لەگەڵ بایەزیدا بۆ ناو حادری سەرکردایەتی ئەنجومەن چووین. لە دەرگای چادری ئەنجومەنی سەرکردایەتییەوە حاجی برلاس بە گەرمییەوە پێشوازی لێکردم و سڵاوی لێکردم و پێی وتم:

-تەیمووری برازام، سەردار و شازادەی سەمەرقەند بەخێربێت و سڵاوت لێبێت.

هەموو لەسەر پشتی ئەسپەکانمان دابەزین و وەڵامی حاجی برلاسم دایەوە وتم:

مامی بەرێزم منیش زۆر بە گەرمییەوە رێز و سڵاوت پێشکەش دەکەم. و حەزمکرد ئەوەی بیر بخەمەوە کە من نوێنەری خاقانم و دەستەڵاتێکی گەورە و بەرزم هەیە. وتم:

-خاقان رێز و سڵاوت لێدەکات.

بێ ئەوەی هیچ گوێ بداتێ و بەبێ ئەهمیتییەکەوە پێی وتم:

-"خاقان.. بەڵێ.. منیش گوێڕایەڵ و لەژێر فەرمانی خاقانی گەورە و باوکی باشمدام".

پاشان چووینە ناو چادرەکەیەوە. ژوورەکە شێوە تاریکێك بوو. کاتێك چاوم لەگەڵ رووناکاییە کەمەکەدا راهات توانیم چەند پیاوێکی چەکدار ببینم، هەندێکیان بە چۆکدا هاتبوون و هەندێکیان بە دەوری ژوورەکەی ناودوەدا راوەستابوون.

حاجی برلاس زۆر بە رێز و حورمەتەوە ئەلجای خێزانمی بەولای دەستی راستی کورسی تەختەکەیەوە دانیشاند. و منیش لە نزیك خۆیەوە بە چۆکدا دانیشتم. بایەزید زۆر بە وریایی و ئاگاهییەوە، چوار فەرماندەکەمی لەو ژوورەدا دانا، کە یەکتریمان تێدا بینی. منیش تۆزێك ترس دایگرتم. و هەستمکرد ئەلجای وردە وردە دێت بە لامەوە. منیشرووم کردە مامە حاجیم و پێم وت:

-مامە هێزێکی چاك و گەورەت هەیە.

-بەڵێ ئێمە لەژێر سایەی فەرمانڕەوایی تۆدا، دەوڵەمەند بووین و شاد و بەختیارین.

-ئەمە من شادومان دەکات، کە دەبینم یەکێك لە خزمانم لەم رۆژە ئاژاوانەدا بەم شێوەیە بە هێز و توانابێت.

-لە راستیدا ئەمە راستە، چونکە هەموو وڵاتی تەتەر لە حاڵەتێکی ئاژاوە و تێکچوونێکی ترسناکدا دەژین.

-من شادومانم بە هاوپەیمانی بەهێزی وەکو تۆ و وەك بایەزیدی قارەمانی خزم و مامی ژنەکەم.

لەناو کۆڕەکەدا جووڵەیەکی سووکی تووڕەیی روویدا، و لەناو یەکێك لە جەنگاوەرە دانیشتوانەکاندا گوێم لە پێکەنینێکی گاڵتەپێکردن بوو. ئەلجای لەسەر زەوییەکە چڵەپووشێکی هەڵگرت و بە سوعبەت و گاڵتەکردنەوە دای بە لووتمدا و لووتی پێخوراندم. دەستیم لە دەم و

چاوم دوور خستەوە و پێکەنینێکم لە ڕوویدا کرد، پاشان ئەلجای چڵەپووشەکەی هەڵگلۆفت و تووڕی دا.

هەر لەم کاتەدا حاجی برلاس وەڵامی دامەوە، وتی:

-بیستوومە هێزەکەت تا بێت کەم دەبێت و بێهێز دەبێت. لەبەرئەوە وامان زانی تۆ پێویستت پێمانە.

-ئۆه، نەخێر ئێستا دە هەزار سەربازم لەژێر دەستدایە بەڵام زۆر شادومانم بەوەی کە هاوپەیمانەکانم بەهێزن و دەتوانن پێش ئەوەی هێزەکەم بگات، بەرگری لە تیرە و هۆزەکەی خۆیان بکەن.

-بەڵێ، ئێمە دەتوانین بەرگری لە تیرەو هۆزەکانمان بکەین.

بایەزید زۆر فێڵبازانە و شارەزایانە توانی لەگەڵ هەریەکێك لە فەرماندەکانمدا، دوو سێ پیاوی خۆی لە دەوریان دابنێ و بە تەواوی هەریەکەیان لەوی تریان جیابکاتەوە و دوور لە منەوە داینیشاندبوون.

ئەلجای هەمدیسان چڵەپووشێکی تری گرت بە دەستەوە و هەمدیسان هێنای بە لووتمدا. منیش چڵە پووشەکەم لێوەرگرت و خستمە دەممەوە و جووم. بینیم کە من وامکرد ئەلجای زۆری پێ خۆشبوو.

ئینجا حاجی برلاس لەسەر قسەکەی ڕۆیشت و وتی:

-ئێستا ئێمە لە هەموو کاتێك بەهێزترین. ئەم سەروەرییەش دەگەڕێتەوە بۆ تۆ.

سەرنجم دا دەنگی گۆڕا، و ئەو شێوە دۆستایەتییە دەستکردەی تیادا نەما. سەرکردەکانی منیش خۆیان کۆکردەوە و بەرەو کورسی عەرشەکە هاتنە پێشەوە، هەستم کرد ئەوانیش هەریەکەیان دەرکی کردبوو کە ئەنجوومەن مەبەستی ئەوەیە من بکوژن.

بایەزیدیش بە شڵەژاوییەوە تەماشای ئەلجای دەکرد و زۆر بە قین و تووڕەییەوە تەماشای دەوروبەری ژوورەکەی دەکرد. و شك و گومانی زۆری لەوە بوو کە ئەگەر زەرەر بە ئەلجای بگەیەنێت، قین و خەشمی هۆزەکەی بەسەردا دەڕژێت. چونکە ئەلجای لای گشت پیاوێکی ئەو هۆزە شازادەیەکی زۆر گەورە و بەڕێز بوو.. بیرم لە ڕێگایەك کردەوە کە بتوانم بە هۆیەوە پێش ئەزدی من و ئەلجای لێك بکەن و لە یەکترمان دووربخەنەوە، ڕابکەم.

هەر لەو کاتەدا ئـەلجای سەری هێنا بـە لامـەوە بـە هێواشی بـە گوێمـدا چرپاندی، تـەیموور کارێ بکە لووتت بپژێت و خوێنـی لێبێـت. بـێ ئـەوەی بهێڵم ئامـادەبووان هەست بـە قسـەکەی ئەلجای بکەن. ڕوومکردە حاجی برلاس و وتم:

-خاقان زۆر پێخۆشحاڵ دەبێت کە بزانێت وا هێزت زیادی کردووە.

بە ساردییەکەوە وەڵامی دامەوە و خۆی خوارکردەوە بۆ نـاو ژوورەکـەی نـاوەوە، تـاکو بزانێـت لە ژوورەکەدا کار چۆنە.

-ئێمە بە هێزی خۆمـان دەتوانـین خاقـان بپارێزین. منیش هـەر لـەو کاتـەدا بـە دەسـتەکانم ڕووی خۆم داپۆشی و چڵەپووشـەکەم لـە دەمـم دەرهێنـا و کـردم بـە نـاو کونـە لووتمـدا و وا خۆم پیشاندا کە هەر چڵە پووشەکە دەجووم. هەرکە دەستم لابرد، دڵۆپێك خوێـن کەوتـە سـەر لێوم. ئەلجای بە پەرۆشەوە بە دەنگێکی بەرزەوە قیژانی:

-ئای خۆشەویستەکەم، بەسەزمان خۆ لووتت خوێنی پێدا دێتە خوارێ هەستە وەرە لامەوە با یارمـەتیت بـدەم. پارچـە شاڵێکی گـرت بـە دەسـتەوە و لووتـی پێداپۆشـیم و ڕوویکـردە حـاجی و پێی وت:

-تۆزێك ڕێمان پێبدە با بچینە سەر جۆگە ئاوەکە و لووتی بشۆم. پێش ئـەوەی هیـچ پیـاوێکی تر لە شوێنی خۆی بجووڵێت ئەلجای لە دەرگایەکی تەنیشتەوە، بـۆ لای جۆگەکـە بـە تونـدی پـاڵی پێوەنـام. ئیـتر زۆر بـە خێرایی لـە پشت چادرێکەوە بـە هـەموو هێزێکمانــەوە بـۆ لای تیپەکـەم ڕامانکرد ماوەیەك بەسەردا تێپەڕیو لەو ماوەیەدا گوێمان لە هیچ شتێك نەبوو. پاشان لەناو ئـەو چادرەوە کە لێوەی هاتبووینە دەرەوەو گوێمان لە دەنگی شمشێر بـە یـەکدادان بـوو. ئێمـەش تـاکو هەموو چادرەکانمان جێنەهێشت، ئاوڕمان لە دوای خۆمان نەدایەوە. کاتێك غیرەتم دایـە بەرخۆم و ئاوڕم بۆ دوای خۆم دایەوە بینیم پیاوەکانی —حاجی برلاس- بە یـەکدا دێـن و لەوبـەری جۆگـە ئاوەکەوەو لە دوای چادرەکانەوە لەناو سێی چنارەکاندا ڕادەکەن.

کاتێك ئیلشی ئێمەی بینـی بـەرەو ڕووی ئـەو ڕادەکـەین، بـە ئەسـپ و پاسـەوانەکانەوە بـەرەو پیرمـان هـات، پێش ئـەوەی دوژمنـەکانمان ئـەو ڕێگایـە بزانـن کـە ئێمـەی لێـوە هـاتبووین خـێرا شـەیپوورچییەکان فوویـان کـرد بـە شـەیپوورداو تیپەکـەم کۆبوونـەوەو ئامـادەی شـەڕ و کوشتار . ون.

پیاوەکانی —بایەزیدیش ڕێگای سەمەرقەندیان گرتبوو. خێرا لەگەڵ ئـەلجای و جیهانگیردا سواری ئەسپەکانمان بووین و ڕوومکردە ئیلشی و پێم وت:

-دەی خێراکەن و سواری ئەسپەکانتان بن و بەرەو شەهری سیبز خێرا غاردەن.

هیچ زۆری نەخایاند، سەربازەکانم گورج بە هەموو هێز و توانایانەوە بەرەو قەلاکەی حسێن لە شەهری سیبز غاریاندا.

بەلام حاجی برلاس و بایەزید جالیر دوای سەربازە تایبەتییەکانی من نەکەوتن. بەلکو لە جیاتی ئەوە بەرەو باکوور رۆیشتن و گەمارۆی سەمەرقەندیان دا. حسێن پێشوازییەکی زۆر ساردو سڕی کردین و ئەو پێخۆشحالە نەبوو کە من چاوەڕوانم دەکرد.

لەگەلْ ئەوەی کە من کردبووم بە سەردار و گەورەی شەهری سیبز. حسێن هیچ جێگا و ڕێگایەکی وای نەداینێ و بە زۆر و نابەدلی نەبێت. چونکە ئەلجای زۆر خۆشدەویست و دلی ڕادەگرت، لەبەرئەوەی خوشکی بچووکێتی.

دلشاد زۆر بە باشی پێشوازی لێکردین بە تایبەت هی جیهانگیر کە ئەوکاتە ببوو بە کوڕێکی جوان و لە تەمەنی حەوت سالیدا بوو.

گەرچی من زۆر هەستم بە ڤین و تووڕەیی دەکرد و بە خۆمدا شکامەوە، گەرچی من لە کۆشکەکەی خۆشمدا بووم. بەلام وەك میوانێك هەلسوکەوتم لەگەلدا دەکرا.. بەلام من هیچ چارێکم نەبوو لەوە زیاتر، دان بنێم بە حسێندا کە ئەوکاتە خاوەن و گەورەی کۆشکی سپییە.

ناوەها ئەو سووکایەتییەم قبوولْ کرد و وا خۆم پیشاندەدا من سەردار و میری سەمەرقەندم.

بەلام ئەو ناوونیشانە لە ڕاستیدا شتێکی هیچ و پووچ و بێمانا بوو. چونکە شارەکە تەنها لە ماوەی هەفتەیەکدا کەوتە دەست حاجی برلاس و بایەزید جالیرەوە.

زۆربەی زۆری پیاوەکانیشم کە لەمەوپێش لە خۆشیدا بوون و هەروەك منیش بوون لەو ژیانە خۆش و بەختیارییەدا. هەموویان لە فەرمانڕەواییەکەم و لە بارەگاکەم هەلگەڕانەوە و بە نارەزووی خۆیان قایل بوون بە بایەزید و حاجی برلاس و کردیانن بە سەردار و میری خۆیان. ئەوەی بۆ منیش لەو پیاوە ترسنۆکانەم مایەوە و دەستم کەوت تەنها ڤین لێبوون و سووکایەتیم بوو. وای لێکردن بۆ هەتا هەتایە ببن بە دوژمنم. منیش ئەو کاتەی خاقان لە باکوورەوە دووبارە هەلمەتی هێنایەوەو هاتەوە سەمەرقەندی گرتەوە و پیاوەکانی دەستیان کرد بە تالان و ڕاووڕووت و وێرانکاری و ئەتك کردن و هەتا ئەو ناوچەیەش کە منی تێدابووم خراپە و وێرانکاری بالی بەسەردا کێشا. هیچ نارەزایی و پێناخۆشیم دەرنەبڕی.

حسێنیش خۆی سەرۆکایەتی پیاوەکانی خۆی کرد بۆ ئەوەی لە باکووری شەهری سیبزەوە بەرەنگاری هێزەکەی خاقان بێتەوە و شەڕی لەگەلدا بکات و بیشکێنێت. منیش لەناو شووراکانی

شەهری سیبزدا تیپەکەم هێشتەوە بۆئەوەی بتوانم شارەکە لە کۆمەڵانی دز و جەردە چەپەڵەکان بپارێزم کە لە کاتی شەڕ و ئاژاوەدا هەلیان بۆ دەلوا، جموجووڵیان زۆر بێت. ماوەی دوو ڕۆژ بە ترس و لەرزەوە سەرنجی ڕێگای سەمەرقەندم دەدا.

دەمزانی کە حسێن ناتوانێت بەرهەڵستی پیاوەکانی خاقان بکات. لەبەرئەوە وام بڕیار دابوو شەهری سیبز تەسلیم خاقان بکەم و بیخەمە ژێر دەستییەوە.

ڕۆژی سێیەم یەکێك لە سەرکردەکانی حسێن بە پەرتاو بەرەو شار هات و نامەیەکی خەتەری حسێنی بۆ هێنام. لە نامەکەیدا وام پێراگەیاندرابوو کە حسێن لە لایەن سەربازەکانی تۆغلوکەوە زۆر خراپ شکێنراوەو دەیەوێت دووبارە بداتەوە ئەو چیاو دۆڵانەی نزیك کابوول و لە نامەکەیدا داوای لە من کردبوو، کاروانێك ئامادەبکەم. هەروەها منیش خۆم ئامادە بکەم و بچمە پاڵی. نامەکەم بۆ ئەلجای و دڵشاد خوێندەوە و دەستمکرد بە ئامادەکردنی قافڵەکەی حسێن پاشان پێم وتن، من لێرە دەمێنمەوە و ئێوەش لەگەڵ حسێندا ڕەوانە دەکەم.

بەڵام ئەلجای زۆر بە ئاشکرا و نەترسییەوە وەڵامی دامەوە وتی:

-منیش دەمەوێت لەگەڵ تۆدا لێرە بمێنمەوە!!

دڵشادیش وتی: منیش دەمەوێت لێرە لەگەڵ ئەلجای و جیهانگیردا بمێنمەوە.

وەڵامی دڵشادم دایەوە، وتم:

-نەخێر دڵشاد جێگای تۆ لە لای حسێنە.

من حەزم دەکرد حسێن لەم ناوچەیە بچێتە دەرەوەو هیچ پاشماوەیەکیش دوای خۆی جێنەهێڵێت.

ئیتر ئەو کاتە دڵشاد پێشنیازی کرد و وتی:

-باشە کەواتە ڕێم پێبدە با جیهانگیر لەگەڵ خۆمدا بەرم چونکە لێرە ئاژاوەی زۆر و شەڕ و ئاکۆکی ترسناك ڕوودەدات. ئەلجایش تاس بردییەوە و بە بیرکردنەوەوە وتی:

-منیش لەم ڕووەوە لەگەڵ دڵشاددام و ڕاست دەکات. ئەگەر جیهانگیر لە کابوول بێت، بە خۆشی و ئارامی دەژی.

ئیتر بۆ ئەو سەفەرە دەستمانکرد بە ئامادەکردنی جیهانگیر. دایکی عەبدوڵلاش بە گەرمییەوە دەیویست و دەیویست کە لەگەڵ جیهانگیردا بڕوات. کاتێك حسێن خۆی و تیپە جەنگاوەرە هیلاك و ماندووە کەمەکەی گەیشتنە لامان. ئەو کاروانەی کە ئامادەمان کردبوو، هەموویان لەگەڵ حسێندا بەرەو کابوول کەوتنەڕێ. حسێن بە هۆی ئەو تێکشکاندنە خراپەی کە

بە سەریدا هاتبوو، ئەو کەش و فیز و لە خۆباییبوون و لووت بەرزییەی جارانی نەمابوو. بەلام لە چاوەکانی نەگەیشتم ئایا ڤینی لێم دەبێتەوە یان سەری سوورمابوو، لەو بڕیارەی من دابووم بە مانەوەم لە شارەکەدا. پاش ئەوەی کاروانەکەی حسێن ڕۆیشت. ئەلجای لێی پرسیم:

-تەیموور ئێستا ئێمە چی بکەین؟

منیش ئەو مۆری دەستەلاتدارێتییەم دەرهێنا، کە وەختی خۆی خاقان دابوومیّ و پێم وت:

-تۆ تەنها بەس چاوەڕوان بکە و پاشان دەبینیت چی ڕوودەدات. چونکە من هەر لە خزمەتی خاقاندام.

ئەلجای کە مۆرەکانی بینی، قاقا پێکەنی و بە شانازییەوە وەلامی دامەوە:

-ئەم مۆرانە ئەوە دەگەیەنن، تۆ هەر سەرکردەی دە هەزار سەربازیت.

کاروانە سەرەتاییەکانی خاقان زۆر ڕێزیان دەگرتم. چونکە من هیچ بەرگرییەکم لە ڕوویاندا نەکرد و بەردەوامیش دەموت، من بەرگری و پارێزگاریم لە شارێك لە شارەکانی تۆغلوك کردووە. دژی دەستدرێژکەران و هێرشبەرانی سەربازگەی تەتەر ئەو کاروانانە فەرمانیان پێدرابوون کە بۆ حسێن بگەڕێن و هەرچۆنێك دەبێت بیگرن.

بەم شێوەیە هێزەکانی خاقان بە نزیك شەهری سیبزدا دەڕۆیشتن و بەردەوام بە دوای حسێندا دەگەڕان. یەکێك لە سەرکردەکانی تۆغلوك خەبەری دامیّ، کە تۆغلوك، بایەزیدی کوشتووە و حاجی برلاسیش هەلاتووە بۆ ناو چیا و گردۆلکەکان.

منیش ئاوەها بە دلەخورپێیەوە، چاوەڕوان بووم، بەردەوام بە دەوری کۆشکەکەمدا دەهاتم و دەچووم و ناخم بۆ ئەو خەسارەتە زۆرە هەلدەکێشا کە لە شان و شکۆ و سەروەریمی کەم کردبۆوە. و لە دەستم چووبوو. ئەلجای بەردەوام هەولی دەدا، شاد و ڕووخۆش بێت و هەولیدەدا منیش دلخۆش و ڕووخۆش بم. بەلام بیر و هەستم ئەوەندە کاری تێکردبوو، بە هیچ شێوەیەك و هیچ ژنێکیش نەیدەتوانی تۆزێك کاربکاتە سەر هەست و ئەو دلگرانی و کێشەیەم کەم بکاتەوە.

لەیلا و زیبام لە سەمەرقەند جێهێشتبوو، لێم ون ببوون، لێونبوونێك دوای ئەوە ئیتر هەرگیزاو هەرگیز کەسیانم نەدییەوە.

ئاوەها بەردەوام خەم و خەفەت و ئێش و ئازارم دەچێژت. بەلام لەگەل ئەوەشدا ترۆسکاییەکم شك دەبرد لە خەم و خەفەتمی لا بڕەوێنمەوە و چارەسەرێکم بکات. ئەویش شەوێك لە شەوان کارین هات بۆ لام، ئەوکاتەش تەمەنی تۆزێك زیادی کردبوو، زۆریش لاواز

ببوو، خۆشی و شادییەکەی جارانی نەمابوو هەموو شتێکی لەدەست چووبوو. ئەوکاتەی هاتە لام و لەگەڵمدا دانیشت پێی وتم:

-سەرداری بەڕێز، شازادە تەیموور وا دووبارە هاتمەوە بۆ لات. هەرکاتێك هەور و هەڵا و تاریکایی لە ڕۆژهەڵاتەوە پەیدابێت، دەبینیت من هانات بۆ دێنم.

-کارین، ئێستا چی ڕوویداوە؟

-شانس و بەختم نەماوە، پیاوەکانی حسێن پارەیان نەماوە تاکو بمدەنێ. ئەو کچانەی لاشم بوون، یەك لە دوای یەك ڕۆیشتن و هەڵاتن. منیش ئێستا هیچ چارێکم نییە و تەنها و ماندوو مردوو ماومەتەوە و هیچ پیاوێکیش پێم ڕازی نابن و لێم دووردەکەونەوە. تەنها تۆ نەبیت ئەی ئەو کەسەی لە یەکەمجارەوە، بەرگریت لێکردم و پارێزگاریت لێکردم.

-ئێستا چیت دەوێت بۆتی بکەم؟

-بمبەرە ماڵەکەی خۆت، وەك کەنیزەکێك یان وەك کارەکەرێك یان وەك هەرچی شتێك، تۆ دەتەوێت. ڕەنگ و ڕووخساری زۆر خەفەتبار بوو، قسەکانیشی زۆر خەمبار و کەساسانە بوو. تۆزێك بیرم کردەوە، ئەو خۆشییە شاز و دەگمەنەم بیرکەوتەوە، کە جارێك لە جاران لە باوەش و لەش و لارە گەرمەکەیدا چەشتبووم. لەگەڵ ئەو دڵشکاو و خەمبارییەشیدا هێشتا هەر جوان بوو.

چارم نەما لەوە زیاتر، ڕازی بم پێی. ئیتر پێم وت:

-تۆ لە کۆشکەکەمدا دەبیت بە جێگای باوەڕ و ڕاز و نیازم. بە منەتباری و چاکەپێزانینەوە وەڵامی دامەوە و پێی وتم:

-ئەمە زۆری زیاترە لەوەی کە من دەمویست.

بەڵام ئەم خۆشییەی وەك ئەو خۆشییەی جاری جارانی نەبوو، کە یەکەمجار بردمە ناو کۆشکەکەمەوە. لە ڕاستیدا جاری یەکەم من زۆر چاك و میهرەبان بووم لەگەڵیدا و ئەویش ڕێز و ئیحترامی تەواوی وا بەو چاکی و میهرەبانییەم و بە هەموو شێوەیەك هەوڵیدەدا شاد و بەختیارم بکات.

لەش و لاریشی وەك ئەو شەش ساڵەی ڕابردوو نەمابوو زۆر لات و لاواز ببوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا نەرم و نیان و جۆرە جوانییەکی دڵڕفێنی پێوە دیاربوو.

بەڵام ئێستا جۆرە ترسێکی خەمباری جێگای ئەو خۆشییە پاك و ڕاستەی جارانی گرتۆتەوە کە دەستم کردە ملی و گرتمە باوەشم. مێشکی حەساندمەوە و دلگرانی و خەم و خەفەتی ڕەواندمەوە. دوای ئەوە، و دوای چەند ڕۆژێك موسا لەگەڵ پیاوەکانیدا هاتن بۆ شەهری سیبز و

ژمارەیەکی زۆری پیاوانی هۆزی جالیری لەگەڵدا بوو. ئەو پیاوانەی کە دوای کوشتنی بایەزید بێ سەرکردە مانەوە و لەملاو لەولادا پەرش و بڵاو ببوونەوە. منیش زۆر بڕوام بە موسا هەبوو، لەبەرئەوە پێشوازیم لێکرد و هێزەکەیم خستە ناو هێز و تیپەکەی خۆمەوە. و بیرم لە پەیوەندی و هاتنی خەڵکانی زیاتر دەکردەوە.

هەروەها، پاشان عەبدوڵڵای نۆکەرم بانگکرد و ڕووم تێکرد و لێم پرسی:

-عەبدوڵڵا پیاوێکی بەشەرەف و ڕاستگۆ و چاك بە، ئایا ڤینت لە منە.. یان.. نا؟

-شازادەی گەورەم، بێگومان، نا، بەڵام بۆچی وا لێم دەپرسیت؟

-درۆم لەگەڵدا مەکە، ئەمە کارێکی زۆر گرنگە، زۆر زۆریش گرنگە. تۆ کاتێك شیرەکەت دزیو دات بە من، جارێك لە جاران دانت نا بەوەدا، کە بیر لەوە دەکەیتەوە بمکوژیت و لە وڵاتێکی تردا، پەیوەندی بە سەرکردەیەکی ترەوە بکەیت. ئایا ئەوە ڕاست نەبوو؟

-بەڵێ، شازادەی گەورەم، بەڵام ئەوکاتە گەنج بووم.

-هەرچۆنێك بێت، تۆ بیرت لە شتێکی وا کردۆتەوە.

باشە کۆیلەکان و خزمەتکارەکانیش هەڵوێست و بیروڕایان بەرامبەر گەورە و خاوەنەکانیان چۆنە؟

-شازادەی گەورەم، هەموو کۆیلەیەکی تر، گەورەکانی خۆیان خۆش ناوێت و ڤینیشیان لێیان دەبێتەوە، بێگومان بە هەموو کۆیلەیەك ئەمە هەستیانە و بەڵام من نەو.

-کەواتە دڵسۆزییان هەمووی درۆیە؟

-بەڵێ شازادەی گەورەم، ئەو کۆیلانە دڵسۆزی کەس نین، دڵسۆزی تیرەکەی خۆیان نەبێت. بەڵام هیچ دەستەڵاتێکیان نییە و ناتوانن هیچیش بکەن.

-بەڵام دەتوانن گەورەی باشتریان دەستکەوێت!!

-ئەوەش ناتوانن ئەگەر یارمەتیان نەدەن.

-بە یارمەتی من.. من پلانێکم هەیە.. تۆ هارونی نۆکەری حاجی برلاس باش دەناسیت، عەبدوڵڵا وا نییە؟

-بەڵێ سەرداری گەورەم، من زۆر باشی دەناسم.

-ئایا ئەویش ڤینی لە گەورەکەی خۆیەتی؟

-بەڵێ، شازادەی گەورەم!!

-من بیرم زۆر لەوە کردۆتەوە.. حاجی برلاس هەوڵی زۆری داوە من بکوژێت.. ئەو پیاوێکی چەپەڵ و ناپیاوە ئایا تۆ لەو باوەڕەدایت، هارون بتوانێت حاجی برلاس بکوژێت، ئەگەر من بەڵێنی پێبدەم کە بیپارێزم و بیگرمە لای خۆم و چاکەی بدەمەوە و پارەیەکی زۆری بدەمێ و بیکەم بە پیاوێکی ئازاد و ئازادی بکەم.

-رەنگە هارون وا بکات. بەڵام من ئەوە بە باش نازانم.

-عەبدوڵڵا پێویستە تۆ خۆت بگەیەنیتە چادرەکانی حاجی برلاس و بگەیتە لای هارون و ئەم ڕێکەوتننامەیەی لەگەڵدا سازبکەیت. ئەگەر لەم کارەدا سەرکەوبت بەڵێنت دەدەمێ کە کارینت بدەمێ و لێت مارە بکەم.

-عەبدوڵڵا. حەپەسا و بە شادییەوە لێی پرسیم:

-کارین..؟

منیش دەمزانی کارینی خۆشدەویست و ئارەزووی لێیەتی لەو ڕۆژەوە، و ماوەی چەند ساڵێک لەمەوپێش کە بردییە ناو ئەو کۆشکەوە کە من دامێ و ماوەی هەفتەیەکی تەواو لەبەرچاوم ونبوو.

منیش پێخۆشحاڵ بووم و پێم وت:

-بەڵێ، دەتوانیت کارینت دەستکەوێت.

-گەورەم، باشە کەی دەست بکەم بە گەڕان و هەوڵدان؟

-تۆ دەتوانیت ئێستا دەستپێبکەیت. بەڵام دوو پیاوی تر لەگەڵ خۆتدا ببە و، وا خۆت پیشان بدە کە لە بارەگای من هەڵاتوویت.. تێگەیشتیت؟!!

-بەڵێ گەورەم.. بەڵێ گەورەم..

هیچ هەفتەیەک ڕانەبوردبوو، دەنگوباس بڵاوبۆوە لە دۆڵ و ناوچەکەدا کە حاجی برلاس لەگەڵ ئەو پاسەوانییە توندوتیژ و قایمەشدا، لە کاتی نووستندا، نۆکەرەکەی کوشتوویەتی و رایکردووە بۆ شاخ و دۆڵە دوورەکان.

ئیتر هەروەک هۆزی جالیر پیاوەکانی هۆزی برلاسیش کە سەردار و سەرکردەکەیان کوژرا، پەرش و بڵاو بوونەوە و پاشان چوونە ژێر دەستی جاکۆ و لەژێر سەرکردایەتی ئەودا خۆیان ڕێکخستەوە. جاکۆش لەگەڵ زۆربەی پیاوەکانیدا لە سەمەرقەند دەرباز ببوو، وە هەڵاتبوو.

منیش ناردم بە دوای جاکۆدا ئەویش بە دەم بانگەوازەکەمەوە هات و هاتەوە بۆ لام و زیاد لە هەزار پیاویشی لەگەڵ خۆیدا هێنا و لە شەهری سیبزدا پەیوەندییان بە هێزەکەمەوە کرد.

عەبدوڵڵاش بە کارین شاد بوو، چەند ساڵێکیان بە خۆشی و شادییەوە پێکەوە بردە سەر.

ئاوەها کاتێك تۆغلوك هاتە ناو سەمەرقەندەوە من سوپایەکی بەهێز و گەورەم هەبوو، ژمارەی سەربازەکانم دوو هەزار پیاو بوو. واتە دوو ئەوەندەی ئەو سەربازانەی کە لەگەڵ تۆغلوکدا هاتبوون و پاسەوانیان دەگرت.

کاتێك تۆغلوك گەیشتە لام ڕووم تێکرد و پێم وت:

-باوکی گەورەم، خاقانی گەورە و سەرداری جیهان!!

من دڵسۆزی و ژێردەستەیی خۆمت پێشکەش دەکەم و دیاری بەنرخت پێشکەش دەکەم و بە خۆشی و شادییەوە لە کۆشکەکەمدا پێشوازیت دەکەم.

هەرچۆنێك بێت دیارییەکانم زۆر لەوە کەمتر بوو، کە ئەو کاتەی دوو سەد پیاوم هەبوو، و پێشکەشم کرد.

پاشان خاقان وەڵامی دامەوە، وتی:

-کوڕم تەیموور شازادەی سەمەرقەند تۆ زۆر بە چاکی و نەترسییەوە خزمەتت کردووم و دیاری گرانبەهاشت پێشکەش کردووم. لەبەرئەوە تۆ لەبەرچاومدا ڕێزی گەورە و تایبەتیت هەیە. بەم جۆرە ماوەی سەعاتێکی تەواو پێکەوە گفتوگۆمان کرد. تۆغلوك دووبارە ئەوەی بیرخستمەوە کە من لە خێزانی کابوولم و دەبێت کوڕەکەی لە کابوول بپارێزم. پاشان ئەو کارە باشانەمان باسکرد کە بۆم کردبوو. ئیتر لە سەر دڵسۆزی و برایەتی هەتاهەتایی پەیمانمان بەستو پێکهاتین.

بەڵام کاتێك خاقان گەڕایەوەو، بینیم سەرکردە "بێکیجوك"ی لە سەمەرقەند جێهێشتووە و کردوویەتی بە سەردار و پارێزەر و فەرمانڕەوایی خۆی و تەنها شەهری سیبز و ئەم مۆرە پۆڵاییانە و چەند سەرباز، دەتوانم بیگرم و لای خۆم بیانهێڵمەوە، بۆی جێهێشتم.

بەڵام هەرچۆنێك بێت من هەر بەردەوام بووم و زاڵبووم لەدەست بەسەرداگرتنی دۆڵ و ناوچە وێرانەکەی خۆمدا.

## بووم بە پیاوێکی شەل

ڕوون و ئاشکرابوو، خاقان لە هیچ سەرکردەیەکی تەتەر نەدەترسا و ڕێزیشی نەدەگرتن. لەو ڕۆژەوە کە کورغان مردبوو هیچ پیاوێك نە لاداخ و نە بایەزید و نە حاجی برلاس و هەتا منیش نەیتوانی ئەو سەرکردە و شازادە یاخی و هەڵگەڕاوانە، ڕابکێشێتەوە ژێر دەست و فەرمانڕەوایی خاقانەوە. هەروەها لەو ڕۆژەوە کە کورغان مردبوو، هیچ پیاوێکیش نەیدەتوانی تەتەرەکان لە چاوچنۆکی و زۆرداری پیاوەکانی تۆغلوك بپارێزێت.

هەرکە بێکیجوك کار و فەرمانی گرتە دەست، دەستیکرد بە وێرانکاری و ئەتك کردن و خراپە و خراپەکاری لە وڵاتدا. خۆ ئەگەر سەردار و سەرکردەکانی هۆزەکان باج و خەراجیان بدایە و نەدایە. سەرکردە مەغۆلییەکە زەوی و زار و زێدیانی لێ داگیر دەکردن و هەرچی بکەوتایەتە بەردەستی تاڵانی دەکرد. ئیتر ئاوەها سەرکردەی پارێزەر دەوری دادوەری بە دادی نەدەبینی. بەڵکو تەنها دزێك بوو بۆ خۆی و بەس.

وە لە زەمانی کورغاندا پاراستن بۆ دوو مەبەست بوو:

یەکەم: بەرگری لە شان و شکۆی خاقان.

دووەم: وەستان و ملکەچی لە ڕووی نوێنەری خاقان. لە سەمەرقەند.

بەڵام لە زەمانی فەرمانڕەوایی بێکیجوکدا هیچ شێوە پاراستنێکی دانیشتوان لە لایەن شازادەی خراپەوە کە نوێنەری خاقان بوو لە سەمەرقەنددا نەمابوو.

کەس نەیدەتوانی لە ڕوویدا ڕابوەستێت. هەتا ئیمام زەینەدین خۆشی مەجبوور بوو، واز لە منارە بەرزەکەی مزگەوتی سەمەرقەند بێنێ و ڕابکات و پەنا بێنێت بۆ شاری شەهری سیبز منیش زۆرم پێخۆش بوو، پێشوازییەکی گەرم و گوڕی ئیمامی پیرەمێردم کرد. چونکە من ڕێزی بیروباوەڕی و تێگەیشتنە زۆرەکەیم دەگرت. ئیمام زەینەدین خۆی هات بۆ لام و باسی ئەو ناخۆشی و کارەساتە ترسناکانەی بۆ کردم. کە بە هۆی زوڵم و زۆرداری بێکیجوکەوە تووشی میللەتەکەمان هاتبوو. وە لەبەرئەوەی من شازادەی سەمەرقەند بووم، و لە لایەن خاقان خۆیەوە دانرابووم. منیش شکاتێکی توند و تیژم لێکرد و ناڕەزایی ئەو زوڵم و زۆرەم دەربڕی کە تووشی گەلەمان هاتبوو. وە ئەو کارە توندوتیژ و تاڵانکارە پیسانەیم تاوانبار و ڕیسوا کردبوو.

بەڵام تۆغلوك هیچ گوێی نەدایە نامە و شکاتەکەی من.

ئیتر ئاوەها بۆ دووەم جار پەنام بردەوە بۆ لای مامۆستا دێرینەکەم. لەژێر سایە و سێبەری مزگەوتە سارد و سڕەکەدا داوای ئامۆژگاری و ڕێنماییم لێکرد.

لە کاتێکدا لـە تەنیشـت ئیمـام زەینەدینـەوە دانیشـتبووم ڕووی تێکـردم و بـە شـێوەیەکی لەسەرخۆ و ڕێکوپێك و گرژییەوە پێی وتم:

-تەیموور، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە، هێز بەکاربهێنیت.

-بەلام تۆ لەمـەوپێش ئامۆژگاریت دەکـردم کـە ڕێگـای چارەسـەری ئاشـتی بگـرم و نامـەی دۆستایەتی بەکاربێنم، وا نەبوو؟

-بـەڵێ، کـورم، بـەلام ئێسـتا تـاوان دەرحـەق خـوا و دژی خـوا دەکرێـت. مەغۆلییـەکان مزگەوتـەکانیان تـالان کـرد و سووکایەتییان بـە مێزەرەکـانی زانایـان و پیـاوە ئاینییـەکان کـرد. خواش لـە کردەوەکانیـان تـووڕە و ناڕازیـە، تـۆش بەندەیـەکی زەبـوون و گوێڕایـەڵی خودایـت. لەبەرئەوە پێویستە لەسەرت، لەبەر خوا ڕاپەڕیت و لە ڕووی بێکیجوکدا ڕاوەستیت.

-من ڕادەپەڕم، بەلام ئایا خوا بەرەکەت و ڕەحمەتی خۆی دەڕژێنێت بەسەر پیاوەکانمدا؟

-بەڵێ، بە هەموو شێوەیەك.

-ئایا لەناو خەڵکیدا بلاوی دەکەیتەوە کە من سەرکردە و نوێنەری هەڵبژاردەی خوام؟

-ئێمـە لـە کاتی نوێـژ و لـە کاتی خوێندنـەوەی وتارەکانمدا نـاوت دێنـین و دوعـا و نـزات بـۆ دەکەین.

-زۆر چاکە، تەنها تۆ هانەهانەی پیاوەکانم بدە و عەزم و غیرەتیان پتـەو بکـە، منیش دەزانم چۆن لە شەڕدا بەکاریان بهێنم.

ئاوەهاو هەروەك ئیمام زەینـەدین وتـی، منیش دەسـتمکرد بـە هەڵمەتەکـەم و لـە کارەکەمـدا، خوداش هاوکاری و یارمەتیدەرم بوو. زانا ئاینییـەکان و شـێخ و دەروێشـەکانیش لـە وتارەکانیـاندا ناویان دەبردم و دوعایان بـۆ دەکـردم. تـاوان و خراپەکارییـەکانی "بێکیجوك"شیان بـۆ خـەڵکی دەردەخست و لـە دژی دەوەسـتانەوە. دەنـگ و چرپـە چـرپ لـەناو خـەڵکیدا بلاوبـۆوە، گوایـە مـن خەوێکی فریشتانەم دیوە و لەو خەوەدا پێیان وتووم مـن لـە شـەڕدا ناشـکێم و سـەرکەوتوو دەبم. خـاوەن بـاوەڕ و ئیمـانداره توندڕەوەکـان پـەیتا پـەیتا پـەیوەندییان بـە هێزەکەمـەوە دەکـرد و دەهاتنـە نـاو ڕیزەکانییـەوە و خۆیـان بـۆ خزمـەتم سـازدەدا. گـەرچی جـەنگاوەرە دێرینـەکانم لەوەوپێش گاڵتەیان بە پیاوانی ئاینی دەهات و ناویان نابوون بە نیوە پیاو، یان شێوە پیاو. بـەلام ئێستا بڕوایان بە نەفسانە و خـەرافات هێنـابوو. ئاوەهـا تـین و توانـای زۆر و زەوەندیـان لـە دڵ و دەروونیـاندا چـاند. هیـچ کەسـێك گاڵتـەی بـەم وەزعـە نوێیـە نـەدەهات. لـەلجای نـەبێت بـە پێکەنینەوە پێی دەوتم:

-مێردەکەم بووە بە پیاوچاك، باشە من چۆن دەتوانم لەگەڵیدا بژیم، ئەگەر تەکێ و جێ نزرگەی بۆ دروست بکەن؟ تەیموور پێم بڵێ چۆن؟

-ئەوکاتە تۆ ناتوانیت لەگەڵ مندا بژیت. چونکە خەڵکی جێ نزرگە تەنها بۆ مردوو دروست دەکەن.

-ئۆه، تەیموور شتی وا مەڵێ. خوا نەکات بمریت. ئایا بە ڕاستی تۆ هەمدیسان شەڕدەکەیتەوە؟

-بەڵێ، شەڕ دەستی پێکردووە، یان خەریکە دەست پێبکات. شەڕ گشت کات هەیە و، شەڕیش هەر دەمێنێت منیش تۆم بە شەڕ و بە زەبری شمشێر دەستکەوتووە. لەبەرئەوە من لەو ڕێگایە زیاتر هیچ ڕێگایەکی تر ناگرم.

-کەواتە منیش بۆ جەنگ لەگەڵتدا دێم. ئیتر تۆ جارێکی تر ناتوانیت و نابێت لە خۆتم دووربخەیتەوە.

-من هیچ کاتێك هەوڵی ئەوە نادەم و پێم خۆش نییە، تۆ لە خۆم دووربخەمەوە. من ئەمەشم بە دوودڵی و گومانەوە پێ وت. لە ژیانمدا ئەمە یەکەم جار بوو هەستم کردبێت بۆ جەنگ دەچم. ڤین و تووڕەیی و نائومێدیش لە سینەمدا سەری دەکرد. لەبەرئەوە بوو، من دەمویست ئەلجای لەگەڵمدا بێت و هاوشانم بێت. ئەوەی پاڵی پێوە دەنام بەرهەڵستی بێکیجوك بکەم، ئەوەبوو، کارێك بکەم ئەلجای لە سەمەرقەندا نیشتەجێ بێت. ئیتر ئیمام زەینەدین و دەست و پێوەندەکەی و شێخەکان، گشت جەنگاوەرەکانیان هەڵنا و تیژیان دەکردن بۆ جەنگ و لەبەردەم خەڵکیدا منیان وا پیشان دەدا، پیاوچاکم و "بێکیجوك"شیان بە پیاوخراپ دادەنا.

لە ئەنجامی ئەوەدا من سەرکردایەتی سێ هەزار سەرباز یاخود سێ هەزار پیاوی شێتم کرد و بەرەو باکوور کەوتمەڕێ. بە شێوەیەکی شێتانە و لەژێر تاریکایی شەودا پێشڕەویم کردن و هەتا گەیشتمە پشت سەمەرقەندەوە. منیش قەڵاکانی مەغۆلییەکانم لە "تاشقەند" و "ئوترار" باش دەزانی و شارەزایان بووم و دەمزانی پڕن و جەمەیان دێت لە دیل و بەندەکانی هەڵمەتەکەم چونکە لە پێناوی خوادا بوو، یەکسەر بۆ ئەو قەڵایانە هەڵمەتم برد. حسێنیش بە خۆی و پیاوە شاخاوییە ئازا و شەڕکەرەکانییەوە بە هانامەوە هاتن و پەیوەندییان پێوەکردم. پیاوەکانیش لە کاتێکدا دوێیان لە شێخ و دەروێشەکان دەبوو، کە هاواریان دەکرد لە پێناوی خوادا بەرگری بکەن و تێبکۆشن. زیاتر شێتگیر دەبوون.

به هاتنی حسێن دوو هەزار سەربازی تر پەیوەندییان بە لەشکرەکەمەوە کرد و منیش بە تەواوی بڕوام کرد، کە خۆم بە ڕاستی خەونێکی فریشتەئاسام دیوە.

ئا بەم جۆرە سەرکردایەتی تێکۆشانێکی پیرۆز و شەڕێکی توندوتیژم لە پێناوی خوادا کرد.

-تاشقەند لە تەنها شەوێکی خوێناویدا کەوتە ژێر ڕەحم و بەزەیی شمشێرەکەم و داگیرم کرد.

پیاود ئازا و دلێرەکانیشم هیچیان لە پیاوە شەڕخواز و دڕەکانی مەغۆلەکان کەمتر نەبوو. هیچ کەسێکیان لە دوژمنان بە ساغی جێنەهێشت. چونکە ڕەحم و بەرەکەتی خوامان لەگەڵدا بوو وە لە پێناوی حەق و ڕاستیدا دەجەنگاین. ئیتر بەم شێوەیە کۆیلەکانمان ئازاد کرد و بوون بە مرۆڤی ئازاد و بوون بە خاوەن سەروەری خۆیان. هەرچی کچێکیش کە گیرابوون دەمانەوە بە کەسوکاریان و هەرچی موڵك و سامانی مزگەوتیش هەبوو گەڕاندمانەوە بۆ مزگەوتەکان. دوای ئەوە بە لەشکرە ئازا و بێشومارەکەمەوە بەرەو ئوترار کەوتمە ڕێ. هیچ کاتێکی زۆری نەخایاند، گەمارۆی شارە شووراد دراوەکەمان دا. ماوەی رۆژێك بوو گەمارۆمان دابوو، لەو ماوەیەدا دەنگوباسمان پێگەیشت کە تۆغلوك خان مردووە. ئەلیاس خان لە جێی ئەو بووە بە خاقان ئیتر ئێمە هەستمان کرد لەسەر حەقین و خوا هێز و توانای لە دوژمنانمان سەندەوە و خانێکی خراپ و چەپەڵی بۆ جێهێشتوون و لە ژیانی خۆیدا نەچۆتە شەڕەوە و شەڕێکی نەکردووە.

ئوتراریش لەبەردەم ئەو دلگەرمی و تێکۆشانە پیرۆزەماندا خۆی ڕانەگرت و گیرا و کەوتە ژێر دەستمانەوە. هەمدیسان دووبارە بە پێی ویستی خوا. کە دوژمنی سەرەکیمانی مراند. کەوتینە وێزەی دوژمنان و دەستمان کرد بە سەربڕینی هەموو مەغۆلییەکان و میللەتەکەی خۆمان لە چنگیان ڕزگار کرد.

دوای ئەوەی تۆزێك پشوومان دا بۆئەوەی لەناو شووراکانی ئوترار دا شوکور و سوپاسمان پێشکەش بە خوا بکەین. ماوەی یەك هەفتەی تەواو ئاهەنگ و شاییمان گێڕا. پاشان ئەو شتانەی لە مەغۆلەکانمان دەستکەوتبوو. لە جلوبەرگی نوێ و چەك و ئەسپ و زین و شتی تر، هەموومان بەسەر پیاوەکانماندا دابەش کرد. پاشان بەسەر دەریای "سیرداریا"دا ڕەتبووین و بەرەو نشێوییەکانی "کیرغیز"یادا کەوتینە ڕێ کە تا ئەوکاتە هۆزە مەغۆلییەکان دەستیان بەسەر ژمارەیەکی زۆری نەتەوەکەماندا گرتبوو. هێرشێکی کتوپڕیمان کردە سەر پیاوانی ئەو هۆزانە و تێکمانشکاندن و تەفروتونامان کردن. پاشان ڕووبەڕووی هێزەکان و تیپەکانی سەمەرقەند ڕاوەستاین کە بە هۆی لەشکرەکەی تۆغلوکەوە بە هێز و توانا ببوون.

لە کاتی ئێوارە و ڕۆژئاوابووندا، کە ڕۆژ کەوتبووە پشتمانەوە بەرەنگاری ئەو تیپانە بووینەوە. کاتێك ئەو جلوبەرگە دڕاوانەی دوژمنانم بینی، و کاتێك ئەو گالیسکە پێچکە گەورانەم بینی کە زۆر بە گران دەجووڵان. هەستم بە خۆ زل زانین کرد و شانازیم بەو لەشکرە گورجوگۆڵ و نەبەردە ڕاپەڕیوەمەوە کرد کە خوا پێی دابووم.

مەغۆلەکان کاتێك ئەو هێزە جوان و ڕێکوپێکە و ئەو جەنگاوەرە نەترس و دلێرانە و ئەو سەربازە ئازا و پۆشتە و پەرداخانەی منیان بینی لە ڕوویاندا ڕاوەستاون. بە ئاشکرا بینیم مەغۆلەکان حەپەسان و ئەبڵەق بوون. لەو لەشکرەی کە خوا پێیدابووم و پشتیوانی دەکرد و بە لەشکری تایبەتی خۆی داناوە. لەو شەوەدا چادرمان هەڵدا بۆئەوەی شەوی تێدا بەرینە سەر و پشووی تێدا بدەین. ئەو شەوە زۆر بە پەرۆش بووین بۆ سبەینێ لە ڕۆژی ڕووناکدا هەڵمەت بەرین و ئەو هێزەی دوژمن تێکوپێك بدەین و بیانشکێنین. بەڵام ئەو شەوە باران بە خوڕ دەستی کرد بە بارین و بە درێژایی ڕۆژیش هەر دەباری و خۆشی نەکردەوە. زەوییە لێژەکان خووسانەوە لینج بوون. ئەسپەکانمان لەو باران و قوڕ و لیتاوەدا تا ئەژنۆیان لە قوڕدا نوقوم بوون و قوڕ گەیشتە ناوقەدیان و جلوبەرگ و قەڵغانەکانمان قورس و گران بوون و چەکەکانیشمان ژەنگی هەڵهانی. بەڵام سەربازە مەغۆلییەکان لە ناو عەرەبانە بەرزەکانیاندا کە لە قوڕەکەدا نەدەچەقین و چادری ئەستووریان دابوو بەسەریاندا و چەك و قەڵغان و زینی زۆریان پێبوو. دڵۆپێك ناویان لێنەکەوتبوو، وشك و برن.

ئاوەها بەرەنگاری ئەو دوژمنانەمان بووینەوە، یەك تۆز هیلاك نەببوون و لەوپەڕی ماندوونەبوونی و بەهێزیدا بوون.

هەروەها پاچ و خاکەنازی گەورە گەورەیان پێبوو چواردەوری چادرەکان و سەربازگەکەیان پێهەڵدەکەند و جۆگەیان بۆ دەکرد، بۆئەوەی ئەو ئاوولیتاوەی کە لە دەوری چادر و سەربازگەکەیاندا کۆدەبۆوە بەو جۆگایانەدا بڕوات.

منیش ئاواتی ئەوەم دەخواست، لە بیابانە وشك و بەربڵاوەکاندا بووینایە، چونکە لەو شوێنانەدا دەمتوانی هێرشی کتوپڕی سەرکەوتووانە بکەینە سەریان. بەڵام لە جیاتی ئەمە دەمبینی سەربازە پیادە و سوارەکانم، سەرسمیان دەدا و هەڵدەخلیسکان و لەو قوڕ و لیتاوەدا نوقوم دەبوون.

ئەسپەکانمان تا ناوقەدیان لە قوڕدا چەقیبوون و سوارەکانیش لەسەر پشت و زینی ئەسپەکان دەخلیسکان و دەکەوتنە خوارەوە بە چەند کاتژمێرێك ئینجا دەمتوانی ڕیزەکانیان ڕێکوپێك بخەمەوە و ئامادە و تەیاریان بکەمەوە.

حسێن و پیاوە شاخاوییە ئازاکانیم لای باڵی ڕاستەوە دانا چونکە لەم لایەنەوە هێرشی گەورەو فشاری زۆرمان لەسەر بوو.

موساش لەگەڵ پیاوەکانیدا، کوڕانی نەوەی هۆزی جالیر سەرکردایەتی گشت ناوچەکەی دەکرد.

منیش لەگەڵ پیاوەکانمدا، کوڕان و نەوەی هۆزی برلاس، سەرکردایەتی باڵی چەپم کرد. سێ فەوجی ئامادەم هەبوو بچنە ناو کۆڕی جەنگەوە و دوو فەوجیشم وەك هێزێکی یەدەك هێشتبۆوە. جاکۆ لە پشتی منەوە بوو. ئیلشیش لە ناوەڕاست و موفاش لە پشتی حسێنەوە بوو.

کاتێك جەنگ دەستی پێکرد بە شێوەیەکی هێواش و ئاقۆڵا دەستی پێکرد. تیروکەوانەکانمان بە تەواوی تەڕببوون. هەتا وای لێهاتبوو تەقاندنی تیر و، تیرە دوورهاوێژەکانمان کە لە لایەن ئەو فەوجە یەدەکییەی لە دواشەوە بوون کارێکی بێسوود و ئەزۆك بوو. جەنگ و پێکدادانەکە، جەنگی شیربازی و بەیەکدادان بوو. لەسەر پشتی ئەسپەکانەوە کە لە قوڕدا تا ناوقەدیان نوقوم ببوون. هەروەها شەڕی تەورزین بوو بەرامبەر تەورزین و ڕیشەی گۆپاڵ و ڕم بوو. ئەو قوڕاوو ئاوە زەردە، سوورهەڵگەڕاو جۆگەی بەست بە هۆی ئەو خوێنە گەشە زۆرەی کە لە هەردوولاوە ڕژا. پیاوانی جەنگاوەرانیش لە شوێنەکانی خۆیاندا هەتا مردن خۆڕاگر بوون. چونکە نەیاندەتوانی لەو قوڕ و لیتەیەدا هەڵسووڕێن و وەرگەڕێنەوە و ڕووبکەنە لایەکی ترەوە.

دڵگەرمی پیاوەکانم زۆر تەواو نەبوو، بە پەرۆشەوە نەدەجەنگان. هێزەکانی مەغۆلەکان دریان بە ڕیزەکانمان دا و بۆ پێشەوە تەکانیان دا و بەرەو ڕوومان هاتنە پێشەوە. شڵەژان و سەرلێشێواوی بە تەواوی لەناو زۆربەی ڕیزەکانی تیپەکانماندا ڕووی دا و جەنگاوەران دەستیان کرد بە هاوار هاوار و کۆمەڵ کۆمەڵ بریندار و خوێناوی، یان بەدەست و قاچ قرتاوییەوە یان بەسەر پەڕاوییەوە دەکەوتنە سەر زەوی.

جەنگاوەرەکانی جاکۆ و هێزە یەدەکییەکەی بە هاوار و شمشێر ڕاوەشاندنەوە، پێش ئەوەی بەکاریشی بێنن و بیدەن بە دوژمندا بەرەو پێشەوە چوون.

دوا کاری منیش کە لە پێناوی خوادا کردم، ئەوە بوو دەستم کرد بە دوای هەڵگری ئاڵاکەی بێکیجوکدا.

بینیم لەگەڵ سەرکردەکەیدا بە پەرۆشەوە پارێزگاری لێدەکات.

جاکۆش کە منی بینی هەڵمەتم بردە سەر بێکیجوک گەیشتە لام. گەرچی ئەسپەکەم تا ناوقەدی لە قوڕدا نوقوم ببوو، لەگەڵ سەرکردە مەغۆلییەکەدا کەوتمە شەڕێکی قورس و سەختەوە. زۆر بە توندوتیژی و دڵڕەقییەوە بە یەکماندا دا. گەرچی شیرەکانیشمان بە تەواوی نەدەگەیشتە یەکتر. کە شیرەکانمان دەدا بە یەکدا و بەر قەڵغانەکانمان دەکەوتن دەنگی دەدایەوەو کەمێك ئازارمان بە یەك دەگەیاند پاشان توانیم زۆر بە شارەزاییانەوە لە ئەژنۆی بێکیجوك بدەمو برینێکی گەورەی تێبکەم. بەڵام ئەویش زۆر شارەزایانە شیرێکی لێدام گەرچی نەیتوانی بە باشی لێمبدا و بمپێکێ، بەڵام دەماری دەستی بڕیم و بریندارى کردم. لەسەر پشتی ئەسپەکەم وەرچەرخامەوە و خۆم بۆ نەگیرایەوە و لاسەنگ بووم، خەریکبوو لەسەر پشتی ئەسپەکەم بکەومە خوارەوە. بەڵام زۆر بە خێرایی لەسەر زینەکەم وەرچەرخامەوە، بینیم بێکیجوك لەسەر ئاوزەنگی ئەسپەکەی ڕاستبۆوە و شیرەکەی لەسەر سەرییەوە بەرزکردبۆوە بۆئەوەی پیامدا بکێشێت و بمکوژێت. ئا لەوکاتەدا کە وایدەزانی زاڵە بە سەرمدا بە تووڕەییەوە دانەکانی جیرکردبۆوە بەڵام ئەو قین و تووڕەبوونەی زۆری نەخایاند. جاکۆ ئەو ڕمبازە شارەزایە، هەروەك چۆن چەند ساڵێك لەمەوپێش لەو شەڕەدا چی لە سەرکردە بیابانییەکە کرد. ئاودەهاش لە پشتمەوە بە غار هات و ڕمێکی دا لە بێکیجوك و لەشی کرد بە دوو کەرتەوە و لەسەر پشتی ئەسپەکەی خستییە خوارەوە.

بەم جۆرە ئاڵای سەمەرقەند لەگەڵ سەرکردەکەیا کەوت. چونکە لەوکاتەدا بێکیجوك کوژراو کەوت. هەڵگری ئاڵاکە ئاوڕی بۆ لای بێکیجوك دایەوە، منیش هەڵگری ئاڵاکەم کوشت. لەبەرئەوە خێرا بانگم کرد کە ساج و تەپڵ ئامادە بێت و دەستبکەن بە لێدانیان. لێدانی ئەو تەپڵ و ساجانە و دەنگدانەوەیان سەرنجی هەموو پیاوانی بۆ لای ئاڵاکە ڕاکێشا. ئیتر سەربازە مەغۆلییەکان لەبەرئەوەی سەرکردەکەیان کوژرا و بێ سەرکردە مانەوە. بە هێواشی دەستیان بە کشانەوە کرد. ڕیزی سەربازەکان و ناوچەکەی من هێمنی باڵی بەسەردا کێشا. خێرا غارم دایە شوێنێکی بەرزەوە کە زەوییەکەی ڕەقانی بوو. چاوم گێڕا بە گشت لایەکی ناوچە و جەنگەکەدا. ئەنجامی شەڕ و پێکدادانەکە زۆر ئاڵۆز و نادیار بوو، نەمتوانی دەربارەی هیچ بڵێم.

بەڵام حاڵەتی باڵی چەپ زۆر ئاشکرا بوو. حسێن زۆر کشابۆوە بۆ دواوە. تەنها موفا و هێزە یەدەکییەکەی مابوونەوە و بەرهەڵستی دوژمنانیان دەکرد. بۆئەوەی خۆیان لەو تێکشکاندنە قووتار بکەن.

جەنگاوەرەکانی خۆم کۆکردەوە بۆ یارمەتیدانی حسێن چووم لە دواوە هێرشم کردە سەر هێزی مەغۆلەکان و سەرم لێشێواندن و شڵەژاندمن. چونکە "ئەلیاس خان" بێکیجوکی لەدەست چووبوو، لەبەرئەوە زۆر وریا و بە ئاگاهییەوە هێزە یەدەییەکەی دەنارده پێشەوە. سەرکەوتن لە بەردەممدا ڕوون و ئاشکرابوو. ئەفسەرێکم نارد بۆ لای حسێن بۆئەوەی داوای لێبکات بێت و لەگەڵمدا کۆببێتەوە. بەڵام حسێنم بینی بەرگری لەسەری خۆی دەکرد و دەستی کرد بە جنێودان و لێدان و زللەپیاکێشانی ئەفسەرەکە. چونکە لە کاتی شەڕ و پێکدادانندا زۆر قینی لە ئامۆژگارییەکانم دەبۆوە. ئیتر خۆی و پیاوەکانی بە تەواوی تێکشکان و لەو قوڕ و لیتەیەدا هەڵاتن و بۆی دەرچوون.

منیش دەستمکرد بە ڕێکخستنەوەی هەموو هێزەکانم.

ئەلیاس خان هەرکە بینی حسێن تێکشکاو ڕایکرد. غیرەتی پەیدا کرد و هێزە یەدەکییەکەی نارده پێشەوە و بەرەنگارمان ڕاوەستان و بە شڵەژاوی و سەرلێشێواوییەوە تاکو شەو شەڕمان کرد. هەرکە تاریکایی باڵی کێشا بەسەرماندا هێزەکەم بڵاوەیان لێکرد و منیش ناچاربووم بکشێمەوە.

لە دڵ و دەروونمدا هەستم بە ئێش و ئازار و خەفەتێکی زۆر کرد. بۆ ڕۆژی دوایی چوومەوە بۆ ناو چادرەکەی خۆم، کە لە پشت ڕیزەکانمەوە بوو. ئەلجایم بینی لە پشکۆی ئاگر گەرمتر بە پەرۆشەوە چاوەڕوانم دەکات. بە زەردەخەنەیەکەوە لێی پرسیم:

-قارەمانی تاکو تەنها چۆن لەو کۆڕی جەنگەدا ڕزگارت بوو؟

-بە شێوەیەکی زۆر خراپ ڕزگارم بوو، بە تەواوی تێکشکام، و ئەمەش خەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ براکەت. بەڵام پێمبڵێ کوا ئەو لە کوێیە؟

-حسێن زۆر توورە بوو. دڵشاد و هەندێ پیاوی توورە و داخ لە دڵی لەگەڵ خۆیدا برد و بەرەو باشوور ڕۆیشتن.

-زۆر چاکە، ڕزگارمان بوو لێی. ئەو هیچ یارمەتییەکی منی نەدا و کەڵك و سوودیشی نەبوو.

-ئەویش هەروای بە تۆ و بە خواش دەوت. وا دیارە خوا هەڵوێستی خۆی گۆڕیبوو. لە کاتێکدا بارانی باراند و یارمەتی دوژمنانی دا.

وەڵامی قسەکانیم نەدایەوە، چونکە هیچ وەڵامێکم پێنەبوو لەسەر فەرشێکی قوڕاوی ڕاکشام. ئەلجای نانێکی سارد و دۆلکەیەك ئاوی بۆ هێنام. پاشان پێشنیاری بۆ کردم و وتی:

-تەیموور، با ئێمەش خۆمان بگەیەنینە حسێن.

-نازانم، قەدر و حورمەت و سەروەریم لەدەست دەچێت. جارێکی تر ناتوانم هەڵمەت بەرمەوە.

-بۆ من وا چاکترە، هەیبەت و سەروەریت نەمێنێت وەك لەوەی ژیانت لەدەست بچێت.

لە دەرگای چادرەکەمەوە ئیلشی بانگی کردم. منیش فەرمووم لێکرد و بانگم کردە ژوورەوە. لێمپرسی:

-ئیلشی دەنگوباسی شەڕ چییە؟

-شازادەی گەورەم، زۆر خراپە، هەموو پیاوەکانمان بڵاومیان لێکردووە.

-ئەی دەنگوباسی جاکۆ چییە؟

-ئەو تاکو ئێستا تیپەکەی ماوە، بەڵام نازانم چەندی تر دەتوانێت خۆی ڕاگرێت.

-ئەی تۆ..؟

-من.. بۆ فەرمانت هاتوومەتە ئێرە، چونکە ئەلیاس خان بەڵێنی لێبووردنی دەرکردووە و نازناوی میر و میرنشینی ناوچەیەکیش بە خەڵات دەدات بەو کەسەی تۆ بکوژێت و سەرەکەی تۆی بۆ بەرێت. جا لەبەرئەوە من لەگەڵتدا دەمێنمەوە، یان لەگەڵتدا دەڕۆم.

ئەلجای پێی وت:

-ئیلشی لەگەڵماندا وەرە و کارێکی واش بکە تەیموریش لەگەڵماندا بێت و بڕۆین.

ئیلشی پێی وتم:

-منیش وای بە چاکتر دەزانم و ئەمەش باشترین ڕێگاچارەیە چونکە لێرە هیچ بەخت و شانسێکمان نەماوە.

منیش ویستم بیر لەم کارە بکەمەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەمتوانی و هیچ ئارەزووشم لەوە نەبوو، بیرو هۆشی خۆم بە بیرکردنەوە خەریك بکەم. هیچ چارێکم نەما لەوە زیاتر. وەڵامی ئیلشیم دایەوە، وتم:

-زۆر چاکە، ئیلشی بەڵام خەبەر بە جاکۆ بدە، بە شارەزایانەوە تیپەکەی پاشەکشە پێبکات و بکشێتەوە. تۆش بیست پیاو و چەند ئەسپێکی باش هەڵبژێرە و ئامادەی ڕۆیشتن بن.

من و ئەلجای پێکەوە دەستمانکرد بە پێچانەوەی کەلوپەلە گرانبەهاکانمان. ئەلجای هەرچی گەوهەر و خشڵ و زێڕ و مروارییەکی هەبوو، لەژێر کراس و جلەکانیدا شاردییەوە. و هەرچی قوماشێکی شاز و گرانبەهاشی هەبوو لە دووتوێی بەتانی و کەلوپەلە زبرەکاندا درووی و شاردییەوە.

منیش جلوبەرگی سەربازێکی ئاسایم لەبەرکرد و ئەلجایش جلوبەرگی ژنە جووتیارێکی لەبەرکرد.

پاش ماوەیەکی کەم ئیلشی گەڕایەوە و پیاوە هەڵبژاردە و ئەسپی حەساوە و وڵاخی بارهەلگری بۆ هەلگرتنی کەلوپەلەکانمان هێنا و بە هێواشی لە چادرەکانمانەوە هاتینە دەرێ و بەرەو ڕووبار و بیابانە دوورەکە کەوتینەڕێ.

لە کاتی ڕۆیشتنەکەماندا کۆمەڵ کۆمەڵ و تیپ تیپ و تاك تاك خەڵکانمان دەبینی ڕایاندەکرد.

بەڵام هەموو کۆمەڵ و تاقمێك لەوی تر دەترسان و بڵاوەیان دەکرد. ئیتر ئاوەها بە تەواوی شەو نەهاتبوو، وامان لێهات تەنها خۆمان لەسەر فەرشی ئەو بیابانە گەورەیەدا ماینەوە چەند ڕۆژێك بەم شێوەیە، بە بیابانەکەدا دەڕۆیشتین و لەناو ئەو هەوا وشك و گەرمەدا ڕێگامان دەبڕی. شەوانیش لە نزیك ئەو بیرانەوە کە شوانە تورکمانییەکان مەڕ و ئاژەڵەکانیان لێ ئاودەدا. چادرمان هەڵدەدا و دەمانکرد بە سەربازگەی خۆمان. ئەو شوانانەش گۆشت و مەڕی سەر براویان پێدەفرۆشتین و دەنگوباسی ئەملاو ئەولا و جیهانیان پێدەوتین و ئێمەش بەرامبەر ئەوانە مستیلە و هەندێ خشڵی زێڕ و زیومان دەدانێ.

ڕۆژانە دەڕۆیشتین و تیروکەوانەکانیشمان بە دەستەوە دەگرت و ئامادە و تەیار بووین بۆئەوەی بەرهەڵستی چەتە و ڕێگران و ئەو کۆمەڵانە بوەستینەوە کە ببوون بە چەتە و ڕێگر. شەوانەش لەژێر تریفەی ئەستێرەکاندا دەنووستین و ئەسپەکانیشمان لەناو پاوەنە گیا وشکەکاندا دەلەوەڕین. کاتێك لەگەڵ ئەلجایدا پێکەوە پاڵکەوتبووین و خۆمان لە ڕاخەرێکی خورییەوە پێچابوو، تەماشای ئەستێرەکانمان دەکرد و سەرنجمان دەدا. ئەلجای ڕووی تێکردم و وتی:

-من ئەم شوێنەم زۆر لە سەمەرقەند پێخۆشترە، چونکە بە درێژایی ڕۆژگار بە سواری لەگەڵمدایت و لێم جیانابیتەوەو شەوگاریش لەژێر یەك پێخەفدا لەگەڵمدا هاوبەشی دەکەیت و پێکەوە دەنووین.

بۆ ڕۆژی دوایی ئاومان لێبڕا. هەتا نیوەشەو بە دوای ئاودا گەڕاین. پاشان بیرێکمان دۆزییەوە بینیمان کۆمەڵە پیاوێکی زۆر بە دەوریدا سوڵگەیان بەستووە و پاسەوانەکانیشی لە هەموو لایەك و گشت ڕێگاکانیدا وەستابوون. ئێمەش زۆر پێویستمان بە ئاو هەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا لەوە دەترساین تا بەیانی چاوەڕوان بکەین و لە بەیانیدا ئەو خەڵکانەی لە دەوروبەری بیرەکەدا

مۆڵگەیان بەستبوو، بمانبینن و تێبگەن ژمارەمـان چەند کەمە. ئیلشی لە ئەسپەکەی دابەزی و بەرەو مۆڵگاکە بە پێ کەوتەڕێ. ئێمەش لە شوێنێکدا ڕاوەستاین و خۆمان شاردەوە. ماوەی یەك کاتژمێری تەواوی پێچوو. شەو زۆر ساردی کرد. چونکە نەماندەوێرا لە شوێنەکەی خۆماندا بجووڵێین، یەکی بەتانییەکمان دەرهێنا و لە خۆمانەوە پێچا. ئەسپەکانیشمان دەستیانکرد بە چەپۆکانە و سەرکەش و پرمەپرم و سمیان دەدا بە زەویدا و بۆنی ئاوی بیرە نزیکەکەیان دەکردو دەیانپرماند. نەشمان دەتوانی ئاویان بۆ بێنین. هەرکە دەنگی تەقەتەقی زینەکان و سمو لغاوەکانیان دەهات، لە مورەغەی پشتمەوە تا قولەپێی قاچم لە ترساندا دەلەرزی. من لەوە دەترسام ئەو دەنگەدەنگە بگاتە گوێی پاسەوانەکان و سەرنجیان بۆ لای ئێمە ڕابکێشێت و پێمان بزانن. کتوپڕ چەند پێیەك دوور لە خۆمانەوە گوێم لە خشەخشێکی سووك بوو. پاشان ئیلشی لە نزیکمەوە دەرکەوت و پێی وتم ژمارەی ئەو پیاوانە دوو ئەوەندەی ژمارەی پیاوەکانی ئێمە دەبن. و لێی پرسیم: وتی:

-هێرش بکەینە سەریان؟

ئەلجای پێش ئەوەی من قسەبکەم وەڵامی دایەوە، وتی:

-نەخێر..

منیش لێم پرسی:

-باشە کەوانە ئێمە چی بکەین؟

-ئێمە، من و تۆ، بەم جلانەوە دەچینە لای بیرەکە و داوای ئاویان لێدەکەین. ئەگەر ئەو پیاوانە باش بوون و بە شەرەف بوون، ئەوا ئیلشیش بانگ دەکەین و دۆلکەکانمان پڕدەکەین و بۆ ناو چادرەکانمان دەگەڕێینەوە.

وتم: ئەی ئەگەر ویستیان بمانگرن؟

وتی: ئەوکاتە ئیلشی دەتوانێت هێرش بکاتە سەریان. خۆ ئەگەر پێویستیش بکات، من لە بەردەم ئاگری چادرەکەدا خۆم ڕووت دەکەمەوەو لەش و لاری خۆمیان بۆ دەردەخەم و سەرنجی پیاوەکان بۆ لای خۆم ڕادەکێشم و ئیلشی لەو کاتەدا کتوپڕ هەڵمەتیان بکاتە سەر و بیانکوژێت. ئیلشی وتی:

-من لەو باوەڕەدام تۆ دەتوانیت سەرنجیان بۆ لای خۆت ڕابکێشیت.

وتی: بەڵێ من نیازم وایە وابکەم.

ئيلشى وتى: باشه، وا ئێمەش لەسەر پلانەكەى تۆ دەڕۆین. و تۆش دەتوانیت خۆت ڕووت بكەیتەوە و شایانى ئەوەى سەرنجى خەڵك ڕابكێشیت و تەماشات بكەن. بەم شێوەیە من و ئەلجاى ناشیرینترین ئەسپ و خراپترین كەلوپەلمان پێش خۆمان دا و بەرەو نزیكترین پاسەوان چووین. هەركە گەیشتینە نزیكترین پاسەوان. هاوارى لێكردین وتى:

-لە شوێنى خۆتاندا بوەستن.

ئێمەش بە هێواشى لە شوێنى خۆماندا ڕاوەستاین و ئەلجاى لێى پرسى:

-هاتووین تۆزێك ئاومان دەستكەوێت. ئایا دەتوانین تۆزێك ئاو بەرین؟

وتى: بەڵام ئێوە كێن؟

ئەلجاى وتى:

-شوانێك و ژنەكەى، و ڕانە مەڕەكەمان لێ ون بووە. بەڵام كێ گەورەى ئەم سەربازگەیەیە؟

پاسەوانەكە وتى: ئەمە پەیوەندى بە تۆوە نییە.

ئەلجاى وتى: كار هەرچۆنێك بێت، ئێمە هەندێ زێڕمان پێیە و دەمانەوێت تۆزێك ئاوى پێبكڕین.

وتى: زۆر چاكە لەگەڵمدا وەرن بۆ لاى شازادەكەم.

پاشان پاسەوانێكى ترى بانگ كرد و بردیانین بۆ لاى پیاوێك كە لە نزیك بیرەكەوە نووستبو. پاسەوانەكە شانى پیاوەكەى ڕاوەشاند و كتوپڕ پیاوەكە خێرا ڕاپەڕى و ڕاستبۆوە پاسەوانەكەش پاشەوپاش بۆ دواوە كشایەوە، تیشكى ئاگرى ناو چادرەكە بە جوانى دەیدا لە دەموچاوى شازادەكە. كاتێك ئەلجاى پیاوە نووستووەكەى بە باشى بینى، خێرا بەرەو پیرى چوو، ڤیژانى وتى: كێ؟ حسێن ئەمە تۆى؟

دەنگێكى تر بەرزبۆوە، وتى: ئەلجاى..!!

دڵشاد لە چادرەكەى بۆ پێشوازى كچە ئامۆزاكەى هاتەدەرەوە هەرچى سەربازگەكە بوو لە خەو هەستان. گەرچى من لە حسێن زۆر تووڕە و زویر بووم. بەڵام لەو كاتەدا سۆز و خۆشەویستییەكى تەواو و خۆشى لە نێوانماندا پەیدابوو. ئەو شەوە تا بەیانى بە خۆشى و شادى ماینەوە.

ڕۆژێكى تر لە دەورى بیرەكەدا ماینەوە، گوێمان لە قسە خۆشەكانى ئەو دوو ژنە دڵ خۆشە، گرتبوو. من و حسێنیش بەرامبەر یەكتر ڕووگرژ و مۆن و ساردوسڕ بووین. بەڵام چونكە ژنەكانمان لە گەڵماندا بوو. شێوازى قسەكانمان بەرامبەر یەكتر باش بوو. ئێمە هەردووكمان شادو

پێخۆشحاڵ بووین چونکە لەگەڵ هێزە ڕاکردووەکانماندا یەکمان گرتەوە و دوور بووین لە چنگی مەغۆلەکانەوە. ئەو مەغۆلانەی بە تەما بوون لە پێناوی سەری مندا خەڵات و پاداشی گەورەیان دەستکەوێت زۆر بە ڕێز و خۆ بە کەم زانینەوە، هەروەك ئەو زۆر لە من ژیرترو ڕوتبەشی لە من گەورەتر بێت لە حسێنم پرسی:

-لێرەوە بۆ کوێ بچین؟

وتی: با بچین بۆ خیفا من فەرمانڕەواکەی دەناسم و دەمانگرێتە خۆی و جێگا و ڕێگاشمان بۆ دابین دەکات.

وتم: باشە دوای ئەوە چی بکەین؟

وتی: دەچم بۆ هند و سامانێکی زۆر پێکەوە دەنێم و لەشکرێکی گەورەی پێ پێکدەهێنم و سەرکردایەتیان دەکەم و هێرش دەکەمە سەر ئەلیاس خان و تا ناوچەی باکووری بەستەڵەکی ڕاودەنێم.

-ئەی تۆ دەتەوێت چی بکەیت؟!

وتم: ئەلجای دەیەوێت ببم بە شوان!!

وتی: ئەمە بۆ تۆ لە هەموو شتێك چاکترە و هەر لە خۆت دەوەشێتەوە.

حسێن ئەمەی زۆر بە لەخۆبایی و گاڵتەجارییەوە پێ وتم. منیش زۆرم پێناخۆش بوو. پەشیمانیش بووم لەوەی ماوەم دا قسەی وا بکات. بەڵام دڵشاد زۆر بە دڵ وتی: باشە ناکرێت هەموومان ببین بە شوان؟ حسێن ناتوانی؟

حسێن بە فێز و سووکایەتییەوە، وەڵامی دایەوە:

-تۆش وەکو ئەلجای خوشکم تێنەگەیشتوو، بێهۆشیت. کتوپڕ بۆ لای من وەرگەڕایەوە و بانگی کردم وتی:

-تەیموور وەرە لەگەڵمدا، شتێکی خراپ ڕوویداوە.

بەرەو پیری ڕامکرد. ئەویش ئاماژەی بۆ وڵاخەکانمان کرد. هەموو ئەسپەکان و وڵاخەکانی تریش کە لە گردەکەدا بڵاوببوونەوە. یان لەسەر زەوییەکە کەوتبوون، یاخود وەك شێت لە شوێنەکەی خۆیدا دەسووڕایەوە. خێرا چووینە جێگاکەیان و بینیمان سێ ئەسپ مردووە و شەش ئەسپی کەش حاڵەتیان زۆر خراپ بوو. کەڵکیان نەمابوو. خۆمان بە دەستی خۆمان لە دووردوە تیربارانمان کردن و کوشتمانن. حسێن چەپکێك گیای هەڵگرت و بۆنی کرد و تۆزێکی خستە دەمییەوە و تامی کرد.

منیش وتم: وا دیاره گیایەکە بێ غەشە و هیچ عەیبی نییە. وا نییە؟

وتی: من هیچ خراپییەك لەم گیایەدا شك نابەم. بەڵام وا دیارە ئەم گیایە بێکەڵکە. بەڵام تەماشای گیاکە بکە، بەشی ئەوە دەکات، دە هەزار ئەسپ بکوژێت.

وتم: شانست هەبوو لێرەدا گشت ئەسپەکانت نەمردوون.

وتی: ئەگەر یەکەمجار، ئەوکاتەی هاتینە ئێرە، بەو کارەمان بزانیایە، چارەسەرێکمان دەکرد. ئەو زیانەمان لێنەدەکەوت. بەڵام ئێمە درەنگانێك گەیشتینە ئێرە و ئەم گرد و تەپۆڵکەو بەرزی و نزمیانەش رێگا بینینی لێگرتبووین.

وتم: وا چاکترە هەر ئێستا ئەم شوێنە جێبهێڵین و بڕۆین. پێش ئەوەی ئەسپەکانی تریشمان تووشی ئەم دەردە ببن وا دیارە ئەم گیایەی کە ماوە زیانبەخشە.

تەنها یەك شەو لەو شوێنەدا ماینەوە و لەو ماوەیەدا دوو ئەسپی ترمان لەدەست چوو. پاشان بەرەو خیڤا کەوتینەڕێ. دوای چەند ڕۆژێك شارەکەمان لێدەرکەوت، حسێن دەیویست یەکسەر بۆ بارەگای فەرمانڕەواکەی بچین. بەڵام من سوور بووم لەسەر ئەوە، کە لە دەری شووراکانەوە بوەستین و پشووبدەین و نوێنەر و هەندێ دیاریی بۆ بارەگای ئەو فەرمانڕەوایە بنێرین.

پاشان عەبدوڵڵای نۆکەرم بۆ هەواڵ ڤۆستنەوە و دەنگوباس زانین بۆ لای کارەکەرەکان نارد. لە ڕاستیدا من باش و شارەزایانەم کرد، چونکە گەرچی فەرمانڕەواکە دیارییەکانی وەرگرت و دیاریشی بۆ ناردین و داوای لێکردین بچین بۆ لای و بیبینین.

-دەنگوباسی ئەو پاداش و خەڵاتەی بۆ کوشتن و سەربڕینی تۆ دانراوە، گەیشتۆتە "خیڤا" و فەرمانڕەواکەشی دەیەوێت ئەو پاداش و خەڵاتەی بۆ خۆی دەستکەوێت.

منیش ئەو خەتەریاتەی هەڕەشەی لێدەکردم بە حسێنم نەوت. بەڵام بە ئیلشیم وت و بە وردی بۆم باسکرد. ئیتر هەمووومان بڕیارمان دا، نەچینە بارەگای فەرمانڕەواکەوە.

پیاوەکانی حسێنیش لەوە دەترسان، ئەمە داوێك بێت بۆ ئەوان نرابێتەوە. لەبەرئەوە داوایان لە حسێن کرد پەلە نەکات تاکو کابرای فەرمانڕەوا بۆ دیدەنیمان دێت. کاتێك پیاوانی خیڤا هاتن بۆ لامان زۆر بە ئاشکرایی دیاربوو، دەیانویست گۆبەندێکمان پێبگێڕن. چونکە هەموویان پڕ چەك بوون و ئامادەی شەڕ بوون و دوو سەد پیاوی جەنگاوەری هەڵبژاردەی باشیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو. خێرا عەبدوڵڵام نارد بەئەوەی ئەلجای و دڵشاد و هەندێك ئەسپ و بارگیری بارهەڵگر لە دۆڵە تەسکەکەی نزیك ڕووباری "ئامۆ دەریا"وە بشارێتەوە. پیاوەکانی خۆشم بە ئامادەیی بۆ شەڕکردن دانا لە کاتێکدا ئەگەر پیاوەکانی خیڤا بگەنە لامان و نیازی شەڕیان

هەبێت هیچ پێچ و پەنا و رووکەشییەکی درۆ لە هەڵوێستی پیاوەکانی خیڤادا نەبوو. چونکە زۆر بە ئاشکرا و خێراییەوە هەڵمەتیان بۆ هێناین. بەڵام ئێمەش بە تەواوی ئامادەی شەڕ بووین پێشەکی تۆزێك ڕامانکرد و بە دوای خۆماندا هەندێ تیری ئاسایی و تیری درێژمان تێگرتن. چونکە شێوە و ڕێگای بەکارهێنانی تیروکەوانەکانمانیان نەدەزانی. ریزی هێرش بەرەکانمان بە تەواوی شڵەژاند و سەرمان لێ شێواندن.

لە کاتێکدا پیاوەکانی خیڤا یەکیان گرتەوە و کۆمەڵ ببوون، بۆ ئەوەی بەر تیروکەوانمان بدەن. خێرا بۆیان گەڕاینە دواوە و ئابڵووقەی پیاوەکانمان دا.

ئەسپەکەی ئیلشی سەرسمی دا و کەوت، بەڵام ئیلشی ڕاستبۆوە و دەستیکرد بە تیرهاویشتن بۆیان. پیاوەکانی خیڤاش بە غار بەرەو ڕووی دەهاتن. هەرکە بینیم جێگایەکی باشی نییە، خۆی تیادا بپارێزێت، خێرا ڕامکردە لای و ژێی کەوانەکەیم پچڕاند و مەجبوورم کرد پێش ئەوەی سوارەکانی دوژمن بگەنە لای ڕابکاتە شوێنێکی باش و قایمەوە و خۆی تیادا بپارێزێت. دوای ئەوە بۆ لای هێرشبەران وەرگەڕامەوە و بانگی پیاوەکانی خۆمم کرد و ئەوانیش وەرگەڕانەوە و وتم:

هێرش بکەنە سەر ئەو کۆمەڵەی لە دوای فەرمانڕەواکەوە بە غار دەڕۆن. چونکە ئەوانە هێزی سەرەکی پیاوەکانێتی.

تیرەکەم ڕێك کردە نێوان دوو کوڵمەکانییەوە و لە دوا تیرمدا لە سەرپشتی ئەسپەکەیەوە خستمە خوارێ. بەردەوام بەرەو پیری دەچووم. ویستی هەستێتەوە و تیرێکی تەقاند و دای لە قاچی چەپم. بەڵام من تۆزێك خۆم خوارکردەوە، بە لای یەکێك لە ئاوزەنگی ئەسپەکەمدا و ڕمێکم لە دەستی یەکێك لە پیاوە کوژراوەکانی خیڤا دەرهێنا و دام لە فەرمانڕەواکە و بە پشتا لەسەر زەوییەکە تەختم کرد. کاتێك ئاوڕم بۆ دوای خۆم دایەوە بینیم حسێن لە پشتمەوەیە. ئێمە هەردووکمان بە تەواوی لە پیاوەکانمان دابڕابووین و تیرەکانی دوژمن دەمانگەیشتن، لەبەرئەوە داوام لە حسێن کرد دوام کەوێت تاکو بچینە دوای سەنگەر و جێگایەکی قایمەوە.

پیاوەکانی شاری خیڤاش دەیانویست دوای پاشماوەی جەنگاوەرەکانمان بکەون. چونکە ئالاهەلگرەکانمان بەردەوام شەڕیان لەگەڵدا دەکردن. هەردوو تیپەکە لە تۆز و خۆڵدا لە پێش چاوماندا ونبوون. تەنها ئەوکاتە لە قاچی چەپمدا هەستم بە ئازارێکی زۆر کرد. هەر ئەو کاتە تیرەکەم ڕاکێشا و سەری تیرەکەم لە قاچمدا دەرهێنا.

حسێن تەماشای برینەکەی کرد و وتی:

-ئێسقانەکەی شکاوە. پێڵاوەکەی دڕاندم و بە پارچە قوماشێك قاچمی بەست و پێچایەوە. پاشان بەرەو هەواری ژنەکانمان لە نزیك رووبارەکەوە رۆیشتین. بڕیارمان دا تا شەو نەیەت و تاریك دانەیەت لە شوێنی خۆماندا نەجووڵێین.

حسێن و عەبدوڵڵا لە گەرووی ئەو دۆڵەی ئەلجای و دڵشاد خۆیان تیادا شاردبۆوە، پاسەوانیان گرت. منیش لە تەنیشت گۆمە ئاوێکی پیس و بۆگەنی رووباری ئامۆدەریاوە ڕاکشام و ئەلجای دەستیکرد بە شتنی برینەکەی قاچم. منیش دەستم بە قژ و دەموچاویدا دەهێنا و هەستم بە لێدانی دەمارەکانی دەموچاوی دەکرد و بیرم لە هەڵاتنەکەمان دەکردەوە کەوا پێنج کەس و هەشت ئەسپ مابووینەوە لە دووری چەند میلێك بێ دۆست و برادەر و پشت و پەنا. تاسێکی کوشتێنەر بەسەرمدا هات و ئەو هەڵمەت و شەڕە پیرۆزە ناخۆشەم بە تەواوی بیرکەوتەوە، کە لە پێناوی خوادا بۆی جەنگام و تێکۆشام. بیرم لەو کێشە نەفرەت لێکراوە دەکردەوە، کە بە هۆی ئەو جەنگە پیرۆزەوە تووشم هات. ئێش و ئازاریش لە دڵ و دەروونمدا هێندەی قاچە بریندارەکەم زیاتر بوو.

لەگەڵ ئەوەشدا هەر بەردەوام بووم لە دەست پیاهێنانی لەشە تەڕ و نەرم و نۆڵەکەی ئەلجایدا لە کاتێکدا ئەویش بەردەوام هەوڵیدەدا تۆزێك لەو تایەی لێم هاتبوو کەمی بکاتەوە، هەموو شتێکم بیرچووبۆوە جگە لە ئەلجای و ئەو نەهامەتی و نەگبەتییە نەبێت کە بەسەرمدا هاتبوو.

دڵشادیش بەرامبەرم دانیشتبوو، سەرنجی منی دەدا و تەماشای ئەلجای دەکرد. مەستی ئەوە بوو، کەوا من چۆن بەو شێوەیە تەماشای ئەلجای دەکەم و گرنگی زۆر بە ئەلجای ئامۆزای دەدەم. هەرکە من تەماشام دەکرد (واتە تەماشای دڵشاد) بە پێکەنینێکی تایبەتییەوە بۆم پێدەکەنی و بە شێوەیەکی سەیر و جیاوازیش چاوی تێبڕیبووم و سەیری دەکردم. تەماشاکردنەکەی تەماشاکردنێکی جیا بوو، تەماشاکردنی دۆستانە نەبوو.

هەر کە شەو هات و تاریکایی داهات. قاچم بە شێوەیەکی زۆر خراپ دەستیکرد بە ئێش و ئازار. ئەلجای هیچ چارێکی نەما لەوە زیاتر بەلامەوە دابنیشێت. حسێنیش زۆر بێزاری و ناڕەزایی دەردەبڕی و بە ناچاریشەوە لەگەڵماندا مایەوە. چارم نەما لەوە زیاتر لە شوێنەکەی ئەوێدا دانیشتم و لە گەرووی دۆڵەکەدا لە جیاتی ئەو ئێشکم گرت. بۆئەوەی لەگەڵ ئەلجای و دڵشادا بڕۆن و تۆزێك بخەون. بەڵام ئەلجای نەیدەویست یەك تۆز لە من دووربکەوێتەوەو لەبەرچاویدا ون بم. هەر دەیویست لەگەڵمدا بێت. بەڵام زۆر هیلاك و ماندوو بوو. لەبەرئەوە

پێم وت: ئازارم کەم بۆتەوە خەریکە ئازارم نەمێنێت. هەرچۆنێك بێت ڕازیم کرد بڕوات و بنوێت، بەڵێنم پێدا هەرکە ئێش و ئازارم بۆ هاتەوە بانگی بکەم. ئیتر ئاوەها لە گەرووی دۆڵەکەدا لەو شەوە تاریکەدا بە خەبەر و بە ئاگا بووم. پاش چەند کاتژمێرێك (یان وام بە خەیاڵدا هات) گوێم لە دەنگی تەپەی پێ بوو لەسەر چەوەکەی پشتمەوە هات. لەو زەلامەی بۆ لام دەهات، لێم پرسی وتم:

-ئەوە کێیە؟ ئەلجای ئەوە تۆی؟!

زەلامەکەی بۆ لام دەهات، وتی:

-نەخێر، ئەلجای نووستووە. من دڵشادم!! و حسێنیش نووستوە. وامزانی تۆ پێویستیت بە منە.

وتم: نەخێر.. دڵشاد من زۆر چاکم.

دڵشاد هات و لە تەنیشتمەوە دانیشت، لەبەرئەوەی شەو زۆر سارد بوو، لێم نزیك کەوتەوە و هاتە پاڵمەوە. چەند چرکەیەك هیچی نەوت.

پاش ئەوە زۆر بە سۆز و دڵنەرمی و میهرەبانییەوە پێی وتم:

-تەیموور میهر و خۆشەویستیت بەرامبەرم هەبێت. وەك چۆن دەستت دەدا لە ئەلجایەوە و هەڵتدەگوشی، ئاوەهاش دەستم بۆ بێنە و هەڵمگوشە تەیموور.. هەڵمگوشە و بمنووسێنە بە خۆتەوە، ماچم بکە.. حسێن هیچ کات هەڵمناگوشێت و نامنووسێنێت بە خۆیەوەو ماچم ناکات. باوەشم پیادا کرد و نووساندم بە سنگمەوە و دەستم هێنا بە سەر قژ و لەشیدا و ماچم کرد، بینیم هەر لە ئەلجای دەچێت.

پاشان دەستی درێژکرد و دەستی گرتم و خستیە سەر سنگ و مەمکە ڕووتەکەی و وردە وردە هانی دەدام زیاتر دەست لە مەمك و لەش و بەسەر.. دا بهێنم و ئیتر شل بوو، بینیم لەسەر زەوییەکە ڕاکشا و بانگی کردم و زۆر بە ئارەزوویەکی گەرم و گوڕەوە هەناسەی سوار ببوو، خەریك بوو هەناسەی بوەستێت. وتی:

-تەیموور، زۆرتر، زۆرتر دەستم تێوەردە و هەڵمگوشە و.. وەرە..

بەڵام من حەزم نەدەکرد هەراو هوریا و ناکۆکی لە نێوان من و حسێندا بقەومێت و ناخۆشیو دووبەرەکی لە نێوانماندا ڕووبدات. حەزیشم نەدەکرد دڵی دڵشاد بیەشێنم و تووڕەی بکەم. بە تایبەتیش کە زۆر لە کچە مامەکەی دەچوو هەر لەو کاتەشدا قاچم بە شێوەیەکی زۆر

زۆر و توند و گران ئازاری هەبوو، یەکجار دەیەشا. لەبەرئەوە بە ناچاری وەڵامی دڵشادم دایەوە، پێم وت:

-نەخێر دڵشاد نەخێر.. لەم شوێنە و لەم دۆڵە دوور و سەر لەدا نا..

-نا.. نا.. تەیموور. تکایە بیکە.. چیم لێت دەوێت بیکە..

-ئەوەی تۆ حەزی پێدەکەیت لەگەڵتا بیکەم.. دەیکەم.. بەڵام کاتێکی تر. لە کاتێکدا کە لەناو جێگایەکی نەرم و شل و ژوورێکی پڕ لە گوڵدا بین و زۆر لە ئێستا زیاتر ئارەزووومان هەستابێت. منت ئاوەها تۆم دەوێت.. واتە وەك ژنە شازادەیەك کە شایانی دەست لەملکردن و ڕابواردن بێت، نەك وەك ئێستا.

وتی: ئەگەر خۆشت بوێم، وەك چۆن ئەلجایت بە میهرەبانی و بە شەرمەفییەوە خۆشدەوێت..! تەیموور ئەوا منیش چاوەڕوانیت دەکەم!!

وتم: بەڵێ.. بڕوای تەواوت پێم هەبێت.

من ئەمدەزانی لە سەربازگەکەی حسێندا کەی پێویستم بە هاوپەیمانێك دەبێت. لەبەرئەوە ویستم دڵی ڕاگرم و دڵی نەشکێنم. دوای ئەوە قاچی پاك بۆ شتم و خاوێنی کردەوە دوای ماوەیەکی کەم گەڕایەوە بۆ دۆڵەکە، بۆ ئەو شوێنەی حسێن و ئەلجای تێدا نووستبوو.

لە ڕۆژی دواییدا ئازاری قاچم زۆر زیادی کرد و ئۆقرەی لێبڕیم. حسێنیش پەیتا پەیتا بە درێژایی ئەو ڕۆژە بە دۆڵەکەدا دەهات و دەچوو، جنێوی دەدا و دەیوت: پێویستە ئێمە ئێرە جێبهێڵین و بڕۆین. کاتی خۆرئاوا نیتر توانای مانەوەی نەما و بە بێزاری و ڕووگرژی و سارد و سڕییەکەوە پێی وتم:

-پێویستە ئەمشەو لێرە بڕۆین.

ئەلجای بە توندی و تووڕەییەوە وەڵامی دایەوە:

-نەخێر، پێویست نییە و پێویست ناکات بڕۆین. قاچی تەیموور لە شەوانی پێشووتر خراپترە.

حسێن بە تووڕەییەوە، وەڵامی دایەوە:

-من و دڵشاد ئەمشەو دەڕۆین، ئێوە ئەگەر دەتانەوێت پێکەوە لێرە بمێننەوە، بمێننەوە، بەڵام من خۆم نامێنمەوە و چاوەڕوانی پیاوێکی شەل ناکەم!!

ئەلجای بەسەر براکەیدا قیژاندی، بە قریشکەیەکی ئەوەندە زۆر توند و تووڕەییەوە باسناکرێت بە براکەی وت:

-پێی مەڵێ شەل!!

زۆر بێئابڕوو و ناپیاوانەیی و ڤین لە دڵییەوە، بێشەرمانە پێکەنی و لێی پرسی وتی:

-باشە، ئەو شەل نییە، ئەی چییە؟

کەواتە وا چاکتر نییە پێی بڵێین تەیمووری لەنگ یان تەیمووره شەل.

ئا لەم کاتەدا زۆر زۆر ڤینم لە حسێن بۆوە، ڤینێکی وا کە لەمەوپێش هەرگیز ڤینی وام لێنەبووبۆوە.

منیش پێم وت:

-حسێن برۆ، برۆ بۆ هند، برۆ بۆ دۆزەخ، لەبەرچاوم مەمێنە و دوورکەوەرەوە!! برۆ، سێ ئەسپ بەرەو وازمان لێبێنە.

کاتێك تاریکایی شەو بە تەواوی باڵی کێشا بەسەرماندا حسێن و دڵشاد ڕۆیشتن و جێیان هێشتین. کاتێك دڵشاد ڕۆیشت و جێی هێشتین فرمێسك بە خوڕ بەسەر کوڵمەکانیدا دەهاتە خوارێ.

بەڵام کە حسێن دەستیکرد بە ڕۆیشتن یەك قسەی نەکرد. عەبدوڵڵا هات بۆ لام و پێی وتم:

-شازادە حسێن چوار ئەسپی برد.

ئاوەها لەو پێنج هەزار جەنگاوەرەی لە پێناوی خوادا بردمن بۆ شەڕ و غەزا و تێکۆشان هیچیان نەمانەوە تەنها چوار ئەسپ و ژنێك و نۆکەرێك و پیاوێکی شەل نەبێت.

* * *

## مردنی ئەلجای

لە دەربەندەکەدا ئەوەندە ماینەوە هەتا خواردنەکەمان کۆتایی هات. عەبدوڵڵا تۆزێك دوور لە حەشارگەکەمانەوە هەندێ ڕۆنی نەباتی لە درزی بەردەکاندا دۆزییەوە.

ئەلجایش ئەو تۆزە ڕۆنەی لەگەڵ هەندێ گژوگیادا تێکەڵ کرد و شێلای، مەلحەمێکی بە سوودی دروستکرد و ڤاچی پێ چەور کردم. پاش ئەوەی ئەلجای بەو ڕۆنە چەند جارێك ڤاچی چەورکردم و پێی هەنوو، وردە وردە ئاوسانی ڤاچم نیشتەوە، و ئازارەکەی زۆر کەم بۆوە، تەنها ژاو برینەکەم ئازارێکی زۆر کەمی مابوو. لە کاتێکدا پێکەوە دانیشتبووین بۆنەوەی ئەو ژەمە نانەی مابوو لەگەڵ گۆشتی ئەو باڵندانەی عەبدوڵڵا ڕاوی کردبوون بیخۆین. هەموو وامان بە چاك زانی، پێویستە لە سەرمان ئەو دۆڵ و دەربەندە جێبهێڵین و ڕەو بکەین بۆ لایەکی تر.

منیش دەمتوانی سواری پشتی ولاخ ببم و لە سەری خۆم ڕاگرم. گەرچی قاچیشم قورس بوو، چونکە کێم و خوێنی پیس لە دەمی برینەکەدا کۆببۆوە. بەلام دەمتوانی قاچ بخەمە ناو ئاوزەنگی زینەکەوە و لەسەر زینەکەوە قاچم بجولێنم و بەردەوام بم لە ڕۆیشتندا.

ئاوەها بەردەوام بووین لە ڕۆیشتندا. بەلام ڕۆیشتنەکەمان بە هێواشی بوو. لە کاتی ڕۆیشتنماندا نەدەوەستاین مەگەر بۆئەوە نەبێت هەندێ جار تۆزێك پشوو بدەین.

لەناو جل و بەرگ و کەلوپەلەکانماندا ماڵ و سامانێکی باشمان پێبوو. خواردنمان لە شوانی ئەو ڕانە مەڕانە دەکڕی کە مێگەلە مەڕەکانیان لەو ناوە، لە نزیك ڕووبارەکەوە بەرەلا کردبوو، بۆ خۆیان دەلەوەڕین. هەندێ جاریش بە ناچاری بە بیابانەکەدا دەڕۆیشتین بۆئەوەی لەو ئاوەی لە لەکەوە دەچۆڕا ئاوی خواردنمان دەستکەوێت. چونکە ئەو ئاوەی لە ڕووبارەکەدا بوو، بە کەڵکی خواردنەوە نەدەهات، تەنها بۆ ئاژەڵ نەبێت. بەڵکو هەندێ جاریش بە کەڵکی خواردنەوەی ئاژەڵیش نەدەهات. چونکە جارێك دوو ولاخ لە ولاخەکانمان مردن، چونکە لەو ئاوەیان خواردەوە. ئیتر دوای ئەوە من و عەبدوللا بە پێ دەڕۆیشتین و ولاخێکمان لێدەخوڕی کە بە بەهاترین و قورسترین کەلوپەلەکانمانی هەلگرتبوو.

ئەلجایش سواری ولاخەکەی تر ببوو. عەبدوللاش توورەکەیەکی گەورەی بە کۆڵی خۆی هەلگرتبوو.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەلجای بە قاقای پێکەنینێکی گاڵتەپێکردنەوە پێی وتم:

-شازادە تەیموور تۆ ئێستا بە پێ دەڕۆیت و ولاخێکیش بە بارەوە لێدەخوڕیت. بەلام لەمەوپێش بێزت نەدەهات و قایل نەدەبوویت بە پێ بچیتە بەردەم تەویلەی ئەسپەکانتەوە. لەبەردەم دەرگای کۆشکەکەتدا ڕادەوەستایت تاکو خزمەتکار و مەیتەرەکان ئەسپەکەتیان بۆ دەهانیت!! دوای ئەوە چاوەکانی زەق بۆوە و پڕبوون لە فرمێسکی خەمباری و بە شێوەیەکی زۆر خەمبارییەوە وتی:

-تەیمووری خۆشەویستم، سەیرە ئێستا قاچت نایەشێت وەرە ها ئەسپەکەی من بگرە و سواری بە.. با من بە پێ بڕۆم. نەمهێشت لەسەر پشتی ئەسپەکەی بێتە خوارەوە، پێم وت:

-نا.. نا.. هەردەگەینە هۆزێك کە ولاخی باشیان هەبێت و لەو هۆزەش چەند ئەسپێکی باش دەکڕین و قاچیشم پێویستی بە تۆزێك وەرزش و ڕاهێنان هەیە.

لە ڕۆیشتنەکەمدا قاچم ئازاری دەدام و دەشەلیم. هەرکە تەماشای ئەلجایم دەکرد، دەمبینی چاوی تێبڕیوم و تەماشام دەکات. ترس لەهەر هەنگاوێکم هەبوو کە دەمنا. منیش بێگومان بووم لەوە کە شەلییەکەی من زیاتر ئازاری بەو دەگەیاند، وەك لەو ئازارەی بە منی دەگەیاند.

پاشان هەندێ پیاومان تووش هات ئەسپیان پێبوو. ئەم کۆمەڵەش هەندێ پیاوی فارس بوون، ئەسپی بەهێز و چاکیان پێبوو. لە دەوری بیرێکدا لەو بیابانەدا مۆڵگەیان بەستبوو. لەبەرئەوەی ئێمە جلی وەك جووتیار و وەرزێرمان لەبەردا بوو، ئەو پیاوانە سەرنجیان نەداین و هیچ گوێیان پێنەداین. بە گەورەکەیانم وت، کە چەند وڵاخێکمان پێبفرۆشێت. سەرکردەی ئەو پیاوانە بە دوودڵی و گومانێکەوە پێی وتم:

-دەتوانیت تا چەندی پێ بدەیت؟

بە کەش و فش و خۆهەڵکێشانێکەوە وەڵامم دایەوە:

-هەندێ گەوهەرم پێیە کەوا شازادەی سەروەرم پێیداوم.

بەڵام کابرای کە جزدانەکەم بۆ ڕاگرتبوو، گورج لێی وەرگرتم و کردییەوە، کاتێك ئەو گەوهەرە گرانبەهایانەی بینی سەری سووڕما و بە وردییەکەوە تەماشای کردم و وتی:

-کابرا وا دیارە تۆ دزیت و دزیت لە شازادەکەت کردووە، من ناتوانم ئەم وڵاخانەت پێبفرۆشم، وا چاکترە بتبەم بۆ لای عەلی بەگی سەردار و گەورەم.

ئیتر ئەو کابرایە وڵاخی چاکی داینێ و بردینی بۆ لادێیەك خانووەکانی لە شێوەی زنج و لە خشتی کاڵ، لە مێرگێکدا کە چەند میلێك کەوتبووە خوارووی ڕووبارەکەوە دروستکرابوون.

عەلی بەگ جلێکی شڕ و پیس و چەپەڵی لەبەردا بوو، بە چاکی لێی پرسیم وتی:

-کابرا ئەم تاڵانییەت لە کوێ دەستکەوتووە؟

وتم: لە سەردارە گەورەکەم دەستم کەوتووە، ئەویش منی زۆر خۆشدەوێت.

وتی: ئەو سەردارە گەورەیەت کێیە؟

وتم: ئەوە شازادە تەیموورە، سەرداری هۆزی برلاس و نۆکەری خوا!!

وتی: ناوبانگیم بیستووە. ڕەنگە بتوانێت لە پێناو ڕزگارکردنتا پارەیەکی زۆرت بۆ بدات.

پاش ئەوەی زۆر بە باشی تەماشای کردین و سەرنجی داین، بینی ئەلجای زۆر لات و زەعیفە بە کەڵکی .. پی نایەت. خستینییە ئـو تەویلەیەکی پیسەوە و دەرگای لەسەر قفڵ داین و عەبدوڵڵاشی لە دەرەوەی تەویلەکەدا بە زنجیر چاك بەستییەوە لەو بەندیخانە بۆگەنەدا ماوەی دوو مانگ ماینەوە..

عەلی بەگیش لەو ماوەیەدا بەردەوام هەوڵی دەدا لە بری ڕزگارکردنی ئێمەدا پارەیەکی باشی لە شەهری سیبز دەستکەوێت.

تەندروستی ئەلجای وردە وردە خراپ بوو. تەندروستی تێکچوو. زۆر ڕق و قینم هەستا. سوێندم خوارد هەتا من لە ژیاندا بم هیچ مرۆڤێک بەند نەکەم. پاش ئەوەی تێگەیشتم، بەندیخانە چ کارێك دەکاتە سەر نەفس و دەروونی مرۆڤ. بە ڕاستی بۆ مرۆڤ وا چاکترە ئەگەر تاوانبار و خراپ بێت، بکوژرێت یان دەست و قاچی ببڕێت یان هەموو ڕۆژێك دارکاری بکرێت چاکترە وەك لەوەی ڕۆح و دەروونی لە بەندیخانەدا وردە وردە تاڵاوی مردن بچێژێت.

لە کاتێکدا عەلی بەگ گفتوگۆی دەکرد. منیش لە قین و بوغزدا گڕم گرتبوو دەسووتام و جنێوم دەدا و کفرم دەکرد. بەڵام من خۆم هیچم نەبیست. بەڵام عەبدوڵڵا توانیبووی ببێت بە هاوڕێی هەندێ لە خزمەتکارانی عەلی بەگ و لەوانەوە هەندێ زانیاری و دەنگوباسیان پێ وتبوو. لە درەنگانێکی شەودا گوێم لە نۆکەر و خزمەتکارەکانی عەلی بەگ بوو، لە دەرەوەی تەویلەی مەڕەکاندا کە عەلی بەگ کردبووی بە بەندیخانەی من و ئەلجای. لەگەڵ عەبدوڵڵادا قسەیان دەکرد، هەر کە ئەو خزمەتکارانە دەڕۆیشتن عەبدوڵڵا لە درزی دیوارەکەوە هەندێ خواردن و زانیاری دەدامێ. عەبدوڵڵا ئەوەی بڵاوکردبۆوە و ئاشکرای کردبوو، من خۆم تەیموورم و هەر منم دۆست و پشت و پەنای خزمەتکاران و کۆیلەکان و بێنەوایان. وە هەر من بووم ئەو ژنە جوانەم پێشکەش بە عەبدوڵڵا خۆی کردووە و هەر منیش بووم، هاروونم لەژێر باری کۆیلایەتیدا ڕزگار کردووە.

دەنگوباس و چیرۆکی زۆرتری لەناو خزمەتکار و نۆکەران و کۆیلەکاندا بڵاوکردبۆوە. کە گشتیان خۆی بە بیری خۆی دروستی کردبوون و هێنابوویە کایەوە. ئەوەی پێوتبوون و بۆی ڕوونکردبوونەوە، گوایە من بە دزییەوە کۆچ دەکەم لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، تاکو لە کێشەو ناخۆشییە قورس و گرانەکانی کۆیلە و چینە هەژارە چەوساوەکان بگەم کە بە دەستییەوە دەناڵێنن.

کاتێك عەلی بەگ ئەم بەندوباو و دەنگوباسانەی بیست "لە ڕاستیشدا عەلی بەگ پیاوێکی بێتوانا و ترسنۆکیش بوو" پەنای بردە لای شێخ ئیبنو سەعیدی برادەری، کە ئەویش سەرۆکی کۆمەڵە پیاوێك و دۆست و برادەری شێخ عەلی بوو، خێرا ئیبن سەعید دیاریی بۆ ناردم و ئامۆژگاری عەلی بەگی کرد زۆر بە زوویی بەرم بدات. دەنا قین و تووڕەیی گەلەکەی خاتوو شێرێزا بەسەر خۆیدا دەڕژێنێت.

عەلی بەگ ناردی بە شوێنماندا و لە بەندیخانەکەی دەری هێناین و بە شێوازی ئاشتی و برادەرییەوە رووی تێکردم و وتی:

-ئەی شازادە، گوناهێکی گەورەم دەربارەت کردووە، بەڵام پێویست بوو خۆت پێت بووتمایە کە تۆ شازادە تەیمووریت و مێردی شازادەی گەورە و بەرێزمان خاتوو شێرێزایت!!

منیش بێگومان بووم لەوە ئەم پیاوە فارسییە بێهۆشە دەیزانی کێ مێردی خاتوو شێرێزایە. بەڵام ئەو بەڵێن و پاداشە گەورەیەی خاقانی نەبیستبوو کە داینابوو بیدات بەو کەسە سەری منی بۆ ببات.

تۆزێك بە لووت بەرزی و خۆ بە زل زانینەوە وەڵامم دایەوە:

-ئەگەر ئەو کاتە پێم بووتیتایە، تۆ بڕوات پێنەدەکردم بەڵام لەبەرئەوەی ئێستا ڕاستیت بۆ دەرکەوتووە. خێرا هەر ئێستا بەرەڵامان بکە، کەلوپەل و شتەکانمان بدەرەوە و ئەسپی چاکیشمان بدەرێ.

وتی: بێگومان، من بەرەڵاتان دەکەم. بەڵام ئەوەش باش بزانن، ئەو دوو مانگەی پێشوو، خزمەتم کردوون و خواردنم داونەتێ، زۆرم لەسەر کەوتووە. لەبەرئەوە هەرچییەکتان لە ماڵ و سامان و شتومەك هەیە، هەتا ئەو دیارییانەش کە لە براکەمەوە وەرمگرتووە ناگاتە نرخی ئەوەی کە تیامدا خەرج کردوون.

وتم: لەو تەویلە پیس و بۆگەنەدا پارەت بۆ خەرج کردووین؟

وتی: وەك کۆشکەکەی تۆ خۆش و ئاوەدان و جێی ڕابواردن نییە. بەڵام چاکترین جێگا بوو کە من توانیبێتم پێشکەشتان بکەم. تۆش لە من زیاتر بەخشندە و میهرەبانتریت. نیازیشم هەیە کەژاوەیەك کە شایانی ژنە شازادەکەت بێت بۆی ئامادە بکەم و باری وڵاخێکی بچووکیش خواردنتان بدەمێ. بێگومانم ئەمەش بەسە بۆ بەڕێکردنتان.

ئەو حوشترەی کەژاوەکەی ئەلجای هەڵگرتبوو حوشترێکی لاتی گەڕی پیر بوو. چەندەها پینەی جۆراوجۆر لەسەر ئەو برینانەی سەرپشتی بوو کە چەندساڵێك بوو چاك نەبووبووەوە و ساڕێژ نەدەبوون.

وڵاخە بچووکەکەش حاڵی لە حاڵی حوشترە گەڕەکە باشتر نەبوو. خواردنەکەش زۆر بە کەڵکی خواردن نەدەهات. لەگەڵ ئەوەشدا بە ناچاری دەستمان کرد بە ڕۆیشتن.

کاتێك ئەلجای لەسەر کەژاوە ڕزیوەکە دانیشت بە بێهێزییەکی تەواو و ئاشکراوە لێی پرسیم وتی:

-تەیمووری خۆشەویستم ئێستا بۆ کوێ بچین؟

وتم: خۆشەویستەکەم بۆ سەمەرقەند دەچین. بۆ ئەوەی بتبەم بۆ لای پزیشکێك و تێتبڕوانێت و چارەسەرێکت بکات.

پاشان بە پێکەنینەوە تەماشایەکی ئەو قافڵەیەمانی کرد، کە پیاو بەزەیی پیادا دەهاتەوە و دڵی بۆی دەسووتا.

وتی: زۆر چاکە، یاڵا بۆ سەمەرقەند، ئەگەر ئێمە بتوانین بگەینە ئەو شارە، ئەوا شاد و بەختەوەر دەبین.

عەبدوڵلاش بە بڕوایەکی تەواوەوە وەڵامی دایەوە و وتی:

-ئەی شازادەی گەورە و بەڕێز، ئێمە هەر دەگەینە سەمەرقەند لە ڕاستیدا لە سەرم پێویست بوو، سوپاسی عەبدوڵلای نۆکەرم بکەم، بۆ ئەو بەرچاوڕوونی و گەشبینییەی هەیبوو. گەرچی من وەك ئەو بەرچاوڕوون و گەشبین نەبووم.

ئاوەها بە پێ دەستمان کرد بە ڕۆیشتن بە دوای ئەو کاروانە بچووك و لاوازەدا. منیش شیرەکەشم لە دەست دابوو. بۆ نیوەڕۆی ڕۆژی دوایی گەیشتینە سەر بیرێك هەندێ ئاوی تێدابوو، وڵاخەکانمان ئاودا و نانی نیوەڕۆمان خوارد. هەستم کرد دەتوانم لە ڕۆیشتندا بەردەوام بم. بەڵام عەبدوڵلا تکای لێکردم و وتی:

-گەورەم ڕێمان بدە با ئەمشەو لێرە بمێنینەوە!!

زۆر تووڕە بووم لێی و لەو قسانەشی کە دەیکرد. بەڵام کاتێك ئەلجای داوای لێکردم، مەجبوور بووم قایل ببم.

بە تایبەتیش قاچیشم دەیەشا و زۆریش ئازاری هەبوو. چونکە پیس و پۆخڵی بەندیخانەکە وای لێکردم، برینەکەم هەو بکات و ئازارم بدات.

کاتێك ئەلجای ئەو هەوا پاکەی هەڵمژی و ئاوە پاك و ڕوونەکەی دی، پێی وتم:

-ئەگەر هەرکەسێك لێیان پرسین، دەڵێین ئێمە شوانین.

وتم: شوانی بێ مەڕ.

وتی: ئەگەر تۆ وات دەوێت و حەزی پێدەکەیت، با سەرکردەی بێ دە هەزار سەرباز بێت.

وتم: ئەلجای هیچیان جیاوازی نییە.

وتی: منیش مەبەستم ئەوەیە، بەڵام تەیمووری خۆشەویستم چاك لەوەدایە ئێمە هەردووکمان پێکەوەین و عەبدوڵلاشمان لەگەڵدایە.

وا دیاربوو عـەبدوڵڵای خۆشدەویست، چونکە هەوڵێکی زۆر باشی دا بۆ ڕزگارکردنمان لـەو بەندیخانـە پیسـەدا. منیش پاش چەند کاتژمێرێك زۆر دڵخۆش شادومان بـووم، چونکـە لـەم ڕەوەمـاندا عـەبدوڵڵامان لەگەڵدا بوو. لـە باشـوورەوە هـەورێکی تـۆز و خـۆڵ بـەرزبۆوە. پـاش ماوەیەکی کەم، کۆمەڵە سوارێك زۆر بە پڕتاو غاریان دەدا و لێمان دەرکەوتن و نزیـك بوونـەوە. منیش بە خەمبارییەکەوە کە نیشانەی بەزین و تێکشکاندنی دەگەیاند بە عەبدوڵڵام وت:

-عەبدوڵڵا، وا هەمدیسان هەڵیانکوتایە سەرمان و ئەمجارە بـە تـەواوی لەناودەچین، چونکـە هیچ شتێکمان پێ نییە پارێزگاری و بەرهەڵستی خۆمانی پێبکەین.

بەڵام عەبدوڵڵا بە بڕوایەکی تەواوەوە وەڵامی دامەوە و وتی:

-شتی وا نابێت، ئێمەش دەتوانین بەم دوو خەنجەرە بەرهەڵستیان بکەین. کاتێك عـەبدوڵڵا ئەمـەی وت. دەسـتیکرد بـە باخـەڵی چاکەتەکـەیدا و دوو خەنجـەری کەوانـەیی دەرهێنـا. و یەکێکیانی دامێ و منیش پێم وت:

-کارێك دەکەین کـە لەسـەر پشـتی ئەسـپەکانیان دابـەزن و بێنـە خـوارەوە، تـاکو بتوانـین خەنجەرەکانمان بە شێوەیەکی باش بەکاربهێنین.

هیوا و ئاواتم بووژایەوە و دڵم خۆش بوو، چونکـە سـوارەکان لـە سێ کـەس و هـەندێ ئەسـپ زیاتر نەبوون. کەچی لە دووریشەوە وادەزانی دە کەس و زیاتریشن.

ئێمەش بێدەنگ لەژێر سێبەری حوشترەکەدا دانیشتین. لـە کـاتێکدا سـوارەکان بـەرەو پیرمـان دەهاتن، هیچ نیشانەیەکی دوژمنایەتیان پێوە دیار نەبوو.

پاشان سوارەکان بـە ڕوویـەکی خۆش و شادییەوە لەسـەر پشتی ئەسپەکانیان دابـەزین و بـە شێوازی دۆستانـەوە سڵاویان لێکردین. و ئیتر یەکێکیان ڕووی دەمی تێکردین و وتی:

-شازادە تـەیموور، ئێمـە بـە تـەواوی فەرمایشـتەکەی تۆمـان پـەیڕەو کـردووە. وەك چـۆن نۆکەرەکەت بە ئێمەی ڕاگەیاندووە. خێرا تەماشای عەبدوڵڵام کرد بینیم دەم دەقوچێنێـت و دان جیڕدەکاتەوە. خێرا وتم:

-مەبەستم ئەوەیە ئەو فەرمانە چی بوو؟ چاکتان کرد بەڵام ئەو فەرمانانە چی بوون؟

وتـی: هـەروەك تـۆ لـەو بـاوەڕەدا بوویـت، گەورەکـەمان ترسـا لـەوەی کەلوپـەل و شـتە بـە بەهاکانت لە ماڵ و بارەگای خۆیدا بهێڵێتەوە. لەبەرئەوە شتومەکەکانی خستە ناو ئەم جەواڵەوە، بە کاروانێکی کەم و بچووکدا ڕەوانەی کرد بۆئەوەی بیدەن بە ئیبن سەعید.

وتم: خۆ بە ئیبن سەعیدتان نەوت، عەلی بەگ چۆن ئەو تاڵانییەی دەستکەوتووە وا نییە؟

-بەڵێ، شازادەی بەڕێز، هەروەك خۆت پێتوتبووین و پلانت بۆ دانابووین، شەوی ڕابوردوو لە کاتی خەوتندا پاسەوانەکانمان کوشت و بە درێژایی ڕۆژ بەغار هاتین بەدواتاندا، بۆئەوەی پێتان بگەین.

وتم: ئاوەها، ئێستا ئێوە داوای پاداشی خۆتان دەکەن.. وانییە؟

وەڵامی دامەوە: نەخێر.. شازادەی گەورەم، ئێمە تەنها بە سێ ئەسپەوە دەگەڕێینەوە، و دەڵێین چەتەو ڕێگر هێرشیان کردە سەرمان و هاوڕێکانمانیان کوشتووە. ئێمەش ژن و منداڵەکانمان ئێستا وان لای عەلی بەگ و چاوەڕوانی ئەو ڕۆژە دەکەین، فەرمان بدەیت بە کۆیلەکان تاکو ڕاپەڕن و ئێمەش ئەوەمان پێخۆشە ببین بە گەورەی وڵاتمان و خاوەنی زەوی و زاری خۆمان بین.

وتم: ئەوەی کە دەیڵێیت، خۆی لە خۆیدا پەند و ئامۆژگاری و قسەی چاکە.

ئەمەم وت و بیرم لە بیر و هۆش و تێگەیشتنی عەبدوڵڵا دەکردەوە، ئا ئەوەمتانێ دووبارە شمشێرەکەی بۆ هێنامەوە پاشان داوام لە سێ سوارەکە کرد و وتم:

-بەڵام پێویستە هەر نەبێت ماوەیەکی کەم لێرە لامان بمێننەوە، بۆئەوەی خۆتان و ئەسپەکانتان بحەسێنەوە. هەرسێکیان پێکەوە وەڵامیان دایەوە:

-بەڵێ شازادەی بەڕێز، بەڵێ، ئێمە زۆر هیلاکین.. سێ نۆکەرەکە نانی ئێوارەیان لەگەڵدا خواردین. ئەو خواردنەش خواردنێکی زۆر چاك بوو. لەو زەخیرەیە دروستمان کردبوو، کە ئەو نۆکەرانە لەگەڵ خۆیاندا هێنابوویان.

دوای نانخواردن پاڵکەوتن و خەویان لێکەوت. هەرکە بە تەواوی خەویان لێکەوت و ئاگایان لە خۆیان نەما.. من و عەبدوڵڵا هەستاین و سەری هەرسێکیانمان بڕین و لەناو خۆڵ و لەکەدا ناشتمانن. و سێ ئەسپیشمان لە بیابانەکەدا بەردا و ڕاومان نان و لە خۆمان دوورخستنەوە، چونکە من نەمدەویست ئەلجای لە خەو هەستێت بەم کارەمان بزانێت. ئینجا بە عەبدوڵڵای نۆکەرمم وت:

-ئەوەی کردمان، هەر دەبوو، بمانکردایە.. وا نییە؟

وتی: بەڵێ شازادەی گەورەم، من ئەوە بە باش دەزانم.. هەرچۆنێك بێت عەلی بەگ هەر دەیکوشتن، چونکە نەیانتوانی بە ساغ و سەلامەتی کاروان و دەستکەوتەکە بگەیەننە شوێنی خۆی، هەروەها ڕێشی تێدەچوو، لە دوایشدا دانیان بە ڕاستی کارەکەیاندا بنایە و هەرچی شتێك ڕووی دابوو بیانوتایە.

وتم: عەبدوڵڵا تۆ چ بەڵێنێکت پێدابوون؟

وتی: شازادەی گەورەم، بەڵێنی هەموو شتێکم پێدابوون، ئەمەش گرنگ نییە، چونکە بەڵێندان بە کۆیلەکان وەك پاداش وایە. کۆیلەکانی تریش لە دوایدا هەر بەو شانسە باشەی من و ئازادکردنی هارون و دووکانەکەی، کە زیئی تێدا دەفرۆشێت، دەزانن. و هیچ کۆیلەیەکیش هەتائەتایە دەربارەی ئەو سیانە هیچ نابیستن.

وتم: باشە عەبدوڵڵا. تۆ بۆچی یارمەتی ئەو کارەت دام؟

وتی: ئەگەر عەلی بەگ تۆی بکوشتایە، منیشی لەگەڵ تۆدا دەکوشت، منیش دەمەوێت بچمەوە بۆ لای کارین ئا لەبەرئەوە من ئەو کارەم لەبەر خاتری خۆم کرد.. نەك لەبەر تۆ ئەی شازادەی گەورە و بەڕێزم. بەڵام من تاکو ئێستاش هەر مرۆڤێکی پاك و شەریفم.

وتم: تۆ ئیسپاتت کرد زۆر لەوە باشتری کە من بیرم بۆی دەچوو.

وتی: مانەوەی تۆ بە ساغ و سەلامەتی بۆ من تەنها ڕێگای شانس و بەختەوەری منە. چونکە من لە ژێر سایەی تۆدا بە خۆشی و بەختیاری دەژیم و بێ تۆش من نامێنم و دەمرم بۆ ڕۆژی دوایی بە ئەلجایم وت:

-پیاوەکان ئەمشەو ڕۆیشتن.

تەندروستی ئەلجای زۆر باش بوو، چونکە ئێستا ئێمە ئەسپی باش و زەخیرەی تەواومان هەبوو.

ئەلجای بە دڵێکی خۆش و زمانێکی شیرین پێی وتم:

-با لە پێشدا بچین بۆ کۆمرود چونکە من حەزدەکەم یەکەم جار جیهانگیر ببینم.

وتم: بە ڕاستی دەتەوێت یەکەمجار جیهانگیر ببینیت؟

وتی: بەڵێ یەکەمجار.. و پێش ئەوەی بچین بۆ سەمەرقەند، چونکە زۆر دەمێکە من نەمدیوە.

منیش ڕەزامەندی خۆم بۆ قسەکانی دەربڕی، و زۆر بە خێرایی لە ڕووبارەکە پەڕینەوە و پاش کەمەکێك گەیشتینە ئەو کێڵگە بەپیتانەی خەڵکەکانی بەردەوام ناویان دەبردم.

جووتیارە دڵساف و باشەکانی گفتوگۆ و هەڵسوکەوتیان لەگەڵماندا باش بوو. لە چوونماندا بۆ کۆمرود هیچ ناخۆشییەکمان تووش نەهات. لە ئاو و هەوا خۆش و ئاوە سازگارەکەی کۆمرودا ئەلجای ڕووە خۆشەکەی جارانی گەشایەوە و تۆزێکیش تەندروستی چاك بوو.

جیهانگیر بە نیسبەت ئەوەوە هەموو خۆشی و شادییەکی بوو. لە ڕاستیشدا جیهانگیر هەروەك دایکی باش و دڵ نەرم بوو. هەروەها کاتێك دڵشاد بیستی ئێمە هاتووین بۆ کۆمرود لە نزیك کابولەوە خێرا بۆ لامان هات. چونکە حسێن لە نزیك کابول لای هەندێ برادەری خۆی دایدنابوو. ئیتر منیش لەوێ لە نێوان ئەو چادرە جوانانەدا، کە بە دەوروبەریدا دارمێوی جوان و لەبەردەمیدا لەوەڕگای سەوز و جوان، وەك مافوورێك پەخش و بڵاو ببۆوە. سەرنج و دڵی مرۆڤی بۆ لای خۆی ڕادەکێشا.

من لە نێوان خێزانە بچووکەکەمدا چەند کاتێکم بە خۆشی و شادی و دڵنیاییەوە بەسەر برد.

ئەلجای و دڵشاد زۆر بە باشی دەرمانی قاچە شەلەکەیان دەکردم و چاودێرییان دەکردم. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من نەمدەتوانی بە باشی قاچم بنووشتێنمەوە و بیچەمێنمەوە، ئیتر وام لێهات بەردەوام لە ڕۆیشتنمدا دەلەنگیم.

جیهانگیریش لەگەڵمدا زۆر باش و میهرەبان بوو. یارمەتی باشی دەدام و نەیدەهێشت هیچ کارێك بکەم و هەرکارێك خۆی بیتوانیایە بیکات نەیدەهێشت من بیکەم و خۆی پێی هەڵدەستا و دەیکرد. لە ڕاستیدا ئەم سیانە زۆر لە یەکتر دەچوون. ئەلجای تەمەنی لە بیست ساڵ و چەند مانگێك تێپەڕ نەببوو. هەروەها دڵشادیش تەمەنی لە نۆزدە ساڵان تێپەڕ نەببوو. پێش ئەوەی ئەلجای نەخۆش بکەوێت. دڵشاد هەر بە تەواوی لەو ئەمیرمیەم دەچوو. منیش زۆر جار بە ناوی ئەلجایەوە بانگم دەکرد. لە کاتێکدا من بەو ناوەوە بانگم دەکرد، پێدەکەنی و زۆر زۆری پێ خۆش بوو. جیهانگیریش هەر لە منالی ئەلجای دەچوو. سەیفەدین کە لە کاتی فەرمانڕەوایی کورغاندا دوا دادوەری شاری سەمەرقەند بوو. خاوەن ماڵێکی باش و میوانداریيەکی بەخشندە و باش بوو.

لەگەڵ ئەوەشدا، لە لایەن نورەدینی کوڕییەوە زۆر بە باشی سەرپەرشتی و چاودێری دەکرا و بە باشی دڵی ڕادەگیرا. زۆربەی کاتی لەگەڵ مندا بەسەردەبرد و خەم و پەژارە و ناخۆشی خۆی بۆ باس دەکردم. منیش لە "کۆمرود"دا بێ ئەوەی شوناسنامەی خۆم دەربخەم، ماوەیەکی دوور و درێژ مامەوە لە ڕاستیشدا زۆر جار کار و تاقیکردنەوە وای لێدەکردم کە شوناسنامەی خۆم دەربخەم. بەڵام ئەوکاتە یەکەم پێویستی سەرشانم ئەوە بوو کە گرنگی بە تەندروستی ئەلجای بدەم. گەرچی تۆزێك ڕووی گەش ببۆوە و ڕەنگە جوانەکەی جارانی پێوە دیاربوو. وەك جاری جارانی بە خۆشییەوە پێدەکەنی. بەڵام زۆرجاریش ئازاری بۆ دەهات. وا دیاربوو نەخۆشییەکەی

نەخۆشییەکی هەتاهەتایی بێت و چارەسەری نەبێت. چونکە هەندێ جار نیشانەی ئەو ئێش و ئازارەی پێوە دیاربوو. کە سامناکییەکەی هیچی لەو سامناکیانەی ئەو کاتانەی کەمتر نەبوو کە لە نزیک ئاوە بۆگەنەکەی نزیک ڕووباری ئامۆداریادا هەڵماندابوو. لە ڕاستیدا زۆربەی خۆشییەکانی ڕووکەشی بوون. و لە بێدەسەڵاتی و بێچارەییدا بوو. چونکە زۆر پێویستی بە پزیشکێکی شارەزا و چارەسەرکردن هەبوو.

من لەو چەند مانگانەی دواییەدا ڕیشم هێشتبۆوە و درێژم کردبۆوە و ئەلجایش قژی درێژ کردبۆوە. ئەلجای لەو ماوەیەدا هیچی نەوت. تا وەرزی زستان هات و بەفر دەستی بە بارین کرد. ئیتر ئەو کاتە، لە کاتێکدا لە بەردەم ئاگرێکی بچووکدا پێکەوە دانیشتبووین، دەستی بە ڕیشمدا هێنا و پێی وتم:

-تەیموور، تۆ لەو باوەڕدایت و دڵنیایت کە مەغۆلەکان ناتناسنەوە؟

وتم: بەڵێ، ئەلجای من لەو باوەڕەدام کە نامناسنەوە. بە تایبەتیش ئێستا کە ڕیشم درێژ کردۆتەوە و لە ڕۆیشتنیشدا دەشەلم.

وتی: ئایا، نابێت ئێرە جێبهێڵین و بڕۆین؟

وتم: بەڵێ تۆ ئێستا تەندروستیت چاک نییە و چاکیش نابێت، لەبەر ئەوە پێویستە بە دوای پزیشکێکی شارەزادا بگەڕێین و تۆی پیشان بدەم و چارەسەرێکت بکات.

وتی: لە ڕاستیدا من حەزدەکەم هەر لێرە بمێنمەوە.

چونکە ئەو چەند مانگە کەمەی لێرە بردمە سەر زۆر بە خۆشی و شادی بوو.

وتم: بەڵام خۆ ئێستا هەر ئازارت هەیە و من بێگومانم لەوە.. وا نییە؟

وتی: تەیمووری خۆشەویستم، هەست بەو ئازارەش دەکەیت؟

وتم: بێگومان،،، بێگومان.. ئەلجای ئایا من هەڵەم؟

وتی: تەیمووری خۆشەویستم، من هەر بەردەوام ئازارم هەیە بە تایبەت لەناو سکمدا. وە هەرکاتێکیش داوام لێبکەیت ئێرە جێبهێڵین، لەگەڵتدا جێی دەهێڵم گەرچی ئێرە خۆش و دڵگیریشە.

وتم: ئەلجای، بەڵام لە وەرزی بەهاردا هەر دەگەڕێینەوە بۆ ئێرە.

وتی: بەڵێ، لە بەهاردا هەر دەگەڕێینەوە..!!

نورەدین لە توولەڕێ باریك و دۆڵە تەسکە شاخاوییەکانەوە، بردینی، تا گەیاندینییە ئەو گردانەی بەسەر شاری سەمەرقەنددا دەڕوانێت. ئیتر ئەوکاتە هەمدیسان خۆم گۆڕی و جلێکم لەبەرکرد کە لە جلی شوان دەچوو.

ئەلجایش جلی ژنە لادێییەکی پۆشی. و کەلوپەل و پێویستییەکانمان لەسەر کەرێکی بچووك بار کرد و ئەلجایش سواری کەرێکی تر بوو. بەرەو شار کەوتینە ڕێ. لەبەرئەوەی من ریشم درێژ بوو، لە ڕۆیشتنیشدا دەلەنگیم. و ئەلجایش دەموچاوی لەڕ و لاواز ببوو نەدەناسرایەوە، بە ئاسانی لەبەردەم بازگەی شار و لە بەردەم پاسەوانەکانییەوە تێپەڕمان کرد. بێ ئەوەی پاسەوانەکان هیچ گوێیەکمان پێبدەن و بمانناسنەوە منیش هەندێ لەو پاسەوانانەم ناسیوە، چونکە کاتی خۆی لە تیپە تایبەتییەکەی خۆمدا کاریان دەکرد.

کارین پێی وتین و پێی ڕاگەیاندین، چۆن ئەو خەڵکە زۆرە ئاوارە و سواڵکەر و لانەوازانە لەناو شاردا بدۆزینەوە و پەیوەندییان پێوە بکەین.

عەبدوڵلا پێش ئێمە بۆ ناو شار هاتبوو بۆئەوەی بۆ مانەوەمان شوێن و جێگایەکمان بۆ ئامادە بکات.

ئاوەها کاتێك هاتمە لای خانووە کۆنەکانەوە، دەبوو من لە دەرگایەکی گەورەی ئەستوور بدەمو خۆم بە ناوی لینغ کۆبیغی واتە سەگە شەل بناسێنم بۆئەوەی ڕێم بدەن بچمە ژوورەوە.

عەبدوڵلا زۆری لا پەسەند بوو، کە ناوی خۆم بنێم سەگە شەل "لینغ کۆبیغی" لە دواییدا تێگەیشتم، بۆچی ئەو ناوەی لا پەسەند بوو. چونکە هەموو سواڵکەرەکان هەر یەکەیان نازناوێکیان هەبوو، وە بە ناوێکەوە ناوی خۆی نابوو، جا ناوەکە شتێکی بەهێز بگەیەنێت یان هەندێ شێوەی لەش و لاریان ئەو عەیبە بێت کە لە لەش و لاریا هەیە. بۆئەوەی بتوانن باسی بکەن و بەو ناو و نیشانانەوە بە ئاسانی بیناسنەوە لە کاتێکدا بە دوای پیاوێکی کتوکوێر، لە گەڕەکێکدا کە خانووەکانی و شووراکەی بە خشتی کاڵ و قوڕ کرابوو، دەڕۆیشتین.

ئەلجای زۆر بە داماوی و کەساسییەوە ڕووی تێکردم و وتی:

-تەیموور، من لێرەدا دەمرم!! ئەم شوێنە زۆر لە بەندیخانەکەی عەلی بەگ ناخۆشترە!!

وتم: ئەلجای سبەینێ دەچم بە دوای خانوویەکی جواندا دەگەڕێم.

وتی: نەخێر! نەخێر!! بەو هۆیەوە خەڵکی دەمانناسنەوە و ئێمەش نابێت خۆمان ئاشکرا بکەین و خەڵکی بمانناسێتەوە. خۆ ئەگەر ناسیتیانەوە ئەوا دەتگرن و دەتکوژن. من بۆیە بە تۆم وت لێرەدا دەمرم، چونکە بە کۆمرود ڕاهاتبووم و ئەوێم پێ خۆش بوو. من زۆر هیلاك و ناساغیشم.

زۆر سەرسام بووین کاتێك ئەو پیاوەی ڕێنمایی دەکردین و چاوساغمان بوو، لە دیوارە گڵەکەدا لە لای چەپەوە دەرگایەکی تری بۆ کردینەوە و چووینە حەوشەیەکی پاك و خاوێن و ڕێکوپێکەوە، پڕ لە گوڵی جوان و گەشاوە بوو. لە حەوشەکەدا کوخێکی جوانمان بینی کە دیوارەکانی دەبریسکایەوە و بە گەچێکی سپی سواخ درابوو.

لەناو دەرگاکەیدا عەبدوڵڵا پێشوازی لێکردین و بردینییە ناو ژوورێکەوە پڕ بوو لە هەموو جۆرە شتێکی جوان و ڕابواردن.

عەبدوڵڵا زۆر بە خۆنازین و شانازییەکەوە پێی وتم:

-ئەمە ئەو شانشینەیە کە بۆ شاهێنشای سوالکەر و هەژارەکان ئامادە کراوە.

منیش پێم وت: عەبدوڵڵا منیش زۆر زۆر سوپاست دەکەم، بەڵام ئەو شاهێنشایە کێیە؟

وەڵامی دامەوە، وتی:

-شازادەی گەورەم، ئەو شایە خودی خۆتی.

وتم: من؟!! چۆن شتی وا دەبێت؟

وەڵامی دایەوە: هارون لێرە دوکانێکی بۆ خۆی داناوە و چیرۆك و دەنگوباسی سەیر سەیری بۆ هەژار و سوالکەر و لانەواز و ئاوارەکان گێڕاوەتەوە و منیش زۆرێکی زۆرم خستۆتە سەر و ئەو چیرۆك و باس و خواستانەم لە ناویاندا بڵاوکردۆتەوە. لەبەرئەوە، ئەو ئاوارە و سوالکەرانە هەموویان بەبێ ئارامییەوە چاوەڕوانی هاتنی تۆ دەکەن.

وتم: ئایا ئەوانە دەزانن من کێم؟

وتی: ئەوان تۆ ناناسن بە ناوی لینغ کۆبیغییەوە نەبێت کە هارونی کۆیلە و کەساسی ڕزگار کردووە.

سەرنجی شتومەکە بە بەهاکانی ناو کوخەکەم دا و بە سەرسووڕمان و حەپەساییەوە لە عەبدوڵڵام پرسی:

-ئایا هارون فەقیر و هەژارە؟

وەڵامی دایەوە وتی: بەڵێ، من ئەم شتانەم لەبەر تۆ داوا کردووە. ئەم شتانەش تاڵانین و تۆ نابێت و ناشتوانیت بە هەوەسی خۆت بەکاریان بێنیت، چونکە لە ڕاستیدا هیچیانماڵی تۆ نییەو تۆ خاوەنی نیت.

وتم: عەبدوڵڵا لەمەودواش من نابم بە خاوەنی هیچ شتێکیان؟

عەبدوڵڵا وتی:

-ئەمە چاکترین کارێکە من لە پێناوی تۆی بەرێزدا بیکەم.

ئەلجای زۆر بە سوپاسگوزارییەوە وتی:

-عەبدوڵڵا تۆ کارێکی زۆر جوان و باشت کردووە.

پاشان لەسەر جێگایەکی خۆش و جوان دانیشت و پاڵی دا بە سەرینێکەوە و بە ئیسراحەت بۆی دانیشت. بەڵام لە ڕاستیدا قسەکانی ئەو خەم و پەژارەیەی دەردەخست کە لە دڵ و دەروونیدا بوو.

ئیتر دوای ئەوەی عەبدوڵڵای نۆکەرم ئیزن دا.

ئەلجای زۆر بە داماوی و خەمبارییەوە لێی پرسیم:

-ئۆی، تەیمووری خۆشەویستم، ئەبێت تۆ هەمیشە هەر شا بیت؟ شای سواڵکەرەکان.. شای هەر شتێك؟

بەڵام تەویلەیەکی پیس و پزیشکێکی شارەزا کە بتوانێت دەرمانم بکات و چارەسەرم بکات، لای من زۆر خۆشتر و باشترە لەم کوخە جوان و شانشینە خاوێنە.

-ئەلجای تۆ ژنە شازادەیەکیت و هەر دەشبێت وەك ژنە شازادەیەکیش بژیت.

-من ئێستا جلی ژنە جووتیارێکم لەبەردایە و حەزیش دەکەم لە ڕاستیدا ببم بە ژنە شوانێك یا جووتیارێك. بەڵام تەیموور پێویستە هەرچۆنێك دەبێت پزیشکێکم بۆ پەیدا بکەیت، تا تێم بڕوانێت و چارەسەرێکم بکات. بۆئەوەی بە زووترین کات ئێرە جێبهێڵین و بڕۆین.

بۆ بەیانی دەستم کرد بە گەڕان بە دوای ئیمام زەینەدیندا. کاتێك دۆزیمەوە، یەکەم جار، تا ماوەیەك، لە ڕاستیدا بە هۆی ئەو ڕووکەشییەوە کە خۆمم پێگۆڕیبوو نەیناسیمەوە، پاشان بە هۆی ئەو پارچە عەقیقەوە کە وەختی خۆی، خۆی دابوومی، خۆمم پێ ناساند و ناسیمییەوە. ئیتر دوای ئەوە لە تاریکایی شەودا پزیشکێکی هێنا بۆ ئەوەی فەحسی ئەلجای بکات و چارەسەرێکی بۆ بدۆزێتەوە. من و ئیمام زەینەدین پێکەوە دانیشتین و پزیشکەکە دەستیکرد بە تەماشاکردن و تێڕوانینی ئەلجای.

ئیمام زەینەدین بە خەمبارییەوە پێی وتم:

-ئێستا ژیان لێرەدا لە هەموو کاتێك زیاتر ناخۆش و سەختترە، هەتا منیش پیرەمێردێکی ئیمام وا پێویست دەکات منیش خۆم لەو شوێنەدا بشارمەوە کە تێیدا منت دۆزییەوە. ئەم ژیان ناخۆشییەی ئێرە، کە ئێمە بە دەستییەوە دەناڵێنین، بوخاری و خوجەند و کارشی-یشی گرتۆتەوە، هەموو جێگایەکی گرتۆتەوە. هیچ شازادەیەکی تەتەریش ناتوانێت سەرکردایەتیمان

بکات و لەم ناخۆشی و تەنگانەیە ڕزگارمان بکات. تەنها تۆ یەکەم شازادەی تەتەریت و وێراوتە نزیك قەلا و سەنگەرەکانی مەغۆل بکەویتەوە.

وتم: زەینەدین، من وەك سەرکردەیەك بۆ ئێرە نەهاتووم. بەڵکو وەك جووتیارێك هاتووم تاکو یارمەتی و چارەسەرێك بۆ ژنەکەم بدۆزمەوە.

وەڵامی دامەوە: تەیموور خوا خۆی سەرکردە هەڵدەبژێرێت. هیچ کەسێکیش ناتوانێت ئینکاری کاری خوا بکات. چونکە هاتنی تۆ بۆ ئێرە لە ڕاو تەگبیر و ویستی خوا بەدەر نییە. ئێمە زۆر نوێژ و پاڕانەوەمان لە پێناوی سەرکردەیەکی لێهاتوو و گونجاودا کردووە. و وا ئێستا تۆ بۆ لامان هاتوویتەوە.

ئیتر ئیمام زەینەدین زۆر بە وردییەوە تێیڕوانیم و تەماشای دەکردم. منیش ڕۆژێك لە ڕۆژان و جارێك ڤایل بووم کە جبە بۆ خودا لەبەر بکەم. بەڵام ئێستا من بۆئەوە نەهاتوومەتەوە کە دووبارە جبەی بۆ لەبەر بکەمەوە.

بە گاڵتەپێکردنێکەوە پێم وت:

-زەینەدین هەر نوێژ بکە بۆئەوەی خوا قامچی خۆی بدات بە پشتی مەغۆلییەکاندا. یاخود نوێژ بکە بەڵکو خوا هەر نەبێت قامچی خۆی بدات بەسەر پشتی ئەسپی مەغۆلەکاندا و لەناویان بەرێت، چونکە مەغۆلەکان کاتێك نامێنن و لەناودەچن کە ئەسپەکانیان نەمێنێت و بمرن و قڕیان تێکەوێت.

بۆم دەرکەوت بە تەماشاکردنەکەیدا بۆم ڕوون بۆوە کە ئیمام زەینەدین قسەکانی منی بە حەقیقەت و ڕاستی تێگەیشت. چونکە زۆر بە وردی و سەرنجەوە گوێی بۆ قسەکانم ڕاگرتبوو، وە تەماشای دەکردم.

بە شەرمێکەوە لێی پرسیم:

-تەیموور ئایا من بە ئیمانداران ڕابگەیەنم کە تۆ خەوت دیوە؟

وتم: بەڵێ من خەوم دیوە.

وتی: ئیمانداران ئێستاش باوەڕیان پێت هەیە. چونکە ئێمە وامان لە ئیمانداران گەیاندووە و بڕوامان پێی پەیداکردوون، خوا بۆیەکی لە بەرزایی و نشێوییەکاندا لە کاتی جەنگەکەدا بارانی بەسەردا باری بۆ ئەوەی داوایان لێبکات، تۆبە بکەن و لەو لووت بەرزی و لە خۆباییبوونە زۆرەیان پەشیمان ببنەوە کە لە کاتی سەرکەوتنەکانی پێشوودا بەدەستیان هێنابوو.

وتم: زەینەدین کەواتە با وا بێت. نوێژ و دوعا بکە بۆ ئەوەی خوا دەرد و مەینەتی بەسەر مەغۆلەکاندا برژێنێ ئیتر من لەوە دڵنیا نەبووم کە ئیمام زەینەدین لە قسەکانم تێگەیشتووە یان نا، چونکە لەو کاتەدا پزیشکەکە هاتە ژوورێ و منیش ڕوو و سەرنجی خۆم بۆ لای پزیشکەکە وەرگێڕا.

بە ترس و دڵە خورپێوە لە پزیشکەکەم پرسی:

-پزیشکی بەڕێز حاڵی چۆنە؟

زۆر بە خەمبارییەوە سەری ڕاوەشاند و وتی:

-حاڵەتی زۆر خراپە!! بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەیەوێت چاك بێتەوە و نەمرێت. ئەژی ئەگەر باروزروفێکی باشتری بۆ بخولقێت و هەندێ گژوگیا و گوڵی سوودمەندی بۆ پەیدا بکرێت.

ئیتر خەریك بوو، نائومێد بم لێی و دەستی لێ بشۆم. بەڵام پێم وت:

-پزیشکی بەڕێز، چ دەرمان و گژوگیایەکی بەسوودت هەیە بیدەرێ، من ئامادەم، پارە چەند داوا دەکەیت بتدەمێ. چونکە من لەوە دڵنیابووم، ئەو پیاو گوژ و دز و سواڵکەرانەی لە دەورم بوون هەرچی پارە و پێویستییەکم بویستایە بۆیان پەیدا دەکردم و دەیاندامێ.

هەروەها عەبدوڵڵاش هەر پارە و پوولێکم بویستایە بۆی پەیدا دەکردم. هەروەها ئەلحاجی خۆشی دەوڵەمەند بوو هەرچییەکی پێویست بوایە هەیبوو.

ئیتر منیش گشت کات و بە درێژایی ڕۆژان بە دیارییەوە دەمامەوە و هەرکە بنووستایە منیش لەگەڵ ئەو دزانەی لە دەوروبەرمدا بوون دەڕۆیشتم و هەرچییەکم بەردەست بکەوتایە دەمدزی، چونکە من ماڵی شازادەکان شارەزا بووم و باش دەمناسین، هەموو کات دزەکانم لەگەڵ خۆمدا بۆ ژێرزەمین و ئەو شوێنە نهێنیانە دەبردن کە سندووقە مرواری و زێڕ و زیویان تێدابوو. هەندێ جاریش لە دەرەوەی شووراکانی شاردا هێرشمان دەکردە سەر ئەو کاروانانەی کە دەهاتن بۆ شار و دەستمان بەسەر کەلوپەلەکانیاندا دەگرت و ڕووتمان دەکردنەوە.

ئەو قسەوباس و بەیت و باڵۆرەیەی عەبدوڵڵام سەلاند کە لەناو خەڵکیدا بڵاوی کردبۆوە دەربارەی شارەزایی و بەکارهێنانی شیر و شیربازییەکەم. وای لێهات ناو و ناوبانگی لینغ کۆبیغی "سەگە شەل" لەناو هەندێ چین و کۆمەڵانی خەڵکیدا بڵاوبۆوە، هەروەك چۆن ناو و ناوبانگی تەیموور لەناو ئیماندارا ن و شازادەکانی تەتەردا بەناوبانگ و ئاشکرا بوو.

عەبدوڵڵا بەردەوام پەیوەندی و تێکەڵاوی دەکرد و لەناو کۆیلە و ئاوارەکان و خزمەتکارانی ناو شاردا و لەناو ئەو کاروانانەی کە بە ناو شاردا تێدەپەڕین. هەتا وای لێهات ئەو کار و کردەوە

قارەمانی و باش و ئازایەتییەم لە هەموو ناوچەیەکی ئاسیادا بڵاوبۆوە، بە تایبەت لەناو کووخ و زنجی هەژارو لانەوازەکاندا. منیش لەناو خەڵکیدا هەردوو کەسایەتی جیاواز بووم. لە کاتێکدا شوان و جووتیار و کۆیلەکان چاوەڕوانی دەست و بازو و یارمەتی لینغ کۆبیغی بوون. لەو لاشەوە پیاوە ئاینییەکان، نوێژ و ڕۆژوویان دەگرت و دەپاڕانەوە بۆ ئەو قامچی و ئەو تۆڵەیەی کە تەیموور بەڵێنی پێدابوون کە بەرزی بکاتەوە و بیکێشێ بە پشتی دوژمناندا.

بۆ ڕۆژی دوایی لەگەڵ چل کەس لە پیاوەکانمدا بۆ بیابانی "کیزیل کوم" کەوتینە ڕێ بۆئەوەی ئەو گیا کوشندە[٦] و ژەهراوییە بهێنین. بە ئاسانی شوێنەکەمان دۆزییەوە و لە نزیک بیرەکەوە سەربازگەمان هەڵدا. لەو گیا کوشندەیە دەرخواردی سێ وڵاخمان دا و تۆزێک چاوەڕوانی کاریگەریی و ئەنجامەکەی ئەو گیایەمان کرد. منیش خۆم حەزمکرد بە دەوری ئەو سەربازگەیەماندا تۆزێك بسووڕێمەوە و لەو شوێنەی کە لەگەڵ ئەلجایدا لە بەهاری ڕابووردوودا پێکەوە نووستبووین، کەمێك ڕاکێشم و بنووم. هەر ئەوکاتە ئەو شارەزایی و فێڵە چاکەیم بیر کەوتەوە لە کاتێکدا کە پێی وتم، ئەگەر پێویست کات جلەکانم دادەکەنم و خۆم ڕووت دەکەمەوەو سەربازەکان دەخلافێنم و ئێوەش لەپڕ بدەن بەسەریاندا و بیانکوژن و دەست بەسەر سەربازگەکەدا بگرن. ئیتر کە سێ وڵاخەکە دەستیان بە لەرزین و هەژاندن کرد و خەریکبوون بکەون. من بە تەواوی دووبارە هەستم بە خۆشی و شادی کردەوە. هەر ئەوکاتە هەستمکرد کە

---

[٦] گیا کوشندە: ئەم جۆرە گیایانە هەیە کە ئاژەڵ دەکوژێت. وە ڕەنگە ئەو گیایەی کە تەیموور هێناوییەتی یەکێك بێت لەمانە:

ا–گیابڕ: کاڕووتی، ئەم جۆرە گیایە بەرزە وڵاخ دەکوژێت و بە زۆری لە شوێنی نێمدا هەیە. وە ڕەنگە ئەو گیایەی کە تەیموور هێناوێتی بۆ کوشتنی وڵاخەکانی مەغۆلەکان لەم جۆرە گیایە بووبێت، چونکە وەك دەڵێت لە بیابانی "کیزیل کوم" دا هێناویەتی و ئەو شوێنەش بیابانە و ئاوی تێدا نییە، دێمە.

ب–مافەتە: ئەمە جۆرە کرمێکی زۆر بچووك و وردە درێژی ٢سم تا ٣ سم دەبێت و لە قۆزاخەیەکدایە کە دەڕوات سەر دێنێتە دەرێ و نزیکەی ١ سم دەبێت. کە دەڕوات پوش و پەلاش لە خۆیەوە دەپێچێت و وردە وردە گەورە دەبێت. لە پاشتندا قاچ دێنێتە دەرێ. کرمەکە وەك کیسەڵ وایە و زۆر ڕەق و قایمیشە. کە ئاژەڵ بە گیایەکەوە دەیخوات، ئاژەڵەکە دەکوژێت. ئەمە بە زۆری لەناو پووشدا هەیە. لەو شوێنانەی کە ئاژەڵ تیایدا دەلەوەڕێت، ئەم کرمە بەسەر هەر گیایەکدا بڕوات ژەهراوی دەکات و هەر ئاژەڵێك بیخوات دەیکوژێت.

ئەم کرمە ڕەنگی مەیلەو ڕەشە و لەناو قۆزاخەدایە. کە ئاژەڵەکە بمرێت دەڵێن گیا مافەتەی خواردووە. "وەرگێڕ".

من بەرەو ڕووی دوژمنان و بەرەو جەنگ و سەرکەوتن دەچم و دوژمنانم لەناودەبەم. نەک بەو هێز و بازووەی کە لەمەوپێش لەدەستم چوو. بەڵکو بە هۆی ئەو فێڵ و تەڵەکەبازییەوە کە دۆزیمەوە بۆ بێهێزکردنی دوژمنانم.

ئیتر ئاوەها سەرقافڵەیی کاروانەکەم کرد و خۆشی و شادی بە هەموو گیانمدا دەڕۆیشت و سەمای دەکرد. لە بیابانەکەوە خۆم و کاروانەکەم کە ئەو فەردە گزوگیا کوشندە و لەناوبەرەی هەلگرتبوو، بەرەو قەڵا و سەنگەرەکانی مەغۆلییەکان گەڕامەوە. بەڵام کاتێک گەیشتمەوە شوێن و جێگای خۆم بینیم ئەلجای کۆچی دوایی کردبوو.

* * *

## گەڕانەوە بۆ شارەکەم

ئیتر دوای ئەوە لەگەڵ دە کەس لە باشترین پیاوەکانمدا کە لە دزی و چەتەییدا قارەمان بوون. چووم بۆ شەهری سیبز بە درێژایی شەو لەو گرد و شاخانەدا کە بەفر دایپۆشیبوون دەڕۆیشتین و لە ڕۆژیشدا خۆمان دەشاردەوە.

لە شەوی دواییدا کاروانەکەم بە دەربەندێکی تەسکدا و لە کونێکی بچووکی تەسکەوە کە بۆ ڕاکردن بەکارمان دەهێنا، بردمن بۆ ئەودیوی شووراێ شارەکە. من خۆم زۆر بە گومان بووم لەوەی کە سەرکردەی مەغۆلەکان کە لە کۆشکی سپیدا بوو ئەو شوێنە پێبزانێت کەوا لە دیوارەکەدا هەیە و درێژبۆتەوە بۆ شوێنێکی تەریکی ناو باخەکە. بەو ڕێگایەدا ڕۆیشتین و عەبدوڵڵاش لە دوامانەوە شوێن پێکانمانی دەسڕییەوە پاشان ئەویش لە کونەکە هاتەدەرێ و لەودیوی شووراکەوە پەیوەندی پێوە کردینەوە. ئەوەی کە ویستم بیکەن بە عەبدوڵڵام وت ڕێنماییم کردن. چاودێری پیاوەکانم کرد تاکو سواری ئەسپەکانیان بوون و لەسەر بەفرەکەدا دوورکەوتنەوە ئیتر منیش ڕووی ئەسپەکەم وەرگێڕا بۆ لای دۆڵەکەو بەرەو کۆمرود کەوتمە ڕێ. مردنی ئەلجای و ئەو زەرەرانەم کارێکی گەورە و گرانی کردبووە سەرم. گەڕامەوە ئەو شوێنەی کە یەکەم جار بە کارین و نیهۆ گەیشتم. هیچ هیواو ئامانجێکم نەبوو، بێهودە و مات و مەلوول دەڕۆیشتم. کاتێک گەیشتمە کۆمرود هیچ لەو خەم و خەفەتەی لەسەر ڕوومدا هەبوو، نەگۆڕابوو. وە دەبوو خەبەر بدەم بە جیهانگیر و دڵشاد و ئەو خزم و دۆستانەمان کە لەناو چادرەکاندا بوون. کەوا ئەلجای مردووە و کۆچی دوایی کردووە. "چونکە تا ئەوکاتەش هەر لە کۆمرود دا مابوون".

بە خەمبارییەوە پێم وتن: کە ئەلجای مردووە. هەرکە ئەومیان بیست، دایکی عەبدوڵڵا دەستیکرد بە گریان و دوای ئەویش دڵشاد دەستیکرد بە گریان و جیهانگیریش دەستی کرد بە گریان. هەرچەندە جیهانگیر جیاوازی نێوان ئەلجای و دڵشادی نەدەکرد چونکە هەردووکیان هەموو کاتێك پێکەوە بوون و زۆر زۆریش لە یەکتر دەچوون.

کاتێك سەیفەدین ڕووە خەمبارو لەشە شەکەتەکەمی بینی. بە قووڵییەوە تەماشای کردم، پێی وتم:

-تەیموور، وەرە لەگەڵمدا با بچین بۆ حەمام.

منیش بە دوایدا هەستام و بەرەو حەمام ڕۆیشتم. کاتێك گەیشتمە گەرماوەکە پێی وتم:

-تۆزێك گەرمی و هەڵم و بوخار و شێلان و تۆزێك نووستنی زۆر لەو خەم و ئێش و ئازارەت ناهێڵێت و چارەسەرت دەکات. ناترەکە دەستی کرد بە شێلان و خاوێنکردنەوە و شتنی لەشم، تاکو لەژێر دەستیدا خەوم لێکەوت. دوایی هەڵیگرتم و بردمییەوە بۆ ناو چادرەکەی خۆم چونکە دوای شەو و ڕۆژێك کە خەبەرم بۆوە خۆم لەناو جێگاکەمدا بینی. کاتێك خەبەرم بۆوە بینیم کارین لە تەنیشتمەوە ڕاوەستاوە و قاپێك خواردنی بە دەستەوە گرتووە و بۆی ئامادە کردووم. هەرکە چاوم کردەوە، لێم پرسی وتم:

-کارین، کوا جیهانگیر؟.. حاڵەتی چۆنە..؟

وتی: گەورە و بەڕێزم، حاڵەتی زۆر باشە، ئەو وەك تۆ، هەست بە مردنی خاتوو ئەلجای ناکات.

وتم: هیچ کەسێك وەك من هەست بە مردن و لەناوچوونی ئەلجای ناکات!!

وتی: شازادەی گەورەم، هەموومان هەوڵدەدەین ئەو خەم و خەفەتەت بیربەرینەوە، چونکە لای هەمووومان بەرێز و خۆشەویستیت.

وتم: پاش ئەو هەموو کردەوەیەی بەرامبەرت کردم هێشتا تۆ هەر منت خۆشدەوێت؟

وتی: شازادەی گەورەم تۆ خراپ نەبوویت و ئازاریشت نەداوم، چونکە من دەزانم ئەوە پلان و ڕێبازی تۆیە.

وتم: بەڵێ کارین ئەوە پلان و ڕێبازی منە ئەوە ڕێبازی منە!!

پاشان کارین قاپەکەی هەڵگرت و لە چادرەکەم چووە دەرەوە. منیش هەستام و جلەکانم لەبەرکرد و چووم بۆ لای چادرەکەی سەیفەدین و لەگەڵ سەیفەدیندا بە درێژایی ئەو بەیانییە

دەستمانکرد بە یاری شەترەنج و گوێم بۆ ئەو وتانـەی شل کردبوو، کـە باسی شەڕ و پێکدادانی ڕابوردووی بۆ دەکردم.

دوای نانخواردنی بەیانی سواری ئەسپەکەم بووم، بەرەو ئەو دەشتە کەوا بەفر دایپۆشیبوو غارم دا. ئەسپەکەشم بە هەموو هێز و توانایەکییەوە غاری دا تاکو بە تەواوی عەرەق لە هەموو گیانییەوە هاتە دەرێ و کەف لەسەر شەویلگەکانییەوە کۆمەڵ بوو. ئەو هەوا ساردەی لە چیاکەوە دەهات دەیدا بە ڕوومدا و خوێنی بزواندم. کاتێك گەڕامەوە بۆ ناو چادرەکان هەستم کرد سەرلەنوێ بوومەتەوە بە پیاوێکی گورج و گۆڵ.

دانیشتنی ئەو شەوەمان زۆر خۆش و پڕ لە شادی بوو. لەناو ئەو چادرە گەورەیەدا مۆمی درێژ و گەورە ناو چادرەکەی ڕووناك کردبۆوە و مقەڵی پڕ لە خەڵووزیش ناو چادرەکەی بە تەواوی گەرم گوڕ کردبوو.

ئەو سوارییەی لەسەر پشتی ئەسپەکەمدا کردم و ئەو غارکردنە و ڕووکردنە ئەو دەرودەشتو دەوەنە ئارەزووی خواردن و خواردنەوەی کردمەوە و زۆر تام و لەزەتم لەو خواردنە چەشت کە لەگەڵ دڵشاد و جیهانگیر و سەیفەدین و ژنەکانیدا خوارد و مەنجەڵێکی تەواو چێشتمان خوارد.

کەس لە ئێمە باسی ئەلجای نەدەکرد. بەڵام هەرکە دڵشاد و جیهانگیر دەهاتنە بەرچاوم وامدەزانی هەردەم لەبەردەممدایە.

لە کاتێکدا جیهانگیر لەگەڵ یەکێك لەو تووتکە سەگە هارانەی نوردینیدا گەمەی دەکرد. ڕووم تێکرد و پێم وت: کوڕم دەڵێیت چی با پێکەوە شەترەنجێك بکەین؟

وەڵامی دامەوە: باوکە چۆن ئارەزوو دەکەیت با وابێت. ئەگەر تۆ ئارەزووت لێیەتی، ئەوا منیش ئارەزووم لێیەتی.

-تۆ حەزی لێدەکەیت و ئارەزووت لێیەتی؟ بەڵام حەزیش ناکەیت لێت بەرمەوە؟

وتی: ئۆهـ نەخێر باوکە، چەند بتوانم هەوڵ دەدەم من لێت بەرمەوە.

وتم: کوڕم، زۆر شاد و کامەران دەبم کە لێم بەریتەوە. و بەسەرمدا زاڵ ببیت.

پێکەوە دەستمانکرد بە شەترەنج. جیهانگیر زۆر بە جوانی و شارەزاییەوە دەستیکرد بە یاری، بە شێوەیەك بوو کە هیچ منداڵێك لە تەمەنی ئەودا یاری نەدەکرد.

سەرنجی پەنجە بچووکەکانیم دەدا کە بەسەر بەردەکاندا دەیهێنا و دەیبرد زۆر بە شارەزایی و لەسەرخۆیی و هێمنییەوە گەمەی دەکرد.

لە سێ یاری دووانیانم لێ بردەوە. هەستمکرد کە هەستی کردووە بە ئەنقەست یاری سێیەمم پێ دۆڕاندووە. چونکە بینیم وەك ئەوەی هاوبەشی نهێنییەکم لەگەڵدا بکات.

تەماشای کردم و پێکەنینێکی شادی و خۆشی لە ڕوویدا دیاربوو. پاشان باوێشکێکم دا و پێم وت:

-وا بزانم خەوم دێت و ئارەزووی خەو دەکەم.

دڵشاد لە کاتێکدا تەماشای یارییەکەمانی دەکرد و سەرنجی دەدا و ناوبەناو کە یارییەکەمان گەرم دەبوو، وە دەبوو بە دەنگە دەنگ، پێکەنینێکی جوان و ناسکی دەکرد. وەڵامی دامەوە و پێی وتم:

من دڵنیام لەوە کە جیهانگیریش خەوی دێت. دوای ئەوە بە جیهانگیری وت:

-جیهانگیر، دەی بەردی شەترەنجەکە دابنێ و بڕۆ بۆ نووستن. هەرکە سەیفەدینیش لەگەڵ ئەو کوڕەدا ڕۆیشت کە یارمەتی دەدا و دەرگای ژووری نووستنەکەی بۆ دەکردەوە. دڵشاد بە تەماشاکردنێکی زۆر پەرۆشەوە تەماشای کردم و بە چرپە پێی وتم:

-گەرچی لە وەرزی زستاندا گوڵ و گوڵزار نییە، بەڵام جێ نووستنەکەم بۆنی گوڵ و گوڵزاری لێدێت و گیانیشم جوان و پاك و خاوێن و خۆشە.

منیش سەرم بۆ ڕاوەشاند و ڕەزامەندی خۆم بۆ داواکارییەکەی نیشاندا و سەرنجی ئەو کچە گۆرانی بێژەی سەیفەدینم دەدا کە جیهانگیری بۆ لای دایەنەکەی برد.

ئیتر لەو شەوەدا دوای ئەوە، گوێم لە هیچ نەما جگە لەو دەنگە دەنگە کەمە نەبێت کە ئەو جەنگاوەرە پیرە ناوبەناو دەیکرد. منیش ماوەی سەعاتێکی تر چاوەڕوانیم کرد هەرکە دنیا تەواو کش و مات و دەنگە دەنگ و جموجووڵ لەناو چادرەکاندا نەما و تاریکاریی باڵی کێشا بەسەردا، هاتمە دەرێ و بە هێواشی دەستمکرد بە گەڕان و بەرەو چادرەکەی دڵشاد کشام.

دڵشاد هەموو مۆمەکانی کوژاندبۆوە، جگە لە یەکێکیان نەبێت. ئەو سێبەرەی کە ئەو مۆمە لە ژوورەکەدا هەیبوو، سێبەرێکی بێدەنگ و لەرزۆك بوو.

بەڵام تیشکە کەمەکەی دەیدا لە گیان و لەشی دڵشاد و لەشە ڕووتەکەی دەردەخست.

لە ڕاستیدا هەروەك خۆی وتی لەشێکی زۆر جوان و سەرنجڕاکێشی هەبوو.

هەست و هۆشم بووژایەوە، دڵەڕاوکێ و ڕاچەنینی گیانم نەما. ئەو خەم و خەفەتە دەروونیو خەفەتە زۆر بە ئازارەم ڕەوییەوە. لە کاتێکدا باوەشم پێدا کردبوو توند نووساندم بە خۆمەوە هەستم بە خۆشی و شادییەکی زۆرتر کرد. لە پێشدا هەردووکمان هەستمان بە شەرم و

دڵتەپێ دەکرد. بەڵام ئەوەندەی نەخایاند، ئەوەشمان نەما. دوای ئەوەی لە باوەشمدا شل بوو. بە دڵخورپێیەوە لێی پرسیم، وتی:

-دەربارەی حسێن چی بکەین؟

وتم: من دەچمە پاڵ حسێن.

وتی: تەیموور بەڵام زۆر دڵڕەق و خراپەی لەگەڵدا کردووم.

وتم: با کاتی خۆی بێت من تۆڵەی لێدەسێنم.

وتی: باشە ئێستا ناتوانیت تۆڵەی لێبستێنیت؟

وەڵامم دایەوە: نەو، ئەوە وازبێنە بۆ کاتی خۆی.

وتی: ئەی تۆ ئیتر وازم لێناهێنیت و جێم ناهێڵیت؟ وا نییە..؟

وەڵامم دایەوە: مەگەر کارێکی زۆر پێویست بێتە پێشەوە جێتبێڵم و وازت لێبێنم. دوای ئەوە هەر بۆم ڕێکەوت بە زووترین کات دێمەوە بۆ لات.؟

-تەیموور. سوێندم بۆ بخۆ!!

-دڵشاد سوێندت بۆ دەخۆم..!!

ئیتر دوای ئەوە زۆر بە زەوق و ئارەزووەوە خۆی خستە باوەشمەوە و باوەشی پێداکردم..!!

هەرکە بە تەواوی پیاوەتیم هەستا، بینیم دڵشاد زۆر لەمەو پێشتری جوان و ناسك ترەو لە بەرامبەریدا هیچ هەستم بە شەرم و دڵەتەپێ نەکرد. لە دڵشاددا ئەلجای خۆیم بینی. لەشی دڵشاد بە تەواوی لەش و لاری ئەلجای بوو. بەڵام ئەوەی لە دڵمدا دەربارەی ئەلجای هەمبوو. وە نهێنی بوو لە باخچەکەی کۆشکی سپیدا بۆ هەتاهەتایە لەگەڵ ئەلجایدا ناشتم. ئایا دوای ئەو هیچ خۆشی و بەختیارییەك هەیە؟ ئایا دوای ئەو خۆشەویستی هەیە؟ ئایا دوای ئەو شادی هەیە؟ تەنها تام و ئارەزوو لەسەر زەویدا ماوە و ئەو قسە و چرپە پەری ئاساییەی ئەلجای بە گوێمدا دەیچرپاند ڕۆیشت و نەما..!!

بەڵام کتوپڕ لەو بێهۆشی و لە خۆچوونە، بە ئاگا هاتمەوە و چوومەوە سەر ئەو ڕێگایەی کە پێش ئەوەی ئەلجای لە هۆش خۆمم بەرێت و لە ڕێگا لامبدا.

ئیتر ئاوەها لە کومرودا لەگەڵ دڵشاد و جیهانگیر و سەیفەدینی پیرەمێردا مامەوە. وەرزی زستان زۆر بە زوویی تێپەڕی. لە کۆتایی بەهاردا هەموو ئەسپی مەغۆلەکان دەستیانکرد بە سووڕان و هەژان و کەوتن و دەمردن. خەڵکانی دەشت و دەری سادە و هەژار لە هەموو لایەکەوە ڕاپەڕین و چەکیان هەڵگرت.

بێ ئەوەی شازادەیەك سەرگردایەتیان بكات و هەرچی دوژمنانیان هەبوو دەریانكردن و ڕایاندان و لە وڵاتدا پاكیان كردنەوە.

لانەواز و هەژارەكان و گەدا و كەمدەستەكان. ئەو هاونیشتمانییە نەبەردانە بە هۆی دزی و ڕاو و ڕووت و فەرهوودەوە و ئەو شەڕ و كوشتارانەیان كە لە جادە و كۆڵانەكان لەگەڵ مەغۆلەكاندا دەیانكرد، ماڵ و سامانیكی بێشوماریان دەستكەوت و هەموو دەوڵەمەند بوون.

منیش تا ئەو كاتەش ڕانەپەڕیبووم، چونكە ئاینده تاریك و تەماوی بوو، پاشەڕۆژ نادیار بوو. گەرچی مەغۆلەكانیش پۆل پۆل بە پێ بەرەو باكوور دەڕۆیشتن و هەڵدەهاتن.

ئەوەش سەیر و سەرسوڕمێن نەبوو كە حسێن بە خۆیی و لەشكرێكی زۆر و بێشوومارەوە لە باشوورەوە بێتەوە و داوای سەمەرقەند و دڵشاد بكاتەوە. حسێن كاتێك منی بینی لەناو ئەو هەڵچوون و شەڕ و ئاژاوەیەدا كە شار و گوندی گرتبۆوە شەترەنج دەكەم. دانەكانی جیڕكردەوە لێی پرسیم:

-ها حاڵی زاوا شەلەكەم چۆنە؟

وەڵامم دایەوە: من زۆر شاد و بەختیارم كە دەبینم مەغۆلەكان ئێرە جێدێڵن و دەڕۆن.

وتی: تۆش هەندێ شتت كردووە بۆ ئەوەی مەغۆلەكان لێرە دەربكەن.. وانییە؟!

وتم: بەڵێ.. منیش هەندێ شتم كردووە.

پێكەنینێكی ئاساییم لە ڕوویدا كرد. چونكە من ئەوكاتە بە پێویستم نەدەزانی هەموو وڵاتی تەتەر ئەوە بزانن. كە چۆن و كێ مەغۆلەكانی بەزاند و لەناوی بردن.

چونكە هێشتا لە پێشمانەوە ناخۆشی تر مابوو. چونكە وڵات نیوە كاول و وێرانە بوو. وڵات پێویستی بەوە بوو كە گومرگ و باج لاببرێت و هەرچی ناكۆكی هەیە لەناودا نەمێنێت و ئەو شازادە بە تەماعانەی كە ئاوات و ئارەزوویان ئەوە بوو بچنە سەر كورسی شانشینی و بەریەرەكانیان بۆ دەكرد لەناو ببرێن و حسابی تایبەتیان بۆ بكرێت.

ئەم پێویستییانە بێگومان ڤین و بوغز و تووڕەیی دەڕژانند بەسەر پارێزگار و سەرداری یەكەمدا.

ئیتر من گەڕامەوە بۆ شەهری سیبز لە كاتێكدا حسێن زۆر بە لووتبەرزی و ڤین و سووكایەتیپێكردنەوە وازی لە شارەكە هێنا و دایەوە دەستم. و بۆئەوەی سووكایەتیم پێبكات بە توانج و تەشەرەوە ئەوكاتەی بیرخستمەوە كە من ڕۆژێك لە ڕۆژان لەسەر كورسی شانشینی بووم، پاشان لەسەر ئەو كورسییە هێنامیانە خوارەوە. پێی وتم:

-تەیموور.. لە بیرتە تۆش ڕۆژێك لە ڕۆژان وەك من ئێستا وازم لەم شارە هێنا بۆت..!! تۆش بۆ من وازت لێهێنا؟!!

وتم: بێگومان ئەوەم لە بیرە و لە بیریشمە کە لە باشوورەوە تۆ زۆر بە باشی شانشینەکەی منت لە خەتەری هێرشی کوتوپڕی دەپاراست!!

وتی: بەڵێ.. پارێزگاریم کردیت تاکو لە باکوورەوە گەمارۆ دەرام.

وتم: حسێن من ئەوکاتە هەڵە بووم.

وتی: ئەمە دابونەریتی تۆیە. بەڵام ئێستا دەتوانیت تیپێکی سێ هەزار کەسی ڕاگریت و بیشیکەیت بە تیپی تایبەتی خۆت.

وتم: حسێن من ئێستا تەنها پێویستیم بەوەندە هەیەو لەگەڵ ئەو سەرکردە بەهێزەی کە لە سەمەرقەند فەرمانڕەوایە!!

وتی: تەیموور. من هەوڵدەدەم کە بە هیچ جۆرێك ئازار بە شارەکەت نەگات.

وتم: منیش زۆر سوپاسی ئەو چاکەیەت دەکەم.

من دەمزانی حسێن لە پاشەڕۆژدا دەبێت چ باجێك و پاداشتێك بداتەوە. منیش هەر ئەو تیپە بچووکەم لا باشتر بوو، چونکە لە دواییدا دەمتوانی بەهێزی بکەم و فراوانی بکەم بێ ئەوەی هیچ تەنگوچەڵەمە و ناکۆکییەك بۆ ئەو ناوچەیە پەیدا بکەم کە تێیدا دەژیم ژیانی خۆم بخەمە مەترسی و ناخۆشییەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا حسێن باجێکی زۆر زۆری خستمە سەر. هەتا وام لێهات هەرچی گەوهەر و ئاڵتوونێکم هەبوو. "هەتا ئەو گەوهەرانەی ئەلجایش" لەسەری ساڵی نوێدا بۆم برد. کاتێك ئەو باج و گومرگەم دایە، کە سەپاندبووی بەسەرمدا، حسێن ئەو گەوهەرانەی ئەلجای ناسییەوە و بە وردی سەرنجی‌دام و هەستی بە دەستکورتی من کرد.

بەڵام من بە ئاسایش و دڵنیایی و لەسەرخۆ لە کۆشکی سپیدا لەگەڵ جیهانگیر و عەبدوڵڵا و دایکی و کاریندا ژیانم دەبردە سەر. گەرچی شەڕ و ئاژاوە و ناکۆکی بە گەرمی بەردەوام بوو. شازادەکانی تر زۆر نارەزا بوون و نارەزایی خۆیان بۆ ئەو خوێن ڕشتن و چاوچنۆکییە زۆرەی حسێن کە بۆ کۆکردنەوەی ماڵ و سامان هەیبوو دەردەبڕی. بەڵام من لەو هەموو ماوەیەدا وەك جیهانگیر یا وەك ئەلجای خوالێخۆشبوو، زۆر خۆڕاگر و بێوەی و لەسەرخۆ بووم.

من هەموو کات چاوەڕوانی ئەو کات و هەلەم دەکرد کە پێویستە تێیدا ڕاپەڕم. چاوەڕوانی ئەو کات و هەلەم دەکرد کە خوا بۆم بڕەخسێنێت و بتوانم تێیدا ڕاپەڕم.

ئاخری ئەو هەلەم بۆ ڕەخسا و پاش ئەوەی لەو مەبەست و ئامانجە پیرۆزە تێگەیشتم. توانیم بە دەستێکی پۆڵایین جڵەوی هەموو جیهان بگرم و ئەو شمشێرە ئاگرینە لە کالان دەرکێشم و بیگرم بە دەستمەوە بۆئەوەی ڕێگەی ڕاستی درەختی ژیانی پێ بپارێزم و خزمەتی مەبەست و ئامانجی ڕاستی خوای گەورەی پێبکەم.

* * *

## پیلانێکی نوێ

هەرکە لە شەهری سیبزدا سەرەتای بەهار دەرکەوت دڵشادیش بۆ دیدەنی و سەردانی جیهانگیر بۆ شەهری سیبز هات. حسێن هیچ بەرهەڵستی و ڕێگایەکی لێنەگرت. چونکە دەیزانی ژنەکەی چەند جیهانگیری کوڕمی خۆشدەوێت و شەیدای باخچەی کۆشکەکەمە و دڵخۆشە پێی. هەروەها بە هۆی ئەو ماڵ و سامانە زۆرەوە کە پێکیەوە نابووی، توانیبووی ژمارەیەکی زۆر ژن و کەنیزەکی تر بهێنێت. حسێن بە هۆی ئەو تێکەڵاوی و ڕابواردنە زۆرەوەی کە لەگەڵ ژنە بێگانەکانیدا هەیبوو. دڵشادی پشتگوێ خستبوو. بە هیچ جۆرێك نەدەچوو بە لایەوە، هیچ کەیف و ئارەزوویەکی لە ئاست شازادە دڵشادا نەمابوو. دڵشاد حسێنی دەبینی هەموو کات لە ئاستیدا سارد و سڕ و وشك و بێ هەست و هیچ خۆشەویستی و مەیلی نەمابوو، زۆر دڵڕەقیش بوو لە ئاستیدا.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەردەم خۆشی و شادییەکی بێ وێنەی بۆ ناو جێگاکەی من دەهێنا و تینوێتی گڕ و کڵپە و ئارەزووی دادەمرکاندمەوە. منیش هەموو کات بە پەرۆش و ئارەزوو بێ ئارامییەوە چاوەڕوانم دەکرد. هیچ کات سڵم لەو پەیوەندی و زەوق و ئارەزووە بە سۆزە نەدەکردەوە، وەك لەگەڵ ئەلجایدا سڵم لێدەکردەوە. وردە وردە بە سەربەستی و نەترسییەوە ئارەزوو، و کەف و کوڵی خۆم لە لەش و لاری دڵشادا دەبینی. ئەو لەش و لارەش خۆشترین و بەتامترین میوەیەك بوو لە بەهەشتی سەرزەوی خوادا. دڵشاد لە پێش چاومدا تەنها ژنێکی جوان و بەتام بوو. هەرکە ماچم دەکرد و دەمگرتە باوەش و هەڵمدەگوشی هەستم بە سام و شکۆ نەدەکرد، وەك ئەو سام و شکۆ و هەیبەتە کە گیانم بەر گیانی ئەلجای دەکەوت و ترس و لەرز دایدەگرتم. خۆشی و شادی لەشی دڵشاد و تام و ئارەزووی بە تەواوی تێگەیشتم. زۆر ئاڵۆز نەبوو وەك ئەو ئاڵۆزییەی ئەلجای هەیبوو. من لە دڵشاد گەیشتبووم بە هۆی ئەو پەیوەندییەی کە لەگەڵ زیبا و لەیلا و خاتوو شێرێزادا هەمبوو.

جارێکیان دڵشاد بە ترس و دڵەخورپێوە لێی پرسیم وتی:

-تۆ لەوە دڵنیایت کە ئەم هەموو ماچ و هەڵگوشینەم تەنها لەبەر منە؟ و هیچ شتێکم لە ئەلجای ناچێت؟ بیری ئەو بکەیتەوە بە دزییەوە و بە یادی ئەلجایەوە لەگەڵمدا بیکەت؟!!

وتم: دڵشاد ئەلجای هەرچییەکی هەبوو لەگەڵ خۆیدا بردییە ناو گۆڕەوە..

وتی: ئەوەی کە ماوەتەوە بۆ منە.. وا نییە؟

چونکە تۆ زۆرت خۆشدەویست و منیش لەو دەچم. وەکو ئەویش دەبم. تەیموور لەبەرئەوە منت خۆشبوێت و منیش وەك ئەلجای دەبم. ئایا تۆ منت خۆشدەوێت؟

وتم: هێشتا باوەڕ ناکەیت من تۆم خۆشدەوێت؟ تۆ لەو باوەڕەدایت من سەرزارەکی تۆم خۆشبوێت؟

وتی: من نازانم.. نەخێر وا دیارنییە منت سەرزارەکی خۆش بوێت. چونکە ئەو دەست تێوەردان و دەستلێدانەت بە هەمان شێوە و ڕێگایە کە دەستت لە ئەلجایەوە دەدا. من وا هەست دەکەم، بەڵام ئاه تەیموور من نازانم.

وتم: بۆچی نازانیت؟ ئایا هەردووکمان کەیف و خۆشی و شادی لە یەکتر نابینین؟

وتی: بەڵێ، بەڵێ.. تەیموور، تام و خۆشی تەواومان دیوە. هەر ئەوەشە پاڵم پێوە دەنێت لێت بپرسم. من ناتوانم تام و شادی لەم خۆشییە ببینم و دڵەخورپێش جێم پێ لێژ بکات. بەڵام ئایا تۆ دڵنیایت لەوە من دڵشادم و ئەلجای نیم؟!!

وتم: بەڵێ دڵشاد من دڵنیام و بێگومانیشم!! ئەمەم پێوت و دەستم هێنا بەسەر قژ و دەموچاویدا، کە هەر لە دەموچاوی ئەلجای دەچوو. بەڵام دەموچاوی ئەو نەبوو. دڵشادیش دڵنیا نەبوو لەوە و لێی پرسیم وتی:

-تەیموور.. ئایا هەردەم هەستت بەرامبەرم هەروا دەمێنێت؟ وە تۆ دڵنیایت هەروا بمێنێتەوە؟

وتم: ئەو هەست و شعورەی بەرامبەرت هەمە. هەتا هەتایە ناگۆڕێت و هەرواش دەمێنێتەوە.

وتی: کەواتە تۆ منت خۆشدەوێت.. وانییە؟

تەیموور.. دە بڵێ من تۆم خۆشدەوێت.. دە بڵێ تۆم خۆشدەوێت.

خۆشەویستی وشەیەکە. بەڵام ئەوەی پیاوان تێیگەیشتوون و بۆی دەچن لە مانای ئەو وشەیە، ئەوە شتێکی ترە.

ئەو شتە وەك پارەیەكی قەڵب وایە، بەڵام هەندێ جار بە پارەی قەڵب و ناڕاست دەتوانیت وەك پارەی ئەسڵی و ڕاستی لای كەسێك كە نەزانێت ئەو پارەیە قەڵبە، شتی پێبكڕیت. بە پێچەوانەیەكی "تناقض" سەیرەوە كە ئەمە لە سیفەتی ژناندایە وەڵامی دامەوە و پێی وتم:

-من دەزانم تۆ منت خۆشدەوێت. و لەوە دڵنیام تۆ منت خۆشدەوێت!!

ئاوەها پارە قەڵبەكەی من توانی دووبارە، ئەو شتە بكڕێت كە پیاوەتی ڕاست و پاكی حسێن نەیتوانی پەی پێ ببات و بیكڕێت. ئیتر دوای ئەوە لەو جێگایە هەردووكمان هاتینە دەرێ و ئاواتم بوو جارێكی تر دڵشاد نەیەتەوە ناوی و بەرەو باخچە دڵڕفێنەكە كەوتینە ڕێ.

ئەو هەوا ساردەی بەهار تۆزێك تەشقی شكابوو.

هەردووكمان خۆمان ڕووت كردەوە و چووینە ناو ئەو گۆمە ئاوەوە كە لە باخچەكەدا بوو. پێكەوە خۆمان شۆری و مەلەمان تیادا كرد. كاتێك لە گۆمەكە هاتینە دەرەوە دڵشاد لەشی نووساند بە لەشمەوە و بە توندی خۆی پێوە نووساندم بۆ ئەوەی گەرمی بێتەوە.

بەپێ لەسەر داگرتنەوە كە لە قسەكانیدا دیاربوو پێی وتم:

-تەیموور.. كەی حسێن لەناو دەبەیت و تێكیدەشكێنیت؟ كەی؟ كەی لەسەر ڕووی زەویدا نایهێڵیت و لەناوی دەبەیت؟

وتم: دڵشاد بەم زووانە لەناوی دەبەم..!!

وتی: ئاخر چۆن؟ بەم زووانە..؟ من زۆرم پێناخۆشە بچمەوە بۆ سەمەرقەند.

وتم: بەم زووانە دەستپێدەكەم. ئەم كارەش پێویستی بە ساڵێك هەیە و ڕەنگە دوو ساڵیش بخایەنێت.

وتی: دوو ساڵ..!! من ناتوانم دوو ساڵی تەواو چاوەڕوان بكەم. ئەمساڵی دواییەی لەگەڵ حسێندا بردمە سەر ساڵێكی زۆر ناخۆش و گران بوو. ئەمەی تۆ دەیڵێیت تەنها بۆ ئەوەیە منی پێ هەڵخەڵەتێنیت و ئازارم بدەیت و بێزارم بكەیت. لەوەش زیاتر هیچی تر نییە. تۆزێك لێم دووركەوتەوە و ترس و لەرز لە چاوەكانیدا دەدرەوشایەوە و دەیویست لەبەر تیشكی ئەو مانگە شەوەدا بیروڕام بخوێنێتەوە. لە سەرمایاندا دەلەرزی و ئەو تیشكی مانگە شەوە كە دەیدا لەو دڵۆپە ئاوانەی لەسەر لەشیدا كۆببوونەوە، وەك پارچە ئەڵماسێك دەبریسكانەوە. هەمدیسان هاتەوە و خۆی خستەوە باوەشم بۆئەوەی گەرمی بێتەوە.

بە دەنگێكی نووساوەوە لێی پرسیم، وتی:

-نەخێر.. تەیموور.. دوو ساڵ چاوەڕوان مەبە.. ئەو ئێش و ئازار و ناخۆشییەی چەشتوومە بەسە.. خێراکە چونکە ئێمە تاکو ئێستا لە هەرەتی جوانی و لاوێتیداین.. ئێستاش کارێك مەکە تاکو بچمەوە بۆ سەمەرقەند.. ئاوەها بە گەرمی داوای لێدەکردم، ئێستا یان سبەینێ یان پاش هەفتەیەکی تر حسێن لەناوبەرم. منیش خۆم هەستم دەکرد ئەوکات و هەلە گونجاوە خەریکە بڕەخسێت و کاتی هاتووە. هەر ئەوکاتەی دڵشاد لە شەهری سیبز بوو، داوام لە سەیفەدین و نورەدین کرد، بێن بۆ لام. لەمەوپێشیش جاکۆ و ئیلشی هاتبوونەوە و ئەوانیش لام بوون. هەروەها نامەم بۆ شێخ عەلی و ئەو سوارە چینییە نارد، کە من وام دادەنا ئەم دووانە باشترین و چابووکترین و بەتواناترین سەرکردەیەکی جەنگین لە هەموو ئاسیادا.

شێخ عەلی نامەیەکی بۆ نووسیم و لە نامەکەیدا پێی ڕاگەیاندم کەوا شامالك هەر نەخۆشە و پێویستی پێم هەیە بەڵام چونکە دەیزانی من بیر لە شتێکی گرنگ دەکەمەوە شێخ عەلی موفای لەگەڵ چل سوارچاکدا بۆ لام نارد. چونکە ئەم سوارە چینییە لەگەڵ خاقاندا ناکۆك بوو سەرکردایەتی کۆمەڵێك یاخیبووان و دز و جەردە و ڕێگری دەکرد. لەگەڵ خۆشیدا سەرکردە داودی بۆ لام هێنا. ئەوکاتەی دڵشاد لە کۆشکەکەی مندا میوان بوو، من سەرزارەکی وام پیشاندا، ڕێز و گەورەیی، گەورەی کۆشك "واتە دڵشاد" دەگرم. میوانداری و بانگهێشتنی شازادە و ناودارەکانم کرد بۆ لای خۆم. ئەو شازادە و گەورە پیاوانەش ژنە شازادەکانیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو. منیش ئەوەی لە توانامدا بوو لە هۆکاری خۆشی و شادی چیم توانی بۆیانم ئامادە کردو پێشکەشم کردن. ڕۆژانە بە هۆی باز و هەڵۆ و شەهێن و تانجی و سەگ و چەکەوە بۆ ڕاو دەچووین و ڕاومان دەکرد. هەندێ جاریش لەو دەشتە پان و بەرینەدا کە نزیك ڕووبارەکە بوو، گەرەو و پێشبڕکێ و یاری شەترەنج و بۆلۆمان دەکرد. نیشانمان دەنایەوە و بە تیر نیشانەکانمان دەشکاند.

بەڵام شەوانە بانگهێشتنی گەورە و ئاهەنگی گەورە و قەشەنگمان دەگێڕا گەڵ یاری و قسە و کاری خۆشمان دەکرد بۆ ئەوەی میوانەکانمان دڵشاد بن و بێزار نەبن. لەو سەردانەیاندا منیش زۆرجار لەو ئاهەنگ و بەزمانەدا فرسەتم دەهێنا و لەگەڵ دڵشادا دەچووینە ژوورێکەوە و دەرگامان دادەخست بۆئەوەی لەوکاتەدا سوود لەو سەردانەی وەربگرم. هەروەها ڕۆژانیش ناوبەناو فرسەتم دەهانی و لەگەڵ ئەفسەرە دێرینەکانمدا بە تەنهایی گفتوگۆ و قسەم لەگەڵدا دەکردن.

بارودۆخی ئیمپراتۆرییەتەکەی حسێن هەروەك من چاوەڕوانم دەکرد و بۆی دەچووم بەرەو خراپی و ناکۆکی دەچوو. چونکە زۆربەی زۆری سەرکردە و شازادە تەتەرییەکان ئامادە بوون ئەو باجە زۆرەی کە خرابووە سەریان نەیدەن و لە حسێن هەڵگەڕێنەوە و لەژێر فەرمانی ئەودا

بچنە دەرەوە. بەڵام هیچ کەسێك لەوان ئەو هێزەی نەبوو بتوانێت سەرکردایەتی ئەو ڕاپەڕین و هەڵگەڕانەوەیە دژ بە حسێن بکات. سەردار و سەرکردە بچووکەکانی ئەو هۆزانە لەناو خۆیاندا دووبەرەکیان تێکەوتبوو، هۆزەکانیان لە یەکتر دابڕیبوو، جگە لە سەردارانی هۆزەکانی جالیر نەبێت، لە سەمەرقەندا لەگەڵ حسێن و لە کارشیشدا لەگەڵ موسادا بوون.

چونکە حسێن منی بە هیچ و بێهێز دەزانی، قینیشی لە توانام دەبۆوە، لەبەرئەوە لێم نەدەترسا و سڵی لێنەدەکردەوە. بەڵام موسا چونکە کاتی خۆی لەژێر ئاڵا و فەرماندەیی مندا کاری کردبوو، توانای منی باش دەزانی، منی بە گەورەترین و سامناکترین کەسانێك دادەنا کە هەڕەشەی لێبکات. حسێن ئەوەندە بەهێز بوو، دەیتوانی سەمەرقەند لە گشت هێرش و هەڕەشەیەکی بەهێزترین سەرکردە و زۆرترین ژمارەی لەشکری دوژمنانی بپارێزێت، کە پیاو نەوێرێت لە پاشەڕۆژدا دژی ئەو کۆببکەنەوە. موساش زۆربەی کات و ڕۆژانی لە نێوان پێکی خواردنەوە و ڕابواردندا بەسەر دەبرد. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سێ هەزار سەربازی چەکدار و شاری کارشی بە دەستەوە بوو، قەڵا و شوورای قایم و بەهێزی هەبوو. گەرچی کارشی شارێکی بچووك بوو، بەڵام لە ڕاستیدا لە چاو سەمەرقەندا شوێنێکی ستراتیژی و قەڵایەکی بەهێز و پتەو بوو.

باروودۆخ وەك هەموو شازادە و سەربازەکان کە بە تەنهایی قسەم لەگەڵدا دەکردن و ئەوانیش بۆیان باس دەکردم و پێیان دەگوتم، باروودۆخێکی ساز و گونجاو بوو. وە دەشبوو هەر بەم شێوەیەش لەو چادرەی کە عەبدوڵڵا، لە لەوەڕگای هۆزی برلاس. لە نزیك دۆڵەکەوە هەڵیدابوو، دەبوو لەو کۆبوونەوەیەدا بەو کۆمەڵە شازادەیە بڵێم.

ئیمام زەینەدینم بانگکرد بۆ ئەو کۆبوونەوەیە، لەو کۆبوونەوەیەدا ئیمام نوێنەری مزگەوتەکان بوو. هەروەها هەندێ دەست و پێوەندی میوانەکانیش کە عەبدوڵڵا بانگی کردبوون و هەڵبژاردبوون لەو کۆبوونەوەیەدا بەشداربوون ئەو دەست پێوەندانە کە لەو کۆبوونەوەیەدا هاوبەشبوون بە شێوەی نۆکەری شازادەکان بانگهێشتن کرابوون وە جگە لە من و عەبدوڵڵا زیاتر کەسی تر نەیدەزانی ئەمانە لەو کۆبوونەوەیەدا دەوری چاودێری نارەسمی دەبینن.

بە گەرمی و ڕاستگۆییەوە ڕوومکردە ئامادەبووان و بە ڕاشکاوییەوە پێم وتن:

-ئەی شازادە بەڕێزەکان!! من ئێوە بەتواناترین و ڕاستترین و بەوەفاترین دۆست و هاوڕێیانی خۆم دەزانم. من بێگومانم و چاکیش دەزانم ئێوە هەستتان کردووە ئەم بانگهێشتنەی من بۆ ئێوە شتێکی نهێنی تێدایە. هەموو ئامادەبووان دەستیانکرد بە غەڵبەغەڵب و هەندێکیشیان قاقا بە زۆڵێتییەوە پێدەکەنین و وا خۆیان پیشان دەدا گوایە تێگەیشتوون بۆچی من بانگهێشتنم کردوون.

جاكۆ لەناو هەمووانـدا وەڵامی دامەوە، وتی:

-تۆ ناتوانیت لە مـامی خـۆت شـت بشاریتەوە و وا بزانیت بێهۆشـە. مـن ئـەوەی بـرلاس بـاش دەناسم و هەردەم چاوەڕوانی شتیان لێدەکەم. بەڵام پێمبڵێ بزانم ئەو شتە چییە؟

وەڵامـم دایەوە، وتم:

-زۆر باشە، ئێمە هەموومان هەوڵێستمان لەسەر هەڵسووڕاندنی کار و بارودۆخ لـە وڵاتـی تەتـەردا یـەکین. مـن لـەو بـاوەڕەدام جنگی پیس و چەپـەڵ و ناپاکییـەکی زۆر وا لـە فـەرمانڕەوایی حسێندا. لەبەرئەوە من دەمەوێت لەم تەنگوچەڵەمەیەی هەمووان تێی کەوتووین ڕزگارمان ببێت.

نوورەدین لێی پرسیم وتی:

-چۆن؟ تـۆ ئێستا لەشـکرێکی زۆر و بـەهێزت نییـە، ئەگـەر ئێمـەش دەسـتمانکرد بـە هێنـانی هێزەکانمان "گەرچی لەگەڵ ئەوەشدا زۆریـش نـین" ئەوکاتـە حسێن تێدەگات پلانێـك هەیـە بـۆ ڕاپـەڕین و لێهەڵگەڕاندنـەوە و ڕاوەستان دژ بـەو. ئەوکاتـە بـە ئاسانی دەتوانێـت شـەهری سـیبز بگرێت، پێش ئەوەی تۆ بتوانیت هەزار کەس کۆبکەیتەوە.

منیش بە بڕوایەکی تەواو، و توانایەکی زۆرەوە، وەڵامم دایەوە:

-نورەدین، من قەڵایەکی زۆر بەهێز داگیر دەکەم. بەڵام ئەوەندەی نەخایاند لێی پرسیم:

-ئەو قەڵایە کوێیە؟!!

جاکۆش زۆر بە هەناسەساردی و بێئومێدییەوە لێی پرسیم:

-تەیموور لەگەڵ کێدا؟ و بەچی؟!!

وەڵامـم دانەوە، وتـم:

-ئەو قەڵایە کارشییە!!

بەڵام هەمەدیسان جاکۆ بە گاڵتەپێکردنەوە لێی پرسیم:

-تۆ دەتوانیت بەهۆی دوو سەد، سێ سەد پیاوەوە دەست بەسەر کارشیدا بگریت؟!!

ئێستا موسا سێ هـەزار سـەرباز و پیـاوی هەیـە!! موسـا دەتوانێـت قەڵاکـەی خـۆی بپـارێزێت، ئەگەر ئەو جیاوازییەش لە نێوان هێزەکەی خۆی و هێزەکەی تۆشدا نەمێنێت.

وتم: من دەتوانم کارشی داگیربکەم و دەستی بەسەردا بگـرم، گـەرچی جیاوازیشـی زۆر بێـت و هیچ یەکسانییەك نە نێوان هێزەکەی من و هێزەکەی ئەویشدا نەبێت.

وتی: وا چاکترە موسا بانگبکەیت بێت بۆ ئێرە بۆ لات و جێگاکانی خۆتان بگۆڕنـەوە، تـۆ شارەکەی خۆت پێدەیت بەو و ئەویش شارەکەی خۆی بدات بە تۆ بەو شێوەیە دەتوانیت شارەکەی بگریت!!

لەبەرئەوەی جاکۆ مامی من بوو، لە منیش گەورەتر بوو دەیتوانی زۆر سەربەستانە قسە بکات.

سەرنجمدا هەندێ لە شازادەکان لەگەڵ بیروڕا و ئەو گومانەی ئەودان. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بینیم شازادەکان و جەنگاوەرە ئازا و نەترسەکانی تری گوێیان بۆ من گرتبوو، وە سەرنج و هۆشی تەواویان لای من بوو. لەبەرئەوە وەڵامی جاکۆم دایەوە، وتم:

-من دەتوانم موسا لە قەڵاکەی بێنمە دەرەوە، چونکە ئێستا گەرما زۆرە لە..

بەڵام جاکۆ نەیهێشت قسەکانم تەواوبکەم و قسەکانمی پێ بڕیم و وتی:

-تەیموور تۆ شێتیت!! موسا هیچ کات لە قەڵای کارشی ناجووڵێت و لەو قەڵایەش نایەتە دەرێ مەگەر بە زۆر دەربکرێت.

بە دوای قسەکانی ئەودا سوارە چینییەکەش وتی:

-موسا حەوانەوە و ژنەکانی خۆی زۆر خۆشدەوێت، ئێستاش لە شاری کارشیدا زۆر گەرمایە. لەم ڕۆژانەشدا ژنەکانی لەو گەرمایەدا بێزارن. لەبەرئەوە دەتوانرێت بە فێڵ و تەڵەکەبازییەکی شارەزاییانەوە موسا لە قەڵاکەی بهێنرێتە دەرێ.

بینیم ئەو سوارە چینییە هەستی بە پلانەکەم کردووە. لەبەرئەوە بەسەر ڕەزامەندی خۆمم پیشاندا و وتم:

-من زۆر پشت بەو بیرۆکەیە دەبەستم. چونکە موسا لەسەر زەوق و کەیف و ڕابواردن لەگەڵ ژنەکانیدا ڕاهاتووە و تەنها هەر مەبەستی ڕابواردن و خۆشییە. من لەو باوەڕەدام، ئێستا خەو بە چادرێکەوە دەبینێت لەو دەشت و لەو کەش و هەوا سارد و خۆشەی ئەو دەشتەدا هەڵبدرێت و پەرییەکی لەش و لار نەرم و شلی لابێت وەك لەوەی خەو بە شەڕەوە ببینێت.

جاکۆ سەری ڕاوەشاند و قسەکانی منی پەسەند نەکرد و پێی وتم:

تا تۆ لەم دۆڵەدا بیت، موسا هیچ کات لە شارەکەی خۆی نایەتە دەرێ.

ئیلشی وەڵامی وتەکانی دایەوە و بە شێوەیەك کە پڕبوو لە هیوا و ئاوات وتی:

-موسا و پیاوەکانی بە ئاواتی ئەوەن تۆزێك لەو دەشت و هەوا فێنکەدا ڕابوێرن و ئەگەر بتوانن و ترسیان نەبێت لە شارەکە دێنە دەرێ.

تەماشایەکی عەبدوڵلام کرد، ئەویش سەری ڕەزامەندی خۆی دانەواند و قسەکانی ئیلشی پەسەند کرد. چونکە زانیارییەکانی عەبدوڵلا لەگەڵ قسەکانی ئیلشیدا وەك یەك وابوون.

پاشان ڕووی دەمم کردە جاکۆ و پێم وت:

-باشە ئەگەر من لە ناوچەکە هاتمە دەرێ و وا خۆم نیشان بدەم کە دەچم بۆ هێرات بۆ سەردانی شامالکی خەزوورم. ناچێتە عەقڵتەوە ئەوساکە موسا لە شارەکەی بێتە دەرێ؟

وتی: بەڵێ دێتە دەرەوە، بەڵام هەرکە دەنگوباسی گەڕانەوەتی لە هێرات بیست، خێرا دەگەڕێتەوە ناو قەڵا و شووراکانی خۆی. ئەوکاتەش دەتوانێت بەرهەڵستی ئەو پیاوانە بکات کە شێخ عەلی لە دەوری شووراکانی کارشی کۆیدەکاتەوە. دەبێت ئەوەشت بیر نەچێت، چ دڵڕایەتییەك لە دڵی حسێندا ڕوودەدات، کاتێك ببیستێ لەشکر لە باشوورەوە هاتووە. من بڕوا ناکەم پلانەکەی تۆ بە هیچ جۆرێك سەربگرێت.

وتم: مامە جاکۆ من پێویستیم بە لەشکری شێخ عەلی نییە. هیچ پێویستیش ناکات ئەو هەموو ڕێگایە ببڕم و بۆ هێرات بچم. من تەنها نیوەی ڕێگا دەڕۆم و کتوپڕ دەگەڕێمەوە.

وتی: کوڕم قسەکانت مەعقوول نییە و ناچێتە عەقڵەوە. من وامدەزانی شتێکی باشتر لە بیروڕاتا هەیە. بەڵام ئەمە ئەوە نییە و هیچیش نییە.

وتم: نەخێر، شتێکی باش لە بیروهۆشمدا هەیە. من کارشی هەر دەگرم. ئەوکاتەش قەڵایەکی توند و بەهێزم هەبوو، دەتوانم خێزان و منداڵی پیاوەکانمی تێدا بپارێزم و دەشتوانم لەو هەموو هۆز و خێڵە زۆرانە هێزێکی گەورە و بە توانا پێکبهێنم و بەربەرەکانی "واتە بەو هێزەوە" حسێن خۆی پێبکەم ئا ئەمە پلانی ڕاست و ڕەوانی منە.

ئیلشی لەسەر قسەکانی من وتی:

-بە ڕاستی ئەم پلانە شایانی ئەوەیە پیاو بیکات و خۆی تێدا تاقی بکاتەوە.

بۆ یەکەمجاریش ئیمام زەینەدین هاتە قسە و پێی وتم:

-ڕەحم و بەزەیی خواشمان لەگەڵدا دەبێت. چونکە لەم دواییەدا حسێن بەردەوام دەستدرێژی کردۆتە سەر ئەو شتومەکانەی ماڵ و سامانی مزگەوتەکانی تێدایە. ئیتر منیش ڕوومکردە ئەو شازادانەی ئامادەبوون و پێم وتن:

-شازادە بەڕێزەکان بیر لەم کارە بکەنەوە و لە دواییدا بیروڕای خۆتانم پێ ڕابگەیەنن.

پاشان لە چادرەکە هاتمە دەرێ و سواری پشتی ئەسپەکەم بووم و بە غار بەرەو دەشت و دۆڵەکە کشام.

هەوا لەو دەشت و دەرە پاك و فێنك بوو. لە نیوەڕوانیشدا گەرما تاوی دەسەند و هەتا شەهری سیبزیش لەو گەرمایە ڕزگاری نەدەبوو. ئیتر هەستمکرد پلەی گەرما لە کارشیدا چەند بەرز بۆتەوە و ئێستاش دەبێت پلەی گەرما چەند زیادی کردبێت، و لە مانگی داهاتووشدا زۆر

زۆر زیاتریش دەبێت وەك لەمەوپێش. بیرم لەوە دەکردەوە موسا لەناو شووڕای شارەکەدا ئێستا چەند نیگەرانی ئەم گەرمایەیە.

هەروەك من موسا بناسم زۆر شاد و بەختیار دەبێت بەوەی هەلێکی بۆ برەخسێت و لەو دەشتەی لەبەردەم شارەکەدایە بتوانێت چادرێکی هاوینە هەڵبدا و لەو هاوینە هەواردا تۆزێك فێنکی بێتەوە و بحەسێتەوە. کاتێك گەڕامەوە بۆ هەوار و چادرەکەی خۆم بە تەواوی بڕوا و ئومێدم بە پلان و بیروڕاکەی خۆم زیاتر کرد.

دڵنیا و بێگومان بووم لەوە کە بیروڕاکەم بە تەواوی ڕاست و پەسەندە.

هەرکە گەیشتمەوە ناو چادرەکەی خۆم بینیم جەنگاوەران و شازادەکان لە دەوری چادرەکاندا پیاسەیان دەکرد و لەگەڵ یەکدا قسە و گفتوگۆیان بوو. لەوە گەیشتم هەمووان گەیشتوونەتە سەر ئەوە بڕیاری کۆتایی بدەن. هەرکە گەیشتمە لایان هەموویان لە دەورم کۆبوونەوە و سەیفەدینی پیرەمێرد بە ناوی هەمووانەوە کەوتە قسەو ئەو پیرەمێردە پەککەوتەیە زۆر بە هێدی و لەسەرخۆییەوە ڕووی تێکردم و پێی وتم:

-ئێمە هەموومان لەسەر ئەوە پێکهاتین کە لەگەڵتدا بین گەرچی هەندێکمان لە پلانەکەت نەگەیشتووین. بەڵام ئێمە ئەو سەرکەوتن و شارەزاییانەی پێشووتمان لە یادە و هەمووان ئارەزوومەندن دووبارە دواتکەون و لە تەکتا بڕۆن. دوای ئەوە ئیمام زەینەدین قورئانی پیرۆزی بە دەستەکانی بەرزکردەوە و سەردار و شازادەکانیش یەك بە دوای یەکدا بە بەردەم ئەو قورئانە پیرۆزەدا ڕەت دەبوون و بەو قورئانە پیرۆز و گەورەیە سوێندیان دەخوارد کە هەردەم ئێستا و پاشەڕۆژیش گوێڕایەڵ و پاك و بێ غەش بین و لەگەڵ یەکتردا ناپاك نەبین.

ئاگاداری یەکەیەکەیانم کرد، دەربارەی پلانەکەم هیچ شتێك نەدرکێنن و بە کەس نەڵێن و دوای ئەوە هەمووان سواری ئەسپەکانمان بووینەوە گەڕاینەوە بۆ شەهری سەبز ئاهەنگ و خۆشیو دەعوات هەفتەیەکی تر درێژەی کێشا. ئیتر دوای ئەوە میوانەکانم یەك یەك لەگەڵ دەستوپێوەندەکانیاندا کۆشکەکەمیان جێهێشت و ڕۆیشتن و بەڕێکردنەکەیان بە شێوەی ڕەسمی بوو. هەریەکەیان بەرەو شار و ناوچەکەی خۆی دەڕۆیشت بۆ ئەوەی ئەگەر هەر جاسووس و چاودێرێکی حسێنیش لەناو قافڵە و دەستوپێوەندەکەی دڵشاددا بێت سەریان لێ تێك بدەن و هەڵیان بخەڵەتێنن. بەڵام ئێمە هەمووانیش لەسەر ئەوە پێکهاتبووین دوای دە ڕۆژی تر لە نزیك دەروازە ئاسنینەکەوە لەگەڵ مندا یەك بگرنەوە.

هەرکە دڵشاد بینی ئەفسەر و جەنگاوەرە دێرینەکانم و شازادەکان لە کۆشکەکەم هاتنە دەرێو ڕۆیشتن و لە دژی حسێن شۆڕشیان نەکرد و ئەوەیان دەرنەخست کە لە حسێن ڕادەپەڕن و دژی ڕادەوەستن بە نائومێدییەکی زۆر و ڤین و تووڕەییەکەوە لێیپرسیم وتی:

-تەیموور، دەتەوێت منیش بڕۆم؟

وەڵامم دایەوە: خۆشەویستەکەم من هەرگیز نامەوێت تۆ بڕۆیت. بەڵام شازادەکان خۆیان نارەزوویان لەوە بوو، بڕۆن و منیش ناتوانم ڕێگایان لێبگرم. خۆ ئەگەر حەزدەکەیت هەندێ شازادەی تر بانگ دەکەم بۆ ئەوەی هاتنەکەی تۆ لای حسێن پاك و جێگای گومان نەبێت.

وتی: بەڵام تۆ لەو باوەڕەدایت حسێن گومان لەم هاتنەم پەیدابکات؟ چونکە من هەر ئەوەندەم پێ وتووە کە من تەنها بۆ بینینی جیهانگیر دەچم. هەروەها ئەگەر منیش زۆر لێرە بمێنمەوە ئەوا..

هەرکە ناوی مێردەکەی هێنا دەموچاوی دا بە یەکدا و وا دیاربوو دڵگران و بە پەژارە بوو.

منیش وەك ئەو وا خۆم نیشاندا، منیش دڵگران و دڵنیا نیم و قسەکەیم پێ بڕی و وتم:

-دڵشاد چۆنت پێ باشە و پێت خۆشە وا بکە!!

وتی: ئێمە نامانەوێت گومان لە پەیوەندیمان پەیدا بکات. هەتا تۆ بە تەواوی خۆت نامادە دەکەیت.

وتم: نۆهـ.. تۆ هیچ کات لەوە مەترسە، چونکە ئێستا ئەو ناتوانێت من بشکێنێت و بەسەرمدا زاڵ ببێت و لەناو بەرێت.

وتی: کەواتە پێویستە ئێستا بڕۆمەوە بۆ لای حسێن و دڵنیای بکەمەوە. بەڵام تۆش پێویستە لە پلانەکەتدا زۆر خێرا بکەیت. ئەگەر دەگونجێت هەر ئێستا دەست پێبکە..!!

وتم: ئەگەر تۆ وات پێباشە، کەواتە هەر ئێستا بڕۆرەوە.

وتی: نۆهـ.. تەیموور من نامەوێت بڕۆمەوە، بەڵکو حەز دەکەم هەر لات بمێنمەوە. بەڵام وا چاکترە من بڕۆم بۆئەوەی ماوە و کاتت هەبێت تاکو پلانەکەت جێبەجێ بکەیت. ئێمە هەردەم و هەموو کاتێکیش هەر لەگەڵ یەکتردایین. من سبەینێ دەگەڕێمەوە.. نا..، نا.. دوو سبەی دەڕۆمەوە، چونکە من حەزدەکەم دوو شەو و دوو ڕۆژی تر لەگەڵ تۆدا ڕابوێرم.

ئیتر بۆ ڕۆژی دوایی فەرمانی دا بە دەست و پێوەند و خزمەتکارەکانی شتومەکی کاروانەکەی ئامادە بکەن و چاوەڕوانی ڕۆیشتن و گەڕانەوە بن. ڕۆژێکی تر لام مایەوە و هەموو کاتێك و

چرکەیەکی ئەو رۆژەمان پێکەوە بردە سەر و چرکەیەکمان بە فیرۆ نەدەدا. لە بەردەم خەڵکیدا وا خۆی نیشان دەدا، شاد و دڵخۆشە. بەڵام ئەو کاتانەی بە تەنها پێکەوە بووین لە جاران برسیتر بوو. هیچ کات قایل نەدەبوو، ئەو کاتانەی بە تەنها پێکەوە بووین هەڵینەگوشم و دەست نەخەمە ناو دەست و سنگ و مەمك و.. یەوە.

هەر بۆی رێکبکەوتایە ئەبوایە دوا دڵۆپی زەوق و ئارەزووم لەگەڵدا ببردایەتە سەر و هیچ چرکەیەکی ئەو هاتنەی بە فیرۆ نەدەدا.

ئەوکاتەی ویستی بڕوات، جیهانگیری نووساند بە سنگییەوە و دەستی کرد بە گریان. ئەوەندە گریا تا چاوەکانی سوورهەڵگەڕا و ڕووی سوور بۆوە و چاوەکانی ئاوسان. من لەوە دڵنیابووم، هیچ کام لە کارەکەرەکانی شکی بۆ ئەوە نەدەچوو کە تەنها بۆ جیهانگیر ناگری..!! هەروەها هیچ گومانیشم نەبوو لەوە کە هیچ یەکێك لە پاسەوانەکانی هەست بکات ئەم گریانەی تەنها بۆ جیهانگیر نییە. هەتا دڵشاد خۆشی هیچ شتێکی لەو پلانەم نەدەزانی کە بۆ سەردار و شازادەکانم ڕەنگ ڕشتبوو.

* * *

## گرتنی شاری کارشی

دوای دوو ڕۆژ گەڕانەوەی دڵشاد هەرچی ماڵ و سامانێکم هەبوو کۆمکردەوە و لەگەڵ دوو سەد کەس لە پیاوەکانمدا بەرەو دەروازە ئاسنینەکە کشام بۆئەوەی لەگەڵ شازادە و هاوپەیمانەکانمدا کۆببینەوە و لەوێدا یەکبگرینەوە. من دەنگوباس و هەواڵم لەناو خەڵکیدا وا بڵاوکردبۆوە، گوایە من بۆ هیرات بۆ سەردانی ماڵی خەزورم و بۆ لای ژنەکەم دەچم. لەبەرئەوەی شەهری سیبز نزیکبوو لە سەمەرقەندەوە بە جۆرێك بوو حسێن بە ئاسانی دەیتوانی بیپارێزێت و لەژێر چاودێری ئەودا بێت. من وام پیشاندا چەند مانگێك لێیان دوور دەکەومەوە.

دڵنیاشم کردن لە هیچ شتێك نەترسێن و نیگەرانیش نەبن. ئیتر دوای ئەوە سەربازەکانم لەسەرخۆ دەستیانکرد بە ڕۆیشتن و لە نزیك گوندەکانەوە بار و بارگەیان هەڵدا و دەیانکرد بە بارەگای خۆیان و سەربەستانە باسی ئەو چوونەیان بۆ هیرات بۆ خەڵکی دەکرد. دەنگوباسی ڕۆیشتن و کۆچکردنمان بۆ هیرات لە هەموو لایەکدا بڵاوبۆوە و ئەم دەنگوباس و ڕۆیشتنەشمان گەیشتە کارشی و دەوروبەریشی. پاشان بە دەروازە ئاسنینەکەدا ڕۆیشتین و بە نزیك کارشیدا

تێپەڕین بێ ئەوەی کەس بەرهەڵستیمان بکات. کاتێك گەیشتینە سەر بیری ئیسحاق کە دەبوو لەوێدا موفا پێمان بگات. ژمارەی پیاوەکانم لە دوو سەد و پەنجا کەس زیاتر تێنەدەپەڕین. بۆئەوەی ژمارەی کاروانەکەم زۆرتر بکەم ڕێم بە پیاوەکانم دا بە هەوەسی خۆیان ماڵ و سامان خەرج بکەن و چۆنیان پێ خۆشە پارە خەرج بکەن بۆئەوەی هانەهانەی ئەو کاروانانە بدەن کە بە ڕێگای خۆراساندا تێدەپەڕن و لە نزیك بیرەکەوە لەگەڵماندا بمێننەوە. دوای ئەوەی سێ چوار کاروانی بازرگانی لە نزیکمانەوە تێپەڕین پاشان چەند ژمارەیەکی کە لە کاروانچییان کاتێك بینیان پیاوەکانم چۆن بە لێشاو پارە خەرج دەکەن لەگەڵماندا مانەوە بۆئەوەی بە هۆی ئەو قازانجە زۆرەوە کە لەو کەنیزەك و عارەقەی پێیان بوو دەستیان بکەوێت.

کاتەکانی ڕۆژ زۆر گەرم و ناخۆشبوو، بە گران کات تێدەپەڕی. بەڵام کاتەکانی شەو ساردو فێنك بوو. ئەو کاتانە زۆر لەبارو خۆش بوو. شەو ئاهەنگی خۆش و ڕابواردن سازبکەین. ئەم ئاهەنگ و ڕابواردنەمان لە سێ هەفتە زیاتری خایاند.

هەرچەند ڕۆژی زیاتر تێدەپەڕی کاروانی زیاتر دەهاتن و ژنی جوان و مەی خواردنەوە و شادی و خۆشی جۆراوجۆری تریان لەگەڵ خۆیاندا دەهانی. ژمارەیەکی زۆر مۆسیقازان هاتن و تیپی تایبەتی گۆرانی و مۆسیقای جۆربەجۆریان سازدەکرد. ئیتر ئاوەها شەوانە وردە وردە فیستیڤاڵی گەورە و هەمەنگی گۆرانی و مۆسیقا ساز دەکرا. کە لە فێستیڤاڵی گەورەی شازادە دەچوو نەك فیستیڤاڵی مێرگێکی بیابانی بچووك. پیاوەکانیشم هەرکاتێك ئەو مەیە خۆشانەیان دەخواردەوە و سەریان گەرم دەبوو باسی ئەو خۆشی و شادییە ئاوازەیەیان دەکرد کە لە هێرات چاوەڕوانی بوون دەستیان بکەوێت. هەتا وای لێهات خەڵکانی خێڵەکانیان بانگەواز دەکرد و داوایان لەو کاروانانە دەکرد، لەگەڵماندا بێن بۆ بارەگای شامالك کاتێك موفا گەیشتە ناو چادرەکانمان بانگەواز و هاتنی کاروان و کاروانچییەکان بۆ ناو چادرەکانمان پشتگوێ خران و گوێیان پێنەدەدان.

شامالکیش کاروانێکی گەورەی نارد بۆ لام و زۆر دیاری نایاب و بەنرخی بۆ من نارد و پێخۆشحاڵی گەرم و گوڕی خۆی دەربڕیبوو بە هاتنی من و هاتنی شازادە و سەردارەکانم بۆ بارەگاکەی خۆی. منیش ئەو دیارییە نایابانەم پیشان پیاوەکانم داو بەخشندەیی خەزوورمم بۆ دەرخستن و هانمدان وەڵامی ئەو سڵاوە گەرم و گوڕ و سۆزەی مامم بدەنەوە کەوا شامالك لە نامەکەیدا دەریبڕیبوو بۆیان.

کاتێك باروبارگە و چادرەکانمان پێچایەوە زۆرێکی زۆر لە میوان و کاروانچییەکان داوایان لێکردم چەند کەسێك لە پاسەوانەکانم لەگەڵ کاروانەکاندا بنێرم و پاسەوانی کاروانەکان بگرن تا دەگەنە کارشی، بەڵام من لەسەر ئەوە سوور بووم، هەرچی پیاو و دەستوپێوەندێکم هەیە گشتیان میوانی شامالکن و نامەوێت و بیر لەوە ناکەمەوە دڵی شامالك لە خۆم برەنجێنم و ژمارەی دەستوپێوەندەکانی خۆم کەم بکەمەوە. ئیتر دوای ئەوە بە جموجووڵێك و دەنگەدەنگێکی زۆر و تەپوتۆزێکی زۆر گەوردەوە هێزەکەم بەسەر ڕێگای خۆراساندا کەوتەڕێ. بەردەوام هەتا شەو هات و تاریکایی داهات بەرەو هێرات ڕۆیشتین. لە جیاتی ئەوەی بارەگامان لە نزیك شەقامەکەوە دابنێین، ئێمە چەند میلێك چووینە ناو بیابانەکەوە و لە جێگایەکدا کە لە شەقامەکەوە نەدەبینراین باروبارگەمان و سەربازگەمان دانا و چادرەکانمان تێیدا هەڵدا و ماوەی هەفتەیەکی تر چاوەڕوانمان کرد، تاکو ماوە بدەین بەو کاروانانە بۆئەوەی بگەنە کارشی و موسا. دڵنیا بێت لەوەی من بە ڕاستی بۆ هێرات ڕۆیشتووم بۆئەوەی ژن و منداڵەکانم ببینم. چونکە پیاو و سەربازەکانم ئاگاداری پلانەکەم نەبوون. بەوە قایل و دڵخۆش نەبوون کە لەوێدا مابووینەوە، وەك لەو قایل و دڵخۆشبوونەی لە نزیك بیری ئیسحاقەوە هەیانبوو. لە ڕاستیدا هیچ کاروان و ژنێکیش نەبوو، ئەو مەیی و عارەقەی هەشمانبوو تەنها بەشی چوار ڕۆژی کرد. هەرکە کاریگەری مەی لە مێشك و دەروونی پیاوەکانمدا نەما بێزار بوون و بەبێ ئارامییەوە پرسیاری چوونەکەی هێراتیان لێدەکردم. هەرکە سەرنجیاندا و هەستیانکرد عەبدوڵڵا دیارنەماوە. کەوتنە شك و گومانەوە، حەزیان نەدەکرد و مەیلیان نەبوو لەو تاریکاییەی بیابانەدا بمێننەوە. پاشان بە یارمەتی ئەو شازادانەی ئاگاداری پلانەکەم بوون، بانگەوازی پیاوەکانم و دەوروبەرەکەی خۆمم کرد. و بۆم ڕوونکردنەوە کە ئێمە نیازمان وایە بچین شاری کارشی داگیربکەین. سەرەتا سەرسووڕمان و شك و گومانێکی زۆریان هەبوو. بەڵام کاتێك پێمڕاگەیاندن عەبدوڵڵا بۆ کارشی لەگەڵ هەندێ کارواندا بە جاسووسی ڕۆیشتووە بۆئەوەی هەندێ دەنگوباس و زانیاریم بۆ بێنێتەوە. ڕوویان گەشایەوە و بڕوایان پەیداکرد. چونکە دەیانزانی من باوەڕی تەواوم بە عەبدوڵڵا هەیە. گەرچی عەبدوڵڵا لە نۆکەرێك زیاتریش نەبوو بۆ من. کاتێك فەرمانم دا چادرەکانیان بپێچنەوە خوێن لە دەمارەکانیاندا قوڵپی دا و ڕاپەڕین بە ڕێکوپێکی و بێدەنگ بەرەو کارشی کەوتینە ڕێ. بۆئەوەی پێش ئەوەی هێرش بکەینە سەر کارشی دەنگوباسی چوونی ئێمەیان پێنەگات. پاش ماوەیەکی کەم گەیشتینە سەر بیرێکی بچووك گەرچی ئەو بیرە لە کارشییەوە لە چەند میلێك زیاتر دوور نەبوو. بەڵام بیرەکە چەپە بوو. ئەو گرد و تەپۆڵکانەی

لە دەوری بوون و بە گیا و دار و دەوەنی جۆراوجۆر شارابۆوە و داپۆشرابوو. لە نزیک بیرەکەوە لە ڕۆژدا خۆمان دەشاردەوە و گوریس و داو و پەیژەمان دروست دەکرد بۆئەوەی بە دیوار و شووراکانی شارەکەدا پێی هەڵبگەڕێین. چەند کەسێکم نارد بۆئەوەی هەواڵ بزانن. هەموویان دەنگوباسیان بۆ هێنامەوە گوایە بە ڕاستی موسا بە فرسەتی زانیوە بۆئەوەی لە شار بێتە دەرەوەو لەو کەش و هەوا فێنکەدا چادری هاوینەی لەو دەشتەی وا لەبەردەم شارەکەیدا هەڵداوە.

لە پیاوە هەواڵ قۆزەکانم بیست و لە دەنگوباسەکانیاندا وا دەردەکەوت هەرچی هێزی موسا هەیە جگە لە تیپێکی بچووک زیاتر هەموویان لە دەوری شووراکاندا سەربازگەیان بەستووە. ئەم دەنگوباس و هەواڵانەش لە لایەن دەست و پێوەندەکانی موساوە کە بە ڕۆژ دەهاتنە سەر بیرەکە، ئەو دەنگوباس و هەواڵانەیان دەسەلماند. ئێمەش بێگومان هەرچی کەسێك بۆ ئاو بهاتایە سەر بیرەکە دەمانگرت. هێشتا ئێوارە نەهاتبوو، ئێمە نزیکەی دە کەسمان بە دیل گرت. لە کاتی ڕۆژئاوادا عەبدوڵڵا هاتە سەر بیرەکە و دوو جەوەنەی گەورەی لەسەر پشتی گوێدرێژێکی بچووک دانابوو بۆئەوەی پڕی بکات لە ئاو. هەروەك ئامـاژەم بۆ پیاوەکانم کرد وا خۆیان پیشاندا گوایە نایناسن و گرتیان و بۆ لای منیان هێنا. بە تەنها قسەم لەگەڵدا کرد و لێم پرسی وتم:

عەبدوڵڵا کاروبار چۆنە..؟

وتی: شازادەی بەڕێزم باشترین و چاکترین هەلت بۆ ڕەخساوە.

وتم: عەبدوڵڵا چۆن.؟

وتی: شازادەی گەورەم ئەمەش لەسەر ئەوە وەستاوە.. کە..

قسەکەم پێ بڕی و وتم: لەسەرچی.. عەبدوڵڵا..؟ بڵێ عەبدوڵڵا بڵێ لەسەرچی..؟

شتێك لە مێشکتدایە، هاوڕێ و برادەرە دز و پیاوکوژەکانت چییان دەوێت..؟

وتی: شازادەی گەورەم، هاوڕێ و برادەرەکانم ئاڵتوونیان دەوێت.

وتم: ئاڵتوون..!! عەبدوڵڵا ئاڵتوونیان چەند دەوێت؟

وتی: تەنها ئەوەندەیان دەوێت، پێی بڕۆن بۆ شارێکی دوور و لەوێدا سەربەست بن و پێی ببن بە گەورە و سەروەر.

وتم: سەربەست بن و ببن بە گەورە و سەروەر..!! ئەوانە بۆ هەرکوێیەك بڕۆن هەر دز و جەردەن، باشە ژمارەیان چەندە..؟

وتی: شازادەی گەورەم نزیکەی پەنجا پیاوێك دەبن.

وتم: باشە.., لە ماڵ و سامانەکەی موسا چی ئاڵتوونیان دەوێت دەیاندەمێ..!!

وتی: هەندێکیشیان ژنیشیان دەوێت..!!

وتم: بێگومان کاتێك ڕاو و ڕووت و تالانی دەستپێدەکات هەر ژنێك ئەوانی ویست دەتوانن لەگەڵ خۆیاندا بیانبەن.

وتی: شازادەی گەورەم، بەڵام ئەمانە ئەو ژنانەیان دەوێت کە لە خێزانی شازادەکانن..!!

وتم: باشە تۆ ڤایلت نەکردوون کە لە بری تەیمووری شازادەی شەهری سیبز لەگەڵیاندا قسەدەکەیت؟

وتی: ئۆهـ.. نەخێر.. شازادەی گەورەم!! ئەوان لەگەڵ لینغ کۆبیغیدا پەیمان دەبەستن. ئەوان ئەو دەرد و بەڵایەیان لە بیرە کە تووشی ئەسپی مەغۆلەکان بوو. چۆنیش سوودیان لەو کارە بینی..!!

وتم: باشە.. لینغ کۆبیغی چۆن دەتوانێت دەستی بگاتە ژنی شازادەکان..؟ هەرچۆنێك بێت ڕەنگە هەرچی ژنی شازادەکان بێت لەناو ئەو چادرانەدا بن کە لە دەشتەکەدا هەڵدراون.

وتی: نەخێر، شازادەی گەورەم، هەر شازادەیەك تەنها دوو ژن یان سێ ژنی لەگەڵ خۆیدا بردووە. بۆئەوەی خۆی بتوانێت لە پیاوەکانی خۆی بیانپارێزێت.

وتم: کەواتە شازادەکان هەڵسوکەوتیان وەك لەشکرێکی داگیرکەر وایە.. عەبدوڵڵا وا نییە..؟

وەڵامی دامەوە: بەڵێ گەورەم شازادەکان بڕوایان بە پیاوانی ناو چادرەکانیان نییە. لەناو ماڵەکانیاندا زۆربەی زۆری ژنەکانیان کراونەتە ژوورەوە و دەرگایان لەسەر داخستوون و لەژێر چاودێری پاسەوانەکانیاندان. بەڵام تەنها لینغ کۆبیغی دەتوانێت هەرچی دەرگا هەیە بیشکێنێت و هەرچی پاسەوانیش هەیە لەناویان بەرێت. عەبدوڵڵا کاتێك یادی ئەو دزی و جەردەیانەمی کردەوە کە لە سەمەرقەندا دەمانکرد، زەردەخەنەیەکی پڕمانای کرد.

پاشان وتم: تێگەیشتم.. کە لینغ کۆبیغی دەتوانێت کاری سەیر و سەرسووڕمێن و سەمەرەش لەبەرچاوی تەیمووردا بکات. وا نییە.. عەبدوڵڵا..؟

وتی: بەڵێ وایە شازادەی گەورەم.

وتم: زۆرچاکە، بێگومان تۆ ڕێکات بۆ وەرگرتنی پاداشیان داناوە.. وا نییە..؟

وتی: بەڵێ گەورەم، ئەو ڕێگایەم بۆ داناون.

وتم: کەواتە دەی عەبدوڵڵا دەستبەکار بە و بڕۆ بۆ کارەکەت و لە نیوە شەودا لای سەرچاوەی ناوەکەوە بە یەك دەگەینەوە.

پاش ئـەوە لـە چادرەکـەم هاتمـە دەرەوە و هـەرچی شـازادە و سـەرکردەیەکم هـەبوو کـۆم کردنەوە و پلانی هێرشکردنم بۆ سەر کارشی بۆ ڕوون کردنەوە. ئەوانیش هەریەکەیان لـە لایـەن خۆیەوە ئەو زانیارییەی بە پیاوەکانی ڕاگەیاند.

پاش چەند کاتژمێرێك کە تاریکایی باڵی کێشا بەسەردا هەرچی پیاو هەبوو لەگـەڵمدا بـەرەو شار کشاین، جگە لە بیست پیاو نەبێت، مانـەوە بۆئـەوەی پاسـەوانی و ئاگاداری چادرەکان بکەن. زۆر بە هێواشی و لەسەرخۆ و بە وریاییەوە گرد و دۆڵەکانمان بڕی تاکو گەیشتینە ئـەو شوێنەی شاخ و گردۆڵکەکان نووسابوون بە سنوور و شووراى شارەکەوە. ئیتر خێرا هەندێ سەربازی ئـازا و بەجەرگم نارد بۆ ئەوەی ئـەو پاسـەوانانە بکوژن کە لەسـەر ئـەو ڕێگا و بانانـەدا ڕاوەسـتابوون و ئێشکیان دەگرت کە دەچووە ناو شارەوە. ئێمـە بـە هۆی ڕووناکی مانگەشـەوەکەوە سێبەری ئـەو پیاوانەمان دەبینی کە دەجوولێن و دێن و دەچن.

پاش یەك کاتژمێر هەرچی سەربازە ئازا و نەترسـەکانم کە نـاردبووم گەڕانـەوە و پێیـان وتم تەنها چوار پاسەوان هەبوو، ئەو چوارەش بێدەنگ و بێ چرپە و بێ ئەوەی هیـچ جۆرە جووڵە و پەلەقاژێیەك بکەن کە سەرنـج ڕابکێشن بـە ئاسـانی کوشـتمانن. پێـش چـەند چرکەیـەك لـە نیوە شەودا جاکۆم لەگەڵ خۆمدا برد "کە تا ئەم کاتەش گومانی لە سەرکەوتنی پلانەکـەمدا هـەبوو". پـەنجا هـەنگاو بـەرەو ئـەو شـوێنە ڕۆیشتین کـە سـەرچاوەی ئاوەکـە لـە شـاخەکەوە دێـت و لـەو خەندەقەوە کە بە دەوری شارەکەدا کرابوو دەچێتە نـاو شـارەکەوە. پاشـان ئەسـپەکانمان بـە چڵـی دارەکانـەوە بەسـتەوە و دانیشتین چاوەڕوانمان کرد. لـەو چـۆڵ و بێدەنگییـەدا گوێمـان شل کـرد و هەناسەمان لە خۆمان بڕی. پاشـان بـە لایـەکی چۆڵدا ڕۆیشتین و گەیشـتینە خەندەقەکە لەژێر تاریکایی سـەرچاوەکەدا خۆمـان شـاردەوە. ئـەو کاتـەی چاوەڕوانمـان دەکـرد و خۆمـان شـاردەوە. گوێمان لە هەندێ دەنگ و دەنگی پێی هاتوچۆکەران بوو. لەو دیـوی شووراکەوە، لـە زۆر جێگا و شوێنی شارەکەوە گوێمان لە دەنگی وەڕینی سەگ بوو. لەو تاریکایی و بێدەنگی شەودا بـە چاکی دەمانتوانی شوێن و ڕێگای ئەو دەنگانە دەستنیشان بکـەین. لـە ناوەڕاسـتی کارشیـدا تـەنها دەنگی کەڵەشێرێك لـە نزیـك قەڵاکـەی موساوە دەهات. ناوبـەناو بـاڕەی بزنێکی بـەرەڵا بـە ڕێکوپێکـی دەهات. بەڵام بە هیچ جۆرێك گوێمان لە دەنگی هیچ مرۆڤێك نەبوو. هـەروەها بـە هیـچ جۆرێـك دەنگی هیچ چەك و قەڵغانێکیش لەسەر قـەڵا و قولـە و لـە سـەنگەرەکانەوە نـەدەهات. جاکۆ لـەم کاتەدا غـیرەتی پـەیداکرد و ئـازایی و نەترسی بـە دڵ و دەمارەکانیدا هـاتوچۆی کـرد. بـە گوێیـدا چرپاندم و وتی:

-ئەگەر ئەمە بۆسە نەبێت بۆمان ئرابێتەوە..؟

وتم: جاکۆ ئەگەر عەبدوڵلا درۆنەکات، ئەمە هیچ بۆسەیەك نییە.. بەڵام کاتێك عەبدوڵلا ڕێنماییمان دەکات بۆ ناو شارەکە ئەوکاتە تێدەگەم بۆسە بێت یان نا..

وتی: تەیموور چۆن ئەوە دەزانیت..؟

وتم: من دەزانم.

خشەخشێکی هێواش گفتوگۆکەمانی بڕی، کە لە دیواری شووراکەوە بە هێواشی بەرەو سەرچاوەکە دەهات. من و جاکۆش زۆر وریانە خۆمان ئامادە کرد و چاوەڕوانمان کرد. پاشان خشەخشێکی هێواش هات و یەکێك خۆی شۆڕکردەوە و چەند هەنگاوێك دوور لە ئێمەوە تەپەی هات و کەوتە سەر زەوییەکە. بە هێواشی خەنجەرەکەم لە کێلانەکەی دەرهێنا و هەناسەم لە خۆم بڕی. جاکۆش کە لە نێوان من و ئەو پیاوەدا بوو دەستی تۆپەڵ کرد و فوچاندی و هەناسەی لە خۆی بڕی. لەو تاریکاییەدا هیچمان نەبینی، بەڵام گوێمان لە خشەخشی جلەکانی بوو، لە تەنیشت دیواری سەرچاوەکەوە بەسەر بەردەکاندا دەڕۆیشت. خشەخشەکە وردە وردە دەنگەکەی زیادی کرد و وردە وردە لێمان نزیك دەبۆوە. کتوپڕ جاکۆ هەڵمەتی بردە سەر پیاوەکەو ڕایکێشایە لای خۆی و بە گورجی بە دەمدا خستی بە زەویدا. منیش کتوپڕ خێرا هەڵمەتم بردە سەر سەری و خەنجەرەکەم لە ملی توند کرد و چرپاندم بە گوێیدا و پێم وت: تۆ عەبدوڵلایت؟

پیاوەکە بە دەنگێکی نووساوەوە وتی: بەڵێ شازادەی گەورەم من عەبدوڵلام. ئیتر من و جاکۆ هەڵمان گێڕایە سەر پشت و لە تاریکییەکەدا هێنامانە بەر مانگە شەوەکە. لەبەر تیشکی مانگە شەوەکەدا دەموچاوی عەبدوڵلام بینی و ناسیمەوە کە عەبدوڵلای نۆکەرمە.

پاشان ڕوومکردە جاکۆ و پێم وت: زۆرباشە جاکۆ وازی لێبێنە با هەستێت.

تەماشای دەموچاوی عەبدوڵلام کرد و بە دڵەخورپەوە لێم پرسی:

-عەبدوڵلا کاروباری هەموو شتێك چۆنە..؟

وەڵامی دامەوە: هەموو کاروبارێك ئامادە کراوە، یاڵا دوام کەون. هەرسێکمان پێکەوە ڕاوەستاین و بە تەنیشت ئەستێرکی سەرچاوەکەدا بەرەو دیواری شووراکە کەوتینەڕێ. ئینجا جاکۆ و عەبدوڵلا منیان بەرزکردەوە و چوومە سەر تەوقەسەری ئەستێرکی سەرچاوەکە و لەسەرەوە یەکە یەکە دەستم گرتن و بۆ لای خۆم هەڵمکێشان. هەر خێرا خۆمان خستە ناو ئاوی ئەستێرکەکەوە و لە خەندەقەکە پەڕینەوە. لە کونێکەوە کە لەژێر بناغەی دیوارەکە بوو بە

سنگەخشکێ لە کونەکەوە چووینە ئەودیوی شووورای شارەکەوە. خۆشبەختانە ئەو پاسەوانەی لە نزیك کونی ئاوی سەرچاوەکەوە کە دەبوو راوەستێ خەوی لێکەوتبوو ئێمەش بە هێواشی و بێ چرپە بەرەو پێشەوە چووین و بێ ئەوەی پاسەوانەکە هەستمان پێبکات، جاکۆ پەلاماریدا و سەری بڕی و ملی لێکردەوە، هەر گوێشمان لە دەنگ و هەناسەش نەبوو. منیش گورج بەرەو پێشەوە ڕۆیشتم، گەیشتمە پاسەوانی دووەم و پێش ئەوەی جاکۆ بیگاتێ، دەستم خستە سەر دەمی و لە خەو خەبەرم کردەوە. بەڵام ئەوەندە هیلاك و شەکەت بوو چاوی نەکردەوە، منیش بە هێواشی سەرم بڕی و کوشتم. ئاوڕم لە عەبدوڵڵا دایەوە و بە هێواشی و بە چرپەوە هەتا جاکۆش گوێی لێنەبوو پێم وت:

-عەبدوڵڵا ئایا هەموو پاسەوانەکان نووستوون؟

وەڵامی دامەوە: بەڵێ گەورەم، گشتیان نووستوون، و هیلاك و ماندوو مردوون و پەلوپۆیان لێبڕاوە. چەند سەعاتێك دەبێت نووستوون. چونکە من دەرمانی خەولێکەوتنم بۆ کردوونەتە ناو ئاوەوە.

وتم: زۆرباشە، هیچ کونێکت لە دیوارەکەدا نەدۆزیوەتەوە؟

وتی: بەڵێ، شازادەی گەورەم، وا لەم لایەوە. ئیتر عەبدوڵڵا دووبارە پێشمان کەوتەوە و بە درێژی نیوەی دیوارەکە ڕۆیشتین و چەند سەربازێکی پاسەوانمان تووش هات و جاکۆش بە شانازی و نەترسییەوە یەك لەدوای یەك دەیکوشتن بێ ئەوەی بزانێت هۆی نووستنی ئەم پاسەوانانە چییە؟ ئاخری گەیشتینە درزێك و کونێك لە دیوارەکەدا. هەرکە گەیشتینە ئەو کونە عەبدوڵڵا وتی: ئەم کونە دوو کەس دەتوانێت پیایدا بڕوات. وەڵامم دایەوە وتم: ئەم کونە دەمەکەی گەورەو چاکە، بەڵام چۆن لە خەندەقەکە بپەڕینەوە. لە تاریکاییەکەدا سەری دارێکی گەورە و درێژی بەرزکردەوە و بە چرپە وتی:

-ئا لێرەوە بەسەر ئەم دارەدا دەڕۆین و دەچینە ئەو بەرەوە و دەچینە ناو شارەوە.

جاکۆ بە خۆشییەوە وتی: وا دیارە بەختی باشمان هەیە، ئەم شتانە دەڵێیت چاوەڕوانی ئێمە بوون یان دەڵێیت بە تایبەتی بۆ ئێمە ئامادە کراون.

وتم: جاکۆ ڕەنگە وابێت. بەڵام دەتەوێت ئێستا ئەم دارە تاقی بکەیتەوە؟

وتی: بەڵێ.. تەیموور.. بەڵێ تەیموور..

وتم: چاکە، ئەم دارە بەسەر خەندەقەکەدا ڕادەکێشین بۆ ئەوبەر، وەك پرد بەسەریدا دەپەڕینەوە. ئێستا تۆ بە خەندەقەکەدا بڕۆرە ئەوبەرو سەری دارەکە بگرەو لەسەر دەمی کونەکە دایبنێ.

وتی: زۆرچاکە، دەی با دەست پێبکەین.

جاکۆ بە خەندەقەکەدا ڕۆیشتە ئەوبەر و گەیشتە کونی دیواری شووراکە و پیایدا هەڵگەڕا و لە دەمی کونەکەدا ڕاوەستا و سەری دارەکەی لەسەر کونەکە دانا و سەرەکەی تری بۆ ئێمە درێژ کردەوە و دایە دەست من و عەبدوڵڵا و ئێمەش لەسەر لێواری خەندەقەکە دامانناو وەك پردێکی چاکی لێهات.

ئیتر جاکۆ لە تاریکاییەکەدا لەبەرچاومان ون بوو. من و عەبدوڵڵاش بەسەر پردەکەدا چووینە ئەودیوی شووراکە و چووینە ناو شارەکەوە، بۆئەوەی دەرگای سەرشەقامەکە بکەینەوە. تۆزێك لەمبەر و ئەوبەری شەقامەکە ڕاوەستاین و هەستمان ڕاگرت و تەماشای ئەملاو ئەولامان کرد لە عەبدوڵڵام پرسی وتم:

عەبدوڵڵا کارەکەم چۆن نەخشە بۆ کێشابوویت.. جێبەجێت کردووە.. وا نییە.. عەبدوڵڵا سەری ڕاوەشاند و بە شانازییەوە پێکەنی و وەڵامی دامەوە وتی: بەڵێ شازادەی گەورەم، چۆن فەرمانت پێکردووم وەها جێبەجێم کردووە.

لەوبەری خەندەقەکەوە گوێم لە دەنگی پێی زەلامێك بوو. تیرێکم خستە ناو کەوانەکەوە و لە کونەکەوە تەماشای ئەوبەری خەندەقەکەم کرد. بە وردی سەرنجی ئەو پیاوەم دەدا کە لەوبەری دارەکەوە کە کردبوومان بە پرد، وردە وردە بەرەو پیرمان دەهات. کە نزیك بۆوە لێمان ناسیمەوە. جاکۆ بوو. منیش ڕێگام پێدا بەسەر داری سەرخەندەقەکەدا بپەڕێتەوە و بێتە ناو شارەکەوە. تیپەکەشم کە ژمارەیان لە دوو سەد کەس زیاتر بوون، یەکەیەکە بە کونەکەدا هاتنە ناو شارەکەوە. زۆربەی زۆری پیاوەکانم لەمەوپێش شارەزای شاری کارشی بوون. ئیتر گورج فەرمانێکی کورتم دا بە پیاوەکانم و هەموویانم بەسەر سەنگەر و شوورای شارەکەدا بڵاوکردەوە، بۆئەوەی هەرچی پاسەوانی موسا هەیە بیانکوژن و لەناویان بەرن. پاش ماوەی سێ سەعات و دوای بەرهەڵستییەکی زۆر کەم پیاوەکانم لە نووشستی دوژمنان سەریان سوڕمابوو، گەڕانەوە بۆ لام و هەموویان کۆبوونەوە بۆئەوەی هێرش بکەنە سەر قەڵاکەی موسا کە کوڕەکەی و هەندێ پاسەوانی ناسایی پاسەوانیان دەگرت. ئەمانەش هیچ ئەهمییەتێکی گرنگیان نەبوو. گەرچی فێڵ و پیلان و دەرمانی عەبدوڵڵا نەگەیشتبووە پاسەوانەکانی قەڵاکە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ

بەرهەڵستییەکی توند و بەهێزمان لە هێرشەکەماندا بۆ سەر قەڵاکە نەبینی. دەتوت ئەوانیش دەرمانی بێهۆشی خەویان خواردبوو. سەربازە جەنگاوەرە دلێرەکانم بێ ئەوەی پاسەوانەکانی دەرەوە دەنگیان لێ بەرزبێتەوە بە ئاسانی لەناویان بردن.

پاش بەرهەڵستییەکی زۆر کەم لە لایەن پاسەوانەکانی ناوەوە هەرچی لە کۆشك و قەڵاکەدا بوو لە خەو خەبەریان بۆوە و ئەفسەرەکانی و دوژمنیش هیچ بەرهەڵستییەکی وایان نەکرد کە شایانی باسکردن بێت. هەتا کورەکەی موسا خۆشی لە دواییدا لە بارەگاکەی هاتە دەرەوە و خۆی و شیرەکەی دا بە دەستمانەوە. هەرکە قەڵا و قوولە و شووراکانمان داگیر کرد هەندێك پیاوم نارد بۆئەوەی جووتیار و هەژارەکان لە خەوهەڵسێنن و پێش ئەوەی ڕۆژ هەڵبێت کۆیان بکەنەوە. هەروەها داوام لە هەندێ جەنگاوەران کرد، چەك لە گەنجینە و جبەخانەکانی موسا بێننە دەرێ. ئەو کەل و پەلی جەنگانەم لە پانتاییەکەدا دانا. بینیم ئەو چەك و پێویستیانە بەشی هەزار کەس دەکات بیاندەمێ. هەرکە ئەو ژمارەیە کۆبۆوە ئیتر دەستمکرد بە دابەشکردنی کڵاو و زرێ و شیر و تیر و ڕم و ناردمنە سەر سەنگەرەکان بۆئەوەی لەوێدا پارێزگاری لێبکەن و منیش لەوە دڵنیا بووم کە پیاوەکانی موسا لە دەشتەکەدا بە هیچ جۆرێك ناوەرۆکی فێڵەکەی منیان نەزانی و هیچیش تێنەگەیشتن لێی.

ئیتر ئاوەها هیچ نیو سەعات زیاتری نەمابوو بۆ ڕۆژهەڵاتن من هەزار پیاوی پڕچەك و ئامادەم بۆ شەڕ و پێکدادان بەسەر سەنگەر و شووراکاندا بڵاوکردەوە.

هەروەها تیرهاوێژ و تیرهاوێژە دوورەکانم لە جێگایەکدا دانا کە لەو جێگایەوە دەیانتوانی فەرمان بدەن بە گشت پیاوانی ناو سەنگەرەکان و پارێزگاری لێبکەن و بتوانن ئەو ڕێگایانەی کە دەچن بۆ قوولە و قەڵاکان بیانپارێزن و خۆیانی تێدا حەشار بدەن. هەرکە بە تەواوی ڕۆژهەڵات. چوومە سەر بەرزترین قوولە و سەنگەری شارەکە و فەرمانم دا بە شەیپوور ژەنەکان، فوو بە شەیپوورەکانیاندا بکەن و داوا لە خەڵکی بکەن لە خەو هەستن و بە خێرایی خۆیان ئامادە بکەن. کاتێك گوێیان لە دەنگی ئەم مۆسیقا و شەیپوورانەم بوو. ترس و لەرز و سەرلێشێوان لەناو شار و چادرەکاندا ڕوویدا. خەڵکانی شار بە جارێ ڕژانە ناو شەقام و بازاڕەکانەوە و کۆمەڵیان تیادا بەست و خەڵکێکی زۆریش چوونە سەر سەربانەکان و تەماشایان دەکرد تاکو بزانن چی ڕوویداوە. زیاتر خەڵکیش لەوە سەرسام بوون کاتێك بینیان دراوسێکانیان پڕ چەك و چەك بە دەستن و لەناو سەنگەرەکاندا ڕاوەستاون و ئامادەی شەڕ و کوشتارن. ئەو لەشکرەش کە لەناو چادرەکاندا لە دەشتەکەدا سەربازگەیان هەڵدابوو. دەستیانکرد بە ڕاکردن و لە دوورییەکی

دوور لە شووورای شارەوە ڕاوەستان و بە سەرسووڕمان و حەپەساوییەوە تەماشای داگیرکەرانیان دەکرد کە لەسەر شوورا و قوولەکانی شارەکەوە ڕاوەستابوون. بەلاّم لەگەڵ ئەمەشدا موسا خۆڕاگری و لەسەرخۆییەکی بێ وێنەی پیشاندا. دوای ئەوەی فوو بە شەیپوورەکاندا کراو نیشانەی لە خەوهەڵسان و کۆبوونەوە ڕاگەیاندرا. دوای نیو سەعات موسام بینی سواری ئەسپەکەی بوو، لەگەڵ پاسەوانە تایبەتییەکەیدا و هەڵگری ئاڵاکەیدا بەرەو شار ملینا. پاشان لە میانەیەکی دیاریکراودا ڕاوەستاو ئاڵای ڕێکەوتن و ئاشتی بەرزکردەوە. بەلاّم من بەرامبەر ئەو ڕێکەوتن و ئاشتییەی هیچ ئیشارەتێکم نەدایە و وەلاّمم نەدایەوە. کاتێك موسا بەرەو دەروازەی شارەکە کشا و هاتە پێشەوە، من فەرمان دا بە تیرهاوێژ و تیرهاوێژە دوورەکان خۆی و ئەوانەی لەگەڵیشیدان تیربارانیان بکەن. لە ڕاستیدا من نەمدەویست و حەزم بەوە نەدەکرد بزانێت من چەند خەڵك و سەربازێکی کەمم لەناو شاردا لەگەڵدایە.

لەگەڵ ئەوەی ژمارەیەکی زۆر کەمی پاسەوانەکانی موسا بەر تیرەکانی ئێمە کەوتن. دەست و پێوەندەکەی گەڕانەوە دواوە و لە شوێنێکدا تیرەکانی ئێمە نەیاندەگەیشتێ ڕاوەستان. موسا تەتەرێکی خۆی ناردە ناو چادرەکانییەوە، پاش چەند چرکەیەك ئەو تەتەرە گەڕایەوە و شەیپوورێکی بە دەستەوە بوو.

موسا شەیپوورەکەی لە دەست وەرگرت و بە شەیپوورەکەی هاواری کرد و وتی:

-من موسام، شازادەی کارشیم و خزمەتکار و فەرمانبەری حسێنی شاهێنشام. داواکارم لە داگیرکەری شارەکەم وتووێژم لەگەڵدا بکات!!

منیش دەمی شەیپوورەکەم تێکرد و وەلاّمم دایەوە وتم:

-من تەیموورم شازادەی شەهری سیبز و کارشیم و خزمەتکار و فەرمانبەری حسێنی جوامێرم. لەبەر ئەوەی شازادەی لەمەوپێشی کارشی توانای پاراستنی شارەکەی نەبووە و نیەتی. من سەرپەرشتی و کاروباری شارەکە دەگرمە دەست. بەوەفایی بۆ شاهێنشاه و گوێڕایەڵی بوونم بۆی، بە سەرمدا دەچەسپێنێت، شارەکانی لە دوژمنان و بێهێزی شازادەکانی بپارێزم. موسا بە سەرسامی و حەپەساوییەوە هاواری کرد.

-ئەمە تۆی تەیموور!!؟ برادەری باش و خۆشەویستم بەخێرهاتنت دەکەم بۆ شاری کارشی من وا دێمە ناو شارەکەوە بۆئەوەی سلاّوت لێبکەم و پێشوازیت بکەم. هەستمکرد ئەم سەرسامی و حەپەساوییەی شتێکی دەستکرد و درۆیە چونکە بێگومان ئەو دەنگی مۆسیقا و شەیپوورەکانی

منی باش دەناسی. چونکە کاتێك لەژێر فەرمانڕەوایی منـدا بـوو، زۆر زۆری گـوێ لێبـووە. لەبەرئەوە وەڵامم دایەوە وتم:

-ئەی ناپاکی بێهێز، ئەگەر دەتەوێت بێیتە ئەم شارەوە پێویستە وەك دیلێکی من بێیتە شارەوە و بە شێوەی فەرمانڕەوایەکی بێ توانا و هیچ لەبارا نەبوو، کاروبار پشتگوێخەریت ببەم بۆ لای حسێن خۆ ئەگەر واشت پێخۆش نیە، ئەوا خۆت دەتوانیت بچیت بۆ سەمەرقەند و خۆت تەسلیم بە حسێن بکەیت. خۆ ئەگەر هەروەها تا سبەینێ لەو دەشتەدا هەروا مایتەوە، ئەوا منیش بۆت دێمە دەرێ و خۆت و لەشکرەکەت تەفروتوونا دەکەم و بە شمشێر دەکەومە ناو ماڵو خێزانت و تێکوپێکتان دەدەم و لەناوتان دەبەم. ئیتر شەیپوورەکەم دانا و لە سەنگەرەکە هاتمە خوارەوە. موساش لە شەیپوورەکەی خۆیەوە قسەی دەکرد بێئەوەی کەس گوێی پێ بدا بەرەو دەروازەی شارەکە هاتە پێشەوە. ژمارەیەکی زۆر تیر و ڕم و تیری گەورە و دوور هاوێژی بە سەردا باری و بە هێواشی بۆ دواوە گەڕایەوە. منیش هیچ گوێم بە قسە و کردەوەکانی نەدا.. ئیتر پاش ماوەیەکی کەم چار ناچار بۆ ناو چادرەکەی خۆی گەڕایەوە.

جەنگاوەرە چەك بە دەستەکانم بە درێژایی ئەو ڕۆژە لەناو سەنگەر و سەر شووراکان و قوولەکانیدا مانەوە. ئینجا نیوەی پیاوەکانم لە دەرگای شووراکانەوە ناردە دەرێ بۆئەوەی لەسەر شاخ و گردۆڵکە نزیکەکانەوە ئاگربکەنەوە و لە دەشتەکانەوە دیاربن. پاشان هەر لە بەیانیدا پیاوەکانم چادرەکانیان پێچایەوە و دیلەکان و چەکەکانیان بۆ ناو شار هێنا. منیش ژمارەیەکی پێویست لەو زێڕانەی لە سنووقەکانی موسادا دەستم بەسەردا گرتبوو ژمارد بۆئەوەی بیدەم بەو کۆیلە و نۆکەرانەی لەمەوپێش هاوکارییان لەگەڵدا کردبووین و دەرمانی بێهۆشییان دابوو بە پاسەوانەکانی کارشی هەروەها چەند هەڵمەتێکیشم بردە سەر ماڵی ئەو شازادانەی لە کارشیدان بۆئەوەی چەند ژن و کچی جوان دەستگیر بکەم و بیدەم بە برادەرەکانی عەبدوڵلا و پەیمانەکەی خۆم بەجێ بهێنم. عەبدوڵلاش ئەو پاداش و مەدالیانەی وەرگرت و بردی بەسەر برادەرەکانیدا دابەشی بکات. هەر کە لە دابەشکردنی گەڕایەوە وتی، بە ناوی لینغ کۆبیغییەوە دابەشم کردووە کاتێك لە کاتی نیوەڕۆدا گەڕامەوە سەر شوورا و لە قوولەکەی خۆمەوە تەماشای شاخ و گردەکانی دەوروبەرم کرد. بۆئەوەی ئەو ئاگرانە ببینم کە لەسەر ئەو شاخ و گردانە کراونەتەوە. گڕ و کڵپە و دووکەڵێکی باش لە دارستانەکانەوە بەرزبۆوە. پیاو وایدەزانی نزیکەی دوو سێ هەزار کەس لەناو ئەو نزار و دارستانی داربەڕوو و مازووەدا مۆڵگەیان بەستووە.

بە رێکەوت پیاوە جەنگاوەرەکانم لە لایەکی شاخەکەوە دەنگی شەیپووریان بەرزکردەوە و لە دۆڵ و دەربەندە تەسکەکانەوە خۆڵ و تۆز بەرزبۆوە و جەنگاوەرە نەبەزەکانی منیش کۆمەڵ کۆمەڵی بچووك سواری ئەسپەکانیان بوون و ئاوەزەنگیان لێدا و بەرەو دەنگەکە چوون. پاڵە و جووتیارەکانی موساش کە لەسەر سەربان و شووراکانەوە راوەستابوون و سەرنجی ئەم چالاکییەی پیاوەکانمیان دەدا. لە چادرەکانیشەوە ئەو ترس و لەرزەم خوێندەوە کە ژمارەی جەنگاوەرەکانی منیان بە ژمارەیەکی زۆر دادەنا کە لە شاخ و گرد و دۆڵەکاندا خۆیان ئامادە کردبوو بۆئەوەی هێرش بکەنە سەر شار و دەست بکەن بە راوو رووت و ئەتککردن هەروەها ئەوەشم رەچاوکرد لە چادرەکانی موسادا کە پلانەکەم سەرکەوتووانە کاریگەرییەکی باشی کردە سەر دڵ و دەروون و غیرەتی ئەو لەشکرەی موسا کە لە دەشتەکاندا سەربازگەیان بەستبوو بە جارێ وزەیان بەردابوو.

ناوبەناو کۆمەڵە سوارێکی کەم لە یەکێك لە بارەگاکانی یەکێك لە شازادەکانی موساوە غاریان دەدا و دەچوون بۆ بارەگای شازادەیەکی تر. دوای ئەوە سێ کۆمەڵی گەورەی سوارە بەرەو گرد و دەربەندەکان کشان. منیش لە راستیدا کە ئەو کۆمەڵ و هەواڵ قۆزانەم بینی بەرەو گرد و دۆڵەکان کشان تۆزێك ترسم لێنیشت. منیش بەردەوام بە ترس و لەرز و دڵەکوتێوە سەرنجم دەدان تاکو ئەو کۆمەڵانە گەرانەوە و بیروڕای خۆیان دا بە موسا و فرۆفێڵ و پلانەکەی منیان بۆ روونکردەوە. پاشان بینیم تیپێکی سوارە بەرەو گرد و دۆڵەکان کشان و غاریاندا. منیش لەوە دەترسام پەیوەندی من و پیاوەکانم کە لە گرد و شاخ و دۆڵەکاندان بپچڕێت و من و ئەو سەد و پەنجا پیاوەی بە تەنها لەگەڵمدا ماونەتەوە لەناو شارەکەدا پاش ئاشکرابوونی فرت و فێڵ و پلانەکەم بۆ موسا لەگەڵ موسادا بەرەنگاری یەك ببینەوە و ببێت بە شەڕ. ئیتر بڕیارم دا دوا پلانم بخەمە کار و تاقی بکەمەوە. لە بورجەکان هاتمە خوارێ و بەرەو ئەو بەندیخانەیە چووم کە کوڕەکەی موسا و سەرلەشکرەکانیم تیادا بەند کردبوو. جاکۆ و سەیفەدینی پیرەمێردیش لەگەڵمدا هاتن. دەرگای بەندیخانەکەم کردەوە و دوو هەڤاڵەکەشم بوون بە پاسەوان و چاودێر بەسەر بەندەکانەوە. ئینجا روومکردە شازادە لاوەکە و وتم:

-لە کردەوەی مندا نییە ئەو شازادانەی خۆیان دەدەن بە دەستمەوە بیانکوژم.

کوڕەکەی موسا بە ترسێکەوە تەماشای کردم و پێی وتم:

-گەورەم من ئەوەم بیستووە.

پاشان هەناسەیەکم هەڵکێشا و خۆم گورج کردەوە و لەسەر قسەکانم بەردەوام وتم:

-ئەی شازادەی لاو، تۆ و سەردارەکانت بەرەڵا دەکەم و دەتاننێرمەوە بۆ سەربازگەکەی باوکت.

-بەڵام ئایا باوکم هێرش ناکاتە سەر شارەکە؟!! و دەورتان ناگرێت؟!

-نەخێر، موسا پیاوێکی زانا و تێگەیشتووە، هیچ فرسەتێکیشی بۆ ئەو کارە بەدەستەوە نەماوە. هێزەکانی من زۆر لە هێزەکانی ئەو زیاترن. لەناو شارەکەدا ئەوەندە هێزم هەیە، هێندەی ئەو هێزە دەبێت کە باوکت بتوانێت کۆیبکاتەوە. لە گرد و شاخ و دۆڵەکانیشدا دوو ئەوەندەی هێزی شارەکەم هەیە و ئەو هێزانەم لەسەر پێن بۆئەوەی ئەگەر باوکت هێرش بکاتە سەر شارەکە، هەڵمەتی بەرنە سەر و تێکوپێکی بشکێنن.

-بەڵام شەوی ڕابردوو دەنگە دەنگێکی زۆر کەم لەناو شاردا هەبوو.

-ئەوە پلانی منە، من خوێن ڕێژ نیم، زۆر بە هێمنی و لەسەرخۆ هاتوومەتە ناو شارەوە بۆئەوەی خوێن نەڕژێت و کەسیش نەکوژرێت و لە کوشتن و وێرانکاری دەستم پاراستووە. هیچ حەز و ئارەزوویەکیشم نییە تۆ و باوکیشت بکوژم. تا ئەم هۆیەیە پاڵم پێوە دەنێت بتنێرمەوە بۆ لای باوکت. موسا ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەفسەرێکی ئازا و بەجەرگ بوو لەژێر دەستمدا، لەبەرئەوە بچۆ بۆ لای باوکت و پێی بڵێ بچێت بۆ سەمەرقەند پێش ئەوەی هاوپەیمانەکانم کاروبار بگرنە دەست و هێرش بکەنە سەری.

-باشە، ئەمە بۆسە و فێڵ نییە بۆمان سازکرابێت؟

-لە ڕاستیدا ئەمە هیچ بۆسەو فرۆفێڵێك نییە. بەڵام دەبێت من چاوت ببەستمەوە بۆئەوەی شوێن و ڕێگای لەشکر و بەرگریمان نەبینن. تۆش خۆت لەوە باش دەگەیت وا نییە؟

شازادە لاوەکە ڕاچڵەکی و بە ترس و لەرزەوە و بە شێوەی پرسیار ڕوویکردە یەکێك لە سەرکردەکانی. بەڵام ئەوەندەی نەخایاند ئەو سەرکردەیە وەڵامی دایەوە وتی:

-گورم ئەوە گرنگ نییە، ئەگەر تەیموور بیەوێت بمانکوژێت. دەمانکوژێت هەرچیش ڕوویدات. دەی بڕۆ بۆ پێشەوە و ئێمەش لەگەڵتدا دەڕۆین.

ئەو پیاوانە یەکەیەکە هاتنە پێشەوە و جاکۆ چاو و قۆڵی بەستن و لە بەندیخانەکە هێنامانانە دەرێ و بەرەو شەقامەکە بردمانن. هاونیشتمانیانیش لە هەموو لایەکەوە بە دەنگی بەرز باسی ئەو لەشکرە زۆرەیان دەکرد کە لە گرد و شاخەکانەوە بەرەو شار دەکشێن بێگومان ئەو دیلانەش هەر لەوکاتەوەی لە بەندیخانە دەرچوون تاکو گەیشتنە بەر دەرگای شووراکان، مێشك و گوێیان پڕبوو لەو دەنگوباس و هەواڵە ترسناکانە، هەرکە گەیشتنە بەردەرگاکان، ئەسپیان دانێ و دەست و قۆڵیانمان کردەوە و دەرگاکانمان بۆ کردنەوە و کردمانانە دەرێ و

دەرگامان لەسەر داخستن و پێمانوتن، چاوتان بکەنەوە و سواری ئەسپەکانتان ببن و بڕۆن. و خواحافیزیم لە کوڕەکەی موسا کرد و پێم وت:

-سڵاوی من بگەینە بە باوکت و پێی بڵێ تا زووە لەبەر سوودی خۆی ڕابکات بۆ سەمەرقەندو پێی بڵێ ژیانی دەدەمە دەست خوا و هەوڵدەدەم جڵەوی هێزەکەم بگرم و تاکو سبەینێ ڕۆژ هەڵات هیچ کاروکردەوەیەك نەکەن. ئەو شازادە لاوە هەرکە منی بینی بە ڕاستی هیچ بۆسەو داوێکم بۆ نەناوەتەوە فرمێسك بە چاوەکانیدا هاتە خوارەوە و وەڵامی دامەوە وتی:

-ئەی شازادە تەیموور من زۆر سوپاست دەکەم، بە ڕاستی تۆ شازادە و داگیرکەرێکی میهرەبان و دڵنەرمیت.

ئیتر سەردار و شازادەکان بەرووداوا بەرەو چادرەکانی موسا غاریان دا.

من و جاکۆ و سەیفەدینیش گەڕاینەوە بۆ ناو شار و پاشان چوومە شوێن و جێگاکەی خۆم لەسەر بورجەکاندا و دەستمکرد بە تێڕوانینی. شازادەکانی کارشی کە بەرەو چادرەکانیان غاریان دەدا و تەماشای گرد و دۆڵەکانم دەکرد بۆ ئەوەی جموجووڵی پیاوەکانم و جموجووڵی پاسەوان و هەواڵ قۆزەکانی موسا ببینم. زۆربەی زۆری کڵپەی ئاگرەکان دامرکابۆوە و دووکەڵی ئاگری شوێنە دوورەکانیش کە لەملاو ئەولادا هەڵکرابوون، وردە وردە کەم دەبۆوە ئەدەما.

لەو هەوا و کەشەی ئەو هاوینە گەرمەدا تۆز و خۆڵ و گەردەلوولێك بەرزبۆوە. بەڵام چونکە ڕۆژ کەوتبووە پشت شاخەکانی ڕۆژئاواوە و تاریکایی باڵی کێشابوو بەسەر ئەو دەشت و دەورەدا هیچ نیشانەی لەشکر و پیاوێکم نەدی.

پاش ئەوەی کوڕەکەی موسا و سەرکردەکانی گەیشتنە چادرەکانی باوکی و بارودۆخیان تێگەیاند. بینیم ژمارەیەك لە گەورە ئەفسەرانی غاریاندا بۆ بەرەو باکوور و لە شوێنێکی بەرزی دەشتەکەدا چاویان بە هەموو لایەکی وڵاتدا گێڕا. من وامدەزانی چاو بۆ ئەو کەسانە دەگێڕن کە ماوەیەك لەمەوپێش ڕۆیشتبوون بۆئەوەی هەواڵی لەشکرەکەم و ژمارەی هێزەکەی منیان بۆ بهێننەوە.

بەڵام ئەو ئەفسەرانە وەك من هیچم نەدی ئەوانیش هیچیان نەدی و پاش چەند چرکەیەك گەڕانەوە بۆ ناو چادرەکانیان.

کتوپڕ شەیپوورژەنەکانی موسا فوویان کرد بە شەیپوورەکانیاندا و لەشکرەکەی موسا زۆر بە تووڕەیی و خێراییەکی شێتانەوە، دەستیانکرد بە تێکدان و پێچانەوەی چادرەکانیان. هەرچی پیاوێکیان بیتوانیایە هاوبەشی تێکدان و پێچانەوەی چادرەکانی دەکرد.

هێشتا تاریکایی بە تەواوی هەموو لایەکی دانەپۆشیبوو، هەرچی چادرێك هەبوو هەڵگیرا و پێچرایەوە و بەری یەکەمی پێشڕەوی هێزەکەی موسا بەرەو ڕێگای شەهری سیبز و سەمەرقەند کەوتەڕێ.

ئیتر هەناسەیەکی شادی و خۆشیم هەڵکێشا و هەستم بە تۆزێك دڵنیایی و ئاسوودەیی کرد. گەرچی هێشتا نیگەران بووم و ترس و لەرز لە دڵمدا بوو، نیگەرانی ژیانی ئەو جەنگاوەرانە بووم کە لە دەروەی شووراکان و لە نێوان گردەکاندا مۆڵگەیان بەستبوو، کردبوویانە سەربازگەی خۆیان. پاشان لە ڕوانگەی سەر شووراکەوە هاتمە خوارێ بۆئەوەی هەندێ کاروباری خۆم جێبەجێ بکەم.

ژمارەیەکی ترم لە پیاوان و جەنگاوەرانم نارد بۆئەوەی سەرکەونە سەر دیوار و بچنە ناو قوله و ڕوانگاکانەوە و ژمارەیەکی ترم نارد بۆئەوەی لە نزیك ئەو دەرگایانەی بە ڕووی ڕێگای شاخەکاندان خۆیان دامەزرێنن و لە سەنگەرەکاندا خۆیان مەڵاس بدەن. ژمارەیەکی تری ئاڵای لەسەر دەرگای دەرەوەی شارەکە چەقاند و لە نێوانیاندا ئاڵاکەی خۆمم چەقاند، بۆئەوەی ڕێنمایی ئەو سەربازانەی پێ بکەم کە دەگەڕێنەوە و لێوەی بێنە ناو شارەوە.

ئیتر دوای ئەوە پیاوە جەنگاوەرەکانم ڕوویانکردە شار و کۆمەڵ کۆمەڵ دەهاتنە ناو شارەوە و هەر کۆمەڵە لە پێنج یا دە کەس پێکهاتبوون.

داود و موفا و ئیلشی لەگەڵ پیاو و دەست و پێوەند و ئەوانەی سەر بەوانن هاتنە ناو شارەوەو دوای ئەوانیش بێرکا و کایدۆ هاتنەوە. دوای یەك کاتژمێر و لە کاتێکدا تاریکایی بە تەواوی باڵی کێشابوو بەسەر ناوچەکەدا، نورەدین و چوار کەس لە پیاوەکانی بە غاردان هاتنەوەو پیاوێکی پیریشیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو.

پاشان نورەدین لەبەردەممدا ڕاوەستا و ڕووی تێکردم و وتی:

-ئەی شازادە تەیموور، وا من منغالی بۆغام بۆ هێناویت و دەیەوێت گفتوگۆ و ڕاوێژت لەگەڵدا بکات.

منیش بە بڕوایەکی تەواوەوە وەڵامم دایەوە و پێم وت:

-نورەدین، با بێتە ژوورەوە.

ئینجا نورەدین لەسەر پشتی ئەسپەکەی هاتە خوارەوە و چوو پیاوە پیرەکەی هێنایە بەردەمی دەرگاکە، لە پیرەمێردەکەم پرسی:

-ئەی پیرەمێردی بەڕێز منغالی بۆغا دەتەوێت باسی چی بکەیت.

وەڵامی دایەوە:

-ئەی شازادە تەیموور من لەمەوپێش لەگەڵ تاراغای باوکتدا هاوبەشی زۆرێکی هەڵمەتەکانیم کردووە. ئێستاش دەمەوێت لەگەڵ کوڕەکەشیدا هاوبەشی بکەم و هێزەکەم بخەمە پاڵ هێزەکەیەوە. من هیچ موسا و حسێنم خۆشناوێت و هیچ ڕێزێکیش بۆ خۆیان و دەستوپێوەندەکانیشیان دانانێم و خۆشمناوێن. لەبەرئەوە داواکارم لێت، ڕێگام پێبدە، با هێزەکەم بێنمە ناو شارەکەتەوە و هێزەکەم بخەمە پاڵ هێزەکەتەوە.

وتم: باشە مامی بەڕێز هێزەکەت چەند پیاوی جەنگاوەرن؟

وتی: دوای نیوەڕۆی ئەمڕۆ پێنج سەد پیاوم هێناوە بۆ شاخ و کێوەکان بۆئەوەی بیانخەمە پاڵ پیاوەکانی تۆوە. ئێستاش پەنجا پیاوم لەگەڵ خۆمدا هێناوە و نورەدین چەکی کردوون. لە ماوەی یەك سەعاتدا شەیپوورەکانم، دەتوانن هەموو هێزەکانم بانگ بکەن و کۆیانبکەمەوە.

وتم: چاکە پیاوەکانت قایل دەبن، چەکەکانیان دابنێن تاکو لە مەبەستی چاکی تۆ دەگەم..؟

وتی: ئەگەر کوڕی تاراغا پەیمانم دەداتێ هیچ زیانێك بە پیاوەکانم ناگەیەنێت، ئەوا من قایل دەبم و بڕیاری لەسەردەدەم نورەدینیش با شاهیدی قسەکانم بێت.

-کەواتە دەی مامی بەڕێز، فەرموو وەرە ناو شاردوە و میوانی من بە، فەرمانیش بدە بە شەیپوورژەنەکانت با پیاوە جەنگاوەرەکانت کۆبکاتەوە و بانگیان بکە بۆ کۆبوونەوە.

-منغالی بۆغا هاتە ناو شاری کارشییەوە. بانگەوازی سەیفەدینم کرد. کاتێك ئەو دوو پیرەمێردەم بیستی وا بە گەرمی و ڕووخۆشییەوە سڵاوی گەرم و گوڕ لە یەکتر دەکەن. ئیتر منیش بێگومان بووم لەوە کەوا من هاوپەیمانێکی گەورە و مەزنم دەستکەوتووە و بە وەرگرتن و قایلبوون بە منغالی بۆغا هێزەکەم بۆ دوو چەندانە زیادی کرد و ئەمەش تەنها سەرەتا بوو.

* * *

# جیهانگیر موسا دەگوزێت

لە ڕاستیدا کارشی ئەو قەڵایە بوو، کە من پێویستم پێی بوو. هەموو هەوڵ و کۆششێکم بۆ گرتنی ئەو قەڵایە بوو. ماوەی دوو ساڵی تەواو پیاو و سەربازم کۆکردەوە و دەمخستنە پاڵ خۆم و لەگەڵ سەربازەکانی خۆمدا تێکەڵاوم دەکردن. ئەو کەسانەش من نەمدەنارد بەدوایاندا، خۆیان دەهاتن و منیش هەرچی بهاتایە، بە ئاشکرا وەرمدەگرتن، دوای ئەم لەشکرکۆکردنەوەیەم، هێرشم کردە سەر قەڵای کارایوسف کە خێڵ و هۆزێکی تورکمانی تێدابوو.

ئەم تورکمانانە ناوبەناو هێرشیان دەکردە سەر سنوورەکانی وڵاتەکەی حسێن و جووتیار و وەرزێرەکانیان دەکوشت و تاڵانیان دەکردن، ترس و لەرزیان دەخستە ناو دڵ و دەروونیانەوە. لەگەڵ شازادە دڵسۆز و هاوپەیمانەکانمدا توانیم دوو هەزار پیاوی جەنگاوەر کۆبکەمەوە و بە ئاسانی و زۆر بە گورجی شارەکەی کارایوسفم داگیرکرد. و سەری کارایوسفم بڕی و ناردم بۆ شا حسێن و ئەوەم دووپات کردەوە کەوا من لە بریتی شاهێنشای سەمەرقەند ئەم کارەم کردووە. بەڵام لە ڕاستیشدا تەتەرەکان بۆ ئەم کارەم ڕێزیان بۆ من دادەناو ڕێزی تایبەتیشم هەبوو لەناویاندا. چونکە هەر کە گەیشتمە سنووری وڵاتی حسێن هەرچی سەرکردە و شازادەیەك هەبوو، کە زانیان و دڵنیابوون لەوەی میرنشینەکانیان ئەمینە و هیچ کەسێك ناتوانێت هێرشیان بکاتە سەر و تاڵانیان بکات. شازادەکان و سەرکردەکان هاتنە ناو لەشکرەکەمەوە و پەیوەندییان پێوەکردم. ئیتر ئاوەها سنووری میرنشینەکەم بەست بە سنووری ئیمپراتۆرییەتەکەی حسێنەوە، و بەسەر هەرچی داگیرکەر و دەستدرێژیکەرێکدا هەبوو کە لە قەدپاڵی شاخە ساردەکانی بامیردا مۆڵگەیان بەستبوو سەرکەوتم و هەرچی سەرۆك و سەردارێکی فارسیش کە لە باکووری ڕووباری ئامۆدەریادا بوون، لەو بیابان و ناو لەمدا هەموویانم کوشت و تەفروتونام کردن.

لە دواییشدا هەرچی مەغۆلییەکیش لە نشێو و قەدپاڵی شاخەکاندا بوون ڕاومنان و لە وڵات دەرمکردن.

هەموو کاتێکیش دەنگوباسی سەرکەوتنی خۆم بۆ حسێن دەنارد و دیاری گرانبەها و ئەنتیکەم بۆ ئەو و شازادە دڵشاد دەنارد.

ماوەیەك حسێن وای بە چاك دەزانی و خۆی وا پیشان دەدا و بڕوای وابوو من بە ڕاستی ئەو دەپارێزم و پارێزگاری لە ئیمپراتۆرییەتەکەی دەکەم.

بەڵان هەر کە بینی دەسەڵات و هێزم سنوورەکەی دەبڕێت و دەگاتە سەمەرقەندیش و هەرچی هاودەم و هاوڕێیەکیش کە دڵشاد هانەهانەیانی دەدا. قسە و چیرۆکی سەیر و سووڕمێنی

ئازایەتی من و هێز و توانای منیان دەگێڕایەوە. حسێن هەستی بەو ڕاستییە کرد، من ئەو خەتەرە سەرەکییەیم، کە وردە وردە پێدەگات و هەڕەشە لە ئاشتی و ئاسایشی شانشینەکەی ئەو دەکات.

لە ڕاستیدا من هیچ نیاز و ئارەزوویەکم نەبوو، هێرش بکەمە سەر سەمەرقەند. من وام بە چاك دەزانی حسێن خۆی بێتە سەر من و هێرشم بکاتە سەر. لە ڕاستیشدا هەروا دەرچوو. دوای ئەوە ئیتر توانای ئەو بەیت و بالۆرە و پیاهەڵدانەی منی نەما کە لەناو شانشینەکەیدا باسی منیان دەکرد. ڕەنگە ئیرەیی "بەخیلی" بێت نەك ترس، وای لێکردبێت ئاخری لە سەمەرقەند بە خۆی و لەشکرێکەوە کە پێکهاتبوو لە چەند هەزار پیاوێك بێتە دەرێ. کار هەرچۆنێك بێت حسێن بەرەو کارشی دەستی بە کشاندن کرد.

منیش دوای ئەوە داودم کرد بە سەرکردەی هەزار پیاوی جەنگاوەر و پاراستن و بەرگری شاری کارشیم پێسپارد.

خۆشم هەرکە بیستم حسێن لە قەڵاکەی خۆی هاتۆتە دەرەوە، هەرچی لەشکرێکم هەبوو کۆمکردەوە و بەرەو گرد و چیا و نشێوەکان کەوتمە ڕێ. هەروەها نوێنەر و تەتەرەکانی خۆمم بۆ هەموو لایەکی وڵاتی تەتەر نارد. بۆئەوەی بانگەشەی سەرۆك و سەردارانی ئەو خێڵ و هۆزانە بکەن، کە لە ماوەی ئەو دوو ساڵی ڕابوردووەدا من یارمەتیم دابوون.

لە کاتێکدا حسێن پیاوەکانی خۆی کۆکردەوە و بەرەو کارشی دەیهێنان، منیش زۆربەی هێزەکەم لە چیاکان و لە میانەیەکی دووردا حەشار دابوو. بۆئەوەی بە هیچ شێوەیەك، ئەو دووکەڵانە نەبینن کە لە ئاگرەکانمانەوە بەرزدەبێتەوە و لەو ڕێگاوبانەوە دیارنەبن کە دەچێت بۆ ناو شار.

هێزەکەم لە دەوروبەر و ئەملاو ئەولادا و لە دوورییەکی دوورەوە دانا و هێزێکی تەواویشم لەناو ئەو بازنەیەدا دانا، کە ئاوی خواردنەوە و لەوەڕی چاکی تێدابوو. هەروەها فەرمانم دا بەو گروپ و کۆمەڵە ڕێگاگرانە، بەرهەڵستی پیاوە هەواڵ قۆزەکانی حسێن بکەن و ئەگەر دەشتوانن پارێزگاری ڕێکوپێکی ئاسایش بکەن.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام پەیوەندیم لەگەڵ تەتەر و شەیپوورچییەکانمدا هەبوو. بۆ ئەوەی ئەگەر پێویست بوو داوای هێزی تر بکەن.

منیش لە لایەن خۆمەوە بەردەوام لەگەڵ جیهانگیردا، کە ئەوکاتە، تەمەنی گەیشتبووە چواردە ساڵان و بە سواری لەگەڵمدا بوو، پێکەوە دەگەڕاین و هەموو شەوێك لەم هۆبەوە

دەچووین بۆ ئەو هۆبە و پێشوازی ئەو کۆمەڵە نوێیانەمان دەکرد، کە لە هەموو لایەکی ئیمپراتۆرییەتییەکەوە دەگەیشتنە لامان و دیاری جۆراوجۆرمان دەدا بە یەکتری و زانیاری نوێمان دەدا بەو کۆمەڵە نوێیانە و باشترین و شارەزاترین ئەفسەرمان بۆ سەرکردایەتی ئەو لەشکرە نوێیانە هەڵدەبژارد.

گەرچی من لەمەوپێش ڕێگام بە کوڕەکەم نەدابوو، لە تەکمدا سواری ئەسپ بێت و هاوبەشی جەنگ و کوشتار بکات. بەڵام ئەو کاتە بڕیارم داو ماوەم پێدا دژی حسێن هاوبەشی جەنگ بکات.

من وا بە بیرمدا دەهات، پاش ئەوەی حسێن دەکوژم. "چونکە ئەمجارە بە هیچ جۆرێك لە بیرمدا نەبوو، ڕێگا بە حسێن بدەم ڕابکات و بە ساغی بمێنێتەوە" جیهانگیر بەم شێوەیە دەتوانێت دڵ و دەروونی پیاوانی هۆزی جالیر بۆ لای خۆی ڕابکێشێت. چونکە جیهانگیر کوڕی ئەلجای ژنە شازادەی خۆشەویستیان بوو. لە دواییشدا ڕێز و کەسێتییەکی گەورەی لەگەڵ دڵشادا پەیدا دەکات. چونکە دڵشاد لایەنگرێکی گەورە و بەهێز و بەتوانای ئەو بوو.

ئیتر بەم شێوەیە جیهانگیرم لەگەڵدا بوو، کاتێك پیاوە هەواڵ فۆزەکانم پێیان ڕاگەیاندم حسێن لە دووری ڕێگای نیوەڕۆیەکەوە، بۆ کارشی سەربازگەی خۆی هەڵداوە، هەر خێرا من و جیهانگیر سواری دوو ئەسپ بووین و بە درێژایی ئەو شەوە ڕۆیشتین تاکو گەیشتینە شوێنێك و لەو شوێنەوە دەمانتوانی سەرپەرشتی و چاودێری ئەو ڕێگاوبانە بکەین کە حسێن لە پاشاندا دەیگرێتە بەر و بەرەو شاری کارشی دەکشێت.

لێرەدا تێگەیشتم و هەستمکرد جیهانگیر هەمان هەست و ئەستی منی هەیە. کاتێك ڕۆژهەڵات و تیشکەکەی دای لەو چادرە شاهانەیەی حسێن کە من بۆ ماوەیەکیش نەمدەتوانی خەویش بەو جۆرە چادرانەوە ببینم کە دەستم کەوێت. جیهانگیر بە شێوە خەمبارییەکەوە لێی پرسیم وتی:

-باوکە ئێستا هێرش بکەینە سەر ئەو چادرانە؟

وەڵامم دایەوە: نەخێر کوڕم، چاوەڕوان دەبین تاکو حسێن لە ئابلۆوقە و هێرشەکەیدا بۆ سەر کارشی هەندێك کوشتاری لێدەکرێت و چەند هێزێکی لەناودەچێت.

وتی: دوای ئەوە ئەو پیاوانەش بە دیل دەگرین کە لەسەر پشتی وڵاخەکانیان دێنە خوارەوە.. باوکە.. وانییە؟

وتم: بەڵێ.. لە دواییدا هەندێکیان بە دیل دەگرین، بەڵام ئێستا نیگەران مەبە، چونکە تۆ ماوەیەکی باش لەسەر پشتی ئەسپەکەت دەمێنیتەوە و ماوەیەکی چاك غاردەدەیت پێش ئەوەی

دوژمنان بە دیل بگرین. من حسێن باش دەناسم. هەرکاتێك بینی ژمارەیەکی زۆر لە پیاوەکانی کوژراو لە دەستی چوو، ئەوکاتە پشتیان تێدەکات و ڕادەکات.. نیگەران مەبە کوڕم.. نیگەران مەبە.. لێی پرسیم وتی: باشە بۆ کوێ ڕادەکات؟ ئایا بۆ شوێنێکی دوور ڕادەکات.

وتم: نازانم.. بەرەو باکوور و بۆ بیابانەکە ڕادەکات. ئێمەش ڕێگای نێوان خۆی و سەمەرقەندی لێدەگرین. چونکە من دوو فەوجم ناردۆتە سەر ڕێگای سەمەرقەند بۆئەوەی لە بۆسەدا بن بۆی.

لەم کاتەدا جیهانگیر دەستی هێنا بە سەر و ملی ئەسپەکەیدا و دەستی خستە ناو ئەو تۆپەڵە مووەوە کە بەسەر ملی ئەسپەکەیدا هاتبووە خوارێ و دەیخوراند.

پاشان قسەکەی تەواو کرد و وتی:

-ئێمەش دوای دەکەوین و دەیگرین..

ئا لە کاتەدا هەستم بە گەورەییەکی زۆر کرد، چونکە کوڕەکەم حەز و ئارەزووی لە ڕاونانە. پاشان بە پێکەنین و زمانێکی شیرینەوە وەڵامم دایەوە و وتم:

-بێگومان ئێمە دوای دەکەوین، و هەر بە دواشییەوە دەبین تاکو ئەسپەکەی لە پەلوپۆ دەکەوێت و دەکەوێتە ژێرپێی ئەسپەکەیەوە. هەر لەم کاتەشدا سوارە ئیلشی لە تەکمەوە سواری ئەسپەکەی ببوو لێیپرسیم وتی:

-شازادە تەیموور، ژمارەی پیاوەکانی حسێن بە چەند کەس دادەنێیت.

وتم: من ژمارەی پیاوەکانی بەهەشت هەزار کەس یان نۆ هەزار پیاو دادەنێم. لە کاتێکدا ئەگەر ئەو دەوریانەش حساب بکەین کە بە هەموو لایەکدا بڵاوی کردۆتەوە.

بەڵام ئەی بیروڕای تۆ بۆ ئەم ئامارە چۆنە..؟

وتی: وا پێدەچێت تۆ ڕاست بیت.. ئا لەو لایەشەوە چادرەکانی موسا دەبینم، من گرەو لەسەر ئەوە دەکەم موسا ئێستا پلانی سەرکەوتووانە دادەنێت کە بە سەرکەوتووییەوە دەگەڕێتەوە بۆ ناو کۆشك و میرنشینەکەی خۆی.. وتم: ئیلشی، موسا تووشی نائومێدییەکی خراپ دەبێت. بیرم کردەوە هەر دەبێت موساش لەناوبەرم و بڕیارمدا، هیچ کەسێك لە هۆزی جالیر نەهێڵمەوە، بتوانێت لە پاشەڕۆژدا بەرامبەری یان دژایەتی جیهانگیر بکات.

چاومان لێبوو لەشکرەکەی حسێن لە دەشتەکەدا لە نانخواردنی بەیانیان بوونەوە و دەستیانکرد بە تێکدان و کۆکردنەوەی چادرەکانیان. حسێن خۆی سەرکردایەتی ئەم هەڵمەتەی دەکرد و بە شێوەی شاهێنشاهێکی ڕاستی هەڵسوکەوتی دەکرد. چونکە حسێن هەموو هۆیەکی

خۆشی و ڕابواردنی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، وەك ئەو خۆشی و ڕابواردنانەی کە لە شانشینی خانەکاندا هەبوو.، ڕەشماڵێکی گەورەی هێنابوو بۆ ژنان کە زیاد لە پەنجا ژنی دەگرت. وا دیاربوو وا چووبێتە مێشکییەوە گەمارۆیەکی درێژخایەنی شاری کارشی دەدات و مانگەکانی بەهار و هاوین لەو دەشتەی کەوتۆتە بەردەمی شارەکەوە بەسەرببات.

هەرکە هێزەکەی کەوتەڕێ و بە شێوەی کاروانێکی ڕێکوپێك جمان، کە درێژاییەکەی گەیشتە چەند میلێك. من لە دڵی خۆمدا دەستمکرد بە پێکەنین و بیرم لەوە دەکردەوە، کاتێك لە دەروازە ئاسنینەکەوە کاروانی زەخیرە و پارمەتی یەکەمی لە پەڕینەوەیدا تووشی نوشوستی دەبێت و هێزی جەنگاوەرانم لە ماوەی چەند کاتژمێرێکدا دەستیان بەسەردا دەگرن و دەرگایان لەسەر دادەخەن، حسێن چی دەکات؟ ئەمەش یەکەم کارێکی کتوپڕی دەبێت کە تووشی دەبێت.

بە درێژایی ئەو بەیانییە بە تووڵەڕێگای گردەکاندا و بە تەنیشت ئەو ڕێگایەی هێزەکەی حسێن پیادا ڕەت دەبوو، دەڕۆیشتین، و سەرنج و تەماشای هەموو جووڵانێکی ئەو لەشکرەمان دەکرد. تاکو گەیشتنە دەشتاییەکە و لە شوێنێکی دیار و بەرچاودا ڕاوەستان و چادریان هەڵدا. ئەو شوێنەش بۆ داود زۆر لەبار بوو. پیاوە خۆڕاگر و پارێزەرەکانی داود ئالآکەی منیان ڕادەوەشاند و فوویان بە شەیپوورەکانمدا دەکرد. هەروەك بە ڕاستی من لەناو شاردا بم وابوو.؟

منیش بیرم لەوە دەکردەوە حسێن وا دەزانێت بەو هێز و لەشکرە زۆرەی، هێنابووی ترس و لەرز دەخاتە دڵ و دەروونمەوە و بیروباوەڕم پێ شلۆق دەکات و ورەم پێ بەردەدات.

لە کاتی ڕۆژئاوادا شازادەی سەمەرقەند چووە ناو چادر و شانشینەکەی خۆیەوە و دوو فەوجیش لە هێزەکەی حسێن گەمارۆی شارەکەیان دا بۆئەوەی ڕێگای هاتووچۆکردن بگرن.

لەشکرەکەی حسێن دەتوت لە جەژن و ئاهەنگ و فیستیڤاڵدان. هەرچی چادرێکیان هەبوو بە تیشکی ئاگر و چراوگ ڕووناك کرابوونەوە. گەرچی ئێمە نەمانتوانی لە چادرەکانیاندا هیچ جووڵە و دەنگێکیان ببیستین، بەڵام ئێمە دەمانزانی چی دەکەن و چی ڕوودەدات.

ئیتر لەو دواییدا وازمان لە چاودێری و سەرنجدانمان هێنا و گەڕاینەوە بۆ ناو گرد و شاخەکان پێش ئەوەی دەورییەکانی حسێن دەستبکەن بە گەڕان و تەماشاکردنی دەوروبەری شاری کارشی.

لە ڕۆژی دواییدا سواری ئەسپەکەم بووم و نزیك شاری کارشی کەوتمەوە، بۆئەوەی تەماشا و چاودێری حسێن بکەم.

ئەویش ئامێری ئابڵووقەی ئامادەکرد و خۆی ئامادە دەکـرد و ڕیزەکانی خۆی قایم دەکـرد و لە شوێنێکدا تیرەکانی ئێمە نەیانگاتێ، سەنگەری بە دەوری شارەکەدا لێدا.

لـە ڕاسـتیدا حسێن سـەرکردەیەکی گـەورە و بـەتوانا بـوو. بـە ڕاسـتی پلانەکانیشـی ڕاسـت و ڕەوان و ئازایانە بوون. بەڵام ئەو ڕۆژە هێرشەکەی نەکردە سەر شاری کارشی.

هەروەها منیش گەڕامەوە بۆ ناو گردەکان و چادرەکەی خۆم، بۆئەوەی لەگەڵ سەرکردەکانم و ئەنجومەنی جەنگدا کۆببمەوە.

زۆربـەی زۆری شازادەکانم لـەو کۆبوونەوەیەدا ئامـادەبوون و بەشداریيان تێداکـرد. هـەروەها ڕێـم بـە جیهانگیریش دا، ئامـادەی ئـەم کۆبوونەوەیـە ببێـت و لەگـەڵ شازادە و سەرلەشـکرەکاندا دانیشێت بۆئـەوەی تێبگـات چـۆن لـە کـاتی شـەڕدا هەڵسـوکەوت بکـات. هـەروەها بۆئـەوەی لـەم کۆبوونەوەیـەدا لــە لایـەن سـەردار و سـەرکردە پـیرۆ و دێرینەکانـەوە بناسـرێت و لەگـەڵیاندا ناسیاوی و دۆستایەتی پـەیدابکات. هەرکە کۆبوونەوەکـە دەسـتیپێکرد و شـازادە و سـەردارەکان سڵاویان لـە مـن کـرد. بـە خۆشـی و شـادییەکی زۆرەوە سـەرنجم دا، شـازادە و سـەرکردەکان بـە ڕوویـەکی گـەش و خۆشـەوە لەگـەڵ جیـهانگیردا دەدوێـن. سـەرنجم دا لـە کـاتی کۆبوونەوەکـەدا زۆربەی زۆریان لـە قسەکردنەکانیاندا کە باسی کاروبـار و کێشـەکانیان دەکـرد، تەماشـای ئـەویان دەکرد.

چونکە کۆبوونەوەکە بۆ ماوەی دوو کـاتژمێر و پاشان بـۆ سـێ کاتژمێر درێـژەی خایـاند مـن هەست و سەرنجی خۆمم دابەشکرد بەسـەر ئـەو پلانـەی گفتوگۆمـان لەسـەر کـرد. "ئـەو پلانـەی کەوا نەخشەکەیم بەسەر شازادە و سەرکردەکاندا دابەشکرد" و بەسەر هەڵسوکەوتی کوڕەکـەمدا. جیهانگیر زۆر گرنگی بـە گفتوگـۆی قسـەکەرەکان دەدا بــە تایبــەتیش بـە خـودی قسـەکەرەکان خۆیان. تا ئەوکاتەی سەگێ یەکێك لـە شازادەکان هاتـە ژوورەوە، دەسـتیکرد بـە مووشـە مـووش و گەڕان بە دوای خاوەنەکەیدا، پاشان لە تەنیشت جیهانگیرەوە پاڵکەوت. ئیتر ئەو کوڕە لاوە دەستی هێنا بەسەر پشتی سەگەکەدا و ئاگای لە کاروباری کۆبوونەوەکە نەما. پاش ئەوەی چـەند جارێك باوێشکی دا، سەری بەسەر سەگەکەدا شۆڕکردەوە و خەوی لێکەوت.

ئەو کاتە سەیفەدین لە تەنیشت جیهانگیری کوڕمەوە دانیشتبوو، بـە هێواشی دەسـتیکرد بـە پێکەنین، و جیهانگیری خەبەرکردەوە و پێی وت:

-کوڕم هەسـتە، ئێسـتا کـاتی ئــەوە هـاتووە، ئێمـەی پـیرەمێردو گەنجـەکان لـەناو جێگاکـانی خۆماندا بنووین.

پیاوەکانی تـر بـە بەزەییـەوە ئـەوانیش دەستیانکرد بـە پێکـەنین و هەندێکیشیان سـەریان سوورما لـەوەی چۆن کورەکـەم ئـەم هـەموو کاتـە دوور و درێـژە توانیویـەتی لـەم کۆبوونەوەیـەدا بمێنێتەوە.

بەهەرحاڵ من زۆر تووڕە بووم لەوەی جیهانگیر تاکو ئـاخری گرنگی بـە کۆبوونـەوەکـە نـەدا. لەوەش نەگەیشتم بۆچی ئەو جەنگاوەرە دێرینە دڵڕەقانەم لەوە خۆش بوون، ئـەو کوڕە لاوە کـە تەمەنی چواردە ساڵانە لە کۆبوونەوەدا بنوێـت؟ بـەڵام بـە ئاشکرا دیـاربوو لێخۆشبوونەکەیان بـە ڕاستی بوو. ئەمەش نهێنییەکی تری کەسێتی ئـەلجای بـوو. منیـش تەنـها نـهێنی و شارەزاییـەکی کەمم لە کەسایەتی ئـەلجایدا هەبوو. هیـچ کاتێکیش نـەمدەتوانی بەسـەر نهێنییـەکـەیدا زاڵبـم. جیـهانگیریش بـە تـەواوی لـە ئـەلجای دەچـوو، کەسـایەتی تایبـەتی خـۆی هـەبوو، خـەڵکیش جیهانگیری خۆشدەویست.

بەڵام ئایا تۆ بڵێی لە پاشەڕۆژدا بە گوێی فەرمانـەکانی بکەن و لە قسەی دەرنەچن؟!

* * *

بۆ ڕۆژی دوایی حسێن بە تەواوی ئابلۆوقەی شاری کارشی دا. لە هێرشـەکـەشیدا هەموو جۆرە ئامێرێکی ئابلۆوقە و مەنجـەنیق و هـەموو جـۆرە ئـامێرێکی قـورس و گرانـی بـەکارهێنا و لەگـەڵ هەموو چەکێکی سووکی تردا.

بەرایی هێز و هێرشبەرانی توانیان بگەنـە شووراکان و بـە هـۆی پـەیژەو تەختـە پانەکانـەوە توانیان بە دیوارەکانـدا هەڵبگـەڕێن. بـەڵام داود مەنجەڵـە زفتـی تـواوە و نـەوت و گـڕی بـۆ ئامـادە کردبوون. هیچ چەند چرکەیەکی نەخایاند، ئەو فەوجە هێرشبەرەی دوژمـن کـە بـە دیوارەکاندا هەڵگەڕابوون، بوون بە کۆی زوخاڵ و پشکۆی بڵێسەی گڕ و دەکەوتنە نـاو خەندەقەکەوە و گـڕ و کڵپـە و دووکـەڵیان لێ بـەرز دەبۆوە. یـان دەکەوتنـە سـەر زەوییـەکـە و وەك شـێت ڕایـاندەکرد و هەڵبـەز و دابـەزیان دەکـرد و هاواریـان دەکـرد و گیانیـان دەسـووتا و لەبـەر ئـەو ئێـش و ئـازارە جەرگبڕەیان خۆیـان دەخستە نـاو خۆڵەکـە و خۆیـان تێـدا دەگـەوزاند، و ئاگرەکـەش بـە تـەواوی لەشی دەسووتاندن و دەمردن.

لـە گردەکـان و شـوێنەکانی خۆمانـەوە تەماشـای پیاوەکـانی حسـێنمان دەکـرد کـەوا ئـاگر دەیسووتاندن.

ئیتر ئەو کاتە بە چاکم زانی، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە و دەتوانم هێرش بکەمە سەریان و بە تەنها لێدانێکم دەتوانم سەدەها کەسیان لێبکوژم و لە خاك و خۆڵدا بیانگەوزێنم و لەژێر پێمدا پانیان بکەمەوە. بەڵام ئەمجارەیان دووبارە هێرشیان بۆ سەر شووراکان نەبردەوە.

بێگومان ئەمجارەیان حسێن زیاتر وریا و ئاگاداربۆوە و وەك پێشووی نەکرد بینیم ئەمجارەیان ئامێرە بچووکەکانی هێنایە ناو مەیدانەوە و دەستی بە کار کرد. تیرە دوورهاوێژ و گەورەکانی حسێن لە دەری شارەکەوە تیربارانێکی زۆر خەست و چڕیان بەسەر جەنگاوەرەکانی مندا کرد. ئامێری ئابلۆوقە و مەنجەنیقەکانیشی بە گەرمی دەستیانکرد بە هاویشتنی بەردی گەورە گەورە و مەنجەڵە زفتی تواوەیان دەکرد بە سەر سەنگەر و قولەکانی شاردا.

هەر ئەوکاتە جیهانگیر بە دڵەخورپێ و بێ ئارامییەوە وتی:

-باوکە ئایا لەناو شاریشدا خەڵك دەسووتێ؟

وتم: نەخێر.. کوڕم.. داود تیپی تایبەتی هەیە و سەتڵە ئاو و خۆڵیان بە دەستەوەیە و ئاگرو مەنجەڵە زفتە تواوەکان دەگەنە ناو شار دەکوژێنەوە.

-باوکە من بەو کارە زۆر شاد و دڵخۆشم.

-منیش شاد و دڵخۆشم. تۆ لەمەودوا ئابلۆوقەی گەورەتر دەبینیت. بەڵام ئەوەش بزانە نە تۆو نە گەلەکەشت بە تەواوی ناکەونە خەتەرییەکی گەورە و گرانەوە. پێویستە تۆش بە وردیو وریاییەوە سەرنجی جەنگ و کوشتار بدەیت و هەرچی دەتوانیت لێوەی فێرببیت.

-بەڵێ باوکە.. من ئەو کارە دەکەم..

وا دیاربوو جیهانگیر باش شارەزایی و تێگەیشتنی پەیداکردبێت. چونکە بیرێکی ڕاست و ڕەوانی لە پلانی جەنگی و شەڕ و پێکدادانـدا پەیدا کردبوو. چونکە کاتێك یەکێك لە سەرکردەکانم پرسیارێکی کتوپڕی ڕووبەڕوو لێکرد وەڵامێکی ڕاست و تەواوی دایەوە.

منیش زۆر زۆر شاد و بەختیار بووم، کاتێك سەرنجی توانایم دا و تێگەیشتم هەڵە و ناتەواوییەکانی هێرشەکەی حسێن باش تێگەیشتووە.

هەرکە حسێن پیاوەکانی کۆکردەوە و پێی ڕاگەیاندن یەکەم جار هێرش بکەنە سەر شووراکانی کارشی. منیش بڕیارمدا و فەرمانم دا بە هێزەکەی خۆم هێرش بکەنە سەر لەشکرەکەی حسێن.

جاسووسەکانیشم پێیان ڕاگەیاندم، دەنگوباس گەیشتۆتە حسێن و پێیان وتووە پیاوەکانی منغالی بۆغای مەنگولی لە کاتێکدا زەخیرە و یارمەتییەکان ویستوویانە لە دەروازە ئاسنینەکە

بپەڕنەوە هێرشیان کردۆتە سەریان و دەستیان بەسەر هەرچی زەخیرە و خواردەمەنییەکدا هەیە گرتووە. ئیتر جاکۆم کرد بە نوێنەر و جێگری خۆم و ئیلشی و موفاشم کرد بە سەرکردەی هەردوو باڵی لەشکرەکەم. ئەو لەشکرەی پێکهاتبوو لە سێ هەزار پیاوی جەنگاوەر و لە چیا و گردەکانەوە دەرپەڕیم، و گەمارۆی چادرەکانی حسێنم دا. هەزار کەسی فارسی لە بەشی شاری کارشییەوە هێرشیان کرد و هەزار کەسی مەغۆلیش لە لایەکی ترەوە هێرشیان کرد. ئەم هەموو لەشکرە زۆرە کتوپڕە حسێنی شڵەژاند و بە تەواوی ترساندی و زۆر بە خراپی تێکیشکاند.

هێزەکەی منیش لەگەڵ ئەو دوو فەوجەی موسادا کە بردبوونی بۆ تێکشکاندنی ئەو هێزەی کەوا دەستیان بەسەر خواردن و زەخیرەکەی حسێندا گرتبوو، لە ڕێگای سەمەرقەند بەرەنگاری یەکتر بووینەوە. ئیتر منیش ئاوەها لەگەڵ هێزێکی گەورە و پڕچەك و ئامادە بۆ جەنگ و کوشتاری کتوپڕی بە یەکدا پژاین. کتوپڕ بۆم دەرکەوت و تێگەیشتم من تووشی زەرەرێکی گەورەو گران دەبمەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە خۆشییەوە پێشوازی ئەم هەڵمەتەم کرد. کە دەمتوانی لە کاتی ناخۆشترین و گەرمترین کاتەکانی جەنگدا لە جیهانگیر بگەم و فێری جەنگی بکەم ئەو کوڕە لاوە لە تەکمەوە سواری ئەسپ بوو. بە گەرمییەوە چووە ناو کۆڕی ئەو پیاوانەوە، کە شەڕیان دەکردو شیریان دەوەشاندو دەیانقیژاند و هاوار و گرمەیان بوو. لە ڕاستیدا هەڵسوکەوتێکی زانایانە و شارەزایانەی لە کوشتاردا بەکاردەهێنا. ناوبەناو تەماشام دەکرد و سەرنجم دەدا دەمبینی بۆ دوژمنی نوێ دەگەڕێت و زۆر شارەزایانە ئەسپەکەی تاودەدا و چۆنمان فێرکردبوو ئاوەها بە جوانی و شارەزاییەوە هەڵمەتی دەبرد و شیرەکەی دەوەشاند و بەکاری دەهێنا. بەردەوام تەماشای منی دەکرد بۆئەوەی بیروڕای من بزانێت. من وام بۆ دەردەکەوت زیاتر گرنگی بەوە دەدا، سەرنجی من ڕابکێشێت و من شادومان بکات. وەك لەوەی گرنگی بە سەرکەوتن و زاڵبوون بەسەر دوژمندا بدات.

بەڵام من کاتی خۆم بە فیڕۆ نەدا و خۆمم بە تەماشاکردن و پێخۆشحاڵبوون بە کوڕەکەمەوە خەریك نەکرد.

موسا و هێزەکەی ماوەیەکی چاك لە ڕووماندا ڕاوەستان و بەرهەڵستی کردین. بۆئەوەی ماوە بدات بە هێزە سەرەکییەکەی لەشکرەکەی حسێن سواری ئەسپەکانیان ببن و ئامادەی شەڕ و کوشتاری جەنگ ببن.

هیچ چەند چرکەیەك تێنەپەڕی، دەشتەکە بە تەواوی پڕبوو لە لاشەی تێکچوانی خەڵکی و خوێن لە برینەکانیان دەچۆڕا و عارەقیان لێدەتکا و ئەو ناوە پڕبوو لە لاشەی ئەسپی کوژراو بریندار و دەیانزریکاند و دەیانحیلاند و گیانیان دەدا و مردار دەبوونەوە.

پێش نیوەڕۆ بە ماوەیەکی کەم ئاماژەم بۆ تیپی یەکەمم کرد، دوامکەون و بەرەو گردەکان کەوتەڕێ بۆئەوەی لەوێوە بە گشتی سەرپەرشتی جەنگ بکەین و بزانین چۆن دەڕوات بەڕێوە. بینیم ئەو سەرکەوتنەی کەیخسرەو و سوارە چینییەکە بەدەستیان هێنابوو، ئێستا لە دەستیان چووە.

بەرگریکەران و پارێزگەرانی حسێنیش لای ئەو چادرانەوە بوون کە بەرامبەر شارەکە بوو. هەروەها هێزەکەی لە هەموو لایەك جێپێی خۆیان کردبۆوە و تیا دامەزرابوون. زۆر بە ئاشکرا دیاربوو حسێن هێزێکی گەورە و ئامێرە جەنگییەکانی لەناوخۆدا باڵادەست و سەرکەوتوو بوو. هەروەها ئەسپی تەواویشیان هەبوو. منیش کە ئەوەم بینی شك و گومانم لەوە پەیداکرد. ئایا من دەتوانم بە هۆی ئەو پلانە جەنگییەی لەمەوپێش دامنابوو بتوانم بیشکێنم و بەسەریدا زاڵ ببم؟ وا بە خەیاڵمدا دەهات ئەو پلانە زامنی سەرکەوتنم بێت.

ئیلشی و موفا لە شوێنەکانی خۆیاندا باش خۆیان ڕاگرتبوو. بەڵام کەیخسرەو و سوارە چینییەکە لە هەڵوێستێکی خراپدا بوون. لە هیچ لایەکەوە هێزێکی پێویست و زامنم بەدی نەکرد، بتوانن بە تەواوەتی سەرکەوتن بەسەر حسێندا بێنن. ئیتر خێرا من تەتەرم بۆ لای ئەو هێزانەم نارد کە لەناو کۆڕی جەنگدا بوون و ناردم بۆ لای داود کە لەناو شاردا دامەزرابوو بەرگری لێدەکرد هەروەها ناردم بۆ لای ئەو هێزە یەدەکییەی لە قەدپاڵی کێوەکاندا بوون و فەرمان و ڕاسپاردەی خۆمم پێڕاگەیاندن.

هەر دوای ئەوە بینیم موسا و هێزە تایبەتییەکەی خۆی هێرش دەکەنە سەر لق و ئەو هێزەی ئیلشی کە نزیك بوون لە شوێنەکەی منەوە.

ئیتر منیش فەرمانم دا بە تیپە تایبەتییەکەم، کەوا پێویست دەکات هێرش بکەینە سەر ئاڵا هەڵگرەکەی موسا هەتا پێش ئەوەی فەرمان و ڕاسپاردەکانم بگاتە دەست سەرکردەکانی ترم.

جاکۆ و جیهانگیر لە دوامەوە بوون کە هێرشە کتوپڕییەکەم بردە سەر موسا هەرکە ئەو هێرشە کتوپڕییەم کردە سەر و لە نێوان ئەو دار و دەوەنانەی لێواری گردەکانەوە لێیان ڕاپەڕین و هاتینە پێشەوە بۆیان، ورەیان بەردا و لە ترساندا زیڕەیان کرد و کەوتنە لەرزین و کشاندنەوە.

موساش له هێرش و هەڵمەتکردنەکەیدا، لەگەڵ هێزەکەی ئیشیدا کشایەوە و زۆر بە قین و تووڕەییەوە بەرەو پیری من هات، بە شێوەیەك قینی هەستابوو ڕیشە سپییە درێژەکەی لەژێر چەناگە و ڕووە تووڕەکەیدا دەلەرزی و دەهات و دەچوو. شیرەکەم بۆ داهێنایەوە و بەو شمشێرە تیژە پیامدا کێشا، بەڵام لەسەر زینی ئەسپەکەیەوە خۆی لارکردەوە و لەو لێدانە توندەم خۆی ڕزگارکرد و بۆی دەرچوو. هەر لەو کاتەدا بە گورجی ئەسپەکەم وەرچەرخاندەوە بینیم، دوای لێدانەکەی من. پێش ئەوەی بتوانێت "واتە موسا" هێز و توانا و لەنگەری خۆی چاك بکات. جیهانگیر لێدانێکی بێوێنەی وای لێدا، لەسەر پشتی ئەسپەکەی خستییە خوارەوە و لەسەر گازی پشت کەوت و شیرەکەشی لە تەنیشتییەوە کەوتبوو.

خێرا جاکۆ ڕمەکەی خۆی دایەوە دەست جیهانگیر و هاواری لێکرد و وتی:

-جیهانگیر ها ڕمەکەی من بگرە و موسای پێ بکوژە.

ئەو کوڕە لاوە ڕمە قورسەکەی لێوەرگرت. بەڵام کە تەماشای چاوی موسای کرد و ئەو ترس و لەرزەی لە چاویدا دی و بە چاو دەپاڕێتەوە، لە کوشتنیدا بە گومان و دوودڵ بوو. ڕوویکردە جاکۆ و وتی:

-بەڵام موسا پیاوێکی پیرە.. با..

-ئەوە موسایە هەتا لە ژیاندا بێت باوکیشت لە خەتەریدا دەبێت.

-کەواتە جاکۆ هەردەبێت بیکوژم؟

-بێگومان جیهانگیر ئەوە شك و گومانی دەوێت..!!

ئیتر جیهانگیر تاوی ئەسپەکەی دا بۆ پێشەوە بە هەموو هێز و توانایەکییەوە سەری ڕمەکەی کردە موسا و سەری ڕمەکەی بە تەواوی لە سنگی دا چەقاند و لە پشتییەوە هاتە دەرێ و لە خۆڵەکەدا چەقی.

دوای ئەوە جاکۆ لەسەر پشتی ئەسپەکەی هاتە خوارەوە و بەرەو لاشەکەی موسا ڕۆیشت و سەری بڕی و ڕمەکەی لە سنگی موسا دەرهێنا، خوێنێکی گەش و زۆری لێدەتکا و ڕمەکەی دایەوە دەست جیهانگیر و سواری ئەسپەکەی بۆوە.

شەپوورەکانی داود لەسەر شووراکانی شاری کارشییەوە ئاگاداریان کردم بکشێمەوە، منیش کتوپڕ لەشکرەکەم بە گشتی بەرەو چیا و گردەکان کشانەوە و غارماندا. لە کاتی کشانەوەدا تیپەکەی من لە پێش هەموویانەوە بوو. ماوەی چەند چرکەیەك بە قەدپاڵی

چیاکاندا دەڕۆیشتین. پاشان لە دەربەندێکی تەسکدا ڕاوەستاین و لەوێوە بە چاکی کۆڕی جەنگ و کوشتارمان دەبینی. هێزەکانی حسێن بۆ ماوەیەکی کورت ڕاویان نان، بەڵام هەرکە شەپپووری شاهانەیان بۆ لێدرا و تێیدا داوایان لێکرا بگەڕێنەوە. زۆربەی زۆری ئەسپ سوارەکانیان ڕاوەستان و وازیان لە ڕۆنانمان هێنا و گەڕانەوە دواوە.

ئەم پاشەکشە و کشانەوەیەی ئێمە وەك سەرکەوتنێکی گەورە وابوو بۆ حسێن.

ئەوکاتە جیهانگیر بە نائومێدی و دڵەڕاوکێیەوە لێی پرسیم وتی:

-باوکە.. ئایا ئەم جەنگەمان دۆڕاند؟

تەماشایەکی ئەو کوڕە لاوەم کرد، بینیم ڕووی زەردهەڵگەڕاوە و نائومێدی پێوە دیار بوو. بە شێوەیەکی دڵنیاییەوە وەڵامم دایەوە:

-کوڕم هێشتا جەنگمان نەدۆڕاندووە و نەشکاوین.

ڕوومکردە دەشتەکەو بینیم پڕبوو لە لاشەی کوژراو و برینداروو ئەسپی مردارەوەبوو. پاشان بۆ ئەوەی جیهانگیر دڵنیا بکەمەوە ڕووی دەمم تێکردو وتم:

-بەڵێ کوڕم.. هێشتا جەنگمان لەدەستنەداوەو نەشکاوین و ئێمە هیچ کات ناشکێین و هێزەکەشمان لەناوناچێت.

وتی: کەواتە کەی دووبارە هێرش دەکەینەوە؟

وتم: کوڕم، بەم زووانە.. تۆش باش بەرگەت گرت و لەگەڵ ئەوەشدا ئەمڕۆ لە ژەمێك زیاتر نانت نەخواردووە. ئێمەش پێش ئەوەی هێرش بکەینەوە نان دەخۆین. ئیتر تۆش هەست بە برسێتی و ئازار ناکەیت.

وتی: باوکە، من حاڵم زۆر باشە و هیچ برسیش نیم.

مستی لەسەر ڕمەکە بەرزکردەوە و بە لەپی دەستی ڕاستی، کە سوور و خوێناوی بوو بە خوێنی موسا دەمی سڕی.

ئینجا پێموت: کوڕم ئەگەر تۆ هیلاکیت پێویست ناکات بگەڕێیتەوە بۆ شەڕ.

بە پاڕانەوە وەڵامی دامەوە:

-باوکە من حاڵم زۆر چاکە و هەر لەگەڵتدا بۆ شەڕ و کوشتار دەگەڕێمەوە. تۆزێکی تر چووینە ناو چیاکانەوە و بەو هێزە یەدەکییەی هێزەکانم گەیشتین. سەربازەکانی خواردنی زۆر و زەوەند و ئەسپی حەساوەی زۆریان پێبوو. لە کاتی نانخواردنماندا، دەنگوباسیان پێڕاگەیاندم کە هەندێك هێزی تر لە هێزەکانم پاشەکشیان کردووە و هاتوونەتە دواوە و

پاش ماوەی کاتژمێرێکی تر و دوای حەسانەوەیان خۆیان تەیار و ئامادە دەکەنەوە. هەرچی تەتمر و هەواڵ قۆزیشم هەبوو ماوەیەکی زۆر لامان مانەوە بۆئەوەی گوێی خۆیان پڕبکەن بەو دەنگوباس و هەواڵی کوشتنەی موسا. بۆئەوەی پیرۆزبایی و دەستخۆشی ئازایەتی و سوارچاکی لە جیهانگیر بکەن.

ئیتر دوای ئەوە ڕۆیشتن بۆئەوەی دەنگوباس و ڕێنماییەکانم بگەیەننە سەرکردە و هاوپەیمانەکانم.

منیش گەڕامەوە ئەو شوێنەی تەماشا و چاودێریم لێوە دەکرد.

بێگومان حسێن وا تێگەیشت گوایە لەم شەڕەدا سەرکەوتووە و منیش زۆر بە خراپی تێکشکاوم و سەربازەکانیشم بە تەواوی ورەیان بەرداوە. حسێن زنجیرەیەك هێزی پاراستن و بەرگری لە نێوان چادرەکانی خۆی و چیاکاندا دانا. ئێمەش ئەوەمان لا ڕوون و ئاشکرا بوو حسێن لەو باوەڕەدا نەبوو، وە بە خەیاڵیشیدا نەدەهات، بە تایبەت ئەو ڕۆژە هێرشێکی تری بکرێتەوە سەر. گەڕانێکی چاوپێکەوتنی بەو شوێن و ناوچانەدا کرد کە زۆربەی شەڕو کوشتارەکانی تێدا ڕوودابوو، چونکە ماوەیەکی دوور و درێژ چاوی گێڕا و تەماشای شووراکانی شاری کارشی کرد. من بیروڕام هاتە سەر ئەوە نەخشە و پلانێکی نوێ بۆ هێرشکردنە سەر شارەکە دادەنێت، پاش لەوە تێگەیشت و زانی بە ڕاستی زۆربەی زۆری هێزەکانم لە دەرەوەی شووراکاندان.

کاتێك حسێن گەیشتبووە لای کۆتایی هێڵی پاراستن و بەرگری هێزەکانیەوە، ئا لەو کاتەشدا سێبەری چیاکانی باکوور دەیدا لە جەمسەری چادرەکانی.

منیش بە تەواوی لەو کاتەدا دەستمکرد بە هێرش و هەڵمەتی کتوپڕ و گورجکبڕی دووەمم.

هێزەکانم گورج بێ تەپڵ لێدان و دەنگی شەیپوور و بێ هیچ ئاماژەکردنێك دووبارە سەربازو پیاوە جەنگاوەرەکانم لە چیاکانەوە دەرپەڕینە دەرێ و یەکسەر بێ ڕاوەستان بەرەو ناوەڕاست و لە بەردەم شاردا وەك یەك هێزی پتەو ڕاوەستان و دەست لەسەر چەك ئامادە بۆ هێرشکردن و هەڵمەتبردن.

داودیش شوورا و قولەکان و سەنگەرەکانی دایە دەست جووتیار و پاڵەکان و ژمارەیەکی کەمی جەنگاوەران و خۆشی لەگەڵ هەزار جەنگاوەردا لە شار هاتنە دەرەوە. ئاوەها ئەگەر ئەم هێرشەم بەراورد بکەین لەگەڵ هێرشەکەی پێشووماندا دەردەکەوت ئێستا هێزێکی

گەورە و شارەزاترم هەیە لە چاو هێرش و هێزەکەی یەکەمم و لەگەڵ ئەوەشدا سوودی زۆرمان لە ڕێگای هێرشی کتوپڕی وەرگرت.

منیش لەم هێرش و هەڵمەتە کتوپڕی و خێرا و جەرگبڕەمدا، ئومێد و چاوەڕوانی سەرکەوتنی گەورەم دەکرد.

هەموو ئامانجی من ئەوە بوو پەیوەندی نێوان حسێن و ئەو هێزانەی لەناو چادرەکاندایە، بپچڕێنم. بۆم دەرکەوت ئەم هەڵمەت و کارەم زۆر بە سوود و سەرکەوتووە. چونکە حسێن زۆر بە خۆی دەنازی و خۆی بە سەربەرز و ئازا و گەورە دادەنا. لە جیاتی ئەوەی بچێتە ناو هێزەکەی خۆی و کاروباری شەڕ و بەرگری جێبەجێ بکات. یەکسەر خۆی دێت بۆئەوەی هێرش بکاتە سەرم و بەرهەڵستی هێزەکەم بکات. هیچ نیو کاتژمێری نەخایاند، فەوجێکی تەواوی من لە نێوان حسێن و چادری هێزەکانیدا، دامەزرا و خۆیان بۆ جەنگ و هەڵمەتبردن ئامادە کرد.

هەر ئەوەندەم زانی حسێن خۆی پێڕانەگیرا و یەکسەر بەرەو باشوور هەڵات و بۆی دەرچوو.

ئیلشی هات بۆئەوەی هێرش بکاتە سەر پاسەوانەکانی پاشەکی هێزەکەی حسێنەوە. بۆئەوەی ڕێ بۆ من خۆش بکات تاکو بتوانم لەگەڵ کۆمەڵێک جەنگاوەردا دوای حسێن بکەوم.

چونکە من لەو باوەڕەدا بووم هێزەکانی دوژمن هەر خۆیان دەدەن بە دەستەوە، چونکە وا تێگەیشتوو بووم و زانیبووشم زۆربەی زۆری سەرکردەکانی حسێن کوژرابوون.

ئیتر منیش ڕمێکم بەرزکردەوە و سەرەبڕاوەکەی موسام کرد بە سەری ڕمەکەدا. جیهانگیر ئەم کارەمانی پێ خۆش نەبوو". پاشان ڕمەکەم دایە دەست یەکێک لە سەرکردەکانی ئیلشی.

هەروەها جەنگاوەرێکی کوژراویشم هەڵبژارد کە زۆر زۆر لە حسێن دەچوو. سەری ئەویشم بڕی و بە ئیلشم ڕاگەیاند و پێم وت:

ئەم دوو سەرە بەرزبکەرەوە و بەرەو ناوجەرگەی هێزی دوژمنیان بەرە و داوایان لێبکە، خۆیان بدەن بە دەستەوە.

منیش دوای ئەوە فەوجێک لەو سەربازە جەنگاوەرانەی لە نزیکمەوە بوون، کۆمکردنەوەو دوای حسێن کەوتم.

* * *

# كوژرانی حسێن

دوای شەوێکی تەواو غاردان و ڕاکردن و ماندووبوون، بۆم دەرکەوت من ناتوانم بگەمە حسێن و بیگرم و لەناوی بەرم. هەتا ئەگاتە ئەو شوێنەی دەیەوێت بچێتە ناوی و تیادا ڕاوەستێت. بەو ڕێگایەی گرتبوویە بەری و پیادا ڕایدەکرد، تێگەیشتم بەرەو بالخ ڕادەکات و دەیەوێت "بایان" بیگرێتە خۆی و بیپارێزێت.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من دوودڵ و بەگومان بووم، لەوەی ئایا بایان دەتوانێت بەرهەڵستییەکی توندوتیژ بکات. چونکە بایان "ئەو جەنگاوەرە پیرە" بە هەمان ڕێگادا دەڕوات کە موسا پێیدا دەڕۆیشت. لەم ساڵانەی دواییدا تەنها هەموو خەم و خەیاڵێکی سەرەکی ئەوە بوو، لەگەڵ ژنە زۆر و جۆراوجۆرەکانیدا ڕابوێرێت و لە خۆشی و ئارەزووی ڕابواردندا بێت.

منیش بەردەوام لە نزیکییەوە دوای حسێن کەوتبووم، و ڕاوم دەنا بۆئەوەی مەجبووری بکەم بە درێژایی شەو و ڕۆژ ڕابکات و نەحەسێتەوە، و ڕێگای ئەوەی پێنەدەم کاتێك دەگاتە بالخ بتوانێت خۆی کۆبکاتەوە و بەرهەڵستیم بکات. منیش بە ئەنقەست و بە هەوەس لە ڕۆیشتنەکەمدا خۆم دوادەخست بۆئەوەی ماوە بدەم بە هێزە یەدەکییەکەم و کاروانی زەخیرە و خواردەمەنی، کە پێمبگات و بێتە پاڵم پێش ئەوەی خۆم بگەمە بالخ بۆئەوەی ئەگەر حسێن و بایان هێزیان کۆکردەوە، و بەرهەڵستیان کردم و پێویست بە گەمارۆکردن بکات.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، پێش ئەوەی حسێن بگاتە شارەکە پێی گەیشتم و شانبەشان پێکەوە لە هەمان کاتدا گەیشتینە ناو شارەکە و حسێن بە هەموو جۆرێك هەوڵیدەدا و دەیویست بگاتە قەڵاکەی بایان، منیش ڕێگام لێگرت و نەمهێشت ڕایوەستێنم و بیگرم. لە پلان و هەوڵەکەمدا سەرکەوتم و لە نێوان ئەو و قەڵاکەی بایاندا ڕاوەستام و ڕێم لێگرت.

بەڵام لە شەقامە تەسکەکانی ناو شاردا لێم ون بوو..!!

چونکە من وەك شەرکەرێك چوومە ناو شاری بالخەوە، وەك میوان نەچووبووم. سەرنجم دا بایان تەواو ڕووگرژ و تووڕەیە. بۆشم دەرکەوت بە کردەوە هەموو هێزەکانی بالخ لە شەڕی کارشیدا دژ بە ئێمە چووبوونە پاڵ هێزەکانی حسێنەوە. تەنها بەشێکی زۆر کەم مابوونەوە بۆ پاسەوانی کۆشك و تەلارەکانی بایان.

لەبەرئەوە جگە لە شەڕێکی کورت زیاتر کە لە دەوری قەڵاکەدا ڕوویدا و لەو شەڕەدا بایانی تێدا کوژرا. ئێمە هیچ بەرهەڵستییەکمان تووش نەهات. هەر دوای ئەوە جەنگاوەرەکانی من

دەستیان بەسەر هەموو شاردا گرت. منیش لە کۆشك و میرنشینەکەی بایاندا خۆم کرد بە شا. عەبدوللا گورج کاروباری بۆ ڕێکخستم و خۆشی کرد بە سەرەك پەردەلادەری بارەگای شاهانە و دەعوات و ئاهەنگێکی وای ساز کرد، شایانی هەموو شاهێنشاهێکی گەورە بێت.

منیش هەرچی ئەفسەر و گەورەپیاوێك کەوا لەگەڵمدا بوون، بانگم کردن بۆ لای خۆی و فەرمانم دا هەرچی ژن و کچێکی هەرچی شازادە و سەردارێك هەیە بیانهێنن بۆ لامان بۆئەوەی ئاهەنگ و خۆشییەکی قەشەنگ لەگەڵیاندا سازبکەین. گەرچی ئێمە هەموومان زۆر هیلاك و ماندوو بووین، هەتا نیوەشەو بە ئاهەنگ و سەما و خۆشییەوەماینەوە.

سەربازەکانیشم لە شاردا پاداشتی خۆیان وەردەگرت.

دوای ئەوە هەرچی میوانێکم هەبوو نیزنم دان و خۆم چووم بۆ حەرەم و جێگانووستنی ژنەکانی بایان ئەو ژنانەی کە تاکو ئێستا ڕێم نەدابوو، کەس دەستیان بۆ بەرێت و لە ڕێز و گەورەییان کەمبکەنەوە.

هەرکە لە دوای پاسەوانەکەی کۆشکی شاهانەوە ڕۆیشتم بۆ هۆڵێکی تر کە لەو هۆڵەوە دوورتر بوو کە ئێمە ئاهەنگمان تێدا دەگێڕا، لە ڕێگا گوێم لە دەنگی میوانەکانم بوو، دەڕۆیشتن و پێدەکەنین و قاقای پێکەنینیان لەگەڵ دەنگ و پێکەنینی ژنەکاندا تێکەڵاو دەبوون.

هەرکە نزیك ژووری نووستنەکانی ژنەکانی بایان دەبوومەوە بۆئەوەی بچم بۆ لایان تەپەتەپی دڵم و لێدانی دڵم زیادی دەکرد. چونکە لەو ڕۆژەوە کە دڵشاد بۆ دواجار بۆ کۆشکی سپی هات بۆ لام، ئیتر دوای ئەوە زۆر بە کەمی و دەگمەن دەستم بۆ ژن بردبوو. هەروەها ئەو تێکۆشان و هەوڵدانەم بە تەواوی گیانمی شەکەت و ماندوو کردبوو. هیچ ئارەزوویەکی جنسی و ڕابواردنم نەمابوو. لە کاتی تێپەڕبوونمدا بەلای ژوورەکاندا، هیچ گرنگی و سەرنجێکی وام نەدا بەو کەلوپەل و ڕاخەرە جوان و ڕازاوانەی لەناو ژوورەکاندا هەبوون.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، لە کاتێکدا ئەو دوو پاسەوانە ڕەشە خەسێنراوە گەورانە فەرمانی بە ژنەکان دا، خۆیان ئامادە بکەن و منی بە شێوەی گەورە و سەرداری نوێی شارەکە پێشکەش کردن. نەمتوانی لە تەماشاکردن و سەرنجدانی ئەو دەرگا زێڕینە و ئەو تووڵە زێڕینانەی کەوتبووە ئەولای هۆڵەکەوە مەست نەبم و سەرنجی نەدەم.

ئەو دوو کۆیلە ڕەشە خەسێنراوە درێژانە شیرە جوانە درەوشاوەکەیان لەبەردەم خۆیاندا ڕێك بەرزکردەوە و بۆئەوەی سڵاوی لێبکەن و ڕێزم بگرن. بە ڕوویەکی گەشەوە پێکەنین و بە ڕاستی و گەرمییەوە پێشوازیان لێکردم.

لەولای ژوورەکەوە گوێم لە خشەی کراسی ئاوریشم و دەنگی پێ و پێڵاوی ئاسك بوو. کاتێك بەو کلیلەی لە گیرفانی بایان دەرمهێنابوو، دەرگاکەم کردەوە، بینیم زیاد لە بیست چاو لە تووڵەکانی پەنجەرەکەوە تەماشام دەکەن. هەرکە تۆزێك هەنگاوم ناو چوومە پێشەوە کیژەکانم بە خێراییەکی سەیرەوە لەبەردەممدا ڕیانکرد. دوای ئەوە دەرگاکەم داخست و بە ڕاڕەوێکی کورتدا ڕۆیشتم. ئەو ڕاڕەوە هیچ کەسێکی تێدانەبوو. بەڵام بۆنی عەتر و گوڵاو و میسکی ئەو ژن و کچانەی لێ بەرزدەبۆوە کە لە پێش چاو و دەممدا هەڵاتن.

ئەو ژوورەی چوومە ناوی بینیم مافووری عەجەمی شاز و نایاب و جوانی تێدا ڕاخراوە و بە چرا و مۆمی گەورە و جوان ڕۆشن کرابۆوە.

دیوارەکانیشی بە وێنەی جوان و دەگمەن و پەردە و قوماشی ئاوریشمی گرانبەها ڕازابۆوە. ئەو فەرش و پەردە و قوماش و تابلۆ و وێنانە، یان لە گەورەترین و جوانترین و بەشەرەفترین کۆشك و شانشینەکانی ئاسیادا کڕدراوە، یاخود تاڵان و بڕۆ کراون. بەڵام ئەوەی هەناسە و پشووی لە مرۆڤ دەبڕی و وای لێدەکرد سەرسام و حەپەساو بووەستێ، ئەو کۆمەڵە ژنە گەنجە جوانانە بوون، کە جوانترین و گرانبەهاترین جل و پۆشاکیان لەبەردا بوو.

لە ژوورەکەدا بە شێوەیەك ڕاوەستابوون بۆئەوەی کارێکی گەورە و گران بکەنە سەر ئەو کەسەی تەماشایان دەکات.

کاتێك من چوومە ژوورەوە بۆ لایان. ژنەکان حەپەسان و سەیریان لێهات. نیو چرکە زیاتری خایاند، هیچ قسەیان نەکرد و بێدەنگ بوون و خۆیان ئامادە کرد بێنە پێشەوە بۆ لام و لە بەردەممدا سەری ڕێز و نەوازشم بۆ دابنەوێنن. پاش ئەوەی فەرمانم پێدان پەچەکانیان لابەرن. ڕاوەستان و هەموو تەماشای منیان دەکرد. هەرکە بینیان من لە گەورە و خاوەنەکەی پێشوویان گەنجترم و پێنج شەش پەنجەش لەو درێژترم. لە کاتێکدا من تەماشای لەشولار و جوانییانم دەکرد، ئەوانیش بە سەیرو شەیداییەوە تەماشای منیان دەکرد.

لە کاتێك لە کاتەکانی لەخۆباییبوون و شادومانیمدا، هەستمکرد ئەوانیش هەموو شاد و پێخۆشحاڵن بەوەی بینیان. کاتێك بەرەو ئەو جێگا نەرم و نیانە جوانە ڕۆیشتم کە لە ناوەندی ژوورەکەدا بایان بۆ حەز و ئارەزووەکانی ئامادەی کردبوو، تێیدا بەسەریبەرێت، هەوڵم دا شەلییەکەی خۆم بشارمەوە و نەهێڵم بزانن من شەلم. ئەو شەلییەی هەموو کات وا تەماشام دەکرد بیرەکانی سەردەمی سەرکەشی و نەزانینی لاوێتیمی وەبیر دەهانیمەوە، و پاراستن و بیرەوەرییەکی سەرەکیشم بێت بۆئەوەی ڕێم پێنەدەن جارێکی تر هەڵەشەیی و هەڵەکانی

ڕابوردووم دووپات بکەمەوە. هەرکە دانیشتم هەندێك لەو کچانە هاتن و ئامێری مۆسیقاکانیان گرت بە دەستەوە دەستیانکرد بە لێدانی ئاوازێکی بەزمی سەماکردنی فارسی خۆش و جوان، دە کچی تریش تیپێکی سەماکردنیان پێکهێنا و دەستیانکرد بە سەما و خۆبادانێکی ئەفسووناوی ئەوتۆ دڵ و دەروونی ڕادەکێشا.

ئەو کچ و ژنانەش سەمایان نەدەزانی لەسەر قاپی زێڕین میوە و مەی و خواردەمەنی جۆراوجۆریان دەهێنا. یان لەسەر ئەو کورسییانەی لە دەوری جێگا نەرم و خۆش و بەرزەکەی منیان دانابوو لە نزیکمەوە دانیشتن، چونکە من لەمەوپێش خواردن و خواردنەوەم خواردبوو، تێربووم، ناوبەناو و لەسەرخۆ هەندێ جار حەلْواو میوەم دەخوارد و کەمێك مەیم دەخواردەوە. کچەکانیش زۆر بە جوانی و ڕێکوپێکییەکی بێوێنەوە لەبەردەممدا سەمایان دەکرد و خۆیان بادەدا. چونکە ئەم خۆشی و ئاهەنگە لەبەر ڕێز و گەورەیی و پێشوازیکردنی من بوو. منیش حەزم نەکرد ڕێگای ئەم خۆشی و ئاهەنگەیان لێبگرم. لەبەرئەوە بەزم و ئاهەنگەکەیان تا زەردەپەڕی ئێوارەی خایاند. ئیتر ئاوەها هێشتا بیری جەنگ و دواکەوتن و گەڕان بە دوای حسێندا چارەسەر نەکرابوو هەروەها کاروبارەکانی تر ورده ورده خەریکبوو لە بیر و مێشکمدا نەمێنێ و بیربچێتەوە.

وا مەست ببووم یاخود هەڵخەڵەتێنرابووم، هەموو جیهانێکی ترم بیرچووبۆوە، جگە لە جیهانی ژن و باخەڵ و ڕابواردنیان نەبێت.

پاش ماوەیەکی درێژخایەن، بەرنامەی بەزم و ئاهەنگ کۆتایی هات. ئیتر ژنان ڕاوەستان و نیشانەی ئارەزوو، و بەربەرەکانی لە ڕووە جوانەکانیاندا دیاربوو. منیش بە دەستەکانم چەپڵەیەکم لێدا، خێرا ئەو ژنانەی تاکو ئێستا ڕێز و حەیا و حورمەتی خۆیان پاراستبوو، هاتنە پێشەوە بۆ لام و بە شێوەی بازنەیەکی تەواو، لەبەردەممدا ڕاوەستان. بە شێوە فەرمانێك پێم وتن:

-لەکانتان دابکەنن و لەشولاری خۆتانم پیشان بدەن!!

بە یەك جووڵە و لە یەك کاتدا جلەکانیان لەبەرداکەندرا لەبەر قاپی ئەو پەریانەدا کۆمەڵ بوون.

لە کاتێکدا ئەو هەموو جوانی و شۆخ و شەنگییە بێوێنە و ئاوازانەیانم بینی وا لەبەردەممدا قوت بوونەتەوە. لە ڕاستیدا هەوڵێکی زۆرم دا بۆ ئەوەی لەو کیژانە ئەو سەرسووڕمانە زۆر و گەورەیەم کە بەسەرمدا هات بشارمەوە. هەر کتوپڕ تێگەیشتم من ناتوانم کەسیان هەڵبژێرم. چونکە ئەوەی کەمترین لەش و لاری جوانی و سەرنجراکێش بێت لەم بازنەیەدا لە ڕاستیدا لەشولارێکی جوان و پڕو شۆخ و شەنگ و قەشەنگی هەبوو. هەر کە کیژەکان لەبەردەممدا بە

هێواشی جوولان و خۆیان وەردەچەرخاند بۆئەوەی جوانی لەشولاری خۆیان بە جوانی و باشتر دەربخەن. هەستم بە هەژان و ئارەزوویەکی گەرم و زۆر کرد. چونکە سەرنجم دا هەموو چاوەکان بە گەرمی و ئارەزووەوە تەماشا و سەرنجی جوولە و دەربڕینی ڕووم دەکەن. و زۆر بە بێ قەرارو بێ ئارامییەوە چاوەڕوانی بڕیاری هەڵبژاردنەکەی من دەکەن. لە کاتێکدا چاوم دەگێڕا بەناو ئەو کیژە جوانانەدا، هەوڵم دا خۆم ڕاگرم و چاو و ڕووم بە هیچ جۆرێك نەگۆڕم و تێکی نەدەم.

بەڵام هەندێ جار چاو و ڕووم دەدا بە یەکدا و ڕووی خۆم گرژ دەکرد، ئەویش لەو کاتەدا نا، کە ڕێك و ڕەوان تەماشای کچێکم دەکرد. یان بۆئەوەی ئارەزووی خۆم دەربڕم. چونکە من هەستم بە ئارەزوویەکی زۆر زۆر دەکرد و خوێن بە هەموو دەمارەکانمدا تێپەڕی دەکرد.

ماوەی کاتژمێرێکی تەواو بەم جۆرە مامەوە و نەمدەزانی چ ژنێکیان هەڵبژێرم. بەڵام یەکێك لە ژنە ئازا و بەغیرەتەکان، ئەو خۆی منی بۆ خۆی هەڵبژارد. و بە زۆری خۆی، خۆی سەپاند بە سەرمدا و.. لە کۆتاییدا هەرکە خەوم لێکەوت هەستم بە حەساندنەوە و دڵنیاییەکی بێوێنە کرد. لە خەو خەبەرم نەبۆوە تا نیوەڕۆی ڕۆژی دوایی.

هەرکە خەبەرم بۆوە خێرا گورج خۆم گۆڕی و ڕامکرد بۆ بارەگاکەم لە کۆشکەکەدا بۆ تەماشاکردنی کاروباری دەوڵەتەکەم.

ئەفسەر و سەردارەکانم هیچیان لەوێ نەبوون. بەڵام ئیمامێکی چڵکن و ناشیرین لە ئیمامی مزگەوتە بچووکەکانی بالخ لە ژوورەکەدا "بارەگاکەم" بە تووڕەییەوە دەهات و دەچوو. لەبەرخۆیەوە هەندێ ڤین و تووڕەیی و نەفرینی خوای دەوتەوە. هەر کە ئەو ئیمامەم بینی، لێم پرسی وتم:

-ها ئەی ئیمام چیت دەوێت؟ چ ئیشێکت هەیە پێم بڵێ؟

-ئەی بەڕێز شازادە تەیموور. سەردار و گەورەی نوێی بالخ من لە لایەن ئەمیر حسێنی شاهێنشا و شازادەی سەمەرقەند و خزمەتکاری..

-لە لایەن حسێنی تالانکەری مزگەوت و ڕاکردوو لەدەست تەیموورەوە هاتوویت؟ باشە چیت دەوێت؟

-گەورەم شازادە تەیموور، حسێن دەیەوێت لەگەڵتا پەیمان ببەستێت.. و لەگەڵتا هاوبەشی پاراستنی سەمەرقەند بکات..

-بەڵام حسێن چۆن دەتوانێت هاوبەشی پاراستنی شتێك بکات کە خاوەنی ئەو شتە نەبێت؟ من خاوەن و پارێزەری سەمەرقەندم و ڕێگاش بە کەس نادەم هاوبەشی پاراستنم لەگەڵدا بکات..

بڕۆرەوە بۆ لای و ئەمەی پێبڵێ.. وە پێشی بڵێ من دوای دەگەوم و بەدوایدا دەگەڕێم هەتا دەیگرم و لەبەر ئەو ناپاکییەی دەرحەق خاقان و ئەو ناپاکییە ناشیرینەی دژی ئاینی پیرۆزی ئیسلام و محەممەدی پێغەمبەر کردوویەتی سەری دەپەڕێنم. ئەی ئیمام تێگەیشتیت؟ کەواتە برۆ..

وتی: بەڵام گەورە و سەروەرم تەیموور، گەورە و پارێزگاری سەمەرقەند ئەمە هەموو شتێك نییە.. هێشتا شتی تر ماوە.

وتم: زۆر چاکە، ئایا هیچ شتێکی تر هەیە؟ شتی تر چییە؟ پێم بڵێ..

وتی: شازادە حسێن دەڵێت خۆمت تەسلیم دەکەم!!

وتم: ئایا بە ڕاست دەیەوێت خۆی بدات بە دەستمەوە؟ باشە چ مەرجێکی هەیە؟

وەڵامی دامەوە: بەڵێ گەورەم حسێن دەیەوێت خۆی بدات بە دەستتەوە لەبەر خاتری خوشکەکەی ئەلجای خوالێخۆشبوو، ژنە خۆشەویستەکەت ئەگەر تۆ ڕازی دەبیت لەگەڵتدا هاوبەشی پاراستنی شاری سەمەرقەند بکات.

وتم: من قایل نیم و گوێ لە قسەشی ناگرم، پێی بڵێ من زمانی دەبڕم، چونکە ناوی ئەلجای خوشکی هێناوە.

وتی: کەواتە هەر خۆی دەدات بە دەستەوە و خۆی دەخاتە ژێر سایە و بەزەیی خوا و تۆوە. ئەو دەڵێت شازادە تەیموور، ئەو دوژمنانە ناکوژێت کە خۆیان دەدەن بە دەستییەوە.

وتم: خەڵکی ئەمە دەربارەی من دەڵێن و ڕاست و بێگومانە، من ئەو کەسانەی خۆیان دەدەن بە دەستمەوە نایانکوژم. لەبەرئەوە بڕۆرەوە بۆ لای حسێن و ئەمەی پێبڵێ.

وتی: گەورەم شازادە تەیموور خوا سەرکەوتوو و تەمەن درێژت بکات. منیش دەڕۆمەوە و قسە و ڕاسپاردەکانی تۆ بە شازادە حسێن ڕادەگەیەنم.

وتم: زۆرچاکە.. بڕۆرەوە بۆ لای و پاداشتی خۆتی لێوەربگرە..

ئیمامەکە زۆر بە ڕێزەوە سڵاوی کرد و خواحافیزی کرد و پاشەوپاش کشایەوە. عەبدوڵلاش دەرگاکەی بۆ کردەوە و چووە دەرەوە. بەسەر ئاماژەم بۆ عەبدوڵلا کرد هەتا لە کۆشکەکە بە تەواوی دەچێتە دەرەوە بەدوایەوە بە.

پاش چەند چرکەیەك جاکۆ و نوورەدین و پاشان سەیفەدین هاتن و جیهانگیریشیان لەگەڵ خۆیاندا بۆ ئەو ژوورەی تیایدا دانیشتبووم هێنا.

جاکۆ کە یاریدەدەری من بوو لێم پرسی:

-جاكۆ هەواڵ و دەنگوباست دەربارەی كارشی چییە؟

وەڵامی دایەوە: پلانەكەت سەركەوتوو بوو، ئەو مەبەستەی ویستمان بەدی هێنا. هەر كە ئیلشی سەری موسا و ئەو سەرەی وتمان سەری حسێنە بە ڕمەكان بەرزی كردنەوە و بەرەو كۆڕی جەنگ و دوژمنان بردنی، پیاوەكانی حسێن دەستیان لە شەڕ كێشایەوە چەكەكانیان دانا و خۆیان دا بە دەستەوە هەرچۆنێك بێت لە بەیانییەوە شارمان جێهێشتووە.

وتم: زۆر چاكە، هیچ دەنگوباس و شتێكی تر هەیە..؟

وتی: داود گەڕاوەتەوە بۆ ناو شار و هەرچی دیلێكیش هەیە بردوونی بۆ ناو شار. هەروەها منغالی بۆغاش لە شەهری سیبزەوە كاروباری پاراستنی شار دەباتبەڕێوە.

سوارە چینییەكە "خیتای"یش وا بەڕێوەیە و بەرەو سەمەرقەند بۆ ئەوەی بچێتە ناوی و دەستی بەسەردا بگرێت و بیپارێزێت.

لێم پرسی وتم: ئەی دەنگوباس و زانیاریت دەربارەی حسێن چییە؟ خۆشم لەوە دڵنیا بووم كەس هیچ دەربارەی ئەو ئیمامە نازانێت و هیچیش لەو قسە و ڕاسپاردانەی كە حسێن پیایدا بۆی ناردبووم نازانن.

وەڵامی دامەوە و وتی:

-گەورەم دەربارەی ئەو هیچ نازانم. ئێستا ئیلشی و موفا تیپەكانی خۆیان دێنن بۆ باڵخ و هەركاتێك گەیشتن، ئێمە شار، ماڵ بە ماڵ دەگەڕێین. هەروەها منیش هەموو دەرگا و ڕێگایەكی هەڵاتنم لێگرتووە. دوای ئەوە سەیفەدین تەماشای كردم و لێی پرسیم وتی:

-ئەگەر بیگرین تۆ چی لێدەكەیت؟

وتم: ئەوكاتە سەردار و شازادە و زانا ئاینییەكان بانگەواز دەكەم بۆ كۆبوونەوەیەكی گشتی و گفتوگۆكردن و بڕیاردان لەسەر ئەوەی چی لێبكەین.. بڕیارێكیان دا ئەوا ئێمەش لەسەر ئەو بڕیارە دەڕۆین. ئێستاش سەربەخۆیی وڵاتی تەتەر لەژێر هەڕەشەیەكی ترسناكدایە..

وتی: تۆ بە بڕیاری شازادە و زانا ئاینییەكان قایل دەبیت؟

وتم: بۆچی.. نا؟ من دڵنیام لەوە بڕیارەكەیان دژی بەرژەوەندی گەلی تەتەر و سەربەخۆیی تەتەر نییە.. ئایا وا نییە؟

جاكۆ ددانی جیڕكردەوە و پێی وتم:

-كۆمەڵی زانایان و سەردار و شازادەكان تۆ بۆ سەركردە و فەرمانڕەوای گشتی هەموو وڵاتی تەتەر هەڵدەبژێرن..!!

-منیش ئەوەم دەوێت کەوا بکەن. بەڵام ئەوەش بزانە، مامە، ئەگەر بمەوێت دەتوانم بە زەبری شمشێرەکەم تەختی شاهانە بەدەست بێنم.

-تەیموور من لەوە دڵنیام تۆ دەتوانیت ئەوە بکەیت. بەڵکو دڵنیام کە هەر ئێستا دەتوانیت ئەوە بکەیت.

-مامە من دڵنیام و توانای ئەوەم هەیە، بەڵام وا پێویست دەکاتە سەرم ئێستا نوێنەر و تەتەری خۆم بنێرم بۆئەوەی داوا لە گشت سەردار و شازادەکان بکەن بێن بۆ ئێرە بۆ کۆبوونەوەیەکی گشتی و سەرانسەری. هەروەها نامەش بۆ ئیمام زەینەدین دەنێرم بۆئەوەی داوا لە هەموو گەورە زانایانی ئاینی مزگەوتەکان بکات و لەگەڵ خۆیدا بیانهێنێت بۆ شاری باڵخ. ئیتر دوای ئەمە پێشوازی گەورەپیاوان و میوانەکانی ترم کرد.

ئێوارەی ئەو ڕۆژەم بە پێکهێنانی دەوڵەتەکەم لە شاردا بردە سەر.. و هەر بەردەوام خەریکبووم بە کاروبارەوە تا کاتی نانخواردنی ئێوارە هات. نانی ئێوارەم نەخوارد تا کاروباری ڕۆژو هەرچی کێشەیەك هەبوو هەموویم جێبەجێ کرد. ئیتر دوای ئەوە ڕۆیشتم بۆ حەرەم بۆ لای ژنان.

ئەو ژنەم بیرکەوتەوە کە ناوی نۆبجا بوو.

لە جیاتی ئەوەی بچمە هۆڵی گەورە -هۆڵی ئارەزووخۆشی و ڕابواردن- داوام لە یەکێك لە نۆکەرە کۆیلە خەساوەکان کرد، بمباتە ئەو ژوورە بچووکەوە کەوا کەلوپەل و مافووری نایاب و جێگا نووستنێکی نەرم و نیانی تێدابوو. هەروەها داوام لێکرد بچێت بۆ لای نۆبجا و بۆم بنێرێت..

کاتێك ناوی نۆبجام هێنا ئەو خەسێنراوە ڕەشە گەورەیە، بە چەپەڵی و بێ ئەقڵی و گێلییەوە قاقا بە خۆشییەوە پێکەنی.

جلەکانم داکەند و لەسەر جێگاکەم بۆ چەند چرکەیەك پاڵکەوتم، بۆئەوەی تۆزێك ماندوێتیم دەرچێت و بحەسێمەوە.

زۆر بە بێ ئارامی و چاوەڕوانییەکی زۆرەوە چاوەڕوانی هاتنی نۆبجام دەکرد. بەڵام هیچ ئەوەندەی نەخایاند چاوم نووقاند. دیاربوو ماوەیەکی باش خەوم لێکەوتبوو چونکە هەر کە گوێم لە دەنگی ئەو پێ سووکە بوو بە هێواشی بەسەر ئەو فەرشەدا نرا، کە لە ژوورەکەدا ڕاخرابوو، خەبەرم بۆوە. هەستمکرد گیانم سووك بووە و ماندوێتی نەماوە. سەرەتا من نەمزانی

له کوێدام. بەڵام ئەو بۆنە میسکە خۆشە کە بە کونە لووتەکانمدا ڕەتبوو. هۆشی هێنامەوە و تێگەیشتم من لەو ژوورەدام کەوام تێیدا و ئۆبجاشم بیرکەوتەوە.

لەسەر لێواری جێگاکە دانیشتم و تەماشای ئەو کیژەم کرد، کەوا لە بەردەممدا ڕاوەستاوە. لەبەرئەوەی خەو هێشتا چاوەکانی بەرنەدابووم. هیچم نەدی لە دوو چاوی ڕەشی نەرم و خومار زیاتر کەوا لە پەچەیەکەوە تەماشای دەکردم. خێرا چاوم هەڵگلۆفت و بە نەرمی و نیانییەکەوە فەرمانم پێدا وتم:

-ڕووی خۆت دەرخە و جلەکانت دابکەنە..!!

هەرکە دووبارە تەماشام کردەوە، بە هێواشی لە جێگاکەی خۆم هەستام، بە جۆرێك مەست و سەرسام بووم وێنەی نەبوو. چی ببینم.. پەیکەری جوانترین کچی زنجیم لە ژیانی خۆمدا بینی لە بەردەممدا ڕاوەستاوە.!! بە شێوەیەکی ئەوەندە جوان و سەرنجڕاکێش راوەستابوو، دەتوت ڕۆژەو گیراوە جلە سپییەکانیشی لەملاولای پێیەوە بە دەوریدا وەك خەرمانەیەکی سپی کۆمەڵ ببوو. هەر کە هەستامە سەرپێ و لە تەنیشتییەوە ڕاوەستام، بینیم باڵابەرزەکەی بە تەواوی هیچی لە باڵای من کەمتر نەبوو.

لەش و لارێکی تێکەڵ لە توندی و نەرمییەکی وا جوانی پێوە بوو هەر لە خۆی دەهات!! شانو سنگێکی گەورە و پانی وەهای پێوە بوو، نیشانەی بەهێزی.. و هەست و هۆشی مرۆڤی مەست و سەرسام دەکرد.

مەمکەکانیشی توند و قوت بۆ پێشەوە، زۆر زۆر بە جوانی لەسەر سنگە جوان و پانەکەیدا بەرزببوونەوە..!!

لەش و لارێکی پڕو گۆشتن و جوان و پاوو پووزێکی وا جوانی پێوە بوو. مەگەر هەر خودا بتوانێت بەو شێوەیە وا بە جوانی و بێوێنەیی دروستکراوی خۆی لەسەر هەموو زەویدا دروستبکات.

بینیم ئۆبجا ئەوەندە تینوو و تامەزرۆ و ئارەزوومەندی ڕابواردنی هەبوو. هەر لەو ئارەزووە زۆرە بێوێنەیەی یەکەمجاری شازادە شێرێزا دەچوو، پێش ئەوەی میران شا لە هەناویدا برەخسێت.

هەرکە لە تەنیشتییەوە پاڵکەوتم بۆئەوەی لەو حەپەسان و هیلاکییەم بحەسێمەوە، هەستم بە ترس و لەرزێکی گەورە کرد لە بەردەم خودادا. بڕوا و باوەڕ و هۆش و ئیمانم بە خودا هاتەوە، دوای ئەوەی بیروباوەڕم لە دوای تێکشکاندنی یەکەمدا بە خوا نەمابوو. ئۆبجا بە

دەنگێکی نەرم و ناسکەوە، وەك ئەو نەرمی و ناسکییەی چاوەکانی کە یەکەمجار بینیم. بە بڕوایەکی تەواوەوە وتی:

-گەورەم تەیموور ئێستا ئیتر خۆ نامفرۆشیت و وازیشم لێناهێنیت.. وا نییە.. تەیموور..؟

وتم: بەڵێ..؟ چونکە ئەوەندە جوانیت.. هەرگیز ناتفرۆشم و وازیشت لێناهێنم.

وتی: من لەبەر تۆ هەروا دەبم و هەرواش دەمێنمەوە.. شازادەی گەورەم من شایانی تۆم نەك شایانی بابانی پیرەمێرد.

وتم: ئەی ئەگەر کوڕت لێم بوو..؟

وتی: من نایەڵم منداڵم لێت ببێت. من خۆم دەزانم چۆن نەیەڵم منداڵم ببێت. هەروەها دەشتوانم نەهێڵم ئەگەر تۆ ڕازی بیت و بتەوێت، هیچ ژنێکی تریش منداڵی لێت ببێت..!! من پەیمانت دەدەمێ کە من شایانی ئەوە بم لای خۆتم بهێڵیتەوە و وازم لێنەهێنیت.

وتم: ئۆبجا بەڵام تۆ دەتەوێت منداڵت ببێت.. وا نییە؟

وتی: بەڵێ.. شازادەی گەورەم.. بەڵام ئێستا ناهێڵم منداڵم ببێت تاکو ئازاد و سەربەست نەبم و نەچمەوە ناو گەل و هۆز و کەسوکاری خۆمەوە..!! ئەوکاتە منداڵەکانم دەتوانن وەك خوشك و براکانم سەربەست بژین..!!

وتم: براکانت..؟ ئۆبجا بۆ تۆ برات هەیە..؟

وەڵامی دامەوە وتی: بەڵێ.. براکانم پاسەوانی دەرگا زێڕینەکەن..

براکانم لەناو گەلەکەمدا شازادە بوون و منیش ژنە شازادەیەك بووم..!! لەبەرئەوە شازادەی گەورەم لای خۆتمان بهێڵەرەوە، داواکارم لێت و لێت دەپاڕێمەوە، هەمووومان لای خۆت بپارێزە و لێکمان مەکە.. منیش گشت کات دەبم بە کارەکەرێکی گوێڕایەڵ و دایەنێکی ڕاست و بچووکت. پاشان دەستی گرتم و بە هەردوو دەستەکانی توند گوشی و دەپاڕایەوە و دەیوت:

-من نایەڵم منداڵم لێت هەبێت. ژنەکانیشت وا ڕادەهێنم هەموو کات گوێڕایەڵت بن و لە قسەت دەرنەچن و دەیانکەم بە باشترین پاسەوانت لە جیهاندا. من و براکانم لای خۆت بهێڵەوە و لێکمان مەکە و بمانپارێزە.. لەبەر ئەو هەموو تکا و پاڕانەوەیەی هیچ چاوم نەما وەڵامم دایەوە.. وتم:

-باشە هەمووتان لای خۆم دەهێڵمەوە و پێکەوە دەتانپارێزم..

لە پەنای ئەم کچە ڕەشەدا کەوا دۆزیمەوە هەستم بە بڕوا و دڵنیایی و ئارامییەکی تەواوەتی کرد.

لە ماوەی ئەو هەفتانەی لەگەڵ ئەنجومەنی شازادە و زانا ئاینییەکاندا کۆدەبوومەوە، نۆبجا لەو ماوەیەدا بە تەواوی دڵ و دەروونمی کردەوە و حەوانمییەوە.

دوای ئەوەی ناردم بە دوای ئیمام زەینەدیندا گورج هات و گەیشتە لام و بە خۆشی و شادییەوە پێشوازی پیاوە ئاینییەکانم کرد. ئەوانەی لە هەموو ناوچەیەکی هەرێمەوە هاتبوون.

پیاوە ئاینییەکان پێیان وتم، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە و ئەو هەلەم بۆ رەخساوە، هەموو وڵاتی تەتەر لە پاشماوەی یاسا و شەریعەتی جەنگیزخان رزگاربکەم. ئەو یاسا و شەریعەتەی تاکو ئێستا هەندێ هۆز و خێڵی ناوچەکانی باکوور پەیرەوی دەکەن و لەسەر رێ و شوێنی دەڕۆن.

بەڵام هەموو شتێکیش زۆر چاك نەبوو. ئەوەتا هەندێ لە شازادەکان، ئەوانەی بە بڕوایەکی تەواوەوە باوەڕیان وابوو، بۆیەکی بانگ کراون بۆئەوەی بڕیار لەسەر ئەوە بدەن چی لە حسێن بکەین؟

ئێستاش وا تووڕە و ناتەبا و ناوچەوانیان داوە بە یەکدا پاش ئەوەی بینیان حسێن کوژراوە. لای هەمووانیش ئاشکرا و ڕوون بوو، من هیچ دەستێك و ئاگایەکم لە کوشتنی حسێندا نەبوو.

تەرمی حسێنیان بە جلوبەرگی جووتیارییەوە لە یەکێك لە هەیوانی مزگەوتێکی بچووکی ناو شاردا دۆزییەوە.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت شاهێنشای پێشوو، بێگومان یان کەسێکی دز و جەردە کوشتوویەتی یاخود یەکێك لە خزمەتکارەکانی خۆی ناسیویەتیەوە و کوشتوویەتی بێشك نە من و نە هیچ کەسێك لە پیاوەکانم ئاگاداری ئەم خۆگۆڕینە ترسنۆکانەیەی حسێن نەبوون. ئەو خۆگۆڕینەی عەبدوڵڵا دەیوت:

-ئەمە خۆگۆڕینێکی چەپەڵ و ترسنۆکانە بووە. حسێن پێش مردنی خۆی، ڕاستی خۆی شاردۆتەوە.

بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك شازادە و پیاوەکان لەناو خۆیاندا ناکۆکی و ناخۆشییان بوو منیش بە ئەنقەست خۆم لەو کۆڕ و کۆمەڵانەیان دووردەخستەوە. چونکە جێگا و ڕێگام وا پێویستی دەکرد، خۆم تەریك ڕابگرم و نەچمە ناویان.

لە سەرەتادا بەردەوام دەچوومە لای نۆبجا، بەڵام دوای چەند ڕۆژێك ترس و خەتەری جوانییەکەی و سەرنجراکێشانەکەیم بۆ دەرکەوت.

لەبەرئەوەی من هەستمکرد پەروەردە و فێربوونی جیهانگیر پێویستە، وە پێویستیشی بە چاودێری و سەرنجدانێکی شارەزا و باش هەیە.

دوو کچم بۆ هەڵبژارد، یەکێکیان لە تەمەنی خۆیدا بوو. ئەوی تریشیان ساڵێك یا دوو ساڵ لە تەمەنی خۆی بچووکتر بوو. هەرسێکیانم خستە ژێر دەست و چاودێری نۆبجاوە. بۆئەوەی بە باشی بتوانێت جیهانگیر پەروەردە بکات و بەو دوو کیژەشی بناسێنێت. واش بە خەیاڵمدا دەهات، ئەو دوو کیژە بە تەواوی پیاوەتی جیهانگیر پێدەگەیەنن.

ئەم پلانەشم بوو بە هۆکارێك باش و ماقووڵ، بۆئەوەی لە کاتێکی باشدا خۆم لەو کەنیزەکە، یان ئەو شازادە ڕەشە بدزمەوە. هەروەها بۆ ئەوەش لەگەڵ ئەو ژنانەی تریشمدا، کە پشتگوێم خستبوون ڕابوێرم و کاتی خۆمیان لەگەڵدا بەرمە سەر.

ئیتر ڕوومکردە هۆڵە گەورەکە –هۆڵی ئارەزوو و ڕابواردن- ئەویش بۆئەوەی لەگەڵ ئەو ژنانەدا ڕابوێرم و حەز و ئارەزووی خۆم بڕەوێنمەوە. ئەو ژنانە هەرچی تین و توانایەکم هەبوو نەیانهێشت.

لە کاتێکدا ئەنجومەن لەژێر کاروبارو بڕیارەکانیدا دەیناڵاند و شەڕ و ناکۆکی و دووبەرەکیش لەناو شازادەکاندا زیانی دەکرد. تا لەم کاتەدا وردە وردە زەوق و کەف و کوڵی ئارەزووی شەهوانیم کەمبۆوە و تێر بووم. جوانی و شۆخ و شەنگی باشترین ژنە هەڵبژاردەکانی بایان لە پێشچاوم کەوتن. ئینجا دوای ئەوە دەستمکرد بە گەڕان بەناو ئەو کچە جوانانەدا، ئەو کچانەی بایانی چاوچنۆك و برسی بۆ کەیف و حەزی ڕابواردنی کاتی پیرێتی هەڵیگرتبوون. ئەم ڕابواردنەم لەگەڵ ئەو کچانەدا ئەوەندەی نەخایاند. هەتا وام لێهات بە قێزەوە تەماشای هەموو ڕابواردنێکی حەز و ئارەزووم دەکرد و بێزم لە جێگا نووستن و باخەڵیشیان دەبۆوە.

ترس و لەرزی ناکۆکی و دووبەرەکی شازادەکانم دایگرتم. بڕیارم دا سنوورێك بۆ ئەم ناکۆکیو دووبەرەکییە چەپەڵە دابنێم کە لە نێوان شازادەکاندا هەیە.

ئاوەها هەرچی ئەوانەی ناکۆك بوون لەگەڵ یەکتردا بانگم کردن و کۆبوونەوەیەکی گشتیم لەگەڵدا سازدان. لەو کۆبوونەوەیەدا ماوەی دوو ڕۆژم بۆ دانان تاکو هەرچی دووبەرەکی و کێشە و ناخۆشییەکیان هەیە لەناو خۆیاندا بە ئاشتی و تەبایی نەیهێڵن و چارەسەری بکەن.

-زەینەدین بە گەشبینیی و ڕوویەکی خۆشەوە پێی وتم:

-بەڕێز شازادە تەیموور، پیاوانی ئاینی هەمووان یەك دەنگ و یەکڕیز لەگەڵتدان و پشتگیری هەنگاوەکانت دەکەن.

پێم وت: ئیمامی بەڕێز، زۆر چاکە، ئێستا بە پیاوە ئاینییەکان ڕابگەیەنە با کاربکەنە سەر شازادە ناکۆکەکان و داوایان لێبکەن با ناکۆکی و کێشەکانیان لەناو خۆیاندا چارەسەر بکەن.

سبەینێ دوا مۆڵەتیانە بۆئەوەی لەناو خۆیاندا کێشەکانیان نەهێڵن و ناکۆکی و دووبەرەکی ناوخۆیان چارەسەر بکەن. خۆ ئەگەر ئەمە نەکەن هەر هەموویان دەکوژم. ئەمەش دوا مۆڵەتیان دەبێت بۆئەوەی ئەو کارانە جێبەجێ بکەن و ژیانی خۆیان لە کوشتن ڕزگار بکەن.

وتی: شازادە تەیموور، بڕیارەکانت گشتیان جێبەجێ دەکرێت. تۆش ئەم بڕیارانە بە توندوتیژی جێبەجێ دەکەیت..؟

وەڵامم دایەوە: بێگومان.. بێگومان.. ئەی ئیمامی بەڕێز.

لە ڕۆژی دواییدا ئەندامانی ئەنجومەنی شازادەکان کۆبوونەوە..

منیش خۆم لە یەکێك لە سندووقە گەورەکانی بایاندا شاردەوە و گوێم لە گفتوگۆ و قسەکانیان گرت.

لە دڵی خۆمدا بڕیاری ئەوەم دا ئەوانەی دژی من بڕیاردەدەن بیانکوژم و نەهێڵم جارێکی تر ڕۆژیان لێهەڵبێت.

لەبەرئەوەی شازادەکان بەرامبەر زانا ئاینییەکان و قسە جوان و ڕەوانەکانیان ڕاوەستابوون و گوێیان لێگرتبوون. ئەو زانایانە کارێکی باشیان کردە سەریان و زاناکانیش دەستپێشکەری هەموو قسە و گفتوگۆیەك بوون.

لەبەرئەوە، وردە وردە، شازادەکان ڕازی بوون و لەناو خۆیاندا دووبەرەکی و کێشەکانیان شیکردەوە و پێکهاتن.

گەرچی ئەم گفتوگۆ و قسەکردنەیان تا ئێوارەی خایاند و منیش لە شوێنەکەی خۆمدا، خۆم شاردبۆوە، لە درزی سندووقەکەوە تەماشام دەکردن. هەتاکو ئەوکاتەی بینیم ئیمام زەینەدین قورئانێکی گرت بە دەستەوە و یەك یەك دەیبرد و دەیگەڕاند بەسەر شازادەکاندا ئەوانیش سوێندی پاکی و گوێڕایەڵی و دڵسۆزییان بۆ دەخوارد. منیش دوای ئەوە بە دزییەوە لە سندووقەکە هاتمە دەرێو گەڕامەوە بۆ ژوورەکەی خۆم.

پاشان پێیان ڕاگەیاندم، کە من هەڵبژێردراوم بە سەرۆك و سەرکردەی نوێی هەموو نەتەوەی تەتەر.

هەر لەو شەوەدا چووم بۆ ژوورەکەی نۆبجا و هیچ خەم و ترس و پەژارەیەکم نەمابوو. ئەو شەوە بێ ئەوەی لە هیچ بترسم، بێترس لەگەڵیدا دانیشتم و رامبوارد. پاشان پرسیاری پەروەردەو هەڵسوکەوت و ئەخلاقی جیهانگیرم لێکرد. ئەویش بە دڵنیاییەوە وەڵامی دامەوە وتی:

-شازادەی گەورەم، پێویست ناکات خەم و پەژارەی کوڕەکەت هەبێت.. هەر زۆر بە زوویی ئەو دوو کچە شەیدای جیهانگیر بوون. ئێستا پێویستیان بە من نییە ڕایانبهێنم بۆ ئەم کارەو هانەهانەو ڕێنماییان بکەم..

وتم: قسەکانت ئەوە دەگەیەنێت، جیهانگیر بە تەواوی لەگەڵ ئەو دوو کیژەدا گونجاوە.. ئۆیجا وا نییە؟

وەڵامی دامەوە: بەڵێ شازادەی گەورەم، من بێگومانم عائیشە و تەمینە بۆ هەتاهەتایە، دوو کەنیزەکی بە وەفای گوێڕایەڵی جیهانگیر دەبن.

وتم: ئەو دوو کەنیزەکە سۆز و بەزەیی منداڵی ئەو بە هەل دەزانن و بۆ ئارەزووی خۆیان بەکاری دێنن؟

وتی: نەخێر.. شازادەی گەورەم.. خۆشەویستییەکەیان بەو جۆرە نییە لە پێناوی ئەودا بە حەز و ئارەزووی خۆیان، خۆیان لە پێناویدا بە کوشت دەدەن. خۆشەویستییەکەیان بۆ جیهانگیر خۆشەویستیەکی ئەمر و هەتاهەتاییە.. شازادەی گەورەم تێگەیشتیت من مەبەستم چییە؟

وتم: بەڵێ.. بەڵێ.. من دەزانم مەبەستت چییە..

لە ڕاستیدا من مەبەستی تێگەیشتم. بەڵام من زیاتر بۆ ئەو پلەیە پەرۆش و نارەحەت بووم کە پلان و تاقیکردنەوەکەم پێی گەیشتبوو!!

* * *

## هاتنەوەی شاژنە شێریزا

دوای ئەوەی ئاهەنگێکی ڕێزلێنانی کورت لە باڵخدا سازکرا. ئیتر وردە وردە سەردارو شازادەکانی تەتەر دەستیانکرد بە گەڕانەوە بۆ نیشتمان و ناوچەکانی خۆیان. بۆئەوەی خۆیان و کاروباریان ڕێکبخەن بۆ ئەو ئاهەنگە گەورەیەی لە سەمەرقەند بۆ من سازدەکرێت بە هۆی تاج لەسەرنانم و گەڕانەوەم بۆ شاری سەمەرقەند.

ماوەیەکی زۆر لە باڵخدا مامەوە، پاشان موقام لە شوێنی خۆم کرد بە فەرمانڕەوای شاری باڵخ.

دوای ئەوە زۆربەی زۆری ئەو ماڵ و سامانەی بایانی پیرەمێرد دوای خۆی جێیهێشتبوو. هێنام و لە پێناو ئەو چوونە سەرکەوتو و مەزنەدا بۆ ناو شاری سەمەرقەند خەرجم کرد.

بۆئەوەی شێوەی گەڕانەوەکەم وەك ئەو گەڕانەوە بە شکۆیەی حسێن بێت کە لە هیند گەڕایەوەو چووە ناو شاری سەمەرقەندەوە.

داود لە پێش مندا بۆ سەمەرقەند چووبوو. بۆئەوەی کاروباری پێشوازیکردنم جێبەجێ بکات.

لە ڕۆیشتنمدا بۆ سەمەرقەندو گەیشتنم بە شەهری سیبز ماوەی دوو ڕۆژ لە شاری شەهری سیبزدا مامەوە بۆئەوەی کاروباری مەوکیبەکەم ڕێك و پێك بخەم. نامەیەکم بۆ داود ناردو ئەو کاتەم تیادا دەستنیشان کرد کە دەگەمە سەمەرقەند.

بۆ ڕۆژی دوایی مەوکیب و بارووبارگەم کۆکردەوە و بەرەو پایتەختەکەم کەوتمەڕێ. هەرچی شتێکی بەنرخ و گرانبەها و بەکەڵك و گرانم هەبوو خستمە ناو عەرەبانەیەکی نەخشێنراوی جوانەوە و لە پێش خۆمدا ناردم بۆ فەراخ شار و خۆشم لە کاتی نێوارەدا گەیشتمە دەوروبەری شار و هەر کە گەیشتمە ئەوێ تۆزێك ڕاوەستام و کاروانەکەمم ڕێك و پێك خست. خۆشم سەرەتا سواری ئەو ئەسپە سپییەم بووم کە ناوم لێنابوو ئاك ڕۆکش ئەو ئەسپەش ئەسپێکی ڕەسەنی زۆر شاز و جوان بوو. تەمەنی سێ ساڵان بوو. بە زین و سەرزین و قوماشی ئاوریشم و گوڵێنکەی سوور و زێڕین ڕازێنرابۆوە.

جیهانگیر و سەردار و شازادەو سەرکردەکانیشم لەگەڵدا بوو. هەر هەموویان جلکی ڕەسمی جوان و ڕازاوەیان لەبەردا بوو.

لە دواشمەوە بە سواری حوشتر نۆبجا و پێنج ژنی جوان و قەشەنگ دەڕۆیشتن. لە پشت ئەو حوشترسوارانەوەش. چل کەژاوە دەڕۆیشتن و کەژاوەکانیش ژنەکانی ترمیان تێدا هەڵگرتبوو. ئەو ژنانەش جوانترین و نایابترین جلوبەرگیان لەبەرکردبوو. هەریەکەیان شانازی بە کەژاوەکەی خۆیەوە دەکرد. کە بە قوماشی ئاوریشم ڕازێنرابوونەوە.

هێزە تایبەتییەکەشم، ئەوانیش جلی جوان و نایابیان لەبەرکردبوو بە دوو ڕیز دەڕۆیشتن. هەر ڕیزەی لە لایەکی کەژاوەکانەوە بە جوانی و تەرتیب و ڕێکوپێکی دەڕۆیشتن.

لەشکرەکەشم لە دوای ئەمانەوە زۆر بە جوانی و تەرتیبەوە دەڕۆیشتن. هەرکە گەیشتمە دەروازەی شار و پێیدا ڕەت بووم. لەملاو لەولای شەقامەکەوە کۆمەڵانی گۆرانیبێژ بە پیرمەوە هاتن، لە هەزار کەس زیاتر پێکهاتبوون و لە پێشمەوە کەوتنەڕێ و سروود و لاوك و حەیرانی نوێیان دەوت و لە سروودەکانیاندا باسی ئەو شەڕ و شۆڕ و گرتنی جێگا و سەرکەوتنانەی منیان دەکرد.

لە پێش گۆرانیبێژەکانیشەوە زیاد لە هەزار کچی سەماکەر دەڕۆیشتن و لەسەر نەزمی ئەو تەپڵ و مۆسیقایە سەما و هەڵپەڕکێیان دەکرد و گوڵیان بەسەر شەقامە پڕ فەرش کراوەکەی شاردا هەڵدەپڕژاند.

خەڵکانی سەمەرقەندیش هەر هەمووی لەملاو لەولای شەقامەکەوە بە ڕیز ڕاوەستابوون. لە سەربانی هەموو ماڵەکانیشەوە خەڵکی کۆمەڵ ببوون و تەماشایان دەکرد.

جەماوەری خەڵکانیش تا چاو بڕیکات لە زۆریدا شەپۆلی دەدا. هەرکە سروودەکان کۆتایی هات. هاوار و بژی لە هەموو لایەکی شارەوە بەرزبۆوە و چەپڵەیان لێدەدا و هاواریان بۆ دەکردەو بە گەرمی و شادییەوە پێشوازییان لێدەکردم، و نەترسی و قاردمانی منیان دەوتەوە. ئەم هاوارو هاژەیەیان ئەوەندە توند بوو لە هەموو لایەکی شاردا دەنگی دەدایەوە. هەتا من بۆ ماوەیەك لەوە ترسام دیوارەکانی شار بڕوخێ و لەم دەنگدانەوە توند و بەهێزەیان ماڵەکان هەرەس بێنێت.

لە پێش چاوەدا دیمەنێکی جوانی شادی و خۆشی خۆی دەنواند. منیش زۆر دڵشادو شادومان بووم. چونکە مەوکیب و کەژاوەکانی من لە جوانی و گەورەییدا دەگەیشتنە ئەو گەورەیی و جوانییەی ئەو مەوکیبەی داود و دڵشاد لە کاتی گەیشتنما بۆ ناو شار بۆ پێشوازیکردنی منیان ئامادە کردبوو.

پێش هەیوانی کۆشکەکە لە ڕاستیدا بە جوانترین ڕازاوە و ڕازاوەترین دیمەن ڕازێنرابۆوە. بە شێوەیەك بوو، شار تاکو ئێستا شتی وای بە خۆیەوە نەیبوو لەسەر و ئەمانەشەوە شانشینێك کە لە داری عاج و ئەبەنۆس دروستکرابوو، دانرابوو. چەترێکی گەورەش کە لە قوماشی زێڕینی جوان دروستکرابوو خەتی سوور و سەوز و مۆر و زەرد و ڕەنگی جۆراوجۆری تر دروستکرابوو هەر لە پەلکەزێڕینە دەچوو. بەسەر شانشینەکەوە بۆ سێبەرکردن دانرابوو.

جوانترین شت کە سەرنجی منی بۆ لای خۆی ڕاکێشا، دیمەنی دڵشاد و ژنانی شانشینەکە بوو. جوانترین و نایابترین جلوبەرگی ئاوریشیمان پۆشیبوو. گرانترین و نایابترین ملوانکە و خشڵیان لە خۆیان دابوو لەو خشڵانەی شارەزاترین و باشترین وەستای شارەزا دروستی کردبێت لە ڕاستیدا ئەم پێشوازییەی بۆ من سازدرابوو، شایانی کەسێك بوو هەموو جیهانی داگیر کردبێت.

ئەگەر بمانەوێت ڕاستی بڵێین پێویستە دان بەوەدا بنێین کە شازادە دڵشاد وای کردبوو، ئەم پێشوازییە بکاتە ئەم پلە بەرز و بێ کەم و کوڕی و قەشەنگە. هەروەها پێشوازی کردنەکەشی لە جیهانگیر پێشوازیکردنێکی دۆستانە و ڕاستگۆیانە بوو.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیدەزانی چۆن ئەو شەوق و خۆشی و ئارەزووە زۆرەی خۆی بشارێتەوە. بۆئەوەی بە تەنها لە شوێنێکدا لەگەڵمدا بە یەك بگەین. بە زەوق و ئارەزوویەکی زۆرەوە دەستی گرتم و بردمی بۆئەوەی ژووری نووستنەکەی خۆم پیشان بدات. بە ڕوویەکی گەش و پێکەنینەوە پێی وتم:

-تەیموور. ئاخری هاتیت.. زۆرم چاوەڕوان کردیت و خۆشم زۆر ڕاگرت. بەڵام هەرچۆنێك بێت تۆ هیوا بڕاوت نەکردم. تەیمووری خۆشەویستم، ئێستا هەموو دنیا هی خۆمانە. ئایا ئەم کارانەی کردت هەر هەمووی لە پێناوی مندا کردت..؟ وا نییە؟

وتم: بەڵێ.. دڵشاد هەر هەمووی لە پێناوی تۆدا بوو!!

وتی: خۆشەویستەکەم.. من دەمزانی ئەمە دەکەیت..

وەڵامم دایەوە: کەواتە ئێستا قەناعەتت کرد من تۆم خۆشدەوێت.. وا نییە؟ دەستم درێژکرد بۆئەوەی دەستێك بە گەردن و سینەیدا بهێنم.. بەڵام دڵشاد تۆزێك چووە دواوە و لێم دوورکەوتەوە و بە بڕوا و قەناعەتێکی تەواوەوە تەماشای کردم و وەڵامی دامەوە:

-بەڵێ.. تەیمووری خۆشەویستم بە تەواوی قەناعەتم کرد.. هیچ کاتێکیش ئەلجایت هێندەی من خۆش نەویستووە. خۆشەویستی تۆش وا لە دەستەکانتا. بەڵێ من بڕوا و قەناعەتم کرد. هەمدیسان خۆی خستەوە ناوباوەشم و.. ئەوکاتەی دەنگی بانگ لەسەر منارەکانەوە بەرزبۆوە و لە کۆشکەکەدا دەنگی دایەوە.. ئەوکاتە لێم دوورکەوتەوە و هەستا چوو خۆی شت و دەستیکرد بە نوێژکردن. هەر کە لە نوێژەکەی بۆوە، تەماشای منی کرد و بینی پێدەکەنم و سەیرم لە خواپەرستییەکەی دەهات. بە ترس و خواپەرستییەوە وتی:

-تەیموور لە پێناوی سەرکەوتنی تۆدا نوێژم کرد. و شوکری خوام کرد وا تۆ هاتوویتەوە بۆ لام. خۆشەویستییەکەشمان گوناه و تاوان نییە. خواش یارمەتیدەرمانە و لەگەڵماندایە. لەبەرئەوە پێویستە نوێژی بۆ بکەم و سوپاسی گەورەیی بکەم.

وتم: دڵشاد منیش لەگەڵ ئەم خۆشەویستییەماندام.

وتی: بەڵێ.. بێگومان ئەمە ڕاستە.. ئەمە ڕاستە..

دڵشاد زەوق و ئارەزووی پیاوەتی وروژاندم.. نەشمدەزانی ئایا ئەویش وەك من هەمان کاریگەری لە دڵ و دەروونیدا هەبوو.. یان نا.. بەڵام ئەوە تێگەیشتم و بۆم دەرکەوت، ئەو دوو ساڵەی کە بە سەری بردبوو وە چاوەڕوانی هاتنەوەی منی کردبوو. زەمانێکی قورس و ناخۆشی چاوەڕوانی و ئارەزووی دووری لێك جیابوونی بووە.

ئەگەر لەم ئاهەنگەدا دڵشادم دەستنەکەوتایە و دڵشادیش نەبوایە هیچ گرنگییەکم بەو ڕێ و ڕەسمە نەدەدا و ئەم ڕێی و ڕەسمی تاج لەسەرنانەم بە کارێکی شێتی و هیچ و پووچ دادەنا. گەرچی ڕێ و ڕەسمی وا جوان و بەجێ.. جوانترین و نایابترین ڕێ و ڕەسمێك بوو، تاکو ئێستا لە ژیاندا وڵاتی تەتەر شتی وای بە خۆیەوە بینیبێت.

لەگەڵ ئەوەشدا من دان بەوەدا دەنێم. ئەو ڕێ و ڕەسمە یەکێك بوو لە شتە سەرسوڕهێن و نایابترین و جوانترین شتەکانی زەمانە..

یەکەم هەنگاوم لە سەمەرقەندا، ئەوە بوو نوێنەری خۆم نارد بۆ هێرات، بۆ لای شێخ عەلی و داوای گەڕانەوەیم لێکرد و لەگەڵ خۆیدا شاژن شێرێزا و دوو کوڕەکەشم بۆ پایتەختەکەم بهێنێتەوە.

من لەوە دڵنیا بووم کە خۆم لە بارودۆخێکی وەهادام، خۆم بەسەر شامالیك دا فەرز کەم و نەتوانێت داواکارییەکەم بداتە دواوە.

هەروەها دەشمزانی شێخ عەلی ئێستا ئارەزووی لێیە بگەڕێتەوە و دووبارە لە خزمەتی مندا کاربکات. لە ڕاستیشدا من زۆر پێویستم بە شێخ عەلی هەبوو. هەروەها لەبەرئەوەی تەندروستی شامالك باش نەبوو بەرەو خراپی دەڕۆیشت و ئەستێرەی لە کوژاندنەوەدا بوو.

شێخ عەلی خۆشی دەیزانی دوای ئەو ئەستێرە و دەستەڵاتی ئەویش نامێنێ.

منیش لەو باوەڕەدا بووم شێخ عەلی و شازادە شێرێزا هەردووکیان زۆر بە گەرمییەوە پێشوازی ئەو هەلەیان دەکرد، بۆیان بڕەخسێت و ماڵ و سامانیان لە هێرات ببەنە دەرێ، پێش ئەوەی برا گەورەکەیان کاروباری فەرمانڕەوایی وڵات بگرێتە دەست. لەگەڵ ئەوەی دڵشاد هیچ دڵ پیسی و ناکۆکی و نارەزایییەکی نەبوو لەوەی کەوا من پەنجا ژنم لە باڵخەوە لەگەڵ خۆمدا هێنابوو. بەڵام زۆر بە توندی بەرهەڵستی ئەوەی دەکردم کە شازادە شێرێزا بۆ لای خۆم بهێنمەوە.

کاتێك پێمووت کەوا من نوێنەرم بۆ هێرات ناردووە، بۆئەوەی شازادە شێرێزا بێتەوە بۆ لام. دڵشاد بە بێزاری و تووڕەییەوە لێی پرسیم وتی:

-تەیموور هێشتا هەر شێرێزات خۆشدەوێت؟

وتم: بێگومان، دڵشاد، شێرێزا وەك خۆت دەزانیت هاوسەرمە و شاژنە شێرێزا ژنێکە پیاو شانازی پێوە دەکات.

وتی: بەڵام هێندەی منت خۆشدەوێت. هێندە ئەوت خۆش ناوێت وا نییە؟

وتم: بێگومان ئەوەندەی تۆم خۆشدەوێت، هێندە ئەوم خۆش ناوێت!!

لێی پرسیم وتی: کەواتە بۆچی ناردووتە بەدوایدا..؟ تەیموور منت بەس نییە؟

وەڵامم دایەوە: دڵشاد پیاو مافی خۆیەتی چوار ژن بهێنێت. منیش مافی خۆمە چوار ژنی شازادە بهێنم. لەگەڵ ئەوەشدا شازادە شێرێزا دایکی دوو کوڕمە، ئێستاش کاتی ئەوەیان هاتووە رێز و گەورەیی و باوکێتی خۆمیان پێ بسەلمێنم و بیان خەمە ژێر باڵی پەروەردە و چاودێری خۆمەوە..

وتی: ئۆهـ.. دوو کوڕەکەتم بیرنەبوو.. بەڵام ئایا تۆ شێرێزات لەبەرخاتری دوو کوڕەکەت خۆشدەوێت..؟

وتم: بێگومان..

وتی: کەواتە منیش هەوڵدەدەم مناڵم لێت ببێت و تۆ خۆشت دەزانی من نەزۆك نیم.. من دەمویست خۆشی و شادی و ئارەزووەمان بپارێزم.. منیش ئێستا بەخێرهاتنەوەی شاژنە شێرێزا دەکەم. قسەکانی بە قین و تووڕەییەوە دەربارەی شێرێزا کۆتایی پێهێنا.

من لەو باوەڕەدا بووم هەر ئەو شەوە دڵشاد سکی بە شاهروخ پڕ بوو. هەرچۆنێك بێت، دوای چەند هەفتەیەك، چەند سوارێکی شێخ عەلی گەیشتنە لام و خەبەری هاتنەوەی شاژنە شێرێزایان پێراگەیاندم.

دڵشادیش کە زانی سکی پڕە. لەگەڵماندا هاوبەشی پێشوازی هاوسەرە گەورەو بەرێزەکەی کرد و لە تەنیشت من و جیهانگیرەوە لەژێر ئەو چەترەدا کە لە قوماشێکی زەردی زێڕین دروستکرابوو ڕاوەستا.

هەر کە کەژاوە ڕەنگینە جوان و ڕازاوەکەی شاژنە شێرێزامان بینی بەسەر شەقامەکەدا بەرەو کۆشکەکە دێت دڵشاد سەری لەو هەموو ڕەنگە درەوشاوانەوەو لەو جلوبەرگە ڕەنگینە نایاب و جوانانە سووڕماو پێی وتم:

-کەژاوەیەکی زۆر جوانەو دیمەنێکی ڕەنگاوڕەنگی نایابی زۆر جوانی هەیە..

وتم: دڵشاد ئەمە نەریتی خەڵکی باکوورە. فارسەکان زۆر حەز لە ڕەنگی جۆراوجۆر دەکەن. پێویستە ئێمەش خۆمان لەسەر ئەوە ڕابهێنین.

وتی: ئایا ئێمە پێویستە لەسەر ئەوە ڕابێین..؟ بەڵام ڕەنگە شازادە شێرێزا بتوانێت لەسەر نەریتی ئێمە ڕابێت..

وتم: بێگومان ئەو لەسەر نەریتی ئێمە ڕادێت.

هەر کە مەوکیبەکەی شیرینزا گەیشتە بەرەوە، نەمتوانی ئەو سەرسوورمان و حەپەسانە لە ڕوومدا بشارمەوە. چونکە شیرینزا وەك ئەو جوانی و گەورەیی و قەشەنگییەی مەکیبەکەی من گەیشتە ناو باڵخ.

دڵشاد هیچ باوەڕی بە خۆی نەما و ورەی بەردا. بە خەم و پەژارەوە پێی وتم:

-تەیمووری خۆشەویستم شیرینزا زۆر دەوڵەمەندەو شازنیشە. وا دیارە لە منت زیاتر خۆش دەوێت. دوو کوڕەکەشی گەورە بوون و بوون بە دوو لاوی نەوجەوان. ئایا ئیتر هیچ هەلێك بۆ من ماوەتەوە..؟!!

تەماشایم کرد، بینیم خەمباری لە ڕوویدا دیارە و فرمێسك لە چاوەکانییەوە بەسەر ڕوومەتە ناسکەکانیدا دێتە خوارێ.

منیش دەستم کردە ناوقەدێوە و بە زمانێکی شیرین و لەسەرخۆوە بۆئەوەی ئێش و خەم و پەژارەکەی کەم بکەمەوە پێم وت:

-دڵشادی خۆشەویستم دلگران مەبە و پەژارەت نەبێت ئەگەر من تەماعی ماڵ و سامانی شازادە شیرینزام ببوایە، لەگەڵ حسێندا نەدەجەنگام و ئەوکاتە دەچووم بۆ هیرات و هیراتم داگیر دەکرد. ڕەنگە ئەو کاتەش ئەوە زۆر ئاسانتر و لەبارتر بوایە بۆ من.

وتی: بەڵێ.. ڕەنگە ئەوە ئاسانتر بوایە.. بەڵام لە جیاتی ئەمەو لەبەرخاتری من هەروەك بەڵێنت پێدام، لەگەڵ حسێندا کەوتینە جەنگەوە. پاشان تۆ منت لە شیرینزا زیاتر خۆش دەوێت وا نییە.. تەیموور؟

وەڵامم دایەوە: بەڵێ خۆشەویستەکەم من تۆم لەو زیاتر خۆش دەوێت.. فرمێسکی چاوەکانی سڕی و فرمێسك لە چاوەکانیدا نەما و بڕوای بە خۆی هاتەوە و گەشایەوە و هەناسەیەکی شادی هەڵکێشا و پێی وتم:

-تۆش هەموو کات منت لەو زیاتر خۆشتر دەوێت.. وا نییە؟

وەڵامم دایەوە: بەڵێ دڵشاد بەردەوام هەر تۆم خۆشدەوێت..

وتی: هەروەها لەسەر پەیمانو بەڵێنی خۆشت دەمێنیتەوە وا نییە؟

وتم: تۆ باشتر دەزانیت من لە پەیمان و بەڵێنمدا هەرگیز درۆ ناکەم. من نامەوێت و ناهێڵم هیچ کات شك و گومانت لە ڕاست و ڕەوانی مندا هەبێت.

چونکە دڵشاد خۆی یەکێك بوو لە ژنە شازادەکانی تەتەر کەسایەتییەکی تایبەتی هەبوو. هەتا ئەو کاتانەش کە حسێن لە ناخۆشترین کات و ڕۆژدا بوو، دڵشاد توانیبووی ڕێز و گەورەیی و

سەرنجی شازادەکان بۆ لای خۆی ڕابکێشێت. لە ڕاستیدا ڕێ و شوێن و ڕێز و گەورەیی شازادە دلْشاد لای من هیچی لە ڕێز و گەورەیی و شوێن و جێگای شاژنە شێرێزا کەمتر نەبوو. بەلاّم دلْشاد خۆی ڕێز و گەورەیی خۆی باش نەدەزانی. بێگومان منیش بەردەوام هەر خۆشم ویستووەو خۆشیشم دەوێت.

بەلاّم لەم کاتە کتوپڕییەدا، ئەوەی لای من گرنگ بوو. مەوکیب و کەژاوەی یەکەم بوو کەوا نزیك هەیوانی شانشینی شاهێنشاهی من دەبوەوە. سەرنجم دا تێگەیشتم شێخ عەلی خۆی سەرپەرشتی پاسەوانە تایبەتییەکانی شاژنە شێرێزا دەکات.

هەر ئەوکاتەش ئەو دوو سەرکردە لاوەی تریشم دی کە جلوبەرگی زۆر جوان و ڕێکوپێك و گونجاویان لەبەردا بوو. ئەو دوو لاوە بە تەنیشت کەژاوەکەی شاژنە شێرێزاوە دەڕۆیشتن.

ئەو سەردارەی لای چەپی کەژاوەکەوە بوو، لاوێکی شۆخ و شەنگ و لاواز بوو. ڕێکوپێك و بە جوانی لەسەر پشتی ئەسپەکەی دانیشتبوو. لەگەلْ هەنگاوی سوارەکانی شێخ عەلیدا بە ڕێکی دەڕۆیشت. هەر گورج تێگەیشتم و زانیم ئەو کوڕە لاوە شێخ عومەری کوڕمە.

کتوپڕیش تێگەیشتم ئەو پەرییە قەلْەوە دەموچاو پانەی لای ڕاستی کەژاوەکەوەیە میران شای کوڕمە.

میران شا دەیتوانی ئەسپەکەی بە هەمان شێوە کە لە قوتابخانەی فێرکردنی سواری ئەسپدا فێرببوو لێبخوڕێت. کە ڕێز و شانازی مامۆستاکانی بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو. بەلاّم لەم کاتەدا بێ ئەوەی گوێ بداتە هیچ شتێك و بێ موبالاتانە لەسەر پشتی ئەسپەکەی دانیشتبوو.

بەلاّم هیچ ئەوەندەی نەخایاند گورج لەسەر پشتی ئەسپەکەی ڕاستبۆوە و خۆی ڕێکخست بە جوانی لەسەر پشتی ئەسپەکەی دانیشت. "بێگومان ئەمە بە فەرمانی دایکی بوو کە لەناو کەژاوەکەدا بوو". پێش ئەوەی شێخ عەلی پاسەوانە تایبەتییەکانی شاژن لەبەردەم تەختی شانشینەکەدا ڕاوەستێنێ.

شێخ عەلی داوای لە تیپە تایبەتییەکەی کرد، چەکەکانیان ڕاست ڕابگرن و سلاّو بکەن..

من و جیهانگیر و پاسەوانی کۆشکەکەم بە هەمان شێوە وەلاّمی سەلامەکەی سەربازەکانی شێخ عەلیمان دایەوە.

پاسەوانەکان بەردەوام بوون لە ڕاگرتنی چەکەکانیاندا. هەر لەو کاتەدا پەیژەیان دانا و یارمەتی ئەو ژنانەیان دا تاکو دابەزین و هاتنە خوارێ بۆ سەرزەوییەکە، شاژنە شێرێزا و دوو کوڕەکەی و ئەو ژن و کارەکەرانەشی لەگەلْیدا بوون جوانترین و نایابترین جلوبەرگیان لەبەردا

بوو. بە شێوەیەك بوون زۆر جوانتر و نایابتر بوو، لە جلوبەرگی ئەو ژنانەی من لە باڵخەوە لەگەڵ خۆمدا هێنابووم. بەسەر ئەو پێپلیکانانەدا سەرکەوتن کە دەچوو بۆ هەیوانی شانشینەکە.

شاژنە شێرێزا ڕێز و گەورەیی و حەیا و حورمەتی لێدەباری. هەر کە گەیشتە بەردەمم بە ڕێز و نەوازشەوە خۆی چەماندەوە بێ ئەوەی چاو بەرزبکاتەوە و تەماشای سەرووی خۆی بکات. بە نەرمی و نیانییەکی جوان و دەم و گفتێکی شیرین و بێ وێنەوە پێی وتم:

-ئەی شازادە تەیموور، گەورە و سەرداری سەمەرقەند و هاوسەری بەڕێز و خۆشەویستم. من زۆر شاد و بەختیارم، پاش لێکدابڕانێکی دوور و درێژ وا هاتوومەتەوە بۆ ناو کۆشك و جێگا و ڕێگاکەت.

شامالیك گەورەی خۆراسان و سوڵتانی ئەفغان فەرمانی پێداوم، کە بگەڕێمەوە ژێر سایەت و لەگەڵ خۆمدا پیرۆزبایی خودا و پیرۆزبایی ئەوم بۆ هێناویت و بە ڕاستی داوا دەکات پیرۆزبایی خودا و خۆی بەسەر ڕووی پاك و ڕەوانتدا برژێنێت.

داوام لێکرد هەستێت و ڕاست بێتەوە.

منیش بە شێوەیەکی جوان و ڕێکوپێك پێم وت:

-شاژنە شێرێزا ئەی هاوسەری خۆشەویستم. من زۆر شاد و پێخۆشحاڵم بە هاتنەوەت. بۆ سەمەرقەند هیوادارم شاد و بەختیاریت لە دیار و بارەگا و شوێنی دانیشتنی خۆتدا.

تەماشای ئەو چاوە گەش و نەرمە جوانانەیم کرد. هەروەك جاری جارانی خۆی جوان و گەشاوە بوون. یەکەمجار چۆنم دیبوو ئێستاش هەر وابوو.

بەڵام کاتێك چاوی بە دڵشاد کەوت جلوبەرگ و تاجی شاهانەی شاژنی کۆشکی لەسەردا بوو. بە شێوەیەکی سەیر، چاوی داپچڕاند و بە سەرسامییەوە، دەمی کردەوە و هاواری کرد:

-ئەلجای خۆشەویستەکەم! ئەلجای خۆ من بیستبووم کە تۆ..

بەڵام من خێرا قسەکەیم پێبڕی و پێم وت:

-ئەمە شازادە دڵشادە. خۆشەویستەکەم شێرێزا، دڵشاد شازادەی سەمەرقەندە.

بە سەرسامییەوە لێی پرسیم:

-بە ڕاستی ئەمە دڵشادە؟!!

ئیتر ئەوەندەی نەخایاند دڵشادیش سڵاوی ڕێز و دۆستانەی لێکرد و پێی وت: من شاد و پێخۆشحاڵم بە دیدار و هاتنت بۆ سەمەرقەند ئەی شاژنی خۆشەویست.

هەستم کرد دڵشاد زۆری پێ خۆش بوو، گەشایەوە، چونکە شێرێزا وایزانی ئەلجایە.

کاتێك جیهانگیرم پێشکەش بە شێرێزا کرد و لەگەڵ براکانیدا بە یەکیانم ناساند. شێرێزا بە بینینی و ناسینی جیهانگیر پێخۆشحاڵ و دڵخۆش نەبوو.

کاتێکیش دڵشاد و شێرێزا پێکەوە گفتوگۆیان دەکرد و مەدح و سەنای کوڕەکانمیان دەکرد و بەراوردیان دەکردن لەگەڵ یەکتردا. بینیم شێوازی قسەو گفتوگۆی دڵشادیش دۆستانە و هی دڵ نەبوو. چونکە دڵشاد زیاتر بەرگری لە جیهانگیر دەکرد.

لایەنی کەم ئەم بەرگرییە هەتا ئەو کاتەی خۆی کوڕی دەبێت و دێتە ڕیزی ئەوانەی دەبن بە جێگری تەختی شانشینەکەم.

منیش لەناو ماڵ و خێزانەکەمدا سوود لەم ناکۆکی و دووبەرەکییەی ناو ژنەکانم دەبینم. گەرچی من خۆشم خاوەن و گەورەی ئەو ماڵ و خێزانەش بووم.

* * *

## شەڕبازی لەگەڵ کوڕەکانمدا

لەبەرئەوەی سوارە چینییەکە (خیتای) و شێخ عەلی هەردووکیان سەرکردایەتی لەشکرەکەمیان دەکرد. من بۆ ماوەیەکی چاك هەستم بە ئارامی و دڵنیایی کرد. منیش خیتای – واتە سوارە چینییەکەم لەگەڵ لیوایەك لە مەغۆلییەکان و تەتەرەکاندا نارد بۆئەوەی تۆڵە و سزای ئەو داگیرکەر و سەرپێچیکەرانە بداتەوە کە هێرش دەبەنە سەر سنووری باشوور و ڕۆژئاوای وڵاتەکەم.

هەروەها بۆئەوەی ئەو ڕاپەڕینانە دابمرکێنێتەوە کە لە لایەن هەندێ لە شازادە چاوچنۆکەکانمەوە لە دژی من هەستابوون و ملکەچی منیان نەدەکرد و فەرمانەکانی منیان پشتگوێ دەخست و جێبەجێیان نەدەکرد.

شێخ عەلیشم لە نزیك سەمەرقەندەوە دانابوو. بۆئەوەی هەمووکات ئامادەبێت و دژی ئەو قۆزاف و مەغۆلیانە بوەستێتەوە کە گێرەشێوێنی و ناکۆکی لە نشێوەکان و چیاکانی باکووردا دەنێنەوە.

سەربازە فارسەکان و ئەفغانییەکانی شێخ عەلی دژی هۆزە مەغۆلییەکان زۆر بە کەیف و خۆشییەوە لەگەڵیاندا حەزیان بە شەڕکردن دەکرد. هەروەك چۆن سەربازەکانی خیتای ئامەزرۆی شەڕ بوون دژی ئەو هۆز و عەشیرەتانەی کە لە باشووردا بوون بۆئەوەی سەرکوتیان بکەن و لەناویان بەرن.

هەر کە دڵشاد، شاهرِوخی بوو، ئیتر دوای ئەوە هەموو کات و هۆشی و گۆشی خۆی لە پێناوی پەروەردە و بەخێوکردنی ئەودا تەرخان کردبوو.

جیهانگیریش هەموو کات و دەمێك لەگەڵ مندا بوو. لە کەژی زستاندا کە ئیشوکاری شانشینەکەم، کەم بوو، ماوەمان هەبوو زوربەی زۆری شەوانی هەفتە تا نیوەشەو پێکەوە یاری شەترەنجمان دەکرد. لە یەکێك لەو شەوانەدا جیهانگیر داوای لێکردم کە رێی پێبدەم عائیشە و تەمینە لەگەڵ خۆیدا بهێنێت. لە کاتێکدا ئێمە یاری دەکەین ئەوانیش تەماشامان بکەن.

وتم: زۆرچاکە جیهانگیر بنێرە بە دوایاندا بابێن..

وتی: هەردووکیانم لەگەڵ خۆمدا هێناوە و وان لە دەرەوە ڕاوەستاون و چاوەڕێ دەکەن.

وتم: باشە، بانگیان بکە با بێنە ژوورەوە.

کاتێك هاتنە ناو ژوورەکەم پەیمانی دامێ و وتی:

-عائیشە و تەمینە هەرگیز نابنە کۆسپ و لە کاتی یاریکردنەکەماندا هیچ قسەیەکیش ناکەن.

ئەم داواکردنەیم بە نیشانێکی باش دانا و بەڵگەی گەورەیی و سەرەتای پێگەیشتنی کەسایەتی خۆی بوو. وای لێدەکرد هەست بکات کە چ هێز و توانایەکی هەیە بە پێچەوانەی ژنە گەنجە حیلکە حیلك کەرەکانی منەوە، ئەو دوو ژنە واتە عائیشە و تەمینە لەسەرخۆ و بە حەیاو شەرمەوە هاتنە ناو ژوورەکەمەوە و لەبەردەممدا چەمانەوە و کڕنووشیان بۆ هێنام. منیش دوای ئەوە بە سەر ئاماژەم بۆ جیهانگیر کرد کە فەرمانیان بداتێ هەستن.

بە زمانێکی ئاسایی و لەسەرخۆ پێم وتن:

-من بە هاتنی ئێوە.. بۆ ناو ژوورەکەم پێخۆشحاڵم.

ئەوانیش بە چاوە جوان و نەرمەکانیانەوە تەماشای ڕووە جوانەکەی جیهانگیریان کرد.

جیهانگیریش بە زمانێکی شیرین و لەسەرخۆوە پێی وتن:

-عائیشە لێرەدا دابنیشە.. تەمینە تۆش لەولایەوە دابنیشە.

بە شێوەی قسەکردنەکەی پێکەنینم هات.. منیش بۆنەوەی پێکەنینەکەم دەرنەبڕم، دەستمکرد بە کۆکەکۆك.

ئیتر ئەوکاتە لە قسەکانی نۆیجا بە تەواوی تێگەیشتم کە لە باڵخ پێی وتم کە هەردووکیان ئامادەن لە پێناوی کوڕەکەمدا گیانی خۆیان ببەخشن..

کاتێك مێزەکەمان لە نێوانماندا دانا و دەستمانکرد بە یاری، جیهانگیر رووی کردە عائیشە و پێی وت:

-عائیشە هەستە بچۆ شتێکمان بۆ بێنە بیخۆین..

کچە گەورەکە بە رێکوپێکی و هێواشییەوە لەسەر مێزەکە هەستا و چوو قاپێکی پڕ مێوژ و گوێزی بۆ هێناین و بەو شێوەیەی ڕاهاتبوو، لە پێشدا لەبەردەم جیهانگیردا ڕاوەستا و قاپەکەی بۆ ڕاگرت تاکو هەندێك مێوژ و گوێز بۆ خۆی هەڵگرێت. ئەویش زۆر بە ئەدەب و هێمنییەوە پێی وت:

-عائیشە مێوژ و گوێزەکە لە پێشدا پێشکەشی باوکمی بکە..

خێرا عائیشە بۆ لای من وەرچەرخایەوە، گەرچی کارێکی نابەجێشی نەکردبوو، بەڵام لە چاوەکانیدا ترس و شەرمەزاریم بینی. منیش دڵنیابووم لەبەر تەریقی و شەرمەزاری خۆی وا سوورهەڵگەڕا.

منیش لە ڕوویدا زەردەخەنەیەکی ئاسایی جوانم بۆ کرد، تاکو هاتەوە سەرخۆی و سیمای گەشایەوە.

لەگەڵ جیهانگیردا دەستمکرد بە یاری و دوو کچەکەش جوان سەرنجی جووڵەی دەستی جیهانگیریان دەدا. ئەو دوو کچە لە پەیمانەکەیاندا ڕاستگۆ بوون. هیچ کەسێکیان دەنگێك یان جووڵەیەکی وایان نەکرد، وامان لێبکات سەرنجی ئەوان بدەین و یارییەکەمان لێ تێك بدات.

پاش تۆزێکی تر جیهانگیر ڕوویکردە تەمینە و پێی وت:

تەمینە مەیمان بۆ بێنە.

بە سەیرێکەوە تەماشای جیهانگیرم کرد.. بینیم دەموچاوی تێکچوو، شڵەژا. تێگەیشتم جیهانگیر لە سۆز و بەزەیی و کردەوەیدا ڕاست و ڕەوانە و جیاوازی نێوان خۆشەویستییان ناکات.

منیش بیری ئەو سۆز و کردەوەیەی خۆمم کەوتەوە کە لە هەرزەتی لاوێتیمدا، چۆن بە یەکسانی لەگەڵ لەیلا و زێبادا دەجووڵامەوە و هەڵسوکەوتم لەگەڵدا دەکردن. بەڵام هۆی شێواوی و نائارامی جیهانگیر تێنەگەیشتم. بەوەش دڵخۆش بووم، کە سەرنجم دەدا بەسەر ئەو دوو کچەدا باش خۆی فەرز کردبوو. نیشانەی ئێش و ئازار و بێزاریم لە هەڵوێستی دوو کچەکەدا دەبینی و ئەو ئێش و ئازارەشم هەست کرد کە جیهانگیر پێوەی دەناڵێنێت.

دوای ئەوە تەمینە پێکی عەرەقەکانی بۆ پڕکردین، بە هێواشی گەڕایەوە شوێنەکەی خۆی. تەماشایەکی کچەکانم کرد بینیم سەرنجی جووڵاندنی دەستمیان دەدا و بە حەیا و شەرمەوە چاویان هەڵدەبڕی و دایان دەخستەوە.

ئەو تەماشاکردن و سەرنجە زۆرەی کچەکان لە منیان دەدا وای لێکردم بشڵەژێم و بێ ئارامم بکات. گەرچی لە ڕاستیشدا ئەو تەماشاکردن و سەرنجدانە زۆرەی کچەکان، وەك ئەو سەرنج و تەماشاکردنەی ژن و کەنیزەکەکانی خۆم نەبوو.. لەبەرئەوە هەر کە دانیشتن شەومان کۆتایی هات هەستم بە دڵنیایی و ئارامی کرد.. کاتێك دوو کچەکە مێز و قاپەکانیان لابرد، جیهانگیر بە شەرمەوە لێی پرسیم:

-باوکە ڕێ بەو دوو کچە دەدەیت، دەستت ماچ بکەن؟!!

زۆر بە سەیر و سەرسوورمانەوە وتم:

-بێگومان ڕازیم و زۆریشم پێخۆشە..

یەکەمجار ڕوویکردە عائیشە و پێی وت:

-وەرە پێشەوە دەستی باوکم ماچ بکە..

عائیشە لەبەردەممدا چەمایەوە و منیش دەستی ڕاستم بۆ درێژ کرد. ئەویش زۆر بە ڕێز و هێمنی و شەرمەوە دەستی ماچ کردم و پاشان بە هێواشی هەر بە سەردانەواندنەوە گەڕایەوە دواوە.

دوای ئەوە جیهانگیر تەماشای تەمینەی کرد و داوای لێکردم، وەك چۆن عائیشە دەستی ماچ کردم ئەویش وەها دەستم ماچ بکات.

کچە بچووکەکە لە بەردەممدا چەمایەوە و دەستی گرتم و ماچی کرد. بەڵام ئەم زیاد لە عائیشە پاش ئەوەی زۆر بە ڕێز و نەدەبەوە یەکەمجار دەستی ماچ کردم. دەستمی خستە ناو لەپی دەستە بچووکەکانییەوە و بەرزی کردەوە و ماوەیەك نووساندی بە ڕوومەتە ناسکەکانییەوەو هەمدیسان ماچی کردەوە.

ئیتر تۆزێك بە ترس و لەرزەوە تەماشای کردم و سوپاسی کردم.

منیش دەستیم گوشی و پێکەنینێکی نەرمم بۆ کرد و وا خۆم پیشاندا، هەموو شتێك ئاساییە و بە چاکی تێپەڕیوە.

پاداشی منیش بریتی بوو، لە دەربڕینی خۆشی و شادییەك، وەك ئەو خۆشی و شادییەی پیاوێکی ئاینی تەماشای چاوی حاجییەکی لەخواترس دەکات کە ناخۆشی ڕێگای حەجی چەشتووە تاکو گەیشتۆتە کەعبەی پیرۆز.

تەمینە بە دەنگێکی هێواش و چرپەوە پێی وتم:

-گەورە و بەڕێز شازادە تەیموور ئێمە سوپاسی تۆ دەکەین بەوەی قایل بوویت و ئێمەت داوە بە شازادە جیهانگیر.

دوای ئەوە جیهانگیر بە دەستەکانی چەپڵەیەکی لێدا و هەردوو کچەکە چوون لە دواوەوە ڕاوەستان. گەرچی جیهانگیر لەبەر هەڵسوکەوت و کردەوەی تەمینە تۆزێك نائارام و شڵەژا بوو.. لێی پرسیم:

-باوکە جارێکی تر ڕێ بەم دوو کچە دەدەیت سەردانت بکەنەوە؟!

وتم: بەڵێ.. کورم.. هەرکاتێك ویستیان دەتوانن بێن بۆ لام.

وتی: بە هاتن و بینینیان بێزار نابیت؟

وتم: نەخێر.. جیهانگیر.

ئیتر دوای ئەوە میوانەکانم بەڕێکرد. بەڵام من لە مەبەستی جیهانگیر نەگەیشتم، بۆچی ئەو دوو کچەی هێنا بۆ سەر مێزی شەترەنج کردن.

پاش دوو سێ دانیشتنی تر لەسەر مێزی یاری شەترەنج و ئەو خۆشەویستییە زۆرەی ئەو دوو کچە کە بە یەکسانی بەسەر من و جیهانگیردا دابەشیان دەکرد.

تێگەیشتم جیهانگیر ئەوەندە منی خۆشدەوێت. لە خۆشەویستییەکەیدا سەری کردبوو بۆ ناو خێزانە بچووکەکەی. و هەر لەبەرئەوەش بوو دوو ژنەکەی دەهێنا بۆلام بۆئەوەی سەرم بۆ دانەوێنن کڕنووشم بۆ بەرن. نەك بۆئەوەی پێخۆشحاڵ بن بە شارەزایی ئەو لە شەترەنجدا.

دڵسۆزی ئەم دوو کچە گەنجە زۆر جیاوازی هەبوو لەگەڵ ئەو دڵسۆزییەی ئەو ژنانەی لەمەوپێش بینیبووم. ئەو دەست ماچ کردنە دۆستانەیەیان کە دەستی منیان ماچ دەکرد. وەك ئەو دەستگوشین و دەستگرتنە دڵدارییەی یەکەمجاری ژنەکانم نەبوو کە دەچووم بۆ لایان و لەسەر جێگای نووستندا پێشوازییان لێدەکردم. ئەم کێشەیە بە تەواوی بێزاری کردبووم.

پاشان میران شا و شێخ عومەریشم بۆ لای خۆمان بانگکرد. مەبەستم لەم بانگهێشتنەدا ئەوە بوو لایەنی کەم ململانێ و بەربەرەکانی لە نێوانیاندا دروست بکەم. یان شتێك لە نێوانیاندا بهەژێنم، کە خۆشم نەمدەزانی ئەو شتە چییە. چونکە من دەربارەی ئەوان لە دوودڵی و

سەرسووڕمانێکی یەکجار زۆردا بووم. هەروەها شازادە شێرێزاشم بانگکرد. گەرچی بانگکردنەکەم بۆ ئەو زۆر بە دڵ و ڕاست نەبوو. لەبەرئەوە زۆر گوێم بە هاتنەکەی نەدا و گرنگیشم پێنەدا. چونکە زۆر کاتم لەگەڵدا بەسەر نەدەبرد و پشتگوێم خستبوو.

ئەویش بە تەمای ئەوە نەبوو، من زۆر گرنگی پێبدەم و دەست لەناو قەدە باریکەکەی بخەم و دەست بە سمتە پڕ و خڕەکەی و مەمکە بەرز و قوتەکەیدا بهێنم. گەرچی هەر شانازی بە سمت و مەمکە خڕ و پڕەکانییەوە دەکرد، کە بەهرەی خوایە و خوا پێی بەخشیوە. لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا پێستی نەرم و شل و ڕەنگ و ڕووخساری جوان و سەرنجڕاکێش و خۆش بوو.

بەڵام من وەك پێویست بوو لە سەرم نەدەچوومە سەر جێگای نووستنی و حەزم نەدەکرد دەستی بۆ بەرم و لەگەڵیدا ڕابوێرم. لەبەرئەوەی من وام دادەنا، کە یەکێکە لە ئەندامانی خێزانەکەم، پێویستە ئامادەی ئەو کۆبوونەوانە ببێت کە لە ژیانی خێزانیدا ڕوودەدات.

کاتێك شێرێزا و کوڕەکانی هاتن و گەیشتنە لامان، دوو ژنەکەی جیهانگیر دانیشتبوون. هەرکە شێرێزا گەیشت و هاتە ژوورەوە و ئەو دوو کچەی بینی زۆر سەری سووڕما، ڕووی تێکردم و وتی:

-ئەم دوو شازادەیەش دەنێرن و ژنەکانی خۆیان بانگ دەکەن!!

منیش پێکەنینێکی نەرمم کرد و پێم وت:

-ئەگەر ئەوان حەز بەوە دەکەن، منیش بە خۆشییەوە پێشوازی ژنەکانیان دەکەم.

شێرێزا لە میران شای کوڕی پرسی:

-ها میران ئایا حەزدەکەیت بنێریت بە دوای ژنەکانتا؟!

وا جیهانگیریش ژنەکانی هێناوە و لەگەڵیاندایە..!!

میران بە ڕوویەکی گرژ و مۆنەوە وەڵامی دایەوە:

-بەڵێ.. دایە.. حەزدەکەم بنێرم بە دوایاندا..!!

پاشان ڕوویکردە شێخ عومەر و لێی پرسی:

-ئەی تۆ شێخ عومەر؟

شێخ عومەر لە سووچێکی ژوورەکەدا ڕاوەستابوو، گەمەی بە نووکی شیرێك دەکرد کە لە جبەخانەکەدا دەریهێنابوو. بێ ئەوەی گوێ بداتە قسەکانی دایکی. شانی ڕاوەشاند و پێی وت:

-دایە.. من ئەوەم زۆر لا گرنگ نییە، تۆ خۆت چۆنت پێخۆشە وا بکە.

شازادە شێرێزا سەری ڕاوەشاند و وتی:

-کەواتە دەنێرم بە دوای هەموو ژنەکاندا..!!

شێخ عومەریش دوای قسەکەی ئەو بێموبالاتانە پێی وت:

-ئا..وا باشە..

جیهانگیریش چووە لای جبەخانەی چەکەکانەوە و لەگەڵ براکەیدا ڕاوەستا. گەرچی شێخ عومەر ساڵێك لە جیهانگیر بچووکتر بوو. بەڵام کەمێك لە جیهانگیر درێژتر بوو. وەکو ئەویش چوارشانە و قەڵەو بوو.

شێخ عومەر ئاماژەی بۆ شیرە جوانەکەی من کرد و پیشانی جیهانگیری دا و پێی وت:

-ئایا ئەمە جوانییە؟ جیهانگیر ئایا ئەم شیرە لە کێ جوانتر نییە؟

وەڵامی دایەوە:

-بەڵێ.. ئەمە باشترین و چاکترین و نایابترین شمشێری باوکمە.. تاکو ئێستا هیچ کەسێك و هیچ پیاوێك شمشێری وەهای بە دەستەوە نەگرتووە.

عومەر وتی:

-من دەزانم خاڵە عەلیم زۆر باسی بۆ کردووم. منیش ناسیمەوە زۆریش حەزدەکەم تاقی بکەمەوە.

جیهانگیر ڕووی تێکردم و لێی پرسیم وتی:

-باوکە، ڕێگا بە شێخ عومەر دەدەیت شیرەکەت تاقی بکاتەوە؟ زۆرم پێناخۆش بوو، بینیم جیهانگیر وەك هۆکارێك و تکاکارێك بوو لە نێوان من و عومەردا، شێخ عومەر لەم کاتەدا وەك لاوێکی نامۆ خۆی دەنواند. گەرچی شێخ عومەر و میران شای برای دوو ساڵی تەواویان لە کۆشکەکەمدا بەسەر بردبوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەڵسوکەوت و کردەوەیان دەتوت میوانن و نامۆن.

منیش هەردووکیانم خستبووە ژێر چاودێری و سەرپەرشتی دایك و مامۆستاکانیانەوە و بە تەواوەتی پشتگوێم خستبوون.

ئیتر هەر ئەوکاتە بڕیارم دا شێخ عومەر و میران شای برای بخەمە ژێر پەروەردە و چاودێری تایبەتی خۆمەوە!!

تەماشای عومەرم کرد و پێم وت:

-عومەر بێگومان دەتوانیت تاقی بکەیتەوە.

جیهانگیر شیرە گەوهەربەندەکەی لە جبەخانەکە، دەرهێنا و مستۆی شیرەکەی بۆ عومەر درێژکرد و عومەریش شیرەکەی لە کالانەکەی دەرهێنا.

لە نێوان ئەو خۆشی و ئارەزووە زۆرەیدا، ئەو کاروان و شەوەی شاری شەهری سیبزم بیرکەوتەوە کە چۆن یەکەمجار ئەو شیرەم بینی و چۆن دەستم لەو شیرە جوان و نایابەوە دا. و چۆن یەکەمجار هەڵمسووڕاند. عومەر شیرەکەی زۆر لەسەرخۆ و بە ئاگاهییەوە لە کالانەکەی دەرهێنا و دەمی شیرەکەی بۆ پێشەوە درێژ کرد و بە جووڵاندنێکی لەسەرخۆ و شارەزایانەوە بۆ سەرەوە، بۆ خوارەوە، بۆ ئەملاو بۆ ئەولای جووڵاند و ڕایوەشاند.

پێکەنینی شادی و خۆشی لە ڕوویدا دەرکەوت و بە گەشییەکەوە سەری شادی و ڕەزامەندی ڕاوەشاند.

منیش چاوم ئەما وەك ئەو دەستمكرد بە پێکەنین و هاوبەشی شادی و خۆشییەکەیم کرد.

ئینجا شیرەکەی بەرزکردەوە و بە پەلەپیتکە دای لە دەمی شیرەکە و لەرین و دەنگدانەوەی شیرەکەی گوێ لێگرت.

ئەو دەنگدان و لەرینەوە ڕەوانە کە لە ژوورەکەدا بە نەرمی و هێواشی دەنگی دایەوە، تاکو ئێستا، لەو هەموو شەڕ و جەنگانەی من هاوبەشیم تێدا کردبوو، هیچ کاری تێنەکردبوو، تێکیش نەچووبوو.

دووبارە عومەر بە توندی پەلەپیتکەی دایەوە لە دەمی شیرەکە و دەنگدانەوەیەکی توندتری لێوەهات.

عومەر و جیهانگیر هەردووکیان پێکەوە تەماشای منیان کرد. منیش بەو دەنگە ساف و ڕەوانە وەك ئەوان شاد و کەیفخۆش بووم.

ئینجا عومەر تۆزێك بۆ دواوە کشایەوە و بە شیرەکەی دەستی کرد بە یاریکردن و ڕاوەشاندنی. هەڵسوکەوتی زۆر بە جوانی لە شێوەی جووڵان و هەڵسوکەوتی شێخ عەلی خالی دەچوو.

دوای ئەوە عومەر شیرەکەی بۆ لای جیهانگیری برای درێژکرد و پێی وت:

-ها برا شیرەکە بگرە..!!

جیهانگیریش شارەزایانە لێی وەرگرت و گرتی بە دەستەوە. زۆر بە جوانی و شارەزاییەکی زۆر زیاتر لە براکەی دەستی کرد بە ڕاوەشاندن و یاریکردن پێی.

منیش هەستام و لە جبەخانەی چەکەکان شیرێکی ترم دەرهێنا و پێم وتن:

-دەی ئەوا پیاوێکی تر بە شیرەوە لە بەرامبەرتا ڕاوەستاوە..!!

جیهانگیر بە هێمنی و لەسەرخۆییەوە تەماشای کردم و لە شوێنەکەی خۆیدا ڕاست ڕاوەستاو ئامادە بۆ جەنگ.

لەسەرخۆ بە سەرنجدان و شارەزاییەوە لەگەڵمدا دەستی بە شیربازی کردن کرد. من زۆر بە ئاسانی خۆم لە لێدانەکانی قوتار دەکرد. بەڵام سەرنجم دا لەم چەند مانگەی دواییەدا، زۆر باشترو شارەزاتر ببوو. ئیتر لەوە دڵنیابووم کە لە پاشەڕۆژدا دەبێتە سوارچاکێکی شارەزا و بێهاوتا. ئینجا بە گاڵتەکردنەوە وتم:

-شارەزایی و شانازی و گەورەیی بۆ شیر نییە، بەڵکو شانازی بۆ ئەو دەستەیە کە دەیگرێت بە دەستەوە و هەڵیدەسووڕێنێت و دەیوەشێنێت.. جیهانگیر وا نییە؟!!

وەڵامی دایەوە:

-باوکە، تۆ لەم کارانەدا لە من زیاتر شارەزاتریت.

وتم:

-ڕاستە.. بەڵام شیروەشاندنەکەت، شیروەشاندنێکی سوارچاکێکی شارەزایە و شیر هەڵسووڕاندنی قوتابییەکی تازەپێگەیشتوو نییە.

وتی: کوڕی لاوی ڕاستەقینە وەك چۆن باوکی پێگەیشتووە ئەویش وەها وەك باوکی خۆی پێدەگات.

ئیتر دوای ئەوە نەمتوانی شادی و خۆشی خۆم بشارمەوە. دەستمکرد بە پێکەنین و زیرەکی جیهانگیرم زۆر بە دڵدا چوو.

عومەریش زۆر بە خۆشی و تامەزرۆییەوە تەماشای دەکردین.

جیهانگیریش شیرەکەی بۆ درێژکرد و پێی وت:

-ها عومەر تۆش شیرەکە بگرە و شارەزایی خۆت لەگەڵ باوکتدا تاقی بکەرەوە.

عومەریش شیرەکەی بە دەستەوە گرت و لێدانی توند و تیژی ناڕاستە دەکردم وام دەهاتە پێشچاو، کە من لەگەڵ شێخ عەلی خۆیدا ڕووبەڕوو وەستاوم.

چونکە چاوە گەش و پێکەنیناوێکانی و لێوە ناسك و ڕووە خەنداوێکەی و خۆڕاگرتن و ئازایەتییە بێهاوتاییەکەی و شیر هەڵسووڕاندن و جووڵاندنەکەی زۆر زۆر لە شێخ عەلی خاڵی دەچوو.

گەرچی عومەر لە جیهانگیر زۆر بەهێزتر بوو. بەڵام وەك برا گەورەكەی شارەزا و كارامە نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا من بە هێز و توانا و، شارەزایی لە بەكارهێنانی شیرو هەڵسووڕاندنیدا زۆر شاد و دڵخۆش بووم.

پاشان تۆزێك بۆ پاشەوە كشامەوە و بە خۆشی و شادییەكەوە سڵاوم بۆ كرد. ئەویش وەڵامی سڵاوەكەی دامەوە و زۆر بە گەرمی و پابەندبوونەوە پێی وتم:

-بە ڕاستی ئەم شیرە، شیرێكی شاز و نایابە..

باوكە ئەم شیرەت لە كوێ دەستكەوتووە؟

وتم: ئەم شیرەیان داوەمەتێ..!!

وتی: ئۆهـ بەڵێ خالە عەلیشم هەر وای پێ وتم.

وتم: بەڵام پاشەڕۆژ یەكێك لە ئێوە لێم وەردەگرێت و دەبێتە هی ئەو.

ئینجا خاتوو شێرێزا ڕوویكردە میران شاو پێی وت:

-ئەی تۆ میران ناتەوێت شیرەكەی باوكت تاقی بكەیتەوە؟

وەڵامی دایەوە:

-بەڵێ.. دایە منیش تاقی دەكەمەوە..

پاشان ئەو پارچە حەڵوایەی كە بە دەستەوە بوو، دەیخوارد. لەسەر ئەو مێزەی كە لە كاتێكدا ئێمە شیربازیمان دەكرد و ئەو لەسەری دانیشتبوو، داینا. هەستایە سەرپێ و عومەریش شیرەكەی بۆ میران شای برای ڕاگرت و وتی: میران ها بگرە ئەوە شیرەكەیە..

میران شا مشتۆی شیرەكەی گرت بە دەستەوە، بەڵام نەك وەك شارەزایی جیهانگیر و تامەزرۆیی عومەر.

بەڵام زۆر بە وریایی و شێوەیەكی جوانەوە بێنەوەی خۆی بشڵەژێنێت و بە سەلامكردنەوە خۆی ماندوو بكات. ڕێك لەبەردەممدا ڕاوەستا و چاوەڕوانی جووڵەی من بوو.

دوای ئەوە زۆر بە توندی و تووڕەییەوە هێرشی بۆ هێنام. لە شیروەشاندنەكەیدا، هەندێ جار شارەزایی و جوانی تێدابوو. بەڵام هەندێ جاریش شیر وەشاندنەكەی نەزانانە و بێهۆشانە بوو. بەڵام بەردەوام هەر هێرشی بۆ دەهێنام و دەهاتە پێشەوە. هەردەم ڕووگرژ و مۆن و نێوچەوانی دابوو بە یەكدا.

ئەمە نیشانەی ئەوە بوو كە میران شا دڵی بەم شیربازییەوە نەبوو، وە حەز و ئارەزووشی لێنەبوو.

لە ڕاستیدا منیش لە بەرامبەریدا نەرم و نیان بووم، چونکە نەمدەزانی بۆچی وا بە توونێ و خێرایی شیرەکەم بۆ دەوەشێنێتەوە و دەیەوێت لێم بدات. ماوەیەکی زۆر شیرەکەی هەڵسووڕاند و زۆر بە توندیش دەیوەشاند، تاکو توانی "جا بە هۆی شارەزاییەوە بێت یان بە هۆی بەختەوە بێت" کتوپڕ شیرێك بدات لە قۆڵم و بە نووکی شیرەکەی قۆڵمی بریندار کرد.

کتوپڕ، تەمینە قیژانی و لەگەڵ عائیشەدا ڕایانکرد بۆ لام.

میران شا بە ترس و لەرز و سەرسووڕمانەوە بۆ دواوە کشایەوە و بە پاڕانەوەوە و داوای لێبووردنەوە وتی:

-باوکە.. من نەمویست بریندارت بکەم!! دەشترسم برینەکەت قووڵ و کاریگەر بێت و ئازاریشی پێگەیاندبێت.

-نا.. نا.. میران مەترسە و دلگران مەبە.. هیچ نییە و برینەکەش کەمە.

-عائیشە و تەمینە قۆڵیان گرتم و بە پارچە قوماشێکی ئاوریشمی تەنك برینەکەیان بۆ پاك کردمەوە و بۆیان تیمار کردم.

لە ڕاستیدا برینەکە بچووك بوو. دوای ئەوە شیرەکانمان دانا.

کاتێك کەنیزەك و کیژەکانی تر بۆ لامان هاتن. ئێمە بە یارییەکی ترەوە کە ئازار و زەرەری تێدا نەبوو خۆمان خەریك کردبوو.

یارییەکی شەترەنجم بە جیهانگیر دۆڕاند.

ئینجا عومەر و جیهانگیر پێکەوە دەستیانکرد بە شەترەنج.

دوای ئەوە بەهانەهانەی شێرێزای دایکی. میران شا مێزی شەترەنجی هێنایە پێشەوە بۆلای کورسییەکەی من و داوای لێکردم یاری لەگەڵدا بکەم. منیش حەزم نەدەکرد یاری لەگەڵدا بکەم، چونکە دایکی پشتگیری دەکرد و ڕێنمایی دەکرد. هەروەها دوو کیژیش لە کەنیزەکەکانی کە مێوژ و گوێزیان دەخستە دەمییەوە ئاگاداریان دەکردەوە و ڕێنماییان دەکرد.

ئیتر ئاوەها پاش چەند جارێکی یارییە وشك و بێتامەکە، هەستم بە بێزاری و بێتاقەتی کردو داوام لە خاتوو شێرێزا کرد بێت و لە شوێنەکەی من دانیشێت و لەگەڵ میران شای کوڕیا یاری بکات.

لە ڕاستیدا هەرکە کاتی دانیشتنی شەومان کۆتایی هات. من زۆرم پێخۆشبوو کە میوانەکان هەریەکەیان بۆ ژووری حەوانەوەی خۆیان ڕۆیشتنەوە.

منیش بۆ لای نۆبجا چووم. چونکە هەر نۆبجا دەیتوانی من تێربکات و کەف و کوڵ و ئارەزووم دابمرکێنێتەوە، بێ ئەوەی جێ و شوێنم پڕبکات لە کوڕ و کچ. ئیتر کە نۆبجا خەم و بێزاری لە مێشکمدا نەهێشت و حەسامەوە. دڵنیابووم لەوەی بێ شك و گومان کە من مرۆڤێکی نەك و بەختیارم. چونکە من ژنی زۆرو منداڵی زۆریشم هەیە بێ ئەوەی من هیچ ئێش و ئازارێکیان پێوە بچێژم و گرنگی زۆر بە کاروباریان بدەم و گوێیان پێبدەم و خۆیان پێوە ماندوو بکەم. چونکە من زۆر کەسم دەناسی ماڵیان وێران ببوو، ببووە دۆزەخ و سەریان لێشێوابوو، چونکە خەم و خەفەت و کێشەی ناو خێزانەکەیان بیروهۆشیانی لەدەست دابوو. هەموو کات و ساتێکی خۆیان بەوەوە خەریك کردبوو، وای لێکردبوون شەڕ و کوشتاریان لەبیر بچێتەوە کە ئەو شەڕ و کوشتارەش دەوڵەمەندی دەکردن و ماڵ و سامانی زۆر و گەورەیی بۆ وەدەست دەهێنان.

هەروەها زۆریشم پێخۆش بوو کە حەز و ئارەزوو، سیفەتی منداڵەکانم تێگەیشتم. هەروەها توانیم تێبگەم کە چۆن من دەتوانم وایان لێبکەم لە حەز و ئارەزووی خۆیان سوود وەربگرن.

تێگەیشتم کە شێخ عومەر لە پاشەڕۆژدا دەبێت بە سوارچاکێکی گەورە و بەتوانا و نەفەرێکی بەناوبانگی وەك شێخ عەلی خاڵی. بەڵام هیچ کات بە کەڵکی ئەوە نایەت کاروباری بەڕێوەبردن ببات بەڕێوە و بە کەڵکی پرس و ڕا نایەت.

میران شاش ئەگەر بە باشی چاودێری بکرێت و یەکێکی عاقڵ و کارامە و تێگەیشتوو ڕێنمایی بکات و ئاگری تەماع و گەورەیی لە مێشك و دەمارەکانیدا هەڵگیرسێنێت ئەوا زۆر لە هەردوو براکانی باشتر دەبێت.

بەڵام جیهانگیر کوڕی گەورەم، پێویستی بە چاودێری و ئاگادارییەکی کتوپڕی و ڕێنماییەکی ڕاست و خێرا هەیە.

بەڵام من چۆن دەتوانم ئەو جوانی و هەستە ناسك و لوتفە زۆرەی بگۆڕم و بیکەم بە سیفەتی مرۆڤێکی سوارچاکی بە سوود..؟

هەر تەنها لەشە جوان و بۆن خۆش و عەتر و عەبیر بۆن و بەرامە شازەکەی لەش و لاری نۆبجا بوو کە دەیتوانی ئەگەر چارەسەریشی بۆ نەدۆزمەوە، خۆ بە لایەنی کەمەوە دەیتوانی ئەو خۆشی و ڕابواردنە بدۆزمەوە کە تینوێتی و پێ لەسەرداگرتنم دابمرکێنێتەوە. بۆئەوەی ئەو کێشە و گرێ کوێرەیە شی بکاتەوە.

ئیتر ئاوەها ڕووم کردەوە بۆ ناو ئەو باوەش و لەش و لارە جوان و نەرمونۆڵ و بۆن خۆشەی نۆبجا.

* * *

# مردنی ئیلشی

وەرزی بەهار ئەمساڵ لە شەهری سیبزدا، پێش سەمەرقەند زۆر بە زوویی سەرەتای دەرکەوت. لەبەرئەوە منیش شانشین و دەستوپێوەندەکانی خۆم گواستەوە بۆ شەهری سیبز. چونکە ئەو ساڵە ڕەمەزان دەکەوتە وەرزی بەهارەوە.

هەروەها حەزیشم دەکرد کاروباری کۆتایی دروستکردنی گومەزی سەرمەزاری ئەلجای و گومەزی سەرمەزاری باوکم ببینم. کە ماوەی دوو ساڵ و نیو بوو بە دروستکردنیانەوە خەریکبوون.

مەزارەکانیش لە باخچەی کۆشکەکە و لەناو حەوشی مزگەوتەکەدا دروستدەکران. هەروەها تیپێکم دروستکرد، کە پێکهاتبوو لە کوڕ و نەوەکانی شازادەکانم. بە هۆی ئەوەی جیهانگیر تەمەنی گەیشتبووە هەژدە ساڵان دەمویست جیهانگیر بکەمە سەرتیپی ئەو تیپە.

زەوی شەهری سیبزیش کە بە درێژایی ڕووبارەکە درێژببۆوە، زۆرباش دەگونجا لەگەڵ ئەو بیرۆکەیەی مندا بۆ مەشق و نمایشکردن. وە ئەو ئاواتەی منی دەهێنایە دی کە جیهانگیر بتوانێت توانا و شارەزایی خۆی بۆ سەرکردایەتی ئەو تیپە دەرخات.

هەروەها چونکە من وا خۆم پیشاندابوو، ئەو ماوەیەی لە شەهری سیبزدا دەمێنمەوە، بۆ حەسانەوە و ماندوو دەرچوونمە.

دڵی خۆشم بەوە خۆش کرد کە شەوو ڕۆژ لەگەڵ دڵشاددا لە ژوورەکەی ئەلجایدا بەسەردەبەم.

هەروەها لەگەڵ شاهڕووخدا لە ژووری نووستنی منداڵی جیهانگیردا ببەمە سەر. و هەمدیسان و جارێکی تریش خۆم بدەمەوە دەست کاروباری شەیتانیم.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کاروبارو پێویستییەکانی ڕۆژانەی شاهانەکەمم پشتگوێ نەخستبوو.

بە شێوەیەکی گشتی بەیانیان لە بارەگای کۆشکەکەمدا بە کاروباری وڵات و هاووڵاتیانەوە خەریکبووم و دوای نیوەڕوانیش لە گۆڕەپانی مەشق و نمایشکردندا لەگەڵ قوتابییە جەنگاوەر و لاوەکانمدا خەریك بووم. هەر کە سواری پشتی ئەسپ دەبووم، زۆر هەستم بە دڵنیایی و خۆشی دەکرد. گەرچی من تەنها فێرکەری کاروباری شیربازی بووم. شازادە گەنجەکان زۆر بە ڕێز و گەورەییەوە پێشوازییان دەکردم.

جیهانگیر زۆر بە ئاسانی توانی سەرکردایەتی تیپە مەشقکەرەکە بکات. هەروەها شێخ عومەرو میران شای برای زۆر بە باشی سەلاندیان کە بە کەڵکی ئەوە دێن ببن بە سەرکردەی ئازا و شارەزا.

شێخ عومەر زۆر بە چاکی لەگەڵ فوتابییە جەنگاوەرەکاندا ڕێککەوتبوو. وە بە باشی لە یەکتر گەیشتبوون. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو فوتابییانە زیاتر بە دڵ جیهانگیریان خۆشدەویست و لە کاتگای دڵیانەوە ڕێزیان بۆ دادەنا. بەڵام میران شا لە هەموو شتێکدا کە ڕێگایەکی تایبەتی خۆی هەبوو، توانی ئەوە بسەلمێنێت کە فێرکەرێکی شارەزاو بەتوانایە. گەرچی لەگەڵ پیاوە جەنگاوەرەکانیدا ڕووگرژ و مۆن و توورە و شەڕانیش بوو.

بەهەرحاڵ کار هەرچۆنێك بێت، هیچ یەکێك لە کوڕەکانم ئەوەی نەسەلماند و هیچ نیشانەیەکی خۆیی و هێزێکی دینامیکی شارەزایی وایان نەنواند کە پێویست بێت تێیاندا بێت کە بتوانن لە پاشەڕۆژدا ببنە جێنشینی من و شانشینەکەم. ئیتر زۆر زۆر بیرم لە شاهڕووخ کردەوە و هەندێ جاریش بیرم لەو نەوانە دەکردەوە کە کوڕەکانم دەیانبێت و لە ناویاندا، تێیاندا هەڵدەکەوێت کە شایانی ئەوە بێت دوای من ببێت بە جێنشینم و جێگری تەختی شاهینشاهیم.

خوێنەکەی شاهڕووخ "خوێنێکی پاکی تەتەری بوو" خوێنێکی پاك و بێغەش بوو. وای لێدەکرد ببێتە جێگر و جێنشینم. گەرچی خوێنەکەشی ئەوەندە لە خوێنی جیهانگیر جیاوازتر نەبوو.

هەروەها شێرێزا خۆی چونکە شازادەیەکی ڕەسەن و لە بنەماڵەیەکی ڕەسەنیش بوو، وە یەکێك بوو لە وەچە و نەوەکانی پێغەمبەری مەزن موحەممەد وە لە وەچەی گەورەپیاوە جەنگاوەرەکانی باشوورییەکان نەبوو. من دەمزانی شێرێزا لە هێنان و هەڵبژاردنی ژن بۆ کوڕەکانی زۆر توندوتیژ دەبێت و بە هەموو کەسێك قایل نابێت.

جیهانگیر تەبیعەتێکی زۆر جوانی هەبوو. ئەو تەبیعەتەی ئەگەر تۆزێك توندوتیژ و گەرمی لەگەڵدا بوایە دەیتوانی لە پاشەڕۆژدا ببێتە جێگر و جێنشینم. لەبەرئەوە من چاودێری کوڕە گەورەکەمم دەکرد بۆئەوەی پێشبکەوێت و ببێتە پیاوێك شایانی جێنشینی من بێت.

بۆ ئەو مەبەستەش لەگەڵ دۆست و ناسیاوەکانمدا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هەوڵی ئەوەم دا، کە کچە شازادەیەکی ڕەسەنی چاکی بۆ بدۆزمەوە و بیکەم بە هاوسەری. کەیخەسرەو، شازادەی کتلان یەکەم کەس بوو، ناوی شازادە سیفینی بۆ هێنام.

شازادە سیفینیش کچی یوسفی خوارەزمی ئەمیری خیفا و سوڵتانی ئۆرغانج و ئەو شار و ناوچە دەوڵەمەند و بەرفراوانە و ئەو زەوییە زۆر و بەرفراوانە بوو، کە کەوتبووە دەوروبەری ڕووباری ئۆراڵەوە.

وتی:

-شازادە سیفین زۆر جوان و سەرنجڕاکێشە. بیستوومە دەڵێن لەش و لار و باڵایەکی زۆر جوانی هەیە و هەر لە لەش و لاری کچە شەرکەسییەکان دەچێت. قژی زەرد و چاوەکانی گەش و سەوزن و لە چاوی دایکی دەچێت!! لەبەرئەوەی من یوسف سۆفی خوارەزمیم دەناسی و دەمزانی کابوولییەوە لە بنەماڵە و لە خوێنی خاقانەکانە. لە کەیخەسرەوم پرسی:

-باشە کەسوکار و نەتەوەی دایکی کێن..؟

وتی: گەورەم لە ڕاستیدا من ئەوە نازانم..!!

وە لەو باوەڕەشدام کەسیش نازانێت، کەسوکار و نەتەوەی کێیە.. بەڵام ئەو خۆی تەنها بەسە.. و خۆی هەموو شتێکە و بە تەنها خۆی بە هۆزێکی تەواو دەچێت.. گەورەم ناویشی کۆلین مۆرفییە..!!

وتم: کەواتە لە ئەسڵدا خەڵکی وڵاتی جۆرجیایە.. وا نییە..؟

وتی: نەخێر گەورەم سۆفی ئەوکاتە دەستی کەوتووە کە هێرشیان کردۆتە سەر کافرەکانی دوای ڕووباری قەزوین.. و وا پێدەچێت لە پاشماوەی هەڵمەتی فەڕەنگەکان بێت.

وتم: کەواتە فەڕەنسییە..؟

وەڵامی دامەوە:

-خۆی دەڵێت کە کەسوکاری لە جوفیرناوە هاتوون. جوفیرناش دوورگەیەکی سەوز و ئاوەدانی ناو دەریایە و دەکەوێتە دوای وڵاتی فەڕەنگەکانەوە. زانا و شارەزاکانی ئێمەش دەربارەی ئەو جێگایە لە پەرتووکەکانی ئەغریقییە کۆنەکاندا خوێندوویانەتەوە. بەڵام هیچ کەسێك ئەو قسە و پاسانەی کۆلین مۆرفی پەگەن ناکەن و بە ڕاستی نازانن.

دانیشتوانی ئەو دوورگەیەش شارستانی نین و وەحشین..

هەروەها کۆلین مۆرفیش وەحشیە..!!

-چیی.. وەحشییە؟!!

-کۆلین.. لە کچە کیرغیزییەکان دەچێت.. ماوەی دە ساڵ دەبێت سۆفی دەستی کەوتووە.. دەڵێن هەرکاتێك یوسف سۆفی ویستوویەتی بچێتە لای و لەگەڵیدا ڕابوێرێت.. کۆلین بە توندی بەرهەڵستی کردووە و نەیهێشتووە سواری بێت..!!

چونکە وای هەست کردووە، کە بە زۆر سواری دەبێت و پەردەی کچێنی بە زۆر دەدڕێنێت..!!

چونکە هەموو کات دەڵێت، پێویستە پیاو یەك ژنی[1] هەبێت و بەس.

بەڵام یوسف سۆفیش خۆی زیاد لە سەد ژنی هەیە..!!

لە ڕاستیشدا کۆلین زیاد لە هەموو ژنەکانی تری سۆفی دەردیسەری و ماندوێتی بۆ سۆفی دروستکردووە.

من لەو باوەڕەدام سۆفی لە هەموو ژنەکانی زیاتر خۆشی و شادی لە کۆلین زۆرتر بینیبێت.

-تۆ دەڵێیت شازادە سیفین لە دایکی دەچێت.. وا نییە خەسرەو؟

-گەورەم کەس ناتوانێت لە کۆلین مۆرفی بچێت..!! بەڵام هەروەك هەندێ کەس پێیان وتووم، ڕوویەکی خۆش و ئەخلاقێکی زۆر بەرزی هەیە.

-تەمەنی شازادە سیفین، چەندە..؟

-ڕێم بدە با حسابی بکەم.. تەمەنی.. تەمەنی.. شانزە ساڵانە..

-زۆر چاکە.. تەمەنی نزیك تەمەنی جیهانگیرە.

ئیتر کەیخەسرەو بە وردی سەرنجی دام و تەماشای کردم. منیش تەماشای ئەوم کردەوە و پێکەنینێکی باشم بۆ کرد و پێم وت:

-بەڵێ.. کەیخەسرەو من بۆ ژنێك دەگەڕێم کە بۆ جیهانگیری بهێنم.

وتی: کەواتە بۆیە دەربارەی شازادە سیفین دەپرسیت!!

بۆئەوەی جیهانگیر بیهێنێت و مارەی بکات.. وا نییە گەورەم؟

وتم: بەڵێ.. ئەگەر کەسێك هەبێت بتوانێت ڕایبهێنێت.. ئەو کەسە تەنها جیهانگیرە..!! چونکە جیهانگیر زۆر شتی سرك و کێوی ڕاهێناوە لە بزنەکێوییەوە بگرە تا دەگاتە بەچکە شێر و پڵنگ.

---

[1] ئەمە لە ئاینی مەسیحیدا وایە. کە دەبێت پیاو تەنها یەك ژنی هەبێت و جیابوونەوەشیان لە کاتێکدا دەبێت کە ژنەکە یا پیاوەکە ناپاکی ژن و مێردایەتی لەگەڵ یەکتردا بکەن ئەوکاتە چ ژنەکە یان پیاوەکە بۆی هەیە لەوی تر جیابێتەوە، ئەمیان شووبکاتەوە ئەویشیان ژنێکی تر بهێنێت – وەرگێڕ.

وتـی: بـەڵێ.. ئـەو دەتوانێـت رایبـهێنێت.. چونکـە هـەموو دەزانـین جیـهانگیر توانـا و شارەزاییەکی تەواوی لەم کارانەدا هەیە..!!

شازادە سیفینیش شایانی ئەوەیە پیاو لە پێناویدا خۆی ماندوو بکات.

وتم: چاکە.. تۆ ئەمیر سۆفی دەناسیت، لەبەرئەوە خۆت ئامادە بکە تاکو بچیت بۆ کۆشك و شانشینەکەی. چونکە من دەمەوێت هەندێك دیاریی گران بە هاونامەیەکی گرنگیشی بۆ بنێرم.!!

وتی: بەڵام ئەمە زیاتر ئەوە دەگەیەنێت، کە تۆ داوای ملکەچی لێبکەیت، وەك لەوەی داوای کچەکەی بۆ جیهانگیر بکەیت.

بە تایبەتیش کە تۆ پێشەکی دیاریی نایاب و گرانبەهاشی بۆ دەنێریت.

وتم: من ئەوە دەزانم و دەشزانم چیش روودەدات.

وتی: بەڵام شازادە سۆفیش دەوڵەمەند و بەهێزیشە.

وتم: منیش دەوڵەمـەند و بـەهێزم. ئێستا لەسـەرت پێویستە تـا مـاوەی سێ رۆژی تـر خۆت ئامادە بکەیت و بکەویتە رێ.

سەری بۆ قسەکانم دانەواند و وتی:

-بەڵێ شازادەی گەورەم، چۆن دەفەرموویت وا دەکەم.

منیش خۆم دەمزانی کە بە دڵ حەزناکات و زۆریش بە پەرۆش نییە بۆ ئەم کـارە بچێت. لـە راستیدا چـەند ساڵێك لەمـەوپێش ئـەمیر سۆفی، کتلانـی داگیر کـرد و دەستی بەسـەردا گـرت و کەیخەسرەوی لە کتلان دەرپەڕاند هەر بەم هۆیەشەوە بوو کەیخەسرەو دەهاتە شانشینەکەم و لـە کۆشکەکەمدا سەردانی دەکردم.

هـەرچۆنێك بێـت کەیخەسـرەو بـۆ ئۆرغـانج بـۆ لای شـازادە سـۆفی رۆیشـت و لەگـەڵ خۆیـدا کاروانێکی گەورەی دیاریی نایاب و دانسقەی برد کە لە گەنجینـە و عـەمارەکانی شـەهری سـیبز و سەمەرقەندا دەرمهێنابوو.

لـە راسـتیدا مـن زۆر گوێـم بـەوە نـەدەدا، ئـەمیر سـۆفی رازی بێـت شـازادە سـیفین بـدات بـە جیهانگیر و ببێت بە ژنی یان قایل بێت بێتـە ژێـر فەرمانـەوە، یـان قـایل نـەبێت و ئـەو داوایـەم قبوڵ نـەکات و وام لێبکات دژی ئـەو جـەنگ هەڵبگیرسێنم. مـن هـەردوو لایەنەکەم لا مەبەسـت نەبوو. چونکە چەند ساڵێك بەسەرمدا تێپەڕیبوو، کە لەو ماوەیەدا یەك هێرشم نەبردبووە سـەر کـەس. جا لەبەرئـەوە.مـن زۆر بـە خۆشـی و ئـارەزووەوە پێشوازی ئـەوەم دەکـرد کـە هـەلێکم بـۆ

بڕەخسێت و بتوانم دووبارە سواری پشتی ئەسپەکەم ببمەوە و هەڵیکیش بۆ تیپەکەی جیهانگیر بڕەخسێنم بۆ ئەوەی بتوانن تامی جەنگی ڕاستەقینە بچێژن.

لە ڕاستیدا من حەزم بە کاری دووەم دەکرد. ناردم بە دوای شێخ عەلی و خیتای دا بۆئەوەی ئامادەبن و هاوبەشی بەستنی کۆڕی ئەنجومەنی ساڵی نوێ بکەن، کە لە ناوەڕاستی کەژی هاویندا دەبەسترا.

هەروەها بۆئەوەی خێرا بکەن لە مەشقکردنی ئەو سەربازە لاوە نوێیانەدا و بە باشی لەسەر شێوەی نوێی جەنگ و کوشتار ڕایانبهێنن و مەشقیان پێبکەن. هەروەها بۆئەوەی نێوەندێکی گونجاو بۆ هەڵمەتێکی سەربازانە دروست بکەم. وە بۆ ئەوەش خۆم لەو گەرما زۆرەی ناو شاردا قووتار بکەم. دوای ئەوەی هەندێ کەسم نارد بۆئەوەی خێمەی شاهانەم لە سەمەرقەندەوە بۆ بهێنن، تاکو شانشین و دەستوپێوەندەکەم بگوێزمەوە بۆ ئەو دەشتەی لە بەردەم ڕووبارەکەدا درێژ ببۆوە.

لەبەرئەوەی من لەو دەشتەدا لە هەموو لایەکەوە بۆنی ئاژەڵ و بۆگەنیانم بۆ دەهات. هەروەها بۆنی ئەو گیا وشکەم بەسەردا دەهات کە سەربازە سوارەکانم پێیان لێدەنا. لەبەر ئەمەش من زۆر حەزم دەکرد وەڵامی شازادە سۆفی، بۆ من دڵڕەقانە و سووکایەتی بێت. بۆئەوەی ببێتە بەهانە و بەڵگە بە دەستمەوە، و بەو هۆیەوە هێرشی بکەمە سەر. چونکە لە هەموو لایەکەوە شازادەکانم بە هۆی سەری ساڵی نوێوە دەهاتن بۆ لام و باج و دیاریی نایابیان بۆ دەهێنام.

چادرەکان لە دەشتەکەدا تا دەهات زیادی دەکرد.

قوببەی چادری تەتەرییەکان کە لبادی سپی دروستکرابوو. وە قوببەی چادری فارسەکان کە لە قوماشێکی ئەستوور دروستکرابوون، دیمەنێکی جوانیان بەو دەشتە دابوو.

هەر لە دیمەنی چادرەکانی ڕۆژانی کورغان دەچوو کە لە دەشتەکەی "ساڵی"دا هەڵیاندابوو. تا ئەمانە هەمووی بە گشتی و زۆر بە توندی و پێداگرتنەوە، پاڵی پێوەدەنام، ئەم هێزە زۆرەم ببەم بۆ کۆڕی جەنگ و کوشتار. بەڵام ئەم ئاهەنگی سەری ساڵە چەند ڕۆژێکی خایاند، و لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا کەیخەسرەو نەگەڕابۆوە، و هیچ زانیاری و دەنگ و باسێکیشی لە ئورغانجەوە نەنارد.

لەبەرئەوەی شێوەی ئاهەنگ و فێستیڤاڵەکە وردە وردە سارد و بێتام دەبوو منیش بۆئەوەی شازادەکانم لە شەهری سیبزدا بهێڵمەوە، تاکو کەیخەسرەو دەگەڕێتەوە. ئاهەنگی تازە و بە

شێوەیەکی نوێترم بۆ سازدەکردن. ئاخری ئاگاداری میوانەکانم کرد. کە تیپی یاریی "بۆلۆ"ی تیپەکەم، ئامادەیە یاری لەگەڵ هەر تیپێکی شازادەکاندا بکات و بەرامبەریان ڕابوەستێت.

ئیتر ئاوەها دەستکرا بە سازکردنی یارییەکە و بەرامبەر یەکتر ڕاوەستان. زۆر بە گەرمی و گرنگییەوە، زیاد لەوەی من چاوەڕوانم دەکرد دەستیان کرد بە یاریکردن. یارییەکەم زۆر گەورە کرد و پاداش و دیاری زۆر بە نرخ و گەورەم دانا، بۆ ئەو کەسانەی یارییەکە دەبەنەوە.

هەروەها لەسەر بردنەوەی یارییەکە گرەومان پێکهێنا.

شازادەکانیش لەو پێناوەدا زۆر بە گەرمییەوە یارییان دەکرد.

بەڵام ئەو تیپە شاهانەیەی کە سێ کوڕەکەی منی تێدابوو. تووشی هەندێ گیروگرفت بوون. چونکە من وەك هەستمکرد هیچ لاوێکی تر نەیاندەوێرا لە یارییەکەدا بەرهەڵستی ئەو شازادە لاوانە بکەنەوە. منیش لە ڕاستیدا حەزم دەکرد تیپەکەی ئێمە بدۆڕێت بۆئەوەی لەشکرەکەم زیاتر حەز بکات دووبارە یارییان لەگەڵدا بکاتەوە هەروەها پێش ئەوەی یارییەکە دەستپێبکات من هەواڵ بیستی خۆمم نارد بۆ ئەوەی ئەگەر کەیخەسرەو گەڕایەوە پێی بڵێن خێرا کات و بە گورجی بگەڕێتەوە. هەر کە یارییەکە دەستی پێکرد من زیاتر بیرم لای ڕێگای ئۆرغانج بوو، وەك لەوەی بیرم زیاتر لای یارییەکە بێت.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە ناچارییەوە سەرنجی زیاتر و زۆریشم لە یارییەکە دەدا بۆئەوەی بزانم یاریزانەکان شارەزایی خۆیان لە یارییەکەدا دەخەنەکار. تاکو تینوێتی تەماشاکەران بشکێنن و سەرنجیان بۆ لای خۆیان ڕابکێشن و ئافەرینی باشەیان لێبکەن.

زۆر بە تووڕەییەوە سەرنجی حەوت گێمی یەکەمی یارییەکەم دا. بینیم هەردوو لا، لە گۆڵ کردندا، وەك یەك وەستانەوە و جیهانگیر دوو گۆڵی کرد و عومەریش دوو گۆڵی کرد. بەڵام میران شا تەنها گۆڵێکی کرد. کوڕە بچوکەکەی ئیلشیش گۆڵێکی کرد.

لە کۆتایی گێمی دواییدا کوڕەکانم لە بەردەممدا بە ڕیز ڕاوەستان و عەرەق لە نێوچەوانیانەوە دەتکا و ماندوو بوون و شەکەتی لە سیمایاندا دیاربوو. بە چۆگانی یارییەکەیان سڵاویان بۆ کردم.

پاش ئەوەی پیرۆزبایی و ئافەرینی ئەو گۆڵانەم لێکردن کە لە یارییەکەدا کردیان. وە بۆئەوەی هانەهانەیان بدەم زیاتر بۆ یاری دووەم خۆیان ئامادە بکەن.

پێم وتن: کوڕەکانم پێویستە ئەم یارییە ببەنەوە. چونکە لەبەر ئێوە گرەوێکی زۆرم لەسەر کردووە.

جیهانگیر زۆر بە دڵنیایی و باوەڕەوە وەڵامی دامەوە:

-باوکە دڵنیابە ئێمە زۆر بە ئاسانی گرەوەکان دەبەینەوە..!!

عومەریش لەسەر قسەکەی ئەوسەری ڕەزامەندی جووڵاند و وتی:

-بێشك و گومان گرەوەکان دەبەینەوە..!!

بەڵام میران شا بە گرژ و مۆنییەوە ڕاوەستابوو، ورتەی لێوەنەهات.

خاتوو شێرێزا تەماشای میران شای کرد و هاواری لێکرد و وتی:

-میران وەرە بۆ لای دایکت.

میران شا خێرا بەرەو شوێنەکەی دایکی چوو. لە بەردەمی دایکیدا ڕاوەستا و خاتوو شێرێزاش بە شاڵەکەی دەستی عەرەقی دەموچاوی سڕی و پاشان بە خۆشی و دڵنەواییەوە پێی وت:

-میران دەبێت لەبەر باوکت ئەم یارییە هەر ببەیتەوە..!!

دوایی بە دەنگێکی سووك و بە هێواشی پێی وت:

-میران تۆ تەنها یەك گۆڵت کرد. بەڵام براکانت چوار گۆڵیان کرد. خۆ تۆش وەك ئەوان شازادەیت و هیچت لەوان کەمتر نییە. پێویستە زیاتر هەوڵ بدەیت.. باشە.. میران.. وا نییە..؟

-بەڵێ.. دایکە..

-هەروەها پێویستە تۆڵەی کەم و کورپییەکانی پێشووشت بکەیتەوە..!!

-بەڵێ.. دایکە.. تۆڵەی دەکەمەوە..

ئینجا خاتوو شێرێزا دەسکی چۆگانەکەی میران شا و ناولەپی دەستەکانی بە سەرپۆشەکەی سڕی و وشکی کردەوە.

شەیپووری دەستپێکردنی یاریی دووەم لێدرا و یاریزانەکان ڕووی ئەسپەکانیان بۆ ناو گۆڕەپانی یارییەکە وەرگێڕا.

میرانیش زۆر بە دڵگەرمییەوە ڕوویکردە گۆڕەپانی یارییەکە و خاتوو شێرێزا پێی وت:

-خۆشەویستەکەم میران ئەوەی پێم وتی بیرت نەچێت..!!

وتی: بەڵێ دایە.. بیرم ناچێت..!!

شێرێزا وتی:

-ئومێد بڕاوم ناکەیت.. میران.. وا نییە..؟

وتی: دایە هیوادارم ئومێدبڕاوت نەکەم..

دووباره فووکرایەوە بە شەیپووردا و هەردوو تیپ خۆیان ئامادەکرد و لەپڕ ئاماژە کرا بۆ یاریزانەکان دەست پێبکەن.

چەند چرکەیەکی زۆر بە سەر یارییەکەدا تێپەڕی و یاریزانەکان زۆر بە گەرمی کەوتنە ململانێ و هەوڵدانێکی زۆر بۆئەوەی گۆڵ تۆمار بکەن. یارییەکە دوو چرکەی مابوو.. چرکە و نیوێك.. یەك چرکە.. کتوپڕ جیهانگیر لەوسەری یاریگاکەوە دەرچوو. تۆپەکەی پێش خۆی دا بەرەو گۆڵەکە.. خێرا عومەر ڕێگای لە هاودژەکەی گرت و میران شاش خێرا بەرەو پێشەوە دەرچوو بۆئەوەی پارێزگاری لای ڕاستی جیهانگیر بکات. دووبارە جیهانگیر بە شارەزاییەکی تەواوەوە لە تۆپەکەی دا و هەردوو شازادە جیهانگیر و میران شا شان بە شانی یەکتر بۆی دەرچوون و بەرەو گۆڵەکە غاریان دا.

عومەریش بە سەر یاریزانەکەی دژ بە خۆیدا زاڵ بوو.

ئیتر چاك لەوە دڵنیا بووم کە تیپەکەی من بێ شك گۆڵ تۆمار دەکات. لەبەرئەوەی جیهانگیرو میران شا شانبەشانی یەك غاریان دەدا، هەردووکیان پێکەوە گەیشتنە تۆپەکە و بۆئەوەی بۆ دواجار لە تۆپەکە بدەن کتوپڕ میران شا لغاوی ئەسپەکەی ڕاکێشا و ڕاوەستا بۆئەوەی خۆی لە تۆپەکە بدات و گۆڵ بکات.

لە هەمان کاتدا جیهانگیر لە شوێنەکەی خۆی دەرچوو. هاوسەنگی میران شا لەسەر پشتی ئەسپەکەی تێکچوو، لەسەر پشتی ئەسپەکەی دەرپەڕی و گلا و کەوتە خوارەوە. بەڵام لە کاتی کەوتنەخوارەوەیدا زۆر بە جوانی لە تۆپەکەی دا.. و گۆڵێکی زۆر جوانی تۆمار کرد. گەرچی چۆگانە دارەکەشی لە دوای ئەوەی لە تۆپەکەی دا.. بەو توندییەوە دای بە ڤاچی پێشەوەی ئەسپەکەدا و کتوپڕ ئەسپەکەی سەرسمێکی دا و بەسەر گیانی میران شادا کەوت و میران لەسەر زەوییەکە خپ بوو. ئا لەم کاتەدا شێرێزا بە ترسەوە بە هەموو دەنگی خۆیەوە ڤیژاندی و لەسەر تەختی شانشینەکە بازی دایە خوارەوە، وەك شێت بەرەو یاریگاکە ڕایکرد.

شێرێزا لەم کاتەدا لە ژنە جووتیارێك دەچوو کە لە کاتێکدا بزنەکەی بباڕێنێت و ئەویش بە هانایەوە بچێت.

منیش بە دوای خاتوو شێرێزادا ڕامکرد. بەڵام پێش ئەوەی من بگەمە سەر میران شا ئەو گەیشتە سەری و سەری گرتە باوەش و دەستی بە گریان کرد. و زۆر بە پەرۆشەوە بانگی دەکرد:

-میران.. میران.. تۆ گۆڵت کرد.. چاوبکەرەوە.. من دایکتم.. چاوبکەرەوە..

جیهانگیریش لە بەردەم براکەیدا چۆکی دادابوو، خۆی بەسەردا شۆڕکردبۆوە و بانگی دەکردو دەیوت:

-میران.. میران.. مەترسە.. پەژارەت نەبێت.. هیچ نییە، پشت بە خوا سەلامەت دەبیت.. مەترسە، برا.. مەترسە..

کاتێك گەیشتمە سەری، لە نێوان جیهانگیر و میران شادا ڕاوەستام و جارێك تەماشای ئەمیانم دەکرد و جارێکیش تەماشای ئەویانم دەکرد. هەتا پزیشك گەیشتە سەری و دەستیکرد بە تێڕوانین و پشکنینی گیانی میران شا. منغالی بۆغاش بە ڕاکردن هات و تێلایەکی گەورەی بە دەستەوە بوو. بە هەموو هێزییەوە کێشای بەنێوچاوانی ئەسپەکەدا و کوشتی. پزیشکەکە بە دەست، دەستیکرد بە دەستلێدانی لەشی میران شا.

ئەو کوڕە لاوەش بێهۆش و هەست و جووڵە، لەسەر زەوییەکە هەر کەوتبوو. ئەوەندەی مەخایاند پزیشکەکە بە دڵنیاییەوە ڕوویکردە شازادە شێرێزا و پێی وت:

-گەورەم شازادە هیچ شوێن و ئێسقانێکی لەشی نەشکاوە. تەنها سەری ئازاری پێگەیشتووە. پێش چەند چرکەیەکی تر هۆشی دێتەوە بە بەردا ئینجا سەربازەکان دەستەبەرمیەکیان هێنا میران شایان خستە سەر و بردیان بۆ ناو چادرەکەی خۆی. شازادە شێرێزاش بە گریان و ناڵەوە دوای کەوت. پێش ئەوەی بیگەیەننە چادرەکەی خۆی، هۆشی هاتەوە بە بەردا. هەر کە چاوی کردەوە و دایکی بینی لە تەنیشت دەستەبەرەکەوە، زۆر بە پەرۆش و دڵنیا نەبوونەوە لە دایکی پرسی:

-دایکە.. گۆڵم کرد..!!

دایکی وتی: بەڵێ خۆشەویستەکەم.. بەڵام پێمبڵێ بزانم گیانت دێشێت..؟

وتی: دایکە.. سەرم زۆر دێشێت.

پاشان دەستی بەرزکردەوە بۆ نێوچەوانی و دەستی لێدا..

هەر کە شازادە شێرێزا بیستی وا دەکات، ئاوڕی بۆ لامان دایەوە و پێی وتین:

-میران سەری دێشێت. چارێکی بکەن با ئەو ئێش و ئازارەی نەمێنێت و چاکبێتەوە.

پزیشکەکە وەڵامی دایەوە وتی:

-هەرکە گەیشتینە چادرەکەی و چووینە ژوورەوە، زۆر بە وردی و جوانی تێیدەڕوانم و چارەسەری بۆ دەدۆزمەوە.

ئەو سەربازانەی دەستەبەرەکەی میران شایان هەلگرتبوو میران شایان گەیاندە ناو چادرەکەیو هەڵیانگرت و بە ئەسپایی لەسەر جێگایەکی نەرم دایاننا. هەرکە سەربازەکان لەسەر جێگاکەی دایاننا، دووبارە بێهۆش کەوتەوە. بەلاّم ئەوەندەی نەخایاند پاش تۆزێك هۆشی بە بەردا هاتەوە. پزیشکەکە بە جوانی لە گیانی ڕوانی و تەماشای کرد. پاشان هەندێك دەرمانی نووستنی دایە و وتی:

-بەم زووانە خەبەری دەبێتەوە و هەڵدەستێت. من خۆم بە دیارییەوە دەمێنمەوە.

شێرێزاش وتی: منیش بە دیارییەوە دەمێنمەوە.

منیش فەرمانم بە خزمەتکارەکان دا، بچن هەرچی کەلوپەل و پێداویستییەکی شێرێزا هەیە. خێرا بیهێنن بۆ ناو چادرەکەی میران شا ئیتر شێرێزام لە نزیك جێگای کوڕەکەیەوە جێهێشت و هاتمە دەرەوە.. بە هۆی ئەو گۆلەی میران شاوە کردی، من گرەوەکانم بردەوە. هەروەها یارییەکە ئەو مادە و کاتەی بۆ ڕەخساندم کە من زۆرم پێویست بوو. چونکە کەیخەسرەو بە یەك کاتژمێر پێش خۆرئاوابوون، گەیشتە لای چادرەکانمانەوە. کاروانێکی گەورەو گرانی دیاری نایابی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو.

وەك ئەو کاروانە زۆرەی کە پێش مانگێك لە شەهری سیبزەوە پێش خۆی دابوو. لەبەرئەوەی شازادەکان گشتیان لە بەردەمی چادرەکەی مندا کۆمەڵ ببوون. فەرمانم بە کەیخەسرەو دا، خێرا هەرچی دیاریی کاروانەکە هەیە دەریبهێنێت و دیاری بەسەر ئامادەبووواندا دابەش بکات.

گەرچی من لە کاتی دابەشکردنی دیارییەکاندا بە نهێنی هەستم بە نائومێدی کەیخەسرەو کرد وە بۆئەوەی ئەم دیارییانە پاڵپێوەنەرێك بێت بۆ جەنگ. من وامکرد کە ئەوانەی لەگەڵ مندان، ئەو دیارییە نایاب و گرانبەهایانە بە چاوی خۆیان ببینن و گوێیان لەو نامەیە بێت کە شازادە سۆفی ناردوویەتی و بە ڕەزامەندی خۆی کچەکەی داوە بە کوڕەکەم.

بەلاّم فایل نابێت سەرم بۆ شۆڕبکات و بێتە ژێر ڕکێفی منەوە. هەروەك دابونەریت بوو. کۆمەڵێك خزمەتکار و نۆکەر دیارییەکانیان یەك یەك پیشان تەماشاکەران دەدا.

کەیخەسرەویش لەبەردەممدا چۆکی دادا و کڕنووشی برد بۆئەوەی ڕێی پێبدەم نامەکەی ئەمیر سۆفیم پێڕابگەیەنێت.

منیش داوام لێکرد کە هەستێت، ئەویش خێرا لەسەر پێ ڕاستبۆوە و بە ترس و لەرزەوە تەماشای کردم و دەستیکرد بە خوێندنەوەی نامەکەی شازادە سۆفی کە ئەمە ناوەڕۆکی نامەکەی بوو:

"بۆ شازادە تەیموور، بەوە و بنەماڵەی کابولی" پارێزەری کەسوکارم لە کابولدا. ئەوانەی کە لە خوێنی خاقانن. بۆ شازادە و سەرداری سەمەرقەند و داگیرکەری بەناوبانگ. کە لە هەموو وڵاتاندا بە ناوی تەیمووری لەنگەوە ناسراوە..".

هەرکە گوێم لە وشەکەی دوایی بوو، ڕاچڵەکیم. چونکە هیچ پیاو و کەسێك دوای حسێن نەیوێراوە لە بەردەم و ڕوومدا ئەو وشەیە بەکاربهێنێت گەرچی من بەو شەلییەم دلگران و توورە نەبووم و هیچ پێشم ناخۆش نەبووە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز لە ژیانمدا ڕێم بە کەس نەداوە بە وشەی شەل من بانگ بکات و بەو ناودوە بمدوێنێت.

لە ڕاستیشدا کەیخەسرەو خۆی بەو وشەیە ڕاچڵەکی و هەستی بە ترس و لەرز کرد. بەڵام کە منی بینی بەو وشەیە زۆر دلگران و توورە نەبووم. بە دەنگێکی بەرز لەسەر خوێندنەوەی نامەکە ڕۆیشت..

"من سۆفی خوارەزمیم و میری خیفا و سوڵتانی ئۆرغانج و ئەو ناوچە و زەوییانەی کەوتوونەتە دەوروبەری ڕووباری ئارال و دوایەوە.

سوپاس و پێزانینی زۆری خۆمت بۆ دەنێرم. بە هۆی ئەو دیارییە نایاب و گرانبەهایانەوە کە بۆت ناردووم. ئەوە نیشانەی بەرچاوتێری و جوانترین دیارییە، کە شاهێك بۆ براکەی خۆی بنێرێت.

منیش وا دیاری نایاب و گرانبەها بۆ برای بەڕێزم تەیموورە شەل دەنێرم تا سوپاس و پێزانینی خۆمت بۆ دەربڕم. بەرەکەتی زۆری خواش لەگەڵ ئەم دیارییانەدا بێت..

شازادە سیفینی کچم کە کیژی خاقانە. ڕێز و سڵاوی خۆی بۆ شازادە جیهانگیری کوڕت دەنێرێت. من داواکارم هەردووکیان پێکەوە وەك خوشك و برا وابن. وە هیوادارم ئەو مێردەی بۆ کچەکەمت هەڵبژاردووە شایانی ناو و نیشان و خوێنی شازادەی خوارەزم بێت..!! داواکارم کچەکەی منیش شایانی ئەوەی تۆ بێت.

برا.. هەروەك تۆ بە زەبری شمشێر سەمەرقەندت دەستکەوتووە منیش ئاوەها بە زەبری شمشێر خوارەزمم دەستکەوتووە. وە ئەم خاکەمان بە ئاسانی لێناسێنرێت.. مەگەر بە زەبری شمشێر نەبێت..!!

برای بەڕێز ئێمە هەرگیز قایل نابین بچینە ژێر فەرمانی هیچ ئەمیرێکەوە.. هەروەها بۆ شازادەی لاو جیهانگیر ئەم دوو پڵنگە ڕاوییەی بە دیاری بۆ دەنێرم..".

دوو سەرباز هاتنە پێشەوە کە تا ئەو کاتە خۆیان شاردبۆوە و دوو پڵنگی گەورەی پیس و چەپەڵیان هێنایە پێشەوە.

پاشان کەیخەسرەو نامەکەی کۆتایی پێهێنا و وتی:

"داواکارم لە خودا کە خێر و بەرەکەتی خوای گەورەش لەگەڵ ئەم دیارییانەدا بێت و تکاکاریشم لە خودا ڕەحم و بەزەیی بە ماڵ و منداڵتا بێتەوە..".

کەیخەسرەو هەر کە لە خوێندنەوەی نامەکە بۆوە. لە ترساندا دەستیکرد بە لەرزین و لە پەوڕوو لە سەردەم، لە بەردەممدا خۆی دا بە زەویدا و بە زەلیلی و بێدەستەڵاتییەکی زۆرەوە دەیوت:

-گەورەم ئەم قسانە، قسەی من نییە و قسەی ئەمیر سۆفی خۆیەتی. لەبەرئەوە سەرداری گەورە و بەرێزم، لێم ببوورە و بەزەییت پیامدا بێتەوە یەك دوو هەنگاو بۆی چوومە پێشەوە، یەك شەقی توندم لە دەم و فلقی هەڵدا و دوو لەقەی توندیشم بە مووڕەغەی پشتیدا کێشا.

ئەم تووڕەییەم لەبەر دیارییەکانی ئەمیر سۆفی و سووکایەتییەکانی نەبوو. چونکە من خۆم حەز و ئارەزووم لە شەڕ و جەنگ بوو لەگەڵیدا.

بەڵکو لەبەرئەوە بوو کەیخەسرەو زۆر خۆی بە سووکی و زەلیلی پیشاندا و قینی هەستاندم.

سەردار و شازادەکانیشم ئەم کردەوەیەی منیان پێخۆش بوو.

بێگومان هەمووشیان وەڵامی نامەکەی ئەمیر سۆفیان لە ڕوومدا خوێندەوە لەبەرئەوە هەموو بە یەك دەنگ و لە هەموو سووچ و پەنایەکی کۆبوونەوەکەدا قیژانیان و هاواریان کرد. دەتوت یەك پیاون و دەگرمێنێت و هاوار و گرمەکەیان لە دەرەوەی چادرەکەدا دەنگی دایەوە.

من خۆم ئەو کاتە ساز و ئامادە بووم. چونکە من خۆم دەمزانی و چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد. کە سۆفی داواکارییەکەی من قبووڵ ناکات و دەیداتە دواوە.

لەبەرئەوە هەر لە کازیوەی بەیانی ڕۆژی دواییدا، چادرەکانمان پێچایەوە و بەرەو خیفا و ئۆرغانج بە خۆم و لەشکرەکەوە کەوتمەڕێ.

پێش ئەوەی بگەمە شاری خیفا دە هەزار سەربازم کەمتر لەگەڵدا نەبوو. پێش هێزەکانی خۆم کەوتم. کە تیپە شینەکەی جیهانگیریشی تێدابوو. ئاڵا زێڕینە نوێیەکەم کە وێنەی هەڵۆیەکی زێڕینی تێدابوو لە پێش هەموو ڕیزەکانەوە دەشەکایەوە.

تیپەکەی کەیخەسرەویش کە لە ئامێری گەمارۆ و مەنجەنیقەکان پێکهاتبوو لە دوای هێزەکەمەوە دەڕۆیشتن.

بە دەربەندەکەدا تێپەڕمان کرد و لەبەردەم شاری بوخارییەوە ڕۆیشتین و چوونە ناو بیابانەکەوە. ئەم کاروانە جەنگییەی ئێستام زۆر جیاوازتر بوو لەو تیپ و کۆمەڵە بچووکانەی ئەو کاتەی کە من و حسێن پێکەوە پێشیان کەوتبووین بەرەو خیڤا کەوتبووینە ڕێ و لەو ڕێگایەدا قاچم بریندار بوو. بووە هۆی لەنگ بوونم.

پیاوانی جەنگاوەر و ئازا و چەك و جبەخانەی زۆرم لەگەڵدا بوو. بەردەوامیش چەك و تەیرم کۆدەکردەوە. تا ماوەی ڕۆژە ڕێیەکم مابوو بگەمە شاری خیڤا هەر ئەوکاتە کەیخەسرەو لە کاتی شەودا بە دزییەوە لە لەشکرەکەم جیابۆوە و بەرەو باشوور کەوتەڕێ و هەڵات..

لەگەڵ ئەوەدا من نەمویست لە ڕێڕەوی خۆم لابدەم. چونکە دەمزانی کەیخەسرەو بەو ئامێرە گەورانەی گەمارۆدانەوە لە پەڕینەوەی ڕووبارەکە دا چ ناخۆشی و هیلاکبوونێك دەچێژێت.

منیش تیپە شینەکەی جیهانگیر و تیپەکەی ئیلشی بۆ گرتن و ڕاونانی بەدوایدا نارد.

بێ ئەوەی هیچ ئامێرێکم هەبێت، شوورای شارەکەی پێ برووخێنم، من بۆ گرتن و دەستبەسەرداگرتنی شارەکە تەنها پشتم بە دلگەرمی و ئازایی جەنگاوەرەکانم بەستبوو.

بە گڵ و خۆڵ دەستمانکرد بە پڕکردنەوەی خەندەقە وشکەکە و پەیژەی پێدا سەرکەوتنمان ئامادەکرد. ورە و ڕۆحی شەڕکردنی جەنگاوەرەکانیشم زۆر بەرز بوو. گەرچی سەربازەکانی شاری خیڤا لەسەر شووراکانەوە نەوت و قیر و زەیتیان بەسەردا کردین و ئاگریان تێبەردا. لەم هێرشەی یەکەممدا هەزار سەربازیان سووتاندم. بەڵام من هەزارەها سەرباز و جەنگاوەری ترم هەبوو. هیچ چەند کاتژمێرێك بەسەر ئەو کارەدا تێنەپەڕی، توانیمان ئەو بەرهەڵستییەی سەر سەنگەر و شووراکانی دوژمن تێکوپێك بدەین و لەناویان بەرین. هەرکە یەکەم جار ئاڵای هەڵۆی تیرین لەسەر شووراکانەوە بەرزبۆوە. لە هەموو لایەکەوە دەنگی دایەوە و سەربازەکانیشم لە هەموو لایەکەوە دەستیان بەسەر قەڵا و سەنگەرەکاندا گرت و تیایدا دامەزران.

پێش ئەوەی شەو دابێت شەقام و کۆڵانەکانی شارمان لە بەرگریکردن پاککردەوە و هەرچی ئازادیەکیش هەبوو لە کۆشك و بینا گشتییەکاندا بەندم کردن و لە تۆڵەی ئەو سەربازانەم، کە لە خەندەقەکەدا سووتان. ئاگرمان تێبەردان. پاشان سەربەستی تەواوم دا بە سەربازەکانم بە هەوەسی خۆیان ئەنتکیان بکەن، تاڵان و بڕۆی شاری خیڤا بکەن و خۆشم لەگەڵ سەردار و ئەفسەرەکانمدا گەڕامەوە بۆ دەشتەکە و ناو چادرەکانمان..

ئەو دەشت و ناو چادرانە بە هۆی ئەو ئاگرانەوە کە لەناو شارەکەدا دەسووتا وەك ڕۆژی ڕووناك وابوو.

هێندەی ئەخایاند جیهانگیریش هاتەوە و هەرچی ئامێری گەمارۆکە بوو لەگەڵ کەیخەسرەودا کە بە دیلی گرتبوو، هێنایەوە.

ئیتر منیش بە دڵێکی خۆش و زمانێکی شیرینەوە پێم وت:

-کوڕەکەم کارێکی زۆر گەورە و چاکت کردووە. وەرە با بە هۆی سەرکەوتنمانەوە ئاهەنگی خۆشی بگێڕین.

وتی: باوکە. ئەمشەو نا.. داوای لێبوردنت لێدەکەم..

وتم: کوڕم.. لەبەرچی..؟

وەڵامی دامەوە: باوکە.. بە هۆی ئیلشیەوە. کاتێك لە ڕووبارەکەدا شەڕی دەکرد، بریندار بوو.. بە برینداری کەوتە ئاوەکەوە و خنکا..!

وتم: چی.. ئایا ئیلشی.. مرد.؟

وەڵامی دامەوە.. بەڵێ.. باوکە.. ئێستا شێخ عومەر بۆتە سەرتیپی تیپەکەی.. و لاشەی ئیلشیشی پێیە و پاش چەند چرکەیەکی تر تەرمەکەی دەگاتە ئێرە..!!

وتم: کەواتە ئیلشی مردووە.. بەڵێ ئەمشەو پێویست بە ئاهەنگ گێڕان ناکات و ئاهەنگ ناگێڕین..

ئیتر دوای ئەوەی لاشەکەی ئیلشی کۆچ پۆش "کفن" کرا بە خەمباری و بێدەنگییەوە بردیانەوە بۆ شەهری سیبز.

هێزێك و فەرمانڕەوایەکم لە خیفادا دانا و دوای ئەوە لە لەشکرەکەمەوە بەرەو ئۆرغانج کەوتمەڕێ..

ژمارەیەکی زۆر لە پیاوان بە دەنگ بانگەوازی شازادە و سەردارەکانمەوە هاتن و چوونە ناو ڕیزەکانمانەوە و جێگای ئەو سەربازانەیان پڕکردەوە کە لە خیفادا لە دەستمان دابوون..

ئەوکاتەی کە لە دووری دوو میلەوە بۆ شاری ئۆرغانج چادرمان هەڵدا.. ژمارەی سەربازانی لەشکرەکەم زیاد لە دە هەزار سەرباز دەبوو.. ئا بەو لەشکرە زۆرەوە هێرشەکەم کردە سەر دوژمن. هەروەها ئامێری گەمارۆی گەورە و ئامێری پێدادان و ڕووخاندن و وێرانکردنی شوورا و قولەکانیشم پێبوو.

لەگەڵ ئەوەشدا لە هێرشەکەمدا پەلەم نەکرد و خێرا و کتوپڕی هێرشم نەکردە سەریان. چونکە شاری ئۆرغانج وەك شاری کارشی و سەمەرقەند شوورا و قەڵاکانی سەخت و قایم بوون.

هەروەها ئەمیر سۆفی مرۆڤێکی زۆر دەوڵەمەند بوو. بە شێوەیەك دەیتوانی بە باشترین چەکی پاراستن و چەکی سووکی تریش خۆی پڕچەك بکات.

جا لەبەرئەوە منیش ماوەی هەفتەیەکی تەواو، لە دەوروبەری شارەکەدا مامەوە و خۆم ئامادە کرد و وەستا و پیشەسازکارەکانیشم ئامێری ئاگرهاویشتن و ئامێری گەمارۆدانی قورس و ئامێری خۆپاراستنی زیادەیان دروستکرد.

دارتاشەکانیش دەیەها پردیان دروستکرد بۆئەوەی بە هۆیەوە لە خەندەقە پڕ ئاوەکەی دەوری شارەکە بپەڕینەوە.

بە دەستی ئەنقەست وام کرد کە وەستا و پیشەسازکارەکانم لە شوێنێکەوە کاربکەن، تیر نەیانگاتێ و لەسەر دیواری شوورای شارەکەشەوە دیارین و زۆر کارگەی بچووك بچووکم لە هەموو لایەکەوە بۆ پیشەسازکارەکانم دانابوو. بۆئەوەی ئەمیر سۆفی بە چاوی خۆی ببینێت کە چۆن وەستاکانم بە خێرایی و شارەزاییەوە لە دەوری قەڵاکەیدا ئامێری گەمارۆ دروست دەکەن.

کار هەرچۆنێك بێت من بە سووکی تەماشای شان و شکۆ و ئازایەتی ئەمیر سۆفیم نەدەکردو لێشم کەم نەدەکردەوە.

چونکە ئەمیر سۆفی سەرکردەیەکی ئازا و هێرشبەرێکی چاونەترس و نەبەرد بوو.

هەروەها کەیخەسرەویش زانیاری زۆرو گرنگی دامێ دەربارەی ئازایی و چاونەترسی سۆفی لە شەڕ و کوشتاردا.

ئەم زانیارییانە بڕوا و قەناعەتی تەواوی پێ پەیدا کردم کەیخەسرەو لە ترسی سۆفی بوو کە وای لێکرد لە ڕێگای خیڤا لابدات و ڕابکات.

منیش خۆم چاوەڕوانی شەڕ و کوشتارێکی توند و سەختم لەگەڵ ئەمیر سۆفیدا دەکرد. وە بۆ ئەوەش باش خۆم ساز دابوو.

بەڵام من بە هیچ شێوەیەك چاوەڕوانی هەڵکردنی ئاڵای ڕێککەوتنم نەدەکرد. کە لە ژێر ئەو ئاڵایەدا پەیمانی ڕێکەوتن ببەستین.

لە کاتێکدا من جەنگاوەرەکان و ئامێرەکانی خۆم لە جێ گرنگەکاندا دادەنا و خۆم بۆ هێرشی یەکەمم ساز دەکرد.

ئا لەم کاتەدا پێنج پیاو کە جلی سپی و سواری ئەسپی سپیش ببوون لە دەروازەی شارەکەوە هاتنە دەرەوە و ئاڵای سپی ئەمیر سۆفیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو، یەکسەر بەرەو ئاڵاکەم، ئاڵای هەڵۆی زێڕین ڕۆیشتن. منیش ناچار بووم کە ڕێزی ئەو داواکردنە بگرم و گوێ لە نوێنەری ئەمیر سۆفی بگرم کە ملی ئەسپەکەی وەرگێڕا بۆ لای و بە ڕێزەوە سڵاوی لێکردم. پاشان پێی وتم:

-ئەی شازادەی گەورە و بەڕێز تەیموور ئەمیری سەمەرقەند و شۆڕشگێڕ و قارەمانی مەزن. سۆفی خوارەزمی و ئەمیری خیفا و سوڵتانی ئۆرغانج و ئەو وڵات و ناوچانەی دەوروبەری ڕووباری ئارال داواکارە لێت کە خودی خۆت قایل بیت و بە تەنها خۆت شەڕبازی لەگەڵدا بکەیت..!!

وتم: بە ڕاست. ئەمیر سۆفی دەیەوێت خۆم شەڕبازی لەگەڵدا بکەم؟!

وتی: بەڵێ گەورەم.. ئەمیر سۆفی دەڵێت ناکۆکییەکە لە نێوان من و ئەودایە، ئەو ناکۆکییەش لەو داواکردنە پیس و سووکایەتییەوە دروست بوو، کە تۆ داوای شازادە سیفینی کچیت کردووە بۆ کوڕەکەت. وە هیچ سوودیش لەوەدا نییە کە زۆربەیەکی زۆری لایەنگرانی تۆ و ژێردەستانی ئەو بە خۆڕایی لەناوبچن.

شازادە تەیموور، ئەمیر سۆفی داواکارە لێت، کە داواکردنەکەی قبووڵ بکەیت. هەروەها پەیمانت دەداتێ هەر کەسێك لە پێشدا خوێنی ئەوی تر بڕێژێت ئەوا ئەو کەسە، سەرکەوتووە و ئەو کەسەش پێویستە وەك مەدالیایەك لە پاداشتی سەرکەوتنەکەیدا شازادە سیفین وەرگرێت.

وتم: نوێنەرانی بەڕێز زۆر چاکە.. بڕۆنەوە بۆ لای ئەمیر سۆفی و پێی بڵێن کە شازادە تەیموور چاوەڕوانتە، بەڵام ئەوەشی پێ ڕابگەیەنن، پێویستە شەڕبازییەکە هەر بەردەوام بێت هەتا یەکێکمان ئەوی تر دەکوژێت.. چونکە ئەو سووکایەتییەی کە بە منی کردووە، تەنها بە ڕژاندنی چەند دڵۆپە خوێنێك کۆتایی پێناهێنرێت و تۆڵەی ناسێنرێت..!!

وتی: کەواتە ئەمیر تەیموور پاش سەعاتێك لە دوای نیوەڕۆوە لەم دەشتەدا بەرامبەر ئەمیر سۆفی دوژمنی، دەوەستێت وا نییە؟

وتم: بەڵێ.. بەڕێز بڕۆرەوە بۆ لای شازادەکەت و ئەوەی پێ ڕابگەیەنە. ئیتر دوای ئەوە نوێنەرەکان بۆ ناو شار گەڕانەوە.

کتوپڕ دوای ئەوان سەرکردە و سەردارەکانم کەوتنە بەرهەڵستیم و ناڕەزایی دەربڕینی ئەو بڕوواپەم.. سەیفەدینی پیرەمێرد وتی:

-شازادە تەیموور ئەوە ئەوپەڕی بێهۆشی و گەوجییە، تۆ سەرۆك و سەرکردەمانی و جێگات لە تەنیشت ئاڵاکەمانەوەیە.. ئێمە ڕێگا نادەین تۆ خۆت بخەیتە ئەو مەترسییەوە، جا لەبەرئەوە ڕێ بدە بە نوورەدینی کوڕم با بەرامبەر ئەمیر سۆفی بوەستێتەوە و تۆڵەت بۆ بسێنێتەوە.

دەستمکرد بە پێکەنین و گاڵتەم بە ترس و لەرزی سەیفەدین دەهات و پێم وت:

-نا.. من ڕێ بە نوورەدین نادەم بەرامبەری سۆفی بکات.

دەستی بە پاڕانەوە کردن کردەوە لێم و دەیوت:

-باشە کەواتە.. با.. شێخ عەلی یان خیتای سوارە چینییەکە، یەکێکیان بەرامبەری بکەن..

-شێخ عەلی و خیتای هەردووکیان کە لەناو هێزەکانیانەوە هاتبوون، ئەو داواکاری و پێشنیارەی ئەمیر سۆفییان گوێ لێبوو.

خیتای هاواری کرد و وتی:

-گەورەم ڕێم بدە، با من بەرامبەری بوەستمەوە..

بەڵام ئەوەندەی نەخایاند شێخ عەلیش هاواری کرد و وتی:

-نەخێر.. ڕێم بدە با من بەرامبەری بوەستمەوە..

جیهانگیریش بە هێمنی و لەسەرخۆییەوە وتی:

-شەڕ و ناکۆکییەکە.. شەڕ و ناکۆکی منە.. داواکردنی ژن بۆ من بۆتە هۆی هەڵگیرساندنی ئەم جەنگە. لەبەرئەوە باوکە ڕێ بە من بدە با بەرامبەری ئەمیر سۆفی بوەستمەوە و شازادە سیفین بۆ خۆم بەرمەوە.. خۆ ئەگەر دۆڕاندیشم، ئەوا هۆی بەرپابوونی ئەم جەنگەش نامێنێتو کۆتایی پێدێت!!

بەڵام شێخ عومەر بەرهەڵستی قسەکانی کرد و وتی:

-باوکە.. جیهانگیر، کەیخەسرەوی بە دیل گرت. لەبەرئەوە باوکە ڕێ بە من بدە با ئەم شیربازییە بکەم..

تەماشای ئەم دوو شازادەیە جیهانگیر و عومەرم کرد و پێکەنیم.. ئەمانە کە هێشتا تەمەنیان لە حەڤدە ساڵان تێنەپەڕیبوو.. بە هۆی ئەو بەرگە شینە نوێیانەوە کە لە بەریاندا بوو، لە خۆیان بایی ببوون و لێم دەپاڕانەوە کە ڕێیان پێبدەم بەرامبەر جەنگاوەرێکی زانا و شارەزا و سوارچاکێکی ڤاڵبووی ئازا و ڤارەمان ببنەوە..

پاشان پێم وتن:

-ئێوە هەردووکتان، ئەی دوو شازادە لاوەکان، ڕاست دەکەن. ڕاستە ئەم جەنگ و شەڕ و شۆڕە، جەنگی ئێمەیە. بەڵام من تاکو ئێستا گەورە و سەرداری ئەم خێزانەم بۆ ئەم بەرەنگاربوونەوەیەش ڕووی دەم کراوەتە من جا لەبەرئەوە بڕۆن زریّ سووکە تەنکەکەم بۆ بێنن و ئێوەش پشت و پەنا و یاریدەدەرم بن. پاشان کڵاو زرێیەك و قەڵغانێکی تیپی شینیان بۆ هێنام. چونکە من پاشان لەژێر ئاڵای جیهانگیردا دەجەنگم.

ئیتر لەگەڵ ئەو هەموو بەرهەڵستییە زۆرە یەك لە دوای یەکەی سەردار و شازادەکانمدا، لەو گەرما زۆرەی نیوەڕۆیەدا خۆم گۆڕی و سواری پشتی ئەسپەکەم بووم. بەرەو دەروازەی شاری ئۆرغانج کەوتمەڕێ. پاشان لە نێوان مۆڵگای چادرەکانی خۆم و شارەکەدا ڕاوەستام. و سڵاوم بۆ ئەو ئاڵایەی ئەمیر سۆفی کرد کە بەسەر دەروازەی شارەکەدا دەشەکایەوە.

بەڵام هیچ وەڵامێکم لەوانەوە نەبیست و هیچ جووڵەیەکیشم لە چاودێرە چەکدارەکانەوە نەدی کە بەسەر شووراکانەوە کۆمەڵ ببوون.

هەرچی پیاو و جەنگاوەر و سەردار و شازادە پارێزەکانی منیش بوون بێدەنگ و چرپە ڕاوەستابوون دەتوت مردوون..!! چاوەڕوانیان دەکرد.

دووبارە دەستم بەرزکردەوە و ڕاموەشاند و تەماشای دەروازەیەکم دەکرد و وام چاوەڕوان دەکرد، ها ئێستا یان تۆزێکی تر کتوپڕ دەکرێتەوە. بەڵام هیچ شتێکی وا ڕووی نەدا هیچ دەنگ و ڕەنگێکیش نەبوو. بێجگە لە دەنگی پیّ و حیلەی ئەسپەکان و چرکەچرکی زینی سەرپشتی ئەو ئەسپانە نەبێت کە سوارچاکەکانی خۆم سواری ببوون.

زیاتر لە چارەکە سەعاتێك تێپەڕی و ئەسپەکانیشمان بە قین و تووڕەیی و خۆڕانەگرتنەوە لەقەیان بە زەوییەکەدا دەکێشا و دەیانحیلاند. نیو سەعاتی تریش بەسەردا تێپەڕی و منیش وەکو ئەسپەکانمان بیّ ئارام بووم و خۆم پیّ ڕانەگیرا. ئەو دڵ گەرمییەم وردە وردە نەما و قین و تووڕەییەکی هێجگار زۆر جێگای گرتەوە و دەموچاوم دا بە یەکدا و زۆر قینم لە لووتبەرزی و گاڵتەپێکردنی ئەمیر سۆفی هەستا. چونکە گاڵتەی پێکردم و لە بەڵێن و ژووانەکەی خۆی پەشیمان بۆوە و لە کات و ساتی خۆیدا نەهات، تاکو وەك دەمویست سەری بپەڕێنم و لە لاشەی جیابکەمەوە. ئیتر شێخ عومەرم بانگ کرد و فەرمانم پێدا و وتم:

-دەی خێرا شێخ عومەر بڕۆ بۆ ناو چادرەکەم و بلندگۆکەم بۆ بهێنە.

پاش چەند چرکەیەك "واتە تا ئەوکاتەی شێخ عومەر گەڕایەوە و ئامێرەکەی بۆ هێنام" هیچ شتێکم نەدی کە نیشانی ئەوە بێت ئەمیر سۆفی دێتە دەریّ.

ئیتر بە تەواوی بۆم دەرکەوت ئەمیر سۆفی هەرگیز نایەتە دەرەوە و پەشیمان بۆتەوە. پاشان بلندگۆکەم بەرزکردەوە بۆ دەمم و ڕوومکردە شوورا و سەنگەرەکان و هاوارم کرد:

-ئەی ئەمیر سۆفی ترسنۆك و بێی وەعد و وەفا. خوا تۆڵەی ئەم ترسنۆکی و بێ بەڵێنییەت لێدەکاتەوە و بە هیلاکت دەبات. منیش هەر شارەکەت داگیردەکەم و تۆڵەی ئەم سووکایەتییەی دواییت لێدەکەمەوە کە بەرامبەر بە من کردت.

ئەم دەنگی تووڕەبوونەی من، گەیشتە ناو شار و لە دیواری شووراکانی شارەوە لەو بێدەنگییەدا دەنگی دایەوە و قسەکانی منی دا بە گوێی ئەو پیاوانەی مندا کە لە دەوری شاری ئۆرغانجدا ڕاوەستابوون و گوێیان گرتبوو. چەند چرکەیەکی ترم چاوەڕوان کرد و پاشان بەبێ دەسەڵاتی و تووڕەیی و ڤین و بوغزێکی زۆرەوە ڕووم وەرگێڕا و غارم دا بۆ ناو هێزەکانم و گەڕامەوە بۆ ناو چادرەکەم.

پێش ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ ناو چادرەکەم بە دەست ئاماژەم بۆ سەرکردەکانم کرد. هەرچی سەرکردەم هەبوو گشتیان بە خۆیان بە پیاو و ئاژەڵ و ئامێری گەمارۆکانەوە بۆ پێشەوە هێرشیان برد. بۆئەوەی شووڕای شار بڕوخێنن و هەروەك ئەو پلانەی لەمەوپێش دامانئابوو بڕۆینە ناو شارەکەوە. ئەم پلانەم بۆیە لەمەوپێش ڕاگرت. چونکە گوێم لە درۆکانی ئەمیر سۆفی گرت. کاتێك لەگەڵ خۆیدا لە دەشتەکەدا داوای شیربازی لێکردم.

هێزەکانی من بەرەو خەندەقەکە چوونە پێشەوە و ئامێرەکانیشم، ئامێری گەمارۆکانیش، بەردی گەورە گەورە و تۆپەڵە ڤیری ئاگراوی شلی گەرمیان بەسەر شوورا و ناوشارەکەدا دەڕشت.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کۆمەڵ و هێزێك لە هێزەکانم نەیانتوانی لە خەندەقەکە بپەڕنەوە.

دیاربوو سۆفی هێزێکی بەرگری و یارمەتییەکی زۆر بێشووماری هەبوو. لەو هێزە یەدەکیانەی هەیبوو، چونکە سەدەها کەس لە هێزەکانی دەکوژران و دەکەوتنە ناو خەندەقەکەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، شوورا و سەنگەرەکانی بەردەوام پتەو و بەهێزتر دەبوون و پڕبوون لەو کەسانەی پارێزگارییان لێدەکرد. لەسەر شوورا و سەنگەرەکانەوە زۆرێکی زۆر تیری گەورە و دوورهاوێژ بەسەر سەرباز و هێزەکانمدا دباری و زۆرێکی زۆر لە پیاوانی هێزەکانمی کوشت و بریندار کرد و ئەو زەوی و ئاوی خەندەقەیان بە خوێن سوور کرد. بەوەش زیاتر سوور بوو، کە کوژراوەکانی سۆفیش لەسەر شووراکانەوە دەکەوتنە خوارەوە و دەکەوتنە ناو خەندەقەکەوە.

هەتا کاتی ڕۆژئاوابوون لەگەڵ ئەو هەزارەها کوشت و کوشتارەی پیاوەکانی من و ئەو پیاوانەی ئەودا کە لەسەر شووراکانەوە بە مردوویی دەکەوتنە خوارێ و دەکەوتنە سەر ئەو زەوییە گەرمە یان دەکەوتنە ناو ئەو ئاوە بۆگەنەی ناو خەندەقەکەوە و نەمانتوانی کەلێنێك لەناو هێزە بەرگرییەکانی ئەمیر سۆفیدا دروست بکەین.

ئیتر فەرمانم دا بە شەیپوورلێدەرەکانم. کە فوو بە شەیپوورەکاندا بکەن و داوای کشاندنەوە لە هێزەکانم بکەن.

ئیتر ناوەها لەشکرەکەم گەڕانەوە بۆ ناو چادرەکانیان و دوای نانخواردنی ئێوارە داوام لە سەردارو شازادەکانم کرد بۆ کۆبوونەوە. و داوام لە عەبدوڵڵای نۆکەریشم کرد، ئاوم بۆ گەرم بکات بۆئەوەی خۆم بشۆم.

کاتێك عەبدوڵڵا هات بۆئەوەی گیانم بشوات. لەگەڵ خۆشیدا چەند دەنگوباس و هەواڵی گرنگی هێنابوو. کە لە سواڵکەرێکەوە وەریگرتبوو. ئەو سواڵکەرەش لە شاری ئۆرغانجەوە هاتبووە دەرێ.

دز و سواڵکەرەکانیش ڕێگای تایبەتی زۆریان هەیە بۆ خۆشاردنەوە و ڕاکردن لەناو شاردا.

لە کاتێکدا قۆڵ و ماسوولکەکانی بۆ دەشتم. لەگەڵمدا دەستی بە قسەکردن کرد و وتی:

-ئەی شازادەی گەورەم تەیموور دەمەوێت شتێکت پێبڵێم و ئەوە بزانیت ئەمیر سۆفی بە تەمای یارمەتی و هێزی گەورەیە کە لەو هۆزە تورکمانییانەوە بۆی بێت، کە دانیشتووی ئەو ناوچە و زەوییانەی دەوروبەری ئاراڵن!

-کەی.. عەبدوڵڵا..؟

-گەورەم.. ئەمڕۆ... سبەینێ.. هەرچی کاتێك بێت بەم زووانە بۆی دێت.

-کەواتە بۆیە ئەمڕۆ خۆی شاردبۆوە و دەستی دەستی پێدەکردین بۆئەوەی هەڵمانخەڵەتێنێت و کاتی دەستکەوێت!!

-بەڵێ شازادەی گەورەم.. بیر و بۆچوون و قسەکانت ڕاست و ڕەوانن..

-بەڵام وا دیارە ئەمیر سۆفی لەناو شاریشدا هێزێکی هێجگار زۆری هەبێت. بەڵام منیش ئەو هێز و هێرشەی کە دەیەوێت لە دوای لەشکرەکەمەوە بۆی بێت لەناوی دەبەم و تەفروتونایان دەکەم.

بەڵام عەبدوڵڵا بیروڕای تۆ چۆنە بگەڕێینەوە بۆ دواوە و ناوی لینغ کۆبیغی "سەگە شەل" سەرلەنوێ بژێنینەوە و ڕێگا و شێوەی پێشوومان بگرینەبەر؟

-گەورەم.. زۆر چاکە.. پیاوێکی کارشی هەیە و لەمەوپێش لە شاری خیڤادا دووکانی چەك فرۆشتنی کردبۆوە.. بەڵام ئەو پیاوە لە کڕین و فرۆشتنەکەیدا زەرەر و زیانێکی زۆری کرد و مایەپووچ دەرچوو. ئێستا ئەو پیاوە چەقۆکانی سەرمێزی نانخواردنی ئەمیر سۆفی خاوێن دەکاتەوە و دەیانشوات.

ئەو پیاوە دەتوانێت بە یەکێك لەو چەقۆیانە ئەمیر سۆفی بکوژێت..!!

نەخێر.. نەخێر.. عەبدوڵڵا چەقۆ بەکارناهێنین. بەڵکو وا پێویستە کە ئەمیر سۆفی بە هەر هۆیەکی ترەوە بێت.. بمرێت و پێویستە بە مردنی خوا لەناوبچێت..

-باشە. شازادەی گەورەم.. لەناو شاردا پیاوێکی تر هەیە ناوی "ڤارادی" یە. دەرمانی ژەهراوی زۆر دەزانێت کە خەڵکی نایزانن.. ئەو پیاوەش کاتی خۆی لە گەورەترین کۆمەڵ و گرووپی ڕێگرو جەردەکاندا کاری کردووە.

-کەواتە ئایا دەتوانین ژەهر بە هۆی یەکێك لە چەقۆکانی سەر مێزەکەوە بەکاربهێنین..؟

عەبدوڵڵاش بەردەوام شان و پشتمی بە سابوون دەشت و وەڵامی دامەوە وتی: بەڵێ گەورەم.. ئەوە دەکرێت.. باشە ئایا بۆ ئەم مەبەستە پێویست دەکات جوابی بۆ بنێرم..؟

-بێگومان.. عەبدوڵڵا بێگومان..

-ئەو پاداشتە چییە کە کۆبیغی دەیداتێ..؟

-من بەڵێن بە ڤارادی دەدەم.. کە پارەیەکی زۆر زۆری بدەمێ کە لە سەمەرقەندا وەك توجارێکی گەورە دەرکەوێت و دووکانێکی چەك و قەڵغان فرۆشتن بکاتەوە، بێ ئەوەی لەوە بترسێت پاشەڕۆژ لات بێت و مایەپووچ بێت..

-ئەی بە برادەرەکەی تری پەیمانی چی دەدەیتێ..؟

-بە دووکانێکی داوودەرمان فرۆشتن.. یان بەهەر شتێك کە ئەو بیەوێت چونکە ئەمیر سۆفی بەرهەڵستییەکی سەرسەختانە دەکات.. جا لەبەرئەوە بەهەر شێوەیەك بێت، پێویستە خۆی لێ دەرباز بکەم.

-شازادەی گەورەم.. ئەو هەر دەبێت بمرێت.. جا بۆ ئەو مەبەستەش بە تەواوی دڵنیابە..

ئیتر دوای ئەوە عەبدوڵڵا دەستی هێنا بە شان و مل و ماسولکەکانمدا و پێی ڕاگەیاندم، گیانم بە تەواوی خاوێن بۆتەوە و قسە و گفتوگۆکەشمان کۆتایی هات..

پاشان لە کۆبوونەوەکەدا بە ئەنجومەنەکەم ڕاگەیاند.. هیوا و مەبەستی سۆفی ئەوەیە و بە تەمای یارمەتییەکی گەورەیە لە لایەن تورکەکانەوە بۆی بێت. منیش بۆ بەرگری ئەو مەبەستەی پلانێکم دانا..

تیپێکی تەواوم دانا بە سەرکردایەتی شێخ عەلی و ناردم بۆئەوەی بچنە کەمینەوە بۆ ئەو یارمەتیانەی بۆ ئەمیر سۆفی دێت و دەستیان بەسەردا بگرێت.

ئیتر هەر کتوپڕ لە تاریکایی شەودا -شێخ عەلی- و تیپەکەی کەوتنەڕێو لەو تاریکاییەدا لە بەردەم شاری ئۆرغانجەوە تێپەڕین. پێش ئەوەی ڕۆژ هەڵبێت بە تەواوی دوورکەوتنەوە..

داوام لە دارتاشەکانی لەشکرەکەم کرد، کە عەرەبانەی زرێپۆش و سەرداخراو دروست بکەن بۆئەوەی تیری گەورە و ئاگراوییان لێوە بهاوێژین.

هەروەها داواشم لێکردن، ئەو ئامێری گەمارۆدانەی کە خراپ بوون و پەکیان کەوتووە دەست بە چاککردنەوەی بکەن و وای لێبکەن بە کەڵکی ئەوە بێت تۆپەڵە قیری شل و تەنەکە نەوتی گڕاوییان پێبهاوێژین بۆ ناو شوورا و سەنگەرەکان لە جیاتی ئەوەی بەردیان پێبهاوێژین بۆ دەروازەکان.

منیش زۆر چاکم دەزانی ئەمیر سۆفی هیچ بە تەنگ ڕۆح و گیانی پیاوەکانییەوە نایەت. وەك لەوەی بە تەنگ ماڵ و موڵك و سامانی خۆیەوە دێت.

لەبەرئەوە پلانی ئەوەم کێشا با ئاگرەکانمان یەکسەر بۆ ئەو شوێنانە بێت کە سۆفی لای گرنگەو وای لێبکەین بەوەوە سەرقاڵ بێت تاکو شێخ عەلی دەگەڕێتەوە.

بە درێژایی شەو و ڕۆژی داهاتوو لەشکرەکەم سەرقاڵی دروستکردنی ئامێر بوون و قازیفەی ئاگراوییان ئامادە دەکرد.

بۆ شەوی دوایی پشووم بە جەنگاوەرەکانم دا و ڕێم پێدان ئەو شەوە پشوو بدەن و بنوون.

لە بەیانیدا هەمدیسان گەمارۆی شارەکەم دایەوە، تیرهاوێژە جەنگاوەرەکانیشم لە عەرەبانە زرێپۆشەکانمانەوە دەستیانکرد بە دابارینی تیری سەر بە ئاگراوی بۆ سەر شووراو قەڵاو سەنگەرەکان و بۆ ناو شار.

تیپەکانی سوارە و پیادەش گشتیان پەیتاپەیتا پێکەوە تیر و زەخیرە و پێداویستیان بۆ ئامێرە گەمارۆکانمان دەبرد.

جا لەبەرئەوە سەربازە بەرگریکەرەکانی شاری ئۆرغانج "جگە لە پاسەوانەکان نەبێت" گشتیان شوورا و سەنگەرەکانیان جێهێشت و بەرەو کووچە و شەقامەکان چوون بۆئەوەی تیپی

تایبەتی ئاگرکوژاندنەوە دروست بکەن بۆ کوژاندنەوەی ئەو ئاگرانەی ئێمە دەمانهاویشتە ناو شارەکەوە.

منیش لەبەردەم چادرەکەمەوە لەسەر روانگەیەکی بەرزەوە دانیشتبووم و دەمڕوانییە ئەو گڕ و ڕووداوانە.

لە کاتێکدا من لەو ڕوانگەیەدا دانیشتبووم. عەبدوڵڵا هات بۆ لام و پێی ڕاگەیاندم کە ئەمیر سۆفی بە هۆی ئەو خواردنە ژەهراوییەوە کە خواردوویەتی کاری لە ناو سکی کردووە و تووشی نێش و ئازارێکی کوشندەی کردووە.

بەردەوام دەنگوباسم پێدەگەیشت و پێیان ڕادەگەیاندم، نەخۆشییەکەی ئەمیر سۆفی زۆر گرانە و پزیشکەکانی شانشینەکەشی دەستەو وستان ماون و هیچ دەستەڵاتێکیان بەسەردا نەماوە.

من تا کازیوەی بەیان هەر بەردەوام لە ڕوانگەکەی خۆمدا دانیشتبووم. کە تیپەکەی شێخ عەلی و پیاوە جەنگاوەرەکانی لە دەشتەکەوە گەڕانەوە و هوتافیان دەکێشا و بە سەری ڕم و قەمەکانیانەوە، سەری هەزار پیاوی کوژراوی تورکمانی ڕیشنیان بەرزکردبۆوە.

وە بە پێی ئەو فەرمانەی من دامنێ شێخ عەلی سەربازەکانی نارد و بەو سەرە بڕاوانەوە بە دەوری شاردا سووڕانەوە و هەریەکە سەری تورکمانییەکیان دا بەسەر کردەی ئامێری گەمارۆدانەکانمان.

دوای ئەوە فوومان بە شەیپوورەکانماندا کرد و هەر ئامێرێکی گەمارۆ سەری یەکێک لەو تورکمانانەیان خستە سەر ئامێری هاویشتن. هەرکە دووبارە فوومان بە شەیپوورەکانماندا کردەوە، ئامێرەکانمان سەرەکانیان بۆ ناو شار و شوورا و سەنگەرەکانی ئەمیر سۆفی هاویشت.

چ وەڵامێك لەمە جوانتر و شایستەتر دەبێت کە ئەمیر سۆفی پێی بگات لە وەڵامدانەوە سووك و نابەجێکەی ئەودا..؟!!

هیچ ئەوەندە تێنەپەڕی، دەنگوباس ڕایگەیاند کە ئەمیر سۆفی مرد..!! هەرکە دەنگوباسی مردنەکەیم بیست لە هەموو سەنگەر و قوولە و سەر شووراکانەوە ئاڵای سپی بەرزکرایەوە و شەڕو کوشتار ڕاوەستا، بێدەنگییەکی سامناك باڵی کێشا بەسەر ئەو دەشت و دەر و ناوچەیەدا.

ئەوەی تەنها ئەو بێدەنگییەی تێکدابوو، تەنها قرچ و هووڕ و لرفەلرفی ئەو گڕ و بڵێسانە بوو کە لە شاردا بەرزدەبۆوە و دەسووتا..

هەر کە قایل بووم بەو داواکردن و خۆبەدەستەوە دانەی شار.. لە هەموو لایەکەوە سەربازەکانم قیژانیان و دەنگی قیژەکەیان بە توندی دەنگی دایەوە. هەر دوای ئەوە دەروازەکانی شاری ئۆرغانج کرایەوە و پەردە سەرەکییەکە بەسەر خەندەقەکەدا ڕاکێشرا.

بەسەر پەردەکەدا ئیمامێکی عەمامە بەسەری سەوز و لەگەڵ چەند شازادەیەکی گەورە و ناودار و شان و شکۆ بەرزدا هاتن بۆ ناو چادرەکەم بۆئەوەی گفتوگۆم لەگەڵدا بکەن و ڕێککەوین.

هەرکە نوێنەرەکان گەیشتنە لام. خواجە بەهادینم ناسیەوە کە ئەمیر سۆفی، وەختی خۆی لە بوخارییەوە هێنابووی بۆئەوەی ببێتە ئیمامی گەورە و یەکەمی شاری ئۆرغانج.

پاش ئەوەی سڵاوی لێکردم.. دەستی بە قسەکردن کرد لەگەڵمدا و وتی:

-ئەی شازادەی پایە بەرز و گەورە تەیموور شازادە و سەرداری سەمەرقەند و سوڵتانی هەموو وڵاتی تەتەر. تۆ قسەکانت ڕاست و ڕەوان بوون. هەروەك خۆت پێشبینیت کرد. خوا بەو جۆرە ئەمیر سۆفی کوشت و بە هیلاکەتی برد.

بێگومان ئەمیر سۆفی هەڵەیەکی زۆر گەورەی کرد کە داخوازیکردنی شازادە سیفینی کچی بۆ کوڕەکەت قبووڵ نەکرد و لەو پەیمانەی کە دابووی پەشیمان بۆوە.

پیاوانی ئاینی و گەورە پیاوانی ئەنجومەنی شاری ئۆرغانج ددان بە پووچبوونەوە و خراپەکانی سەرداری پێشوویاندا دەنێن. وا ئێستاش شازادە سۆفی مردووە و گشتیان خۆیان دەخەنە ژێر سایە و بەزەیی تۆوە. بەرەکەتی خوات لەسەر بێت ئەی شازادە تەیموور تۆ ببە بە گەورە و سەرداری نوێی شارەکەمان شاری ئۆرغانج ئێمەش دەبین بە ژێردەستە و نۆکەری تۆ.

ئەمەش قەدەر و ویستی خوایە و خواش چی دانابێت دەبێت بێتە دی و نادرێتە دواوە..!!

-ئەی خواجە بەهاء تۆ دەمێکی دوور و درێژە، هاوڕێ‌و برادەری منیت. بە دەستی من هیچ زیانێك نابینیت.. بەڵام دەربارەی سەردار و شازادەکان ئەگەر ئەوان سوێندم بۆ بخۆن پەیمان و بەڵێنی ملکەچی و ژێردەستیم لەسەردەستی تۆدا بدەنی‌و تۆش شاهیدی پاکی و ڕاستگۆیی ئەوانم بۆ بدەیت ئەوا منیش ڕێیان پێدەدەم بە خۆشی و ئاشتی بژین.

هەرچی ئەشکەنجە و وێرانکارییەکیش هەیە ناهێڵم بەسەر شارەکەدا بێت.

شازادە تەیموور من دڵنیام لەو کارە و چۆن دەڵێیت هەرواش دەبێت داواکارم لێت هەرچی سەردار و شازادەیەکی ئۆرغانجیش هەیە بە دەست و پێوەندی خۆتی بزانیت.

بەڵام دەربارەی شازادە سیفین هەرچی کەسوکاری هەیە، ئەومیان ئارەزوو لێیە و پێیان خۆشە شازادە سیفین وەك بووکێك بنێرن بۆ لات. نەك وەك کەنیزەك و کۆیلەیەکی دەستبەسەرداگیراوی جەنگ.

-منیش هەروەهام دەوێت. وە هەرکاتێکیش ئەو و کوڕەکەی من گەیشتنە تەمەنی تەواو و کامڵی. ئەوا شازادە سیفینیش لەگەڵ کوڕەکەی مندا وەك ژنە شازادەیەك لە ئۆرغانجدا فەرمانڕەوایی گەلەکەی خۆی بکات. چونکە من وام نیازە ئەم شارە بکەم بە پایتەختی میرنشینی کوڕەکەم. وە هەوڵیش دەدەم مارەیی سیفین پارێزراو بێت و هیچ دەستکاری نەکرێت و بۆی هەڵگیرێت. بۆئەوەی بە سەربەرزی و گەورەییەوە لەگەڵ خۆیدا بیبات بۆ سەمەرقەند هەروەك ئەوە وابێت باوکە لووت بەرزەکەی، بە هیچ جۆرێك داوا و ئارەزووەکەی منی نەدابێتە دواوە.

-ئەی شازادە تەیموور من بە ناوی خۆم و ئەنجومەنی گەورەپیاوانی شاری ئۆرغانجەوە سوپاست دەکەم. بە ڕاستی بۆ شازادە و گەورەپیاوانت نیسپات کرد کە تۆ فەرمانڕەوایەکی باش و دڵ نەرم‌و دادپەروەریت. شازادەکانیش بە مەرجەکانت شاد و پێخۆشحاڵ دەبن.

ئەوانەی لەگەڵ ئیمامدا هاتبوون سەری ڕەزامەندییان بۆ قسەکانی ئیمام دانەواند. و لە سیماو چاوەکانیاندا دڵنیایی و هیوام خوێندەوە کاتێك سڵاویان لێکردم و وەرگەڕانەوە بۆئەوەی بە دەروازەکەدا بمبەن بۆ ناو شاری ئۆرغانج لە ڕاستیدا هەموو دانیشتوان و خەڵکانی شارەکەم حەپەساند بەوەی من لێیان خۆشبووم و ڕەحم و بەزەییم لە ئاستیاندا نواند، و ئەو گرنگییە زۆرەم دا بە کاروباری سیفین ی شازادەیان، بە پێداگرتنم لە خۆشی و شادی و دڵنیایی شازادەکەیان.

تەنها دڵشاد بۆ سەردانی سیفین چوو، وە لەگەڵیدا باش ڕێ و ڕەسم و ڕێکخستنی کاروباری شووکردن گواستنەوەکەی لەگەڵدا کرد.

گەرچی شازادە دڵشاد بە دڵ حەزی بە شووکردنی شازادە سیفین بە جیهانگیر نەدەکرد. چونکە پاشەڕۆژ دەبێت بە یەکێك لە ئەندامی خێزانی کوڕەکەم. ئەو واتە دڵشاد قسەی بۆ کردم‌و وتی:

-تەیموور، بە ڕاستی وەك وتیان شازادە سیفین زۆر جوانە..

وەڵامم دایەوە:

-کەواتە من بە شادی و خۆشی جیهانگیر شاد و بەختیارم..

بینیم پێش ئەوەی وەڵامـم بداتـەوە، دەم و چاوە جوانەکەی پەردەیەکی خـەم و ناخۆشی و ڕووگرژی بەسەردا کشا. ئینجا وتی:

-بەڵام.. جیهانگیر هێشتا لاوێکی دڵ نەرمە و من زۆر پێم سەیرە چۆن..

-چۆن دڵە ڕەق و بێبەزەییەکەی.. وا نییە؟

چاکە.. جیهانگیر پێویستی بە ژنێکی دڵ ڕەق و دڵ قایم و بێ بەزەیی هەیە.. نەك پێویستی بە ژنێك کە وەك بەرخ وابن لە بەردەستیدا وەك عائیشە و تەمینە و بۆ هەتاهەتایە دەست بەسەریاندا بهێنێت و خۆشیانی بوێت و دڵنەواییان بکات.

بەڵکو جیهانگیر پاشەڕۆژ هەر ڕامی دەکات و دەستەمۆی دەکات و سیفینیش لە دواییدا بەو ڕێگا تایبەتییەی خۆی هەر دەبێت خۆشی بوێت..

-بە ڕێگا تایبەتییەکـەی خۆی؟!! تـەیموور مـن لـەوە دەترسـم و ترسـم لێی هەیـە.. مـن لـەوە دڵنیا نیم، پاشەڕۆژ چاك بێت و ببێتە ژنێکی باش بۆی..

-قسەکانت هەمووی هیـچ و پووچـە و سەروبەر و هیـچ وەزنێکیـان نییـە تـۆش دڵێکی ڕەقـت هـەبوو، هـەروەها ئـەلجایش، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا باشـترین ژنێـك بـوون کـە خـەڵکی ئـاواتی پێدەخواستن و دەست من کەوتن.

پێکەنینێکی سارد لـە ڕوویـدا دەرکـەوت. بـەڵام ئـەوەندەی نـەخایاند، دەموچاوی بــە یــەکدا دایەوە و گرژ بوو. وەڵامی دامەوە و وتی:

-بەڵام سیفین نە لە من دەچێت و نە لە ئـەلجایش دەکات. ئـەو لـە ژنـە بیانییـەك دەچێت و زۆر گرانـە مـرۆڤ پشتی پێبـبەستێت. ڕاسـتە ئـەو زۆر جوانـە و قـەد و باڵایـەکی ڕێـك و جوانــی هەیە. بەڵام من هەر لێی دەترسـم و گومـانم لێـی هەیـە.. چونکـە بـە ڕاستی مـن جیـهانگیرم زۆر خۆشدەوێت.

دڵشاد هیچ مەترسە و شك و گومانیشت نـەبێت. بـڕۆرەوە بـۆ سـەمەرقەند و کاروبـار و ڕێ و ڕەسمی جوانـترین بـووك ئامـادە بکە، کـە وڵاتـی تەتـەر تـاکو ئێسـتا شـتی وا جوانی بـە خۆیــەوە نـەبینیبێت! ئێمـەش ئـەمیر سیفین سەرسام دەکـەین و سـەرنجی بـۆ لای خۆمـان ڕادەکێشـین و ڕایدێنین وەك پشیلەیەکی دەستەمۆی بچووکی لێدەکەین.

-تەیموور.. ئایا تۆ لەوە دڵنیایت..؟

-بێگومان.. دڵشاد.. بێگومان.. دڵنیام..

-باشە.. دوایی دەبینین.. ئایا دەبێت بە پشیلەیەکی دەستەمۆی بچووك.. یان دەبێت بە پشیلەیەکی گەورەی هار..

گەرچی قسە و دەنگی دڵشاد نەرم و نیان بوو. بەڵام قسەکانی پیس و ناخۆش بوون لە فیشکەی مار دەچوو..

* * *

## کۆیلەفرۆشێك و جوانترین کچ لە جیهاندا

کاتێك نزیك شەهری سیبز کەوتمەوە و خانووەکانیم لێدەرکەوت. بینیم شارەکە ماتەمینییەك باڵی بەسەردا کێشاوە. وامزانی میران شا مردووە! خێرا ئاوزەنگیم لە ئەسپەکەم دا و تاومدا و پێش کاروانەکەم کەوتم. یەکسەر بەرەو کۆشکی سپی ڕۆیشتم. لە کاتی هەڵمەتەکەمدا زۆر کەم بیرم لە میرانی کوڕم دەکردەوە. بەڵام هەندێ جار بیرم دەکەوتەوە و پێم ناخۆش بوو نەگەڵمدا نییە. چونکە دەیتوانی هاوبەشی ئەم شەڕ و کوشتارە بکات و شارەزاییەکی تەواو لە شەڕ و کوشتاردا پەیدا بکات.

گەرچی من زۆر گوێشم پێنەدەدا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم کارەم بە شتێکی نابەجێ و شوورەیی دەزانی کە مرۆڤ منداڵی خۆی لەدەست بچێت، پێش ئەوەی بتوانن خزمەتێکی دەرباره بکەن.

هەر لە دوورەوە پاسەوانێك منی ناسیەوە و خێرا ئاماژەی بۆ پاسەوانی کۆشکەکە کرد و ئاگاداری کردنەوە.

خاتوو شێرێزا لەسەر پێپلیکانەی کۆشکەکەدا ڕاوەستابوو. خۆی بۆ پێشوازی و سڵاولێکردنم ئامادە دەکرد.

ئەو خەم و خەفەت و ماتەمینییە زۆرەی لە ڕووخساریدا بینیم. ترس و گومانی زۆر زیادکردم.

کاتێك لەسەر پشتی ئەسپەکەم دابەزیم. خێرا باوەشم بۆ خاتوو شێرێزا کردەوە و باوەشم پێداگرد. بۆئەوەی خەم و پەژارە و گریانی کەم بکەمەوە.

هەستم کرد چەند خەمبارە و چ زەرەرێکی گەورەی کردووە. پێم وت:

-ئایا میران شا..؟!!

دەستی بە گریان کرد و سەری خستە ناو دووتوێی جلە تۆز و خۆڵاوییەکەمەوە و قسەی پێبڕیم و وتی:

-میران شا وا لە ژوورەکەی خۆیدایە..

لێم پرسی: پێم بڵێ لە کەیەوە.. ئەو.. لە کەیەوە.. ئەمە ڕوویدا..؟

هەستم کرد حەز بە وشەی مرد.. ناکات.

شێرێزا هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و تۆزێك هاتەوە سەرخۆ و وەڵامی دامەوە وتی: ماوەی مانگێکە.. بەڵام من ئەو هەواڵەم هیچ پێنەگەیشت دوێنێ نەبێت..!!

وتم: ماوەی مانگێك..؟!! ئایا تۆ دەزانیت چی دەڵێیت..؟

وەڵامی دامەوە:

-بەڵێ تەیموور ماوەی مانگێکە ئەمە ڕوویداوە..!!

تۆزێك لە خۆمم دوورخستەوە بۆئەوەی تەماشای ڕووخساری بکەم. چونکە دەمزانی میران شا ماوەی مانگێك نابێت ئەم شتەی لێبەسەرهاتووە. چونکە ئەو بەسەرهاتە ناخۆشەی بەسەری هات، ماوەی هەفتەیەك زیاتر نییە. من وامزانی خاتوو شێرێزا دەبێت شێت بووبێت یان جنۆکە دەستی لێوەشاندبێت.

سەرلەنوێ پرسیارم لێکردەوە:

-ئایا تۆ لەوە دڵنیایت ئەم کارە مانگێك لەمەوپێش ڕووی داوە..؟

وتی: بەڵێ.. تەتەرە سوارەکە ماوەی مانگێکی پێچووە تا توانیویەتی بگاتە لام و ئەم هەواڵەم لە هیراتەوە پێبگەیەنێت.

وتم: کەواتە میران شا لێرە نییە..؟!! ئایا ئەو لە هیراتە؟

وەڵامی دامەوە وتی:

-نەخێر.. میران لێرەیە.. وا لە ژوورەکەی خۆیدا کەوتووە..

وتم: کەواتە ئەو نەمردووە..؟

وتی: نەخێر کوڕەکەم نەمردووە. بەڵکو باوکم مردووە..!!

ئیتر کتوپڕ خاتوو شێرێزا دایە پرمەی گریان.. خۆشی نەیدەزانی ئایا بە هۆی مردنی باوکییەوە دەگری یان بۆ میران شا دەگری؟ کەوا لە ژوورەوە گیاندەدات..!!

پاشان بە پەژارە و دڵەخورپێوە لێم پرسی:

-بەڵام ئەی میران شا ئێستا چۆنە..؟ تەندروستی لە چیدایە..؟

وەڵامی دایەوە:

-میران هێشتا هەر سەری دێشێت.. تەیموور..!! تۆ وا بە گورجی و خێرایی هاتیت، یەکەم قەمو پرسیارت، هەواڵی تەندروستی میران شای کوڕت پرسی.. دەبوو لە پێشدا سڵاو لە من بکەیت و هەواڵی من بپرسیت، بەڵام هەر لە منت نەپرسییەوە..!!

وتم: بێگومان شێرێزا من یەکەمجار ناوی ئەوم هێنا و لە تەندروستی ئەوم پرسی. باشە ئەمە زیاتر لە باوکی چاوەڕوانی چی دەکەیت..؟

ئیتر دوای ئەوە ناچار بووم، دڵنەوایی بکەم. چونکە ئەو جۆرە بالگوشینەم کە شێرێزا گوشی، وی پێراگەیاندم، هۆیەکی تر هەیە و بەو هۆیەوە خەم و پەژارەی کەم دەکەمەوە و دڵتەنگی نەهێڵم..!!

ئەو پەرۆش و بە تەنگەوەبوونەم بۆ میران شا لە هەناوی خاتوو شێرێزادا شتێکی خەملاند، ئەو سۆز و برسێتییە جنسییەی یەکەمجاری شەوی زاوایەتیمان دەچوو..!!

ئیتر ئاوەها پاش ئەوەی تەماشای میران شامان کرد و دڵنیابووین لە ساغ و سەلامەتی و بینیمان نوستووە. دایکی پێی وتم:

-میران دەرمانی خەوی خواردووە.

دوای ئەوە پێکەوە لەگەڵ خاتووندا چووین بۆ ژووری نووستنەکەی لەوێ لە مێشکماندا بیری جەنگ و چارەنووس و پاشەڕۆژمان خستە لاوە و.. پێش ئەوەی شاری شەهری سیبز جێبهێڵم. تیپێکم نارد بۆ هیرات. بۆئەوەی خەم و پەژارە و سەرەخۆشی خۆم بە هۆی مردنی شامالکەوە بگەیەنن بە کوڕ و کەسوکاری. هەروەها داوام لە براکەی شێرێزا کرد، بێن و ئامادەبن لە ئاهەنگ و شایی گواستنەوەی ژنهێنانی جیهانگیردا.

شازادە شێرێزا و شێخ عەلی لە دوای باوکیان باشترین و ڕەسەنترین نەوە و وەچە بوون و لە براکەیان زیاتر ڕەوا بوون.

ئەو برایەشیان –غیاسەددین- باوک برایان بوو لە دایک و باوکێک نەبوون. منیش دەمزانی هەردووکیان "واتە شێخ عەلی و شێرێزا" هەستیان بەوە کردبوو، کە دەتوانن لە مافی چوونە سەر تەختی شاهانەدا بەرهەڵستی براکەیان بکەن و بەرامبەری ڕابوەستن.

شێرێزا هیوا و ئاواتی وابوو لە دوای مردنی باوکی، براکەی لەبەر خاتری ئەو ملکەچی و ژێردەستەیی خۆیم بۆ ئاشکرا بکات. بەم کارەش شاری هیرات کە ئەو زۆری خۆشدەویست لە کارەساتی وێرانکاری دوورکەوێتەوە.

بەهەرحاڵ شێخ عەلی لەگەڵ ئەو ئاوات و ئارەزووەی ئەودا نەبوو. منیش زۆر گوێم نەدەدایە، ئایا شای نوێی هێرات. گوێ لە بانگەوازەکەم دەگرێت یان نا.. و پاڵم پێوە دەنێت جەنگی لەگەڵدا بکەم.

منیش دەمتوانی ئەوە لەبەرچاوی خاتوو شێرێزا و لە پێشچاوی هەزارەها فارسی و ئەفغانیدا، بسەلێنم و شاری هێرات داگیربکەم.

گەل و میللەتەکەش لە هەموو شتێك زیاتر و بگرە لە هەموو کەسێکیش زیاتر ڕێزی گەورەیی شازادە شێرێزایان دەگرت و خۆشیاندەویست.

ئەو سەرکەوتنە نوێیانەشم زیاتر پاڵی پێوە دەنام و بڕوای پێ پەیدا کردم. خۆشم ئارەزووم لێبوو. هێرات کە ناوچەیەکی بەهێز و دەوڵەمەند بوو. بخەمە سەر موڵك و وای لێبکەم یەکسەر بیخەمە ژێر فەرمانڕەوایی خۆمەوە. کاتێك گەیشتینەوە بۆ سەمەرقەند بینیم، شار هەموو سەرقاڵی ئامادەکردنی ڕێ و ڕەسمی ئاهەنگی ژنهێنان و شایی جیهانگیرن، دڵشاد لەگەڵ ئەو هەموو گومانەیدا، یەك تۆز کاتی خۆی بە فیڕۆ نەدابوو. هەوڵێکی زۆر و زەبەندی دابوو بۆ ڕێکخستن و ئامادەکردنی کاروباری شاییەکە. بە ڕوویەکی خۆشی دروستکراوی درۆیانەوە پێیوتم:

-ئێمە ئەوەندە بەغیل نین و پێشمان ناخۆش نییە جیهانگیر شازادە سیفین بهێنێت. گەرچی شازادە سیفین ئەوەندە شتێکی جوان و دانسقەش نییە.

هەستم کرد دڵشاد زۆری پێ ناخۆش بوو، غیرەتی زۆر جووڵا کە زانی من لە شەهری سیبز بووم.

ئیتر منیش بە گەمە و گاڵتەوە گوێم گرت و ڕامێکێشا و پێم وت:

-دڵشاد شایی، شایی جیهانگیرە، هەرچۆنێك بێت خۆت وتت شازادە سیفین، جوان و ڕێکوپێکەو قەدوباڵایەکی ڕێك و جوانیشی هەیە. جا لەبەرئەوە پێویستە کارێك بکەین شاییەکەی زۆر خۆش و جوان و قەشەنگی بۆ بگێڕین. بە شێوەیەك بێت، سەرنجی سیفین ڕابکێشین و سەرسامی بکەین و لووت بەرزی و خۆبەزل زانینی نەهێڵین و لەبیری بەرینەوە.

وتی: ئۆهـ.. تەیموور خۆ بەزل زانینی نەهێڵین؟ تۆ بە جۆرێك دەتوانیت لووت بەرزی و خۆبەزل زانینی نەهێڵیت، بە شێوەی کەنیزەکێك پێشکەش بە جیهانگیری بکەیت. ئا بەم شێوەیە هەرکاتێك ئازاری جیهانگیر دا و لە فەرمانی دەرچوو. ئەوکاتە دەتوانیت بیکوژیت. وا نییە.. تەیموور..؟ یاخود بۆخۆتی بهێنە و بیکە بە ژنی خۆت و بگەڕێ ژنێکی جوانتری بۆ بدۆزەرەوە..!!

وتم: دڵشاد هەرگیز ئەم نابەجێییە ناکەم و ئابڕووی خۆم نابەم.

من لەو باوەڕەدام تۆ ئیرەییەکی زۆر بە شازادە سیفین دەبەیت. تۆ خۆت دەزانیت، نابێت شتێك لای من گرنگ بێت و پێم خۆشبێت تۆ پێت ناخۆش بێت.

وتی: نا.. تەیموور.. من دەزانم تۆ دەرەقەتی دێیت و دەتوانیت بەرهەڵستی بکەیت و زاڵ بیت بەسەریدا. بەڵام من لەوە دڵنیا نیم جیهانگیر بتوانێت زاڵ بێت بەسەریدا و بەرهەڵستی بکاتەوە!

لە ڕاستیدا من نەمدەتوانی و نەمدەزانی هۆی ترس و لەرز و نائارامی دڵشاد بزانم چییە..

لە ماوەیەکی کەمدا نوێنەرەکانم لە هێرات گەڕانەوە و لەگەڵ خۆشیاندا دیاریی زۆر گرانبەهاو دانسقەتریان لەوانەی من بۆم ناردبوون هێنایەوە و لەگەڵ خۆشیاندا نامەیەکی فەرمانڕەوای نوێی هێراتیان هێنابوو کە تێیدا وتبووی:

"من شەرەفمەند بووم و شادومان بووم، بەو میوانداریەیەم. داواکارم لە بەڕێزتان سەیفەدین و هەندێك شازادەی تری بە تەمەن درێژی خاوەن شان و شکۆ بنێرن بۆ لامان بۆئەوەی لەگەڵیاندا بێم بۆ سەمەرقەند"

گەرچی من بڕوام بەو شادی و خۆشییەی فەرمانڕەوای نوێی هێرات و بەو پێخۆشبوونەی نەکرد.

بەڵام ئەم وەڵام و پێخۆشبوونەی دەنگدانەوەیەکی زۆر گەورە و باشی هەبوو لە لایەن شازادە شێرێزاوە زۆریشی پێخۆش بوو.

ئیتر ئەوکاتە کۆمەڵە پیاوی تایبەتیم نارد بۆ ڕێگا سەرەکییەکانی ڕێگای خۆراسان و ڕێگای چین و ڕێگای بوخاری کە دەچوو بۆ هیند بۆئەوەی خواردن و پێداویستی و شتومەك بکڕن و ئەگەر پێویستیش بکات بە هێز پەیدای بکەن و بیهێننەوە بۆ سەمەرقەند بۆ لامان.

هەروەها کۆمەڵێك پیاوی تایبەتی خۆم نارد بۆ -ئەنفووت- بۆئەوەی سەد کچی زۆر جوانم بۆ بهێنن و دەنگوباس و هەواڵیشم نارد بۆ هەموو جێگا و ڕێگا بازرگانییەکان و بە توجارەکانم ڕاگەیاند، هەرچی کەلوپەل و شتی نایابیان هەیە، لەهەر جۆر و شتێك بن، لەگەڵ خۆیاندا بۆم بهێنن.

من دەمویست ئەو دیارییانەی لە ئاهەنگ و شایی ژن هێنانەکەی جیهانگیردا، دابەش دەکرێت لە جوانترین و نایابترین و دانسقەترین دیارییەك بێت، لە جوانیدا تاکو ئێستا لە مێژووی وڵاتی تەتەردا شتی وا جوانی بە خۆیەوە نەدیبێت.

بازرگانانیش له هەموو لایەکەوە بە دەنگ بانگەوازەکەمانەوە هاتن. گەوهەرفرۆشەکان لە هەموو لایەکەوە باشترین و نایابترین دوڕ و گەوهەر و مەرجانیان لەگەڵ خۆیاندا هێنا. بازرگانانی قوماش و چەك و هەموو جۆرە کەلوپەلێکی ترو شتی نایابی دروستکراو ڕوویان کردە سەمەرقەندو لەگەڵ مـنو وەکیلە شارەزاکانمدا لە کاروباری کڕینو فرۆشتندا ڕێککەوتنو ڕێککەوتننامەی شت کڕینمان مۆرکرد. کۆیلەفرۆشێك -واتە بازرگانی بەندەکان- کە ناوی پۆلس بوو، هات بۆ لامو لەگەڵ خۆیدا شتی فرۆشتنەکەی خۆی هێنابوو.

هەرکە ناسیمەوە، ڕێگام دا بێتە ناو کۆشکەکەمەوە. ئەم کۆیلە فرۆشانە زۆرجار بۆ سوودی خۆیان ئەو کەنیزەکانەی پێیان بوو، بۆ ماوەیەك بەکرێیان دەدا. بەرامبەر هەندێك پارەو نەیاندەفرۆشتن بۆئەوەی لە دواییدا دەستبەتاڵ نەمێننەوەو هیچیان پێنەمێنێت.

لە کاتێکدا پێشوازی پۆڵسم کرد. لەگەڵ ئۆیجا "کە زیرەکترینو شارەزاترین کەسێك بوو لە ژیانمدا دیبێتم بۆ ناسینو بڕیاردان بە سەریدا" و دە ژنی تر لە کەنیزەکانمدا لە هۆڵی کەیفو ڕابواردندا دانیشتبووم. بە شێوەی خۆ لە پێش کردنو فێڵبازێکی شارەزاوە هاتە ژوورەوە.

لێم پرسیو وتم:

-ها.. پۆڵس وا دیارە هەندێك کەنیزەکت پێیەو هێناوتە بۆ ئاهەنگی شاییەکە؟ وا نییە.. پۆڵس..؟

وەڵامی دامەوە:

-نەخێر.. شازادەی گەورەم.. بەڵکو تەنها گەوهەرێکم پێیەو ئەویش لە باشوورەوە لەبەر خاتری تۆ هێناومە.. تەنها لەبەر خاتری تۆ.. بۆ کەسی ترم نەهێناوە، لە ڕێزو گەورەییدا لە تۆ کەمتر بێت.

وتم: ئایا ئەو کەنیزەکە ئەوەندە جوانە؟

وتی: بەڵێ شازادەی گەورەم، ئەو کچە جوانترینو نایابترین کیژی جیهانە..!!

وتم: زۆر باشە، کەواتە بانگی بکە با بێتە ژوورەوەو خۆیمان پیشان بدات، پۆڵس هەنگاوێکی ناو هاتە پێشەوە بۆ لامو لووتمو ئەو ناوەی پڕکرد لە بۆنی ئەو میسكو گوڵاوەی لە لەشی خۆیدا بوو.

چەپڵەیەکی توندی لێدا. کۆیلەیەکی ڕەشی خەسێنراو هاتە ژوورەوەو کچێکی پێش خۆی دابوو. دەموچاوی بە پەچەیەکی ئەستوور داپۆشیبوو. کراسێکی ئاودامانی درێژی لەبەردا بوو، گەیشتبووە سەر پەنجەکانی پێی. ئینجا پۆڵس ڕووی تێکردمو وتی:

-ئەی شازادەی گەورەو بەڕێز، خۆت ئامادە بکە بۆئەوەی جوانترین کچ ببینیت کە تاکو ئێستا مرۆڤ شتی وا جوانی نەدیوە..!!

بە زەردەخەنەو ڕوویەکی خۆشەوە وەڵامم دایەوەو وتم:

-پۆڵس زۆر چاکە من ئێستا زۆرچاك ئامادەم.. دەی ئەو شتە جوانەتم پیشان بدە.

دووبارە چەپڵەیەکی تری لێدایەوەو بە زمانێکی بیانی کە من تاکو ئێستا ئەو زمانەم نەبیستبوو.. قسەی لەگەڵ کچەکەدا کرد. بەڵام کچەکە لە شوێنی خۆی نەجووڵا.. هەمدیسان پۆڵس قسەی لەگەڵدا کردەوەو فەرمانی پێدا.. کچە هەر هیچ نەجووڵا.. ئیتر دوای ئەوە ڕوویکردە کۆیلە خەسێنراوەکەو فەرمانی پێدا.. کۆیلەکەش فەرمانەکەی جێبەجێ کرد.. قولە، کراسی کچەکەی گرتو بە خێرایی کراسەکەی لەبەردا داکەند.!! لەش‌و لارێکی ڕێکوپێك‌و لەشێکی ئەوەندە جوان‌و ناسك دەرکەوت، لە لەشولاری مرۆڤ نەدەچوو.. بەڵکو لەش‌و لاری پەرییەکی ڕاستی بوو. کە لە باخچەی بەهەشتی بەرینی خودادا هاتبێتە دەرەوە..!!

ئیتر دوای ئەوە پۆڵس هاواری کردو وتی:

-شازادەی گەورەم تەماشاکە.. ئایا ئەم جوانییە، جوانییەکی خەیاڵی‌و ئەفسانەیی نییە..؟!! ئایا قسەکانم ڕاست‌و ڕەوان نەبوون؟ ئەوەندەی نەخایاند کابرای خەسێنراو پەچەکەی لە ڕووخساریدا داماڵی‌و سەرپۆشەکەشی لەسەر کردەوە..

ئەو قژە زەردە ئاڵتوونییەی کردبووی بە پرچ‌و بەسەر شان‌و ملیدا هاتبووە خوارەوە، دەتوت تیشکی خۆرە..

بە جوانی ئەو پرچ‌و قژەی هەر حەپەسام. هەتا ماوەی یەك چرکەی تەواو بێ ئەوەی تەماشای ڕووی بکەم، تەماشای ئەو پرچە زەردانەیم کرد. لەبەرئەوەی شەرمەزار بوو، بە شەرمێکەوە کەمێك سەری داخست‌و چاوەکانی نووقاند.

بەڵام ئەم سەرداخستن‌و چاونووقاندنەی زیاتر شۆخ‌و شەنگ‌و جوانتری کرد.

کاتێك تەماشای ئەو دوو ئەبرۆ بەرزو کەوانەیی‌و برژانگە درێژەکانی‌و چاوە نەرمەکانی‌و ئەو لووتە قوت‌و ڕێك‌و بچووکەو ئەو لێوە سوورە ئەفسووناوییانەیم کرد، ئەوەندە لە تەریقی‌و شەرمەزاریدا گازی لێگرتبوو، سوور سوور هەڵگەڕابوو. بە جارێ دڵ‌و هۆشمی بۆ لای خۆی ڕاکێشا..!! ئەی خوایە چەند جوان‌و دڵبەرو شۆخ‌و شەنگ‌و سەرنجڕاکێش بوو!! چاوی داخستبوو لە شەرماندا بە نائومێدییەوە گازی لە لێوەکانی دەگرت بۆئەوەی بەسەر ئەو دڵە خورپێ‌و شەرمەزارییە زۆرەیدا زاڵ بێت.

ئەوەندە سەرنجی ئەو ڕووخسارە جوانەیم دا هەتا بە جارێك سوورایی لە ڕوویدا نەما جگە لە سەر کوڵمە سوورە گوڵاوییەکانی نەبێت، وەك گوڵێکی سووری گەشی جوان لەسەر هەردوو کوڵمەکانیدا دەبریسکایەوە.

دوای ئەوە تەماشای شانە سپییە نەرمەکانیم کرد، کە لە نێوان قژو پرچەکانییەوە، دیاربوون.

ئینجا چاوم بڕییە ئەو دوو مەمکە قوتو جوانە دولبەرانەی کە لە دوو هەناری تازە پێگەیشتوو دەچوون. سەرگۆی مەمکەکانی وەك سەرگۆی مەمکەکانی ژنە تەمەنرییەکان ڕەش نەبوو، بەڵکو دەتوت دوو خونچەی گوڵە مێخەکی سووری تازە پێگەیشتوون.

لەسەر جێگاکەم هەستامو پۆڵس بە خۆشیو شادیو ئارەزووەوە دەستی گرتمو بردمی بۆ لای کچەکەوە بۆئەوەی بە دەوریدا بسووڕێمەوەو تەماشای ئەو جوانییە بێوێنەییو ئەفسانەییەی بکەم..

-تۆبجاش لەسەر جێگاکەی خۆی هەستاو بەدوامدا هات.

-پۆڵس یش بە شانازیو گەشو فشو خۆهەڵکێشانەوە پێی وتم:

-گەورەم.. تەماشای ئەم جوانییە ئەفسووناوییە بکە، لەم کچە پاکیزەیەدا هەیە.. گەرچی تەمەنی لە بیست ساڵ زیاتریشە.

بە ڕاستی کچی وا جوانو قەشەنگ، نە لە وڵاتی ئێوەداو نە لە وڵاتی ئێمەشدا نییە..

ئیتر منیش دەستم هێنا بەسەر قۆڵە سپییە ناسکەکانیداو دەستمهێنا بەسەر ئەو سنگە سپییە مەرمەڕییەداو لەپی دەستم خستە ژێر مەمکە توندوتۆڵەکانییەوەو بە هێواشیو لەسەرخۆ گرتمو سووك گوشیم..!! بەڵام تۆزێك لێم دوورکەوتەوەو گرژ بوو، ددانەکانی جیڕکردنەوەو هێواش چاوەکانی نووقاندو لێوەکانی خۆی گەست.

ئینجا لە پۆڵسم پرسی:

-پۆڵس ئەم کچەت لە کوێ دەستکەوتووە؟

وتی: لە یەکێك لە دزو جەردەکانی ناو دەریا..

وتم: چۆنت دەستکەوت..؟

وەڵامی دامەوە: لە یەکێك لە سەرکردەی دزو جەردە پیرەکانی ناو دەریام کڕیوە. ئەو جەردەی ناو دەریایەش دەیزانی بە هۆیەوە، پارەیەکی زۆر باشی دەستدەکەوێت، لەبەرئەوە نەیهێشتووە هیچ پیاوێك لە پیاوەکانی بە هیچ جۆرێك دەستی بۆ بەرنو بێزاری بکەن. هەروەك

سەرۆکی جەردەکان پێی وتم ئەم کچە لەگەڵ دوو ژنی تری هاوڕێیدا دەچوون بۆ فەلەستین بۆ حەج.. بەڵام ئەو ژنانە لەم گەورەتر بوون‌و سەریشیان هیچ قزیان پێوە نەبوو. لەبەرئەوە ئەم سەرگردە پیرە، ئەوانی داوە بە دەریاوانەکانی برادەری‌و ئەمیشی بۆ خۆی گلداوەتەوە..

وتم: پۆڵس بە ڕاستی ئەم کچە جوانییەکی بێوێنەی سەیرو نایابی هەیە!! ئینجا دەستم هێنا بە لەشە ناسك‌و نەرمەکەی‌و پووزە جوان‌و ڕانە نەرم‌و نیانەکەیداو، دەستم خستە ناو قژە زەردە زێڕینەکەیەوەو بە تەواوی مەست‌و سەرخۆش بووم‌و چاوم بڕییە جوانییەکەی.

ماوەیەکی زۆر بڕوام بە چاوەکانی خۆم نەکرد، وامدەزانی خەو دەبینم یان لە خەیاڵدام. وامدەزانی من پەرییەکی ئاسمان یان فریشتەیەك لە فریشتەکانی بەهەشت دەبینم. بەڵام هیچ نموونەی نەخایاند لەو مەستییەم هاتمەوە سەرخۆم‌و تێگەیشتم بە ڕاستی من وام لەبەردەم ئینسانێکدا، وام لە بەردەم کچێکی ڕاستەقینەدا.

ئەم کچە زۆر زۆر سپی بوو، بە عەکسی نۆبجاوە بوو کە زۆر ڕەش بوو.

نۆبجاش بە دەوری کچەکەدا بە سەرسامی‌و نائارامییەوە سووڕایەوەو پاشان هانی دام‌و وتی:

-گەورەم زووبە ئەم کچە بکڕەو ئەم پیاوەش خێرا ئیزن دە.

ئیتر پاش ئەوەی باش لە کچەکەم ڕوانی‌و سەرنجدانەکەم کۆتایی پێهێنا.

بە هێواشی دەستێکم کێشا بە سمتیدا. ئەمەش ڕێگای تایبەتی من بوو کە بەکارمدەهێنا، لە کاتێکدا بمویستایە ماینێك یان ئەسپێك بکڕم بۆ ئەوەی هێزو توانای بزانم.

کتوپڕ کچەکە لە شوێنی خۆیدا وەرگەڕایەوە بۆ لام‌و ڕووی تێکردم‌و بۆ یەکەمجار دەموچاوەکانی کردەوەو شتێکی وت..!!

بەڵام من تێنەگەیشتم چی وت. سەرەتا زەردەخەنەیەکم بۆ کرد. پاشان لە خۆشی‌و شادی خۆم دەستم کرد بە قاقای پێکەنین. بینیم کچەکە ئەو ترس‌و لەرزو قین‌و ڕووگرژییەی لە ڕوودا نەماو ڕووی گەشایەوە. هەستێکی سەیرو شادی‌و گوێڕایەڵبوون‌و خۆشی جێگای گرتەوە!!

کچەکە هاتە پێشەوە، سەری پەنجەکانم‌و ناولەپی دەستمی گرت‌و هێنای بەسەر لەشە سپییە عاجییەکەیدا.

ئەو لەشەش زۆر لە ئاوریشم نەرمونیانتر بوو!!

لە پۆڵسم پرسی، وتم:

-ئەم کچە ناوی چییە؟

وتی: گەورەم.. نالی سۆن..

وتم: ئالی سۆن..؟ ناوێکی جوانـه.. خۆی چەند جوانـه.. ئـەوەندەش ناوەکەی جوانـه.. باشـه نرخی ئەم کچه چەندە..؟!!

وتی: گەورەم.. پەنجا هەزار دینار..!!

وتم: پـەنجا هـەزار دینـار...!! ئەمـه نرخێکی هێجگار گرانـه.. مـن بـەو پارەیـه دەیـەها ژنـی پێدەکڕم..!!

وتی: بەڵام وەك ئەم.. نا.. ئەم جوانترین کچی جیهانه.. هەروەها هێشتا کچەو پاکیزەشه[٢]..!!

وتم: پاکیزە..؟ تەمەنی ئەم کچه بیستویەك ساڵه.. دزو جەردەی نـاو دەریـاش گرتوویانـه، لـه وڵاتی یۆنانـەوە لە لایەن کۆیلەفرۆشەوە بۆ ئێرە هێنراوە.. ئایا ئەمە دەچێتە عەقڵەوە تاکو ئێستا به پاکیزەیی مابێتەوەو نەکرابێت به ژن..؟! ئەمە قسەیەکی درۆیەو هیچ ڕاست نییە..!!

وتی: نـەخێر. گەورەم.. قسەکانم هەمووی ڕاستو بێگومانن.. من پێم وتیـت ئـەو جەردەیـەی لێم کڕی، پیرەمێردێك بوو.. منیش بـه هیـچ جۆرێك نـەچووم بـه لایداو بـه خراپـی دەستم بۆ نەبردووە. به ڕاستی بڕوام پێبکه هێشتا کچێکی پاکیزەیه..!!

بەڵام هێندەی نەخایاند نۆبجا تەماشای کردمو پێی وتم:

-ئەمیرەکەم، کچەکەی لێبکڕەو ئەم پیاوە ئیزن بدە..

وتم: نۆبجا بەڵام نرخەکەی پەنجا هەزار دینارە..!! نرخێکی زۆر گرانه..!

وتی: ئەمیرەکەم بۆ دووەم جار پێت دەڵێم.. کچەکه بکڕەو کابرا ئیزن بدە..!!

-پۆلسیش سەری ڕەزامەندی دانەواندو پێی وتم:

-گەورەم، ئەمە کچێکی جوانەو گەورە کچو نەوجەوانێکی تازەپێگەیشتووە من سوێندیشت بۆ دەخۆم تاقی بکەیتەوەو تێیبڕوانیت.

ئەگەر کچ نەبوو بە پاکیزەیی نەمابێتەوە.. ئەوا ئامادەم ئەوکاتە زمانم ببڕیت.

نۆبجا بێ ئەوەی خۆی پێڕابگرێت ڕایکێشامە ئـەملاوە بـه وردی تەماشـای چـاوی کـردمو بـه هێواشیو لەسەرخۆ چرپاندیو وتی:

گـەورەم.. ئـەمیرەکـەم.. کچەکەی لێبکـڕەو کـابرا ئـیزن دە.. خـوا پیـاوی لەبـەر خـاتری ژن دروستکردووەو ژنیشی لەبـەر خـاتری پیاو دروستکردووە.. مـن ددان بـەوەدا دەنێمو دەڵێم ئـەم ئافرەتـه تـاکو ئێستا کچێکی پاکیزەیـەو دڵنیاشـم هێشتا کـەس دەستی بـۆ نـەبردووەو هـەر بـه پاکیزەیی ماوەتـەوە.. بـه ڕاستی ئـەو پارەیـەش دێنێـت..!! مـن هـەندێ کچـی وەك ئەمـەم لـه

---

[٢] پاکیزە: عذراء _ بتول

نەستەنبووڵدا دیـوە.. بـە ڕووخۆشـیو نەرمونیانییـەوە لەگـەڵیدا بجووڵێرەوەو میـهرەبان بـە لەگەڵیدا.. ئەوساکە تێدەگەیت.. ئەم کچە شایانی ئەو هەموو پارەیەیە. میرانی گەورەم هـەر ئێستا ئەم کچە بکڕەو ئەم کابرایەش خێرا ئیزن دە..!!

وتم: زۆر چاکە.. ئۆبجا بە قسەت دەکەمو چی دەڵێیت وا دەکەم..

وتی: پاشان تێدەگەیت ڤازانجیشت کردووە.

وتم: باشە تۆ لەمە بە تەواوی دڵنیایت..؟

وتی: بەڵێ من بەڵێنو گرەنتی ئەمەو قسەکانمت دەدەمێ..!!

ئینجا وەرگەڕامەوە بەلای پۆڵسداو پێم وت:

-واز لە کچەکە بهێنە با لێرە بێت.. خۆت وەرە لەگەڵمدا با بچینە ژووری نەختینەمەوە.. باشە دەتەوێت جۆری نرخەکە چۆن بێت..؟

وتی: گەورەم دەمەوێت بـە گەوهـەرو ئـەڵماس بێـت.. چونکە ئەمانـە لە ئاڵتوون سووکترنو منیش دەبێت لە گەڕانەوەمدا ماوەیەکی دوورو درێژ ببڕم..

وتم: زۆر چاکە چۆنت پێخۆشە با وابێت، منیش بێ دڵیو نائومێدت ناکەم.

پۆڵس لە پێشمەوە ڕۆیشتو لەگەڵ خۆشیدا بۆنو بەرامەی میسكو گوڵاوە خۆشەکەشی برد.

منیش بە بەردەم ئالی سۆندا ڕەت بووم بۆنی عەترێکی خۆشـم بـە سەردا هات بۆنـی عـەترو گوڵاوێکی تیژ وەك کچەکە خۆی جوانو ناسكو بۆن خۆش بوو. وەك ڕەنگو ڕوو، و لەشە سپییە عاجییەکەی جوانو دڵڕفێن بوو.

لە ڕاستیدا ئالی سۆن جوانترینو نایابترینو بە نرخترین شتێك بوو من دەستم کەوتو کڕیم.

لـە مـاوەی ئـەو مانگـەی خۆمـان ئامـادە دەکـردو ڕێو ڕەسمـی ئاهـەنگی ژنهێنانەکـەی جیهانگیرمان سازدەکرد. مـن حـەوت ژوور لـە گەنجینـەکانو ئـەو شـوێنانەی شـتم تیـادا دادەنـا، پڕکرد لە بە بەهاترینو نایابترین کەلوپەلی جیهان.

لە قوماشی ئاوریشم کە لە چینەوە هێنرابوونو لـە قومـاشو ئاوریشـمو گەوهـەرو ئـەڵماسو شەوچراو یاقووتی ولاّـی هینـدو بـەردی گرانبـەهاو زومـوردو یـاقووت کـە لـە دەریاکانی خۆتـاندا دەریانهێنابوو. وە لە عەقیقو بەردی گرانبەهای وڵاتانی ناوچە بەستەڵۆکەکانو بۆرسلینو شتی لە شووشە دروستکراوو شیرو قەڵغان کە شارەزاترین وەستاکانی ئاسیا دروستیان کردبوو.

هەروەها ژوورو تەویلەو کوڵانەکانیشم پڕکردبوو لە دیاریی زیندو وەك: سەدەها کچی جوانی پاکیزەو ئەسپو مایینی ڕەسەنو هەڵۆو بازو شەهێنو تانجیو سەگی ڕاویو پڵنگو..

دڵشادیش هەرچی خواردنو خواردنەوەیەکی نـاوخۆو دەرەوە بـوو، هـەڵبیژاردبوو وە ئامـادەی کردبوو بۆئەوەی خوانو سەرمێزی نانخواردنو خواردنەوەی میوانەکانی پێ برازێنێتەوە.

شازادە شێرێزاش کە ئاواتی دەخواستو بـە هیوابـوو ئـەویش لـە پاشـەڕۆژدا شاییو ئاهـەنگی لەمە خۆشتر بۆ ژنهێنانی کوڕەکانی بگێڕێت. ئەویش هەرچی توجارو وەستایەکی شارەزا هـەبوو، لە هەموو لایەکەوە بانگی کردبوون بۆئەوەی چی دەتوانـنو چی دەزانـن لـە شـتی جوان کـردنو ڕازاندنەوە دروستی بکەنو دارو دیوارو ژوورو زەوی تەلارەکە برازێننەوەو جوانی بکەن.

کاتێك هـەواڵم پێگەیشت، براکەی شێرێزا، نـاتوانێت بێت هاوبەشی ئاهـەنگو خۆشـییەکە بکاتو نوێنەرو تەتەرەکانیشی لە هیرات ئازارداوەو تەنگەتاوی کردوون.

تەنها ئـەوەم بـە شێرێزا وت، براکەی داوای لێبوردن دەکاتو نایـەوێت هاوبەشی ئاهـەنگو شاییەکە بکات.

باسی بێ بەڵێنیو پاشگەزبوونەوەکەیم نەکرد..

چونکە من دەمویست ئاهەنگی شاییو ژنهێنانەکـەی جیهانگیر تێکنـەچێتو زۆر سـەرکەوتوو نایابو خۆش بێت.

چونکە دوای شاییەکە دەتـوانم حسابی خۆم لەگـەڵ براکـەی شێرێزادا بکـەم. هـەرچی بـانگ کراوانو میوانـەکانی تـر هـەبوو، میواندارییەکـەمانیان قبـووڵ کردو هیـچ ڕۆژی یەکـەمی مـانگی جـەمادی یەکـەم تێنەپـەڕی، هـەرچی کۆشكو تـەلارو میوانخانـەو چادرەکـان هـەبوو، هـەمووی پڕبوون لە شازادەو گەورەپیاوانو ناودارانو جەمەیان دەهات لە میوانو بانگکراوان.

لە دەشتەکەی ئەودیو شوورای شارەکەشدا چادری گـەورە گـەورە هـەڵدران بـۆ ئـەوەی جێگـای میوانە بانگکراوەکانی تر بێتەوە.

لەمبەرو ئەوبەری ڕێگای خۆراسانەوە بۆ بوخاری بە درێژی پێنج میل چادرمـان هـەڵداو لـەو شوێنەوە ڕێگاکەی تـاکو نـاو کۆشکەکەم مافوورمـان ڕاخستو بەسـەریدا تـاقی سـەرکەوتنو بـە هەموو جۆرە جوانییەك ڕازاندمانەوەو ئاڵای جۆراوجۆریشی لەسەر دەشەکایەوە.

شازادە سیفین سواری کەژاوە سپییە قەشەنگەکەی ببوو، بە ڕێو ڕەسمێکی زۆر جـوان. هـەزار سوارچاکی شۆخو شەنگ لەگەڵ کاروانی دیارییەکانیدا بوون. پاسـەوانی ئـەو دیارییانـەیان دەکـرد کە لەگەڵ خۆیدا بۆ جیهانگیری هێنابوو.

ئەو ماینەی بە دیاری بۆ جیهانگیری هێنابوو، لە پلەی دووەمدا بوو، لە چاو ئەو ماینەی وەختی خۆی شازادە شێرێزا بۆی هێنام، کاتێك لە بیابانەکەدا دەستمکرد بە سەر چادرەکانی شامالکدا.

چونکە ژنەکانی ئۆرغانج پەچەیان نەدەگرتەوەو دەمو ڕووخساری خۆیان دانەدەپۆشی، و شازادە سیفینیش سواری کەژاوەیەك ببوو، بە پەردەی جوانو گرانبەها داپۆشرابوو. ئەو خەڵکانەی لەمبەرو ئەوبەری شەقامو کۆڵانەکاندا ڕاوەستابوون شازادە سیفینیان نەبینی.

بەڵام ئەو دەستو پێوەندە جوانو شۆخو شەنگانەی پەچەپۆش نەبوون، تەماشاکەرانیان شادو دڵخۆش کرد، کە لە پێش هەیوانی ماڵەکانو سەربانەکانی سەمەرقەندەوە تەماشایان دەکردو چەپڵەیان لێدەداو هەلھەلەی خۆشیان لێدەدا. کاتێك ئەو مەوکیبە قەشەنگە جوانو ڕازاوەیە ڕاوەستاو ئەو حوشترەی کەژاوەکەی شازادە سیفینی هەڵگرتبوو لە خوار ئەو پێپلیکانانەی دەچوو بۆ ناو کۆشکەکە ڕاوەستاو چۆکی داداو لەسەر زەوییەکە یخ بوو، سەربازەکانی سڵاویان لە منو جیهانگیر کردو هەشت کەس لە خزمەتکاران کەژاوەکەیان لەسەر حوشترەکە هەڵگرت. "کەژاوەکە تا ئەم کاتەش داپۆشرابوو" و یەکسەر بردیانە ناو کۆشکەکەوە.

چونکە نەدەبوو جیهانگیر بیبینێت، تاکو ڕێو ڕەسمی ئاینیو مارەکردنی بۆ نەکرێت.

ئیتر دواتی ئەوە هەرچی دیارییەکانی شازادە سیفین بوو برانە ناو ئەو چادرانەوە کە لەناو باخی کۆشکەکەدا بۆ ئەو مەبەستە هەڵدرابوون.

هەروەك دابونەریتو پێویستی سەرشانم بوو. منیش چووم بۆ ژوورەکەی خۆم بۆ ئەوەی بە تەنها پێشوازی بووکەکەم بکەم.

ئەم دابونەریتەش مێژووەکەی دەگەڕایەوە بۆ زەمانی کۆن. ئەویش ئەوە بوو باوك "لەبەرئەوەی زۆر شارەزاو ڤاڵبوو بە کاروباری ژنانە" لەگەڵ بووکە نوێیەکەیدا بە تەنها دادەنیشتن بۆئەوەی جوان تەماشای بکاتو تێبڕوانێت تاکو بزانێت ئایا شایانی کوڕەکەیەتی یان.. نا..

منیش بەو جۆرە بە تەنها لەسەر دۆشەکێکی نەرمونۆڵو لە نێوان دوو سەرینی گەورەی پەڕی نەرمونۆڵدا کە لە قوماشێکی نایابی چنراو دروستکرابوو. لەسەر فەرشێکی جوانو دانسقەدا دانرابوو، دانیشتم.

نۆکەرێك هاتە ژوورەوە شازادە سیفینی لەگەڵ خۆیدا بۆ ژوورەکەم هێناو پاشان نۆکەرەکە چووە دەرەوەو لە دوای خۆیەوە دەرگاکەی داخست.

شازاده سیفین کراسێکی ئاوریشمی سپیو سەرکراسێکی سەوزی بە دەنکە مرواری چنراو لەبەردابوو. هاتو لەبەردەممدا ڕاوەستا.

هەرکە بە جوانی سەرنجم داو بە وردی تێمڕوانیو تەماشایم کرد. دڵنیابوومو ڕاستی قسەوباسکردنەکەی کەیخەسرەوم بۆ دەرکەوت.

هەردوو قۆڵی ڕووت بوونو گەردنێکی سپی جوانی بەرزی پێوە بوو. قژە زەردەکانی بەسەر شانو ملو پشتیدا پەخش ببۆوەو چین چین هاتبووە خوارێ، وەك زێڕ لەبەر تیشکی هەتاودا دەبریسکایەوە. ببووە چوارچێوەیەکی زێڕینی زۆر جوانو نایاب بۆ ڕووە گەشو جوانە بریسکاوەکەی.

گەرچی چاوەکانیشی وەك عەباکەی سەرشانی سەوز بوون، بەڵام ئەو دووچاوە وەك زێڕێکی درەوشاوە دەبریسکایەوە.

شازادە سیفین هیچ جۆرە کڕنووشو چەمانەوەیەکی بۆ نەکردم. هەتا بە یەك وشەش سڵاوی لێنەکردم.

بەڵام من ڕووم تێکردو زۆر هەوڵم دا قسەکانم ئاساییو هێمنو جوان بن، پێم وت:

-کیژەکەم بەخێرهاتنت دەکەم بۆ سەمەرقەندو پێخۆشحاڵم بە هاتنتو شای سەمەرقەند شادومانە بە تێکەڵبوونو هاوبەشیکردنی شازادەی خوارەزم بۆ ناو خێزانی شاهانەی.

بە دەنگێکی سووكو نووساوەوە وەڵامی دامەوە، نەشمزانی ئایا دەنگەکەی خۆی ئاساییە یان هۆی تووڕەبوونو شڵەژانییەتی.

وتی: گەورەم.. ئەمە شەرەفێکی گەورەیە بۆ من کە بە شێوەی بووكو هاوسەری کوڕەکەت هاتوومەتە لات. من ئەوەم پێناخۆشە کە باوکم نەماوەو منت پێشکەش بکات.

سەرم داخستو وەك دۆستێك پێم وت:

-کچم منیش دڵگرانمو زۆرم پێناخۆش بوو، لەم دواییەدا باوکت مرد، چەند حەزم دەکردو بە ئاواتەوە بووم باوکت بمایەو لە ژیاندا بوایەو بە ڕەزامەندیو دڵنەرمیو بەزەییو دڵسۆزییە بەناوبانگەکەیەوە تۆی پێشکەش بکردایە..

بەڵام ئەمیرە سیفین هیچ قسەیەکی نەکرد. چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسك وەك بەردێکی گرانبەها وابوو کاتێك لە نیوەڕواندا تیشکی خۆری لێبداتو خوناوی لەسەر پەیدا بکات.. و بریسکێتەوە..

هەستامو دووبارە کەوتمەوە قسەکردن لەگەڵیداو بە مەدحو سەناوە پێم وت:

-کچم من زۆر ئیرەیی بە جیهانگیری کورم دەبەم..!!

لەسەرخۆو بە هێمنییەوە دەستمکرد بە پیاهەڵدان و باسکردنی. ئەوەندە جوان بوو جوانییەکەی دڵ و سەرنجی ڕادەکێشا.

زۆر حەزمکرد دەست بدەم لە گیانییەوە بۆئەوەی خۆم لە ڕاستی و بێخەشی جوانییەکەی دڵنیابم و پێم وت:

-وەرە پێشەوە بۆ لام با بتبینم لە چی دەچیت..

وتی: مەبەستت ئەوەیە خۆم ڕووت بکەمەوەو جلەکانم وەك بەربەرییەکان دابکەنم و لەشی خۆمت پیشان بدەم..؟!

وتم: نەخێر.. ئەی ڕێوییە فێڵبازە چەپەڵەکە..!!

منیش هەر دەبوو دەستم لێبدایە، لەبەرئەوە بە شێوەی توورەبوونەوە بە لەپی دەستم کێشام بە ڕوویدا..

ئەمیرەش دەستێکی بەرزکردەوە، بەڵام نەك بۆئەوەی لێم بداتەوە.. بەڵکو بۆئەوەی مەچەکم بگرێت و دەستم بە هێواشی بخاتە سەر ئەو ڕوومەتەی زللەکەم لێدابوو!!

لە چاوەکانیدا فرمێسکێکی سەیرو جوانم بینی. ئەو فرمێسکە تێکەڵ بوو لە دڵنەرمی و ئازار. فرمێسکی وا جوان و گەشاوەم تا ئێستا لە چاوی هیچ ژنێکدا بەو شێوەیە نەدیبوو. پاشان مەچەکی بەردام و هەردوو لەپی دەستی گرتم و پەنجەکانمی هێنا بەسەر کوڵمە ناسك و دەمە بچکۆلانەکەی و لێوە تەنکە ناسکەکانیدا.

بە لێوە ناسکەکانی لە نزیك ئەو مستیلە عەقیقەوە کە وەختی خۆی ئیمام زەینەدین پێشکەشی کردبووم، پەنجەی ناوەڕاستی ماچ کردم.

پاشان لە بەردەممدا دانەوییەوەو کڕنووشی بۆ بردم، بۆئەوەی سڵاوی ڕێزلێنانم لێبکات. ئەو سەلامەی کە دەبوو یەکەمجار هاتە ژوورەکەمەوە بیکردایە. پاشان بە ڕێزو گەورەیی و ترسەوە، بە دەنگێکی نووساوەوە ڕووی تێکردم و وتی:

-باوکی بەڕێزم من دەبم بە کچێکی باش و دەشبم بە کچێکی بەسوودو باش بۆ گەلەکەی خۆم.. ئینجا دوای ئەوە، هێشتا دەستی بەرنەدابووم، بە جووڵانێکی سەیرو سەرسوڕمێن هەستایە سەرپێ و ددانە تیژەکانی لە پەنجەم چەقاندو نینۆکە درێژەکانیشی توند لە قۆڵم چەقاندو خوێنی پێدا هێنایە خوارەوە.

پاشان هەردوو دەستمی فرێداو گەڕایەوە دواوە. سەرلەنوێ تیشکێکی ئاگراوی لە چاوەکانیدا بریسکایەوە.

خێرا دەستم بەرزکردەوە بۆ ناودەمەو پەنجەم خستە دەمەوەو دەستمکرد بە مژینی ئەو خوێنەی لە پەنجەم دەتکا.

گەرچی ئەو هەڵچوونەی سیفین دامرکایەوەو نەما.. ئەو واتە سیفین هیچ نیشانەیەکی ترس و لەرز لە ڕووخسارو دەموچاوەکانیدا بەدی نەدەکرا. بەڵام بێ ئەوەی تووڕە ببم، تەماشام کردو بە پێکەنینەوە پێم وت:

-تۆ پاشەڕۆژ دەبیت بە ژنێکی زۆر چاك و بەسوود. منیش پاشان دەبم بە باوکێکی باش و میهرەبان بۆت.!! لە پاشەڕۆژیشدا پێکەوە بە خۆشی و تەبایی دەژین. منیش شادومانم بە هاتنت بۆ ناو خانەوادە شاهانەکەم.

ئیتر دوای ئەوە ئیزنم داو.. ڕۆیشت، تا چووەوە ناو هۆڵەکە، بۆ ناو کارەکەرو دەست و پێوەندەکانی تەماشام دەکردو سەرنجیم دەدا..

تێگەیشتم و بۆم ئاشکرا بوو، پاشەڕۆژ کوڕێکی چاونەترسی ئازاو بەجەرگی دەبێت. ئەو کوڕە ژیانی پیرێتی و دەوڵەتەکەم دەپارێزێت..

لە ماوەی ئەو ڕۆژانەداو لەو ئاهەنگەدا میوانداری گەورەو خواردنی نایابی تێدا دەخوراو ئاهەنگی قەشەنگی تێدا دەگێڕدرا.

بەردەوام بیرەوەری مارەکردن و هێنانی ئەلجایم دەکردەوە. ئەو بیرەوەرییانە تێکەڵ بەو ئاهەنگ و بەزمە دەبوو، کە لەسەر شەرەفی کوڕەکەم دەکرا. هەتا وام لێهاتبوو نەمدەتوانی ئەندێشە لە ڕاستی جیابکەمەوە.

هەموو ڕۆژێك یەکێك لە ژووری گەنجینەکانم چی تێدا بوایە لە کەلوپەلی گرانبەهاو دیاری نایاب و پڕبایەخ و ماڵ و سامانم بەسەر شازادەو سەردارەکانمدا دابەش دەکردو هیچم تێدا نەدەهێشتەوە.

بۆ خۆشی و ڕابواردنی خەڵکی هەموو ڕۆژێك کەیخەسرەوم بە ڕووتی، "کەیخەسرەو ئەو کەسە بوو پێش ئەوەی بگەینە شاری -خیفا- خۆی دزییەوەو هەڵات" سواری گەرێکم دەکردو بەرووپشت بە پشتی کەرەکەوە دەمبەست و کلکی کەرەکەم دەدایە دەست و فەرمانم بە چەند سەربازێك دەدا، ئەم کەرە بەناو شەقامەکانی شاردا بگێڕن با خەڵکی ببینن.

نیتر کە هەموو کەسێکی شاری سەمەرقەند زانییان کەیخەسرەو کێیەو چی کردووە. هێنام هەردوو دەستیم بە گوریسێکی سەدمەترییەوە بەست بە هێسترێکی بەهێزەوەو هەردوو قاچیشیم بەست بە هێسترێکی ترەوەو فەرمانم دا هێسترەکان هەریەکەیان بە لایەکی جیاوازدا زۆر بە خێرایی لێخوڕنو بەم شێوەیە لێکم هەڵوەشاند.

ئەمە لە پێش چاوی خەڵکەکەدا خۆشیو ڕابواردنو گاڵتەجاڕییەکی زۆر گەورەو خۆش بوو. بەڵام من لەم کارەمدا مەبەستی ڕاستیم ئاگادارکردنەوەیەکی ڕوونو ئاشکرا بوو، بۆ ئەوانەی دەیانەوێت یان بیر لەوە دەکەنەوە پاشەڕۆژ لەناو لەشکرەکەمەوە هەڵبێنو ڕووبکەنە لایەکی تر.

هەروەها لەناو هۆڵو ژوورەکاندا خوان دادەنراو نان دەخوراو هەندێ یاریو گەمەی سووک دەکرا.

ئەم گەمەو یارییانە هەرگیز نەدەوەستانو هەر بە بەردەوامی بۆ خۆشی میوانەکان دەکرا. هەموو شەوێکیش پۆلێك کیژی جوانو نازدار بەناو میوانەکاندا دەهاتنو دەچوون. دیاریو گەوهەریان بەسەردا دابەش دەکردنو لە ڕوویاندا پێدەکەنینو بەخێرهاتنو قسەی خۆشو شادییان بۆ دەکردن.

ئاهەنگو شاییو میوانداریو نانخواردن بێوچان بەردەوام بوو.

دڵەخورپێو خۆشیو شادی منیش هەتا دەهات زیادی دەکرد. تاکو ئەو کاتە هاتو جیهانگیر شازادە سیفینی لەسەر پشتی ئەسپە سپیەکەی داگرتو لەگەڵ خۆیدا بردی بۆ ناو پەردەی زاوایی کە لەناو ئەو چادرە دوورەی قەراغ باخەکەوە بۆی ئامادە کرابوو..

ئەوکاتە من سیفینم وەك ئەلجای هاتە پێشچاو.. بەڵام خۆشم.. کاتێك گەڕامەوە بۆ شوێنی نووستنمو هەرکە گەیشتمە جێ.. خێرا ناردم بە شوێن نۆبجادا.. کە ئالی سۆنم خستبووە ژێر ڕکێفو چاودێری ئەوەوە. هەرکە نۆبجا دەرکەوت بە خۆشیو ئارەزووەوە لێم پرسی؛

وتم: نۆبجا کوا.. خاتوو ئالی سۆن..؟

وتی: گەورەم ژوورێکی تایبەتیم داوەتێ.. گەورەم بە ڕاستی وا دیارە ئالی سۆن وەك هەموو ژنێکی تر نەبێت..!!

وتم: نۆبجا خێرا بمبە بۆ لای..

وتی: ئێستا..؟ ئەو هێشتا خۆی ئامادە نەکردووە.. ئەمیرەکەم خۆشیو ئارەزووی خۆت تێك مەدە..

وتم: نۆبجا.. بمبە بۆ لای..!!

چونکه مەیم زۆر خواردبۆوە، سەرم ڕاوەشاند بۆئەوەی بێمەوە سەر خۆم‌و مەستی بەرم بدات.

دەمویست مێشکم ساف بێت کاتێك بە تەنها لەگەڵ ئالی سۆندا دادەنیشم. ئۆبجا بردمی بۆ ژوورێکی زۆر دوور لە ژووری کەیف‌و ڕابواردنەوە.

ئینجا ئاگاداری کردمەوە، مێشکم ساف بکەم‌و بێدەنگ‌و لەسەرخۆ بم‌و لەسەرخۆشی‌و مەستی بێمەوە سەرخۆم.

پاشان دەرگاکەی سووك بە هێواشی کردەوە..

ئالی سۆن لەسەر جێگایەکی نەرم‌و شل ڕاکشابوو.. خەوی لێکەوتبوو قژە زەردە ئاڵتوونییەکەی‌و ڕووخسارە سپییە ناسکەکەی لەبەر تیشکی ئەو تەنها مۆمەدا کە لە پشت سەرییەوە دەسووتا وەك تیشکی خۆر دەبریسکایەوە.

هەر لەوکاتەدا ئۆبجا چرپاندی بە گوێمداو وتی:

-گەورەم، تکات لێدەکەم ئێستا.. نا..

منیش کەوتمە دوودڵییەوەو تەماشایەکی ئەو کچە پاکیزە نووستووەم کردو تەماشای ژوورەکەیم کرد وەك ژووری ئافرەتەکانی تر بە شتی جوان‌و نایاب نەڕازێنرابۆوە.

سەرنجم دا ژوورەکە پڕبوو لە تەنها شتێك، ئەویش پەڕە کاغەز بوو.. ئاوڕم دایەوەو تەماشای چاوەکانی ئۆبجام کرد. ئەویش زۆر بە وردی سەرنجی چاوەکانی منی دەدا. هیچ ئەوەندەی نەخایاند پێی وتم:

-من پێم وتووە هەرچییەکی دەوێت ئامادەین بۆی پەیدابکەین‌و بۆی بهێنین.. کاغەز لای ئەو لە هەموو شتێك زیاتر بایەخدارترە.. ئالی سۆن بە منی دەوت کاغەز لە وڵاتی ئێمەدا شتێکی زۆر کەم‌و دانسقەیە.

وتم: باشە، بەڵام ئەم کاغەزانەی بۆچییە..؟

وتی: بۆ کاری تایبەتی خۆی بەکاری دێنێت..!!

وتم: ئەوە بە ڕاستتە؟.. بۆچی..؟

وتی: باشە.. تەماشای ئەمە بکە..

ئۆبجا کۆمەڵێکی بچووك پەڕە کاغەزی دامێ.. ڕیزەکانی بە نووسینێکی سەیر لەسەر نووسرابوو.

ئەو پەڕە کاغەزانە بۆنی عەترە تیژە بۆنخۆشەکەی ئالی سۆنی لێدەهات.

پاشان نۆبجا بەرێزگرتنێکی زۆر زۆرەوە پێی وتم:

-ئەمیرەکەم، ئالی سۆن خەریکە زمانەکەی تۆ زۆر بە خێراییەکی سەیرەوە فێردەبێت. هەروەها ئەو بیرەوەرییانەی وڵاتەکەشی کە دێتەوە یادی دەیانووسێتەوەو هەرچی وشەیەکی زمانەکەی خۆشی هەیە دەیانووسێتەوە بۆئەوەی جێگاو نیشتمانەکەی خۆی بیرنەچێتەوە. کۆمەڵە کاغەزەکەی بە دەستمەوە بوو دامناو دووبارە تەماشای کچە نووستووەکەم کردەوە..

نۆبجا دووبارە بۆئەوەی سەرنجم ڕاکێشێت و دوورم بخاتەوە لە کچەکە.. ڕوویتێکردم و بە خێرایی وتی:

-گەورەم هەروەها دەزانیت وێنەش بکێشێت..!! تەماشای ئەمە بکە کۆمەڵێگ پەڕە کاغەزی گەورەی دا بە دەستمەوە.

پاش ئەوەی نۆبجا هەناسەیەکی هەڵکێشا لەسەر قسەکانی ڕۆیشت و وتی: ئالی سۆن هەرچی وێنەی ماڵ و خانوویەك لە شارۆچکەکەیدا هەیە، هەمووی وێنەکێشاوە بۆئەوەی شێوەی شارەکەی خۆی لە یاد نەچێتەوە. هەروەها وێنەی ئەو شەقامەشی کێشاوە کە دەچێت بۆ کۆشکەکەی خۆی.. تەماشاکە.. ئا ئەوەتا.. بۆ ئەوەی هەرکاتێك یادی نیشتمان و شارۆچکەکەی خۆی کەوتەوە، پێیدا بڕوات بۆ کۆشکەکەی خۆی..

وێنەکان زۆر جوان و دیارو ئاشکرا بوون. وێنەکان لە ماڵ و خانووی بچووك بچووکی سەیر پێکهاتبوون و سەربانەکانیان قووچەکی بوون.

نۆبجا نەیهێشت تەماشای هەموو وێنەکان بکەم. لێی سەندم و پێی وتم: شازادەی گەورەو بەرێزم، بە میهرەبانی و دڵنەرمی لەگەڵیدا رەفتار بکە.. هەرکاتێك سۆزو خۆشەویستی نیشتمانەکەی نەماو بیری چۆوە.. ئەوکاتە ئیتر تۆی خۆشدەوێت و پاداشتی هەموو ئەو پارانەت دەداتەوە کە لە پێناویدا خەرجت کردووە.. بەڵام ئێستا، شازادەی سەرومەرم، وەرە لەگەڵ مندا با پێکەوە بڕۆین.

بەڵام چاوەکانم خەریکبوو، ئەو لەش و لارە سپییە جوانەی هەڵلووشێت. کە لەسەر جێگاکەی ڕاکشابوو..

گەرچی هیچ شوێنێکیشی دەرنەکەوتبوو، جگە لە شانە سپییە مەرمەڕییەکانی و یەکێك لە مەمکە خڕوپڕەکانی نەبێت. بەڵام لە کراسە ئاوریشمە تەنکەکەیەوە هەموو لەش و لاریم دەبینی. لە کاتێکدا سەرخۆش و مەستی جوانییە ئەفسووناوییەکەی ئەو کچە پاکیزە نووستووە

بووم. بەو مەستییەوە لەگەڵ نۆبجادا چووم بۆ ناو جێگای نووستنە گەورەکەی چونکە لە لەش و لاری نۆبجادا خۆشی و ئارەزووی هەموو ژنێکی تێدا توابۆوە هەتا خۆشی ئالی سۆنیش.

چونکە هەرکە لەگەڵ نۆبجادا دەبووم.. هەرچی ژنی جیهان هەیە، هەمووم بیرەچۆوە، جگە لە نۆبجا خۆی نەبێت..!!

* * *

## گورەزاو دروستکردنی قەڵایەك

هەر لەوکاتەی ئەو ئاهەنگە قەشەنگ و پرشکۆیە بۆ شایی و ژنهێنانەکەی جیهانگیر سازدەکرا. من جیهانگیرم کرد بە سەرکردەی هەتاهەتایی تیپی شین. بۆئەو مەبەستەش فەرمانی تایبەتیم بۆ دەرکرد.

ژمارەیەکی زۆریش جەنگاوەری نوێم خستە ناو تیپەکەیەوە بۆئەوەی تیپەکەی زۆر بکەم و بیکەم بە لیوایەکی تەواو.

پاشان فەرمانم بۆ دەرکردو بە ئەمیری میرنشینی شەهری سیبز جێ و شوێنی پێشینانی خانەوادەو بنەماڵە دێرینەکەمان.

هەروەها فەوجێکی تەواویشم سەرباز دایە، بۆئەوەی لەوێدا بنکەی سەربازی دابنێن و تیایدا نیشتەجێ ببن.

لە هەمان کاتیشدا بە خێرایی دەستمکرد بە چاکردنەوەو دروستکردنەوەی ماڵ و خانووە وێرانەکانی شاری ئۆرغانج بەو هیوایەی لەگەڵ تەواوبوونیدا، جیهانگیریش بە تەواوی شارەزایی تەواو پەیدابکات لە کاروباری بەڕێوەبردنی وڵات و فەرمانڕەواییدا.

تاکو جڵەوی فەرمانڕەوایی ئەوێی بدەمە دەست و بیکەم بە سەردارو فەرمانڕەوای میرنشینی ناوچەی ئۆرغانج و هەموو دەوروبەری.

بەڵام دەربارەی گورج و گۆڵی و کاروباری خۆم. لە ماوەی وەرزی زستاندا لە شاری سەمەرقەند دانیشتم و دەستمکرد بە بەهێزکردنی ئیمپراتۆرییەتەکەم. بۆئەوەی ئەو ناتەواوی و کەموکورییانەی لەناو هێزەکەمدا هەیە نەیهێڵم و زاڵبم بەسەریدا. پێش ئەوەی وەرزی بەهار بێت و کێشەی هەڵمەت و شەڕوشۆڕ یەخەم بگرێت. لە هیراتیشەوە هەواڵم پێگەیشت کە نوێنەرەکانم لەوێدا بە باشی هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا کراوە.

لەسەر ئامۆژگاری‌و ڕێنماییەکانی نۆبجا لەگەڵ ئالی سۆندا وا بە باشی دەجووڵامەوەو وەك شازادەیەکی میوان ڕەفتارم لەگەڵدا دەکرد. وە هەرچی ترس‌و ناخۆشییەك لە دڵیدا بوو نەمهێشت.

لە هەمان کاتیشدا بۆم دەرکەوت ئەم کچە وا تێگەیشتبوو من هەردەم ڕێزی کچێنی دەگرم‌و دەستی بۆ نابەم‌و کچێنی دەپارێزم‌و دەستکاری ناکەم.

لەسەر ئەوەشەوە، ئەو کردەوەو هەڵسوکەوتانەی منی بە مافێکی ڕەوای خۆی دەزانی. شك‌و گومانیشم لەوە نەبوو، ئەو زۆرباش دەیزانی مانای کڕینی ئەو بۆ من چیە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دۆستایەتی‌و هۆگری لەگەڵ مندا وردە وردە زیادی دەکردو وا بە خەیاڵیدا دەهات لەگەڵ ئەو نرخە زۆرو گرانەدا کە لە پێناویدا داومە، من لە پاشەڕۆژدا ئەو بیروباوەڕە هیچ‌و پووچەی ئەو‌و بیروباوەڕی میللەتەکەی قبووڵ دەکەم کە دەربارەی ژن‌و کەنیزەکی هەیان بوو.

ئالی سۆن بە یارمەتی نۆبجا توانی زۆر بە خێرایی پێشکەوێت‌و زمانەکەی من فێرببێت‌و لە قسەکانم دەگەیشت‌و هەوڵی دەدا منیش لە قسەکانی ئەو بگەم. بەڵام ئەوەی من توانیم زیاتر لە قسەکانی بگەم ئەوە بوو ئالی سۆن زۆر زۆر بیریادی نیشتمانەکەی دەکردەوەو وایدەزانی پیاوێکی بەخشندەی وەکو من، "چونکە منیش هەرچی پێویست بوایە خێرا بۆم ئامادە دەکرد" لە دوایدا هەر قایل دەبێت کە بینێرمەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی.

منیش نەمدەویست ڕووی بشکێنم‌و هیوا بڕاوی بکەم. چونکە منیش بیرم لەوە دەکردەوە هەرکاتێك فەرەنسییەکان بشکێنم وڵاتە خۆشەویستەکەی داگیربکەم، ئەو وڵاتەی ئەو بیری دەکات. ئەوکاتە قایل دەبم‌و دەینێرمەوە بۆ وڵاتە خۆشەویستەکەی. بیریشم لەوە کردبۆوە، سوود لە زانیاری ئالی سۆن وەرگرم‌و بە هۆی ئەوەوە ڕێگایەك بدۆزمەوە بۆ شکاندنی میللەتەکەی‌و داگیرکردنی وڵاتەکەی.

وە ڕەنگە تا ئەوکاتەش وا پێویست بکات‌و بجووڵێم‌و هەڵمەت بەرمە سەر فەرەنگەکان‌و تێکیان بشکێنم‌و سەرنجی ئەو زیاتر بۆ لای خۆم ڕابکێشم‌و وایلێبکەم منی زیاتر خۆشبوێت.

نەمدەویست‌و نیازیشم نەبوون بۆنەو مەبەستەی بەم کچەم هەبوو زۆرتر درێژەی پێبدەم.

بێگومان هەرکاتێك بمویستایە دەمتوانی بە زۆر چیم بویستایە لەو کچەی بکەم، بەڵام من ڕێزی بیروباوەڕەکانی نۆبجام دەگرت.

چونکە ئەوەی بە زۆر لە ئالی سۆنم دەستکەوت، نرخی ئەو پەنجا هەزار دینارە نەدەبوو کە لە پێناویدا داومە.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو فرۆفێڵو نەرمو نیانییەی لەگەڵ ئالی سۆندا دەمکرد، لە ژیانمدا بەو شێوەیە ڕەحمو بەزەیی‌و دڵنەواییم لەگەڵ هیچ ژنێکی تردا نەکردبوو. ئەم کردەوەو بەرهەڵسەتیکردنەم، لە ژیانمدا هەلێکی زێڕینی نوێی بۆ من خوڵقاند. ئا بەو جۆرە چووم بۆ ناو ئەو جێگایەی دابووم بە ئالی سۆن.

بینیم هەروەك کردبووی بە پیشە، سەرقاڵە بە کاغەزو نووسین‌و وێنەکردنەوە. هەرکە چاوی بە من کەوت، خێرا بانگی کردمە ژوورەوەو بە ڕووخۆشییەوە وتی:

-فەرموو شازادەکەم وەرە ژوورەوە.

وتم: زۆر سوپاست دەکەم.. بەڵام ئەمڕۆ چی دەکەیت..؟ دەنووسیت وێنەدەکێشیت.. چی دەکەیت..؟

وەڵامی دامەوە: ئەمیرەکەم وێنەدەکێشم..

وتم: .. باش دەزانیت وێنە بکێشیت..؟

وەڵامی دامەوە: بەڵێ شازادەی گەورەم.. وەرە تەماشاکە، دەستی گرتم، بردمی بۆ لای ئەو مێزە بچووکەوە کە بۆم دروستکردبوو. وێنەی شەقامێکی درێژی پیشاندام.

لە ڕاستیدا وێنەکەی زۆرباش نەبوو. ئالی سۆن هەستی کرد وێنەکەیم لا جوان نییە، و هیچ سەرنجی ڕانەکێشام. خێرا وتی:

-من دەتوانم وێنەی هەموو خانوویەك بە جوانی دروست بکەم.

وتم: هەرجۆرە خانوویەك بێت دروستی دەکەیت..؟

وتی: بەڵێ.. هەر جۆرە خانوویەك بێت دەتوانم دروستی بکەم. بەڵام ناتوانم شەقامێك دروستبکەم کە چەند ماڵ‌و خانوویەکی لەسەر بێت.

حەزیش دەکەم شەقامێك دروستبکەم، لە نێوان چەند خانوویەکدا بێت.

وتم: تۆ دووچاوی باشت هەیەو سەرنجی باشیشی پێدەدەیت. تۆ دەتوانیت زۆر بە جوانی هەر خانوویەك بتەوێت وێنەی بکێشیت.

بەڵام ئایا دەزانیت ئەم خانووانە چۆن دروست دەکرێت..؟

وەڵامی دایەوە: بەڵێ.. کاتێك من منداڵ بووم‌و بچووك بووم زۆر جار سەرنجی..

-دارتاش‌و بەناکانت دەدا.. وانییە؟

-بەڵێ.. من سەرنجی دارتاش‌و بەناکانم دەدا کە لە گوندەکەماندا خانوویان دروست دەکردو لەو ماڵانەشدا زۆر یاریشم کردووە.

-ئەگەر تۆ بینیت وەستاکان وەك ئەو خانووانە دروست دەکەن، دەتوانیت ناتەواوی و کەموکورییەکانیان پیشان بدەیت..؟

-شازادەی گەورەم.. من لەو باوەڕەدام.. بتوانم.

کۆمەڵێك لە وێنەکانیم هەڵگرت و لەسەر ئەو کورسییە دارەدا کە لە ژوورەکەدا لە جیاتی کورسییەکی نەرم و شل دانرابوو لە تەنیشتییەوە دانیشتم.

ئەویش تۆزێك لە من دوورترەوە لە تەنیشتمەوە دانیشت. بەڵام بۆنی عەترە تیژەکەی کونەلووتی پڕکردم.

ئەوەش زیاتر بۆئەوە بوو ئەو بەرهەڵستیکردنەی نەهێڵم و لەگەڵ خۆمدا بیبەم بۆ ناو جێگای نووستنی بە سەرنجدان و تێڕوانینەوە پێم وت:

-گریمان پارچە زەوییەکی وەك زەوی گوندەکەت..

تۆزێك ڕاوەستام بۆئەوەی ناوی گوندەکەی خۆیم پێبڵێت.. هەرکە زانی دوودڵ بووم لە قسەکانمداو لەسەری وەستام خێرا فریام کەوت و وتی: زۆرچاکە گوندەکەی من ناوی دیفونە.

ئیتر منیش لەسەر قسەکانم ڕۆیشتم و وتم:

-گریمان پارچە زەوییەکمان ئامادە کرد هێندەی ئەو زەوییەی شارۆچکەی دیفون و هەزار وەستامان خستە سەرو لە ماوەی مانگێکدا توانییان ماڵ و شەقامێکی وەك ئەمە دروست بکەن.. ئایا تۆ دەتوانیت سەرپەرشتی کارەکەیان بکەیت..؟!!

بەڵام ئالی سۆن چرکەی لە دەم نەهاتەدەرێ..

ئینجا بە ڕاستی لێمپرسی و وتم:

-ئایا شتی وات دەوێت و حەزی پێدەکەیت..؟!!

وەڵامی دامەوە: ئایا شتی وا دەکەیت؟!! تۆ ئەوەندە دڵنەرمیت؟

وتم: بۆچی.. نا..؟ تۆ لەو باوەڕەدایت.. دڵی ڕەقەکان هەندێ جار دڵیان نەرم نەبێت و دڵ و دەروونیان باش نەبێت و بەزەیی نەچێتە ناو دڵیانەوە..؟!!

وتی: گەورەم زۆرچاکە.. بەڵام ئایا بە ڕاستی دەتەوێت شارۆچکەیەکی وەك دیفون دروستبکەیت..؟ ئایا ئەمەت.. بە ڕاستە..؟!!

وتم: بێگومان من بە ڕاستی دەمەوێت ئەم کارە بکەم.. هانەهانەم داو وام لێکرد لەسەر قسەکانی بەردەوام بێت.. و باسی وێنەکانی تریم بۆ بکات.

-ئالی سۆن بە پەرۆشـەوە باسـی دیفونـی دەکـرد، بـە تـەواوی خـۆی لـەبیرچووبۆوە.. منیش لێ، نزیك کەوتمەوەو ئاگام لە هەموو هەڵسوکەوتو دەست جووڵانێکی بوو. دەستی دەدا لـە قۆڵمـەوەو ئەژنۆی پەر ئەژنۆم دەکەوتو ئەو بۆنی عەترو میسکە خۆشەی لە قژییـەوە دەهـات کونـەلووتی پڕکردبووم.

هەرکە هەستمکرد من گەیشتوومەتە پلەیەكو لەوە زیاتر نـاتوانم بەسـەر هەسـتو مێشکمدا زاڵ ببم.. لە شوێنەکەی خۆم هەستام. پاش ئەوەی هەستامە سەرپێ پێم وت:

-ئالی سۆن سبەینێ ئەو شوێنە دەستنیشان دەکەین کە پرۆژەکەی تیـادا جێبـەجێ دەکـەین، و داوا لە ئەندازیارە شارەزاکانیش دەکەم بە پێی وێنەو نەخشەکانی تۆ کارەکە جێبەجێ بکەن.!!

وتی: بەڵام بیرت ناچێت..؟ ئایا بە ڕاستی دەتەوێت سبەینێ ئەم کارە بکەیت؟

وەڵامم دایەوە:

-نەخێر.. بیرم ناچێت..

وتی: باشە.. گەورەم شەوێکی شاد..

پاشان ئالی سۆن وەك کەنیزەکێك دەستی ماچ کردم.

منیـش جێگـا سـاردو سـڕەکەیم جێهێشـتو چـووم بـۆ جێگـا گـەرمو گوڕەکـانی ژنو کەنیزەکەکانی ترم.. ئەو جێگا نووستنانەی سەرڕێژ بـوو لـە خۆشـیو رابواردنو بـۆنو بەرامـەی عەترو گوڵاو.

لـە ڕۆژی دواییـدا فـەرمانم دا دوو ئەسـپم بـۆ زیـن بکـەنو بـۆم بێنـن بـۆ لای دەرگـای کۆشکەکەمەوە. ئەسپێکیانم نارد بۆ ئالی سۆنو ڕامگەیاند بیهێنن بۆ لام.

ئەوەندەی نەخایاند ئالی سۆن بە سواری ئەسپەکەیەوە هات بۆ لام.

بەو سوارییەوە دیمەنێکی زۆر جوانو قەشەنگی هەبوو. ئەو کراسە ڕەشەی لەبەریدا بوو لێی ببوو بە نەخشو جوانییەکی بێوێنەی پێبەخشیبوو. بەو کراسـە ڕەشـە تەسـکە بیانییـەوە زۆر بـە جوانـیو ڕێـكو پێکییـەوە سـواری ئەسـپەکەی ببـوو. بـە شـارەزاییو سـوارچاکییەوە لـە تەنیشتمەوە دەڕۆیشتو لە باخچەی کۆشکەکە پێکەوە هاتینەدەرەوە.

هەرکـە بینیـم وا بـە شارەزاییو سوارچاکییەوە سواری ئەسـپەکەی بـووە، پێشـیکەوتمو بـۆ شوێنی نمایشەکەو ئـاوزەنگیم لـە -ئـاك ڕۆکش- "واتـە ئەسـپە سـپییەکە"دا. ئـەویش بۆنـەوەی دوانەکەوێت گورج ئاوزەنگی لە ئەسپەکەی خۆیداو لە تەنیشتمەوە دەڕۆیشت.

سەرپۆشەکەی سەری کەوتە خوارێو قژە زەردە زێڕینییەکانی بەسەر شانو ملیدا پەخشو بڵاو بوونەوەو لەبەر تیشکی ئەو هەتاوی بەیانەدا دەبریسکایەوە. ئەو هەوا ساردەی زستانیش کە دەیدا لە کوڵمەکانی وەك چۆن یەکەمجار بینیم ئاوا وەك گوڵێکی ئاڵ سوورهەڵگەڕابوو. بەمەش زیاتر جوانو شۆخو شەنگترو سەرنجڕاکێشتری کردبوو.

ئیتر خێراو کتوپڕ لغاوی ئەسپەکەم ڕاکێشاو لە شوێنی خۆمدا ڕاوەستامو ئەویش خێرا لەبەر دەممەوە بە تیژی تێپەڕیو ئەویش گورج جڵەوی ئەسپەکەی خۆی ڕاکێشاو ڕاوەستا.

هەرگە قژە زەردەکانی پەخشو بڵاوبوونەوە، حەپەسام، لە ناوەڕاستی سەریدا تۆپەڵێکی سپیم بینی.. قژی پێوە نەبوو..

هەروەها سەریشم لە قریشکەی پێکەنینەکەی سووڕما، کاتێك ڕاوەستاو خەریکبوو لەسەر پشتی ئەسپەکەی بکەوێتەخوارەوە.

ئەمە یەکەمجاری بوو وەك دۆستێکی گونجاو لەگەڵمدا ئاوا شادو بەختیار بێت. بە دڵێکی شادو خۆشییەوە قسەی لەگەڵدا دەکردم. "تێگەیشتم تاکو ئێستا هیچ کاتێك لە شوێنەکەی خۆیدا نەهاتۆتە دەرەوە".

پێی وتم: ئێستا هەوا زۆر خۆشو فێنکە..

وتم: ئایا حەزدەکەیت هەموو کات هەوای پاكو فێنك هەڵمژیت؟

وەڵامی دامەوە وتی: بێگومان.. ئەمە کەڵکی زۆرە بۆ مرۆڤو تەندروستی مرۆڤ باش دەکات.

وتم: کەواتە پێویستە هەموو کاتێك پێکەوە سواری ئەسپەکانمان ببینو پێکەوە بۆ دەرودەشت بێین.

وتی: بەڵێ پێویستە ئێمە پێکەوە سواری ئەسپ ببینو بێینە دەرەوە. ئەمە یەکەمجاری بوو ئالی سۆن وشەی ئێمە بەکاربهێنێت.

پێم وت: بەڵام ئەم زەوییە لە زەوی دیفون ناچێت.. وا نییە..؟

وەڵامی دامەوە: بەڵێ.. لە دیفوندا گردۆڵکەیەکی بچووکی تێدایە.. لە قسەکانیدا نیشانەی خەمباریو بێتاقەتیو یادکردنەوەیەکی تێدابوو. منیش نەمویست هیوابڕاوو بێ نومێدی بکەم. لەبەرئەوە بۆ دڵنیاییکردنەوەی

وتم: وا بزانم شوێنێکی چاکتر شك دەبەمو ڕەنگە لە شوێنەکەی دیفون بچێت..

پێکەوە گەڕاینەوە بۆ نزیک شووراى باخەکەو چووینە سووچێکى شووراکەوە کە لە نزیکییەوە پارچە زەوییەکى تەختانى هەبوو، ڕاوەستاین. منیش حەزم دەکرد دیفون لە دوور کۆشکەکەى خۆمەوە دروست بکەم. هەرکە ئالى سۆن پارچە زەوییەکەى بینى لێم پرسى، وتم:

-ها بیروڕات دەربارەى ئەم پارچە زەوییە چۆنە..؟

وەڵامى دامەوە وتى:

-نازانم، ئێرە ماڵ و خانووى زۆر لێیە.. لە نزیک شارۆچکەکەى منیشەوە چیاى لێ نییە، جگە لە تەنها گردێکى بچووک نەبێت.

وتم: ئەم خانووانە دەتوانین بڕووخێنین و تێکیان بدەین. بەڵام ناتوانین ئەم چیایانە بڕووخێنین و تێکیان بدەین.

بەڵام دەتوانین بە دارو درەخت بیانشارینەوەو دایانبپۆشین.

وتى: بەڵێ دەتوانین بە دارو درەخت بیانشارینەوە. هەروەها لە دەورى قەڵاکەى باوکیشمدا بێستانێکیش هەبوو. منیش لە پەنجەرەى ژوورەکەمەوە تەنها درەختم دەبینى.

وتم: کەواتە شاخەکانى دەوروبەرى درەختى تێدا دەڕوێنین و درەخت ڕێزى دەکەین.. وانییە..؟

وتى: بەڵێ.. وایە..

بەناو پارچە زەوییەکەدا بست بە بست گەڕاین و تەماشامان کرد.

ئالى سۆن وتى: ئا لێرەدا قەڵاکە دروستدەکەین و شەقامى گوندەکەش لەوێوە دەستپێدەکەین.

بە دەست ئاماژەى بۆ لاى شووراى باخەکە کرد. منیش تێگەیشتم دەروازەى قەڵاکە لە کوێدایە. ئیتر هەستم بە دڵنیایى کرد. چونکە ئەو پلان و ڕەنگ ڕشتنەى لەگەڵ پلان و مەبەستەکەى مندا وەک یەک بوون.

وەڵامم دایەوە: زۆر چاکە.. کەواتە ئێستا با ئەندازیاران بانگ بکەین بۆ ڕەنگ ڕشتنى. ئینجا پێکەوە گەڕاینەوە بۆ ناو کۆشکەکە.

ژمارەیەکى زۆر وێنەکێش و ئەندازیارى شارەزاو بەناوبانگ لە شارى سەمەرقەندا هەبوون هەموویانم بانگ کردو کۆمکردنەوەو لەگەڵ ئەمانەدا دوو کەسى شارەزاو بەناوبانگى ترم خستنەپاڵ. ئەم دووانە هەموو شوێنێک و هەتا ئەستەمبوڵیش گەڕابوون. شارەزاییەکى زۆریان لە هونەرى بیناسازى فەڕەنگەکاندا هەبوو.

شارەزاترین وێنەکێشم نارد بۆ جێگاکەو داوام لێکردن نەخشەو وێنەکانی ئالی سۆن راستبکەنەوەو چاوی پێدا بخشێننەوە.

هەرکە ئەندازیارە بەناوبانگەکانی شاری بوخاری گەیشتن و هاتن بۆ لام. پێم راگەیاندن بۆ دروستکردنی خانووەکان لەگەڵ ئالی سۆندا پێکەوە راوێژ بکەن. پاش ئەوەی یەکێک لە ئەندازیارە شارەزاکان دوا نەخشەو دوا وێنەی ئەو وێنانەی بینی کە ئالی سۆن دروستی کردبوو. وە بە راسترین شێوەی دانابوو کە لەسەر ئەو شێوەیە خانووەکان دروستبکرێت. ئەو ئەندازیارە پێی وتم:

-شازادەی گەورەم، بۆ چۆنێتی دروستکردنی خانووەکان هیچ هیلاکیو ماندووبوونێکی ناوێت.. چونکە ئەم خاتوونە، خۆی چاوێکی تیژو سەرنجێکی زۆر وردی هەیە لە دروستکردنی دیکۆری پێشی خانووەکاندا.

ئێمە دەتوانین بەو شێوەیەی خۆی دەیەوێت پرۆژەی گوندەکەی بۆ رەنگ برێژین و دروستی بکەین. بێ ئەوەی ئێمە خۆمانی زۆر پێوە ماندوو بکەین.

وتم: من دەمەوێت خانووەکان بە تەواوی وەك خانووە ئەسڵییەکانی گوندەکە بن. بۆ ئەم مەبەستەش هەر شارەزاییەکت هەیە بەکاری بێنەو کەموکوڕی تێدا مەکە..

وتی: گەورەم، زۆرچاکە من شتێك لە هونەری بیناسازی دەزانم. بەلام بۆ زیاتر روونکردنەوە..

وتم: پرسیار لە ئالی سۆن خۆی بکە.. هەر ئێستا دەتوانیت بانگی بکەیت و راوێژی لەگەڵدا بکەیت. من دەمەوێت ئەو خۆی سەرپەرشتی هەموو شتێکی خانووەکان بکات و ئەندازەی ئەستووری دیوارەکان بپێوێت..

وتی: بەڵێ شازادەی گەورەم، چۆن دەفەرموویت وا دەکەین.

وتم: من دەمەوێت هەر هەموو خانوو ماڵەکان چۆنن بە تەواوی وەك خۆیان بە راستی دروستبکرێن، لەبەرئەوە چەند پارەت دەوێت بۆ دروستکردنی خانووەکان خەرجی بکەو چرووکی لە پارە خەرجکردندا مەکەو خانووەکان تێکمەدە..!!

ئیتر ئەو کابرا ئەندازیارەم ئیزن دا بچێتەوە بۆ ژوورەکەی خۆی بۆئەوەی دووبارە بەسەر وێنەو نەخشەکانی پرۆژەکەدا بچێتەوە.

لەو کاتەدا داودو خیتای لە لامانەوە راوەستابوون و گوێیان لە قسەکانمان گرتبوو. داود روویکردە خیتای و ددانی جیرکردەوە. پاشان روویکردە من و

وتی: گەورەم تۆ زۆر شت لە پێناوی ئەم کچەدا دەکەیت. دەتوانم بڵێم لە پێناویدا زۆر زیاتر لە شازادە ئەلجای یان شازادە شێرێزاشت زیاتر بۆ کردووە.

باشە دەچێتە عەقڵەوە ئەم کچە ئەوەندە زاڵ بێت بەسەر ئەمیری سەمەرقەندا.

خیتاییش لە سەر قسەکانی داودەوە وتی:

-شازادە تەیموور قەڵای بۆ دروست دەکات. ڕەنگە بیر لەوە بکاتەوە هەرکاتێك دوژمن هێرش بکەنە سەر شووراو کۆشکەکەی، ئەو لەناو ئەو قەڵایەدا خۆی حەشار بدات..!! چونکە لە وێنەکاندا دەردەکەوێت قەڵاکە زۆر گەورە بێت.

منیش سەرم ڕاوەشاندو وەڵامم دایەوەو وتم:

-ئا ئەوەیە مەبەستو ئامانجی من کە دەمەوێت تێبگەمو بزانم قەڵای فەرەنگەکان چۆنن و زۆریش حەزدەکەم قەڵاکە گەورە بێت. چونکە ئەگەر ڕێککەوت ڕۆژێ لە ڕۆژان بە لەشکرەکەمەوە هێرشم کردە سەر فەرەنگەکانو شەڕم لەگەڵدا کردن، من دەمەوێت پێش ئەوە بزانمو تێبگەم چی بەرهەڵستیم دەکاتو ئەو قەڵایە چۆنەو شووراو بورجو سەنگەرەکانی چەندن.!!

منو نالی سۆن زۆرکات پێکەوە دەبووینو سەرنجی نەخشەو شێوەی دروستکردنو پرۆژەکانمان دەدا.

ئەمە باشترین هەل بوو کە بە ئارەزووی خۆیو لەسەر خواستی خۆی پێکەوە بینو من لەگەڵیدا بمێنمەوە.

هەروەها پێکەوەش سەرپەرشتی دروستکردنی خانووەکانی دیفونمان دەکرد. ئەم کارکردنەش بەردەوامو بە یەك شێوە بە بەردەوامی کاری تێدا دەکراو لێی ڕانەوەستان، مەگەر هەندێ ڕۆژانی زستان نەبێت، ناوبەناو دەوەستانو کاریان تێدا نەدەکرد..

هەرکە ئەندازیارەکانو وەستای خانووەکان لە شارەزاییو زانینی نالی سۆن گەیشتن، ئیتر هەر هەموویان ڕێزیان دەگرتو هەر ناڕێکیو ناقۆڵاییەك ببوایەو ئەو بە باشی نەزانیایە، بە قسەیان دەکردو ڕاستیان دەکردەوە.

لە شوێنو جێگای پرۆژەکەدا چەندەها کاتژمێر بەبێ پاسەوانو یاوەر دەمایەوە. وەستاکان ئەمەیان بە مافی خۆی دەزانیو کەسیش دەمەدەمیان لەگەڵدا نەدەکردو پێشیان ناخۆش نەبوو.

زۆرجاریش لە سەمەرقەندا بە تەنها یان لەگەڵ مەیتەرێکدا یان لەگەڵ تەنها ئەفسەرێك لە ئەفسەرەکانمدا دەسووڕایەوە.

نیتر بەم شێوەیە تەنووره ڕەشەکەیو ڕووخسارە جوانەکەیو ئەسپە سپییەکەی لەبەرچاوی خەڵکیدا لە بازاڕو شەقامەکاندا بوون بە شتێکی ئاسایىو لەگەڵیدا ڕاهاتن. بەڵام کە قژە زەردە زێرینەکەی دەردەکەوتو خەڵکی بینیان ئەمە لە پێش چاوو دڵیاندا بوو بە شتێکی سەیروسەمەرە. منیش سەرم لەوە سوڕمابوو، ئەگەر وەرزی هاوین بێتو ئالی سۆن بەسەر ڕووتو ڕەنگە بە کراسێکی کورتی تەسکیشەوە بچێتە دەرێ، ئەی ئەوکاتە چی ڕوودەداتو خەڵکی چی دەڵێن.؟!!

پێش ئەوەی بەفری چیاکان دەست بە تواندنەوە بکات. سەیفەدینو جاکۆو مەنغالی بۆغا لە هیرات گەڕانەوە بۆ سەمەرقەندو لەگەڵ خۆشیاندا نامەیەکیان بۆ هێنابووم.

نامەکە بەم شێوەیە دەستی پێکردبوو:

"من غەیاسەددین شای هیراتو سوڵتانی ئەفغانو هەڵگرو پارێزەری بیروباوەڕی ئیسلام.. شادومانم بە برای خۆم ناوت بەرم.." هەروەها لە نامەکەشدا سڵاوی گەرمو گوڕو بەڵێنی زۆر تێدابوو، وە بەڵێنی دابوو بۆ کۆبوونەوەی ئەنجومەنی سەری ساڵی نوێ، ئامادەبێتو دیاری نایابو گرانبەهای زۆر لەو دیارییە نایابو دانسقانەی برا دەیدات بە برا لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت..

پاشان لە جاکۆم پرسی:

کەواتە غەیاسەددین بەم زووانە نایەت بۆ ئێرە.. جاکۆ.. وا نییە.؟

وەڵامی دایەوە:

-من لەو باوەڕەدا نیم بێت.. تەیموور لەوەش دەچێت، مەبەستێکت هەبێتو شەڕت بە دەستەوە بێت..!!

وتم: جاکۆ تۆ بۆ پاشەڕۆژێکی دوور دەڕوانیت..

وتی: نەخێر بەو شێوەیەش.. نا.. بەڵام ئەوەی دووربین بێتو بە وردی سەرنج بدات، ئەم کارەی زۆر لا ڕوونو ئاشکرایە.. تەماشای مەنغالی بۆغام کرد. دەموچاوی دابو بەیەکدا. کتوپڕ پێی وتم:

-بە ڕاستی غەیاسەددین پیاوێکی تێگەیشتوو و عاقڵەو زۆر بە باشی کردەوە و هەڵسووکەوتی لەگەڵماندا دەکرد. من لەگەڵ جاکۆدام غەیاسەددین ئەوەندە باش دەبێت تاکو شوورا نوێیەکەی دەوری شارەکەی تەواو دەکات.

لێم پرسی: باشە، ئەو شوورایەی کەی تەواودەبێت..؟

وەڵامی دامەوە: پێش سەری ساڵی نوێ..

وتم: کەواتە منیش پێش ئەو مێژوومیە دەچم سەردانی غەیاسەددین دەکەم.

بەڵام ئەم سەردانەم چەند کاتی دەوێت؟

وە پێویستم بە چەند هێزو سەربازیش هەیە..؟

جاکۆ وەڵامی دامەوەو وتی:

-تۆ چەند دەتوانیت هێز کۆبکەیتەوە، ئەوەندەت پێویستەو هێشتا هەرکەمە.. ئەگەر لەم سەفەرو هەڵمەتەدا خێرا نەکەیتو بە هێواشی بجوولێیتەوە، چل هەزار سەرباز یان پەنجا هەزارو زیاتریشت دەوێت. چونکە غیاسەددین وایدەزانی ئێمە بە بەڵێنەکانی ئەو باوەڕمان کردووەو لە مەبەستی ئەو ناگەین.

پێش جەژنی سەری ساڵی نوێ ئەو بە تەواوی خۆی بۆ شەڕ ئامادە دەکات. دوای ئەوەش ئیتر پێویستی بە دڵنیایی‌و گوێڕایەڵی‌و ئامۆژگاری نییەو سەر بۆ کەس دانانەوێنێت.

-کەواتە لە هەڵمەتەکەماندا هەتا زیاتر خێرا بکەین، چاکترە.. وانییە. جاکۆ؟

-بەڵێ.. هەتا خێراتر بکەیت چاکترە..

مەنغالی بۆغاش بۆ قسەکانی من‌و جاکۆ سەری ڕەزامەندی ڕاوەشاند. ئیتر ئاوەها پێش ئەوەی بەفر بتوێتەوەو ڕێگاوبان نەگونجێتو بە کەڵکی هاتوچۆ نەیەت. فەرمانم نارد بۆ گشت سەردارو شازادەکانی میرنشینەکانم‌و داوام لێکردن بێن بۆ شەهری سیبز بۆ کۆبوونەوە.

پاش ئەوەی ڕێنمایی داوەم کردو لە شوێنەکەی خۆمدا دامناو کردم بە فەرمانڕەوای سەمەرقەندو پێم وت:

-لە دروستکردنی دیفوندا یارمەتی ئالی سۆن بدات.

ئیتر خۆشم هێزە تایبەتییەکەی خۆمم کۆکردەوەو لەگەڵیاندا بەرەو دەشتو دۆڵی ناوچەکەم کەوتمەڕێ.

هێزەکەی جیهانگیریشم بینی لە حاڵەتێکی ئامادەبوونی چاکدایەو ئامەزرۆیە بۆ هاوکاری‌و چوونە پاڵی هێزەکەی من لەم هەڵمەتە بەرفراوانەمدا.

جیهانگیریش وەك لەمەوپێش قەڵەو نەبوو، زۆر لاواز ببوو. لەوە دەچوو لە شوێنەکەی‌و کاروبارەکانیدا زۆر خۆی ماندوو کردبێت.

جیهانگیر زۆر مەیلی نەبوو، زۆریش گوێی بە شتە لاوەکییەکان نەدەداو حەزیشی پێنەدەکردن. لە کاتی بێکاریدا هیچ نیشانەیەکی خۆشی‌و شادی لە چاوەکانیدا بەدی نەدەکرا.

لە کاتی ئەو میوانداریو دەعوەتەی بۆ منی کرد سەرنجم دا مێشکی زۆر هیلاکەو بیری لای شوێنو شتێکی تر بوو. بە تایبەت لە کاتێکدا من لەسەر خوانو میوانداری ئەودا بوومو دەمخواردەوە، دەبوو مەستو سەرخۆش بمو هەستم بە غەریبی نەکردایەو هۆشو خەیاڵم بۆ هیچ لایەکی تر نەچوایەو دەبوو هەر بیری خێزانوماڵو منداڵیشم نەکردایەوە.

بەڵام هەرکە تەماشام دەکردن هەمووان بێدەنگو خەمبارنو دەمو لچیان داوە بەیەکداو دۆش داماون.

بە تایبەتی جیهانگیر هەموو بیروهۆشێکی لای شازادە سیفین بوو کە بەو هەموو جوانیو شۆخو شەنگییەوە لایەوە دانیشتبوو. بە شەرمو شکۆوە لە جیهانگیری دەڕوانی.

لە کاتێکدا جیهانگیر سەری هەڵدەبڕیو بەڕێزو خۆشەویستییەوە تەماشای ژنەکەی دەکرد. لە تەماشاکردنەکەیدا دوودڵیو دڵەڕاوکێیەکی تێدابوو.

لەوە دەچوو بەدەست خۆشەویستییەکەیەوە ئێشو ئازارێك بچێژێتو ترسی لێی هەبێت.

بەڵام شازادە سیفین هەستو نەستی خۆی زۆر بە باشی دەردەبڕی.

لە کاتێکدا تەماشای جیهانگیری دەکرد، ئەو چاوە گەشە سەوزانەی بریسکەی دەدایەوە. هەروەها کاتێك دەستی یان قۆڵی جیهانگیری دەگرت، دەستەکانی زۆر ئاسایی بوونو هیچ جووڵەو لەرزینێکی تێدا نەبوو.

شازادە سیفین هەر بۆنەو مناسەبەیەك ڕێکەوتایە، خێرا قۆڵی جیهانگیری دەگرت یان دەستی دەخستە ناودەستییەوەو هەڵی دەگلۆفتو دەیگوشین. "وەك ئەو جارەی دەستی منی گوشی" دەمبینی کە دەستی بە توند دەگوشی، جیهانگیر ڕادەچڵەکیو پاشان زەردەخەنەیەکی نەرمی جوانی بۆ دەکرد.. ئیتر لەوە باش تێگەیشتم ئەم دووانە زۆر بە چاکی یەکتریان خۆشدەوێت. بەڵام ئەم خۆشەویستییەیان شتێکی سەیری تێدایە.

لە کردەوەکانی جیهانگیرو سیفین زۆر سەرم سووڕمابوو. بە تایبەت لەو کردەوە سەیرو دڵەخورپێیەیان کە لە کاتی میوانداریيەکەدا دەیانکرد. لە کاتی هاتنی ئەو خواردنانەدا کە یەك لە دوای یەك دەهاتن. من زیاتر سەرم لە کردەوەی خانەخوێکانم سووڕدەما، بە تایبەتی لە شازادە سیفین.. زۆر شەیدای سەمای ئەو تیشکی مۆمە بووم کە لە ڕووخسارە سپییە مەرمەڕێکەی سیفینو لەسەر قژە زێڕینەکەیدا دەمبینی.. و هەندێ جاریش وای لێدەکردم لەو دڵەخورپێیەدا بکولێم.

بە دڵ حەزم دەکرد دەست بخەمە ناو قژییەوەو قژە زەردەکەی تێکبدەمو قۆڵو شانە نەرمو نۆڵەکانیشی هەڵگوشمو بەسەر یەکدا بیانهاڕمو بە توندی بەدەست بەریمە زڵلەلێدانیو ئەو ئەفسوونەم بشکاندایە کە کاری لە کوڕەکەمو لە منیش کردبوو. هیچ سوودو کەڵکێکم لەو میوانداریە نەبینی. ئەومندەم زانی، کتوپڕ کۆتایی هاتو جیهانگیرو سیفینیش هەستانو هاتن بۆ دوعاخوازیو شەوباش لێکردنم. هەر لەوکاتەدا شازادە سیفین لە جیهانگیری مێردی پرسیو وتی:

-ئایا ئێستا پێی بڵێین؟ من هەر چاوەڕوانی تۆ بووم پێی بڵێین..!!

ئیتر سیفین ڕووی تێکردمو چاوە گەشەکانی وەك بڵێسەیەکی گەش دەبریسکایەوە بە گەورەییو لەسەرخۆییەوە وتی:

-گەورەم هەروەك لەمەوپێش بەڵێنم پێدابوویت. من دەبم بە کچێکی باش.. ئا ئێستا دەتوانیت بزانیت من چیم بۆ کردوویت؟

وتم: دەعواتو میوانداریەکی نایابی شاهانە.. وانییە..؟

وتی: نەخێر.. گەورەم.. من.. کوڕەزایەکت پێشکەش دەکەم..!!

وتم: کەواتە بە ڕاستی سەلامەت تۆ کچێکی زۆر باشیت.. پیرۆزبایی خۆم پێشکەش بە تۆو کوڕەکەشم دەکەم.. بەڵام نامەوێت کچت ببێت..!!

وتی: ئەگەر ئەو کچە وەکو منیش بێت..؟ ئایا نایەتەوە یادت لە پێناوی مندا چەند شەڕت کرد؟!!

وتم: بەڵێ.. هەتا ئەو کچە وەك تۆش وابێت..

جیهانگیریش لەسەر قسەکانی ئێمەوە وتی:

-باوکە.. بە هەموو دڵنیاییەکەوە دەڵێم.. سیفین کوڕی دەبێت..!! ئینجا سیفین لە بەردەممدا کڕنووشی بردو وەك چۆن نۆبجا دەستی ماچ دەکردم. ئەویش ئاوەها دەستی ماچ کردم.

پاشان جیهانگیر لە هۆڵەکەوە بە ڕاڕەوێکدا بردمیو لە بەردەم ژوورێك لە ژووری کۆشکەکەدا ڕاوەستاو لێیپرسیمو وتی:

-باوکە.. حەزدەکەیت، عائیشەو تەمینە ببینیت..؟

وەڵامم دایەوە: کوڕم زۆر بە دڵو ئارەزووەوە حەزدەکەم بیانبینم.

وتی: زۆرباشە، کەواتە با بەم ڕێگایەدا بڕۆین..

وتم: زۆرچاکە.. دەی با بڕۆین..

گەیشتینە بەردەرگای ژوورێك‌و جیهانگیر دەرگای ژوورەکەی کردەوە. ژوورەکە زۆر ڕۆشن نەبوو. ڕووناکییەکی کەم‌و کزی تێدابوو. هەردوو ژنەکە لە ژوورەکەدا هاتنە دەرەوەو لەبەردەممدا بە چۆکدا هاتن‌و لە پێشدا عائیشە دەستی ماچ کردم‌و دوای ئەویش تەمینە دەستی ماچ کردم.

هەرکە سەریان هەڵبڕی‌و ناوچاویانم بینی.. توانیم هەمان سەرنج لە چاویاندا بخوێنمەوە کە لەمەوێش لە مێشکمدا چەسپیبوو.

بە ڕاستی هەموو ترسمان لە جیهانگیر هەبوو..!!

* * *

## ماچێکی سەیر

ماوەی دوو مانگ بەردەوام لە هەموو لایەکی ئیمپراتۆریەتەکەمەوە سەربازان‌و جەنگاوەران بۆ شەهری سیبز دەهاتن. دواجار ژمارەی ئەو سەربازانەی ڕوویانکردبووە شەهری سیبز گەیشتە پەنجا هەزار کەس‌و منیش دابەشمکردن بەسەر پێنج تیپی گەورەدا.

خۆشم سەرکردایەتی ئەو تیپەم کرد کە لە جەنگاوەرەکانی خۆم‌و لە سەربازە جەنگاوەرەکانی جیهانگیر پێکهاتبوون.

شێخ عومەریش لە تیپەکەی شێخ عەلی خالیدا کاری دەکرد.

میران شاش فەرمانداری یەکێك لە میلیشیاکانی هێزەکەی خیتای گرتە دەست. بە شێوەیەکی گشتی کاتێك پێشەوایی ئەم هێزە زۆرەم کردو لە دەروازە ئاسنینەکەوە تێپەڕین‌و لە دەریاکە پەڕینەوەو چووینە ناو بیابانەکەو ڕوومانکردە شاری هەرات بە شێوەیەکی گشتی، سەرکردایەتی‌و ورەی سوپاکەم زۆر باش‌و بە دڵ بوو.

سوپاکەم لەگەڵ خۆیدا خواردن‌و پێداویستی زۆر زۆری هەڵگرتبوو.

هەروەها ژمارەیەکی زۆریش خزمەتکارو کارەکەرو کۆیلەی لەگەڵدا بوو. لەگەڵ ئەوانیشدا چەند هەزار ژنێکیان لەگەڵدا بوو.

بە هێواشی‌و شادییەوە بەو زەوییە وشکانەدا چەند هەفتەیەك ڕۆیشتین. لەو ماوەی چەند هەفتەیەدا هیچ کەسێکمان نەدی بەو ڕێگایەدا لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بچێت. هەتا ڕیخی حوشتریشمان دەست نەکەوت ئاگری پێبکەینەوە.

لە دواییدا قافڵەیەکمان تووشهات کە لەو بیابانەدا سەریان لێشێوابوو، ڕێگایان لێ تێکچووبوو.

به زۆر سەرۆکی کاروانەکەمان لەگەڵ خۆماندا هێنا بۆئەوەی لەگەڵماندا بێت و ڕێنماییمان[٢] بکات و لەوەرگاکانمان پیشانبدات.

پاش ئەوەی خۆمان و ئەسپ و ئاژەڵەکانمان حەسایەنەوەو ماندوویی و ناخۆشی ڕێگامان دەرچوو. داوامان لە سەرقافڵەچییەکە کرد، ڕێنماییمان بکات و بنکەیەکی نزیکی غەیاسەددینمان پیشانبدات.

یاخود یەکێك لە قەڵاکانی غەیاسەددینمان پیشانبدات کە ماوەی ڕۆژەرێیەك زیاتر لە هێراتەوە دوور نییە.

لە شەودا سوپاکەم بە تەواوی گەمارۆی شاری فوشانج یان داو لە هەموو لایەکەوە ڕێگایان لێگرتن.

هەر کە لە کازیوەی بەیاندا شەپوورەکانیان فووی پیاکراو داوای لە سەربازەکانیان و لە خەڵکی کرد لە خەو هەستن. شار بە یەکجاری هەموو لە خەو ڕاپەڕین و بینییان سەربازی پرچەك و چەك بەدەست وەك بازن بە دەوری مەچەکدا گەمارۆی شارەکەیانی داوەو ڕێگاوبانیان لێبەستوون.

دەمتوانی هەر ئەوکاتە کتوپڕ هێرش بکەمە سەر شارەکەو بیگرم.

بەڵام بە پێی ئەو باسکردنەی شێخ عەلی و منداڵەکانم کە باسی ئەم شارەیان بۆ کردم.

وە بە پێی شێوەی بەرگری شارەکە، کە نوێنەرو شارەزاکانم بە وردی بۆیان باسکردبووم. تێگەیشتم ئەم شارە هەروەك شاری هێرات وایە. وە لەبەر ئەو خۆشەویستییەی خاتوو شێرێزا بەرامبەر ئەم شارە هەیبوو. هەموو ئەمانە وای لێکردم هەوڵبدەم ئەم شارە بەبێ شەڕو خوێن ڕشتن و وێرانکاری داگیر بکەم.

هەروەها تێشگەیشتم ئەو پلانەی دایدەنێم و ئەو هێرشەی دەیکەمە سەر شاری فوشانج وا لە غەیاسەددین دەکات لەگەڵمدا ڕێکەوێت و قایل بێت بە مەرجەکانم، بێ ئەوەی گەمارۆی دەوری شاری هێرات بدەم. فەرمانم بە تیپەکەم دا بە دەوری شارەکەدا چادری سپی هەڵبدەن و سەربازەکانیش هەموو جلی ڕەسمی سپی لەبەربکەن و سواری ئەسپی سپیش ببن. هەر کە ڕۆژ

---

[٢] ئەمە هیچ مانایەکی نییە، دەچێتە عەقڵەوە لەشکرێکی پەنجا هەزار کەسی و زیاتریش، بڕۆن بۆ هێرش و گرتنی شوێنێکی گرنگی وەك هێرات لەناو ئەو پەنجا هەزار کەسەدا شارەزایەکی تێدا نەبێت، ڕێنماییان بکات. سەرقافڵەچییەکی سەرلێشێواو ڕێگا ونکردوو نەبێت؟ لەگەڵ ئەوەشدا پیاوی وەك شێخ عەلیش لەناو ئەو سوپایەدا بێت کە خۆی خەڵکی ئەو شوێن و ناوچەیە بێت!! —وەرگێڕ—

هەڵات و دنیا بە تەواوی ڕووناك بۆوە. تیپی مۆسیقاژەنەكانی من و تیپی مۆسیقای هێزەكانی تریش دەستیانكرد بە دەهۆڵ و زوڕنا لێدان و ئاوازی خۆش و بە زەوق وەك ئەو ئاوازە خۆشانەی لە ئاهەنگی خۆشی و شاییدا لێی دەدەن. ئینجا خۆشم بە سواری بە دەوری شارەكەدا بە مەوكیبێكی زۆر جوانەوە پێش تیپەكەم كەوتم و سووڕامەوە.

جاڕچییەكانیشم كە جلی سپیان لەبەردا بوو نزیك شووورای شارەكە دەكەوتنەوەو بەو بڵندگۆیانەی بە دەستیانەوە بوو بە میللەتەكەیان دەوت:

"ئەی دانیشتوانی شار، دەروازەكانی شار بكەنەوەو پێشوازی سەرداری سەمەرقەند بكەن و ئەمڕۆ خۆتانی بدەن بە دەستەوەو هیچ كەسێك لە ئێوە تووشی زیان و سەرگەردانی نابێت".

بە درێژایی ئەو ڕۆژە مۆسیقاو تەپڵ و زوڕنا بەردەوام بوو. تیپە سپییەكەی منیش هەر سانەناساتێك بە سواری ئەسپە سپییەكانیانەوە بە دەوری شاردا دەسووڕانەوە. جاڕچییەكانیشم خێرا خێرا ئاگاداری شاریان دەكردەوەو بانگەوازەكەیان دووپات دەكردەوە.

سەرەتا لەسەر شوووراكانەوە هاتوچۆو گورج و گۆڵییەكی زۆر هەبوو. تیرهاوێژو ڕم بە دەستەكانیان بە گەرمی ڕم و تیربارانی پیاوە جەنگاوەرەكانمیان دەكرد. ژن و منداڵیش بەردەوام دەهاتنە سەر دیوارەكان و لە بورج و سەنگەرەكانەوە بە وردی دەیانڕوانییە سوپاو لەشكرەكەم.

بەڵام سەربازە بەرگریكەرەكان كە لەسەر شووراكان ڕاوەستابوون بە هیچ جۆرێك بە دەنگ بانگەوازەكەمەوە نەهاتن.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سوپاكەی من بە هیچ جۆرێك نەجووڵان و هیچ كارێكی تۆڵەكردنەوەیان بەرامبەر نەكردن.

بە درێژایی شەویش مۆسیقاو دەهۆڵ و زوڕنا هەر بەردەوام بوو. بەڵام لەپڕ دەنگی دەهۆڵ و زوڕناكان بە توندی زیادی كردو دەهۆڵ كوتەكان بە توند دەیانكێشا بە دەهۆڵەكانیانداو دەنگی مۆسیقاكانیان داپۆشی. ئا لەم كاتەدا ئەو وەستایانەی شارەزاییان هەبوو لە قمووش لێدان و كونكردنی ژێرزەویدا. دەستیانكرد بە قمووش لێدان و توونێل كردن بۆ ژێر شووورای شارەكە، بۆئەوەی لە كاتی پێویستدا شووراكان بڕوخێنن و تێكیان بدەن. لە ڕۆژی دووەمدا چادرە سپییەكانم پێچایەوەو لە شوێنەكانیاندا چادری سووری تۆخم هەڵداو بە گوریسی زێڕین و گوڵمێخی زێڕینەوە قایممان كردو بەستمانەوە. ئاڵاكەشم كە وێنەی هەڵۆیەكی زێڕینی تێدابوو بەسەر چادرەكاندا دەشەكایەوە ئەم ڕەنگانەش نیشانەی ئاگری شەڕو خوێن ڕژاندنی ناو كۆڕی جەنگ بوو. تیپەكەی خۆشم بە هەمان شێوە جلی سوورو زەردیان لەبەركردبوو.

ئەسپەکانیشیان بە هەمان ڕەنگی سوورو زەرد داپۆشیبوو.

هەمدیسان پێش لەشکرەکەم کەوتمو دووبارە بە دەوری شاردا سووڕامەوەو هەڵۆیەکی زەردیش لەسەر شانمدا ڕاوەستابوو.

بە توندیش لە هەموو لایەکەوە بەردەوام تەپڵو مۆسیقاو کەڕەنای سەربازیش بە دەوری شاردا لێدەدرا.

جاڕچییەکانیشم دووبارە هاواریان لە دانیشتوانی شار دەکردو دەیانوت:

"دانیشتوانی شار، ئەمڕۆ خۆتان بدەن بە دەستەوەو دەروازەی شارەکە بکەنەوە کەس دەستتان بۆ نابات و ماڵو سامانتان دەپارێزرێتو جگە لە ئەفسەرو سەربازەکان نەبێت کەسی تر ناکوژرێتو ژیانی پێناگەیەنرێت، ئەمە پەیمانێکە، سەردارو پێشەوای شاری سەمەرقەند بە ئێوەی دەدات.."

بە درێژایی ئەو ڕۆژە بەم شێوەیە ئینزارمان کردن. بەلام بە داخەوە یەك تاکە وەلامەمان پێنەگەیشتو کەسیش گوێی لە بانگەوازەکەمان نەگرت..

منیش بە دڵ ئاواتم دەخواست کەس گوێ لە بانگەوازەکەمان نەگرێت.

هەرکە شەو باڵی کێشا بەسەر ناوچەکەدا، ڕێنمایی ئەو وەستایانەم کرد کە شارەزاییان هەبوو لە قمووش لێدانو کونکردنی ژێرزەمیندا، خێرا بکەنو قمووش لێدەنو بچنە ژێر شوورای دیوارەکانی شارەکەوەو بن دیوارو بناغەکانیان گڵ کەند بکەنو دیوارەکان لەسەر دیرەگو کۆڵەکەداری ئەستوور ڕابگرن تا کاتی پێویست.

ئیتر دەنگی ئەو تەپڵو دەهۆڵانە دەنگی هەڵکەندنی زەوییەکەی داپۆشیو نەیهێشت هیچ کەسێك لەودیو شوورای شارەکەوە گوێی لەو تەپە تەپە بێتو هەر هەستیشیان نەکرد لە ژێر دیواری شارەکەیاندا چی ڕوودەدات.

ڕۆژی سێیەم دوا مۆڵەت بوو، مۆڵەتی خۆبەدەستەوەدان. سەربازە جەنگاوەرەکانم هەموو جلی ڕەشیان پۆشیو کڵاوی ڕەشیان لەسەرکردو لە چادرە ڕەشەکانیانەوە هاتنەدەرێو سواری ئەسپی ڕەشیش بوون. بەرەو شوورای شارەکە کشان.

منیش خۆم سەرکردایەتی تیپەکەی خۆمم کرد، و بۆئەوەی زیاتر کار بکەمە سەر خەڵکەکەو زیاتر بیانترسێنم. دوو پڵنگی ڕەشم لە لانەکەیان هێنایە دەرەوەو زنجیرم کردە ملیانو لە پێش ئەسپەکەمەوە بەرمدان. ئەو دوو پڵنگەش ناوبەناو گازیان لە زنجیرەکانی ملیان دەگرتو بە دەنگێکی ترسناکەوە دەیانقریشکاند.

ئەم قریشکەیە تێکەڵ بەو ئاوازە خەمبارو دڵتەنگییە دەبوو کە شەیپوورژەن و تەپڵ لێدەرەکانم لێیان دەدا.

ئەمەش بۆ خەڵکەکە نیشانەی ئەوە بوو ئیتر سۆزو بەزەیی لە دڵو مێشکمدا نەما. جارچییەکانم بە بڵندگۆکانیان بە خەڵکی شارەکەیان ڕاگەیاندو وتیان:

"سەرداری سەمەرقەند شازادە تەیموور، فەرمانی دەرکردووە، ئەگەر ئەمڕۆ خۆتان نەدەن بە دەستەوە، ئەوا بۆ سبەینێ هەرچی کەس و پیاوێکتان هەیە بکوژرێت. ئەم فەرمانە بێ جیاوازی ژن و منداڵیش دەگرێتەوەو کەسی لێ قوتار نابێت. ئەوە بزانن هەرکە ڕۆژ ئاوا بوو، مانای ئەوەیە مردن باڵ دەکێشێت بەسەر هەموو شاری قوشانجدا".

لەگەڵ ئەوەشدا هیچ نیشانەیەکیان لێدەرنەکەوت، ئەوە بگەیەنێت، ئەوان دەیانەوێت بە دەنگ بانگەوازەکەمەوە بێن.

ئەشمدەزانی و لەوەش نەدەگەیشتم ئایا دانیشتوانی ناو شارەکە بڕوایان بە جارچییەکانم هەبوو، یان لەو باوەڕەدا بوون دەیانتوانی بەرهەڵستی گەمارۆکەم بکەن و ڕووبەڕووی لەشکرەکەم بوەستنەوە.

بەڵام کاتێك خۆیان نەدا بە دەستەوەو فەرمانەکەی منیان دایە دواوە، مانای ئەوە بوو گیان و ڕۆحی خۆیان دا بە دەستمەوە.

بەڵام کاتێك بەرگریکەران شووراو سەنگەرەکانیان چۆڵ کردو لەناو شاردا هیچ شتێك دەنگی لێوەنەهات و بێدەنگ بوو. ئەمە نیشانەی ئەوە بوو، پێش ئەوەی خۆری ئەو ڕۆژە ئاوابێت، مردن باڵی ڕەشی بەسەر شارەکەدا کێشا.

هەرکە خۆر ئاوا بوو فەرمانمدا بە مۆسیقاو تەپڵ لێدەرەکان لە مۆسیقاو تەپڵ لێدان بوەستن. چونکە کاری قمووش لێدان و زەوی هەڵکۆڵینی ژێر شووراکان کۆتایی هات و کشومات بوون. ئەم کش وماتییە زۆر ناخۆش بوو. هەروەها لێدانی مۆسیقاو دەهۆڵ کۆتانیش ماوەی سێ شەوو سێ ڕۆژ، ئەمەش هەر ناخۆشترو بێزارتری کردبووین.

ئەو دەنگە دەنگ و هەراو هوریایە بە تەواوی لەشکرەکەمی ماندوو کردبوو.

هەرکە لەشکرەکەم بۆ نووستن کشومات بوون و حەسانەوە. لەو شەوەدا من تەنها ناوبەناو دەنگی بۆڕەو بارەی ئاژەڵەکان و حیلەی ئەسپەکانی خۆمانم گوێ لێدەبوو ناوبەناویش لەودیو شووراکانەوە گوێم لە دەنگ و هاوارێکی شێتانەی پچڕپچڕ دەبوو. لەبەردەم چادرەکەی خۆمدا دانیشتبوومو سەرنجی مانگە شەوەکەم دەدا. تیشکەکەی دەیدا لە شارەکەو ڕووناکی کردبۆوە.

لەبەر تیشکی ئەو مانگە شەوە ڕووناکەدا ناوبەناو تارمایيم دەدی بەسەر شووراکانەوە دەجوولآن. ئەو تارماییانە سێبەری پاسەوانەکانی شەو بوون‌و چاوەڕوانی هێرشی شەوانەیان دەکرد. یان تارمایی جەنگاوەران بوون‌و خۆیان بۆ گەمارۆ ئامادە دەکرد. یان بەناکان بوون لە ڕیزەکانی پێشەوە شوێنە بێهێزەکانی شووراکانیان چاك دەکردەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا هیچ دەنگێك ئەو بێدەنگییەی شەوی تێك نەدەدا. تەنها جارجارێك نەبێت، گوێم لە دەنگێکی دوور دەبوو ناوبەناو یان لەودیوەوە لەناو شارە نوستووەکەوە دەهات. یان لە دوورەوە لەناو چادرەکانی خۆمانەوە دەهات. ئیتر لە نیوە شەودا چارم نەما پێش ئەوەی هێرشەکەم بکەم تۆزێك نووستم.

پاش ئەوەی چوار کاتژمێر نووستم. عەبدوڵڵا لە خەو خەبەری کردمەوە. تەماشام کرد مانگ ئاوا ببوو. شەویش زۆر تاریك بوو، بەڵام ئەستێرەکان لە ئاسماندا بە کزی دەدرەوشانەوە.

هەستام جلەکانم لەبەرکردو چەند کەسێکم بە پرتاو نارد بۆ لای هەموو لەشکرو تیپەکانم‌و دوا ڕێنماییم پێڕاگەیاندن.

خۆشم چووم بۆ دەرگای قمووشەکان بۆ ئەوەی تەماشایان بکەم‌و دڵنیابم لەوەی وەستاو سەربازە شارەزاکانم هەموو شتێکیان ئامادە کردووەو بزانم ئایا ئەو دیرەك‌و کۆڵەکانەی لەسەر زەوی ژێر قمووشی دیوارەکاندان بە باشی نەوتیان پێدا کراوەو ئامادەن لە یەکەم هەنگاوی هێرشەکەماندا ئاگریان تێبەردەن. پاش ئەوەی لەم گەڕانە چاوپێکەوتنەدا گەڕامەوە بۆ بنکەی سەرکردایەتیم. فەرمانم دا بە یەکێك لە تیرهاوێژەکانم کە تیرێکی ئاگراوی بە بەرزی بۆ ناو شار بهاوێژێت. هیچ ئەوەندەی نەخایاند بڵێسەی ئاگرم بینی لەژێر قمووش‌و ژێرزەوی شووراکانەوە بەرزبۆوە. پیاوە تایبەتییەکانی ئەم کارەش دەرگای قمووش‌و ژێرزەمینەکانیان کردەوە بۆئەوەی هەوای پاکیان بۆ بچێت‌و بە باشی بسووتێ.

هەر لە هەمان کاتیشدا فەرماندارانی تیپەکانی ئاگر، ئاگریان لە هەموو دەوروبەری شار بەردا. هێزەکەی منیش بە هێواشی‌و لەسەرخۆوە بۆ پێشەوە کشان. دەنگەدەنگ‌و هاوارێکی زۆر لەناو شاردا پەیدابوو.

هاوارو بانگەوازی توندو تەقەتەقی قەڵغان پێکەوە بەرزبوونەوەو جەنگاوەران‌و بەرگریکەرانی شار هەموو پێکەوە بە شووراکاندا هەڵگەڕان‌و چوونە ناو سەنگەرو بورجەکانیانەوە.

لەبەرئەوەی هەموو هۆش‌و خەیاڵێکی بەرگریکەرانی شاری فوشانج لای ئەو ئاگرە بوو کە وەك بازنێك بە دەوری مەچەکێکدا لە دەوری شارەکەدا دەسووتا ئاگایان لەو ئاگرە نەبوو لەژێر شوورای شارەکەیاندا دەسووتا. هەتا دووکەڵەکەی بۆ سەنگەرو بورجەکانیان بەرزبۆوە.

ئینجا ترسیان لێنیشت‌و هەریەکەیان دەستیان دایە سەتڵە ئاو بۆ کوژاندنەوەی ئاگرەکە. بەڵام پاش چی، پاش لەدەستدانی هەموو شتێك.. هەرکە بەیان دەرکەوت‌و خۆر هەڵات‌و تیشکەکەی بەسەر دەشت‌و دەرو بیابانەکەدا پەخش کردەوە، دیرەگ‌و کۆڵەکە دارەکانی کە لەژێر شووراکاندا بوون‌و ڕایانگرتبوو دەستیکرد بە سووتان‌و هەرەسیان دەهێناو دەبوونە خۆڵەمێش‌و لەگەڵ خۆیاندا لایەکی تەواوی شووراکانیان دەرماندو دەلاقەی گەورەگەورەیان تێدەبوو.

هەر لەو کاتەشدا جەنگاوەرو سەربازەکانی منیش نەعرەتەیان لێداو بە یەك دەنگ قیژانیان‌و خۆیان ئامادەی شەڕو کوشتار کردو کۆمەڵێکیان چوونە پێشەوە بۆئەوەی پرد بەسەر خەندەقەکەدا دروست بکەن. سەربازە پیادەکانیش لە خەندەقەکە پەڕینەوەو لە شووراکاندا هەڵگەڕان‌و لەگەڵ سەربازەکانی فوشانجدا دەستەویەخە شەڕێکی قورسی خوێناوییان کرد. هیچ چەند چرکەیەك تێنەپەڕی هەر چوار دەروازەی شارەکە کرایەوەو پردەکانیان لەبەردەمیاندا ڕاکێشاو خێرا دە هەزار سەربازی سوارە هێرشیان کردە ناو شارەکەوەو بە هەموو هێزیانەوە بە ترسناکی دەیانقیژاندو بێ جیاوازی بەربوونە سەربازو خەڵکەکانی‌و دەستیان کرد بە کوشتنیان‌و هەرچی شەقام‌و کۆڵانەکان بوو، پڕبوون لە لاشەی کوژراوان‌و یەك پیاویان بە ساغی تێدا نەهێشت‌و هەر هەموویان کوشتن. جگە لەو پیاوانە نەبێت کە لەژێر ئاڵاکەی مندا شەڕیان دەکرد.

ئینجا پاش ئەوەی پیاوەکانی من شەقامەکانیان لە بەرگریکەران پاك کردەوەو هەموویان کوشتن‌و لەناویان بردن. داوام لە جەنگاوەرەکانم کرد ماڵەکانیش بپشکنن‌و ئەگەر شازادەیەکی ترسنۆکیان بینی ماوە بیگرن‌و بە ساغی بۆم بهێنن. لە ئێوارەدا جەنگاوەرەکانم شازادەیەکی فوشانجیان بە دیلی بۆ هێنام ناوی شێخ موراد بوو. چوار کەسی تریش لە فەرماندارەکانی لەگەڵدا بوو. ئەمانە لەژێر زەمینێکی تاریکدا خۆیان شاردبۆوە.

خۆی‌و فەرماندارەکانیم برد بۆ بەرزترین بورجی قەڵاکەو داوام لێکردن سەرنجی ئەو تاڵان‌و برۆیە بدەن کە لەناو شاردا دەکرێت.

چونکە سەربازەکانی من ماوەیەکی زۆر بوو وەك دیل لەناو چادرەکانی خۆیاندا مابوونەوەو شەڕیان نەکردبوو. هەرچی شتێکی باش‌و بەسوودو گرانبەهایان دەستبکەوتایە دەیاندا بە کۆڵیانداو دەیانبردە ناو چادرەکانی خۆیانەوەو فەرهوودیان دەکرد.

وە هەرچی نێرینەو مێینەیەك هەبوون‌و تەمەنیان لە دە ساڵ کەمترو لە پەنجا ساڵ زیاتر بوو، هەر هەموویان کوشتن، و ئەو ژن‌و کچانەشی تەمەنیان لە نێوان دە ساڵ‌و پەنجا ساڵیدا بوو، هەر هەموویان ئەتك کردو کچێتیان نەهێشتن. پیاوەکانم ئاگری غەریزەی شەهوەتی خۆیانیان پێ دامرکاندنەوە.

پێش ئەوەی شەو دابێت زۆربەی لاشەی کوژراوەکان فڕێدرانە ناو خەندەق‌و کران بە ژێر گڵ‌و خۆڵی شووراکانەوە.

بە بەردەوامیش وەستا شارەزاکانم دیوارو شووراکانیان دەڕماندو کاولیان دەکردن. بۆ شەویش گۆڕەپانی شارەکە بە مەشخەڵ‌و بڵێسەئاگر ڕووناك کرایەوەو زەوییەکەی بەردەو مافووری تێدا ڕاخراو دووکان‌و کۆگای مەی فرۆشەکان هەر هەمووی خرانە سەر پشت‌و مەڕو ئاژەڵێکی زۆر بۆ سازکردنی ئاهەنگی سەرکەوتن سەربڕان‌و دەتوت لە فێستیڤاڵێکی شەوانەداین.

مرۆڤ زۆر بە گرانی دەیزانی‌و بۆی دەردەکەوت کە بەشەکانی تری شارەکە چۆڵ‌و هۆڵ‌و خامۆشن‌و ترسناکی مردن باڵی بەسەردا کێشاوە.

هەرچی سەردارو شازادەو ئەفسەرە گەورەکانم بوون تا نیوەشەو لە گۆڕەپانی شارەکەدا مانەوە. هەرکە لە ژنە دیلەکانیان ڕوانی‌و تەماشایان کردن، ئەوانەی جوان بوون هێشتنیانەوەدو ئەوانەشی سەرنجی تەماشاکەرانیان ڕانەکێشاو جوان نەبوون ناردیانن بۆ سەربازە ئاساییەکان.

دوای ئەوە ئاهەنگ‌و بەزم‌و سەماو ڕابواردن دەستپێکرد.

پاش ئەوەی ئەو بەرهەڵستی‌و خۆنەدان بە دەستەوەیەی هەندێك لە ژنەکان نەماو چارەسەر کران. ئیتر هیچ بەرهەڵستی‌و ناخۆشییەك نەبوو لە ڕێی ژن‌و کچەکاندا کە لەبەردەم مەشخەڵ‌و بڵێسەکاندا سەما بکەن‌و گۆرانی میللی‌و فۆلکلۆری بۆ سەردارو شازادەو ئەفسەرەکانم بڵێن.

بەڵام ئەو ژن‌و کچانەی نەیاندەزانی گۆرانی بڵێن یان نەیاندەتوانی سەمابکەن، ئەو پیاوانەی گوێیان بە ڕابواردن‌و ئاوازی مۆسیقا نەدەدا، هەریەکەیان ژنێك یان کچێکی لەوانە لەگەڵ خۆیدا بردو..

ئاهەنگ‌و بەزمەکەی ئێمەش سات لە دوای سات گەرمترو خۆشتر دەبوو.

لە هیلاکیو ماندوێتیدا ژمارەیەکی زۆر لە ژنەکان بوورانەوەو لە پەلوپۆ کەوتن. بەڵام کچە بچکۆلەکانیش ئەوانەی تەمەنیان لە نێوان دە ساڵانو چواردە ساڵاندا بوون ئەوەندەیان عارەق خواردبۆوە، سەرخۆش بوونو کەوتنە باوێشکدان. ئیتر سەردارانو شازادەو ئەفسەرانیش کەوتنە هەڵبژاردنی ژنو کچەکانو یەکەیەکە ون دەبوونو دەچوون بۆ ڕابواردنو بەسەربردنی شەوێکی سوورو خۆش.

لەو ئاهەنگەدا بە تایبەتی کچێکی فارسی سەرنجی منی بۆ لای خۆی ڕاکێشا.

کچەکە زۆر ڕووخۆشو منداڵ بوو. بەردەوام لە ڕوومدا بۆم پێدەکەنیو بە دەورمـدا دەهاتو خزمەتی دەکردم. ئـەم کچە وەك کچەکانی تـر بێمەیلو خـەمبار نـەبوو. لەگەڵ ئەوەشـدا هیـچ گۆرانی نەدەوتو سەماشی نەدەکرد. کاتێك مەیو مەزەو گۆشتی برژاوو کەبابی بۆ دەهێنـام، زۆر بە جوانیو ڕێکوپێکی وەك کچە سەماکەرەکان خـۆی بـە لەنجـەولار دەهێنـاو دەبـردو لـەشو لاری خۆی پیشان دەدام.

هەتا لەو قەرەباڵغیو گەرمایـەی ئاهەنگەکەدا، ئـەو عارەقـەی ئێـی دەتکا –واتـە لـە کچەکـە- ئەو کچە بۆنێکی پاكو عەتراوی خۆشی لێدەهات.

گەرچی بـە هـۆی کاریگەری ئـەو مـەیـە زۆرەوە بـوو کـە خواردبوویـەوە، وای لێکردبـوو زۆر ڕووخۆشو ڕۆیشتنەکەی جوانو بە لەنجە بێت. بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا لەشێکی تازەپێگەیشتوو گەیووی پڕی تۆزێك قەڵەوی پێوەبوو. ئەوەی دەگەیاند کاتی لێکردنەوەی هاتووە.!! پێستی لەشـی نەرمۆنۆڵ بوو. دوو مەمکی خڕی قوتو دوو پـووزو دوو ڕانـی سافو لـووسو دوو سمتی بـەرزو جوانو سەرنجڕاکێشی پێوە بوو.

لـە کاتێکدا دەچەمییـەوە بۆئـەوەی خواردنو مـەیم پێشکەش بکات، ئـەو دوو مەمکە قوتـە جوانەی بەردەوام دەبیدا لە ڕووەو بە ئەنقەست تێیهەڵدەسووم. بە سۆزو ئارەزوویەکی زۆرەوە بـە چاوە جوانەکانی تەماشای دەکردمو زۆر بە ڕاشکاویو ئاشکراو سادەییەوە پێـی دەوتم، ئەگەر مـن لە ئامێز بگریتو لەگەڵمدا ڕابوێریت، ئەوا ئەو ڕابواردنـە بـە هیـچ جۆرێك مانـای ئـەتك کـردنو بەزۆر نییە.

بـەڵام مـن بـە عەکسـی هـەموو پیاوێکـەوە بـاوەڕم نـەبوو بـە زۆر کـچ ئـەتك کـردن زەوقو ئارەزووی زۆری پیاو هەڵدەستێنێت.

لەبەرئەوە وازم لە کچەکـە هێنـا بـە کـەیفی خۆی هەڵسوکەوت بکاتو چۆنـی پێخۆشـە بـا وا خزمەتم بکات.

کاتێك ماوەی بەزمو ئاهەنگەکە کۆتایی هات. کچەکانم دا بە سەربازەکانمو خۆشم ئەو کچەم برد بۆ ناو جێگاو دیوانەکەی خۆم.

هەر سەرم سوورماو حەپەسام لێی کاتێك بینیم چەند حەشەرییەو چەند برسییەو کەیفو ئارەزوویەکی یەکجار زیاتری هەیە لەوەی من چاوەڕێم لێدەکرد. ئەوەندە تامەزرۆو حەشەرێ بوو، تا من جارێك لەگەڵیدا ڕەحەت دەبووم، ئەو شەش جار بەسەر مندا ڕەحەت دەبوو. بە هیچ جۆرێك تێر.. نەدەبوو!! بەرەبەیان نزیك ببۆوە، خەریکبوو خۆر چاو هەڵبێنێت، ئەو هێشتا تێر نەبیبوو هەر لەسەر کەیفو زەوقی خۆی بوو.

لە دواییدا تێگەیشتم، مـن مـافی خۆیـم بـە تـەواوی نەدابوویـە. چونکـە نەمدایـە دەسـت سەربازەکانم. ڕەنگە ئـەوان هـەموو پێکـەوە بیانتوانیایـە تێریـان بکردایـە! زۆریـش پەشـیمان بوومەوەو پێشم ناخۆش بوو، لە بەیانی داهاتوودا ناردم بۆ گۆڕەپانی شارەکە، بۆئەوەی لەگەڵ هەموو کچو ژنەکانی تردا سەری بپەڕێنن، بەڵام لە ڕاستیشدا نەمدەتوانی سۆزو بەزەیی خۆم تێکەڵ بە کاروباری سەربازیو پێویستییەکانی شەڕ بکەم.

پاش ئەوەی هەموو ژنەکان کوژران. ئیتر پیاوانو سەربازەکانم ئاگریان لە هەموو شارەکە بەردا. بە درێژایی ئەو ڕۆژە بەردەوام تەماشای کاولکردنو ڕووخاندنی خانووەکانمان دەکرد.

ئەو پیاوانەی کاولکردنو وێرانکردنی خانووەکانیان پێسپێردرابوو، هەرکەسە لە شوێنەکەی خۆیەوە تا شەو خەریکبوون. لەو شەوەدا کۆمەڵ کۆمەڵ ژیلەمۆی گەش دیاربوو. لەو شەوو ڕۆژەدا خانوو ماڵەکان بە تەواوی کاول نەبوون. بۆ ڕۆژی دوایی بە تەواوی کاولو وێران کرانو داریان بەسەر بەردەوە نەما. هەمووی کاولو وێران کرانو بوون بە کەلاوە.

وە بۆئەوەی کاولکردنو وێرانکردنەکە بە تەواوی بێت پیاوەکانم جەنجەڕی گەورەو ئامێری ڕامالّینی گەورەگەورەیان لە داری ئەستوورو تەختەی پان دروستکردو بە زنجیرو گوریسی ئەستوورەوە بەستیان لە هێسترو گای بەهێزو زەبییەکەیان پێ کێشان دەو بەردیان بەسەر یەکدا ڕامالّی.

هیچ هەفتەیەکی نەخایاند هەرچی ماڵو خانوو جێگایەکی شاری فوشانج هەبوو، هەمووی بەسەر یەکدا ڕووخێنراو سووتێنرا. تەنها گردێکی خۆڵی گەورە نەبێت هیچ شتێك لە شوێنەواری شاری فوشانجدا نەما.

شێخ مورادیشم بە زۆر دانابوو، بۆئەوەی بە چاوی خۆی بە وردیو بە چاکی کاولکردنو تالانکاری هەموو شاری فوشانج ببینێتو بە باشی لە مێشکیدا بچەسپێت. هەرکە تێگەیشتم

ئەمانە هەمووی بە باشی لە مێشکیدا چەسپیوە، هێنام هەردوو چاویم دەرهێناو کوێرم کردو لەگەڵ یاوەرەکانیدا ناردم بۆ هیرات. بۆئەوەی دەستی بگرن و پاسەوانی بکەن و بیبەنەوە بۆ لای غەیاسەددین و باس و خواستی قوشانجی بۆ بگێڕێتەوە.

پاش چەند سەعاتێك سوپاکەشم بە دوای شێخ مورادا کەوتنەڕێ.

لەگەڵ خۆرهەڵاتی ڕۆژی دواییدا هێزەکەی و لەشکرە پڕ چەکەکەم، گەمارۆی شووراکانی شاری هیراتیان دا.

ئەو شوورایانەی هێشتاکە تەواو نەببوون.

شاری هیرات زۆر جوان و خۆش بوو. لەو ڕۆژەدا لە شاری سەمەرقەند زۆر خۆشتر بوو. خانووماڵی زۆر جوان و نایابی تێدابوو کە لە بەردو خشتی سوورەوەکراوی قایم دروستکرابوون. قووبەی سپییان هەبوو. هەندێکیان بە زەرکەفتی ئاڵتوون زەرکەفت کرابوون و دەدرەوشانەوە. بورج و منارەی خەت خەتی تێدابوو. شوێنی بانگدانی جۆراوجۆری زۆر تێدابوو.

ئاشی بای ڕەنگاوڕەنگی تێدابوو لەو کزەبای بەیانەدا بە هێواشی دەخولانەوە. گەرچی شوورای شارەکە هێشتا تەواو نەببوو. زۆریش پتەوو قایم نەبوو. بەڵام بە ڕاستی کارێکی هونەری زۆر جوانی تێدا کرابوو.

لە چوار لاوە چوار دەروازەداری بەهێزو تێکەڵ بە ئاسن و پۆڵای بۆ دەروازە داخستن و ڕێگاگرتن لە شاری بۆ دروستکرابوو.

منیش هێزە تایبەتییەکەی خۆم کە جلی سپییان لەبەردا بوو. یەکەم جار بە دەوری شارەکەدا سووڕاندمنەوە. لەوەش دڵنیابووم فەرماندارو سەرلەشکرەکانم زیاتر چاویان لە شارەکە بڕیبوو وەك لەوەی لە کاتی خۆپیشاندنەکەمدا چاویان لە من بێت. هەتا تیپی شەیپوور لێدەرەکانیشم لە ناردنی نیشارەت و فووکردن بە شەیپوورەکانیاندا دواکەوتن.

بەڵام ئەوەندەی نەخایاند لەو دواکەوتنە خێرا لەگەڵ دەنگی لێدانی تەپڵەکاندا ئاوازێکی خۆش و جوانیان لێداو لەگەڵ ئەو ئاوازەدا جارچییەکانیشم ئاگاداری ڕۆژی یەکەمیان بە خەڵکی ناوشار ڕاگەیاند.

بێگومان غەیاسەددین بە هاتنی ئێمە هیچ سەری سووڕنەماو گوێی پێنەداین.

بورج و سەنگەرەکانی پڕبوون لە جەنگاوەران و بەرگریکەران. وا دیاربوو پیاوە جەنگاوەرەکانی گاڵتەیان بە هیواو پلانەکانی من دەهات. چونکە شاری هیرات، شارێکی زۆر گەورە بوو. دوو سەدو پەنجا هەزار کەس تێدا دەژیاو ژمارەی بەرگریکەرانیش ژمارەیەکی کەم نەبوو.

خەڵکیش لەم شارەداو لە من کەیشتبوون‌و وایان من ناسیبوو، گوایـە مـن مێردێکی ئەڵقەلـەگوێ‌ۆ گوێڕایەڵی شازادە شێرێزام.

غەیاسـەددین خۆپیشـاندان‌و سـووڕانەوەی یەکـەمجارم بـە دەوری شـووراکانی شـاردا هیـچ کاریگەرییەك‌و دەنگدانەوەیەکی نەبوو. جگە لەوە زیاتر جەنگاوەران‌و بەریگریکەرانی شارو سەر شووراکان زیاتر پێم پێدەکەنین‌و گاڵتەیان پێدەکردم.

بەڵام دوای کاتژمێرێك بەسەر ئەم ڕووداوانەدا، کە چوومە پێشەوەو لە شار نزیـك بوومـەوە، فـەوجێکی تـەواو لـە جـەنگاوەرە مێزەر بەسەرە بریسکاوەکانی فارسـەکان لـە دەروازەی سەرووی شـارەوە بـەرەو ڕووم هاتنـە دەرەوەو بۆئـەوەی تیپەکـەی مـن لەناوبـەرن. منیـش هیـچ خـۆم نەشڵەژاندو خۆم تێك نـەدا. بـەڵام کاتێك هێزەکەی شێخ عـەلی‌و هێزەکـەی نوورەدیـن هاتنـە پێشەوە بۆئەوەی هێرش بکەنە سەر دوژمن‌و بەرهەڵستی بکەن. کتوپڕ سوارچاکەکانی فارسـەکان بێئەوەی تیرێك بهاوێژن، زۆر خێراتر لەو خێراییەی هاتنە پێشـەوە، کشانەوە بـۆ نـاو شـار. جگە لـە نزیکـەی سـەد سواریان نـەبێت، کوژران ئـەویش بـە هـۆی ئـەو هێرشـە خێراییـەی هێزەکـەی نوورەدینەوە بوو کە وەك گەردەلوول بەرەو پیریان کشان‌و لێیان دان.

منیش بێ ڕاوەستان‌و گوێپێدانیان سێ جار بە دەوری شارەکەدا سووڕامەوە. گەرچی لەهـەر سووڕانەوەیەکمدا بـە دەوری شـارەکەدا ژمارەیـەکی زۆر زۆرتـر لـە جـەنگاوەرانیان‌و لـە خـەڵکان لەسەر شووراکان کۆدەبوونـەوە. بـەڵام بێ ئـەوەی یـەك تـۆز ئـەمجارە پێمـان پێبکەنن‌و گاڵتـەمان پێبکەن. خەڵکانی شارو ژن‌و منداڵان کە تەماشایان دەکردین، ترس‌و لەرزو تۆقین‌و سەرسووڕمان لە ڕوویاندا بە ئاشکرا دیاربوو.

لەوەوە تێگەیشتم دەنگوباس‌و بەسەرهاتی شاری فوشانج بە چاکی لە هیراتدا بڵاوبۆتەوە.

ئیـتر وەهـا دوای نیـوەڕۆ کاتێك بـە دەوری شارەکەدا نمایشـم دەکـرد. هیـچ سـەرم سـووڕنەما کتوپڕ کۆمەڵێك پیاوی ناو شارم بینی لە دەروازەکەوە هاتنـە دەرێ‌و بـەرەو ڕووم هـاتن. بۆئـەوەی دیمانەو گفتوگۆم لەگەڵدا بکەن.

ئـەو کۆمەڵەش ئـاڵای سپیان هـەڵگرتبوو، کـە ئەمـەش نیشانەی ئاشـتی‌و ڕێکەوتن بـوو. لـە ناوەڕاستی ئەو خەڵکەدا کـە لـە چادرە سپییەکەمەوە بۆ دەروازە سەرەکییەکەی شار درێژببۆوە لەگەڵ نوێنەرەکانی شاردا بە یەکگەیشتن‌و چاومان بەیـەکتر کـەوت. گـەرچی مـن لەمـەوپێش بـە هیچ جۆرێك غەیاسەددینم نەدیبوو. بەڵام کتوپڕ تێگەیشتم سـەرۆکی ئـەم کۆمەڵە لـە کوڕەکـەی

شامالك زیاتر كەسی تر نیە. هەركە غەیاسەددین لە من نزیك بۆوە زۆر بە ڕێزەوە لە بەردەممدا چەمییەوەو سڵاوی لێكردم‌و وتی:

-"ئەی تەیمووری برام من غەیاسەددین شای هیرات‌و سوڵتانی ئەفغان‌و هەڵگری بیروباوەڕم. من پێشوازیت دەكەم بۆ ناو شارەكەم..".

وتم: ئەی برام غەیاسەددین منیش تەیموور سەرداری سەمەرقەندو پێشەوای هەموو گەلی تەتەری بە گشتی زۆر سوپاست دەكەم بۆ ئەم پێشوازییەت.

وتی: زۆرچاكە.. ئەی تەندروستی خاتووشیرێزای خوشكی بەڕێزم چۆنە؟و حاڵ‌و هەواڵی برام شێخ عەلی قارەمان چۆنە..؟

وتی: خاتوون لەوپەڕی چاكی تەندروستی‌و بەختیاریدایە، ئەویش لە كانگای دڵییەوە ڕێزو سڵاوی بۆت هەیە..

بەڵام شێخ عەلی ئا ئەوەتا لەوێوە..

بە پەنجە ئاماژەم بۆ لەشكرەكەی شێخ عەلی كردو وتم:

-بێگومان ئاڵاكەی باش دەناسیت..

وتی: چاكە.. كەواتە ئەویش لێرەیە.. من ئەوەم سەرنج نەدابوو، چونكە ماوەیەكی زۆر كەمە لە خەو هەستاوم‌و هیچ باس‌و هەواڵی ئامادەبوونی تۆم بۆ ئێرە پێنەگەیشتبوو.

وتم: بۆئەوە هاتووین بۆ ئێرە كە لەگەڵ خۆماندا بتبەین بۆ هاوبەشیكردن لە ئەنجومەنی ساڵی نوێدا!!

وتی: براكەم.. ئای تۆ چەند دووربینیت. منیش زۆرم پێخۆشە لەگەڵ تۆدا بێم. فەرموو زۆر بە خۆشی‌و شادییەوە با بچینە ناو شارەكەمەوە..!!

وتم: بە پێی ئەو مەرجانەی من دامناوە، تۆش بێگومان دەزانیت‌و گوێشت لێبووە.

وتی: بەڵێ.. بەڵێ.. گوێم لە جاڕچییەكانت بووە..

وتم: زۆرچاكە.. كەواتە دەی هەر ئێستا فەرمان دەركەو فەرمان بدە بە لەشكرەكەت هەر هەموویان بێ چەك لە شار بێنەدەرێ‌و رووبكەنە ناو چادرەكانم..

غەیاسەددین بێ هیچ فرت‌و فێڵ‌و ناپاكییەك فەرمانی بۆ گشت شازادەكان‌و فەرماندارەكانی دەركرد، و خۆشی لەگەڵ مندا مایەوە، لە كاتێكدا هەر هەموو فەوج‌و هێزێكی فارسی‌و ئەفغانی هەبوو لە شار هاتنە دەرێ‌و خۆیان دا بە دەست هێزەكانی منەوە.

ئینجا دوای ئەوە لە هەر فەوجێك لە فەوجەكانی خۆم تیپێكم هەڵبژاردو لەگەڵیاندا چوومە ناو شارەكەوە.

دوای ئەمە مێژوونووسان من بە دڵڕەق و نامرۆڤی ناودەبەن و تاوانبارم دەكەن بەرامبەر ئەو كردەوەیەی لەگەڵ دانیشتوانی شاری فوشانجدا كردم. بەڵام هەر مێژوونووسێك گەر بە ڕاستەو دادوەریانەو بێ جیاوازی، سەرنجی ئەم كردەوەیەی من بدەن و بیانتوانییایە بە سواری ئەسپەكانیان بێن و لە دوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژەدا بەناو شاری هیراتدا بگەڕایەو ئەو هەزارەها خەڵكە بێگوناهو بینا جوانانەیان ببینیایە كە بە خۆبەدەستەوەدانی غەیاسەددین لە چنگ كاولكردن و وێرانكاری ڕزگاریان بوو، ئەو كاتە تێدەگەیشت ئەو كردەوەیەم كارێكی دادوەریانەو چاك بوو.

لە ڕاستیدا وێرانكردنی شاری فوشانج بوو بە هۆی ئەوەی بتوانم پایتەختی ئەفغانستان بەو ئاسانییەو بێ بەرهەڵستی و شەڕو كوشتار داگیربكەم. خێرای كاروباری فەرمانڕەوایی حكومەتی هیراتی گرتە دەست و هێزی سەربازە مەغۆلییەكانی لەگەڵ خۆیدا هێشتەوە. چونكە ئەو هێزە ئەوەندە هێزیان هەبوو كە دەیانتوانی جڵەوگیری هەموو گەل بكەن و بەردەوام گوێڕایەڵیشمان بن. پێویستی تەواوم لە ئاژەڵ و ئازووقە بۆ جێهێشتن كە بتوانێت خۆی خۆی بژێنێت و ببێتە كرۆكێك و بە دەوری خۆیدا هێزێكی سەربازی نوێ لە باشووردا پێكبهێنێت.

ئیتر دوای ئەوە هەرچی سامان و گەوهەرو مرواری و شتی نایابی شاری هیرات هەبوو كردم بە كاروانێك و لەگەڵ خۆمدا هێنام و گەڕامەوە بۆ سەمەرقەند بۆئەوەی پێش سەری ساڵی نوێ بگەمەوە ئەوێ..

ئەم كاروانەی من گەورەترین و دەوڵەمەندترین كاروانێك بوو كە لە دوای زەمانی جەنگیزخانەوە توانیبێتی لە دەریا بپەڕێتەوە، بەم دەستكەوت و سەركەوتنە مەزنییەوە كە چوومەوە ناو شاری سەمەرقەند هەر هەموو شتێكی لە بیرو مێشكی خەڵكیدا سڕییەوە.

شازادە دڵشاد و شازادە شێرێزا ئەم سەركەوتنە مەزنەی منیان زۆر پێخۆشبوو. بە شادی و شانازییەوە پێشوازییان كردم و هەریەكەیان لە ڕوانگەی خۆیانەوە تەماشایان دەكرد.

ئەوەتا دڵشاد ئەم سەركەوتنەی منی بە بووژاندنەوەی گشت تەتەرەكان دادەنا. هەروەها لەو ئاماژەكردنە زۆرەیدا كە بۆ شاهڕووخی دەكرد كە هێشتا تەمەنی لە چوار ساڵان تێنەپەڕیبوو. كە ڕۆژێك لە ڕۆژان كوڕەكەی جڵەوی فەرمانڕەوایی ئیمپراتۆریەتەكە دەگرێتەدەست و ئەوكاتە سنووری ئیمپراتۆرییەتەكە زۆر زیاترو فراوانتر دەكات لەمەی ئێستای.

شازادە شێرێزاش ئەم سەرکەوتنە گەورەیەی منی بە هەلێك دەزانی کە بە هۆیەوە لەگەڵ میران شای کوڕیدا بگەڕێتەوە بۆ هیراتو تاجی شاهانە لەسەر شانشینی ئەوێ بکاتە سەری.

بیری لەوە دەکردەوە کە دەبێت بە دایکی شایەكو فەرمانڕەوایی هەموو ئاسیا دەکات. شازادە شێرێزا هیچ بەرهەڵستیو ناخۆشییەکی پیشان نەدا بەرامبەر ئەوەی فەرمانڕەواییەکی بچووکم لەناو شانشینەکەمدا، دابە غەیاسەددینو کردم بە سەرکردەی تیپێکی پاسەوانانی تایبەتی کە لە ڕاستیدا ئەو پیاوو سەربازانەی لە تیپەکەی ئەودا کاریان دەکرد، وەك پاسەوانێك وابوونو سەرپەرشتیو چاودێری هەڵسوکەوتی غەیاسەددینیان دەکرد تا لە ژیاندا بێت.

بەڵام ئالی سۆن یەکەم کەسێك بوو، گوێی نەدایە ئەو گەڕانەوە پڕ شکۆو سەرکەوتنە مەزنەم. گەرچی زۆریش تامەزرۆ بوو، بە دڵ حەزی دەکرد بمبینێت. کاتێك لە ئاهەنگەکەدا پێکەوە هاتینە دەرێو لەگەڵیدا چووم بۆ تەماشاکردنی دیفون زۆر بە خۆشیو ئارەزووەوە پێی وتم:

-شازادە، دروستکردنی دیفون وا لە تەواوبوونو کۆتاییدایە..!!

چاوەکانی وەك قژە زەردەکەی دەبریسکایەوە.

بەڵام کاتێك بە وردی سەرنجی ڕووخساریم داو تەماشای دەموچاویم کرد بینیم نەخۆشییەکی پیس سیمای تێکداوە هەر لە سوورێژە دەچوو.. بە ترسو دڵەخورپێوە لێم پرسی:

-ئالی سۆن ئایا تۆ نەخۆشیت..؟

وتی: نەخێر.. بۆچی..؟

وتم: چونکە چەند پەڵەو زیپکەیەك بە ڕووخسارتەوە دەبینم.

وتی: ئا لەوە ترسایت؟ ئەوە هیچ شتێك نییە کە لێی بترسیت.. بەڵکو ئەم زیپکانە تەنها گرمژنەیە..!!

وتم: زیپکە.. گرمژنە..؟

وتی: بەڵێ.. گەرما ئەم گرمژنانە لە دەموچاومدا دروست دەکات، بەڵام ماوەیەکی کەم ئەم گرمژنانە لەسەر ڕوومدا نامێنێتو لە کەژی زستاندا دووبارە جوانو شۆخو شەنگ دەبمەوە!!

وتم: کەواتە ئەم زیپکانە هیچ ئێشو ئازارێکت پێناگەیەنێت.. وا نییە؟

وتی: بێگومان هیچ ئازارێکم پێناگەیەنێت، تەنها مەگەر ئەوە نەبێت وام لێبکات لە پێش چاوی تۆدا من ناشیرین بکات..!!

کە ئەم قسەیەم کرد لە شەرماندا سەری داخستو سوورهەڵگەڕا.

پاشان دەستی گرتم و لە کۆشکەکە بردمییە دەرێ و پێی وتم:

-واز لەمانە بێنە با بچینە دەرێ و پیاسەیەك بکەین و تەماشای دیفون بکەی لـە ڕاستیدا حەزم لە پیاسەو گەڕان نەدەکرد. بەڵام تەما چاوم بە خۆشییەوە چووم بە پیر ڕەخساندنی ئەم هەلەوەو لەگەڵیدا لەناو باخچەکەدا کەوتینە گەڕان. گەرچی نێوان باخچەکەو ئەو دەروازەیەی ڕوو لە دیفون بوو زۆر دوورو درێژیش بوو. بۆن و بەرامەو میسك و عەبیر لە سەروقژی دەهات.

منیش بە ئەنقەست وام لێکرد بکەوێتە خوارووەمەوەو لەوێوە بڕوات بۆنەوەی هەواکە بیدات لەسەرو قژی و ئەو بۆن و بەرامەیەی بە سەرمدا بێت و مەست و سەرخۆشم بکات.

حەزیشم دەکرد لە پێشمەوە بڕوات بۆنەوەی لە کاتی ڕۆیشتنیدا تەماشای ئەو لەشولارە پاراوە جوانەی بکەم کە لەژێر ئەو کراسە تەنکە سادەیەی لە بەریدا بوو دەلەرییەوە، بەڵام کاتێك گەیشتینە ئەو سەرەو لێژییەی لە باخچەکەدا بۆ سەرەوە دەڕۆیشت و چونکە منیش لێوەی نزیك بووم خۆیدا بەسەر شان و قۆڵمداو منیش زۆرم پێ خۆش بوو بەو قورسییەی کە خۆی دابوو بەسەر شان و قۆڵمداو بە دەستە نەرمەکانی کە لەناو دەستمدا بوو. خۆشی و ئارەزوویەکی وای پێبەخشیم. کە خۆش و ئارەزووی وا تاکو ئێستا لە هیچ ژنێك لەو ژنانەی تاکو ئێستا ناسیومن و گرتوومنەتە باوەش خۆشی و ئارەزووی وام لێنەدیبوون.

ئەم خۆشی و ئارەزووە تۆزێك شڵەژاندمی و ئارەزووی ڕابواردنمی هەستاند. بەڵام من نەمدەویست و هیچ مەبەست و ئارەزوویەکم لەوە نەبوو جارێکی تر دووبارە سۆزو خۆشەویستی خۆم بخەمەوە ناو داوی هیچ ژنێکی ترەوە.

چونکە کاتی خۆی ئەلجای خەریکبوو بە هیلاکم ببات و لەناوم بەرێت. کاتێك منی خستە ناو داوی خۆشەویستی خۆیەوە..!!

گەرچی خۆر لە زەردەپەڕدا بوو، خەریکبوو ئاوا دەبوو. شنەبای ئێوارەش سارد بوو. بەڵام چەند دڵۆپە عارەقێك لەسەر گۆناو سەرلووت و ژێر چەوانی ئەلی سرن لەگەڵ زیپکەکانی دەموچاویدا تێکەڵ ببوون و دەبریسکانەوە.

ئەوەندەی نەخایاند دەموچاوی خۆی بە تاراکەی سەری سڕی و وتی:

-بینای قەڵاکەم تەواو بووە.. وا نییە..؟

وتم: بەڵێ.. بەڵام وەك ئەوەیە کە تۆ دەتویست؟

وتی: بەڵێ.. خەریکە بە تەواوی لە گوندەکەی من بچێت.. هەتا شتومەکی ناوەکەشی لەو شتومەکانەی وڵاتەکەی من دەچێت..!!

لە قسەکانیدا یادو بیرەوەری بۆ نیشتمانەکەی تێدابوو.. کە سەرنجم دا ئەو یادە بەسەر سۆزو نارەزوویدا زاڵ نەببوو. هەمدیسان لێم پرسییەوە وتم:

-ئەی خانوو ماڵەکانی تر چۆنە..؟

وتی: بەشی دەرەوەیان بە تەواوی تەواوبوون. بەڵام ناوەوەیان هێشتا پێویستی بە تۆزێك چاودێری‌و چاکردن‌و شت‌و پێداویستی هەیە..

وتم: باشە ئەوانیش جوانن؟

وتی: چاکە.. دەی ئێستا چاوت بنووقێنە، با من دەروازەکەی بکەمەوە. وەك گەمەی منداڵان چاوم نووقاندو چاوەڕوانی ئالی سۆنم کرد. پاش ئەوەی دەروازەکەی کردەوە پێی وتم:

-ئێستا چاوت بکەرەوە..!!

بە ڕاستی کاتێك بە قسەی ئەو کچەم کرد هەستم بە بێهۆشی‌و گێلی خۆم کرد.. چاوم کردەوەو یەکەم جارم بوو کە چاوم بە دیمەن کەوت.

لە بەردەممدا شەقامێکی تەسکم بینی‌و لەمبەروئەوبەرییەوە ماڵ‌و خانووی جوان بە پێی وێنەو نەخشەکانی ئالی سۆن دروستکرابوون.

لە کۆتایی شەقامەکەدا قەڵایەکی بچوك دروستکرابوو. هەر کە قەڵاکەم بینی ئەوەندە بچووکەو زۆریش بڵند نییە لە ئالی سۆنم پرسی:

-وابزانم قەڵاو خانووەکان زۆر بەرز نین.. وا نییە..؟

-بەڵێ.. بەڵام بە شێوەیەکی باش‌و ڕاست‌و ڕەوان دروستکراون‌و شوێنەکانیان شوێنێکی چاکن. من خۆم کاتی خۆی پێپلیکانەی ماڵەکەی خۆمانم ژماردووەو ئێستا لە یادمەو بە ئاسانی دەزانم ژمارەی پێپلیکانەکانی چەندن. ئەم شەقامەش بە تەواوی لە شەقامەکەی خۆمان دەچێت‌و زۆریشم خۆشدەوێت‌و دڵم پێخۆشە.

-ئایا ئەوەندە وڵاتەکەی خۆتت خۆشدەوێت..؟

ئەی من گوندێکم بۆ دروست نەکردویت وەك گوندەکەی خۆت..؟ ئالی سۆن توند قۆڵی گرتم‌و بینیم فرمێسك بە چاوەکانیدا دێتەخوارێ، لەوە نەگەیشتم، ئایا ئەو فرمێسکانە فرمێسکی سوپاسگوزاری‌و لە پێشگرتنی چاکەیە، یان فرمێسکی خەم‌و پەژارەیە..؟!!

پاشان ئالی سۆن وەرگەڕایەوە تەماشای شەقامەکەی کردو پێی وتم:

-گەورەم، دەی با خێرا کەین‌و بڕۆین بەشێك لە قەڵاکەش ببینین، پێش ئەوەی تاریکی باڵ بەسەر گشت لایەکدا بکێشێت.

تەنها توانیمان تەماشای هۆڵە سەرەکییەکە بکەین.

ئەم هۆڵە لەچاو هۆڵە گەورەکانی کۆشکی فارسییەکان‌و تەتەرەکاندا هەروەك هیچی تێدا نەبێت‌و رووت‌و قووت بێت وابوو. چونکە ئەو هۆڵانە پڕ لە ڕاخەرو شتی دانسقەو گرانبەها بوون.

لە ڕاستیدا شتومەکی ناو هۆڵەکە زۆر سادەو ساکار بوون. ئەوەی لەم هۆڵەدا سەرنجی منی ڕاکێشاو سەیرترین شتێك بوو لام ئەو ئاگردانە بوو کە لە دیوارەکەدا دروستکرابوو. منیش بەسەرسامییەوە لە بەردەمیدا ڕاوەستام‌و سەرنجم دا.

لەگەڵ ئەوەی ئالی سۆن زۆر شانازی بەم ژوورەوە دەکرد، بەڵام خێرا داوای لێکردم، خێرا بکەم‌و لەگەڵیدا بچم بۆ پێش ئەو باڵەکۆنەی کۆشکەکەی‌و ئەو تیشکی شەفەقی خۆرە ببینین کە خەریکە ئاوادەبێت‌و تیشکە ئاگرییە جوانەکەی بەسەر خۆڵ‌و خاکی ڕێگاکەی بوخاریدا پەخش کردبۆوە.

ئالی سۆن لە تەنیشتمەوە ڕاوەستابوو دەستی خستبووە ناو دەستمەوەو تەماشای ئەو شەقامەی دەکرد کە تۆزێك خوارببۆوەو دەچووەوە بۆ دەروازەی شوورای باخچەکەم‌و پێی وتم:

-ئا ئەمەیە دیفون من دەمەوێت‌و حەزیش دەکەم هەموو ڕۆژێك لەم کاتەدا لێرە بم.

وتم: هەر ئێستا دەتوانیت، بێیت بۆ ئێرەو بە یەکجاری لێرەدا نیشتەجێ ببیت.

وتی: بەڵێ پەیمانەکەی خۆم دێنمەدی، گەرچی لەمەوپێش هیچ ئومێدێکیشم نەبوو.

وتم: پەیمانەکەت؟ ئەو پەیمانە.. چییە..؟

وتی: بەڵێ گەورەو سەروەرم ئەمیرەکەم تەیموور من ئەوەندە تێنەگەیشتوو و گێل‌و بێهۆش نیم‌و کچێکی منداڵیش نیم تەنها ئاوات‌و مەبەستم ئەوە بێت ماڵێکم بێت‌و بەس. کاتێك تۆ منت کڕی من دەمزانی تۆ چاوەڕوانی چی لە من دەکەیت..!!

وتم: خۆ من هیچ شتێکم نە...رتوو...

وتی: شازادەی گەورەم من چاك ئەوە دەزانم، جارێکی تر ناتوانم بۆ نیشتمانەکەم بگەڕێمەوە ئەمەش لە ڕاستیدا، دیفونی ڕاستی نییە.. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەبەرخاتری من باشترین شتێك کە مرۆڤ بتوانێت بیکات تۆ بۆ منت دروست کردووە. جا لەبەر ئەوە بڕوام وایە لەبەر ئەمانە من تۆم زۆر خۆشدەوێت.

لێم پرسی: ئایا هەست بە نائومێدی دەکەیت؟

وەڵامی دامەوە: نەخێر.. تۆ منت بۆ ئێرە نەهێناوەو هیچ لۆمەیەکیش ناکرێیت‌و لۆمەشت لەسەر نییە، بەڵکو تۆ لە ئاستمدا لەوپەڕی گەورەیی‌و پیاوەتی‌و دەستبڵاویدا بووی لەبەر ئەوە من بە هیچ جۆرێك هەست بە نائومێدی‌و ناخۆشی ناکەم لەم دیفونەدا کە تۆ بۆ منت بنیات ناوە.

وتم: کەواتە من زۆر شادو بەختیارم.

وتی: نافرەتان شتی زۆرو قسەی زۆریان لە مێشکمدا هەژاندووە.

دەربارەی ئەوە کە تۆ شانازیم پێوە دەکەیت‌و دڵڕەق نیت لە ئاستمدا. هەندێکیان پێیان دەوتم، تۆ بە ڕاستی‌و لە کانگای دڵتەوە منت خۆشدەوێت. هەندێکی تریان پێیان دەوتم، تۆ دەتەوێت لەگەڵمدا ڕابوێریت‌و خۆ ئەگەر من نەیەڵم لەگەڵمدا ڕابوێریت ئەوا دەمکوژیت‌و لەناوم دەبەیت..

لێم پرسی: باشە ئەی تۆ بیروڕاو گومانت بەرامبەر من چییە؟

وەڵامی دامەوە: من لەو باوەڕەدام تۆ منت خۆشدەوێت‌و منیش دابونەریتی میللەتەکەی تۆ باش فێربووم‌و تێگەیشتووم.

"مەبەستم ژنهێنانی زۆرە لای ئێوە". بەڵام ئەگەر من شووم پێکردیت، من خۆم وا دادەنێم تەنها یەك مێردم هەیەو لە منیش زیاتر هیچ ژنێکی تری نییە. خۆ ئەگەر ئەمەش گوناهو تاوان بێت. ئەو گوناهو تاوانە ناکەوێتە سەرشانی من، بەڵکو تاوان‌و گوناهەکە تەنها تۆ دەیکەیت‌و دەکەوێتە سەرشانی تۆ.

نالی سۆن لە کاتی قسەکردنەکەیدا تەماشای منی نەدەکرد. چونکە من لەوە دڵنیابووم ئەم قسانەی پێویستی بە سەرنجدان‌و هەوڵدانێکی زۆر هەیە.. هەروەها کاتێك من دەستم خستە سەرشانی‌و دەستم کردە ملی هیچ چاوی هەڵنەبڕی‌و تەماشای نەکردم.

ئەوەندەی نەخایاند لێی پرسیم‌و وتی:

-شازادە ئایا دەتوانم داوای شتێکی ترت لێبکەم؟ ئایا داواکارییەکەم بۆ جێبەجێ دەکەیت؟

وتم: بێگومان.. ئەو داوایە چییە؟

وتی: ماوەیەکی تر ماوەم بدەریّ‌و ڕێم پێبدە با بێمە ئێرەو بە کەسانێکیش شەقام‌و جێگاکانی پێ بڕبکەمەوە کە هەمان جلوبەرگی گوندو شارەکەی منیان لەبەردا بێت. تۆش هەفتەی جارێك وەرە بۆ لام‌و وەك خۆشەویستێکی شەیدا ڕەفتارم لەگەڵدا بکەو لە خۆشەویستیم هەڵێنجە!! وە بە تەواوی ئومێدەکەم بۆ تەواو بکەی. منیش پەیمانت دەدەمێ هەردەم بەوەفا بم بۆت‌و تا تەمەنیشم مابێت لەناو شووورای ئەم دیفونی نوێیەدا بمێنمەوە.

خۆ ئەم داواكارییەم داواكارییەكی هیچو بێ جێو خراپ نییە..؟!! ئینجا ئالی سۆن چاوەكانی هەڵبڕیو تەماشای كردم. بەڵام لەبەر ئەو تەمومژییە زۆرەی بەرچاوی گرتبوو نەمتوانی هیچ لە چاوەكانیدا بخوێنمەوە.!! پاشان وەڵامم دایەوەو وتم:

-من لەو باوەڕەدا نیم ئەم داواكارییەت بە شتێكی هیچو پووچو ناڕەوا دابنێم. جگە لەوە نەبێت، من ناتوانم بە شێوەو ڕێگای ئەفرەنجییەك تۆم خۆشبوێتو شەیدای تۆ بمو ئەو شێوەیەش بە هیچ جۆرێك نازانم.

وتی: من فێرت دەكەم..!!

وتم: باشە، كەواتە پێكەوە بە خۆشیو دۆستایەتی دەژین..

ماوەیەك ئالی سۆن بێدەنگ ڕاوەستا، كتوپڕ وەرگەڕایەوە بە لامداو باوەشی پیاكردمو دەمی بەرزكردەوەو دەمی خستە ناو دەممەوەو لێوەكانمی مژی..!!

هەروەك هەموو شتەكانی تری دیفون ماچەكەی ئالی سۆنیش كە بە شێوەی ئەفرەنجی كردی شتێكی سەیرو خۆشو تازەو ئەفسووناوی بوو.!!

لە ڕاستیدا تەنها هەر ئەو دابونەریتە نوێیەی ئینگلتەرە وڵاتی ئالی سۆن شایانی ئەوە بوو كە مرۆڤ بۆ خۆی وەریگرێتو لێوەی فێرببێت!

* * *

## مردنی جیهانگیر

لەگەڵ هاتنی وەرزی پاییزدا —دیفون-یش بە تەواوی تەواوبوو. خێرا گوندەكەم پڕكرد لەو خەڵكانەی لە سەرمەرقەندا بوون و سپی پێست بوون.

لە شازادە و لە مرۆڤی ئازاد و كۆیلە و لە هەموو توێژ و چینێكەم تێكرد. هەندێ جاریش دەستم لە هەندێ ژن و منداڵ هەڵدەگرت و دەمناردن بۆ دیفون بۆئەوەی خێزان پێكبهێنن و لەگەڵ ئەو داواكارییەی -ئالی سۆن-دا بگونجێت، هیچ هەفتەیەكی نەخایاند شەقامەكەی دیفون پڕبوو لەو كەسانەی پێستیان سوور و سپی بوو یان بە تەواوی سپی بوون وەك ئەفرەنجییەكان جلوبەرگێكیان لەبەركرد هەر لە جلوبەرگی خەڵكانی ئینگلتەرە دەچوو. چونكە ئالی سۆن خۆی نەخشەی جلوبەرگەكانی دەكێشاو بەرگدرووەكانی شانشینەكەی منیش جلوبەرگەكانی بۆ دەدروون و بۆیان ڕێكدەخستن.

هەروەها بە پێی ئەو پەیمان و ڕێکەوتنەمان، منیش کە چووم بۆ سەردانی ئالی سۆن جلوبەرگی سوارچاکێکی ئەفرەنجیم لەبەرکرد. گەرچی ئەو زرێ قورسە کە مرۆڤ لەبەری دەکرد، لەبەر قورسی زرێکە خاوەنەکەی بێزار دەکرد، بەڵام من لەبەرمکرد و دامنەکەند بەم شێوەیە سواری ئەسپەکەم بووم و بە باخچەی کۆشکەکەدا ڕۆیشتم تا گەیشتمە بەر دەروازەی دیفون و لەوێوە چووم بۆ شەقامە تەسکەکەی و بەرەو قەڵا بچووکەکە ڕۆیشتم و لەبەردەرگای قەڵاکەدا پیاوێك بە جلوبەرگی تایبەتییەوە ڕاوەستابوو. ئەسپەکەی لێوەرگرتم و بردمی بۆ هۆڵە سەرەکییەکە، کە ئالی سۆن لەگەڵ کچانی دەستوپێوەندییدا لەو هۆڵەدا دانیشتبوون.

بە عەکسی ئەو ڕووگرژی و مۆنییەم، کاتێك چوومە ناو کۆشکی ژنانی شاری باڵخەوە، دەبوو بۆ ناو ئەم کۆشکە لە کاتی چوونەژوورەوەمدا پێبکەنیمایە. هەندێ لە ژنە دەستوپێوەندەکانی دەرزی کارییان دەکردو خۆیان بە نەخۆشونیگارەوە خەریك کردبوو. هەندێکی تریشیان قاپ و قاچاغیان پڕ لە میوە و شیرینی دەکرد. تەنها یەك ژنیان دانیشتبوو مۆسیقای لێدەدا و بە زمانەکەی ئالی سۆن گۆرانی دەوت. بەڵام شێوەی گۆرانییەکەی زۆر جیاواز بوو لە شێوەی زمانەکەی ئالی سۆن.

ئەو گۆرانییەم زۆر پێ خۆشبوو، گەرچی تەنها لە شتێکی زۆر کەمی وشەکانی دەگەیشتم. ئالی سۆن زۆر بە گەرمی و خۆشحاڵییەوە پێشوازی کردم. و هەر هەموو ئەو ژنانەی لای بوون ئیزنی دان و بەڕێی کردن.

بەرامبەر ئالی سۆن لەسەر کورسییەکی نەرمی جوان دانیشتم.

هیچ ئەوەندەی نەخایاند پێی وتم:

-گەورەم ئەو هاتنەت بۆ لام شتێکی جوان و پیرۆزە..

-ئالی سۆن سوپاست دەکەم، منیش هەردەم حەز بەم جۆرە هاتنە دەکەم و حەزیش دەکەم بێم بۆ لات.

-چاکە.. شازادەی گەورەم منیش بە خۆشییەوە حەزدەکەم گشت کات بتبینم. دوای ئەوە ئالی سۆن هەستا و وەك دابونەریتی ئەفرەنجییەکان و دابونەریتی خۆی دەمی خستە ناو دەممەوە و ماچی کردم. بەو شێوە و ڕێگایە ماچی کردم کە بڕوام وابوو تەنها ڕێگایەکە، خوا پێی خۆشە و ئەگەر خوا بیەوێت مرۆڤ تام و لەزەت لە ماچ ببینێت و پێی مەست و سەرخۆش ببێت. تەنها ئەم جۆرە ماچەیە کە دوو لێوی پیاو لەگەڵ دوو لێوی ژندا بە یەك دەگەن و یەکتر دەمژن و تام و لەزەت لە یەکتر دەبینن. پاشان ئالی سۆن گەڕایەوە دواوە و لە هۆڵە سەرەکییەکەدا لە

بەردەم ئەو کووره گەوره بیانییەدا کە دارەکان لە ناویدا دەسووتا و تەقەتەقیان لێوەدەهات، پێکەوه دانیشتین و بە شادی و ڕووخۆشییەوه پێی وتم:

-شازاده، تۆ مرۆڤێکی جوان و باشیت و هەڵسووکەوتیشت لەگەڵمدا زۆر چاك بووه، لەبەرئەوه من سبەینێ شووت پێدەکەم.

منیش لێمپرسی وتم:

-تۆ خۆت ئەمەت دەوێت و پێت خۆشه.. وا نییه..؟

وتی: بەڵێ شازادەی گەورەم، ئەم گونده بە تەواوی لە دیفون دەچێت.

ئەو شتانەشی کەوا تێیدایه بە تەواوی لەو شتانه دەچێت کەوا لە گوندەکەی مندایه منیش لەو بڕوایەدا نیم هیچ شتێك و هیچ شوێنێکی تر هەبێت بە تەواوی وەکو ئێره لە دیفون بچێت.

وتم: بەڵام تاکو دەتنێرمەوه بۆ ئینگلتەره بۆ وڵاتەکەی خۆت.

-بەڵێ تاکو دەمنێریتەوه بۆ وڵاتەکەی خۆم.

ئەمەی کە وت لەڕاستیدا بڕواشی بەڕاستی قسەکەی من نەبوو.

هەمدیسان لێمپرسییەوه وتم:

-هیچ شتێکی تر ماوه بتەوێت بۆت بکەم..؟

وەڵامی دامەوه:

-بەڵێ.. ئۆبجا..!!

-ئۆبجا..؟ بۆچی..؟

-چونکە ئەو تەنها هاوڕێی منە. ئێمە هەردووکمان وەك یەکین و هەردووکیشمان لە کۆشکی ژناندا چارەڕەش و بێنەواین. چونکە ئەو ڕەشە و منیش سپیم.

منیش ئەوم خۆشدەوێت و وەك دایکێکی میهرەبان وایە بۆ من..

وتم: ئۆبجا.. دایکی ئەمرۆانە..

وتی: من دەمەوێت ئۆبجا لە دیفون لەگەڵ مندا ژیان بەرێتە سەر.

وتم: نەخێر من ناتوانم دەست لە ئۆبجا هەڵبگرم و بتدەمێ.

وتی: من مەبەستم ئەوە نییە ئۆبجام وەك کەنیزەکێك یان کارەکەرێك بدەیتێ. چونکە ئەو بەڕاستی ژنە شازادەیەکە و کۆیلە نییە. چونکە من بیستوومە و دەشزانم ئەو لە بنەماڵەیەکی گەوره و خانەدان بووه..!!

وتم: هەرچۆنێك بێت من ناتوانم وازی لێبێنم و رێی پێبدەم لە کۆشکی ژناندا نەمێنێت. چونکە من هەردەم پێویستم بەوە کە لەو کۆشکەدا بمێنێتەوە. چونکە نۆبجا ژنێکی بە تەربیەتە و رێزی تایبەتی هەیە لای من. بەڵام ناوبەناو دەتوانم وازی لێبێنم و رێی پێبدەم زوو زوو بێت بۆ سەردانت و لات بمێنێتەوە.

وتی: شازادەی گەورە و بەرێزم زۆر سوپاست دەکەم. من داوای زۆر شتم لێکردوویت و زۆریشت بۆ کردووم. ئەوەندە بەسە.

ئالی سۆن لەوە نائومێد بوو کە نۆبجا بچێتە لای و لەسەر ئەوە زۆریشی پێدانەگرت. پاش ماوەی شەومان بە قسە و باس و شتی ترەوە بەسەربرد.

تەنها شتێکی زۆر کەم لە دابونەریتی ژن مارەکردنی رۆژئاواییم دەزانی. چونکە ئالی سۆن بە گەرمی دەیویست ئەم دابونەریتە لە کەنیسە ـنەسطوریـە بچووکەکەی دیفوندا جێبەجێ بکرێت.

ئەم بۆنەیەش ئیتر سنووری دانا بۆ ئەو بەرهەڵستییە بەردەوامەی کە ئالی سۆن بەرامبەرم دەیکرد و منیش بەرامبەر ئەو هەموو دڵرەقی و خۆنەدان بەدەستەوەییەوە خۆم راگرتبوو. ئاوەها چاوەروانی پاداشتی ئەو رۆژەم کرد بۆئەوەی تۆڵەی ئەو نرخە گرانە بکەمەوە کە لە پێناوی ئالی سۆندا خەرجم کردبوو.

رۆژ لە دوای رۆژ پەیوەندیم لەگەڵ ئالی سۆنی شۆخ و شەنگدا باشتر و پتەوتر دەبوو.

دەستم دەهێنا بەو لەشولارە نەرم و شۆخ و شەنگ و ناسکەیدا و تام و چێژم لەو لەشە جوانەی دەبینی. بۆنی عەتری قژە زێرینەکەیم هەڵدەمژی و هەست و نەست و نەفسی خۆمم لێ تێر دەکرد و کاتێکی خۆش و بەتام و ئارامم لەگەڵ جوانترین ئافرەتێکدا بردەسەر، کە بە باشی ناسیم و چاك لێی تێگەیشتم.

لەراستیدا ئالی سۆن جگە لە شازادە دڵشاد یەکەم ژنێك بوو، پێش ئەوەی ببێت بە ژنم و بیبەم بۆ ناو پێخەفی نووستن و رابواردنم، لە ژیانمدا بەراستی بیناسم و بە باشی نێیبگەم.

لەو ماوە زۆرەی رابوردوودا کە لەگەڵ ئالی سۆندا لە دیفون بردمە سەر هیچ کاتێك بە زۆر یان بە شێوەی فەرمان و لەژێر فشارێکی زۆردا نەبوایە ئالی سۆن لەگەڵ ئارەزووی مندا نەبوو.

ئاخری پاداشتی بێبەشبوونەکەم کە لە ئالی سۆنم دەستکەوت تەنها ئالی سۆن خۆی بوو.

لەراستیدا هەروەك نۆبجا پەیمانی پێدام، تەنها ئەو پاداشتە بۆ من بەس بوو.

بەراستی جوانی و سپێتی لەشی ئالی سۆن لە مانگ دەچوو. ئەوکاتەی پێش چەند مانگێك بە روونی بینیم، ئەو جوانییەی لە مێشکمدا چەسپی و هەتاهەتایە لە مێشکمدا ناسرێتەوە و

هەرگیزاو هەرگیز بیرم ناچێتەوە ئێستاش بە گەرمی و ئارەزوویەکی زۆرەوە حەز بە بینینەوەی دەکەم.

کاتێك لەو شەوی زاوایێەدا لەسەر ئەو چەرچەفە ئاوریشمەی سەر جێگای بووکێنیدا پالکەوتبوو لەبەردەم ڕووناکی ئەو تەنها مۆمەدا کە لە ژوورەکەدا دەسووتا و پرتەپرتی دەکرد..

ئەو لەشە ناسك و شەفافەی دەرکەوتبوو. بڕوام بە خۆم نەدەکرد کە بووکەکەم بوونەوەرێکەو مرۆڤێکی ئاساییە وەك ئەم هەمووکەسانە. هەتا بە سەری پەنجەکانم دەستم هێنا بە گەردن و مەمکەکانیدا. و ئەو بیر و خەیاڵە ناڕاستە لە مێشکمدا خاو ئەبۆوە تا بە تەواوی لەشی ئالی سۆن ئەو سۆز و ئارەزووە گەرمەی منی هەڵمژی کە ماوەیەکی زۆر دوور و درێژ بوو چاوەڕوانی تێرخواردنەوە و تێربوونم لێدەکرد.

ئەو شێوە و ڕێگایەی ئالی سۆن لە کاتی ڕابواردن و ئارەزوویدا دەیکرد شتێکی سەیر و سەمەرە و تازە و جوان بوو..!!

منیش خۆم زۆر هەستم بە حەسانەوە و ئارامی دەکرد. هەروەك چۆن هەوایەکی پاك و فێنکی ناو شاخ هەڵمژم وابوو.

کتوپڕ ئیرمیم بە ئەفرەنجییەکان هات کەوا ژنی سوور و سپی و جوان و ناسك و بەسۆزیان هەیە.

ئیتر لەوەوە کەوتمە ژێر کاریگەری دیفون و ئەفسوونی کچە سوور و سپییە جوانەکەیەوە، کە ئەویش ئالی سۆن بوو.

پاش ئەوەی سیفینی ژنی جیهانگیر شازادە موحەمەدی بوو. خێرا گەڕامەوە بۆ شەهری سیبز لەو ماوەیەدا هەموو شتێك بێزار و بێتاقەتی دەکردم ئالی سۆن نەبێت.

خاتوو شێرێزا پێی ڕاگەیاندم، نیازی هانینی کچە شازادەیەکی هەیە بۆ شێخ عومەری بهێنێ منیش ڕەزامەندی خۆم پیشاندا و پێم وت، خۆی سەرپەرشتی ئەم کارە بکات و کاروبار و ڕێ و ڕەسمی پێویست چۆنە خۆی جێبەجێی بکات.

پاشان دەربارەی پاکی و بە حەیا و حورمەتی ژنەکانی میران شا قسەوباسی زۆری بۆ کردم. لەگەڵ ئەوەشدا قایل نەبوو هیچ یەکێك لەو ژنانەی بۆ بهێنێت و بە پێی شەرع ببێتە ژنی و کەسیانی بە شایانی کوڕەکەی نەدەزانی.

لە قسەوباسەکانی بێزار بووم، خەو دەیبردمەوە چونکە لە ئازایەتی و پلەوپایە و جوامێری میران شای لە جەنگ و شەڕ و شۆڕدا دەهێنایە خوارەوە.

لەڕاستیدا میران جەنگاوەرێکی زۆر باش و بەختەوەر و نازاش بوو. شازادە شێرێزا زیاتر توانای میرانی لە بەڕێوەبردن و ڕێکخستنی کاروباری دەوڵەتدا دەردەخست. منیش زۆر گوێم بە قسەکانی نەدەدا و بیرم هەر لە ئالی سۆن دەکردەوە.

خاتوون لەوە گەیشت، من بایەخ بە قسەکانی نادەم و گوێی لێناگرم. ئیتر هەندێ تێبینی گاڵتەجاڕی دەربارەی ژنانی سوور و سپی و دەربارەی منداڵەکانیان دەبڕی و بە گاڵتەپێکردنەوە باسی کردن.

بەڵام دڵشاد وەك خووی خۆی لە سەرخۆ و هێمن و چاك بوو، بە باشی بیری لە شت دەکردەوە و، منیش هەندێ کات لەگەڵیدا دادەنیشتم و لەگەڵیدا ڕادەبوارد و دەستبازیم لەگەڵدا دەکرد و خۆشەویستی خۆمم بۆ دەردەبڕی.

زۆرجاریش لای دادەنیشتم و دەربارەی حاڵ و ژیانی شاهڕووخ قسە و گفتوگۆمان دەکرد. و دەربارەی چۆنێتی ژیانی ئەو منداڵانەم کە لە کەنیزەك و ژنەکانی ترم هەمبوو کە ژمارەیان گەیشتبووە سەد منداڵ قسەمان دەکرد.

چونکە شازادە دڵشاد گەورە و سەرداری کۆشکەکەم بوو. هەر ئەویش بوو سەرپەرشتی پەروەردە و پێگەیاندنی کوڕەکانمی دەکرد. هەتا تەمەنیان دەگەیشتە ئەو کاتەی بە کەڵکی سەربازی بێن.

لەگەڵ ئەوەشدا دڵشاد لە ڕابوردووشدا هەڵسوکەوتی زۆر باش بوو لەگەڵ ئەلجایدا. بەڵام هێشتا نەیتوانی لەو ئەفسوونە سەیرەی ئالی سۆن قوتارم بکات، ئەو ماوەیەی لەگەڵ ئالی سۆندا بردمە سەر مانگ و ڕۆژ زۆر بە خێرایی تێپەڕی دەکرد.

لەو ماوەیەی لەگەڵ ئالی سۆندا بووم. بەو بیروڕا و کردەوە شارەزاییەی خۆی بە تەواوی سەمەرقەندی لە پێش چاومدا فەرامۆش کردبوو.

ئەو هەموو گۆڕانکارییە تەورەیەی لە شارەکەدا دەکرا. بە تەواوی هەر هەمووی لە پێش چاومدا شاردبوویەوە و هەستم پێنەدەکرد.

لەو ماوەیەشدا پایتەختەکەم بە تەواوی ژیابۆوە و پێشکەوتبوو. ببووە شارێك جمەی دەهات لە بازاڕ و قەیسەری و دووکان و خانی گەورە گەورە و مەیخانە و شوێنە گشتییەکانیش لە جموجووڵ و هاتوچۆکەرانی خەڵکی ژاوەی دەهات و ڕێ بەر ڕێبواران نەدەکەوت.

خەڵکی لە هەموو لایەکیدا بە خۆشی و شادی دەژیان و لە هیچیان کەم نەبوو. هەتا وای لێهاتبوو دراوسێ چاوچنۆکەکانم ئیرەییان پێدەبردین و ناوبەناو هێرشیان دەکردە سەر سنووری وڵاتەکەم.

هەر کە سکی ئالی سۆن بەرز بۆوە و گەورە بوو. منیش لە پێخەفە نووستنە نەرم و نۆڵەکەم راپەڕیم و گەڕامەوە سەر زینی پشتی ئەسپەکەم.

واتە گەڕامەوە بۆ سەر خودی خۆم و گەڕامەوە بۆ سەر ڕێگای پێشووی خۆم.!!

لەبەرئەوەی جاکۆ سەرۆکی دیوان بوو. ئاگاداری هەموو کاروبار و شتێکی دەوڵەت بوو. هەر که منی بینی هۆشم هاتۆتەوە بە خۆمدا زۆر بە بڕوا و ڕاشکاوییەوە ددانەکانی جیڕ کردەوە و پێی ڕاگەیاندم یەکەم جار لە پێش هەموو شتێکدا چی بکەم..

منیش خێرا نامەم نارد بۆ هەموو سەرکردە و ئەفسەرەکانم بانگهێشتم کردن و خۆم بۆ جەنگ ئامادە کرد..!!

هەمدیسان گەڕامەوە بۆ شەهری سیبز بۆ ئەوەی هێز کۆبکەمەوە و هەموو جەنگاوەر و لایەنگرانم یەك بخەمەوە و ئامادەیان بکەمەوە بۆ جەنگ.

دووبارە ڕوومکردەوە کۆشکی سپی بۆئەوەی سەرلەنوێ ئەو هەست و نەستە سەیرە تێبگەم کە باڵی کێشابوو بەسەر کۆشکەکەی جیهانگیر و سیفیندا.

لە ژووری نووستندا کە کاتی خۆی لەگەڵ ئەلجای و دڵشادا پێکەوە بە خۆشی و شادی تێیدا ژیاین. ئا لەو ژوورەدا سیفین نەخۆش بوو. دووبارە سکی بە منداڵێکی تر پڕ بوو.

ژوورەکەی زۆر سەیر تێکدابوو. هەرچی پێداویست و ڕاخەری ژوورەکە هەبوون بە شێوەیەکی تر ڕێکوپێکی کردبوو. هەر کە تەماشای شازادە بچکۆلەکە موحەمەدم کرد کە لەناو بێشکەکەیدا ڕاکشابوو.

سیفین لەسەر جێگەکەیەوە تەماشای کردم و لێی پرسیم وتی:

-گەورە و بەڕێزم ئایا شازادە بچکۆلەکە لە جیهانگیر ناچێت؟

وتم: بەڵێ.. و نەخێر..!!

وتی: تەیمووری گەورەم.. بەڵێ.. و .. نەخێر وەڵامێکی ڕاست نییە..

وتم: بەڵێ.. دەم و چەناگەی لە دەم و چەناگەی جیهانگیر دەچێت. بەڵام چاوەکانی و نێوچەوانی.. نەخێر..

وتی: ئا ئەوەم لا باشە چونکە من دەم و چەناگەی جیهانگیرم خۆشدەوێت.

ئینجا تەماشایەکی شازادە بچکۆلەکەم کرد کە قژلە جوانەکانی لەژێر ئەو قوماشەدا کە پیایدا درابوو وەك زێڕ دەرکەوتبوو. قژە گەنم ڕەنگییە جوانەکەشی بە دەوری دەم و چاویدا چوارچێوەیەکی زێڕینی جوانی پەخش کردبۆوە و بەسەر ئەو جێگا سەوزەدا کە لەسەری پاڵکەوتبوو، وە لە ڕەنگی چاوەکانی دەچوو بڵاوببۆوە. پاشان پێم وت:

-چاوەکانی هەر لە چاوەکانی تۆ دەچێت و نێوچەوانیشی هەر لە تۆ دەچێت..

ئا من زۆر بە جەخت نیم چونکە چاوەکانی لای من شتێکی نامۆ نییە..!!

سیفین دەستیکرد بە پێکەنین و بە بڕوا و دڵنیاییەوە وەڵامی دامەوە:

-گەورەم چاوەکانی هەر لە چاوەکانی تۆ دەچێت..

لەم کاتەدا جیهانگیریش قسەی خۆی تێکەڵ قسەکانمان کرد و وتی:

-بەڵێ باوکە چاوەکانی هەر لە چاوی تۆ دەچێت، ئێمە لەم بارەیەوە زۆر قسەمان کردووە، چاوەکانی بە تەواوی لە چاوی تۆ دەچێت.

وتم: جیهانگیر کەواتە چاوەکانی جوانە.. وا نییە..؟

ڕەنگە ئێستا لەم کاتەدا گەش نەبێت، بەڵام دوو چاوی جوانی پێوەیە..

وتی: باوکە ئێستا نابێت کەس دەستی تێوەبدات..

وتم: بۆچی؟!!

وتی: نازانم تەنها ئەوەی دەیزانم ئەوەیە نابێت کەس دەستی تێوەبدات.

منیش بۆئەوەی ئەو دڵەڕاوکێ و ناکۆکییە لە نێوانیاندا کەم بکەمەوە.. وتم:

-من دەمەوێت کوڕێکی تری وەك ئەمەتان ببێت، بۆئەوەی لە کاتی پیریمدا بمپارێزێت.

خێرا سیفین وەڵامی دامەوە وتی:

-گەورەم کوڕێکی ترت بۆ بەرهەم دەهێنم هەر بە تەواوی لەمە بچێت بۆ کاتی پیرێتیت.

بەڵام بە هیچ جۆرێك ئاماژەی نەکرد کە لە پاشەڕۆژدا دەمپارێزێت.

ئا لەم کاتەدا هەستم کرد شازادە سیفین قینی لێمە و خۆشی ناوێم..

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەستم بە دڵنیایی کرد، کاتێك بیرم کردەوە ئەم قینەی لە من یارمەتی ئەوەی دەدات ئەو ئەفسوونەی سیفین لە جیهانگیری کردووە و بەو هۆیەوە خستوویەتییە ژێر داوی خۆیەوە لە دواییدا دەڕەوێتەوە و نایمێنێت.

منیش چاك دەمزانی جیهانگیر منی زۆر خۆشدەوێت.

ئیتر دوای ئەوە تەماشای کردم و پێی وتم:

باوکە وا چاکترە بڕۆینەوە بۆ هۆڵی میوانداری.

منیش سەری ڕەزامەندیم بۆ ڕاوەشاند و بە سیفینم وت:

زۆرچاکە.. خۆشەویستەکەم شەوێکی شاد..

سیفین وەڵامی دامەوە:

-شەوی تۆش شاد بێت باوکی بەڕێز و گەورەم تەیموور.

کاتێك گەڕامەوە بۆ هۆڵە گەورەکە و ئەو هەموو دەموچاوەم بینییەوە کە لە زۆر جەنگ و کوشتاردا هاوبەشیان لەگەڵدا کردبووم.

ئیتر کاروباری تایبەتی جیهانگیرم لە مێشکی خۆمدا لادا و هەموو گرنگییەکم دا بە کێشە و کاروباری جەنگ و پلانی سەربازی.

هەرچی سەردار و شازادەیەکم هەبوو هەر هەموویان بە دەنگ بانگەوازەکەمەوە هاتن. لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا هەفتا هەزار سەرباز و جەنگاوەریان کۆکردەوە. کاتێك ئەو ڕۆژە هات کە دەستنیشانم کرد بۆ ڕۆیشتنی لە شەهری سیبز گەورەترین و باشترین سوپام هەبوو لە هەموو ئاسیادا.

هەمدیسان کاروباری جیهانگیر لە مێشکمدا خولقایەوە، لە درەنگانێکی شەودا جیهانگیر هاتە ناو چادرەکەمەوە. چونکە منیش لەمەوپێش نووستبووم و بەخەبەربووم لە ژووری نووستنەکەمدا پێشوازیم کرد.

جیهانگیر دەستی بە قسەکردن کرد و پێی وتم:

-باوکە.. سوپاکەت، سوپایەکی زۆر بەهێزە و ژمارەیەکی زۆریش ئەفسەری بەتوانات هەیە.. ئایا لێم دلگیر نابیت ئەگەر من لێرە بمێنمەوە و لەگەڵ سوپاکەتدا نەیەم..؟!!

وتم: بۆچی.. کوڕم..؟ ئایا نەخۆشیت..؟

وتی: نەخێر.. باوکە.. لەبەرئەوە نییە، بەڵکو لەبەر منداڵە بچکۆلەکە -ئەمیر موحەمەد- و لەبەر سیفین ئا لەبەرئەوەیە من دەمەوێت نەڕۆم و زۆریش دەترسم..

وتم: دەترسیت..؟!

وتی: نەخێر.. لەوە ناترسم بڕۆم بۆ شەڕ.. بەڵکو لەوە دەترسم سیفین و منداڵەکان بە تەنها جێبهێڵم.

تۆزێك بیرم کردەوە، حەزیشم نەدەکرد ئەفسەرەکانم وا تێبگەن من کوڕێکی نەرم و لاواز و بێدەستەڵاتی وام هەیە..

بەڵام هەموو جەنگاوەران و ئەفسەرەکان پێش ئەوەی ژن بهێنێت ئازایەتی و نەترسی ئەویان بینیبوو..

خۆ ئەگەر بێت و دوای خۆمان بێ هۆ جێمان هێشت و لەگەڵ خۆماندا نەمانبرد. ئەوە ئەو کاتە دەبێتە هۆی ئەوەی زۆر قسە و باس و بەند و بالۆرەمان بۆ دروستبکات و ئەو کاتەش ڕوونکردنەوەی ئەم کارە بۆ من دەبێتە شتێکی قورس و گران و نابەجێ..

دوای ئەوە تەماشایەکی جیهانگیرم کرد و پێم وت:

-کوڕم زۆر چاکە.. من سەرپەرشتی و سەرەوکارێتی شاری سەمەرقەند دەدەمە دەست تۆ و جاکۆ و سەیفەددین لە ڕاستیشدا ئەوان پێویستیان بە یەکێکی لاو هەیە بۆ هەڵسووڕاندنی کاروباری وڵات.

تۆش خۆت دەتوانیت زۆر شت لە جاکۆ و سەیفەددینی پیرەمێردەوە فێرببیت ئەگەر گوێیان لێبگریت و سوودیان لێببینیت.

بەڵێ.. پێویستە تۆ بچیت بۆ سەمەرقەند و خۆت ئامادە بکەیت بۆئەوەی کاتێك من گەڕامەوە کاروباری فەرمانڕەوایی حکومەتی ئۆرغانج بگریتە دەست.

وتی: بەڵێ.. باوکە.. سیفینیش هەر ئەوەی دەوێت..

وتم: بەڵێ من لەوە دڵنیام ئەویش هەر ئەوەی دەوێت.

باشە.. کوڕم ئەوا کێشەکەت حەل کرا.

ئینجا جیهانگیرم ئیزن دا و چوومە ناو نوێنەکانمەوە وام دانا کە بەم شێوەیە حەلی کێشەکە دەکەم و سەردار و شازادەکانیشم بەم شێوەیە قایل دەبن و بڕوا دەکەن.

جیهانگیریش گەیشتبووە تەمەنێك کە شایانی ئەوە بێت بەرپرسیاری گەورە و گرانی پێ بسپێردرێت.

شێخ عومەر و میران شاش هەریەکەیان تەمەنیان گەیشتبووە نۆزدە ساڵ و هەریەکەیان فەرمانداری فەوجێکی تایبەتییان گرتە ئەستۆ. پاش هەفتەیەك بۆ ئەو هەڵمەتە دوور و درێژەمان بەرەو باشوور و ڕۆژئاوا کەوتینەڕێ.

سەرەتا بەرەو ڕۆژهەڵات کەوتەڕێ و ڕووم کردە -باداکشان- و -کوندوز- و -کابوول- و هەرچی هۆزە بچووکەکان بوو لەناوم بردن، یان مەجبوورم کردن بێنە ژێر فەرمانی منەوە و لەو شوێن و جێگایانەی هەرا و هوریا و ئاژاوە و ئاکۆکیان نابۆوە هەڵمکەندن و نەمهێشتن.

پاشان بەرەو باشووری دەریای قەزوین كشام بۆئەوەی گەمارۆی دەوری شاری تەبرێز بدەم، لەو شوێنەوە كە ڕێگای خۆراسان دەبێت بە دوو ڕێگاوە، یەكێكیان بەرەو باشوور بۆ بەغداد و دیمەشق و ئەستەنبوولْ دەچێت.

شاری تەبرێز ئەوكاتە شارێكی زۆر گەورە بوو. ژمارەی دانیشتوانی زیاد لە ملیۆنێك كەس دەبوو. ناوەندێكی گرنگی بازرگانی بوو.

ئاوەها گەمارۆی ئەم شارە بە درێژایی كەژی زستانی خایاند..

لە ماوەی ئەو هەڵمەتەمدا سوپاكەم زۆر زیادی كرد و ژمارەی سەربازەكانم گەیشتە زیاتر لە سەد هەزار سەرباز. لەبەرئەوە من دڵنیابووم و هیچ شك و گومانێكم نەبوو كە ئەم گەمارۆیە بەرهەمێكی چاكی دەبێت. گەرچی فەرمانڕەوای شارەكە داوای یارمەتی و كۆمەكی لە سوڵتانی میرنشینەكانی قاهیرە كرد و هەروەها داوای كۆمەك و یارمەتیشی لە سوڵتانی بەغداد كرد.

بەڵام ئەو دوو سوڵتانە منیان بەدەست درێژكەر و داگیركەرێكی بیابانی دادەنا و هیچ ترسێكیان لێم نەبوو كە هەڕەشە لە فەرمانڕەوایی و سەربەخۆییان بكات. لەبەرئەوە هیچ جۆرە یارمەتییەكیان بۆ فەرمانڕەوای تەبرێز نەنارد.

لە سەرەتادا سوپاكەم هاوار و گازاندەی كەمی ئازووقەیان بوو. بەڵام كاتێك دەستم گرت بەسەر ئەو هەموو كاروانانەدا كە دەیانویست بچن بۆ شارەكە و هەندێ جاریش هێرشم دەكردە سەر ئەو ناوچە ئاوەدانە نزیكانە و دەستم دەگرت بەسەر ئازووقەو دانەوێڵە و شتوومەكەكانیاندا و ئیتر ئەو كاتە توانیم ئازووقەی تەواو بۆ لەشكرەكەم دابین بكەم.

لەسەر ئەمەشەوە هەندێ بازرگانی قاچاخچی ناو شارەكە بەردەوام بە ڕێگای قاچاخدا زۆرێكی زۆر ئازووقە و خواردنیان بۆ دەهێنام.

ورده ورده شارەكه بێ هێز بوو. تەن و تواناى نەما، خواردن و ئازووقەی كەم بۆوە. ئینجا شانە و كۆمەڵەكانی لینغ كۆبیغی یش لەناو شاردا دەستیانكرد بە تێكدانی ئامێرە جەنگییە بەرهەڵستییەكان و شارەكە خۆی دا بە دەستەوە.

لە سەرەتای كەژی بەهاردا من لەناو شاری تەبرێزدا ڕۆخی دەریای قەزوێن كەوتمەڕێ و بەرەو شاری تەفلیس ڕۆیشتم و لە ماوەی سێ ڕۆژدا شاری تەفلیس كەوتە ژێر دەستمەوە.پاشان بەرەو جۆرجیا و ئەستراخان كەوتمەڕێ و لەوێوە بۆ شاری سەرای كە ئەم شارە پایتەختی ئەو نەتەوانە بوو كە لە دەوروبەری ڕووباری ڤۆلگادا نیشتەجێ ببوون.

بەڵام پێش ئەوەی بگەمە سەرای هەواڵم پێگەیشت کە قەمەرەدین سەرکردەی بەتوانا و بەهێزی مەغۆلییەکان بە هێز و لەشکرەکەیەوە لە -ئالمالیک-ەوە بەرەو سەمەرقەند کشاوە و نیازی داگیرکردنێتی.

جا لەبەرئەوە منیش دیاری نایاب و گرانبەهام نارد بۆ ئۆرۆس خانی شاهێنشای ئەو نەتەوانەی لەسەر رووباری فولگادا نیشتەجێ ببوون.

بە نزیک پایتەختەکەیدا ڕەت بووم و لە جیاتی ئەوەی لەگەڵ ئەو شایەدا خۆم بخەمە ناو گێژاوی شەڕێکی خەتەرناکەوە.. پێمڕاگەیاند و دڵنیام کرد، من بەم ڕێگایەدا دەڕۆم بۆئەوەی بەرهەڵستی سەرکردەی مەغۆلی قەمەرەدین بکەمەوە.

بەرەو ئوترار ڕۆیشتم و لەوێدا چادری زۆرم هەڵدا بۆئەوەی سوپاکەم ڕێکبخەمەوە و سەرکردە و شازادەیان بۆ دابنێم.

لەبەرئەوەی جەژنی سەری ساڵی نوێ نزیک ببۆوە. بانگهێشتن و نامەم نارد بۆ ئەو سەردار و شازادانەی لە دوای خۆم جێمهێشتبوون و داوام لێکردن لە بریتی ئەوەی لە سەمەرقەند کۆببنەوە با بێن لە ئوترار کۆببنەوە.

جاکۆ و سەیفەددینیش لە پایتەختەوە هاتن. بەڵام جیهانگیر نەهات!! هەردوو پیرەمێرد " جاکۆ تەمەنی لە شەست ساڵ تێپەڕیبوو، بەڵام سەیفەددین تەمەنی گەیشتبووە حەفتا ساڵان" هاتن بۆ لام بۆ ناو ئەو چادرە ئاوریشمە نوێیەم کە لەمەوپێش چادری وەهایان نەدیبوو.

هەر کە لەسەر ئەو دوو جێگایەی بۆیان ئامادە کرابوو دانیشتن، لێم پرسین وتم:

-دەنگوباس و هەواڵی سەمەرقەند چییە..؟

سەیفەددین وەڵامی دامەوە وتی:

-خێزانەکەت لە زیادبووندایە، ئەوەتا شازادە سیفینی ژنی جیهانگیر کوڕێکی تری بووە و ناویان ناوە موحەممەد سوڵتان و خاتوو ئالی سۆنیش کوڕێکی بۆت بووە.

کتوپڕ تێگەیشتم کە سەیفەددین بۆچی لە پێشدا ناوی جیهانگیری هێنا چونکە سەیفەددین و جیهانگیر یەکتریان زۆر خۆشدەویست و سەیفەددین هێندەی منداڵەکانی خۆی جیهانگیری خۆشدەویست.

بەڵام من ویستم سەرنجی سەیفەددین بۆ لای ئەو خۆشەویستییەی ڕابکێشم:

بە ڕێز و خۆشەویستییەوە لێم پرسی:

-باشە ئالی سۆن کوڕەکەی ناوناوە چی..؟

وتی: بوەستە با تۆزێك بیربكەمەوە..

وتم: بۆچی..؟ ئایا ناوەكەی نازانیت..؟

وتی: بەڵێ.. ناوەكەی.. ئا ناوی ناوە جۆن بیستر..!!

وتم: جۆن بیستر..؟!! كەواتە وەك نەصرانییەك ناوی ناوە و كردوویەتی بە مەسیحی، بێگومان ئەمە كاری ئەوە..

ئاوەها ئەمە یەكەم كوڕم بوو كە ببێت بە مەسیحی و غەیرە دین.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تووڕە نەبووم و زۆریشم پێخۆش بوو. چونكە من خۆم ئارەزووم لێبوو حەزیشم دەكرد گەورە ببێت و ببێتە مرۆڤێكی نەصرانی، ڕەنگە لە پاشەڕۆژدا ببێتە پیاوێكی بەتوانا و فەرمانڕەوایەكی باش و گونجاو بۆ ئەفرەنجییەكان. كاتێك ئەو ڕۆژە دێت و بەرەو وڵاتی ڕۆژئاوا دەكشێم و ئەو وڵاتە داگیردەكەم و دەیكەمە فەرمانڕەوایان.

ئەو هەواڵە ئەزۆكانەی ئەو دوو شازادەیە -جاكۆ و سەیفەددین- دەیاندا و بە ئەنقەست خۆیان لە باسكردنی جیهانگیر دووردەخستەوە هیچ بیر و هۆشمیان نەگۆڕی دەربارەی جیهانگیر، بەڵكو بە عەكسەوە وای لێكردم و دەمویست زیاتر شتێك لە دەنگوباس و هەواڵی بزانم.

لەبەرئەوە لێم پرسین وتم:

-باشە.. جیهانگیر بۆچی لەگەڵ ئێوەدا نەهات..؟

ئەو دوو پیرەمێردە بە پەشۆكاوی و تەماشاكردنێكی سەیرەوە تەماشای یەكتریان كرد! پاش تۆزێك بێدەنگی.. جاكۆ وەڵامی دامەوە وتی:

-ناتوانین هەموو بە یەكجاری سەمەرقەند جێبهێڵین. خۆ دەبێت بە لایەنی كەمەوە بۆ بەڕێوەبردنی كاروباری دەوڵەت یەكێكی تیابمێنێتەوە.

سەیفەددینیش وتی:

-هەروەها دوو منداڵی بچووكیشی هەیە و.. دەشیویست لەگەڵماندا بێت بەڵام ئێمە..

جاكۆ نەیهێشت قسەكانی تەواو بكات. خێرا وتی:

-بەڵام ئێمە نەمانهێشت لەگەڵماندا بێت..

لەسەرخۆ و بە هێواشی وەڵامم دانەوە وتم:

-من هیچ شك و گومانێكم لە قسەكانی ئێوە نییە.. بەڵام حەزم دەكرد بیبینم..

سەیفەددین سەری جووڵاند و وتی:

-بێگومان تۆ هەر دەیبینیت..

بەڵام من لە دڵی خۆمدا قەناعەتم بە قسەی ئەو دوو پیاوە پەیدا نەکرد..!!

خیتای کە لە هیراتەوە بانگم کردبوو. لە باکووردا کردبووم بە یاریدەدەری خۆم. کردم بە فەرمانداری فەوجەکەی میران شا، چونکە ئێش و ئازارەکەی سەری لێی هەڵدابۆوە و ئازاری زۆری هەبوو. لەبەرئەوە لەگەڵ سەیفەددین و جاکۆدا ناردمەوە بۆ سەمەرقەند.

شێخ عومەریشم لە ئوترار هێشتەوە لەگەڵ هێزێکی تەواودا بۆئەوەی لە کاتی پێویستدا بەرهەڵستی -تۆرۆس خان- بکات. شاهێنشای ئەو نەتەوانەی لە ڕۆخی دەریای -فولگا- دا نیشتەجێ بوون.

فەرمانم پێدا ئەگەر زۆر پێویست نەبوو. وە تۆرۆس خان نەیویست هێرش بکاتە سەر سەمەرقەند بە هیچ جۆرێك شەڕی لەگەڵدا نەکات.

کاتێك لە ڕووباری -سەرداریا- پەڕیمەوە و بەرەو زەوییە چۆڵەوانییەکەی کیرغیزیا کەوتمەڕێ. ئەوکاتە سوپایەکم لەگەڵدا بوو، ژمارەیان پەنجا هەزار کەس زیاتر بوو. کاروانی ئازووقە و عەرەبانەی گەورە هەموو جۆرە ئاژەڵێکی بارهەڵگر و هێستر و بارگیری عەرەبانە ڕاکێشانم لەگەڵدا بوو.

ماوەی هەفتەیەکی تەواو بە ڕێگادا ڕۆیشتم بێ ئەوەی هیچ جۆرە بەرەنگاری و بەرهەڵستییەك بەرەو ڕوومان ببێتەوە.

خۆ ئەگەر ڕێکەوت بەرەنگاری دەورییەك یان هۆزێك ببوومایەوە. لە ماوەی چاوتروکاندنێکدا تێك و پێکم دەدان و لەناوم دەبردن.

کاتێك گەیشتمە دەریاچەی بەلکاش، تێگەیشتم قەمەرەدین لەبەرامبەرمدا خۆی ڕاناگرێت و دەستی کردووە بە کشانەوە. مەبەستی لەمەیان بۆ ئەوەیە لە ئالمالیکدا خۆی قایم بکات یان دەیەوێت ڕامبکێشێتە ناو بیابانی باشوور و لەوێدا بمخلافێنێت و بمهێڵێتەوە تا وەرزی زستان بەسەردا دێت و بەفروباران دەست بە بارین بکات.

لەبەرئەوەی دەمزانی چ مەترسییەك تووشم دەبێت ئەگەر قەمەرەدین ڕامبکێشێتە ناو بیابانەکە و لەوێدا بمێنمەوە.

ئیتر منیش بێ ڕاوەستان بەرەو ئالمالیك کشام و هیچ بۆی نەوەستام. هەر کە بۆم ئاشکرا بوو ئەو هێزەی بەرگری لە شارەکە دەکات هێزێکی کەمە، نووڕەدینم لە دەوروبەری شارەکەدا جێهێشت بۆئەوەی داگیری بکات.

خۆشم خێرا دوای ئەو هێزە کەوتم کە لەگەڵ قەمەرەدیندا بوو.

چونکـه مـن دەمویسـت قەمـەرەدین تێکوپێـك بـدەم و لـەناوی بـەرم. تەنـها بـە دەستبەسەرداگرتنی پایتەختەکەی قایل نەدەبووم.

ئاوەها بەردەوام سوپاکەم بەرەو پێشەوە کشا، هەتا لەو ڕێگایەی باکووردا کە دەچوو بۆ چین بـەرەنگاری قەمـەرەدین بوومـەوە. کاتێك تێگەیشتم سوپاکەی قەمـەرەدین لـە بیست هـەزار کەس زیاتر نییە، لەشکرەکەی خۆم کرد بە سێ تیپی گەورەوە.

خیتـایم کـرد بـە سەرکردەی تیپێکیـان و داودیشم کـرد بـە سـەرکردەی تیپەکـەی تریـان، و خۆشم سەرکردایەتی تیپی سێیەمم کرد.

داوام لە داود و خیتای کرد بە تیپەکانیانەوە لە ڕاست و چەپەوە گەمارۆی سـوپاکەی بـدەن و ڕێگای هەڵاتن لە قەمەرەدین بگرن.

پاش شـەڕ و کوشتارێکی پچڕپچڕ کە ماوەی سێ ڕۆژی خایـاند قەمـەرەدینم تـەنگاو کـرد و مەجبوور بوو شەڕ ڕابگرێت.

بە شێوەیەك شکاندم و لەشکرەکەیم تێکوپێك دا هـەر وێنـەی نـەبوو. ئـەوەی کـوژرا، کوژرا، ئەوەشی مابوو خۆیان دا بەدەستەوە.

لەبەرئـەوە مـن پێویستی زۆرم بـە ئـاژەڵ و ئەسپ و ئازووقـە زۆرەکـەی قەمـەرەدین هـەبوو، هیچ هۆیـەکی گواستنەوەشـم نـەبوو. بۆئـەوەی دیلـەکانی پێبگوێزمـەوە. لەبەرئـەوە ئـەو دیلانـەم لەگـەڵ خۆمـدا نەهێنایـەوە. بـەڵکو چـەند سـەد کەسـێك لـە باشـترین و جوانـترین ژنـەکانی قەمەرەدینم هەڵبژارد و ئیتر هەرچی بەند و دیلێکی تریان هەبوون هەر هـەموویانم بـە شمشێر لە مل دا و کوشتمن و لەناوم بردن.

هەر کە زانیم سنووری باکووری وڵاتەکەم لە هێمنی و ئاسایشدایە و هیچ داگیرکەر و چەتە و پیاوخراپێکی تێدا نەماوە. حەزم کرد تۆزێك پشوو بدەم و تۆزێك ماوە بـدەم بـە سـوپاکەم لـەو شەڕ و کوشتار و ڕۆیشتنە بەردەوامەی بحەسێتەوە و ماندوێتییان دەرچێت.

هـەر دوای ئـەوە خێرا بڕیـاری گەڕانـەوەم بۆ سـەمەرقەند دا. پێـش ئـەوەی کـەژی زسـتان بەسـەردا بێـت و سـەرما و سۆڵە بەسـەردا بێـت. چونکـە تێگەیشـتم شـوورایەکی پۆڵایینـم بـە چواردەوری وڵاتەکـەمدا کێشـاوە و لـە دەسـتدرێژی هـەموو چـاوچنۆك و دەسـتدرێژکەران دەمپارێزێت.

یەکەم کاری پێویستی سەرشانم ئەوە بوو لەناو وڵاتەکەمدا ئەمن و ئاسایش بەرقەرار بکەم.

بەو بڕیارەوە سواری پشتی ئەسپەکەم -کونك ئۆغلان- بووم.

ئەو ئەسپە ڕەش و سپییە بەهێزەی لە جیاتی ئەسپەکەی پێشووم -ئاك ڕۆكش- هەڵمبژاردبوو، چونکە ئاك ڕۆكش پیر و پەككەوتە ببوو.

ڕۆژ لە کاتی خۆرنشیندا بوو کاتێك من لە سێبەری چیای -ئاماسار- هاتمە دەرێ و سەمەرقەندم بینی لەژێر تیشکی زێڕینی شەفەقی خۆرئاوادا دەدرەوشایەوە.

هەر ئەوکاتە جاکۆ و سەیفەددین لەگەڵ پاسەوانانی کۆشکدا بۆ پێشوازیم ڕاوەستابوون. سەرنجمدان هیچ کەسێکیان جلە ئاوریشمە تایبەتییەکانی تیپی شینیان لەبەردا نەبوو. بەڵکو گشتیان جلی ڕەشیان پۆشیبوو..!! بەبێ دەنگ لەسەر پشتی ئەسپەکانیان هاتبوونە خوارێ و بە خەمبارییەوە ڕاوەستابوون، سەیفەددین بەرەو پیرم هات و بە خەمباری و ماتەمینییەوە سەری داخستبوو. بە هێواشی هاتە پێشەوە و دەستی خستە سەر قەڵبۆزی زینەکەم..!! منیش لەم کارەیان سەرم سووڕما و تێنەگەیشتم. بە ترس و نائارامییەوە لێم پرسی وتم:

-پیرەمێرد چی ڕوویداوە؟ بڵێ چییە تۆ دەترسێت؟!

وتی: سەرداری گەورە و بەڕێزم من ناترسم، بەڵکو لەبەر خەم و پەژارە سەرم داخستووە..!! چونکە شازادە جیهانگیر مردووە..!!

وتم: مرد..!!؟ بە ڕاستیتە، بەڕاستی جیهانگیر مرد..؟!! کەی مرد..؟!! بۆچی لەمەوپێش کەس پێی نەوتووم..؟!!

وتی: سەرداری بەڕێز، دوو ڕۆژ لەمەوپێش کۆچی دوایی کرد، پێش مردنی زۆر سوێندی داین، خەبەرت نەدەینێ و لە هەڵمەتەکەتدا بۆ سەر ناوچەی باکوور بێزار و شپرزەت نەکەین.

ئیتر منیش لەسەر پشتی ئەسپەکەم هاتمە خوارێ و لە ماوەی چرکەیەکدا ئەم هەواڵە بەناو هەموو کاروانی سوپاکەمدا بڵاوبۆوە.

هەر هەموو سەرباز و پیاوەکانم وەك من بە ماتەمی و خەمبارییەوە لەسەر پشتی ئەسپەکانیان دابەزین.

تیپی مۆسیقا و شەیپوورەکانیشم خێرا گشتیان تیپێکی گەورەیان پێکهێنا و لە پێشمانەوە ئاوازی ماتەمینیان لێدا و کەوتنەڕێ.

منیش بە پێ بە شەلەشەل لغاوی ئەسپەکەم گرت بە دەستەوە و هەر هەموو سەرباز و ئەفسەر و سەرکردە و شازادە و پاسەوانانم هەموو بە پێ لە دوامەوە بەرەو دەروازەکانی شار و کۆشك کەوتینەڕێ.

بۆ ڕۆژی دوایی ئەسپەکەی جیهانگیر بە زینێکی بەتاڵەوە، کە کەسی بەسەرەوە نەبوو، پێش جەنازەی خاوەنەکەی کەوت و بەرەو شەهری سیبز بە خەمباری و ماتەمینییەوە کشا.

تا لەوێدا لە پێش کۆشکی سپیدا، لەو شوێنەی کە جیهانگیری تیا لەدایك بوو. تیروکەوان و شمشێر و تەپڵەکانیان گشت شکاند و پارچەپارچەیان کرد و شەیپوورەکەی بۆ هەتاهەتایە بێدەنگ بوو.

پاش ئەوەی ئیمامی پیرەمێرد بە خەمباری و پەژارەو لەرزەلەرزەوە تەلقینی دادا و هەندێ ئایەتی قورئانی پیرۆزی لەسەر لاشەکەی خوێندەوە و ڕێ و ڕەسمی ئاینی تەواو کرد.

هەندێك سەرباز بە ماتەمینییەوە لاشەی کوڕە گەورەکەمیان لەو مەزارەدا ناشت کە چەند هەنگاوێك لە مەزارە مەرمەڕە سپییەکەی ئەلجای دایکییەوە دوور بوو.

* * *

## پلانێك بۆ گرتنی چین

پاش ناشتنی تەرمی جیهانگیر و گەڕانەوەم لە شەهری سیبزەوە بۆ سەمەرقەند یەکەم کێشەی ناو خێزانەکەم لە بەردەممدا قوت بۆوە.

هەر کە گەیشتمەوە ناو شانشینەکەم، خاتوو شێرێزا لەگەڵ میران شادا هات بۆ دیدەنیم هەردووکیان سەرەخۆشییان لێکردم و منیش سوپاسی سەرەخۆشییەکەیانم کردن و خاتوو شێرێزام لەسەر دۆشەکێکی نەرم دانیشاند.

زۆر بە وردی سەرنجی گفتوگۆ و قسەکانی خاتوونم دا.

پاش ئەوەی خاتوو شێرێزا دانیشت و هەناسەیەکی درێژی هەڵکێشا، پێی وتم:

-تەیموور، ئەوە شتێکی زۆر ناڕەوا و نابەجێ بوو کە جیهانگیر بۆ ئەم هەڵمەتەی دواییە لەگەڵتا نەهات.

میران شا زۆر چیرۆك و بەسەرهاتی سەیری بۆ گێڕامەوە و تێگەیشتم ئەو و شێخ عومەری برای لەو شەڕ و کوشتارەدا چەند پاڵەوانی و قارەمانییان نواندووە و جێدەستیان دیاربووە.

وتم: شێرێزا بێگومان من جیهانگیرم لەدەستچوو. بەڵام کە نەهاتووە لەگەڵمدا بۆ ئەوە بووە کەوا پێویستی کردبوو دەبوا پیاوێکی بەهێز و توانا بۆ پاراستن و بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت لە سەمەرقەند ببوایە..

وتی: بێگومان تەیموور بە مردنی جیهانگیر تووشی نائومێدییەك بوویت. چونکە تۆ نیازت

بوو بیکەیت بە فەرمانڕەوای شاری خوارەزم و ئەگەر ئەمە نەبوایە، ئەوا شێخ عومەریشت دەکرد بە فەرمانڕەوای ئوترار.. و ئوترار لە سەربازگەیەکی سەربازی زیاتر هیچی تری لێ نییە و جێگای فەرمانڕەوایی نییە..!!

-کوڕە گەورەکەشت بکە بە فەرمانڕەوای شاری ئۆرغانج ئەمەش بۆ تۆ و خانەوادەکەشت جێگای شانازییە کە تۆ هێشتا تەمەنت نەگەیشتۆتە چل و دوو ساڵان. دوو کوڕی خۆت فەرمانڕەوای دوو شار بن. بەڕاستی ئەمە شتێکە پیاو بەخیلی پێبەرێت..!!

منیش بێدەنگ بووم و یەك قسەم نەکرد و گوێم لە شێرێزا گرتبوو، دەیوت:

-میران شا ئێستا کوڕە گەورەی تۆیە و بۆشی سەلماندوویت کە ئەفسەرێکی گەورە و بەتوانایە.

-بەڵێ.. بەڵێ.. میران شا توانا و شارەزایی خۆی لە شەڕ و کوشتاردا دەرخست و شایانی ئەوەیە سەربازگەیەکی لە شوێنێکدا بۆ بدۆزمەوە و بیکەم بە فەرماندەی ئەو سەربازگەیە.

-بەڵام ئەگەر میران بۆ ماوەیەکی زۆر قۆناغێکی دوور و درێژ سواری ئەسپ بێت سەری ژان دەکات. ئێستا –ئۆرغانج- پاش ئەوەی سەرلەنوێ بنیاتت نایەوە و چاکت کردەوە، ئەو شوێنە زۆر لە بارە بۆ میران شا و بە تایبەتیش ئەو ئێستا کوڕی گەورەی تۆیە..

-رەنگە کاتێك شارەزایی تەواوی لە کاروباری بەڕێوەبردن و ڕێکخستندا پەیداکرد..

-من خۆم لەگەڵیدا دەڕۆم، من کاتی خۆی بەردەوام پەیوەندیم بە کاروباری باوکمەوە هەبوو، لەویشەوە زۆر شت فێر بووم. جا لەبەرئەوە من لەو باوەڕەدام هەردووکمان، من و میران پێکەوە دەتوانین بە شێوەیەکی زۆر چاك کاروباری بەڕێوەبردن و ڕێکخستن ئەنجام بدەین. پاشان ڕوویکردە میران شا و لێی پرسی وتی:

-پێکەوە هەردووکمان دەتوانین ئەمە بکەین میران وا نییە..؟

وتی: بەڵێ دایکە.. منیش کاتی خۆی لەگەڵ باپیرەمدا پێکەوە زۆر کاتمان بردۆتە سەر.

شێرێزا وتی: کەواتە پاشەڕۆژ دەبێتە جێی بڕوا و متمانەی باوکت.. وایە؟

وتی: بێگومان.. دایکە.. بێگومان.

دوای ئەوە زۆر بە وردی تەماشام کردن و بە چاوێکی وردبینییەوە تێم ڕوانین، بۆم دەرکەوت میران شاش لە پاشەڕۆژدا، ئەوکاتەی دەگاتە تەمەنی دایکی وەك ئەوی لێدێت و فەڵەو دەبێت.

لە دڵی خۆمدا بڕوای تەواوم هێنا، ئەم دووانە شایانی ئەوەن لە سەمەرقەندا نەیانهێڵم و دووریان بخەمەوە.

شاری -ئۆرغانج- و میللەتەکەشی لە ئاستی شێرێزادا نامۆیە و باش نایانناسێت. منیش ناتوانم ئەو تەماعەی گردوویەتە سەر شاری هیرات بەسەریدا زاڵ ببم و لە مێشکیدا نەیهێڵم.

خۆشم بێگومان بووم لەوە کە بە هیچ جۆرێك هیرات نادەمە دەست میران شا، ئینجا وەڵامی شێرێزام دایەوە. وتم:

-خۆشەویستەکەم لە دواییدا بیر لەم کارە دەکەمەوە. بەڵام ئێستا لەم کاتەدا مێشکم ساف نییە..

ئیتر شێرێزا هەستا و خێرا خێرا باوەشێنەکەی ڕادەوەشاند و پێکەوە لەگەڵ کوڕەکەیدا لە ژوورەکەم چوونە دەرەوە.

سەرنجمدان کە لە ژوورەکەم دەچوونە دەرەوە میران شا بێهۆشانە و بێ ئەوەی ئاگای لەو خۆشییەی دایکی بێت قسەی دەکرد.. بۆچی نا..؟ بۆچی نابم بە فەرمانڕەوای خوارزم..؟

منیش خێرا هەر دوای ئەوە چووم بۆ ماڵی سیفین. بۆئەوەی سەردانی بکەم. ئەویش پاش ئەو ڕۆیشتنە دوور و درێژەی لە شەهری سیبزەوە گەڕابۆوە، لەسەر جێگاکەی پاڵکەوتبوو دەیویست بحەسێتەوە.

سەری خستبووە سەر سەرینێکی سەوز و قژە زەردەکەی بەسەریدا پەخش ببۆوە.

لەمەوپێش هیچ کاتێك بەم شێوە ناسك و نازدارییە نەمدیبوو. کاتێك چوومە ژووردوە بۆ لای بە شێوەیەکی میهرەبانییەوە پێی وتم:

-باوکی بەڕێزم تەیموور من زۆر سوپاسی ئەم هاتنەت دەکەم. بەڕاستی پاش لەدەستچوونی جیهانگیر هەست بە تەنهاییەکی زۆر ترسناك دەکەم.

وتم: خۆشەویستەکەم کار هەرچۆنێك بێت لەدەستدانی جیهانگیر هیچ لە دەستەڵاتی ئێمەدا نەبوو. بەڵام کوا دوو منداڵە بچووکەکە لە کوێن..؟

وتی: وان لای عائیشە و تەمینە و ئەوان چاودێری و خزمەتیان دەکەن. من خۆم ئێستاهەست بە ماندووێتییەکی زۆر دەکەم. عائیشە و تەمینەش منداڵەکانیان زۆر خۆشدەوێت و لەمەوپێشیش ئەوان جیهانگیریان بە شێوەیەکی سەیر خۆشدەویست.

وتم: چی..؟ بە شێوەیەکی سەیر..؟

سیفین بە دڵێکی سافەوە تەماشای کردم و پاشان وەڵامی دامەوە وتی:

-بەڵێ.. باوکی بەڕێزم تەیموور..!! منیش بە تەواوی و لە ناخی دڵمەوە جیهانگیرم خۆشدەویست.

بەرووپات بەرامبەرم هەرچۆنێك بێت، تكات لێدەكەم بڕوام پێبكە من كوڕەكەتم زۆر خۆشدەویست و تكاشت لێدەكەم بڕوات بە قسەكانم هەبێت. گەرچی من لە خۆشەویستی جیهانگیر نەدەگەیشتم و نازانم چیم بەرامبەر جیهانگیر كردووە. بەڵام من زۆر بە ڕاست و پاكییەوە جیهانگیرم خۆشویستووە.

پێم وت: بەڵێ من بڕوام بە قسەكانت هەیە..

بێگومان لەو كاتەدا سیفین زۆر جوان و ناسك و شۆخ و شەنگ و سەرنجڕاكێش بوو.

بەڵێ جوان و ناسك و شۆخ و شەنگ بوو. وەك ئەو كاتەی یەكەم جار بینیم و بە لەپی دەستم زللەیەكم بە ڕوومەتیدا دا.

ئا لەم كاتەدا سەرنج و دڵی ڕادەكێشا و لەگەڵ ئەو دڵ ساف و پاكییەیدا بە دڵ ئارەزووم دەكرد جارێكی تر زللەیەكی تری لێبدەمەوە.

ئیتر دەستی خۆم نوقاند و لە كاتی قسەكردنم لەگەڵیدا ویستم قسەكانم نەرم و نیان و لەسەرخۆ بێت و پێم وت:

-ئایا هیچ شتێكت دەوێت بۆت بكەم؟

وتی: نەخێر هیچ شتێكم نییە.. مەگەر ئەوە نەبێت، ئەگەر ڕێگام پێبدەیت بگەڕێمەوە بۆ ئۆرغانج بۆ نیشتمانەكەم. چونكە من لێرە تەنها و بێكەسم و دوورم لە كەسوكار و هاوڵاتیانمەوە..!!

وتم: كەواتە دەتەوێت بتنێرمەوە بۆ وڵاتی خۆت.. وایە..؟

وتی: بەڵێ هەر كە میران شا بچێت بۆ ئۆرغانج منیش حەزدەكەم بچمەوە بۆ ئەوێ..

وتم: كێ پێی وتوویت میران شا دەچێت بۆ ئۆرغانج؟

وتی: خاتوو شێرێزا.. تۆ ناتوانیت نهێنی خۆت بپارێزیت..!! چونكە خاتوو شێرێزات هەموو شانشینی تێگەیاندووە و پێی وتوون میران شا دەبێت بە فەرمانڕەوایی ئۆرغانج.

وتم: كەواتە تۆش نهێنیم دەزانیت..؟

منیش نهێنی ئەوم باش دەزانی و دەمزانی چوونەوەی بۆ ئۆرغانج تەنها بێكەسی و تاك و تەنهایی نییە. بەڵكو لەم داواكردنەیدا شتێكی تری لەژێر سەردایە..!!

خۆ ئەگەر ئەو و خاتوو شێرێزا پێكەوە بچن بۆ خوارزم ئەوكاتە هەریەكەیان بەوەوە سەرقاڵ دەبێت كە هەریەكەیان پیلان لە دژی ئەوی تریان دابنێت ئەو كاتەش لە توانایاندا نابێت ڕووبەڕووم بوەستنەوە و بەربەرەكانیم لەگەڵدا بكەن.

ئەمەش بۆ من سوودێکی باشی هەیە و کەشوبای دەوروبەری شاری سەمەرقەند خۆشدەکات و بۆ ماوەیەکیش سەمەرقەند ئارام دەبێت، پاشان لێوی خۆم گەست و ڕاچڵەکیم و وتم:

-بەڵێ بەم زووانە میران شا دەچێت بۆ ئۆرغانج.

تۆش سەربەست بە و دەتوانیت لەگەڵیدا بڕۆیت. بێگومان دوو کوڕەزاکەشم لێرە جێدێڵێت و بیدەرە دەست شازادە دڵشاد بۆ بەخێوکردن و پەروەردەکردنیان.

وتی: کەواتە دەبێت هەردوو منداڵەکەم لێرە جێبهێڵم..؟

وتم: بەڵێ.. ئەو دوو منداڵە کوڕەزای منن.

وتی: زۆر چاکە باوکی بەڕێزم تەیموور تۆ پیاوێکی دڵنەرم و بەبەزەییت من خۆم دەڕۆم و دوو منداڵەکەشم لێرە بەجێدێڵم..

وتم: کوان..؟ دەمەوێت ئێستا بیانبینم..

وتی: بێگومان.. هەردووکیان ئێستا وان لە ژوورەکەی خۆیاندا لە خوارووی ئەم هۆڵەوەن.

سیفین ویستی هەستێت و بمبات بۆ ژووری دوو منداڵەکە. بەڵام من لەڕاستیدا دەمویست عائیشە و تەمینە بە تەنها ببینم. لەبەرئەوە پێم وت:

-خۆشەویستەکەم تۆ لە شوێنی خۆت دانیشە، پاش ماوەیەکی تر دێمەوە بۆ لات.

وتی: شازادە، زۆر سوپاست دەکەم.. شەوباش..

وتم: شەوباش خۆشەویستەکەم.. نیگەران مەبە، بەم زووانە دەتنێرمەوە بۆ ناو کەسوکار و میللەتەکەی خۆت.

ئیتر سیفین زەردەخەنەیەکی خەمباری کرد و دەستی بەرزکردەوە و خواحافیزی لێکردم. منیش سەرم بۆ ڕاوەشاند و چوومە دەرەوە بۆئەوەی منداڵەکان ببینم.

بینیم هەردوو کوڕەزاکەم بە خەبەربوون و بێ جووڵە و بێدەنگ ڕاکشابوون.

عائیشە و تەمینەش هێشتا جلی ڕەشیان لەبەردا بوو. سەر و دەموچاویشیان بە سەرپۆشێکی ئەستوور داپۆشیبوو.

هەر کە چوومە ناو ژوورەکەیانەوە هەردووکیان هەستان و لە بەردەممدا کڕنووشیان برد و دەستیانکرد بە گریان.

پاش ئەوەی فەرمانی هەستانم پێدان. لە بەردەم جێگاکەی موحەمەد سوڵتاندا ماوەیەک ڕاوەستام و پاشان دانیشتم.

ئەمیر موحەممەد بە گاگۆلکێ بۆ لام هات. منیش لەسەر ڕانی خۆم دامنا. بێ ئەوەی دەنگی لێوە بێت و بترسێت و بگری دانیشت.

ئینجا بە خەمبارییەوە لە دوو کچەکەم پرسی:

-کوڕەکەم چی لێ بەسەرهات..؟

بەڵام هیچ یەکێکیان قسەیان نەکرد و هیچ وەڵامیان نەدامەوە.

دووبارە ڕوومکردە عائیشە و پێم وت:

-عائیشە تۆ دەتوانیت پێم بڵێیت.. بڵێ بزانم چی بووە..؟

بە پچڕپچڕ وەڵامی دامەوە.. من.. من.. نا..

تەمینە دەستی بە گریان کرد و وتی:

-ئەو خۆی کوشتی..؟!!

وتم: ئەو..؟ ئەو.. کێیە..؟!!

وتی: شازادە سیفین.. ئەو دڵی پچڕاند..!!

ئینجا ڕوومکردە عائیشە چونکە ئەو زۆرتر لە تەمینە لەسەرخۆ و بێدەنگتر بوو.. لێمپرسی وتم:

-چۆن..؟ چۆن ئەمە ڕوویدا..؟ ئایا سیفین جیهانگیری خۆش نەدەویست؟

وتی: بەڵێ گەورەم.. سیفین. ئەوی خۆشدەویست. بەڵام بەو شێوەیەی ئێمە خۆشمان دەویست.. نا..

وتم: باشە کەواتە چۆن دڵی پچڕاند..؟

وتی: ئەو.. ئەو.. "مەبەستی سیفین بوو"

تەمینە قسەکەی پێبڕی وتی:

-ئەو بوو بە هۆی ئێش و ئازار و خەم و خەفەت و بوو بە هۆی مردنی.. جیهانگیریش لەم دنیایەدا و لە ژیانیدا خراپە و ئازاری کەسی نەدابوو.. تەماشای عائیشەم کرد بۆئەوەی زیاتر بۆم ڕوونبکاتەوە، بە شڵەژاویەکەوە زۆر بە ڕاشکاوییەوە پێی وتم:

-سیفین جیهانگیری خۆشدەویست. بەڵام زۆر خراپ بوو لەگەڵیدا و ئازاری دڵی زۆر دەدا.

بەڵێ هەندێ جاریش ئازاری منداڵەکانیشی دەدا و لێشی دەدان.

لەبەرئەوە جیهانگیر زۆر دەترسا، منداڵەکان لای سیفین دابنێت. من لەوە ئەگەیشتم سیفین چۆن دڵی جیهانگیری پچڕاند.

بەڵام ئەوەی تەمینە وتی شتێکی ڕاست و دروست بوو. چونکە لەڕاستیدا سیفین بوو بە هۆی ئەوەی بە هەر شێوەیەك بێت دڵی بپچڕێنێت و بیکوژێت. ئینجا عائیشە دەستی بە گریان کرد و بە دەم گریانەوە لێم دەپاڕایەوە، دەیوت:

-شازادەی گەورەم تکات لێدەکەم، سزای تەمینە مەدە، لەبەرئەوەی ڕێزی شازادە سیفینی نەدەگرت و منیش پاشان..

قسەکەیم پێبڕی و پێم وت، و لەکاتی قسەکردنەکەشمدا هەوڵم دا بە میهرەبانییەوە بیدوێنم وتم:

-من سزای هیچ کەسێکتان نادەم و لەو باوەڕەشدام، هیچ کەسێکتان حەز ناکەن لەگەڵ سیفیندا بۆ ئۆرغانج بچن.. وا نییە..؟

وتی: بەڵێ گەورەم ئێمە نامانەوێت و حەزیش ناکەین لەگەڵیدا بڕۆین..

وتم: باشە حەزدەکەن بتانفرۆشم بە پیاوێکی تر..؟

وتی: نەخێر.. گەورەم.. نەخێر..!!

وتم: کەواتە لێرە بمێننەوە و ئاگاداری منداڵەکان بن و لەژێر چاودێری شازادە دڵشادی گەورەی کۆشکدا بەخێویان بکەن.. ئایا وەهاتان پێخۆشە؟

وتی: بەڵێ گەورەم لە کانگای دڵمانەوە زۆر سوپاست دەکەین.

لەم کاتەدا ئاوڕم لێدانەوە تەماشام کردن بینیم ئەوەندە فرمێسکیان هەڵڕشتبوو چاوەکانیا سوورهەڵگەڕابوو. منیش نەمدەتوانی بیانخەمە ناو کۆشکی ژنەکانمەوە و لەگەڵ ئەوانیان دابنێم. چونکە ئەمە دەبوو بە کارێکی داوێن پیسی و زیناکردن بۆ من. چونکە ئەوان بۆ من لە ڕیزی کچمدابوون.

لەگەڵ ئەوەشدا تەمینە بە وشەی سوپاست دەکەم قایل نەبوو، بەڵکو لە بەردەممدا چۆکی دادا و دەستەکانمی خستە ناو دەستییەوە و نووساندی بە لێوە گەرمەکانییەوە کە فرمێسکی گەرمی چاوەکانی پێدا دەهاتە خوارێ و گەرم داهاتبوو.

دەستی کرد بە ماچکردنی دەستم و بە دەنگێکی نووساوەوە پێی وتم:

-شازادەی گەورەم من زۆر سوپاست دەکەم.. زۆر سوپاست دەکەم.. بەڕاستی تۆ مرۆڤێکی چاکیت.. وەك جیهانگیر من زۆر سوپاست دەکەم..

ئینجا عائیشە دەستی خستە ناوقەدی تەمینەو هەڵیساندە سەرپێیان. دوای ئەوە ئەمیر موحەممەد دەستیکرد بە قیژەقیژ و گریان. خێرا تەمینە باوەشی پیاکرد و لەسەر ئەژنۆمی لابرد.

موحەممەد سوڵتانیش دەستی بە گریان و قیڕەقیڕ کرد.

منیش لە شوێنەکەی خۆم هەستام زووری منداڵەکانم جێهێشت و گەڕامەوە بۆ لای ژنە خەمبارەکەی جیهانگیر.

* * *

خاتوو شێرێزا هەموو شارەکەی پڕکردبوو لە دەنگە دەنگ و هاتووچۆکردن..

تا ئاخری کاروانەکەی بە دەنگە دەنگ و ژاوەژاوەوە لەگەڵ تیپەکەی میران شادا لە شار دەرچوون و بە ڕێگای خۆراساندا کە دەچوو بۆ بوخاری لەبەرچاو ون بوون.. هەر کە کاروانەکەی شێرێزا و تیپی کوڕەکەی کۆچیان کرد و لەبەرچاومدا نەمان.. منیش دوای ئەوە هەناسەیەکی شادومانیم هەڵکێشا و لە دڵی خۆمدا پیرۆزباییم لە خۆم کرد کە لە دەست شێرێزا و سیفین بەم شێوە ئاسان و شارەزایی و ڕێکوپێکییەوە ڕزگارم بوو، ئێستا بە سەربەستی دەتوانم ئەو دەستکەوتە زۆرەی لەو دوو ساڵی ڕابوردووەدا بە دەستم هێنابوو بیانپارێزم و سوودیان لێوەربگرم.

ماوەی دوو ساڵی تەواو هەموو گرنگییەکم دا بە کاروباری ناوخۆی وڵاتەکەم و زۆربەی کات و ساتەکانم بە گوێگرتن لەگەڵ فەیلەسووفان و مێژوونووسان و زانایاندا بەسەر دەبرد و گوێم لەبیروڕایان دەگرت و سوودم لە ئامۆژگارییەکانیان وەردەگرت.. هەروەها چەند داوات نامەم بۆ چەند زانا و تێگەیشتوانی تر نارد. بە تایبەت بۆ زاناکانی چین و داوام لێکردن بێن بۆ سەمەرقەند بۆئەوەی داب و نەریت و ڕێگا و شوێنی چین تێبگەم و بە بیانووی ئەوەوە کە دەمەوێت گوندێك و قەڵایەك لەسەر شێوەی چین دروست بکەم.

لەڕاستیدا مەبەستی من ئەوە بوو شێوازی سەربازی چینیەکان تێبگەم. چونکە من پلان و نەخشە و ڕاو تەگبیری ئەهێنیم بۆ ئەوە داڕشتبوو کە هێرش بکەمە سەر چین و داگیری بکەم و ئەو وڵاتە بخەمە ژێر سایە و فەرمانڕەوایی خۆمەوە. چونکە لەمەوپێش خزم و کەسوکاری خۆم لە ژێر سایە و فەرمانداری جەنگیزخان و قبلای خاندا کاریان کردبوو.

گەرچی لەمەوپێش من هیچ پەیوەندییەکم لەگەڵ ئەو وڵاتەدا نەبوو کە کەوتبووە پشت شووڕای گەورەوە -شووڕای چین- دیاری جوان و نایاب و گرانبەهام نارد بۆ ئیمپراتۆری چین.

ئیمپراتۆری مەغۆل بە شادی و خۆشییەوە دیارییەکانی منی وەرگرت و ئەوانیش دیاری نایاب و گرانبەهایان لەگەڵ ئەو نوێنەرانەیاندا بۆ ناردم کە لە کۆتایی وەرزی بەهاردا هاتن بۆ سەمەرقەند.

ئیتر بەم شێوەیە منیش داودم لەگەڵ باڵیۆز و نوێنەرەکانی ئیمپراتۆردا نارد و نامەیەکم پیادا نارد و داوام لە ئیمپراتۆر کرد کە من حەزدەکەم ئیمپراتۆر یەکێك لە کچەکانیم بداتێ و لێم مارە بکات.

داویشم سەرپشك کرد لە لایەن منەوە هەرچۆنێك دەتوانێت و دەستەڵاتی هەبێت بەڵێنیان بداتێ کە من ئامادەم ئەو ئەمیرەیە چ جۆرە کۆشکێکی بوێت، من ئامادەم بۆی دروست بکەم و چۆنی ئارەزوو لێیە و چی لا جوانە لەو کۆشکەدا بۆی ئامادە بکەم.

هەروەها من ئامادەم ڕێی پێبدەم کە لەگەڵ خۆیدا لە وڵاتەکەی خۆیەوە کەسانی هێندەی خەڵکی گوندێك بە تەواوی لەگەڵ خۆیدا بهێنێت.

بۆ ئەوەی سەمەرقەند لە پێش چاویدا شوێنێکی نامۆ نەبێت..

* * *

## وەڵامێکی گرنگ

داود گەڕایەوە دوای ئەوەی وەڵامی ڕازیبوونی داواکردنەکەی منی لە لایەن ئیمپراتۆری مەغۆلەوە بۆ هێنامەوە.

گەڕانەوەی داود لە کاتێکدا بوو کە ئێمە خۆمان بۆ ئاهەنگ گێڕانی سەری ساڵی نوێ ئامادە دەکرد.

لەبەرئەوە من داودم دانا بە قارەمانی ساڵی نوێ.

لە کاتێکدا نامەکەم بۆ سەردار و شازادەکانم دەخوێندەوە کە ئیمپراتۆر بۆی ناردبووم. یەك تەماشای یەکتریان دەکرد و سەری ڕەزامەندییان ڕادەوەشاند و مەدح و سەنای ئەو دیبلۆماسییە شارەزاییەی داودیان دەکرد. لەڕاستیدا هەروەك لە خوێندنەوەی نامەکەی ئیمپراتۆردا تێگەیشتم داود لە جێبەجێکردنی هەموو خاڵەکانی کارەکەیدا زۆر سەرکەوتوو بوو.

نامەکەی ئیمپراتۆریش بەم شێوەیە دەستی پێکردبوو:

"ئەی شازادەی بەڕێز و گەورە، ئەی سەرداری وڵاتی تەتەر و گەورە و سەرداری جیهان لە سنووری وڵاتی مەغۆلەوە تا دەگاتە خۆرنشین. من ئیمپراتۆری مەغۆلم وا خۆم کچەکەم

پێشکەش بە تۆ دەکەم بۆئەوەی ببێت بە ژنت. من کە ئەمە دەکەم مانای ئەوەیە، من شتێکت پێشکەش دەکەم کە هەموو مەغۆل شانازی پێوە دەکات. چونکە ئەم کچە بچکۆلەیەم بەڕاستیکچی ئاسمانە و پاکیزەی مانگە. گەرچی ئەم کچەمان ناوی شازادە -شۆلیان مەلەکە بەلام ئێمە بانگی دەکەین بە شازادەی پیرۆز، و چۆن باوو باپیرانی پێشینانمان پەرستووە، ناوەهاش ئەم دەپەرستین.!!" "ئەی سەرداری گەورە!! تکات لێدەکەین لەم کاتەدا وای دابنێ کچەکەم هاوسەری تۆیە و بە ناوی شاژنی خۆتەوە بانگی بکە. چونکە من بە پێی بەڵێنێکی پیرۆز لێم مارە کردوویت.بەلام من لێت دەپاڕێمەوە و داوات لێدەکەم ماوەی پێنج شەش ساڵی تر وازی لێبێنە، با لای ئێمە بێت. چونکە ئێستا ئەم کچەم لە تەمەنی دە ساڵاندایە. من تکاکارم لێت منی پیرەمێرد ئێستا واز لە سامانە بەنرخەکەم -واتە کچە شازادەکەم- بهێنە با لەژێر سایە و چاودێری خۆمدا بێت هەتا گەورە دەبێت و ئەو کاتە دەبێت بە ژنت و خوێنی ئیمپراتۆری ئێمە لەگەڵ خوێنی مەزنی ئێوەدا تێکەڵ دەبێت".

"ئەی سەرداری گەورە و ڕێزدار!! شازادە بچکۆلەکە، نموونەی جوانی و نموونەی شۆخ و شەنگییە.

لەبەرئەوە تکا دەکەم لە داواکارییەکەمان ڕازی بیت و وازی لێبێنیت. با لەژێر سایەی خۆمان و لەژێر چاودێری پەروەردەکەرانی و مامۆستاکانیدا بێت. هەتا دەبێت بە ژنێکی پێگەیشتوو و کامڵ و خاوەنی ئەخلاقی جوان و پەروەردەی چاك و دروست، وەك شازادەکانی ترمان.

ئەو بەڵێنە بەخشندەییەت کە داوتە و بەڵێن بەم شازادەیە -بەڵکو بەم گەوهەرە- بچکۆلەیە دەدەیت کە کۆشکێکی شاهانەی بۆ دروست بکەیت. زۆر لەو خەم و پەژارەیەی ئێمەی کەم کردۆتەوە کەوا ئێمە دەینێرین بۆ شوێنێکی دوور لە نیشتمانەکەی.

ئێستاش ئێمە لەگەڵ داود باڵیۆز و شازادەی گەورەتدا سێ سەد پیاوی شارەزا و بەناوبانگترین ئەندازیار و بەنا دەنێرین بۆ لای بەڕێزت بۆئەوەی نەخشە و پلانی دروستکردنی کۆند و کۆشك بۆ شاژن دابڕێژن.

ئێمەش بە هۆی ئەو دیارییە زۆر و گران بەهایانەتەوە تێگەیشتین، تۆ هیچ ڕژدی ناکەیت لە دابینکردنی کەلوپەل و پێداویستییەکانی ناو کۆشکی شاژندا.. ژنەکەت.. و داوا دەکەین هیچ کەمو کوڕی لە دابینکردنی پێداویستییەکانی کۆشکی شازادە بچکۆلەکەدا مەکە. چونکە بەڕاستی شازادە شایانی جوانترین و نایابترین شتی ئەرز و ئاسمانە".

پاش ماوەی نامەکەش بریتی بوو لە سوپاسکردنی ئەو دیارییانەی بۆم ناردبوون. هەروەها لیستەی ناوی ئەو دیارییانەی تێدابوو کە لە جیاتی ئەو دیارییانەی من بۆیان ناردبووم. هەروەها ڕێز و سڵاوی یەکەیەکەی تایبەتی خانەوادەی شاهانەی منی تێدا بوو.."

لە هەموو لایەکەوە دەنگی سەردار و شازادەکانم بەرزبۆوە و پیرۆزباییان لێدەکردم و ناخۆشی خۆیان بە دواکەوتنی بووکەکەم دەردەبڕی.

گەرچی ژمارەیەکی زۆریان باش هەستیان دەکرد و "بە پێی ئەو تێڕوانینە وردەیان لە دیفون" دەیانزانی مەبەستی ڕاستی من لە دروستکردنی کۆشکی شازادەی نوێدا چییە..

لەبەرئەوەی من ئەندازیارەکانی مەغۆلم ئاگادار کردبۆوە و پێمڕاگەیاندبوون زۆر ورد و کارامە بن لە کارەکانیاندا. لەبەرئەوە بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەکەیان بڕوا و نامادەبوونی خۆیان بۆ ماوەی شەش ساڵ ڕاگەیاند..

کرێکار و بەننا شارەزاکانی خۆشمان سەرنجی کار و ئیشەکانی ئەوانیان دەدا و لە جوانکردنی شاری سەمەرقەندا سوودیان لێدەبینین و سەمەرقەندیان کرد بە گەوهەرێکی خۆرهەڵات.

لەمبەر و ئەوبەری هەموو لایەکی شەقامە گەورەکانەوە، خانووی جوان و نوێ دروستکران و بڵند بوونەوە.

ئیتر هەرچی شازادە و دەوڵەمەندەکانیش بوون بە جلی جوانی ڕەنگاوڕەنگەوە لەگەڵ ژنە جوان و شۆخ و شەنگەکانیاندا بەناو شار و شەقامەکاندا پیاسەیان دەکرد و شەقام و ناو شارەکە جمەی دەهات و پڕ بوو لە بازرگانی بیانی و خەڵکیش سەرقاڵی کڕین و فرۆشتنی کاڵا بوون..

بەڵام دیمەنی لات و لە وار و پەککەوتە و سوالکەری ڤێزەونی شار تا دەهات لە شاردا زیادی دەکرد و بە شێوەیەك زۆر بوون کاری کردبووە سەر ناو و ناوبانگی فەرمانڕەوایی و گەورەییم.هەر کە نەسرەدینی کوڕی ئەدهەم هات بۆ لام و پێشنیاری پرۆژەیەکی بۆ خۆشی گوزەرانی چینی هەژاران و چاککردنی باری ژیانیان بۆ کردم. منیش زۆر بە وردییەوە گوێم بۆ پرۆژەکەی شل کرد و ڕەزامەندی خۆمم نیشاندا.

کاتێك نەسرەدینی کوڕی ئەدهەم لەبەردەممدا دانیشت بۆئەوەی پرۆژەکەیم بۆ ڕوون بکاتەوە، پێم وت:

-من هەموو کاتێك پێشوازی ئەو پلان و کارانە دەکەم کە دەبنە هۆی چاککردنی باری ژیان و گوزەرانی میللەتەکەم.

ئەی نەسرەدینی کوڕی ئەدهەم پێم بڵێ بزانم پرۆژەکەی تۆ چییە و بیر لە چی دەکەیتەوە؟

وتی: ئەی سەرداری گەورە و بەڕێز..!! دەمەوێت یاسا و نیزامێکی خێرخواهی بۆ هەژاران و پەککەوتە و کەم ئەندامان دابنرێت و بۆ هەریەکەیان مووچەیەکیان بۆ دابین بکەیت. ئەم مووچەیەش لەو پارەی باجە بدرێت کە لە لایەن هاونیشتمانیان و دەوڵەمەند و شازادەکانەوە دەدرێت. ئەگەر بێت و لە کاتی خۆیدا و بە ڕێکوپێکی ئەم هەژارانەیە بدرێت بەو سوالکەر و پەککەوتە و کەم ئەندامانە ئەوا باری ژیانیان چاك دەبێت و لە هەژاری و نەبوونی و سوالکردن رزگاریان دەبێت.

کاتێکیش ئەو سوالکەر و هەژارانە لە شەقام و کوچەکاندا لە سوالکردن ڕزگاریان بوو، ئەو کاتە ڕێز و سەروەرییان بۆ دەگەڕێتەوە.

ئەوانەشی کەم ئەندام نین و لەش ساغن ئەو کاتە کاتی خۆیان بە ئیش و کارێکی بە سوودەوە خەریك دەکەن و واز لە سوالکردن دێنن.

وتم: بەڵام خۆت دەزانیت لە دابونەریتی ئێمەدا سوالکردن شتێکی شوورەیی و نابەجێ نییەو کارێکی چاکە..

وتی: گەورەم هەر ئەوەندا، بەڵکو ئێستا پیاوە ئاینییەکانیشمان چاویان بڕیوەتە سوالکردن و ئەم سوالکردنەشیان لەژێر ناوو پەردەی ئاینیدایە.

وتم: باشە پێم بڵێ وەکو چی..؟

وتی: سەرداری گەورەم خۆت باش دەزانیت و چاك لێم تێدەگەیت و جێی دڵخۆشی و شانازییە کە مرۆڤ لەگەڵ شایەکی ڕۆشنبیردا بدوێ.

وتم: زۆر چاکە پلانەکەت بە تەواوی دارێژە و چۆنت دەوێت بە ڕێکوپێکی بیدە بە شازادە داود منیش پێی ڕادەگەیەنم بە هەموو شێوەیەك کۆمەکیت بکات.

وتی: سەرداری گەورەم من زۆر سوپاست دەکەم بەڕاستی تۆ مرۆڤێکی ئەوەی مرۆڤایەتیشت لا بە نرخە و خۆشتدەوێن.

من هەستدەکەم تۆ پێخۆشحاڵیت بەوەی ڕێز و سەروەری مرۆڤایەتی بۆ هەژاران و پەککەوتەی هاووڵاتیانی ژێر فەرمانڕەواییت بگەڕێتەوە.

* * *

پاش چەند هەفتەیەك نەسرەدینی کوڕی ئەدهەم داوای لێکردم لەگەڵیدا کۆببمەوە. پاش ئەوەی قایل بوونی خۆم نیشاندا و هاتە لام لێم پرسی:

وتم: زۆر چاکە.. پێم بڵێ بزانم کێشەت چییە..؟

پرۆژه و یاسا تایبەتییەکەت بۆ دەستگرتنی هەژار و لێقەوماوان چی لێ بەسەرهات؟

وتی: سەرداری گەورەم، ئەم یاسا و دەستووره شتێکە باوەڕی پێناکەن.

وتم: سوالکەر و پەککەوتەکان نەهاتن بە دەنگ بانگەوازەکەتەوە..؟

برادەرەکانم پێی قایل نەبوون..؟

وەلامی دایەوە:

-سەرەتا زۆر بە گەرمی پێی ڕازی بوون. بەلام ئێستا خۆیان دەدزنەوە و لێمان دوور دەکەونەوە. لە ڕووی من و یاریدەدەرەکانمدا، لێویان دەکرۆژن و پێمان دەلێن.. دز..!!

وتم: بەڕاستی پێتان دەلێن.. دز..؟ بۆچی؟

باشە تۆ لەوە زیاترت نەداونەتێ کە بە سوالکردن دەستیان دەکەوێت؟ باشە ئەمە ڕێپێدان نییە کە شەرەف و کەرامەتی مرۆڤایەتییان دەستکەوێتەوەو ببنەوە بە یەکێك لە هاولاتییە ڕێزدارەکان.

وتی: سەرداری گەورەم، ئا ئەمەیە کە من تێی ناگەم. سوالکەر و پەککەوتەکان نایانەوێت کاتی خۆیان بە کارێکی سوودمەندەوە ببەنە سەر. لەگەلْ ئەو ئیشوکارانەشدا کە بەو کرێ زۆرانەش بۆمان دۆزیونەتەوە، نایکەن و دێن ئەو مووچەیەی بۆمان بڕیونەتەوە وەریدەگرن و پاشان دەگەڕێنەوە بۆ سەر سووچ و کۆلانەکان و ناو شەقامەکان و دەستدەکەنەوە بە سوالکردن.

وە لەو ڕۆژەوەی ئەم یاسا و بەرنامەی خێرخواهییەمان داناوە سوالکەر و پەککەوتە لە هەموو سووچ و لایەکەوە دێن و ژمارەیان بە هەزارەها کەس زیادی کردووە.

وتم: باشە مەبەستی پرۆژەکەی تۆ ئەوە نەبوو سوالکەر و پەککەوتەکان لە کۆلان و شەقامەکاندا نەمێنن..؟

وتی: بەلێ سەرداری گەورەم، ئێمە مەبەستی پرۆژەکەی خۆمانمان بۆ ڕوونکردونەتەوە. بەلام کە گوێیان لەوە دەبێت دەستدەکەن بە قسە و جوێنی ناشیرین پێمان. و دەلێن ئێوە مافی ڕەوای خۆمان لێ زەوت دەکەن. سوالکردنیش بۆتە خووڕەوشت و پیشەیان.

لێم پرسی وتم:

-باشە ئایا ئەوان ئەم خێر و یارمەتییانە وەرناگرن..؟

وتی: نەخێر سەرداری گەورەم، ئەم سوالکەرانە داوای زیاتریش دەکەن و ئێستاش بۆ سوالکردن لە شەقامەکاندا پێشبڕکێ لەگەلْ یەکتردا دەکەن. بەڕاستی ئەم سوالکەرانە جێگای شەرمەزاری و ناخۆشین.

وتم: نەسرەدینی کوڕی ئەدهەم ئایا سواڵکەرەکانت خۆشدەوێت و بەزەییت پێیاندا دێتەوە؟

وەڵامی دامەوە: نەخێر سەرداری گەورەم، زۆر زۆر قینم لێیانە و ڕقم لە هەموویان دەبێتەوە، توانای تەماشاکردنیانم نەماوە، چونکە ئەم سەرزەوییەیان پیس و پۆخڵ کردووە.

وتم: نەسرەدین بەردەوام بە لە پاککردنەوەی شەقامەکانی سەمەرقەندا و کارەکەی خۆت جێبەجێ بکە و دەست بکە بە دەست قرتاندنیان و چاوهەڵکۆڵینیان و کوشتنیان.

لە پێناوی جێبەجێکردنی کارەکەتدا چی بە چاك دەزانیت بیکە. ژیانیشت لەسەر ئەوە بەندە کە شارەکە لە سواڵکەر و دەروازەکەرەوە پاك بکەیتەوە!! تێگەیشتیت..؟

وتی: بەڵێ گەورەم، ئا ئەمەم پێخۆشە و شادومان و دڵخۆشم دەکات!!

* * *

# شەڕێکی دڕندانە

هەر کە هەموو کاروباری ناوخۆی وڵاتەکەم بە تەواوی کەوتە ژێر سایە و دەستی خۆمەوە و هیچ کێشەیەکم نەما. ئیتر گەڕانەوەی نوورەددین لە ئۆرغانجەوە، سەرنج و بیروهۆشمی بۆ لای خۆی ڕاکێشا و ئاگام لە سەمەرقەند نەما.

نوورەددین لە کاتژمێری یەکی پاش نیوەڕۆدا گەیشتەوە ناو پایتەختەکەم. لە کاتێکدا بوو، من دەمویست لە شانشینەکەم بێمە دەرێ.

جا لەبەرئەوە گەڕامەوە بۆ بارەگاکەی خۆم و نوورەددینم بانگ کردە ژوورەوە و لەسەر مێزێك هەردووکمان بەرامبەر یەك دانیشتینەوە دەستیکرد بە باسکردنی میران شا بۆم.

وتی: سەرداری گەورەم.. دەنگوباس زۆر ناخۆش و خراپە!!

-کار هەرچۆنێك بێت، دەی بە درێژی لە خراپترین هەواڵەوە بۆم باس بکە.

-گەورەم من خۆم باوەڕم بە خۆم نییە، ئەوەی دەربارەی کوڕەکەت بۆت باس دەکەم، پێخۆشحاڵت ناکات و ڕەنگە زۆریش قینت هەڵسێنێت و تووڕەت بکات.

-بە هەموو سەربەستی یەکەوە چۆن دەتوانیت قسە بکە و بڕوات هەبێت نە تووڕە دەبم و نە ڕقیشم هەڵدەستێت..!!

-زۆر چاکە.. میران شا ناوی تۆی زڕاندووە و ناوی تۆی عەیبدار و لەکەدار کردووە. دەستەڵات و شان و شکۆی تۆی لاواز کردووە..!

-چۆن..؟ و بە چ شێوە و ڕێگایەك..؟

-گەورەم من ئارامم نییە، چونکە میران شا فێری تلیاك و حەشیشە خواردن بووە و لە سەری ڕاهاتووە و بەردەوام دەیکێشی و زۆر زۆریش دەکێشێت و دەیخوات..!!

-باشە ئەی خاتوو شێرێزا بۆئەوەی ڕێگای لێبگرێت و نەهێڵێت ئەم کارە بکات، چی دەکات..؟

-سەرداری گەورەم، داوای لێبووردن دەکەم، کە بڵێم خاتوو شێرێزا لەگەڵ هەموو ڕێزێکمدا بۆی، ئاگای لە هیچ کردەوەیەکی نییە و بەڵکو چاو لە هەموو کردەوەکانی دەنووقێنێت و ڕووی خۆی لێ وەردەگێڕێت. دەڵێت میران شا هێشتا نەخۆشە. لەڕاستیشدا ئەو خۆی هانەهانەی دەدات بۆئەوەی ئەم شتە بێهۆشکەرانە بخوات، تاکو ئێش و ئازاری سەری کەم بکاتەوە و ئازارەکانی بڕەوێنێتەوە.

میران شاش بەردەوام هاواری ئازاری سەری دەکات. و ئازارەکەشی تا دێت زۆرتر دەبێت.

-تێگەیشتم.. لەسەر قسەکانت بەردەوام بە، پێمبڵێ میران شا جگە لەمە چی تر دەکات..؟

-گەورەم کاتێك گەیشتمە ئۆرغانج، میران شا لە سوڵتانییەتی تەبرێزەوە تازە گەیشتبۆوە شاری ئۆرغانج. هەروەك من تێگەیشتبێتم خاتوونی دایکی پلانی ئەم سەفەرەی بۆ داڕشتووە. خاتوو شێرێزا خۆی پێی وتم: میران شا مافی خۆیەتی فەرمانڕەوایی ئەم دوو شارە بکات..!!

-لە جیاتی من.. وا نییە؟

-بەڵێ.. لە جیاتی تۆ بۆ ئەوێ چووە، نابەجێی و ناڕەوایی ئەم کارە لەوەدایە.

-ئەمە چ مانایەك دەگەیەنێت..؟

-سەرداری بەڕێز.. کردەوەی ناشیرین و نابەجێشی کردووە. بە خەڵکی ڕاگەیاندووە کە ئەو کوڕی تەیموورە بە ناوی تۆوە فەرمانی داوە بە ڕووخاندنی کۆشك و نەخۆشخانە و هەتا مزگەوتیشی ڕووخاندووە و وێرانی کردووە.

گۆڕی مردووەکانیشی دەرهێناوە و تێکوپێکی داون..!!

لە مزگەوتەکاندا دەستی کردووە بە تلیاك و بەنگکێشان و زێڕ و زیو و گەوهەری لە شەقامەکاندا بەسەر سوالکەر و دەرۆزەکەرەکاندا تەخشان و پەخشان کردووە، و لەگەڵ قەحبە و بێئابڕووەکاندا لە کەنیسەی نەسطورییەکاندا کاری نابەجێ و بێ ئەخلاقی کردووە.

زۆر جاریش لە شەقام و کۆڵانەکاندا بە سەرخۆشی وەك شێت دەسووڕێتەوە و گۆرانی دەڵێت..!!

هەتا وای لێهاتووە دانیشتوانی ئەو شارانە تەواو بێزاربوون و باسی هیچ ناکەن جگە لە باسی خراپە و خراپەکارییەکانی ئەو نەبێت.

ئەو خەڵکانە وا بێزار بوون وایان لێهاتووە هەر باسی تۆ ناکەن و خەریکە لەبیریان بچیتەوە.

ئەی سەرداری گەورە و بەڕێزم تەیموور من کە باسی ئەم شتانەت بۆ دەکەم تەریق دەبمەوەو پێم ناخۆشە..!!

نوورەددین من بەڕاستی دەمەوێت هەرچی حەقیقەت و ڕاستییە بە تەواوی تێبگەم و ئاگاداری بم و بیزانم.

مەبەستی من لەم قسانەمدا ئەوە بوو، دڵنیای بکەمەوە کە من هیچ لۆمەی ناکەم لەسەر ئەو کردەوە ناشیرینانەی میران شا کە کردبووی و لەسەر ئەو قسە و باسانەی تری کە بۆی باس کردبووم.

لەبەرئەوە حەزم کرد شتێکیش لە دەنگوباسی ژنە بێوەژنەکەی جیهانگیر بزانم. لەبەرئەوە لێمپرسی وتم:

-ئەی دەنگوباسی شازادە سیفین چییە؟

-سەرداری گەورەم، شووردییترین و نابەجێترین دەنگوباس، دەنگوباسی سیفینە.

میران شا بە زۆر بردوویەتی بۆ ناو کۆشکەکەی خۆی و لەوێ ڕووتی کردۆتەوە و لەبەردەم چاوی شازادەکان و کەسوکارەکەیدا، بە ڕووتی سەمای پێکردووە و پاشان لە کۆشکەکەی خۆیدا هێشتوویەتییەوە و بەردەوام ئەتکی دەکات و لەگەڵیدا ڕادەبوێرێت.

ئێستا کوڕێکی لێی بووە، تەمەنی نزیکەی ساڵێك دەبێت و ناویان ناوە خەلیل سوڵتان.. و ئێستاش سیفین لای میران شا وەك کەنیزەکێك وایە..

-نوورەددین ئەم دەنگ و باسانەت لە کێ بیستووە..؟

-لە سیفین خۆی، لە کاتێکدا، دەمویست ئۆرغانج جێبهێڵم کارەکەرێك جلی ڕەشی لەبەردا بوو، پەچەیەکی ئەستوور بە دەموچاوییەوە بوو. نامەیەکی سیفینی دایە دەستم. من خۆشم لەمەوپێش هەیتوهووت و قسەوباسی زۆریشم بیستبوو. بەڵام هەرچی خەڵکی و هەتا سەردار و شازادەکانی ئۆرغانج خۆشی هەیە ئەم دەنگوباسانەیان کردووە بەمژێر لێوەوە و لە ترساندا باسی ناکەن.

-تۆ دەڵێیت خاتوو شیرێزا خۆی چاو لەم هەموو شتانە دەپۆشێت. خۆی لە کردەوەکانی کوڕەکەی گێل دەکات.. وا نییە..؟

-گەورەم، لەم کارانە دڵگرانم و پێم ناخۆشە، خاتوو شیرێزا منداڵەکەی نووساندووە بە دڵییەوە و دەڵێت چاکترین و پاکترین خوێنێك هەبێت، خوێنی ئەم منداڵەیە کە خوێنی

خانەکانە بە دەمارەکانیدا ڕەت دەبێت..!! بەڵێ گەورەم من زۆر دڵگران و نائارامم چونکە خاتوو شێرێزا کردەوە و کاری کوڕەکەی بە چاك دەزانێت و لەوەش دڵنیام ئەو خۆی ڕێگای ئەم کارە نابەجێ و ناڕەوایانەی دەدات و هەرگیز سەرزەنشتی ئەم بەرەڵایی و داوێن پیسی و کارە ناشیرینانەی ناکات!!

-نوورەددین من زۆر سوپاسی ئەم هەواڵ و باسانەت دەکەم.

بەڵام لە ماوەی ئەم هەفتەیەدا خۆت ئامادە بکە و بڕۆ بۆ تەبرێز و خۆت سەرپەرشتی چاککردنەوەی ئەو شوێنانە بکە کە میران شای کوڕم کاولی کردووە و پاداشتی هەموو ئەو زەرەر و زیانانە بدەرەوە کە لە خەڵکی کەوتووە. من نامەوێت و حەزیش ناکەم ڕێز و گەورەیی و ناو و ناوبانگم لە خۆرئاوادا لەکەدار بێت و ناوم بە خراپە ببرێت.

من خۆشم پاشان دەچم بۆ ئۆرغانج.

پاش ئەوەی نوورەددین ڕۆیشت. منیش چووم بۆ جێگای تایبەتی حەوانەوەم و خۆم شت و پاشان جلێکی نەرم و نیانی جوانم لەبەرکرد و بە کارەکەرەکانم وت خواردنی ئێوارەم بۆ بێنن. هەر کە عەبدوڵڵا هات بۆ لام، هەرچی خزمەتکار و کارەکەرێك هەبوو، هەموویانم ئیزن دا و بە عەبدوڵڵام وت خۆت بە تەنها خزمەتم بکە.

هەر کە خزمەتکار و کارەکەرەکان لە دەرگای ژوورەکە چوونە دەرەوە لە عەبدوڵڵام پرسی:

وتم: ها عەبدوڵڵا پێم بڵێ چیت بیستووە.؟

-گەورەم.. میران شای کوڕت بە دەستی خۆی، خۆی لەناو دەبات.. بەڵکو دەیەوێت تۆش لەناوبەرێت..!!

-عەبدوڵڵا من هەموو ئەمانە دەزانم، بەڵام دەی خێرا پێمبڵێ کردەوەی لەگەڵ شازادە سیفیندا چۆنە..؟

-بەڵێ سەرداری گەورەم من دەنگ و باسی میران شا چاك دەزانم. چونکە خالیدی خزمەتکاری سیفین هەموو شتێکی بۆ گێڕاوەمەتەوە و باسی بۆ کردووم.

-زۆرچاکە، دەی ئەو دەنگوباسەم بۆ باس بکە..؟

-هەر کە سیفین چووەوە کۆشکەکەی خۆی و تیایدا جێگیر بوو. لەگەڵ خاتوو شێرێزا و میران شادا دۆستایەتییەکی باشی پەیدا کرد..

هەروەکو خالید بۆی باسکردم. سیفین وا خۆی پیشان دەدا کە سەرخۆشە و عارەقی زۆر خواردۆتەوە و بە لارولەنجە بە بەردەم میران شادا دەهات و دەچوو، هەندێ جاریش بە دەستی ئەنقەست هەندێ شوێنی لەشی خۆی دەردەخست و خۆی لەبەردەمیدا دەنواند..

-ئێی پاشان..؟

-دیارە میران شاش نەیتوانیوە خۆی لەبەردەمیدا ڕابگرێت. چونکە سیفین بە شێوەیەکی زۆر نابەجێ و بێنابڕووانە لەش و لاری خۆی بۆ ڕووتکردۆتەوە و خۆی پیشان داوە و زەوق و ئارەزووی هەڵساندووە.. تا لەم کاتەدا دیار بوو عەبدوڵڵا دەترسا لەو قسانەی کردبووی.. دەیویست واز لە قسەکانی بهێنێت و شتی تری بەسەردا بهێنێت.

منیش دڵنیام کرد و سوێندم بۆ خوارد لەسەر ئەم قسانە هیچی لێناکەم و لۆمەشی ناکەم. وتم: ئازادبە چی زانیاری و حەقیقەتێك دەزانیت بۆم ڕوون بکەرەوە. پاشان پێم وت: عەبدوڵڵا بڕوا بکە چۆن باسی خێزانەکەم دەکەیت بیکە، بە هیچ جۆرێك لێت نادەم و خراپەم بۆت نابێت.

-زۆرباشە، سەرداری گەورەم، میران شا ئێش و ئازاری سەری زۆر زۆر بووە. لەبەرئەوە خاتوو شێرێزا لە سەرەتادا دەیبردەماڵەوە و لە ماڵەوە، دایدەنا. کاتێك شێرێزا هەستی کرد سیفین حەزو ئارەزووی میران شا دەجووڵێنێت و کاری کردۆتە سەری. ئیتر خاتوو شێرێزا سیفینی بانگ کردە لای خۆی و بردییە لای میران شا بۆئەوەی ئەو خەم و پەژارە و بێدەنگییە زۆرەی میران شا برەوێنێتەوە.

-باشە عەبدوڵڵا دوای ئەوە چی ڕوویدا..؟

عەبدوڵڵا لە قسەوباسەکەی وەستا و پێکێ عارەقی بۆ تێکردم و هەناسەیەکی هەڵکێشا و لەسەر قسەکانی ڕۆیشت و وتی:

-ئیتر بەم شێوەیە هاتوچۆ لە نێوان میران شا و سیفیندا گەرم بوو. سیفینیش تا دەهات زیاتر خۆی جوان دەکرد و شۆخ و شەنگتر دەبوو. لەگەڵ میران شادا کردەوەی وایان دەکرد، خالید شەرمی پێدەهات بۆم بگێڕێتەوە. سەرداری گەورەم خزمەتکاریش هەست و شەرمیان هەیە.

-ڕاستە.. عەبدوڵڵا بەڵام دەی لەسەر قسەکانت بەردەوام بە..!!

-شازادە شێرێزاش هەموو کات لەگەڵیاندا بوو. ئاگای لە هەموو شتێکیان بوو ئیتر شەوێك لە شەوان میران شا لەگەڵ کۆمەڵێکی کەم لە شازادەکانی ئۆرغانجدا، کە دۆست و هاودەمی سیفین بوون هاتن بۆ کۆشکەکەی سیفین. سەرداری گەورەم پێویستە لە سەرم پێت بڵێم.. کە

-بەڵێ عەبدوڵڵا پێویستە هەرچی شتێك دەزانیت و بیستووتە پێم بڵێی..

-شازادە سیفین ئەو کاتە لە هەموو کاتێکی تری زیاتر جوان و سەرنجڕاکێش و شۆخ و شەنگتر بوو. بە ڕووتی لەبەردەم شازادەکاندا سەمای دەکرد.. ئا لەوکاتەدا کتوپڕ میران شا هەڵدەستێت و هەرچی شازادەکان هەیە هەر هەموویان ئیزن دەدات و خۆی بە تەنها لەگەڵ سیفیندا دەمێنێتەوە عەبدوڵڵا تۆزێك لێم دوورکەوتەوە، لە ترسی ئەوەی نەك لێی بدەم و دەترسا لەوەی من لە بەڵێنەکەی خۆم پەشیمان ببمەوە. کە پێم وتبوو هەرچۆنێك باسی خێزانەکەم بکەیت ئازادی و بە هیچ شێوەیەك لێت نادەم.

لەڕاستیدا من ئەوکاتە زۆر هێمن و لەسەرخۆ بووم. چونکە باسوخواستەکەی عەبدوڵڵا بە تەواوی لەگەڵ دەنگوباسەکەی نوورەددیندا یەکیان دەگرتەوە و جیاوازییان نەبوو.

لەبەرئەوە چارم نەما، جگە لەوە نەبێت لە عەبدوڵڵام پرسی، وتم:

-باشە خزم و کەسەکانی سیفین هیچ تووڕە نەبوون کە میران شا ئیزنی دان و خۆی بە تەنها لە ژوورەکەدا لەگەڵ سیفیندا مایەوە..؟

-نەخێر سەرداری گەورەم، هەرگیز ئەمە تۆ نیت، لەم جۆرە پرسیارانە بکەیت..!! هەتا خالیدیش لە گردەوەی ئەم خزمانەی سیفین سەری سووڕماوە و وایان دادەنێت ئەوان.. .

-بێگومان ئەوانیش هاوبەشن لەو پلان و پلانکارییەی سیفیندا.. وا نییە..؟

-بەڵێ سەرداری گەورەم، هەتا خەڵکیش داخ لە دڵن و قینیان لەو بێئابڕووە بەردەوامەی میران شا دەبێتەوە کە لەگەڵ سیفیندا دەیکات ئێستاش میران شا، سیفینی بردۆتە ناو کۆشکی ژنەکانییەوە بۆئەوەی لەوێدا هەر لەگەڵیدا بێت و لە ئۆرغانجیشدا هاودەمەکانی میران شا هاوبەشی میران شا دەکەن لە قەحبەبازی و ئەتککردنی ژناندا و بەردەوام هانەهانەی دەدەن بۆ ئەم خراپەکاری و ملهوڕییەی. هەرچی لاو لایەنێکیش هەیە کە من باوەڕیان پێبکەم و دەنگوباسیان لێوەرگرم، ئەم قسانەی من دووپات دەکەنەوە کە پێم ڕاگەیاندیت..!!

-بەڵێ خالید ئەمەی لا سەیرە. بەڵام من هیچ کات ئەوەم لا سەیر نییە.

-گەورەم، منیش ئەوەم لا سەیر نییە، بەڵام من لەو مەبەست و ئارەزووەی سیفین نەگەیشتووم کە لەبەرچی هاتووە بۆ ئێرە ئەگەر شتێکی..

-ئایا بەڕاستی هاتووە بۆ ئێرە..؟ ئایا سیفین بەڕاستی هاتووە بۆ سەمەرقەند..؟

-بەڵێ سەرداری گەورەم سیفین جلی ژنە کارەکەرێکی لەبەرکردووە و خۆی تێکەڵ کاروانەکەی نوورەددین کردووە و هەندێك دۆست و برادەریشی لەگەڵدایە. من لەو باوەڕەدام، ئەمشەو دێت بۆ لات..!!

وتم: بەڵام عەبدوڵڵا خۆ نوورەددین شتی وای پێنەوتووم..

وتی: سەرداری گەورەم من دڵنیام لەوە کە نوورەددین ئاگای لە هاتنی سیفین نەبووە. بەڵام هەندێك کارەکەر و خزمەتکار ناسیویانەتەوە. بە هۆی هەندێ کارەکەر و خزمەتکاری هاوڕێکانی سیفینەوە کە لە سەمەرقەندان، ئەو کارەکەرانە ئاگاداری هەڵسوکەوتی هەن.

سەرداری گەورەم، ڕەنگە ئێستا بەڕێوەبێت، بێت بۆ ئێرە..!!

هەر دوای ئەمە عەبدوڵڵا دەستیکرد بە کۆکردنەوەی قاپ و قاچاخەکان و بردنی بۆ ژووری نانخواردن.

منیش دوای ئەوە چوومە ژێرزەمینە تاریکەکەوە و کیسەیەك زێڕم هێنا و بۆ عەبدوڵڵام هاویشت. ئەویش خێرا دەستێکی لە سینی نانخواردنەکە بەردا و گورج کیسە زێڕەکەی قۆستەوە.

کە کیسە زێڕەکەم بۆ عەبدوڵڵا هەڵدا، لەگەڵ هەڵدانەکەدا پێم وت:

-عەبدوڵڵا ئەمە پاداشتی ئەو دەنگوباسەتە.

وەڵامی داعەوە وتی:

-سەروەری گەورەم منیش زۆر سوپاست دەکەم.

بە دەم قسەوە لە ژوورەکە چووە دەرەوە، بەڵام هێشتا لە دەرگاکە نەچبووە دەرەوە، ڕاوەستاو ئاوڕێکی لێدامەوە و پێی وتم:

-سەرداری گەورەم ژنێك دەیەوێت بتبینێت..!!

منیش پێم وت:

-زۆر چاکە، پێی بڵێ با بێتە ژوورەوە..

ئیتر عەبدوڵڵا دەرگاکەی کردەوە و خۆی لە لایەکیەوە، ڕاوەستاو ژنێك بە جلێکی ڕەش و دەموچاوی بە پەچەیەکی ئەستوور داپۆشیبوو هاتە ناو ژوورەکەمەوە و عەبدوڵڵاش هەر کە ئەو هاتە ژوورەوە لە دوای خۆیەوە دەرگاکەی داخست.

بەڵام من گورج ڕووم تێکرد و پێم وت:

-کچم من زۆر پێخۆشحاڵم، بە پەناهێنانت بۆ کۆشکەکەم.

هەر کە تێگەیشت لەگەڵ ئەو خۆگۆڕین و پەچەپۆشینەیدا من ناسیمەوە. هەستمکرد حەپەساو دەمی داچەقاندو لەژێر ئەو پەچە ئەستوورەوە سەرسامی و وڕبوونیم بینی.

ئینجا لەبەردەممدا بە چۆکدا هات و دەستی گرتم و ڕووی تێکردم وتی:

-ئەی باوکی بەڕێز و بەڕەحمم، سەرداری بەخشندە و گەورە تەیموور من لەدەست ئەو عەیبو شوورەیی و ئابڕووچوونە ڕامکردووە، کە کوڕەکەت دوای خستووم و کەڵەکەی کردووە بەسەرمدا و ناوی پێ زڕاندووم. من وا ئێستا خۆم دەخەمە ژێر پێ و بەزەییتەوە و داوای پاراستنت لێدەکەم بە زمانێکی شیرین پێم وت:

-کچم هەستە پاشان من گوێ لە هەموو سکاڵایەکت دەگرم.

هەر کە هەستایە سەرپێ سەرپۆشەکەی سەری لەسەر کەوتە سەرشانی و قژە لوولەکەی و پرچە زێڕینەکانی وەك چوارچێوەیەکی زێڕین بە دەوری ڕوویدا پەخش و بڵاو بوونەوە.

پێش ئەوە سیفین تۆزێك بۆ دواوە بکشێتەوە، پەچەکەی لە ڕووی خۆیدا لابدات. هەر ئەوکاتە بۆنی عەتری قژەکەی بڵاوبۆوە و کونە لووتەکانمی پڕکرد لە بۆنە تیژە خۆشەکەی خۆی.

هەر حەپەسام کە بینیم لەگەڵ ئەو هەموو ئابڕووچوون و شوورەیی و کارە نابەجێیانەی میران شا لەگەڵیدا کردووە. یەك تۆز لە جوانی و شۆخ و شەنگی کەم نەکردۆتەوە.

بینیم هێشتا لەشی نەرم و نۆڵ و سپی و چاوەکانی سەوز و برژانگەکانی درێژ و سیما و ڕەنگ و ڕووی ئەوەی دەگەیاند لەش و لار و بەژن و باڵای گەیشتۆتە پلەی کامڵی تەواو.

لەڕاستیدا ئەوکاتە سیفین تەمەنی گەیشتبووە بیست و پێنج ساڵان. کە ئەو جوانی و شۆخ و شەنگییە ئەفسووناوییە سەرنجراکێشەم بینی حەپەسام سیفین هاتەوە سەرخۆی و هەناسەبڕکێی نەما و تۆزێك سەری داخست و پێی وتم:

-بێگومان تۆ کردەوەکانی میران شات بەرامبەر بە من بیستووە.. وا نییە.. گەورەم..؟

وتم: سیفینی خۆشەویست، من دەربارەی ئەم باسە لەگەڵ نوورەددیندا قسەم کردووە.

وتی: کەواتە ئەو باسی منی بۆ کردوویت.. وایە..؟

وەڵامم دایەوە:

-بەڵێ، ئەو بە دوور و درێژی باس و خواستی تۆی بۆ کردووم.

وتی: ئایا ئەو پێی وتوویت من هاتووم بۆ ئێرە..؟

وتم: نەخێر.. من خۆم ناسیمیتەوە..

وتی: تۆ..؟ بەس خۆت منت ناسیوە..؟

وتم: بەڵێ خۆشەویستەکەم..!! تۆ ناتوانیت خۆتم لێ بگۆڕێت و خۆتم لێبشاریتەوە. هەردووکیشمان یەکتر چاك دەناسین.!!

وتی: کەواتە تۆ خۆت دەتزانی کە پێویست بوو بێم بۆ لات و تکات لێ بکەم کوڕەکەت لە ئۆرغانج دوور بخەیتەوە و لە فەرمانڕەوایی میللەتەکەم لای بەریت. چونکە گەلەکەی من بە هۆی ئەو کردەوە نابەجێ و سووکایەتیانەوە کە بەسەر من و ولاتەکەمیدا هێناوە فینیان لێدەبێتەوە.

وتم: پاشان ئەوە دەکەم و داواکارییەکەشت جێبەجێ دەکەم..

وتی: دەبێت یەکێك لە خزمە دڵسۆزەکانم لەسەر کورسی شانشینی دابنێیت و پێویستە ئەوەی لەسەر کورسی شانشینی دادەنێیت، دڵسۆزی من بێت. هێندەی من دڵسۆزی تۆم.

بە وردی سەرنجم دا و تەماشام کرد و بینیم چاوەکانی گڕ و بڵێسەی گەرم و گەشی بۆ کێشەکەی تیا دەدرەوشێتەوە و بەو چاوانەوە زۆر بە وردی و ئاگاهییەوە سەرنجی هەڵسوکەوت و گۆڕانی ڕەنگ و ڕووخساری دەدام. بە گاڵتەپێکردنێکی زۆرەوە لێم پرسی:

-سیفین هێندەی دڵسۆزیت بۆ من..؟

چاوەکانی بچووك کردەوە، هەتا وەك چاوی پڵنگێکی ڕاوی لێهات و بە تیژی سەرنجی دام و بە تووڕەیی و هەڵچوونێکی گەرمەوە پێی وتم:

-هەتا ئەوکاتە دڵسۆزت بووم، کە کوڕەکەت بە زۆر سوارم بوو، ئەتکی کردم و بە چنگەکانی چنگی لێ گیرکردم و لەشی زامدار کردم و بە شەق تێیهەڵدەدام و لێی دەدام بۆئەوەی تێربێت و ئاگری شەهوەتی خۆی بە من دابمرکێنێتەوە. خۆ هەر هەفتەی ڕابوردوو بوو کوڕەکەت هەموو گیانمی بە نوقرچ بریندار کرد و لە کاتی ئەو زەوق و ئارەزووە زۆرە شەهوانییەیدا گازی لێدەگرتم.

ئەو بریندار و ڕووشانانە تاکو ئێستا بە لەشمەوە دیارە، گەورەم تەماشاکە کوڕەکەت چی لێکردووم.

بە شێوە تەمسیلییەکەوە سیفین کراسەکەی لەسەر شانییەوە داکەندو بە لەشیدا هاتە خوارێو لەژێر پێیدا کۆمەڵ بوو.

سیفین تەنها ئەو کراسەی لەبەردا بوو. زۆر بە لووتبەرزی و خۆنواندنەوە لەبەردەممدا ڕاوەستا.

لەسەر کراسە ڕەشەکەیەوە وەك بڵێسەیەکی زێڕین و زیندوو لە ژوورەکەدا دەدرەوشایەوە.

كە تەماشای ئەو جوانییە بێهاوتاییەی و بەژن و باڵا ڕێك و ڕەوانەیم کرد، دڵی دەبزواند و چاو لێی تێر نەدەبوو. لە شوێنەکەی خۆمدا ئەبڵەق بووم. بە قین و تووڕەییەوە پێم وت:

-تۆ دڵسۆزی منیت.. وا نییە..؟ ئایا تۆو کەسوکارە شازادەکانت کوڕەکەمتان سووك و ڕیسوا نەکردووە؟

کوڕو بنەماڵەکەمتان تووشی عەیب و عار نەکردووە..؟

زۆرچاکە، سیفین دەزانم چیت کردووە..!!

ئینجا جێی چنگ و ڕووشاندم لە لەشیدا بینی.

تینی تووڕەیی و قینم تاوی سەند. وەك گەرمی تیشکی چاوەکانی ئەو. لە تووڕەییدا گڕم گرتبوو.ههەمدەتوانی خۆم ڕابگرم و بەسەر خواست و مێشکمدا زاڵ ببم. دەستی ڕاستم بەرزکردەوە بە هەموو هێزمەوە، دڕندانە کێشام بەو دەمە ناسکەیدا کە مێشکی هەموو ئینسانێکی ژیری تێکدەدا. لە ماوەیەکی زۆر کەمدا چاوەکانی سیفین گڕ و بڵێسە زێڕینەکەی نەما و وەك خەڵووزێکی ڕەشی لێهات.

پاشان بەو لەشە ڕێك و ناسك و نازدارییەوە خۆی دا بەسەرمدا و زۆر بە گرانی کەوتە هەناسەبڕکێ و پرتەپرت وتی:

-گەورەم، خۆ ئێستا دەزانیت چیم کردووەو چیم نەکردووە.

کاتێك خۆی دا بە سەرمدا، لەشم گرژ بوو. وەك ئەوەی بە تینی ئاگری لەشی داخم بکاتو تینی ئاگرەکەی لە جلەکانمەوە بە هەموو لەشمدا گەڕا.

کە بەو شەقازللە توندە کێشام بە دەموچاویدا، خوێنی پێدا هاتەخوارێو تامی ئەو خوێنە گەرمەم کرد کە لە دەمییەوە دەخاتەخوارێ.

هەروەك ئەوەی پەنابەرم بۆ شتێك لەو ئاگرە بە تینەی خەریکبوو بمسووتێنێو خۆمی پێ بپارێزم. توند باوەشم پێدا کردو بە هەموو هێزەوە گوشیم بە خۆمەوەو چنگم لە گۆشتە نەرمونیانەکەی پشتی گیر کرد.

کاتێك ڕاستبوومەوەو ئاوڕم لێدایەوە باوەشم پێدا کردو ویستم بیخەمە سەر جێگاکەی خۆم. بە هەموو ئارەزوویەكو برسێتییەکی کوشندەوە دەمی کردەوەو بە چرپەوە وتی:

-لێم بدە، ئازارم بدە.. تەیموور.. بمکوژە.. تەیموور. چەند دەتوانیت بمگوشە، بمهاڕە..!!

لەبەرئەوەی ڤین‌و بوغز لە سینەمدا دەکوڵی، منیش ویستم بە هەموو هێزمەوە ئێش‌و ئازاری بدەم‌و بە هەموو توانایەکمەوە تۆڵەی لێبکەمەوەو هەرچی لەش‌و گیانی هەیە بریندارو ئەنجن ئەنجنی بکەم‌و خوێنی پێدا بێتەخوارێ‌و تووشی ئێش‌و ئازارێکی زۆری بکەم.

خۆشم بە شێوەیەکی شێتانە دەمویست هاوبەشی ئێش‌و ئازارەکەی بکەم‌و وای لێبکەم ئەویش زیاتر لە من ئازارم بدات. بۆئەوەی زاڵبم بەسەر ئەو شتەیدا کە جیهانگیرو میران شای برای پێ لەناوبردووە.

ئیتر سیفین لە باوەشمدا شل بوو. وەك بووکە شووشەیەکی نەرم‌و جوانی ئاوریشم. کە تەماشام کرد، زەردەخەنەیەکی بۆ کردم‌و بە دەنگێکی نەرم و ناسك وەك ئەو شەماڵە فێنکەی لە پەنجەرەکەوە دێتە ژوورەکەمەوە پێی وتم:

-بۆچی یەکەمجار کە منت بینی‌و یەکەمجار زللەکەت لێدام، نەتهێشت جلەکانم دابکەنم‌و لەش‌و لاری خۆمت پیشانبدەم؟

بۆچی ئەم هەموو کاتە زۆرە چاوەڕوانت کرد؟

وەڵامم دایەوەو وتم:

-چونکە تۆ بووکی کوڕەکەی من بوویت..

وتی: بەڵام تۆ بە شەڕ منت بردەوەو بە شەڕو کوشتاریش منت دەستکەوت.

وتم: بەڵێ، بەڵام لەبەرخاتری کوڕەکەم بوو، بەو شەڕو کوشتارە تۆم دەستکەوت.

وتی: نەدەبوو، ئەوەت بکردایە..

وتم: ئاخۆ تۆ ئەو کاتە ڤینت لە من بوو..!!

ئینجا سیفین دەستی بە ڕیشمدا هێناو بە هێواشی پەنجەکانی هێنا بە سمێڵ‌و لێوەکانمدا.

اشان دەستی خستە ناو سنگمەوەو بە لەپی دەستی پیایدا هێنا.. هەتا گەیشتە پەراسووەکانم‌و بە نینۆکەکانی پێستی پەراسووەکانمی لەسەرخۆ گرت‌و نینۆکەکانی لە پێستی پەراسووەکانم چەقاندو بە توندی دەستی لێ گیرکردو شاخاوی لێهانی‌و برینداری کرد.!!

ئینجا منیش دەستم جووڵاندو مەمکە خڕو پڕە توندوتۆڵەکانیم گرت..

پاشان بە هێواشی دەستم بردە خوارێ‌و دەستمهێنا بە سمتە ساف‌و لووسە سپییە ناسکەکەیداو هەڵمگوشی..!!

هەستمکرد لەشی گرژ بوو وردە وردە لەژێر دەستمدا شل بوو.. بەڵام ئەمە نەبووە هۆی ئەوەی بەرهەڵستی سیفین بکات. بەڵکو وەڵامی دامەوەو وتی:

-سەرداری گەورەم، من ئێستاش ڤینم لێتە!!

وتم: منیش ئێستا لەم کاتەدا، لە هەموو کاتێکی پێشووتر زۆرترو زیاتر ڤینم لێتە، چونکە من ئێستا هۆم بە دەستەوەیە ڕقم لێت بێت.. چونکە تۆ دوو کوڕی منت فەوتاندووەو لەناوت بردوون..!!

وتی: ئێستاش مەبەستمەو دەمەوێت تۆش بفەوتێنمو لەناوت بەرم..!!

وتم: من ئەوە باش دەزانمو لە سەرەتاوە هەستم بەوە کردووە..

وتی: بەڵام من ئێستاو هەتا لە ژیاندا بم تۆ لەناو نابەم.. چونکە من پێویستیم بە تۆ هەیە.. تۆش من لێرە دەرناکەیتو کاری واش ناکەیت.

وتم: سیفین تۆ دایکی کوڕەزاکانی منیتو دایکی جێگرانی منیت.. لەبەرئەوە بێگومان ژیانت پارێزراوەو بە ساغو سەلامەتی دەمێنێتەوە.

وتی: ئەمە هەموو هۆیەکی ئەوە نییە..!!

لە دەنگو قسە ڕەقەکانیدا ڤینو بوغزێکی ئێجگار زۆرو ئاشکرا دیاربوو. شانازیو سەرکەوتنی پێوە دیاربوو.

هەمدیسان هەستێکی زۆر بەهێزی ڤینو تووڕەیی پاڵی پێوە دەنامو حەزم دەکرد زیاتر لە جاری پێشووتر بەر زللەی بدەمو تێروپڕی لێدەم.

سیفین دەستی کردەوە بە قسەو پێی وتم:

-بەڵام من هەر لە ناوت دەبەمو میللەتەکەشم لەدەستت ڕزگار دەکەم..!! لەڕاستیدا ئەم قسانەی دوایی هێندەی زامی شمشێرێکی تیژ زیاتر کاری تێکردم.

پاشان درندانە چنگو نینۆکەکانی لە گۆشتەکەم گیر کردو شاخاوی لێهێناو خوێنی پێدا هاتەخوارەوە. هەر کە ئەوەم بینی حەپەساو منیش درندانەتر چنگم لە گۆشتی ڕانی گیرکردو پاشان بە هەموو هێزمەوە بە توندی کێشام بە ناوی دەمیداو تێی بەربووم. سیفین درندانە هێرشی بۆ هێنامو پەلاماری گوێی چەپی دامو بە ڤینو بوغزێکی زۆرەوە ددانی لە نەرمایی گوێچکەم گیرکردو بە هەموو هێزییەوە گازی لێگرت. بە توندی زللەیەکی کێشا بە گوێچکەکەی ترمداو بەسەرمدا ڤیژاندیو وتی:

-دەی تەیموور لێمدە.. دەی دووبارە لێمبدەرەوە.. ئازارم بدە.. بمکوژە! هەمدیسان گڕی ڤینو تووڕەییم تاوی سەندو درندانەو بێبەزەییانە دەستمکرد بە لێدانو زللە پیاداکێشانی

تا تەواو هیلاك بووم.. بەم شێوەیە بە درێژایی شەوو ڕۆژ، بۆ ماوەی سێ شەوو سێ ڕۆژ بەردەوام شەڕمان دەکردو لە یەکترمان دەدا.

کە لە سیفینم دەدا لە کانگای دڵمەوە هەستم بە شادیو خۆشی دەکرد. چونکە هەستو شعوورو گەورەیی شازادەی ئۆرغانجم شکاند. و تێگەیشتم چی لە لەشیدایەو بە هۆی چییەوە جیهانگیرو میران شای کوڕمی فەوتاندو دەیەوێت بە هۆی ئەو شتەشەوە، من ڕاکێشێتو وەکو ئەوان منیش بفەوتێنێتو لەناوم بەرێت.

لەو ئێشو ئازارە گەیشتم کە جیهانگیری پێ لەناوبردووەو میران شاشی پێ لەناوبردو فەوتاندی..!!

کاروبارم خستە پشتگوێو وازم لە پێویستییەکانی سەرشانم هێناو دڵنیابووم منیش خۆم دەخەمە بەر شاڵاوی ئاگری شۆخو شەنگیو ئەفسوونو جوانی سیفینەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حەزم نەدەکرد وازی لێبێنمو نەشمدەزانی چ شتێکە پاڵم پێوە دەنێت، وازی لێنەهێنم.

ئایا ڤینو بوغزە..؟ یان ئارەزووی شەهوانییە..؟ ئایا پلانە بۆ ئەوەی بە تەواوی زاڵ بم بەسەریدا، یان خۆ دان بە دەستەوەیە بۆ ئارەزووە ئاژەڵییەکانی؟ بەڕاستی خۆشم لە ماناو ناوەڕۆکی ئەو پاڵپێوەنەرە نەدەگەیشتم. هیچ کەسێکمان شوێنەکەمان جێنەدەهێشت.

کاتێك برسیمان دەبوو، دەمانویست نان بخۆین. داوام لە هەندێ خزمەتکار دەکرد، نانمان بۆ بێنن.

زۆرتر ئاومان دەخواردەوە، بۆئەوەی گڕو تینی گەرمای لەشمان کە پڕبوو لە ڕووشاندنو جێ چڕنووك، دابمرکێتەوەو بیکوژێنێتەوە.

هەر کە ڤینو تووڕەیی لە دەروونماندا دادەگیرسایەوە دەستمان دەکردەوە بە شەڕو لێدانی یەکتری.

هەندێ جاریش ئەوەندە هیلاك دەبووین، دەکەوتینو خەومان لێدەکەوت هەر کە خەبەرمان دەبۆوە، هەمدیسان دەستمان دەکردەوە بە شەڕو پێکدادان. وا دیاربوو دانەدەمرکاینەوەو کۆتایشی نەبوو.

شەوی چوارەم خەبەرم بۆوە بینیم سیفین ڕۆیشتووەو جێگاکەمی جێهێشتووە.. کاتی چاوکردنەوەم کاتێکی باش بوو.

بینیم سیفین گراسەکەی لەبەرکردبوو، خەریکبوو بە عەبا ڕەشەکەی خۆی بپێچێتەوە. چۆن بە هێواشی هاتبووە ژوورەکەمەوە، هەرواش بە هێواشی لە ژوورەکەم بچێتە دەرەوە.

نەمدەزانی ئایا پێم خۆشە بچێتە دەرەوە یان نەهێڵم بڕواتو ڕێگەی ڕۆیشتنی لێبگرم. یان وازی لێبهێنم بڕوات، کەی تینو توانای پەیداکردەوە ئەوکاتە بێتەوە بۆ لام..

دوای ئەو منیش لە جێگاکەی خۆم هەستامو خۆم شتو جلە ئەفرەنجییەکانم لەبەرکردو لە کۆشکەکەم هاتمە دەرەوەو بەرەو دەروازەی دیفون کەوتمەڕێ..

ئالی سۆنم بینی نووستبوو. منیش بە هێواشی جلەکانم داکەندو بێئەوەی خەبەری بکەمەوەو ڕایپەڕێنم، بە هێواشیو لەسەرخۆوە شانیم ڕاوەشاند. ئالی سۆن بە هێواشی چاوی هەڵهێناو دەستی بەرزکردەوە قژە زێڕینەکەی لە سەردەموچاوی لاداو پێی وتم:

ئای تەیمووری خۆشەویستم، زۆر بە دواتا گەڕامو نەمدۆزیتەوە.. هەر کە چاوە شینە جوانەکانیم بینی هەرچی گڕو بڵێسەی قینو تووڕەییم لەدڵدا بوو گشتی دامرکایەوە.

لەشە سپییە جوانە ناسکەکەی، دەتوت تۆپەڵە بەفرێکی سپییەو لەسەر جێگا ئاوریشمە شینەکەی کۆمەڵ ببوو. بە هێواشی لە تەنیشتییەوە ڕاکشام کتوپڕ بینیم لەشە سپییەکەی دەرمانێکەو ئەو ئێشو ئازارو تووڕەییەی سیفین لە دڵو دەروونمدا، هەڵیگیرساندبوو چارەسەر دەکات.

هەر کە لەشە نەرمو نیانەکەی گڕوتینی لەشمی دامرکاندەوە هەستمکرد مێشکم ساف بوو.. ئالی سۆن ئەو قەڵاو سەنگەرە قایمو پتەوەیە، لە شەڕو شۆڕو هێرشی سیفین دەمپارێزێت. لەگەڵ ئەوەشدا لە ئالی سۆنیش دەترسام. بەڕاستی ژنی شارەزاو بەتوانا دەتوانێت پیاو لە ڕێگای ڕاستی وەرگێڕێت. ئەو پیاوەی ڕێگا بە هەر ژنێك بدات لە ڕێگای ڕاستی لای بداتو ڕێگای ڕاست نەبینێت. ئەو پیاوە، پیاو نییەو مرۆڤێکی نادانو بێهۆشە..

ئیتر منیش، ئاگرو بەفر.. زێڕو گەوهەر.. ڕەشو سپی. هەتا ئۆبجاشم لە مێشكو هۆشی خۆمدا دوورخستەوە. بۆئەوەی خەوێکی خۆشو ئارامم لێبکەوێتو بحەسێمەوەو مێشکم ساف بێت لە هیچو پووچیو مەکری ژنان ڕزگارم بێتو بگەڕێمەوە، سەر ئەو ڕێگایەی ژیانی خۆم لە پێناویدا تەرخان کردبوو..

* * *

# شۆڕشی سواڵکەرەکان

شازادە شێرێزاو میران شای کوڕی لە ئۆرغانجدا بۆ پێشوازیکردنم هەموو کاروبارێکیان سازو ئامادە کردبوو. گەرچی ئەم سەردانەی من لە سەردانێکی هەواڵپرسین‌و سەفەرێکی ئاسایی زیاتر نەبوو. کە شایەك دەیکات بۆ دیدەنی شاری فەرمانڕەوایەکی بەڕێزو خۆشەویستی.

لە دەرەوەی دەروازەی شارەکەوە، بە درێژایی میلێکی تەواو، ڕێگاکەیان بە فەرش‌و ڕاخەری نایاب مافووڕڕێژ کردبوو.

کاتێك کاروانە شاهانەکەی من گەیشت. دوانزە هەزار سەربازی پاسەوان تا دەروازەکراوەکانی ناو شاری ئۆرغانجی لەگەڵدا بوو.

ئەو کاتە ئەو ڕۆژەم بیرکەوتەوە کە ئەمیر سۆفی لە بەڵێنەکەی پاشگەز بۆوەو لە دەشتەکەدا چاوپێکەوتن‌و زۆران بازییەکەی منی نەکردو خۆی لێ دزییەوە..! تیشکی هەتاوی ئەو نیوەڕۆیە کە دەیدا لە لوتکەی کۆشکە زێڕینەکان‌و دەیدا لە گومەزی ئەو مزگەوتانەی تازە دروستکرابوون، یان چاك کرابوونەوە، ئەو ئاگرە فراوانەم بیردەکەوتەوە کە دە ساڵ پێش ئێستاو لەو هەڵمەتە بەرفراوانەی کردمە سەر شاری ئۆرغانج‌و بوو بە هۆی سووتانی شاری خیڤاو شارەکەی بە تەواوی تەفروتوناو وێران کردو لەسەر نەخشەی ڕووی زەویدا نەیهێشت‌و بووە هۆی ئەوە شاری ئۆرغانج خۆی پێڕانەگیری‌و بەئاسانی خۆی دا بە دەستەوە.

ئەو پێشوازییە پڕ شکۆ گەرمە، چاوبەستی لێنەکردم، کاتێك بەو ڕێگا مافووڕڕێژەدا دەڕۆیشتم‌و دەچووم بۆ ئەو جێگایە کە لەبەردەم کۆشکەکەی میران شادا، کورسی شانشینییان لەگەڵ شاژنە شێرێزادا بۆ سازو ئامادە کردبووم. هەتا ئەو قسە ئاساییانەی میران شاشم بیرنەچوو کە کردی لە کاتێکدا هات بە پیرمەوەو منیش لە ئەسپەکەم دابەزیم بۆئەوەی بە پیر ئەو خۆ بە کەم زانین‌و کڕنووشی پیاوانی شانشینەکەوە بچم. لە کاتێکدا لەبەردەمەدا کڕنووش‌و خۆچەمانەوەیان لەبەر ڕێزو گەورەییمدا کردبوو.

کاتێك لە تەنیشت خاتوو شێرێزاوە دانیشتم بۆئەوەی تەماشای ئەو نمایشە بکەم کە هێزەکەی میران شا لە گۆڕەپانەکەدا دەیکرد. شادو دڵخۆش بووم کە لە پێشوازی‌و قسەکانی خاتوو شێرێزادا ناڕامی‌و دڵەخورپێی تەواوی پێوە دیاربوو. خێرا، خێرا خاتوو شێرێزا باوەشێنەکەی ڕادەوەشاند. لێی پرسیم‌و وتی:

-باشە پێویست بوو، تۆ لەم کاتەداو لەم گەرما زۆرەدا بێیت..؟

بە تایبەتی لەم کاتەشدا کە میران شا زۆر نەخۆشەو تەندروستی بە تـەواوی تێکچووە..؟ خۆ ئەگەر دوای مانگێکی تر بهاتیتایە ئەوە چاکتر بوو..

چونکە ئەوکاتە ئۆرغانج فێنكو خۆشتر دەبوو.

وتم: شێرێزا پێویست بوو بە تایبەت، لەم کاتەدا هەر بێم.

وتی: کەواتە تۆ بۆ مەبەستێکی تایبەتی هاتوویت بۆ ئێرە.. وا نییە..؟

وتم: بەڵێ خۆشەویستم، من بە پێی پێویستو بۆ مەبەستی تایبەتی هاتووم بۆ ئێرە..

وتی: هەرچۆنێك بێت، نـەدەبوو ئێستا بهاتیتایـە.. بـەڵکو کاتێکی تـر بهاتیتایـە چاکـتر بـوو.. دڵنیاشم لەوە تۆ دەتتوانـی ماوەیـەکی تـر چاوەڕوانی بکـەیتو ئـەم هاتنـەت دوابخستایە. چونکە ئێمە بەو کتوپڕییە نەمانتوانی وەك پێویست پێشوازیت لێبکەینو خۆمـان بـۆ ئاهـەنگو شادی تەواو سازو ئامادەبکەین.

وتم: شێرێزا زۆر چاوەڕوانم کردو ماوەیەکی دوورو درێژیش خۆم دواخست.

ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە شادیو خۆشی خۆم سازبکەم.

شێرێزا لە قسەکانم سەری سووڕماو لە مەبەستی هاتنەکەم بۆ ئۆرغانج تێگەیشتو نـەیتوانی لەوە زیاتر بەرگەی ئەو گەرما زۆرە بگرێت.

بە قینو تووڕەییـەوە تەماشای ئـەو خزمـەتکارو کارەکەرانـەی کـرد کـە لـە پـەڕی تـاوس باوەشێنیان بە دەستەوە بوو. بەو باوەشێنانە باوەشێنیان دەکردین. قیژاندی بەسەریانداو وتی:

-خزمەتکارینە دەی باوەشێنەکانتان خێراتر ڕاوەشێنن.

پاشان ڕووی کرد بە لای منەوە بە شێوەی گاڵتەپێکردنێکەوە پێی وتم:

-وا دیارە قینت لێمان هەستاوە، وا بەم شێوەیە کتوپـڕ بـێ ئـەوەی پێمـان بڵێیـت بـۆ ئـێرە بـۆ لامان هاتوویت.

وتم: شێرێزا چۆن تێدەگەیت.. وا تێبگـە بـەڵام پێویسـتە ئـەوە بزانیـت هـەندێ شـازادەو فەرمانڕەوا پاشان تۆڵەو سزای خۆیان لێدەسێنرێت، دەبێت هەر لەناویان بەرەو سەریان بـپەڕێنم پێش ئـەوەی خۆری ئەمڕۆ ئاوابێت..!!

وتی: هەرچی دەکەیت بیکە.. بەڵام نابێت میران شـا هیـچ زیـانێکی پێبگات، بـەڵام ئـەوەندەی نەخایاند شێرێزا هەستی کرد شێوازی تووڕەیـیو هەڕەشـەکردن، دادی نـادات. لەبەرئـەوە شێوەی قسەکردنەکەی گۆڕیو بایدایەوە. پاشان بە شێوەیەکی نەرمو لەسەرخۆ، بە پاڕانەوەوە پێی وتم:

-سەرداری گەورەم، میران شا گەنجێکی باشە، میران گەنجێکی خوێن گەرمو تازەپێگەیشتووە. هیچ لۆمەی ناکەوێتە سەرو لۆمەش ناکرێت.. هەرچۆنێك بێت ئەوەی بیستووتە لە درۆو دەلەسەو قسە دروستکردنو دوو زمانی زیاتر.. هیچی تر نییە..!!

وتم: شێرێزا من بڕیار لەسەر ئەوە دەدەم.

وتی: تەیموور ئاخر تۆ نابێت خراپەت بۆی هەبێتو منیش ناهێڵم بە هیچ جۆرێك زیانت بۆی هەبێتو ئازاری بدەیت..

لەم کاتەدا میران شا سواری ئەسپەکەی ببوو لە پێش فەوجە تایبەتییەکەی خۆیەوە دەڕۆیشتو بە بەردەم شانشینەکەمدا تێپەڕیو سڵاوی لە ئاڵای شاهانەکەم کرد.

منیش لە جێگاکەی خۆم ڕاستبوومەوەو وەڵامی سڵاوەکەیم دایەوە. شێرێزاش زۆر بە گەرمیو پەرۆشەوە شاڵە سەوزەکەی دەستی بۆ ڕاوەشاند.

هەستم بە خۆشیو شادییەکی تەواوکرد. چونکە خاتوون دوای ئەوە منی بیرچوو، ئیتر ڕووی تێنەکردمەوەو منیش ئەو ماوەیەی کە نمایشەکە مابووی بە هیچ جۆرێك خۆم تێنەگەیاندو قسەم لەگەڵدا نەکرد.

بۆ هۆڵی دادگا شێرێزاش لەگەڵمدا هاتو لەوێ چاوەڕوانی گەڕانەوەی میران شاو پیاوانی شانشینەکەی دەکرد. چونکە میران پێشەوایی هێزو سەربازەکانی لە نمایشەکەدا دەکرد.

هەر کە داوام لە پیاوەکانم کرد، چەند تەشتێكو کۆتەدارێکم بۆ بێنن بۆئەوەی ملو گەردنی ئەوانەی بخرێتە سەر کە فەرمانی سەرپەڕاندنیان بەسەردا دەدرێت.. خاتوو شێرێزا بە ترسو لەرزێکی شێتانەوە قیژاندیو وتی:

-تەیموور کوڕەکەت سەرمەبڕە..

ئەوەندەی وتو بوورایەوەو لە هۆش خۆی چوو.

منیش فەرمانم بە پیاوەکانم دا هەڵیگرنو بیخەنە سەر دەستەبەرە[4] یەكو بیبەن خێرا پزیشکی بۆ بانگ بکەن با چارەسەری بکات.

ئاوەها کاتێك میران شاو پیاوەکانی میرنشینەکەیو شازادەکانی ئۆرغانج هاتنە ژوورەوە. کورسی دانیشتنەکەی خاتوو شێرێزا چۆڵ بوو.

پیاوەکانی منیش زنجیریان کردبووە دەستی ئەو کاربەدەستو شازادانەی ئۆرغانجەوەو بۆ لای منیان هێنان.

---

[4] دەستەبەرە = ئەقالە.

لە سەرو سیمای ئەو تاوانبارانەدا نیشانەی ترس‌و ترسنۆکی‌و ملهوڕی‌و ڤین‌و تووڕەیی‌و لوتبەرزی دیاربوو.

بەلام لەناو هەموو ئەوانەدا تەنها پیاوێکی شەمۆلە[*] ی کورتەبالای پشتکۆم نەبێت هەر کە هاتەژوورەوەو کۆتەدارەکەو ئامێری سەربڕین‌و دوو کۆیلە ڕەشەکەی لەملاو لەولاوە ڕاوەستابوون بینی‌و دوو شمشێری گەورەی تیژیان گرتبوو بە دەستەوەو ئامادەی فەرمان بوون. دەستیکرد بە پێکەنین‌و گاڵتەپێکردنی. کابرای شەمۆلەی کۆم لە بەردەم مەوکیبی شازادە بێدەنگەکاندا بە خۆشی‌و شادییەوە دەستیکرد بە سەماو گۆرانی وتن‌و وتی:

-ئەی شازادە بەڕێزەکان ئەمە دادو دادوەرییەو جەلادەکانتان لەو گوناهو تاوانانەی کردووتانە بێگوناهن‌و تاوانبار نین..!!

ئەی شازادە بەڕێزو فەرمانڕەواکان ئەمە دادو دادوەرییە..!!

زۆر سەرم سووڕما لەو حەرەکەو جموجووڵە ڕێك‌و ڕەوانەی ڤاچ‌و لاقەکانی ئەو شەمۆلە کۆمەدا بە جوانی دەیکرد سەرنجی ڕادەکێشا.

دانیشتوان‌و خزمەتکارەکانیش لە کانگای دڵیانەوە پێی پێدەکەنین‌و دەستیانکرد بە چەپڵەلێدان بۆی. کابرای شەمۆلەی کۆم لە پاداشی ئەو چەپڵەیەدا کە ئامادەبووان بۆیان لێدا، سەری ڕێزی بۆ دانەواندن‌و پاشان کڵاوو خوودەی شازادەیەکی نزیك خۆی لەسەر فڕاندو بازی دایە سەر کۆتەدارەکەو پاشان بە شێوەی ڕێزو ئیحترامێکی گاڵتەجاڕییەوە کڵاوو خوودەکەی بە لایەکی سەریدا لارکردەوە. ئەوەندەی نەخایاند بە شێوەیەکی لەسەرخۆو ڕێزەوە ڕاوەستاو زۆر بە هێمنی‌و لەسەرخۆییەوە کەوتە قسەو وتی:

-ئەی ئەمیرە بەڕێزەکان، ئێوە هەمووکات، لە هەموو شتێکدا لە پێش منەوە بوون. فەرموون دەی ئێستاش ئێوە پێش من بکەون‌و دوای ئێوەش سەرەی من دێت. ئیتر دوای ئەوە کڵاوو خوودەکەی هەڵدایەوە بۆ خاوەنەکەی‌و زۆر شارەزایانە لە سەر کۆتە دارەکە بازی داو هاتە خوارەوە.

پاشان سەری دانەواندو دەستی ڕاستی پانکردەوەو بۆ جەللادەکانی درێژکردو ئاماژەی ئارەزوو ڤایلبوون‌و چۆڵکردنی جێگاکەی خۆی بۆ پیاوێکی تر کرد.

پیاوەکانی من هەر کە ئەم گاڵتەجاڕی‌و حەرەکەتانەی کابرای شەمۆلەی کۆمەیان بینی‌و بیست دووبارە دەستیانکردەوە بە پێکەنین‌و چەپڵەلێدان.

---

(*) شەمۆلە = قەزەم.

ئاماژەم بۆ کرد کە بێت لەسەر کورسییە چۆڵەکەی خاتوو شێرێزا لە تەنیشتمەوە دابنیشێت.

لە جیاتی ئەوەی لە خۆشیاندا سەمابکات. بە شێوەیەکی گاڵتەجاڕیو سووکایەتییەوە شەلەشەل لاسایی ڕۆیشتنەکەی منی کردەوەو بەرەو کورسییەکە هات..!! ئا بەم کردەوەیەی خراپترین کوشتنو مردنی تووش خۆی کرد.

بەڵام کاتێك کابرای شەمۆڵەی کۆم لاسایی شەلێتییەکەی منی کردەوە هیچ کەسێك لە پیاوەکانم نەیانوێرا پێبکەنن.

لەسەر کورسییەکە دانیشت بە تووڕەییەوە لێم پرسی:

-تۆ کێیت..؟

وتی: جووتاهی گێلو نەفام..!!

وتم: ئایا بەڕاستی تۆ گێلو نەفامیت..؟!!

وەڵامی دایەوە: بەڵێ گەورەم.،، بەڵام ئەی تۆ کێیت..؟!!

خۆم لە پرسیارەکەی گێل کردو بەسەر ئاماژەم بۆ جەللادەکان کرد کە سەری یەکەم پیلانگێڕ ببەڕێنن..!!

-جووتاه دەستی پانکردەوە، وتی:

-ئەمیر "هریس" ئێستا بەم شێوەیە نوێژ دەکات.. بە دەنگێکی نووساوەوە دەستیکرد بە وتنی هەندێ وشە. کاتێك ئاوڕم بۆ دوای خۆم دایەوە.. ئەمیر هریسیم بینی بەرەو کۆتە دارەکە دەچێتە پێشەوە، لە سیماو ڕوویدا هەمان دەربڕینو سەرو سیمام بینی کە جووتاهی گێل پیشانی دەداو بەردەوام وەکو ئەو نوێژی دەکردو لەبەرخۆیەوە بە دەنگێکی نووساوەوە، بە گەرمی قسەی دەکرد. تاکو کۆیلە ڕەشەکە سەری پەڕاندو سەرەکەی کەوتە ناو تەشتەکەوە.

ئینجا دوای ئەوە جووتاه وتی:

-ئێستا ئەمیر زوهێر دەستدەکات بە جوێن پێدانو نەفرەت لێکردنت..!!

قسەکەی ڕاستبوو، ئەمیر زوهێر بە دەنگێکی بەرزو قایم قیژانیو دەستیکرد بە جوێن پێدانو نەفرەت لێکردنم.

هەتا بە دەستی کۆیلە ڕەشە گەورەکە سەری پەڕاند.

ئینجا جووتاه وتی:

-ئێستا دەبینی ئەمیر ڕاویجا بەم شێوەیە دەگریو فرمێسك دەڕێژێت. دەستیکرد بە گریانو زۆر بە شێوەیەکی ئاسایی فرمێسك بەسەر ڕوومەتەکانیدا دەهاتەخوارێ.

لەڕاستیدا فرمێسکەکانی ڕاویجا بە تەواوی وەك فرمێسکەکانی جووتاھ بە ڕوومەتەکانیدا دەھاتە خوارەوە.

ھیچ ئەوەندەی نەخایاند کۆیلە ڕەشەکە سەری ڕاویجاشی پەڕاندو خوێنەکەی بەسەر مل و زەوییەکەو ناو تەشتەکەدا پەرش و بڵاو بۆوە.

جووتاھی گێل بەردەوام بە شێوەیەکی گاڵتەجاڕی و پێکەنینەوە باسی سلوکی ھەر ئەو ٢٠ شازادەیەی کرد کە لە ھۆڵی دادگاو دادوەریدا ئەو ڕۆژە ئیعدام کران و سەریان پەڕێندرا.

زۆر سەرم لەم گێلە پیاوە، لەم شەمۆلە کۆمە نەفامە سووڕما، چۆن ئەم نەفامە بەو شێوەیە شارەزای دڵ و دەروون و تەبیعەتی ئەو ھەموو پیاوانە بوو..!! سەرە ھاتە سەر جووتاھی گێل و نەفام.

ئینجا نۆبەی من بوو گاڵتەی پێبکەم. وەرگەڕامەوە بە لایەوەو سڵاوێکم بۆ کرد. بە قین و تووڕەییەکی زۆرەوە تەماشای کردم و ناوچەوانی گرژ کردو چاوەکانی بچووك بوونەوە ھێندەی کونە سووژنێکیان مایەوە.

ڕووم تێکردو پێم وت:

-جووتاھ خەڵکی وا باش دەناسیت و تێیان دەگەیت. واتلێدەکات شایانی ئەوە بیت ببیتە شاھێنشاھ.

بەڵام بە داخەوە بچووکی لەشت و کورتە باڵاکەت و پشت کۆمەکەت. ئەم ھەموو عەیبداری و ناشیرینانییەت، بێگومان بوونەتە ھۆی ئەوە نەھێڵن ئیشوکارێکی سەرەکی دەوڵەتیشت بدرێتێ.

بە شێوازو شێوەیەکی گاڵتەپێکردنەوەو بێئەوەی ڕێز بۆ پلەو پایەو ناونیشانم دابنێ پێی وتم:

-ئەی تەیموور تێگەیشتن و زانینت لە شتە شاراوەو ناوەکییەکانی ناو دڵ و دەروونی خەڵکی وای لێکردوویت، ببیت بە گێلەپیاوێکی زۆر زۆر چاك. بەڵێ بێگومان. قاچە شەلەکەت بوونەتە ھۆی ئەوەی نەتوانیت سەمایەکی ڕێك و پێك بکەیت و بە خێراییش بڕۆیت..!!

ھەر کە ئەم قسە ناشیرین و نابەجێیانەی کرد لە شوێنەکەی خۆم ڕاچڵەکیم.. ئەوەندەی نەخایاند دەستیکرد بە قاقای پێکەنین و لە شوێنەکەی خۆیەوە بازی دایە سەر زەوییەکەو دەستیکرد بە سەمایەکی ڕێکوپێك و زۆر سەیرو گران. ئینجا دوای ئەوە بە شەلە شەل و لاساییکردنەوەی من، بەرەو کۆتە دارەکە ڕۆیشت.

پاش ئەوەی چووە نزیك كۆتە دارەكەوە، وەرگەڕایەوە بە لامەوەو زۆر لەسەرخۆو بەڕێزو گەورەییەوە سڵاوی لێكردم.

منیش لەسەر كورسی شانشینەكەم هەستامو وەڵامی سڵاوەكەیم دایەوەو لە شوێنەكەی خۆم دانیشتمەوە.

بەڵام ئەو بەسەر كۆتە دارەكەدا چەمایەوە، هەتا كۆیلە ڕەشەكە بە شمشێرە تیژە گەورەكەی سەری پەڕاند..!!

لەڕاستیدا جووتاھ لەهەر هەموو شازادەكانی تر خەتەرناكتر بوو. چونكە وا خۆی پیشان دەدا، گوایە گێلو نەفامە. بەڵام ئەو زۆر بە ئاشكراو ڕووبەڕوو گاڵتەی پێدەكردم. و بەبێ شەرمو نەترسییەوە لاسایی شەلینو لەنگییەكەی منی دەكردەوە.

لە كاتی سەرپەڕاندنی ئەو خەڵكانەدا میران شا لە لایەكی هۆڵەكەوە بە ماتو مەلوولی ڕاوەستابوو، تەماشای سەرپەڕاندنی ئەو شازادانەی دەكرد بێ ئەوەی بە هیچ جۆرێك ئەم سەرپەڕاندنانە كاریكاتە سەر هەستو نەستیو تۆزێك سیماو ڕووی تێكبدات.

كاتێك جەللادەكانم ئیزن دا میران شا بە سەرسووڕمانێكی زۆر سەیرەوە تەماشای منی كردو حەپەسا. چونكە من سەریم نەپەڕاندو لە لاشەیم جیانەكردەوە.

پاشان ڕووم تێكردو پێم وت:

-كوڕم.. وەرە لەگەڵمدا با بڕۆین بچین دایكت ببینینو بزانین چی لێ بەسەرهاتووە..؟!

زۆر بە ساردییەكەوە وەڵامی دامەوە:

-بەڵێ.. باشە.. باوكە..

ئینجا لە دوامەوە هەنگاوی ناو لە ڕاڕەوەكەوە ڕۆیشتین بۆ ژوورەكەی شازادە شیرێزا پێش ئەوەی بگەینە ژوورەكەی گوێمان لە خاتوون بوو هاواری دەكردو دەیناڵاندو دەگوڕوزایەوەو دەگریا.

پێش ئەوەی خزمەتكارو یاریدەدەرەكانی هاتنی منی پێڕابگەیەنن. خۆم كرد بە ژوورەكەیدا. شیرێزام بینی لەسەر دۆشەكێكی نەرم ڕاكشاوەو بە كوڵ دەگریو هاودەمەكانیشی لە بەردەمیدا باوەشێنی دەكەن.

ئینجا منیش بە تووڕەییەوە بە خاتوونم وت:

-هەر ئێستا خۆت ئامادەكەو لەگەڵمدا وەرەوە بۆ سەمەرقەند.

لێی پرسیم وتی:

-تەیموور بۆ سەمەرقەند..؟

-بەڵێ.. بۆ سەمەرقەند..

ئا لەم کاتەدا شێرێزا میران شای کوڕی بینیو بە حەپەساوییەوە قیژاندی:

-میران شا.. تەیموور.. نەتکوشتووە؟!!

کوڕەکەمت نەکوشتووەو ئازارت نەداوە.. میران وەرە بۆ لای دایکت.. بە تەواوی پرزەی لێبڕاو لە پەلوپۆ کەوت.. کاتێك میران شا لە بەردەمیدا بە چۆکدا هاتو سەری خستە ناو باوەشییەوە. دەستیکرد بە گریانو لەشی کەوتە هەژانو لەرزین. چەند چرکەیەك بێدەنگ بوو.. وردە وردە هاتەوە سەرخۆو هەمدیسان پاش ئەوەی هەناسەبڕکێی نەماو حەسایەوە توانی قسەبکاتەوە، پێی وتم:

-تەیموور من خۆم دەمزانی تۆ کوڕەکەم ناکوژیتو ئازاری نادەیت.. چونکە تۆ میرانت خۆشدەوێتو منیشت هەر خۆشدەوێت. بەڕاستی تەیموور تۆ پیاوێکی باشیت..!!

وتم: کار هەرچۆنێك بێت شێرێزا ئێمە بەیانی زوو لەگەڵ خۆرهەڵاتندا دەکەوینەڕێو دەچینەوە بۆ سەمەرقەند لەبەرئەوە دەبێت هەر لە ئێستاوە خۆ ئامادەبکەیت..

وتی: نەخێر سبەینێ ناڕۆین. چونکە بەم پەلەپەلە، ناتوانین کەلوپەلو شتەکانمان کۆبکەینەوە.

وتم: نەخێر.. هەردەبێت سبەینێ بڕۆین..!!

وتی: ئاخر ئێستا زۆر گەرمایە.. باشە نابێت مانگێکی تر چاوەڕوان بکەین؟ ئەوکاتەش دنیا خۆشدەبێتو کەشوهەوا فێنك دەبێت.

وتم: نەخێر.. پێویستە زۆر بە زوویی‌و هەر ئێستاش بگەڕێمەوە.. لەمەودواش نوورەددین فەرمانڕەوایی ئێرە دەکاتو لە دوایشدا تۆڵەو سزا لە تاوانبارەکانی تریش دەسێنێتو بە سزای خۆیان دەگەیەنێت. جا لەبەرئەوە پێویستە سبەینێ ئێرە بەجێبهێڵینو بڕۆین. دەبێت تۆش هەر لەگەڵمدا بێیت.

وتی: تەیموور تۆ ئێستا بڕۆ، ئێمەش لە دواییدا دێین بۆ لات چونکە ئێستا تەندروستی میران شا چاك نییە.

پاشان شێرێزا ڕوویکردە کوڕەکەیو بە دوودڵییەوە لێی پرسیو وتی:

-تەندروستیت چاك نییە.. میران.. وا نییە..؟

وەڵامی دایەوە: بەڵێ.. دایە..

وتی: خۆ ناشتوانیت لەگەڵ باوكتدا برۆیت.. وا نییە.. میران..؟

وەڵامی دایەوە: بێگومان من ئێستا ناتوانم سواری ئەسپ ببم..

هەستمكرد ڤینو بوغز لە دڵو دەروونمدا دەكوڵێت.

بە توورەییەوە روومكردە شێرێزاو پێم وت:

-خۆ كورەكەت دەتوانێت لە دارە مەیتێكدا رابكشێتو لەگەڵ ئێمەدا بێت بۆ سەمەرقەند!!

وتی: بۆچی..؟ بەڕاستی من تێناگەم لەبەرچی تۆ ئەوەندە جەخت دەكەیت لەسەر ئەوەی لەم كاتەدا ئێمە لەگەڵ خۆتدا بەریت..

وتم: پێویست ناكات تۆ تێبگەیت، ئەوەی پێویستە تۆ تێی بگەیت ئەوەیە پێویستە لە كازیوەی بەیاندا ئامادەی رۆیشتن بیت لەگەڵماندا ئێستا تێگەیشتیت..؟

وەڵامی دایەوە: تەیموور.. خەریكە تێبگەم.. بەڵام ئەم توورەبوونو رووگرژییە بۆ..؟

وتم: بۆ ئەم كارە دەمەدەمم لەگەڵدا مەكە.. ئێستا كاتی ئەوە هاتووە لە هەستو مەبەستم بگەیت..!!

پاشان وەرگەڕامە دواوەو لە ژوورەكەدا چوومە دەرەوە..

شێرێزا لە دوای من بە دەنگێكی زۆر بەرزەوە ڤیژانی:

-تەیموور.. تۆ ئینسانێكی سەخیفو بێ مێشكی..

-تەیموور.. تۆ هیچو پووچو بێ مێشكیت..!!

كاتێك لە ژوورەكە هاتمە دەرەوە، چاوم بەو پزیشكە كەوت كە چارەسەری شێرێزای دەكرد.. بە دڵەخورپێوە لێی پرسیم:

-سەرداری گەورەم، تەندروستی خاتوو شێرێزا.. چۆنە..؟

وتم: ژنێكی هیچو پووچو.. دەرمانێكی كاریگەری باشی بدەرێ با مێشكی خۆی، بێ پاك بكاتەوە..

وتی: گەورەم لەسەرخۆ بەو توورە مەبەو مێشكی خۆتی پێوە هیلاك مەكە. پزیشكەكەم بەجێهێشتو بە ڕاڕەوەكەدا گەڕامەوە بۆ هۆڵی دادوەر..

لە میانەی ئەو تێكەیشتنە جەنگیو سەربازییانەو لە میانەی ئەو نووسینو هەواڵانەی عەبدوڵڵا دایمێ. لە وردو درشتی پیلانەكە بە درێژی تێگەیشتم. ئەو پیلانو پیلانگێڕانە مەبەستیان بێهێزكردنی فەرمانڕەوایی من بوو.

لە نیوەشەودا لیستەیەك ناوی تاوانبارانم دا بە نووردەدین كە لە دوای من پێویستە لە ملیان بداو سەریان ببەڕێنێت.

ئینجا لە دوایيدا بە ئاسوودەیی‌و بێ خەم لە ئۆرغانجەوە گەڕامەوە پایتەختەکەم‌و بە تەواوی دڵنیابووم لە بەهێزی فەرمانڕەواییم لە سنووری ئیمپراتۆرییەتییەکەمدا، بەڵام کاتێك گەیشتمەوە سەمەرقەند بینیم ئاژاوەو هەراو هوریایەکی زۆر لەناو شاردا بەرپا بووە. بازاڕو جادەکانم بینی چۆڵ‌و هۆڵ‌و دەرگای دووکانەکان لە ترسی ئاژاوەو تاڵان‌و بڕۆی ناو شەقامەکاندا، داخرابوون.

سواڵکەرو هەژارو دەرۆزەکەرەکانم بینی لە هەموو لایەکەوە کۆمەڵەیان کردبوو بە دەنگی بەرز هاواریان دەکردو قسەی نابەجێ‌و جوێنی ناشیرینیان دەداو دەنگ‌و سەدایان لە هەموو لایەکەوە دەنگی دەدایەوە.

هیچ کاربەدەستێکم نەبینی تاکو پرسیاری لێبکەم‌و ڕاستی ئەم بەسەرهات‌و ئاژاوەو هەراو هوریا ناخۆشەم بۆ باس بکات.

لەبەرئەوە هەزار پیاوم لە سەربازە تایبەتییەکانی خۆم نارد بۆئەوەی هێمنی ئاسایش‌و نیزامی ناو شارەکە بگەڕێننەوە بۆ هاوڵاتیانی شارەکە.

خۆشم بە پەلەو بە خێرایی چووم بۆ لای ئیمام بۆئەوەی واز لە خاتوو شێرێزاو کوڕە پیس‌و بێفەڕەکەی بهێنم‌و ڕزگارم بێت لێیان.

شوێنێکی تایبەتیم لە کۆشکەکەمدا بۆ خاتوو شێرێزاو کوڕەکەی تەرخان کردو پێکەوە کردمنە ناو ئەو بەشەوە کە بۆم تەرخان کردبوون.

ماوەیەکی کەم لەوێ مامەوەو ڕێنمایی خزمەتکارەکانم کرد کە بە باشی خزمەتیان بکەن‌و هەرچی شتێکیان دەوێت بۆیان ئامادە بکەن.

خاتوو شێرێزا زۆر هیلاك‌و ماندوو بوو. زۆریش دەترسا. هەر کە چوومە ژوورە ڕازاوەکەیەوە، خۆی دا بەسەر جێگا نەرمەکەیداو پاڵکەوت. بەڵام بە چاوو دڵ هوشیار بوو. ترس‌و لەرزیشی پێوە دیاربوو.

بە دەنگێکی نەرم‌و نیانەوە لێی پرسیم:

-تەیموور کوڕەکەم لێناسێنیتەوە.. وا نییە؟

وتم: بەڵێ.. بەڵام لەمەودوا کوڕەکەت نابێت لە ژوورەکەت بێتە دەرەوە. چونکە من دەزانم هەست‌و شعورت بەرامبەر کوڕەکەت چۆنەو چەندیشت خۆشدەوێت. جا لەبەرئەوە من ڕێزی ئەو هەست‌و ئەستەت دەگرم‌و کوڕەکەت لێنەسەندمەوە.

وتی: سوپاست دەکەم تەیموور من دەزانم تۆ مرۆڤێکی زۆر چاك‌و بێ هاوتایت.

وتم: من فەرمانم داوە کە کوڕەکەت لەگەڵتا بێت‌و هەرچی شتێکیشی پێویست بوو بیدەنێ وەك عارەق‌و حەشیشەو تلیاك‌و ژن‌و هەرچی شتێکی تر کە داوای بکات. تۆش دەتوانیت لەگەڵ خۆتدا دایبنێیت‌و هەرچی شتێکی لێ داوا کردیت بۆی بێنیت‌و حەزو ئارەزووی لەسەر چی بوو، خێرا بێ کەم‌و کوڕی بۆی جێبەجێ بکەیت.. ئایا ئەمەت وا پێخۆشە..؟

وتی: بێگومان سەرداری گەورەم..!! هیچ ژنێك مێردی وەکو تۆ چاك‌و باشی نییە.. مێردە خۆشەویستەکەم. من لە ئێستاوە ئیتر دەبم بە کۆیلەو ئەڵقەلەگوێت‌و هەرگیز لەژێر فەرمانتا دەرناچم.. بەس تۆ تەنها ئەوەندە وازم لێ بێنە با کوڕەکەمم لەگەڵدا بێت..

شێرێزا لەسەر جێگاکەی هەستاو هات لە بەردەممدا بە چۆکدا هات‌و بە هەردوو دەستی، دەستی ڕاستی گرتم‌و نووساندی بە دەمییەوەو بە فرمێسکی چاوەکانی تەڕی کرد..!!

منیش دەستیم گرت‌و هەڵمساندو بردمەوە سەر جێگاکەی‌و لەسەر جێگاکە ڕاکشاو وازم لێهێناو گەڕامەوە بۆ بارەگای ناو کۆشکەکەم.

هەر کە گەیشتمەوە بارەگاکەم هەرچی زوڵم لێکراوو شکاتکەرێك هەبوون بە هانایانەوە چووم‌و بەڕێم کردن. جگە لە نەسری کوڕی ئەدهەم نەبێت ئەویش هیلاك‌و ماندوو و ڕەنگ زەردو زەعیف. لە یەکەمجاری زۆر تووڕەتر بوو کە هات بۆ لام‌و دوا پێشنیاری کارگوزارییەکەی پێشکەش کردم.

بە پەرۆشی‌و پێداگرتنەوە لێم پرسی‌و وتم:

-باشە.. نەسری کوڕی ئەدهەم دەی ئێستا پێم بڵێ بزانم چی ڕووی داوە؟

وتی: سەرداری گەورەم، تۆ خۆت باش دەزانیت من هەوڵم داو ویستم یارمەتی سواڵکەرو هەژارەکان بدەم. تۆ خۆشت ئەم کارەت پێ خۆش بوو. خۆشت ویستت یارمەتییان بدەیت. وا نەبوو گەورەم..؟

وەڵامم دایەوە:

-بەڵێ.. وابوو.. دەی قسەکانت تەواو بکە..

وتی: باشە گەورەم.. دەستمکرد بە گفتوگۆ لەگەڵ ئەو سواڵکەرە بێوەفاو هیچ لەبەرچاو نەبوانەدا.. کە من چیم لە پێناویاندا نەکردو چیم بۆ نەکردن.. لە جیاتی سوپاس‌و پێزانین ئەو سپڵانە پێدەکەنین‌و گاڵتەیان پێدەکردم‌و داوای خێرو یارمەتی زیاتریان لێدەکردم. منیش بە پێی ڕاوێژو ڕەزامەندی‌و ئەو ڕێکەوتنەی لەگەڵ زوربەی زۆری ئەو سواڵکەرە چەپەڵ‌و پیسانەدا

کردم بیست پیاوم لەو سواڵکەرە چاوچنۆکانەی بەردەوام داوای خێرو یارمەتییان دەکرد گرتن‌و هێنام دەستیانم بڕی.

لەم کاتەدا نەسری کوڕی ئەدهەم بیری ئەو دەستانەی کەوتەوە کە سواڵیان دەکردو ئەم بڕیبوونی.. لە خۆشیاندا شەیتانانە فرمێسکی شادی بە چاوەکانیدا هاتەخوارەوە. کتوپڕ زەردەخەنەیەکی زۆڵانە بەسەر لێوەکانیدا تێپەڕی. ئەوەندەی نەخایاند دەموچاوی خۆی گۆڕی‌و زەردەخەنەکە لە ڕوویدا نەما..!!

پاشان دەستی بە قسە کردەوەو وتی:

-بەڵام هەر ئەوەندە خۆش بوو، بڵاوەیان لێکرد.. هەر دوای ئەوە ئەو سواڵکەرانە لە شەقامەکاندا کۆبوونەوەو دەستیان کرد بە ئاژاوەنانەوەو خراپەکاری‌و لە هەموو لایەکەوە بە دەنگی بەرز دەیانقیژاندو هاواریان دەکردو داوای خێرو پارەیان دەکرد..!!

نەسری کوڕی ئەدهەم لەم کاتەدا دەستی خستە ناو کونە گوێچکەکانییەوە، وەك ئەوەی لە کۆشك‌و بارەگاکەی منیشدا دەنگی ئەو سواڵکەرو هەزارانە بە گوێیدا بدات‌و گوێی کەڕ بکات.

هەمدیسان کەوتەوە قسەو وتی:

-ئیتر منیش لە قین‌و تۆڵەی ئەمەدا دووبارە ئەو سواڵکەرە چەپەڵانەم کۆکردنەوەو زمانی سەد سواڵکەریانم بڕی‌و چاوی سەد سواڵکەری تریانم دەرهێناو هەزار کەسی تریشیانم کوشت‌و پاشان..

-پاشان چی..؟ نەسری کوڕی ئەدهەم پاشان چی..؟

-پاشان سواڵکەرەکانی تر لە خۆشیاندا دەستیانکرد بە هەل هەلە لێدان. چونکە من ژمارەی سواڵکەرەکانم کەم کردۆتەوەو ژمارەیەکی زۆر لەوانەم کوشتووە، کە لە سواڵکردندا بەربەرەکانیان لەگەڵدا دەکردن..!!

نەسری کوڕی ئەدهەم تۆ ئەگەر وەك خۆت دەڵێیت ژمارەیەکی زۆرت لەو سواڵکەرانە کوشتبێت‌و بەوە ژمارەیانت کەم کردبێتەوە.. ئەوا من دەڵێم تۆ بەمە کارێکی باشت کردووە. بەڵام هەرچیت کردووە کردووتە قەیناکات.. باشە دوای ئەو چی تریشت کرد..؟

-کاتێك هەزار سواڵکەرم لە شەقامەکاندا نەدەهێشت‌و لەناوم دەبردن.. خەڵکی دەیانوت ئەوا ئیتر سواڵکەر لە سەمەرقەندا نەماو دوایی هات. بەڵام هیچ ئەوەندەی نەدەخایاند.. دوو هەزاریتر لە شەقام‌و کۆڵانەکاندا قوت دەبوونەوەو نەمدەزانی ئەوانە لە کوێوە دێن‌و چۆن پەیدادەبن..!! هەر دوای هەفتەیەکیش، هەر کە ئەو سواڵکەرانەی چاویانم دەرهێناو دەست‌و

زمانیانم بڕیبوون. تەندروستیان باش دەبوو، هێزو توانایان پیادا دەهاتەوە لە شەقام و سەر سووچ و پەناکاندا دادەنیشتنەوەو چاوە کوێرو دەرهاتووەکانیان و دەستەبڕاوەکانیان و بە هەناسەبڕکی زمانە بڕاوەکانیان پیشان خەڵکی دەداو بەم شێوەیە سەرنج و سۆزو بەزەیی خەڵکیان بۆ لای خۆیان ڕادەکێشاو ڕەحم و بەزەیی خەڵکیش دەجووڵاو پارەیان دەدانێ و هەمدیسان دەکەوتنەوە سواڵکردن، ئیتر ئەم جەزایەی من دەبوو بە سوودو چاکە بۆیان.

منیش کە گوێم لەم قسانە بوو پڕبەدڵ دەستمکرد بە پێکەنین.

بەڵام نەسری کوڕی ئەدهەم بە تووڕەییەوە تەماشای کردم و دەستی بەملاو بەولادا پان کردەوەو بە دەنگێکی نووساوەوە وتی:

-ئیتر دوای ئەوە بە هەزارەها سواڵکەری مل ئەستوورو بەهێز، هێرشیان کردە سەر شوێن و جێگای کاروبارەکەم و مستەکۆڵەیان بەرزدەکردەوەو ڕایاندەوەشاندو بە هەموو هێزیانەوە دەیانقیژاندو هەڕەشەیان لێدەکردم. چونکە من وام لە هاوڕێکانیان کردووەو ئەمەش بۆتە سوودو هەلێکی باش بۆیان بۆئەوەی سواڵ بکەن و ڕەحم و بەزەیی لە دڵ و دەروونی خەڵکیدا زیاتر بۆیان بجووڵێت و پارەو یارمەتی و شتومەکیان بدەنێ..!!

بە هەموو هێزو توانایانەوە دەیانقیژاندو دەیانوت: ئێمە کەسمان لە شەقامەکاندا، کەس بەزەییان پیاماندا نایەتەوەو یەك پوولی قەڵبمان نادەنێ.

تۆ ئەو دابونەریتی خێرو سواڵکردنەت نەهێشت کە خەڵکی پەیڕەوییان دەکردو لە دێرزەمانیشەوە ئەم دابونەریتە، هەر بووەو پیرۆزیش بووە. تۆ لەم مافە پیرۆزە بێبەشت کردووین و ڕق و قینی خوات لێ هەستاندووین و خوات لێ ڕەنجاندووین و قەهرو غەزەبی لێگرتووین.

-نەسری کوڕی ئەدهەم ڕەنگە بەو کردەوەیەت، ئەممەت کردبێت..

-ئێستاش پەلوپۆم لێبڕاوەو ناتوانم بۆ هیچ لایەك بچم و پاسەوانەکانم بە شمشێرەکانیانەوە لە دەورەم ڕاوەستاون و دەمپارێزن. ماڵم لێبووە بە دۆزەخ و بەندیخانەو وەك بەندێك تیادا دەژیم و ناوێرم لە هیچ لایەك خۆم دەرخەم. لە ترسی ئەو پیاوە سپڵانەی کە یارمەتیم دابوون و لە ترسی ئەوانەی چاویانم دەرهێناوەو دەست و زمانیانم بڕیون و لە ترسی ئەوانەشی کە گوشتوومن. لەم کاتەدا نەسری کوڕی ئەدهەم، وەرگەڕایەوەو بە پەل وپۆ شکاوی ڕوو هەڵبزرکاوییەوە، بێ ئەوەی ئیزن لە من وەربگرێت. خۆی دا بە سەر کورسییەکەداو دانیشت و لەسەری پان بۆوە..

سەرم داخستو پێموت:

-بەڵێ ئەسری کوڕی ئەدهەم تۆ بەڕاست خوات ڕەنجاندووەو قەهرو غەزەبیت هەستاندووەو تووڕەت کردووە. چونکە تۆ دەستکاری ئیشوکاری ئەم سواڵکەرانەت کردووە. چونکە تۆ دەستکاری ئیشوکاری ئەم سواڵکەرانەت کردووە. خواش ئەمەی پێ خۆش نییە..

وتی: بەڵام گەورەم من ئەمەم بە پێی فەرمانی تۆ کردووە. لە خۆشمەوە نەمکردووە.. گەورەم وا نییە..؟

وەڵامم دایەوە:

-هەرچۆنێك بێت.. مەترسە.. دەمەوێت ئەوەت پێبڵێم، تۆ بەو کارەی کردووتە، هیچ کارێکی خراپو نابەجێت لەگەڵ منداڵ نەکردووە.. ئیتر دوای ئەوە لەسەر کورسییەکەی خۆم هەستامو ئەسری کوڕی ئەدهەمیش لە جێگاکەی خۆی هەستاو دوام کەوت بۆ ژووری چاوپێکەوتن. کە پاسەوانە تایبەتیەکانی خۆمی تێدابوو. لەوێوە لەگەڵ ئەو پاسەوانانەدا بۆئەوەی پاسەوانیمان بکەن، چووین بۆ ماڵی ئەسری کوڕی ئەدهەم.

خەڵکێکی زۆرو سواڵکەرێکی هێجگار زۆر لەو ناوەدا ڕاوەستابوونو کۆمەڵەیان کردبوو. جادەو کۆڵانەکانیان گرتبوو. ڕێ بەر ڕێبوار نەدەکەوت.

بەڵام پاسەوانەکانم دریان بەو سواڵکەرانە داو بڵاوەیان پێکردنو ئەو ڕێگایەیان بۆ چۆڵ کردم کە پیادا دەڕۆیشتم.

کاتێك چووینە ماڵەکەوە ماڵی ئەسری کوڕی ئەدهەم و چووینە ئەو هەیوانەی دەیڕوانی بەسەر ئەو سواڵکەرانەی لەبەردەم ماڵی ئەسری کوڕی ئەدهەمدا ڕاوەستابوون. دەستم بەرزکردەوەو فەرمانم پێدان بێدەنگ بنو قسە نەکەن. ماوەی چرکەیەکی تەواو ڤیزانیانو هاواریان کردو جنێویان بە ئەسری کوڕی ئەدهەم دا. بەڵام دوای ئەوە بە تەواوی بێدەنگ بوون.

منیش دوای ئەوە بە ڕەقیو تووڕەییەوە ڕووم تێکردنو پێم وتن:

-ئەی هاوڵاتییە هەژارو دڵسۆزەکان، گوێ لە من بگرن، ئەم پیاوە لە کاتێکدا من لێرە نەبووم، خراپەی لەگەڵدا کردوون. بەم کردەوەیەشی ڕقو غەزەبی خوای هەستاندووە. بەوەی دەستی لە کاروبارو مافی ڕەوای ئێوە وەرداوەو نەیهێشتووە ئێوە سواڵ بکەنو خەڵکیش یارمەتیتان بدەن..!!

زۆر بە گەرمییەوە دەستیانکرد بە هەل هەلە لێدانو چەپڵەلێدان بۆم. و بە پیسترین جنێویش، جوێنیان بە ئەسری کوڕی ئەدهەم دەداو تفیان لێدەکرد. دوای ئەوە بێدەنگ بوونەوە. منیش هەمدیسان دەستم کردەوە بە قسەو وتم:

-من دەزانم ئێوە دەتانەوێت تۆڵەی خۆتانی لێبکەنەوە. جا لەبەرئەوە چی لەگەڵ ئێوەدا کردووە، منیش وەهای لەگەڵدا دەکەمەوە.

لەم کاتەدا دینارێکی زێرم دەرهێناو دام بە دەستی نەسری کوڕی ئەدهەمەوە، ئەویش بە حەپەساویو سەرسووڕمانەوە لێی وەرگرتم..

سواڵکەرەکانیش هەر هەموویان بە گەرمییەوە دایان لە چەپڵەلێدان.

ئینجا فەرمانم بە سەربازێکم دا، هەردوو دەستی نەسری کوڕی ئەدهەم ببڕێتو هەردوو دەستەکانم هاویشت بۆ ئەو سواڵکەرانەی لەوێدا کۆمەڵ ببوون.

هەمدیسان بە گەرمییەوە دەستیان کرد بە چەپڵەلێدانو هەلهەلە لێدان بۆمو ئەم دادوەرییەی منیان زۆر پێخۆش بوو.

دوای ئەوە زمانی نەسری کوڕی ئەدهەمم قرتاندو پاشان هەردوو چاویشیم دەرهێناو لە شوێنەکەی خۆمەوە بۆم هاویشتن.

لە کاتێکدا زمانو چاوەکانم بۆ هەڵدان، هەروەك گێوی هەڵمەتیان بۆ بردو بە سەر یەکدا کەوتنو کەوتنە لێدانی یەکتری بۆئەوەی پارچەیەك لە پارچەکانی گیانی دوژمنەکەیان دەستکەوێتو تۆڵەی خۆیانی لێبکەنەوەو قینو تووڕەیی خۆیانی پێدابمرکێننەوە. وە لە کاتێکدا سەری نەسری کوڕی ئەدهەمم پەڕاندو سەرەکەیم بۆ هەڵدانە ناو شەقامەکەوە. ئاپۆرەی سواڵکەرەکان هەموویان دەستیان کرد بە هەلهەلە لێدانو چەپڵەلێدانو دە کەسیان بە قینو تووڕەییەوە دەستیان کرد بە شەق تێهەڵدانی سەرەکەو بەر لەقەیان دا. تۆزێك چاوەڕوانم کرد تاکو ئەم قینو هەڵچوونەیان دامرکایەوە پاشان لاشەکەشیم هاویشتە ناویانەوە. هیچ چەند چرکەیەکی نەخایاند سواڵکەرەکان بە چەقۆو خەنجەرو بە دەستی ڕووتیو هەتا بە ددانەکانیشیان لاشەکەیان ونجڕ ونجڕ کردو تۆڵەی خۆیانیان لێکردەوە. منیش لە شوێنەکەی خۆم لە هەیوانەکەوە ڕاوەستابوومو تەماشام دەکردن تاکو سەرەکەی نەسری کوڕی ئەدهەمیان وەك ئاڵایەكو نیشانەی سەرکەوتنیان کرد بەسەری ڕمێکی درێژەوەو هەر هەموویان لە دوای سەرەکەی نەسری کوڕی ئەدهەمەوە ڕۆیشتنو دوورکەوتنەوە.

لەو شەوەدا کە لەگەڵ نۆبجادا پاڵکەوتبووم. بۆ یەکەمجار لە ژیانمدا هەستمکرد من لەگەڵ نۆبجادا وەکو یەکین. هەروەك ئەو خوا بۆ ئەوەی دروستکردووە ژیانو ئومێد ببەخشێت بە پیاو.

هەروەها منیش بۆئەوە خوڵقێنراوم کە مردنو نائومێدی ببەخشم بە ئەوەی هەموو دایکانێك. ئیتر حەزم نەکرد نۆبجا لەمە زیاتر نائومێدو هێوابڕاوتری بکەم.

لەبەرئەوە رووم تێکردو پێم وت:

-ئۆبجا چاك گوێم لێبگرە.. ئێستا دەتوانیت سکی خۆت پڕکەیت‌و کورێکت ببێت. هەروەك بەڵێنم پێدایت ئەو کورە بێ جیاوازی وەك شازادەیەکی ئازادو تەواو رەفتاری لەگەڵدا دەکرێت هەروەك ئەوەی لەناو میللەتەکەی خۆتدا بیت وەها دەبێت.

دەبێت ئەو کورەی تۆو من وەك فارەمانێکی بەهێزو زەبر بەدەست ڕاست بێتەوەو هەرچی پیاوانی تر هەن‌و هەتا شازادەو مەلیك‌و کۆیلەکانیش هەیە لە پاشەڕۆژدا کڕنووشی بۆ بەرن‌و ببن بە دەستەو خزمەتکاری ئەو.

* * *

## هەوڵدان بۆ بەکارهێنانی بارووت

کاتێك تەمەنم گەیشتە پەنجا ساڵ تەماشای سەرو ڕیشی خۆمم کرد، بینیم مووی سپی کەوتۆتە سەرو ڕیشمەوە. من ئەمەم پێ ناخۆش نەبوو. بەڵکو زۆرم پێ خۆش بوو. چونکە لەم تەمەنەمدا پلەو پایەی زیاترم دەستکەوت‌و گەیشتمە دوای پلەی هەرمتی سەروەری‌و هێزو توانای لەشم. چونکە بەڕاستی ئەو کاتە دەمتوانی خۆشی لە دوو سەروەری باش ببینم. یەکەمیان سەروەری هێزی چەك‌و شمشێر، دووەمیان سەروەری ژیری‌و تێگەیشتنی تەواو.

ئەو کاتە دەمتوانی خۆم بە باوکی هەموو ئەو کەسانە دابنێم کە تا دوێنێ نەیاندەوێرا لە برا گەورە زیاتر ناوم بێنن‌و تەماشام بکەن.

کاتێك لەو ژوورەی کە لە کۆشکی ژنەکانمدا کردبوومە ژووری خۆم‌و دانیشتبووم‌و "گەرچی من بارەگای ڕەسمی خۆمم بردبووە ئەو بەشەی کەوتبووە دەری باخەکەوە".

لەوێوە ئەو مناڵانەم دەبینی کە لە تۆو پشتی خۆم کەوتبوونەوە. لەوانە نزیکەی سێ سەد کوڕم بینی کە تەمەنیان گەیشتبووە تەمەنێك، دەیانتوانی لە باخچەی کۆشکەکەدا یاری بکەن. نزیکەی ئەو ژمارەیەش منداڵی بچووکم هەبوون کە هێشتا ساوا بوون‌و لەگەڵ دایکیاندا لە کۆشکەکەدا بوون.

ژمارەیەکی زۆرتریشم کچ هەبوو کە لە ژمارەی کوڕەکانم زیاتر بوون. لەبەرئەوەی ئەو کچانە لەناو کۆشکەکەدا پەروەردە دەکران‌و لە کوڕەکان دوورخرابوونەوەو لەگەڵیاندا نەبوون. لەبەرئەوە ئەو کچانەم نەبینی لە باخەکەدا یاری بکەن.

لەڕاستیدا ئەو کچانە سەبارەت بە من نامۆ بوون و نەمدەناسین و هەتا هەندێ جار من جوانەکانیانم -ئەوانەی لەو دایکە کەنیزەکانەی ناو سەراو دیوەخانەکانمدا بوون- هەڵدەبژاردو لەگەڵیاندا ڕامدەبوارد.. ئەگەر سکیان پڕ ببوایەو منداڵیان ببوایە. من منداڵەکانیانم دەکوشت و نەمدەهێشتن بۆئەوەی لە پاشەڕۆژدا تووشی شزوزو نوقسانی لەش و لار نەبن و بۆئەوەی پاشەڕۆژیش لۆمەم نەکرێت و توانجم تێنەگرن و ناوم بە خراپە نەبرێت.

ئەوکاتە شاهڕووخ تەمەنی گەیشتبووە پانزە ساڵان و لاوێکی جوان و گورجوگۆڵ و زیرەکی لێدەرچووبوو. بە تەواوی لە جیهانگیر دەچوو. بەڵام هەست و سۆزی جیهانگیری نەبوو. ئەویش لە هەیوانەکەدا لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو، تەماشای ئەو منداڵە بچووکانەی دەکرد، کە بە شمشێری تەختە یاری و شیربازییان دەکردو سواری ئەسپی تەختە یان سواری پشتی کۆیلەو خزمەتکارەکان ببوون.

گەرچی ئەمیر موحەممەد ئەوکاتە تەمەنی دە ساڵان بوو. وە چەند ساڵێکیش لەو منداڵانەی کە لە کەنیزەکەکان و ژنەکانی ترم بوون بچووکتر بوو. ئەو پێشەوایەتی تیپە سەرکەوتووەکەی دەکردو بە تەواوی کەسایەتی خۆی هەر لە من دەچوو. لە کاتی یاریکردنی منداڵەکاندا شتێکی زۆر گرنگ تێگەیشتم و بینیم ئەمیر موحەممەد کتومت بە تەواوی لە خۆم دەچوو. ڕۆیشتنە شەلییەکەی منی زۆر بە چاکی لاسایی دەکردەوە.

ئەو شەلییەی منی وا لاسایی دەکردەوە بە تەواوی لەناو هەموو منداڵەکانی تردا بە چاکی دیاربوو.

کاتێک شاهڕووخ بینی من وا بە وردی سەرنجی ئەمیر موحەممەدی کوڕەزام دەدەم کە لاسایی ڕۆیشتنە شەلییەکەی من دەکاتەوە. زۆر بە سەیرو سەرسووڕمانێکی ئاشکراوە لێی پرسیم:

-باوکە.. ئەمیر موحەممەد بەم ڕۆیشتن و شەلینە لاسایی تۆ دەکاتەوەو تووڕەت دەکات..؟

وتم: نەخێر کوڕم.. بۆچی تووڕە دەبم..؟

وتی: چونکە دایکم زۆرجار لەو بارەیەوە پێی وتووەو ئامۆژگاری کردووم شتی وا نەکەم. و پێی وتووم تۆ بەم کارە زۆر تووڕە دەبیت.

وتم: نەخێر.. کوڕم.. من بە شەلێتیکەی خۆم تووڕە نابم.

بە تایبەتیش ئەگەر منداڵە بچووکەکانی خۆم لاساییم بکەنەوە.

بەڵام من هەرگیز ڕێگانادەم بە هیچ کەسێک و لێشی خۆش نابم، گاڵتەم پێبکات و لاسایی ڕۆیشتنە شەلێتیکەی من بکاتەوە.

بەڵام ئایا دایکت بە منداڵەکانی تریشی وتووەو پێی ڕاگەیاندوون کە لاسایی ڕۆیشتن و شەلێتیکەی من نەکەنەوە..؟

وتی: نەخێر باوکە.. من ئەمە بە تەواوی نازانم..

لەڕاستیدا دڵشاد زۆر منی خۆشدەویست و دڵسۆزی من بوو.

دەشمزانی تۆوی خۆشەویستی و دڵسۆزی لەناو دڵ و دەروونی منداڵەکانیشدا دەچاند. چونکە ئەو منداڵانەی زۆر بەڕێزو گەورەییەوە تەماشایان دەکردو لە قسەی دەرنەدەچوون.

بەڵام من لەوە دڵنیابووم هیچ کات خۆی لەوە هەڵنەدەقورتاندو گوێی بەوە نەدەدا ئەگەر هەموو شازادەکان، جگە لە کوڕەکەی خۆی نەبێت. هەر هەموویان بەهەر شێوەو ڕێگایەك بێت من تووڕە بکەن. ئەو خۆی تێنەدەگەیاندن و خۆی نەدەکرد بە خاوەنی. ئەگەر لاسایی هەنگاوە شەلەکانی منیشیان بکردایەوەو ببوایە بە هۆی کەم بڕواییم پێیان.

لەبەرئەوەی زانیاری تەواوو ڕوونم دەربارەی سیفین هەبوو. دەمزانی سیفین هانەهانەو پشتگیری هەموو شتێکی دەکرد کە ئازارم بدات و ڤین و تووڕەییم هەڵبسێنێت. لەبەرئەوە لە شاهڕووخم پرسی:

-باشە شازادە سیفین ئامۆژگاری منداڵەکانی دەکات. لاسایی ڕۆیشتنە شەلییەکەی من نەکەنەوە..؟

وتی: باوکە.. من نازانم.. بەڵام ئاگام لێیەو دەزانم، دایکم زۆر جار سیفین لە ئەمیر موحەممەدو موحەممەد سوڵتان دووردەخاتەوەو ناهێڵێت لەگەڵیاندا بێت.

ئەوە خەلیل سوڵتانیش ئێستا تەمەنی شەش ساڵانەو دەربارەی ئەو هیچ نازانێ.. بەڵام دەتەوێت لەو بارەیەوە بپرسم..؟

وتم: نەخێر.. نەخێر.. کوڕم.. هەروەك پێم وتی، ئەوە لای من زۆر گرنگ نییە.. بەڕاستی تۆ چاودێرێکی باش و شارەزایت.

من ویستم تەنها سەرنج و شارەزاییت لە چاودێریدا بزانم و تاقیت بکەمەوە..

وتی: زۆر چاکە.. ئیتر من لەمەودوا زۆر بە چاکی و ئاگاهییەوە چاودێرییان دەکەم، منیش نەمویست لەو بارەیەوە هانەهانەی بدەم و لە ئازایی و غیرەتی کەم بکەمەوەو تێگەیشتم شاهڕووخ بە شێوەیەکی چاك لەژێر دەستی دڵشادا پەروەردەو سەرپەرشتی دەکرێت.

هەر لەسەر هەیوانی ژوورەکەی خۆمەوە توانیم زۆر شت و بەڵگەی تر ببینم کە بەری ڕەنج و تێکۆشانم بوو لە سەمەرقەندا.

ئەو خانوانەی کە دانیشگاو خوێندنگا بوون. لە هەموو ناوچەکانی شاردا زۆر بەرزتر بوون لە کۆشكو تەلاری شازادەکان.

ئەو خوێندنگایانەش لە نێوان ژوورو دیوارەکانیدا بە ناوبانگترین زاناو مامۆستای دانیشگای تێدابوو. ئەوانەش بە تەواوی ڕێزی گەورەیی منیان دەگرت بە سیفەتێك کە من یەکەم پارێزەرو پاڵپشتی زانستو زانیاریو پەروەردەو فێرکردن بووم.

بەرامبەر خانووی ئەو خوێندنگایانەش ژمارەیەکی زۆر مزگەوتی گەورەی لێبوو، کە گومەزی جوانو ڕازاوەو منارەی بەرزو ڕازاوەو ڕێکوپێکیان بەرەو ئاسمان بڵند ببوونەوە. هەروەها زۆر خانوو، و نووسینگەی بازرگانیو بینای جوان جوانی زۆری تری لێبوو. کە شاری سەمەرقەندیان ڕازاندبۆوەو کردبوویان بە گەوهەرێك لە ڕۆژهەڵاتدا.

جوانترین بینایەك کە لە شارەکەدا دروست کرابوو. ئەو بەشە تەلارە گەورەو بڵندە بوو، کە لە تەنیشت شانشینەکەوە دروستکرابوو بۆئەوەی ببێت بە مەڵبەندو تەلاری شازادە مەغۆلییەکە، کەوا بە ڕێگاوە بوو بێت بۆ سەمەرقەند.

لە هەمان کاتیشدا من خەریکی چاککردنو دروستکردنی ئامێری نوێی جەنگ بووم. چەندەها ئامێری گەمارۆو مەنجەنیقی نوێی ترم دروستکردو هێنامە کایەوە.

لەبەرئەوەی شاهرووخ پەرتووکێکی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، سەری بەسەر پەڕەکانیدا شۆڕکردبۆوەو چاوی تێبڕیبوو. حەزم کرد دەربارەی حەزو ئارەزووی بیروڕای تێبگەم. لەبەرئەوە من لێم پرسی:

وتم: وا دیارە کاروباری جەنگو کوشتارت لا سەیرەو بە یاریو شتێکی منداڵانەی هیچو پووچی تێدەگەیت.. وا نییە.. شاهڕووخ..؟

وەڵامی دایەوە: نەخێر.. باوکە..

وتم: کەواتە حەزدەکەیت لەگەڵمدا بێیت.. بۆ بەشی پلاندانان بۆئەوەی ئەو ئامێرە جەنگیانەو.. هۆو چۆنێتی بەکارهێنانیان ببینیتو بزانیت جەنگ چییەو چۆنیش دەکرێت..؟ چونکە من ئێستا بۆ ئەوێ دەچم..

وتی: بەڵێ.. باوکە.. من زۆر حەزم لەوەیە..

-زۆرچاکە، کەواتە برۆ دوو ئەسپ ئامادە بکەو بیانهێنە با سواریان ببینو هەر ئێستا بچین بۆ ئەوێ.

پاش ماوەیەکی کەم شاهرووخ گەڕایەوەو دوو ئەسپی زینکراوی لەگەڵ خۆیدا هێنا. لە هەیوانەکەوە هاتنە خوارێو سواری پشتی ئەسپەکەم -کۆنك نۆغلان- بووم. زۆرم پێ خۆشبوو، کاتێك بینیم شاهرووخ ئاڵای هەموو سەرەك هۆزەکانی دەناسی کە لەسەر ئەو چادرانەی لەملاو لەولای ڕێگاکەوە هەڵیاندابوو. بەڵام کاتێك گەیشتینە نزیك ئەو خانووەی، ئەختینەو سامانو چەكو قەڵغانی تێدابوو. وە لە هەموو لایەکیەوە پاسەوان ڕاوەستابوونو پاسەوانیان دەکرد. ئیتر شاهرووخ تەماشای ئاڵاکانی نەکردو سەرنجم دا بە بڕوایەکی تەواوەوە، جڵەوی بۆ ئەسپەکەی شل کردو ئاوزەنگی لە ئەسپەکەی دا بۆئەوەی پێش ئەسپەکەم -کۆنك نۆغلان- بکەوێت. کاتێك لە بەردەم ژووری ئەختینەدا ڕاوەستاینو جڵەوی ئەسپەکانمان دایە دەست مەیتەرەکان.

شاهرووخ خێرا لە پشتی ئەسپەکەی بازیدایە خوارەوە، بۆئەوەی ڕێزو دڵسۆزی خۆیم نیشان بدات. بێ ئەوەی ئەوە پێویست بکات. گورج ئاوزەنگی ئەسپەکەمی گرت بۆئەوەی من لەسەر پشتی ئەسپەکەم دابەزمو بێمە خوارەوە منیش دوای ئەوە پێم وت:

-باشە.. کوڕەکەم.. ئێمە سەرەتا دەچینە ژووری پلانو نەخشەدانانەوە. پێشی کەوتم بۆ ژووری نەخشەو پلان. بەڵام ئەوەندەی نەخایاند شاهرووخ لەو ژوورەدا ون بوو. چونکە ئەو ژوورە پڕبوو لە وێنەو نەخشەکاری و نموونەی هەموو ئامێرێکی جەنگی تێدابوو. وەك ئامێری گەمارۆدانو ئامێری مەنجەنیقو ئامێری فۆج پیاکێشانو ئامێری ئاگرهاویشتنو پەیژەو قەڵغانو شیرو تیرو گەلێ ئامێری تریش. هەروەها ئەم شوێنە پڕ بوو لە وەستای شارەزاو داهێنەری ئامێری نوێو بناغەدانەری ئەم ئامێرانە.

ئەو هەموو وەستاو داهێنەرانەش هەریەکەیان شانازییان بە کارەکانی خۆیانەوە دەکرد. خۆ ئەگەر یەکێك لەم ئامێرانە سەرنجی شاهرووخی ڕابکێشایەو بە وردی تەماشای بکردایە. ئەوا ئەو وەستاو داهێنەرانە خێرا بە گەرمییەوە باسی چۆنێتی دروستکردنو بەکارهێنانی ئەو ئامێرەیان بۆ دەکرد..

ئیتر منیش لەو ژوورەدا لەگەڵ وەستاو داهێنەرەکاندا شاهرووخم جێهێشتو خۆشم ڕووم کردە بەشی بارەگای زانای بیرکاری. ئەو زانایانەی کە لە خوێندنگا عەرەبییەکانەوە هێنابووم بۆئەوەی پێوانەی هێزی تاودانو بارستاییو توانای هاویشتنی بارستاییو بەردو هەندێ شتی تر لە مەسەلەی زانستی جووڵەی هاوێژەرو بەشەکانی تری زانست بکات..

سڵاوم لێکرد..

ئەو زانای بیرکارییە بێ ئەوەی لەبەرم هەستێت یان تۆزێك خۆیم بۆ بچەمێنێتەوە، پێی وتم:

-"سڵاوی خوات لێبێت ئەی شازادەی بەڕێز.."

ئەم زانایە گوێی بە هیچ شتێك نەدەدا کە پەیوەندی بە زانیارییەکەی خۆیەوە نەبێت.. هەتا گوێشی بە شاو شالیارو شاژنیش نەدەدا..!!

منیش لەم کردەوەو گوێپێنەدانەی ئەو هیچ تووڕە نەبووم‌و لۆمەم نەکرد.. چونکە من تەنها ئەوەم لەو دەویست کە گوێ بداتە کاروباری زانیارییەکەی‌و بەس. زۆر بە پەرۆشەوە لێمپرسی:

-ئەی زانای بەڕێز دەربارەی بارووت کە لە چین دروست دەکرێت چی دەزانیت..؟

وەڵامی دامەوە: سەرداری گەورەو بەڕێز هیچی لێنازانم. تەنها شتێکی کەم نەبێت، بەڕاستی ئەوە شتێکە عەقڵ تێیدا سەرگەردانە.

وتم: من لەو باوەڕەدام کە بارووت بۆ هاویشتنی (قازیفە) و سووتاندن‌و وێرانکردن بەکاردەهێنرێت. وەکو بیستوومە هەندێ جار ئەو بارووتە، دەتەقێت‌و کونی گەورە گەورە لە دیوارو خانووەکاندا دروست دەکات. بەڵام من نازانم ئایا ئەم شتە لە خۆیەوە دروست بووە یان بە پێی پلان‌و نەخشەیەکی داڕێژراوو شارەزایان دروستکراوە؟

وتی: منیش بیستوومە، چەند ساڵێك لەمەوپێش لە مەراکیش بۆ هاویشتنی پارچە بەردی گەورەو ئاسن بەکارهێنراوە. بەڵام من نازانم‌و تێناگەم ئەوە چۆن دروستکراوە..

زانا عەرەبییەکەش سەری ڕاوەشاندو چەند جارێك جووڵاندی‌و وتی:

-بەڕاستی منیش نازانم چۆن بەکارهێنراوە. من ئەو بارووتەم کێشاوەو بە کۆمەڵ کۆمەڵی بچووك‌و گەورە سووتاندوومە. بەڵام نهێنی پێکهاتنی‌و بەکارهێنانیم نەدۆزیوەتەوە..

لێم پرسی وتم:

-باشە، ئەی کیمیاگەرییەکان دەربارەی بارووت چی دەڵێن..؟

وەڵامی دامەوە: کیمیاگەرییەکان؟ ئەوانە کەسانێکی ئەستێرەشووناس‌و ڕەمڵ لێدەر، زیاتر هیچی تر نین. ئەوانە ناتوانن دروستی بکەن‌و هەتا ناشزانن لە چی پێکهاتووە.

وتم: ئەگەر بمزانیایە چۆن بەکاردەهێنرێت. ئەوا لە پێناوی وەدەستهێنانی بارووتدا لەگەڵ چیندا شەڕم دەکردو دەمشکاندن.

وتی: من لە ئەستەمبوڵدا بیستوومە ئەفرەنجییەکانیش دەتوانن بارووت دروستبکەن.

وتم: کەواتە منیش لە داهاتوودا بۆئەوەی باروودم دەستبکەوێت لەگەڵ ئەفرەنجییەکاندا شەڕدەکەمو دەیانشکێنم.

زانا عەرەبییەکە بە گاڵتەپێکردنەوە وەك منداڵێکی گێل تەماشای کردمو بە زەردەخەنەیەکی گاڵتەجاڕییەوە پێی وتم:

-سەرداری گەورەم، تۆ لە ڕاوچییەك دەچیت کە لە دەشتو بیابانێکدا بگەڕێت تەنها مەبەستی ئەوە بێت نێچیر کۆبکاتەوەو لەبەردەمیدا کۆمەڵی بکاتو هیچی تر نەك بۆ ئەوە بگەڕێت هێزو توانا پەیدا بکات.

تۆ تەنها مەبەستت ئەوەیە چەکی زۆرت هەبێت نەك نێچیر کۆکردنەوە.

وتم: ئەوەی زانای بەڕێز، هەرچۆنێك بێت.. من ئەوەم لە تۆ دەوێت هەوڵبدەیت بزانیت باروود لە جەنگدا چۆن بەکاردەهێنرێت.. تێگەیشتیت؟

وتی: بەڵێ باشە گەورەم، من هەوڵی ئەوە دەدەم. بەڵام گەورەم بەکارهێنانی باروود پارەی زۆری دەوێت..

وتم: ئەوە لای من گرنگ نییە، تەنها ئەوەی لای من گرنگ بێت ئەوەیە بزانیت باروود لە جەنگدا چۆن بەکاردەهێنرێت..

وتی: بەڵێ گەورەم، داواکارییەکەت جێبەجێ دەکەم..

ئیتر زانا عەرەبییەکەم جێهێشتو گەڕامەوە بۆ ژووری "تصمیم" و چەكو جبەخانە.

*　　*　　*

## زللەیەك بۆ ناودەمی دڵشاد

یەکێك لە هەواڵ هێزەکانم بە خێرایی گەیشتە سەمەرقەندو پێی ڕاگەیاندم کە ئەمیر شۆلیان مەلەك گەیشتۆتە -تاشقەند- و لەوێدا ماوەیەك دەمێنێتەوە بۆئەوەی خۆی ئامادە بکاتو پاشان دێت بۆ لام.

منیش هەر ئەوکاتە خێرا فەرمانم بە پیاوو سەربازەکانم دا، بۆ پێشوازیکردنی ئەو شازادەیە چی پێویست دەکات، بە گورجیو بێ دواکەوتنو بە تەواوی جێبەجێی بکەن.

بۆ ئەم کارانەش دڵشاد ئەمیرەی کۆشك لێپرسراوی یەکەمو خاوەنی پرسو ڕاکردن بوو. کاتێك چووم بۆ لای بۆئەوەی دەربارەی پێشوازیکردنی ئەمیرە شۆلیان مەلەك پرسو ڕا پێبکەم.

بینیم زۆر بێتاقەت و بێزارە بە هۆی ئەو ئاهەنگ و خۆسازدانەی بەم زووانە دەگرا. ویستم بەڕاستی هۆی بێزاری تێبگەم.

لێم پرسی: خۆشەویستەکەم چیتە وا دەتبینم بێزارو بێتاقەتیت؟ هیچ ڕووی داوە؟.. بڵێ بزانم بیر لە چی دەکەیتەوە..؟

وەڵامی دامەوە: من هیچ بیر لە کاروباری خۆم ناکەمەوەو هیچیشم نییە تا بێزارو بێتاقەتم بکات. بەڵام گەورەم تەنها بیر لە کاروباری تۆ دەکەمەوە، چونکە من بە هیچ جۆرێك بیر لە کاروباری پێشوازیکردن و خۆسازدان بۆ ئەمیرە شۆلیان ناکەمەوە.. بەڵکو..

قسەکەیم پێ بڕی و وتم: بەڵکو چی..؟ قسەکەت مەبڕەو دامەمێنە.

وتی: بەڵێ باشە، تەیمووری خۆشەویستم تۆ ئێستا تەمەنت لە پەنجاویەك ساڵیدایەو ئێستا ئەمیرە شۆلیان مەلەك هێشتا تەمەنی لە شانزە ساڵی تێپەڕی نەکردووە.

وتم: ئەمە ڕاستە، بێگومان تۆ ئەم قسەیە بە هۆی غیرەت و پێناخۆشبوونەوە نالێیت. چونکە تۆ خۆت ئاگاداریت من هەموو ساڵێك زیاد لە پەنجا ژن مارە دەکەم، کە هیچیان تەمەنیان لە شانزە ساڵ زیاتر نییە، وا نییە..؟

وەڵامی دامەوە: بەڵێ وایە.. تەیموور من ئەوە باش دەزانم و هیچ پێم ناخۆش نییە، بەڵام مارەکردن و هێنانی ئەم ئەمیرە مەغۆلییە ئێستا لەم تەمەنەدا زۆر جیاوازە لە مارەکردنی ئەو کچانەی تر. چونکە ئەمیرە شۆلیان شازادەیەکی گەنج و تازەپێگەیشتووە، ژیرەو لە خێزانێکی شاهانەیە. من لەوە دەترسم بتفەوتێنێت و لەناوت ببات. چونکە لەمەوپێش کاری وا لەگەڵ زۆر پیاوی بەهێزو توانادا ڕوویداوە.

وتم: قسەی هیچ و پووچ..!! من پیر نیم، بەڵکو ئێستا من گەیشتوومەتە هەرەتی لاوێتیم.. ئەم ژنهێنانەی منیش تەنها ژنهێنانێکی ڕامیارییەو هیچی تر. مەبەستی من لەم ژنهێنانە تەنها ئەوەیە دۆست و هاوپەیمانێکی بەهێزم لەناو شووڕای چینی بەناوبانگدا هەبێت.

وتی: تەیموور.. من بڕوام بەم قسانە نییە.. چونکە ئەندازیارەکان پێیان وتووم تۆ لەبەرخاتری ئەم شازادە نوێیە گوندێکی تەواو کۆشك و تەلارێکی زۆر جوانت دروست کردووە، کە لە جوانیدا شان دەدات لە شانی جوانترین و بەناوبانگترین کۆشك و تەلاری هەموو دنیا..

وتم: دڵشاد ئەوە زۆر ڕاستە. من کاتی خۆی بەڵێنم پێدا، ئەو کۆشك و تەلارەی بۆ دروست بکەم. بۆئەوەی وا خۆمی پیشان بدەم کە من شاهێنشایەکم زۆر لە باوکی ئەو گەورەترو

بەتواناترم. ئەگەر وام نەکردایە ئەوا دەبووم بە یەکێك لە وابەستە[٦] کانی ژێردەستی ئەو..

خەریك بوو بە دڵشاد بڵێم، مەبەستی ڕاستی من لە دروستکردنی ئەو کۆشك و تەلاردا ئەوەیە، کە تێبگەم نموونەی کۆشك و تەلار لە وڵاتی ئەمیرە شۆلیاندا چۆنە.. تاکو بتوانم بەو بۆنەیەوە، پلانی جەنگ لە لایەن مەغۆلییەکانەوە تێبگەم و لێی بکۆڵمەوە.

بەڵام دڵشاد بیرو خەیاڵەکەی لێ تێکدام. کاتێك بە گاڵتەپێکردنێکی ئاشکراو سەیرەوە پێی وتم:

-گوێڕایەڵیت بۆ حەزو ئارەزووەکانی باوکی شۆلیان نیشانەی پابەستەگی و سەرشۆڕکردنتە بۆی..

پاشان بە دەستەکانی، دەستی گرتم. بەڵام ئەوەندەی نەخایاند نێوچەوانی دایەوە بەیەکداو کەوتەوە قسەو وتی:

-بەڵام من لەوە دەترسم ئەمیرە شۆلیان بەسەرتا زاڵ بێت و تۆش نەتوانیت لە قسەی دەربچیت. چونکە تۆ پیر بوویت و ئەو هێزو توانایەت نەماوە.

ئەویش کچێکی گەنج و تازەپێگەیشتووە. دەتوانێت چی بوێت بیکات..!!

وتم: دڵشاد ئەم قسانەت هیچی بەسەر هیچەوە نییەو قسەکانت هەر هەمووی هیچ و پووچن.

وتی: تەیموور ئەمە تەنها بەسەر تۆدا نەهاتووە!! بەڵکو بەسەر هەموو پیاوێکی پیر کە لەم تەمەنەی تۆداو بەسەر هەموو شاژنێکی گەنج لە تەمەنی ئەودا هاتووە.

ئاه.. تەیموور بەڕاستی من زۆر بێ ئارامم و زۆریش دەترسم.

ئا لەم کاتەدا دڵشاد بە توندی هەردوو دەستی گوشیم و هەردوو چاوی پڕ بوو لە فرمێسك. پاشان ئەو فرمێسکانە لە چاوییەوە سەری کردو بەسەر کوڵمەکانیدا هاتنەخوارێ. پاشان بە دەم گریانەوە وتی:

-ئەوکاتەش کە چوویت بۆ ئۆرغانج و شازادە سیفینت لەگەڵ خۆتدا هێنا. بۆئەوەی لە جیهانگیری مارە بکەیت و بیکەیت بە هاوسەری.

ئەوکاتەش هەر هەمان ترس و لەرزم لێت هەبوو..

وتم: بەڵام ئەو کاتە لەو باوەڕەدا بوویت و خۆشت وتت: من دەتوانم بەسەر سیفیندا زاڵ ببم و پاڵت پێوە دەنام بۆ خۆمی مارە بکەم.

---

(٦) وابەستە - مربوط

وتی: بەڵێ.. تـەیموور تـۆ ئـەوەت کـردو لـەو بارەیەشـەوە مـن ئاگاداری هـەموو شتێکت هـەم. کاتێك گوێم لەوە بوو حەپەسامو زۆر سەرسام بووم.

دڵشاد هەناسەیەکی هەڵکێشاو دەستی بە قسە کردەوەو وتی:

-بـەڵام ئەوکاتـە تـۆ لـە هـەرەتی هێزو پیـاوەتیدا بوویت. بـەڵام ئێستا دەربارەی تـۆ گـار زۆر جیاوازە. تۆ وا بۆ ماوەی شەش ساڵە هەر بیر لەو کچە -واتە ئـەمیرە شۆلیان- دەکەیتـەوەو لـەبیرو خـەیاڵی خۆتـدا بـە جوانـترین شێوە بیری لێدەکەیتـەوە. مـن لـەو چـەند هەفتەیـەی رابـوردوودا، سەرنجی تۆم داوە، دەمبینی هەردەم ئاگات لە خۆت نـەبوو. بـە بچووکـترین شـت هـەڵدەچوویتو توورە دەبوویت.

تەیموور من داوات لێدەکەمو لێت دەپارێمەوە، ئاگات لە خۆت بێت. هۆش بێنەرەوە بە خۆتـا. چونکە ئەوەندە بیر لە ئەمیرە شۆلیان دەکەیتەوە. هەسـتو هۆشی نەهێشتوویتو بـەری چاوتی تاریك کردووە.

وتم: نەخێر دڵشاد من هیچ بیر لەو کچە ناکەمەوەو هیچ کاتێکیش بـیرو هۆشـی خۆمـم پێوە خەریك نەکردووە. تەنها من بیر لەوە دەکەمەوە بە جۆرێك پێشوازی بکەین جێگای ڕەزامـەندی باوکی بێت.

باشە ئەو کچە دەتوانێت چ ئازارێك بە من بگەیەنێت. من گەنجێکی عاشقو شـەیدا نیـم. مـن ئێستا زیاد لە هەزار ژنو کەنیزەکی ئاشکراو نەهێنیم هەیە.

وتـی: بـەڵام خـۆ ژنـە شـازادەیەکی مـەغۆلیت نییـە. بـەڵام ئـەوەندەی ئـەو کچـە مەغۆلییـە دەتوانێت پاشەڕۆژ ئێشو ئـازارت بـدات، زۆر جێگـای مەترسییە، ئەوکاتـە پاشـەڕۆژ بەسـەرتا زاڵ دەبێتو شێتو گێلت دەکاتو بە تەواوی تێکت دەشـکێنێتو کوێرایـی بەسـەر چاوتـا دێنێت، خـۆ ئەگەر کوڕێکیشت لێبوو، ئەوا ئەوکاتەی هێزو دەستەڵاتت بەسەر ئیمپـراتۆری یەتەکەدا نـەما، یـان ئەو کاتەی دەمریت هەر ئەو کاتەش ئیمپراتۆرییەتەکەت بە ئاسانی دەدات بەدەسـت میللەتەکـەی خۆیەوە.

وتم: ئەمـە هیـچ ڕاسـت نییـە. ئـەوەتا لـە تـۆ شـاهڕووخم بـووەو لـە شێرێزا مـیران شـاو شێخ عومـەرم بـووەو سـیفینیش سێ منداڵی بـووەو نۆبجاش کوڕێکی لێـم بـووە. ئەمانـە هـەموویان جێگرو جێنشینی منن.

منیش پاشەڕۆژ تەماشایان دەکەم. کامیان لە هەموویان بەهێزتر بوون ئەوا ئەومیان دەبێتە جێی باوەڕی منو سەرکردایەتی دەوڵەتی دەدەمە دەستو لە ئیمپراتۆرییەتەکەمدا دەیکەم بە جێگرو جێنشینی خۆم..

وتی: خۆ من ناوی شاهڕووخم نەهێناوە. من ڕۆحیو دڵسۆزیم لەناو دڵو دەروونی هەموو منداڵەکانتدا چاندووەو فێرم کردوون دڵسۆزت بن.

وەکو دڵسۆزی من.. ژنە تاکو تەنها تەتەرییەکەت.. هەتا ئەم کاتەش من تەنها بیر لە تۆو لە دڵسۆزی تۆ دەکەمەوە.

خۆ ئەگەر تۆ بە ژیری بیربکەیتەوەو پیاوێکی بە داد بیت. من دڵنیام لەوە پاشەڕۆژ کوڕی ڕاستو حەقیقی خۆت هەڵدەبژێریت. خۆ ئەگەر شێتو بێئەقڵیش بوویت ئەوا ئەو کارە ناکەیت.

ئیتر منیش زۆر قینم لە دڵشاد هەستاو بە تووڕەییەوە قیژانم بە سەریداو دەستم بەرزکردەوەو بە هەموو هێزمەوە زللەیەکی توندم کێشا بەناو دەمیداو پێم وت: ئەگەر شێتو بێعەقڵیش بم.. وا نییە..؟

باشە، ئەوا ئێستا شێتو بێعەقڵ بووم..!!

دڵشادیش بێ ئەوەی خۆی تێکبداتو تووڕە ببێت. دەستی بەرزکردەوەو دڵۆپەخوێنەکانی کە لە دەمی هاتەخوارێ سڕیو بە شێوەیەکی ڕەحمو بەزەیی هاتنەوە بە منداو بە خەمبارییەوە پێی وتم:

-هیوادارم ئەم کچە هۆشو بیری نەبردبیتو شێتی نەکردبیتو هیوادارم کە من هەڵە بم. بەڵام خۆ ئەگەر ئەم کچە پێش ئەوەی بیبینی تۆی گەیاندبێتە ئەم ئاستە ناخۆشە.. ئەوا من.. نەمهێشت قسەکەی تەواو بکات زللەیەکی ترم کێشا بە ناو دەمیداو لە ژوورەکەی ڕایکردە دەرەوە..

دوای ئەوە بە تەواوی هەستم بە ئارامیو حەسانەوەیەکی تەواو کرد.

ئارامیو حەسانەوەیەکی وا کە لەو هەفتانەی ڕابردوودا شتی وام بە خۆمەوە نەدیبوو. چونکە دڵشاد بە تەواوی لە ئەلجای دەچوو.

هەرچی قینو تووڕەییم هەبوو، هەر هەمووی هەڵمژیو مێشکی حەساندمەوە، کاتێک ڕووبەڕووم وەستاو بەرهەڵستی کردمو وای لێکردم بەم شێوە دڕندانەییە بکێشم بە ناوی دەمیدا..!!

* * *

ئەو کاروانەی کە لەگەڵ ئەمیرە شۆلیان مەلەکدا بوو. گەورەترین کاروانێك بوو کە ڕێگاکانی ئاسیا بە خۆیەوە بینیبێتی.

چونکە کاتێك ئەو کاروانە گەیشتنە سەمەرقەند جێگای بە تاڵ ئەما کە ئەو دیارییانەی لەگەڵ خۆیدا هێنابووی تێیدا دابنێین.

بێگومان شای مەغۆلەکان لە ناردنی ئەم هەموو دیارییە نایابانەدا کە شاری سەمەرقەندی لێ پڕکرد. مەبەستی ئەوە بوو گەورەیی و بەخشندەیی و دەوڵەمەندی خۆی پیشان بدات.

بەڵام من لە مەبەستی ئەو گەیشتم و زانیم هەوڵ دەدات و دەیەوێت کاربکاتە سەر من و منیش بە چاوێکی ڕێزو گەورەییەوە تەماشای بکەم و ببم بە پابەندی ئەوو خۆم بە ژێردەستەی ئەو بزانم و ئارەزووی لەسەر چی بوو پێم بکات و بۆی جێبەجێ بکەم. جا لەبەرئەوە منیش پێشوازییەکی وا گەورەو گەرمم لە ئەمیرە شۆلیان مەلەك کرد. مێژوو شتی وای بە خۆیەوە نەدیبوو. کۆشك و تەلارێکم بۆ دروستکرد لە جوانی و گەورەیی و ڕازاوەییدا، جوانترین و گەورەترین کۆشکەکانی سەر ڕووی زەمین نەیاندەتوانی شان بدەن لە شانی.

ماوەی هەفتەیەکی تەواو ئاهەنگ و خۆشی بە بەردەوامی ساز کرا.

دوای ئەو هەفتەیە هەرچی میوان و بانگ کراوان هەبوو، شاریان جێهێشت و گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان.

کاتێکیش کاروانی مەغۆلەکان گەڕانەوە بۆ لای شاهێنشاکەیان دیاری وا نایاب و بەنرخم لەگەڵدا نارد کە تاکو ئێستا هیچ شایەك لە ئاسیادا شتی وای هەر بە خەویش بە خۆیەوە نەدیبوو.

کاتێك کاروانەکە گەیشتەوە جێی خۆی و شاهێنشای مەغۆل گوێی لەو شازادانە گرت کە لەگەڵ کاروانەکەدا گەڕابوونەوەو باسی جوان و ڕازاوەیی کۆشکەکەی منیان بۆ کردو باسی گەورەیی و قەشەنگی کۆشك و تەلارە نوێیەکەی ئەمیرە شۆلیانیان بۆ کردو باسی ئەو پێشوازییە بێ هاوتاو بێ وێنەیان بۆ کردبوو. کاتێکیش ئەو هەموو دیارییە نایاب و بە نرخەی منی بینی. هەواڵگرە بڕوا پێکراوەکانی من بۆیان گێڕامەوە، وتیان: کاتێك شای مەغۆلەکان ئەوەی بیست و چاوی بەو هەموو دەست و دیارییە بەنرخ و نایابانە کەوت. خۆی پێ نەگیراو سەری باداو وتی:

-بەڕاستی تەیموور پیاوێکی گەورەو ئەبەزە، کەس ناتوانێت زاڵ بێت بەسەریدا..!!

بەڵام ئەم خۆشیو شادییەمان زۆری نەخایاند. چونکە هەواڵم پێگەیشت کە -تەفتەمیش- کە لە دوای ئۆرۆس خان ببوو بە سەرکردەی ئەو میللەتانەی کەوتبوونە باشووری کە ناوی ڕووباری فۆلفاوە. دەستی بەسەر تەبرێزدا گرتووەو داگیری کردووە. سلێمان سۆفیش کە کردبووم بە فەرمانڕەوای شاری ئۆرغانج ئەویش چۆتە پاڵیو لێم هەڵگەڕاوەتەوە.

هەر کە ئەو هەواڵانەم بیست خێرا بانگەوازی هەموو سەرکردەو فەرمانڕەواکانی ژێردەستەڵاتی خۆمم کردو داوام لێکردن، خۆیانو هێزەکانیان لە شاری شەهری سیبزدا کۆببنەوەو پەیوەندیم پێوە بکەن.

کاتێك لە سەمەرقەند هاتمە دەرێ گاردە تایبەتیەکەی خۆم کە بریتی بوو لە دوانزە هەزار سەرباز لەگەڵمدا بوو. هەروەها ئەمیرە شۆلیان و زیاد لە سەد کۆمەڵ کەنیزەکم لەگەڵ خۆمدا هێنا. چونکە لەو بڕوایەدا بووم چەند ساڵێك لە جەنگدا دەمێنمەوە. زۆر لە شاری شەهری سیبزدا نەمامەوە. خێرا سەرکردایەتی لەشکرەکەم کرد، کە لە حەفتا تیپ پێکهاتبوو. وە باشترینو تازەترین چەكو جبەخانەیان پێبوو. یەکسەر بەرەو شاری ئۆرغانج کەوتمەڕێ. لە داگیرکردنەوەی شاری ئۆرغانجدا بەرهەڵستییەکی وامان نەکرا. زۆر بە ئاسانی شارەکە کەوتەوە ژێر دەستمو سلێمان سۆفی ناپاکم کوشتو ڕێگام بە سەربازەکانم دا -بەڵکو خۆم داوام لێکردن- شارەکە تاڵان بکەنو هەرچییەکیان ئارەزوو لێیە بۆ خۆیانی بەرن.

لەبەرئەوەی میللەتی ئۆرغانج سێ جار بەرەبەرەکانییان کردم، زۆر قینم لێیان هەستابوو. لەبەرئەوە شارەکەم وێران کردو تەختو تاراجم تێکداو هەرچی ماڵو خانوویەکی هەبوو هەر هەموویانم وێران کردو ئەو بەردودارەی خانووەکانی پێ دروست کرابوو، هەر هەموویم گواستەوە بۆ دەری شارەکەو هەرچی ژنو کۆیلەیەکم پێویست بوو. بۆ خۆم لامداو دوای ئەوە هەر هەموو خەڵکەکەیم کوشتو سەربڕیو لاشەکەیانم خستە ناو خەندەقی شارەکەوەو لەوێدا ناشتمنو پاشان هەموو زەوی شارەکەم کێڵاو گەنمو جۆم تیادا چاند..!!

پاش ئەوەی شاری ئۆرغانجم وێران کرد. شێخ عەلیم لەگەڵ تیپێکی تەواودا گەڕایەوە بۆ خوارەزم بەرهەڵستی بکاتو ڕووبەڕووی بوەستێتەوە.

خۆ ئەگەر ڕووسەکانیش لە باکوورەوە هێرشیان کردە سەر سەمەرقەند ئەوا بە هانای شێخ عومەرەوە بەرەو ئوترار بچێت..

سەرکردایەتی باڵی ڕاستی لەشکرەکەم دا بە سوڵتان مەحموود کوڕی شێخ عەلیو بەرەو دەریای قەزوین کەوتمەڕێ.

بە دەوری کەنارەکانی باشووریدا سووڕامەوەو ڕوومکردە شاری تەبریز، هیچ کاتێکی زۆری نەخایاند گەیشتینە ناو شارەکە.

لە داگیرکردنەوەی شارەکەدا هیچ بەرهەڵستییەکمان تووش نەهات. چونکە تەقتەمیش دە ڕۆژی تەواو لەناو شارەکەدا تاڵانو بڕۆو ئەتکی ژنەکانی کردبوو.

هەرچی سەرکردەو هێزەکانی منیش هەبوون هەر هەموویانی کوشتبوو. پاشان لە شارەکەدا کشابۆوەو لە شاری باکۆوەو لە پشت وڵاتی قۆقازەوە کشابۆوەو بەرەو ناوچەی ئەستراخان ملی نابوو.

هەر کە گەیشتمە ناو شارەکە دانیشتوانی شارەکە زۆر بە گەرمیو پێخۆشحاڵییەوە پێشوازییان کردمو کۆمەڵە سەربازە کەمەکەی تەقتەمیش کە لە شارەکەدا جێی هێشتبوو هەر هەموویان گورج پەیوەندییان پێوە کردمو هاتنە ناو هێزەکەمەوە. بەڵام ئەوەندە لە تەبریزدا نەمامەوە. لەسەر ڕۆیشتنەکەم بەردەوام بووم. ڕوومکردە ڕۆخی دەریاچەی ئورمیاو لەوێدا بارو بارگەمان داناو چادرمان لێ هەڵدا. چونکە ئەو شوێنە ئاوو هەوایەکی زۆر خۆش‌و فێنکی هەبوو.

کاتێک چادرمان هەڵداو حەساینەوە لە ژووری بەڕێوەبردنی کاروباری فەرمانڕەوایی‌و شاهانەدا دانیشتبووم.

پێشوازیم کرد لەو نوێنەرانەی شاهێنشای فارسەکان ناردبوونی بۆ لام.. لەبەرئەوەی من پێنج سەد میل لە قەڵا پتەوەکەی ئەسفەهانەوە دوور بووم. گەرچی ئێمە لەمەوپێشیش پەیمانی دۆستایەتی‌و هاوپەیمانی‌و برایەتی‌و هاوسنووریشمان بەستبوو. من وا هات بە خەیاڵمدا ئەم نامەیەی کە شا ناردبووی بۆ من نامەیەکی دوژمنایەتییە.

لەڕاستیدا من زۆر نارەزووم دەکردو حەزم بەوە دەکرد هۆیەک بێت بۆ شەڕکردن. چونکە من خۆم مەبەستم بوو وڵاتی فورس داگیر بکەمو زاڵ ببم بەسەریدا.

بەڵام کاتێک بینیم کوڕە خۆشەویستەکەی شا خۆی سەرۆکایەتی ئەو نوێنەرانەیە کە شاهێنشا ناردوویەتی. هەر حەپەسامو سەرم سووڕما. لەگەڵ خۆشیدا دیاری نایاب‌و گرانبەهاشی بۆ هێنابووم.

بینیم ئەو کوڕە بە شێوەیەکی زۆر تێگەیشووانەو دۆستانەو برایانەوە قسەم لەگەڵدا دەکات.

نامەکەی باوکی لە بەردەم سەرکردەو شازادەکانمدا کە لەناو چادرەکەمدا کۆببوونەوە خوێندەوە. جگە لەو ڕێزو سڵاوە ناسک‌و نازناوە جۆراوجۆرانەی کە نامەکەی پێ دەست پێکردبوو. دوای ئەوە ناوەڕۆکی نامەکە بەم جۆرە بوو:

"هەموو پیاوێکی زاناو تێگەیشتوو دەزانێت شێوەی دنیاو گۆڕانکارییەکانی چۆنە. هەرچی لەم دنیایەدا هەیە لە پەندو خۆشیو بەختیاریو جوانیو ژیان، هەر هەموو ئاخری بەرەو نەمانو کۆتاییو لەناوچوون دەچێت. هەروەها مرۆڤیش بەرەو کۆتاییو لەناوچوون دەچێت. منو تۆش هەر هەمان چارەنووسمان هەیە.. ئا ئەوەتا کاتی کۆتایی ژیانم نزیك بۆتەوەو ژیانم چەند ڕۆژێکی دیاریکراوی ماوە. بەڵام من کە ئەم دنیایە بەجێ دەهێڵم دڵو دەروونم ئارامەو لە خۆم ڕازیم، چونکە من پەیمانی خۆم لەگەڵ تۆدا بردۆتە سەرو ئەو ئەنگوستیلەیەی تۆ لەگەڵ خۆمدادە بەمە ناو گۆڕەوەو لە بەردەم خوای گەورەدا دەریدێنمو پیشانی دەدەم بۆ ئیسپاتو بەڵگەی پاکیو نەگۆڕیو دڵسۆزیم.

بیرو خەیاڵی هیچو پووچی ئەم دنیایەم لە دڵو دەروونمدا نەهێشتووە. بە دڵو دەروونێکی پاكو خاوێنەوە دەچمە بەر بارەگای خودا.

من وا ئێستا دەمرم، پاش ئەوەی پەنجاو سێ ساڵم لەم دنیایەدا بە خواپەرستیو تەرککردنی دنیا بردە سەر.

لەو ماوەیەدا هەرچی خۆشیو ڕابواردنێك هەبوو، هەر هەموویم لە خۆم حەرام کرد. لەوە زیاتر کە خوا حەڵاڵی کردووە.

بەڵام من لەوە دڵنیام لە پاداشتی ئەوەدا، خودا لە بەهەشتە پانو بەرینەکەیدا حەفتا پەری لە جوانترین پەرییەکانی بەهەشتەکەی خۆیم دەداتێ..

ئەی شاهی بەڕێزو گەورە لەبەرئەوەی من پەیمانی خۆمم بردۆتە سەرو بەڵێنی خۆمم پاراستووە، لەبەرئەوە ئەی گەورەو بەڕێزم تەیموور منیش داواکارم لێتو لێت دەپاڕێمەوە، چونکە تۆ وەك سولەیمان زاناو تێگەیشتوویتو وەك ئەسکەندەریش بە تواناو بەدەستەڵاتیت. تۆش بەڵێنو پەیمانەکەی خۆت ببەرە سەرو دەستی ڕەحمو پاراستن بۆ زێن العابدینی کوڕم درێژ بکەو بیپارێزە. منیش لە خوای گەورەو بەتواناو لە تو دەپاڕێمەوە هەموو کات ئاگاداری بنو لەژێر سایەو بەزەیی خوداو تۆدا بێت..".

پاش ئەوەی زێن العابدین لە خوێندنەوەی نامەکە بۆوە. بە دڵنیاییو دۆستایەتییەوە ڕووم تێکردو لەسەرخۆ پێم وت:

-کوڕەکەم هیچ مەترسە، چۆن باوکت بەڵێنو پەیمانی خۆی بردۆتە سەرو پاراستوویەتی، منیش وەکو ئەو پەیمانو بەڵێنی خۆم دەبەمە سەرو ئارەزووەکانی جێبەجێ دەکەم..

وتی: گەورەم زۆر سوپاست دەکەم. کاتێك ئەم وەڵامو بەڵێنو پەیمان بردنە سەرەی تۆی پێ ڕادەگەیەنم، ئەوکاتە بە دڵنیاییو بەختیارییەوە چاو لێکدەنێتو دەمرێت.

وتم: هیوادارم باوکت تا ماوەیەکی تر نەمرێت. چونکە من نیازم وایە ماوەیەکی تر بچم بۆ دیدەنیو سەردانی.

وتی: ئەی شاهێنشای بەڕێز.. ئەگەر ئێستا لەگەڵ مندا نەیەیت، من لەوە دەترسم ئەو کاتەی دەچیت بۆ لای نەیبینیو مردبێت.

وتم: بەڵام ئێستا پێویستە ماوەیەك لامان بمێنیتەوە، تاکو ئاهەنگێکی خۆشو ڕازاوەت بۆ ساز بکەین.

ئێستاش تۆ دەتوانیت بچیت بەناو چادرەکانماندا بگەڕێیت. یا دانیشیتو بحەسێیتەوە تاکو دەعواتو میواندارییەکی چاکت بۆ ساز دەکەین کە شایانی تۆ بێت. و هەندی دیاری جوانو نایابت پێشکەش بکەم. ئیتر زێن العابدینو وەفدە یاوەرەکەی لە چادرەکەم چوونە دەرەوە. منیش بەسەر ئاماژەم بۆ سەردارو شازادەکانم کرد، کەس لە جێگەی خۆی نەجمێتو لە جێگای خۆیاندا نەجوولێن.

هەر کە زێن العابدین لە بارەگەکەم چووە دەردوە. نوورەددین دەستی بە قاقای پێکەنین کردو ڕووی تێکردمو وتی:

-"وا ئێستا دەمرم.." قسەیەکی خراپ نییە، قسەیەکی جوانو بەکەڵکە.. شازادایەکی تر وەڵامی دایەوە وتی:

-من بیستوومە شاهێنشای فارسەکان هەروەك ئەم نامەیە، نامەشی بۆ سوڵتان ئەحمەد ناردووە بۆ بەغدادو نامەشی بۆ سوڵتان بایەزیدیش ناردووە بۆ ئەستەمبووڵ.

لەم قسەیە زۆر سەرم سوڕما. بە تووڕەییەوە لەو شازادەیەم پرسی:

-ئەی شزادە.. پێم بڵێ شاهێنشاکەی ئەو ئەوو نامەیەی بۆ ناردوون..؟

وەڵامی دایەوە: گەورەم.. دوو ساڵ لەمەوپێش..

وتم: تۆ بە تەواوی لەوە دڵنیایت..؟

وتی: بەڵێ گەورەم.

-نوورەددینیش سەری باداو لەسەر قسەکانی ئێمە وتی:

-لەگەڵ ئەوەشدا، هێشتا شا نەمردووەو ماوە..!!

بەڕاستی من بڕوای پێناکەم. ئەگەر بمردایە، بۆچی تاکو ئێستا نەمردووە..؟ منیش بۆ ڕێزو ڕاگرتنی هەست و شعووری ئیمامە ئامادەبووەکان، بە شێوەی لە خواترسێکەوە وەڵامی نوورەددینم دایەوە، وتم:

-خوا نەبێت، کەس نازانێت کەی دەمرێت.. و مردنیش بەدەست خوایە.. و هەر ڕۆژێکیش دێت بمرێت..

بۆ ڕۆژی دوایی سوارچاکێک بە پرتاو لە ئەسفەهانەوە هات و پێی ڕاگەیاندین تەندروستی شا زۆر خراپەو مردنی لە ئان و ساتدایە..

هەر کە زێن العابدین گوێی لەوە بوو، خێرا خۆی بۆ گەڕانەوەی قەڵاکەی باوکی ئامادە کردو منیش لە گەڕانەوەیدا گەورەی ئیمامەکان و کوڕە بچووکەکەی شێخ عەلی کە ناوی میرزا موراد بوو لەگەڵیدا ناردمن و دیاری گرانبەهاو نایابیشم لەگەڵیاندا بۆ شا نارد، کاتێک نوورەددین کاروانەکەی زێن العابدینی بینی بەرەو ئەسفەهان کەوتەڕێ و ئەم هەموو دیارییە نایاب و گرانبەهایەیان پێیە. تەماشای منی کردو پێی وتم:

-گەورەم، ئەمە کاروانێکی ئێجگار گەورەیە، تیپێک بۆ پاراستنیان ئامادە بکەم و لە دوایانەوە بڕۆم..؟

وەڵامم دایەوە: نەخێر.. نوورەددین ئێمە زۆر بەهێزین و کەسیش ناوێرێت بەرهەڵستی کاروانەکانی ئێمە بکات..

وتی: ئەی ئەگەر ڕێکەوت هەندێ دزو جەردە ڕێیان پێگرتن..؟

وەڵامم دایەوە: من پێم وتی ئێمە زۆر بەهێزین.. خۆ ئەگەر ڕێکەوت هەندێ دزو جەردە ڕێگایان بە کاروانەکانی ئێمە گرت ئەوا ئەو کاتە ئێمەش لێدانێکی وایان لێدەدەین تەفروتوونایان دەکەین و ئاساوەریان ناهێڵین. ئێستا واز لەوە بێنە، با بزانین چی ڕوودەدات..

-نوورەددینیش قەناعەتی بە قسەکە کردو، وەرتەی لە دەم نەهاتە دەرێ. ئێمەش لە شوێنەکەی خۆماندا ماینەوەو چاوەڕوانمان دەکرد. تا جەژنی سەری ساڵی نوێ هات. منیش بەو بۆنەیەوە کۆبوونەوەیەکم سازکردو لە هەموو لایەکەوە سەردارو شازادەکانی خۆمم بانگەواز کرد. گەرچی من بەردەوام هەموو ڕۆژێک هەواڵگرەکانی خۆم کە لە سەمەرقەند دەهاتنەوەو هەواڵ و دەنگوباسی ئەوێیان پێدەوتم. بەڵام کاتێک داودو جاکۆ خۆیان لەوێوە هاتن بۆ لام و دەنگوباسی ئەوێیان بۆ باسکردم. زۆر شادو پێخۆشحاڵ بووم.

هەروەها بەوەش زۆر شادو بەختیار بووم کاتێك شاهڕووخ کە تەمەنی گەیشتبووە هەژدە ساڵان. لەگەڵ داودو جاکۆدا هات بۆ لام بۆئەوەی پەیوەندی بکات بە هێزەکەمەوە..

بەڵام لەو کاتەدا هەواڵێکی ناخۆش‌و دڵتەزێنم پێگەیشت. ئەویش ئەوە بوو هەندێ کەس لە هەواڵگرەکانم، پێی ڕاگەیاندم، کە یەکێك لە سیخوڕەکانی تەفتەمیش بە شێوەیەکی ناپیاوانە هێرشی کردۆتە سەر شێخ عەلی‌و بەر خەنجەری داوەو کوشتوویەتی.. شێخ عومەریش دوای تەفتەمیش کەوتووەو شکاندوویەتی. تاکو شاری سەرای ڕاوی ناوەو لەم شەڕو کوشتارەیدا قارەمانێتییەکی جوان‌و بێوێنەی نواندووە، دژ بە نەتەوەکانی دەوروبەری ڕووباری فولگا کاتێك لەم بارەیەوە لەگەڵ داوددا کەوتمە گفتوگۆو لێمپرسی: داود ئایا تۆ لەو باوەڕەدایت کە شێخ عومەر بتوانێت ماوەیەکی زۆر بەرهەڵستی تەفتەمیشی پێ بکرێت..؟ چونکە من لێرە لەبەر هەندێ کاروباری تایبەت تا ساڵێك یا دوو ساڵی تر دەمێنمەوە..

وتی: گەورەم.. تەفتەمیش شەڕی ڕووبەڕووی گەورەو بەردەوام ناکات. ئەو دەستی خۆی دەوەشێنێت‌و دەکشێتەوەو خۆی ون دەکات. هەرچی هێزو لەشکرێکیش هەیە بە هەموو لایەکدا پەرش‌و بڵاوی کردۆتەوە. بێگومان شێخ عومەر دەتوانێت لە ناوچەی باکوورەوە بتپارێزێت. بەڵام بە هیچ جۆرێك ناتوانێت بە تەواوی تەفتەمیش تەفروتونا بکات‌و لەناوی بەرێت.

وتم: باشە تۆ لەوە ناترسیت یەکێك لە سیخوڕەکانی تەفتەمیش هەستێت‌و هەوڵی کوشتنی شێخ عومەر بدات..؟

وتی: بەڵێ گەورەم شتی وا ڕوودەدات. جا لەبەرئەوە پێویستە شێخ عومەر زۆر وریا بێت‌و ئاگای لە خۆی بێت.

ئا بەم جۆرەو لەگەڵ ئەو نائومێدییە زۆرەی کە بە کوشتنی شێخ عەلی تووشم هات‌و هەستم پێکرد. سەرنجم داو تێگەیشتم لەڕاستیدا کار بەو جۆرە لە سەمەرقەندا خەتەرناك نییە..

هیچ هەفتەیەکی نەخایاند بیروهۆشم بە شتێکی ترەوە سەرقاڵ بوو.

ئەویش ئەوە بوو، گەورەی پزیشکەکانی شاری تەبرێز هەواڵی دامێ کە ئەمیرە شۆلیان مەلەك خەریکە منداڵی دەبێت..

گەرچی سەبارەت بە من، لەدایکبوونی منداڵێکی نوێ لەناو خێزانەکەمدا شتێکی زۆر گرنگ نەبوو.

بەڵام لەڕاستیدا من گرنگییەکی زۆرم بەم منداڵبوونەی ئەمیرە شۆلیان دا، ئەمیرە شۆلیان لە دەی مانگی موحەڕەمدا کوڕێکی جوانی بوو. ناومان نا ئەلەهدیو لە هەمان ڕۆژیشدا هەواڵم پێگەیشت کە شاهێنشای فارسەکان کۆچی دوایی کرد.

* * *

## هێرشێك بۆ سەر باشووری ڕووسیا

پاش ئەوەی هەواڵی مردنی شای فارسەکانم پێگەیشت. چەند تیپێکم بۆ سەمەرقەندو ئوترار نارد بۆئەوەی بەرهەڵستی تەفتەمیش بکەن‌و ڕووبەڕووی ڕاوەستنەوە. بەڵام وەك سەردارو شازادەکانم ئاماژەیان بۆ کردم کە بەرەو باشوور بکشێم. بەڵام من ساڵێکی تریش لە تەبریزدا مامەوە.

چەند نوێنەرێکی خۆمم بۆ لای کوڕەکانی شا نارد. کە لە دوای مردنی باوکیان لەسەر جێگاو شانشینەکەی باوکیان ناکۆکی‌و ناتەباییان تێکەوتبوو.

نوورەددینیش پەیتاپەیتا ئاگاداری دەکردمەوەو زۆری لێدەکردم هێرش بکەمە سەر پایتەختەکەیان‌و داگیری بکەم‌و بیخەمە ژێر سایەو دەستەڵاتی خۆمەوە. پێش ئەوەی ئەوان دژی من یەك بگرن‌و ببنە خەتەرو هەڕەشە لە وڵاتەکەی من بکەن.

بەڵام من پێم ڕاگەیاند، ترسی نەبێت چونکە ئەوان هەرگیزاو هەرگیز یەك نابن‌و بە عەکسەوە پاشەڕۆژ لەسەر شانشینەکەی باوکیان زیاتر ناکۆك‌و ناتەبا دەبن.

لە ڕاستیشدا نوقلانەکەی من ڕاست دەرچوو. چونکە ئەوەندەی نەخایاند کوڕەکانی شا لە ناو خۆیاندا دەستیان کرد بە شەڕو پێکدادان.

ئیتر منیش چاوم ئەما بە بیانووی ئەوەی پارێزگاری زێن العابدین دەکەم بەرەو ئەسفەهان کشام‌و داگیرم کرد. دوای ئەوە بە گورجی نامەم بە چەند نوێنەرێکمدا بۆ لای براکانی زێن العابدین نارد.

لە نامەکانمدا بانگەوازی ئەوەم تێدا کردبوو، کە بێن بۆ ئەسفەهان تاکو ناکۆکییان لە نێواندا نەهێڵم‌و کێشەکانیان بۆ چارەسەر بکەم.

براکانی زێن العابدینیش کە ژمارەیان ١٠ برا بوون ڕەزامەندی خۆیان بۆ هاتنی ئەسفەهان دەربڕی‌و هەر هەموویان جگە لە شا مەنسوور نەبێت کە لەگەڵ لەشکرەکەیدا هەڵاتن بۆ قەڵای سپی کە خاوەنەکەی یەکێك بوو لە شێخەکانی ناو چیا.

کاتێك کورەکانی شا هاتنو بینییان من پایەختەکەی باوکیانم داگیرکردووەو دڵنیا بوون لەوەی ناتوانن شەرم لەگەڵدا بکەن. هەر هەموویان بە ناچارییەوە دانیان نا بەوەی کە من شاهێنشایانمو هەمووشیان قایل بوون بە سیفەتی ئەوەی من شای ئەوانم لە نوێژەکانی هەینیدا ناوم بێننو دووعای خێرم بۆ بکەن.

پاش ئەوەی لە ئەسفەهاندا کاروبارم رێکخست. دوای ئەوە بەرەو سەمەرقەند کەوتمە رێو لە رێگادا ئەگەیشتمە هەر شارێك ئەو باجو خەراجەی شا لە سەر خەڵکەکانی دانابوو، کەمم دەکردەوەو باری شانیانم سووك دەکرد. وە ئەو برە پارەیەشم لەسەر بازرگانو دەوڵەمەندەکانو شازادەکانیش لابرد کە پێویست بوو بیدەن بە من.

لەم رێو رۆیشتنەمدا زێن العابدینیشم لەگەڵدا بوو. بەڵام کاتێك گەیشتینە شاری شیراز زێن العابدینم لەوێدا کرد بە شاو لە رێو رەسمێکی پڕ شکۆو قەشەنگدا، کە شاری شیراز لە هەموو مێژووی خۆیدا شتی وای بە خۆیەوە نەدیبوو، تاجی شاهانەم کردە سەر زێن العابدینو کردم بە شای ئەوێ.

پاشان بەرەو رۆژهەڵات کەوتمەرێو بە بیابانەکەدا رەت بووم هەتا گەیشتمە شاری هێراتو لەوێدا شاهرووخم کرد بە سوڵتانی خۆراسان چونکە حەزی دەکرد لەگەڵمدا بۆ سەمەرقەند بێت. قایل بووم لە جیاتی خۆی بۆ چەند ماوەیەك تا دێتەوە، فەرمانڕەوایەك لە جێی خۆیدا دابنێت.

کاتێك گەیشتمە شەهری سیبز فەرمانم دا بە لەشکرەکەم کە لەوێدا سەربازگە دابنێنو خۆیان بۆ ئەو هەڵمەتو هێرشە ئامادە بکەن کە لە دواییدا سەرکردایەتی دەکەمو هەڵمەت دەبەینە سەر تەقتەمیشو لەناوی دەبەم.

ئیتر دوای ئەوە لەگەڵ پاسەوانە تایبەتییەکانی خۆمدا، کە ژمارەیان دووانزە هەزار سەرباز بوو. وە لەگەڵ تیپی شیندا کە شاهرووخ سەرکردایەتی دەکردو پێم سپاردبوو بۆئەوەی لە کاتی رێو رۆیشتنمدا ئاگای لێم بێتو بمپارێزێت. بەرەو سەمەرقەند رەومان کردو کەوتینە رێ.

کاتێك گەیشتینە سەمەرقەند خەڵکەکەی پێشوازییەکی وا گەرمو گوڕیان لێکردم هەروەك من لە گەڕانەوەمدا هەموو سەروەتو سامانی هیندو چینم لەگەڵ خۆمدا بۆ هێنابێتەوە. لەناو پێشوازیکەرەکانیشدا دڵشادو ئالی سۆنو نۆبجاو سیفینو هەموو منداڵەکانیشیان کە لەو ماوەیەدا من لە سەمەرقەندا نەبووم، هەموویان گەورە ببوونو باڵایان بەرزببۆوە لە ریزی پێشوازیکەرەکاندا بوون. بەڵام کاتێك چاوم بەناو پێشوازیکەرەکاندا گێڕا. زۆر سەیرم پێهاتو

سەرم سووڕماو کە شازادە شێرێزایان تێدا نەبوو. چونکە شێرێزا لە هەموو ژنەکانی تر زیاتر حەزی بە خۆنواندن و کەش و فش و خۆدەرخستن دەکرد.

کاتێك بە تەنها لەگەڵ شازادە دڵشادا دانیشتم. بە سەرسووڕمان و سەیرێکەوە لێم پرسی:

-دڵشاد، شازادە شێرێزا لە کوێیە..؟ چونکە من لەناو پێشوازیکەرەکاندا نەمبینی.

وتی: تەیموور، شێرێزا لە ئوتراره.

وتم: چووە بۆ سەردانی شێخ عومەر.. وا نییە؟

وا دیارە دڵی بەرامبەر میران شای نازداری کوڕی گۆڕاوە.. وا جێی هێشتووەو چووە بۆ بینینی کوڕەکەی تری.."

وتی: نەخێر.. میران شای نازداریشی لەگەڵ خۆیدا بردووە..

وتم: چۆن..؟ ئەی من فەرمانم نەداوە کە..

قسەکەی پێبڕیم وتی:

-بەڵێ من ئەوە دەزانم.. زۆریشمان هەوڵ لەگەڵدا دا، کە نەیەڵین بڕوات بەڵام بێ سوود بوو. قەناعەتی بە قسەکانمان نەکرد.. گەورەم خۆشت دەزانیت ئەو -بێجوە دیل نییە..

وتم: باشە هۆی چوونەکەی بۆ ئوترار چییە..؟

ئەی میران شا دەتوانێت سەفەر بکات..؟ من وام دەزانی ئێستا میران شا..

-مردووە.. وا نییە..؟ نەخێر خاتوو شێرێزا لە مردن قووتاری کردو لە دڵ و دەروونیدا تۆوی تەماع و گەورەیی چاند..

-بۆچی..؟ دڵشاد. چۆن..؟

-بێگومان تۆ خۆت ئاگاداریت کە شێخ عومەر تەفتەمیشی ڕاوناو شکاندی، بەو شکاندن و ڕاونانەی تەفتەمیش، شێخ عومەر ناوو ناوبانگێکی گەورەو گرانی بۆ خۆی پەیدا کرد. لەناو دڵ و دەروونی دانیشتووندا جێگاو ڕێگایەکی بەرزی بۆ خۆی کردەوە. لەوەش زیاتر ئێستا خەڵکی زۆر بە چاوی ڕێزو گەورەییەوە تەماشای دەکەن و وەك پەرستن دەیپەرستن.

-بەڵێ.. ئەو ناوو دەنگوباسەیم پێگەیشتووەو منیش شانازی پێوە دەکەم.

-بەڵێ شازادە شێرێزا ئەم سەرکەوتن و ناووناوبانگەی شێخ عومەری پێ خۆش نەبوو. چونکە لەوە دەترسا ناوو ناوبانگی شێخ عومەر ناوو ناوبانگی میران شا نەهێڵێت. لەبەرئەوە دەستی کوڕەکەی یاخود منداڵەکەی گرت و بردی بۆئەوەی ئەویش هاوبەشی جەنگ و کوشتار بکات.؟

-بۆئەوەی هاوبەشی جەنگ‌و کوشتار بکات..؟ بەڕاستی شێرێزاش لە هیچ‌و پووچیدا هیچی لە منداڵە نازدارەکەی کەمتر نییە..

-بەڵێ دەبێت وا بێت.. لە ڕاستیشدا شێرێزا لە حاڵەتێکدا بوو، ئینسان بەزەیی پێدا دەهاتەوە..

هەرچۆنێك بێت، هەفتەیەك لەمەوپێش تیپێکی لەو کەسانەی سەر بەو بوون کۆکردەوەو لەگەڵیاندا ڕۆیشت بۆ ئوترار لەم ڕێ ڕۆیشتنەیدا سەیفەددینی پیرەمێردیشی لەگەڵدا چوو. چوونی سەیفەددین لەگەڵیدا کارێکی باش بوو. چونکە ڕەنگە، ڕێگای خراپەی لێبگرێت.

-من گومانم لەوە هەیە.. چونکە سەیفەددینی پیرەمێرد، پیاوێکی بێگوێ‌و بێ مێشکە.. چونکە چوونی لەگەڵ شێرێزادا زۆرترو زووتر پاڵی پێوە دەنێت بۆ کاری خراپ‌و نابەجێ‌و دڵتەزێن.

-تەیموور من زۆر شادو بەختیارم چونکە تۆ شاهڕووخت خۆشدەوێت.

-دڵشاد من قینم لە هیچ کەسێك نییە، کوڕەکەی تۆش کوڕێکی زیرەك‌و خۆشەویستە. ناچێتە عەقڵیشەوە من هەرگیزاو هەرگیز قینم لێی بێت. ئیتر دەستم خستە سەر شانی‌و دەستم کردە ملی‌و ئەویش خۆیدا بە سنگمداو خۆی پێوە نووساندو دەستیکرد بە گریان‌و بەدەم گریانەوە دەیوت:

-ئۆه.. تەیموور.. بەڕاستی من شاهڕووخم زۆر خۆشدەوێت.. و تۆشم زۆر زۆر خۆشدەوێت. داواکارم لێت کە لەگەڵیدا بە چاکی بجووڵێتەوەو کردەوەت لەگەڵیدا باش بێت. من هیچ کات نامەوێت ڕوتبەو ناوو نیشانێکی بدەیتێ کە شایانی ئەو نەبێت.

من تەنها ئەوەندە لە تۆ داوا دەکەم ڕقت لێی نەبێت‌و خۆشت بوێت..

دەستم هێنا بە پشتیداو ڕەحم‌و سۆزیم دامرکاندەوەو دڵنیام کرد. و ئەو ڕۆژە خۆشانەم بە یادهێنایەوە کە پێکەوە لە دەربەندە خێمەکەی نزیك خیڤادا بردمانە سەرو.. لەو کاتەشدا یادی ئەلجایشم بیرکەوتەوە..!! لە شاری سەمەرقەندا زۆر نەمامەوە، چونکە پاش ئەوەی گەیشتمە ئەوێ ئەوەندەی نەخایاند بیستم تەقتەمیش هێرش ناکاتە سەر شێخ عومەر لە جیاتی ئەوە بەرەو باکوور کشاوەتەوەو هێزەکانی خۆی کۆدەکاتەوەو خۆی بۆ هێرشێکی گەورەو بەرفراوان بۆ سەر سەمەرقەند ئامادە دەکات..!!

هەواڵیشم پێگەیشت تەقتەمیش هەرچی ئەو نەتەوانەی کەوتوونەتە باشووری ڕووسیاوە یەکی خستوون‌و ئێستا هێزێکی هەیە ژمارەیان زۆر لە هێزەکەی من زیاترە. منیش گورج

لەشکرەکەم کۆکردەوەو ئامادەم کردن بۆ هێرشێك بۆ سەر وڵاتی تەقتەمیش هەرچی سەردارو سەرلەشکرەکانم هەبوون خۆیانو هێزە بێ شومارەکانیان لە شەهری سیبزەوە بەرەو سەمەرقەند هاتن.

منیش لە بەردەم ئەو دەشتەی کەوتۆتە بەردەم شاری سەمەرقەندەوە لە شێوەی نمایشێکدا بەسەر لەشکرەکەمدا گەڕامو تەماشام کردن.

لە ناوەڕاستی وەرزی زستاندا لە مەڵبەندەکەی خۆمەوە لە سەمەرقەندەوە بەرەو تەشقەند کشام.

بەڵام هەر کە گەیشتمە ئەو شارە نەخۆش کەوتمو بۆ ماوەی چل ڕۆژی تەواو بەردەوام تووشی لەرزوتا بووم.

شازادە دڵشادو ئەمیرە شۆلیان پێکەوە بۆ تەشقەند بۆ لام هاتن. بۆ ئەوەی چاودێریو خزمەتم بکەن. هەتا چاك بوومەوەو توانیم بڕۆم بۆ ئوترارو لە ڕۆیشتنمدا بۆ ئوترار ئەوانیش

لەگەڵمدا هاتن. لەوێدا داوام لە دڵشاد کرد کە بگەڕێتەوە بۆ سەمەرقەند، چونکە وا پێویست دەکات کە لەوێدا بێت.

بەڵام ئەمیرە شۆلیان زۆر حەزی کرد لەم سەفەرەدا لەگەڵمدا بێت.. دیاربوو ئەمەش لەبەر ئەو سۆزو بیرەوەرییە زۆرە بوو کە لە کاتی منداڵیدا لەو وڵاتە ساردو بەستەڵەکەدا بردبوویە سەر.

لە ئوتراریشدا شێخ عومەرو شازادە شێرێزاو میران شاو هەموو هێزەکانی ترم هاتنە پاڵ لەشکرەکەمەوەو لەگەڵمدا بەرەو باشووری ڕووسیا کەوتینە ڕێ بۆ ڕووبەڕووبوونەوە بەرامبەر تەقتەمیشی سەرکردەی درندەی ڕووسی. ئەوکاتە لەشکرێکی بەهێزو زۆرم هەبوو لە سەد هەزار سەرباز زیاتر بوو. بەردەوام بە دەشتو دەری باشووری ڕووسیادا دەڕۆیشتین هەتا وامان لێهات تەنها ٢٠ میل لە بارەگای تەقتەمیشەوە دووربووین.

ئیتر لەوێدا سەرپەرشتیو ڕێکخستنی لەشکرەکەمم کردو سەرکردەم بۆ هێزو تیپەکان داناو بە هێرشێکی بەرفراوان بەرەو نەتەوەکانی کەناری ڕووباری فولگا کشاینو هێرشمان کردە سەریان.

شەڕو کوشتار لە نێوان لەشکرەکەی تەقتەمیشو لەشکرەکەی مندا گەرم بوو لەڕاستیدا ئەم شەڕەی نێوانمان شەڕێکی سەختو خوێناوی بوو.

بە جۆرێك بوو نەدەچوو عەقڵەوە. چونکە ئەو نەتەوانەی کەنارەکانی ڕووباری فولگا بە بیروباوەڕێکی تەواوەوە شەڕیان دەکردو لەو باوەڕەدا بوون کە زۆر پێویستی سەر شانیانە بەرگری و پارێزگاری لە خاك و نیشتمانی خۆیان بکەن..!! هەروەها هێزەکەی منیش بڕوای تەواویان هەبوو کە پێویستە بە بڕوایەکی پتەوو بە ئازایەتییەکی بێوێنەو خۆبەخت کردنێکی لەخۆ بووردوانەوە شەڕ بکەن هەتا بە تەواوی دەتوانن خۆیان لەم دوژمنە سەرسەختە دڕندەیەی ڕووس تەفتەمیش ڕزگار بکەن.

شەڕو کوشتار ماوەیەکی دوورو درێژو چەند هەفتەی خایاند. بەڵام لە کۆتاییدا هێزەکەی تەفتەمیش شکا. کاتێکیش نەتەوەکانی کەناری ڕووباری فولگا کشانەوەو هەڵاتن. نزیکەی شەست تا حەفتا هەزار کوژراویان لەو دەشتەدا لە دوای خۆیان جێهێشت.

شێخ عومەریش دەستیکرد بە ڕاونانی پاشماوەی هەڵاتووەکانیان. منیش ویستم ئاماری ئەو سەربازانەی خۆم بکەم کە لەم کۆڕی جەنگەدا کوژرابوون. لە دواییدا بۆم دەرکەوت منیش ۲۰ هەزار سەربازم لەم جەنگ و کوشتارەدا لەدەستچووە لە دوای نیوەڕۆدا لەشکرەکەی خۆمم کۆکردەوە بۆئەوەی ڕێزی کوژراوەکانمان بگرین و ڕێو ڕەسمی ناشتیان سازبکەین. لەناو کوژراوەکاندا تەرمی شازادەی پیرەمێرد سەیفەددینیشی تێدابوو. پاش ڕێو ڕەسمی بەرێکردن و ناشتنی کوژراوەکانمان. وە پاش ئەوەی ئیمام ڕێو ڕەسمی ئاینی و خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزی بەسەر لاشەی سەیفەددیندا تەواو کرد. تەرمەکەیم دایە دەست نوورەددین بۆئەوەی بە ڕێزو شانازییەوە بینێژێت.

ئیتر دوای ئەوە سوڵتان مەحموودم بۆ یارمەتی و پشتگیری شێخ عومەر نارد ڕۆژی دواییش من و نوورەددین بەرەو کەناری ڕووباری فولگا ڕۆیشتین. لە نێوان هێزەکەی شێخ عومەرو پاشماوەی هێزەکانی کەناری ڕووباری فولگادا هەندێ شەڕو پێکدادان ڕوویداو ئەم شەڕو کوشتارە سێ ڕۆژی خایاند. هەر کە من گەیشتمە کەناری ڕووباری فولگا بە تەواوی شەڕو کوشتار کۆتایی هات. هەرچی جەنگاوەری ڕووسەکان هەبوو هەر هەموویان کوژران و سەریان پەڕاندن یان لە کاتی پەڕینەوەیاندا لە ڕووباری فولگادا خنکان.

شێخ عومەر لە کاتی هێرشەکەیدا دەستیگرت بەسەر ئەو کاروانەی ڕووسەکاندا کە لەمەوپێش ڕایانکردبوو.

لەناو ئەو کاروانەدا هەرچی ژن و سامانی نەتەوەکانی کەناری ڕووباری فولگا بوو هەر هەمووی تێدابوو.

تیپێکیش له تیپەکانی لەشکرەکەم دوای تیپە تایبەتییەکەی تەفتەمیش کەوتن. بە هیوای ئەوەی ئەو سەرکردەو درندەیەی ڕووسەکان بگرن. بەلام تەفتەمیش لەگەڵ تیپە تایبەتییەکەی خۆیدا ڕایانکردو خۆیان گەیاندە جۆرجیا منیش ئەو کاتە نەمدەتوانی لە پێناوی ڕاونان و گرتنی تەنها سەرکردەیەکدا لەشکرەکەم بەرەو جۆرجیا بەرم.

لەگەڵ ئەوەشدا لەشکرو جەنگاوەرەکانم دەستیانکرد بە تالان و بڕۆی ئەو ولاتەو وێرانیان کرد. ژنەکانیانی ئەتك کردن و هەرچی پیاوێکیان هەبوو، هەر هەموویان کوشتن.

دوای ئەوە ئیتر من دڵنیابووم لەوەی کە جارێکی تر هیچ سەرکردەیەکی تری ڕووسی کەرەتێکی تر ناتوانێت لەشکر پێکەوە بنێت و تا من لە ژیاندا بم بتوانێت و بوێرێت شەڕم لەگەڵدا بکات..!!

* * *

## زیانێکی زۆر گەورە

هەر کە گەیشتمەوە سەمەرقەند خێرا ناردم بە شوێن سیفیندا. گەرچی من بە هۆی ئەو خۆتێهەڵقورتاندنەیەوە کە خۆی لە کاروباری شازادە شێرێزاو میران شادا هەڵقورتاندبوو هیچ زیانێکم نەکردبوو.

بەلام ئەم خۆتێهەڵقورتاندنەی بە تەواوی تووڕەو بێزاری کردبووم و وای لێکردم کە لەبەر ئەو کردەوە ناشیرین و هەڵسوکەوتە نابەجێیەی سزای ئەو ڕێوییە چەپەڵە بدەم. هەروەك پیشەی خۆی هەر کە هاتە ناو ژوورەکەمەوە، کراسێکی ڕەشی لە بەردا بوو. ئەوەندەی نەخایاند، جلەکانی داکەندو وردە وردە خۆی ڕووت کردەوەو لەش و لاری خۆی دەرخست. بە شێوەیەکی سەیرو سەرنجڕاکێش دەستی بە خۆبادان کرد. منیش لەم کردەوەو خۆبادانە نابەجێیەی بە تەواوی بێزارو تووڕە بووم. چونکە مێشکی تێکدام و نارەزووی هەستاندم. بە هەموو قین و هێزێکمەوە زللەیەکی توندم کێشا بە ڕوومەت و بناگوێیدا.

لە جیاتی ئەوەی تووڕە بێت و قینی لێم بێتەوەو لە ژوورەکەدا بچێتە دەرەوە. دەستیکرد بە کردنەوەی قۆپچەی کراسەکەی کە تەنها هەر ئەو کراسەی لە بەردا مابوو، هەتا وای لێهات کراسەکەی لەسەر شانییەوە خزایە خوارێ و لە بەردەم پێیدا کۆمەڵە بوو. منیش هەر کە ئەوەم بینی هەمدیسان بە توندی زللەیەکی ترم پیاداکێشا.

من وامزانی دوای ئەوە کراسە ڕەشەکەی لەبەردەکاتەوەو خۆی دادەپۆشێتو لە ژوورەکەم دەچێتە دەرەوە. بەڵام کاتێك بینیم لەشو لارە ڕووتەکەی خۆی دا بە سەرمداو بە گوێمدا دەستیکرد بە چرپە چرپو بە زۆر زەوقو ئارەزووی شەهوانی هەستاندمو مێشكو ئارەزووی هەژاندمو بە زۆر خستیە جووڵە. هەر حەپەساو لە شوێنەکەی خۆمدا سڕ بووم. هەر ئەوەندەم پێکرا زللەیەکی ترم بە هەموو هێزمەوە پیادا کێشاو هەرچی قینو توورەییەکی شێتانە لە دڵمدا بوو پێم ڕشت.

لەگەڵ ئەوەشدا هەر گوێی بە زللەکەم نەداو کاری تێنەکرد. لە جیاتی ئەوە باوەشی پیادا کردمو نینۆکەکانی لە پشتم چەقاند.

نیشانەی زەوقو ئارەزوویەکی شەهوانی بێوێنە لە چاوەکانیدا دەدرەوشایەوەو دەستیکرد بە پاڕاندنەوە لێمو دەیوت:

-تەیموور.. تینووم.. من زۆر تینووم، تەیموور.. گڕو کڵپەو تینی تینوێتیو ئارەزووم دابمرکێنەوە،، وازت لێناهێنم هەتا برسێتیو ئارەزووم دانەمرکێنیتەوەو تێرم نەکەیت..!!

منیش هیچ چارێکم نەماو خۆم دا بەدەست زەوقو ئارەزووە زۆرو زەبەندە شەهوانیو ئاژەڵییەکەیەوە..

کاتێك تینوێتیو ئارەزووم دامرکایەوە.. هەستم بە ماندوێتیو بێهێزی کردو ویستم بێمەوە سەرخۆمو مێشکی خۆم ساف بکەم. سووك سیفینم هەڵگرتو لەسەر جێگاکەی خۆم دامناو خۆشم لەسەر جێگاکە ڕاکشامو سیفینیش لە تەنیشتمەوە دانیشت. بەڵام ئەوەندەی نەخایاند ڕاستبۆوەو نیشانەی شادیو سەرکەوتن لە ڕوویدا خۆی دەنواندو بە ڕاشکاویو شانازییەوە پێی وتم:

-ئەی پیرەمێرد وا لەناو جێگاکەتدا من تۆم بەزاندو بەسەرتدا زاڵ بووم..!! پاشەڕۆژیش لەناو وڵاتەکەشتدا دەتبەزێنمو بەسەرتدا زاڵ دەبم. خو ئێستا من سەرکەوتووم.. وا نییە..؟

دەستی بە جل لەبەرکردنەوە کردو منیش هەر تەماشام دەکردو نەمدەزانی چی بەرامبەر بکەم. وا کەللەیی ببووم هۆشم لای خۆی نەمابوو.

لەم کاتەدا وا هات بە بیرما هەستمو بە چەقۆیەکی تیژ، گۆشاوگۆش سەری ببڕمو بیکوژم.

هەمدیسان ڕووی تێکردمەوەو بە توندی لە ڕوومدا ڕاوەستایەوە، قسەکەی پێشووی دووپات کردەوەو وتی:

-ـەی پیرەمێرد..!! وا لەناو جێگاکەتدا من تۆم بەزاندو زاڵبووم بەسەرتدا.. ئینجا نۆبەی ئیمپراتۆرییەتەکەتە..!!

بە گاڵتەپێکردنەوە، دایە قاقای پێکەنینو لە ژوورەکەم چووە دەرەوە.. منیش نەمدەزانی چۆن لەم کێشەیە خۆم قووتار بکەمو ڕزگارم ببێت.. پاشان وا هات بە بیرمدا، بچم بۆ کۆشکەکەی ئالی سۆنو لەوێدا تۆزێك مێشکم بحەسێنەوەو ئارام ببمەوە.

کاتێك گەیشتمە کۆشکەکەی‌و چوومە ژوورەکەیەوە. جۆن بیتری کوڕی لەگەڵماندا دانیشت. ئالی سۆن داوای لێکردمو هەڵێنام کە قایل بم. جۆن بیتری کوڕی بنێرم بۆ قوتابخانەیەکی دواناوەندی بۆ خوێندنو خوێندن لەوێدا تەواو بکاتو زانستو زانیاری فێربێت.. چونکە ئالی سۆن دەیویست کوڕەکەی ببێت بە قەشە، منیش داواکارییەکەیم قبوڵ کردو بەڵێنم پێداو دڵنیام کرد. لە پاشاندا ڕەوانەی قوتابخانەی شاری سوڵتانیەی وڵاتی فارسەکانی دەکەم. چونکە ئەو قوتابخانەیە لە هەموو ئاسیادا چاکترین قوتابخانە بوو.

ئالی سۆنیش بەمە زۆر دڵخۆش بوو لە خۆشیاندا هەرچی پێداویستییەكو خۆشی‌و شادییەك کە دڵو دەروونم پێی خۆش بوو، بۆی کردم.

کاتێك گەڕامەوە بۆ کۆشکە تایبەتییەکەی خۆم. هەواڵیان پێڕاگەیاندم کە کوڕەکانی شا لەناو خۆیاندا تێکچوونو شەڕێکی گەورەو گران لە نێوانیاندا قەوماوە.

منیش بۆئەوەی کوڕەکانی شا ئاشت بکەمەوە. بڕیارم دا بڕۆم بۆ وڵاتی فارسەکانو لە وڵاتی فارسەکانیشدا کاتێك بەسەر بەرەو مێشکم بحەسێنەوە..

لەگەڵ خۆشمدا شاهرووخو جۆن بیترو کوڕەزاکانمو سەرکردەکانیشم برد. هەر کە گەیشتمە ئەوێ زۆری نەخایاند، برا شەڕکەرەکانم ئاشت کردەوەو ناکۆکیم لە نێوانیاندا نەهێشتو هێمنو ئاسایشم خستەوە ناو وڵاتی فارسەکان. لەمەوپێش من هەندێ پیاوو جاسووسی خۆمم بۆ بەغداد ناردبوو، بۆئەوەی شەڕو ئاژاوە لەناو بەغدادا بنێنەوەو سوڵتانە بێهێزەکەی بەغدادی پێ بترسێنن.

کاتێك تێگەیشتم سوڵتان ئەحمەد، سوڵتانی بەغداد زۆر بێهێزو بێ توانایە، لەشکرەکەم بەرەو شاری بەغداد گشاند. کاتێك گەیشتمە بەغداد بینیم، سوڵتان ئەحمەد ڕایکردووەو پەنای بردۆتە لای سوڵتانی میرنشینەکان لە قاهیرە. کە بەڕاستی ئەو سوڵتانی تەواوو فەرمانڕەوایی ڕاستەقینەی بە دەستەوە بوو.

شارەکە لە حاڵەتێکی وا پەرێشان و شڵەژانیدا بوو، کە بۆ داگیرکردنی پێویستی بەوە نەکرد من هیچ شەڕو کوشتارێك بکەم و بە ئاسانی شارەکەم داگیرکرد. شاهرووخیشم بۆ گرتنی سوڵتان ئەحمەد بەدوادا ناردو خۆشم لەسەر تەخت و شانشینی بەغداد دانیشتم و بووم بە شاهێنشای ئەوێ.

پاش هەفتەیەك شاهرووخ گەڕایەوە، دوای ئەوەی دەستی بەسەر هەموو سامان و ژنەکانی سوڵتان ئەحمەدا گرتبوو.

بەڵام نەیتوانی سوڵتان ئەحمەد بگرێت، چونکە سوڵتان ئەحمەد پێش نیوەڕۆیەك لەگەڵ باشترین سوارچاکەکانیدا لە بیابانی شامەوە بۆ شاری دیمەشق هەڵاتبوو.

منیش نامەیەکم بۆ قاهیرە ناردو لە نامەکەمدا داوام لە سوڵتانی میرنشینەکان کردبوو کە سوڵتان ئەحمەدم بداتەوە دەست.

بەڵام سوڵتانی میرنشینەکان. هەر هەموو نوێنەرەکانی منی کوشت. جگە لە یەکێکیان نەبێت و بەودا وەڵامێکی سووك و ناشیرین و نابەجێی بۆ ناردمەوە. هەروەها بینیم بە هۆی هاتنی من و داگیرکردنی بەغداوە سوڵتان بایەزید، سوڵتانی تورکیا زۆر لێم تووڕەیە و نامەیەکی تووڕەو پڕ هەڕەشاوی بۆ ناردم. نامەکەی سوڵتان بایەزید بریتی بوو لە هەڕەشەو گوڕەشەیەکی زۆرو قسەی سووك و نابەجێی زۆری تێدابوو. نامەکەی زۆر سووکایەتی ترو بە کەمزانینی تر بوو لە نامەکەی سوڵتانی میرنشینەکانی قاهیرە..! نامەکەی سوڵتان بایەزید بەم شێوەیە دەستی پێکردبوو:

"ئەی تەیموورە شەل..!! ئەی تەتەری دەشتەکی..!! ئەی سەگی دەشت و بیابان، هەر ئێستا بۆ کونەکەی خۆت لە سەمەرقەند بگەڕێرەوە.. دەنا پاشان لەشکری تورك دژی تۆ هێرش دەکەنە سەرت و لەناوت دەبەن.. من خۆم دێم ڕاوت دەنێم و دەرتدەکەمەوە بۆ کولانەکەی دەشت و بیابانەکەت و لەبەرچاوی خۆت ژنەکەشت ئەمیرە شۆلیان مەلەك لە خێم مارە دەکەم. تۆش پێویستە باش گوێ بدەیتە ئەم ئاگاداری و ووریاکردنەوەیەی من. خۆ ئەگەر ئەوە نەکەیت. ئەوا لە پاشاندا خۆت بەرپرسیاری ئەنجامی خەتەرناکی ئەم کارەتیت و من بەڵێنت دەدەمێ کارێکی وا ناخۆشت پێدەکەم، خۆت و هەرچی لەشکرەکەشت هەیە، هەر هەموویان دەکوژم و لە ناویان دەبەم..!!".

. نامەکەی بایەزید زۆر بێزاری کردم، وەك لەوەی تووڕەم بکات. چونکە نامەکەی زۆر هیچ و پووچانە و لە خۆباییبوون و درۆی تێدا بوو.

لە ڕاستیشدا من حەزم نەدەکرد سوڵتانی تورك تووڕە بکەم. تا ئەو کاتەی لەشکرێکم دەبێت زۆر زیاترو بەهێزتر دەبێت لەو لەشکرە زۆرو زەبەندەی کە لە شانس و بەختی مندا ئەو کاتە لە ئەورووپادا سەرقاڵ و خەریك بوون.

هەروەها هەندێ دەنگوباس و زانیارم پێگەیشت کە تەفتەمیش هەندێ ئاژاوەو کێشەی لە سنووردا بۆ تورکەکان ناوەتەوە. ئەم دەنگوباسە منی زیاتر بێزار کرد.

چونکە ئەگەر ئەم سەرکردە دڕندە ڕووسییە بتوانێت لەشکرێکی گەورە لە جۆرجیاو قەفقاسدا کۆبکاتەوە بۆئەوەی هێرش بکاتە سەر تورکەکان، ئەوا ئەوکاتەش خەتەرییەکی گەورە دەبێت بۆ من و هەڕەشە لە سنووری وڵاتەکەی منیش دەکات. جا لەبەرئەوە بڕیارم دا بگەڕێمەوە بۆ تەبریز بۆئەوەی لەشکرەکەم کۆبکەمەوەو بەرەو باکوور بکشێم و بۆ هەتاهەتایە تەفتەمیش بشکێنم و لەناوی بەرم و دەبەری قەفقاس و جۆرجیاش وێران بکەم کە بوونەتە دوا قەڵاو مەڵبەندی نەتەوەکانی کەناری فولگا..

* * *

خێمە تایبەتییەکەی خۆم لە کەناری دەریاچەی ئورمیادا هەڵدابوو. لەو خێمەیەدا هەموو پێداویستییەکانی ژیان و خۆشی و حەسانەوەی تێدابوو. هەر لەو خێمەیەشداو لە هەمان شوێندا بوو کە ئەلەهدی کوڕمی تیا لەدایك بوو. هەر لەوێدا نوورەددین و شێخ عومەرو فەرماندەو سەرتیپەکانی تریشم هاتن بۆ لام و پەیوەندییان پێوەکردم و لە تەنیشت چادرەکەی منەوە بۆ ماوەی ساڵێکی تەواو چادرەکانی خۆیان هەڵدا.

ئەمەش لە کاتێکدا بوو، کە من سەرقاڵ بووم و خۆم ئامادە کردو کاروبارو پێداویستیم جێبەجێ دەکرد بۆئەوەی ببنە زامنی ئەوەی تەفتەمیش و ئەو نەتەوانەی لەگەڵیدان بە تەواوی بۆ هەتاهەتایی لەناویان بەرم.

ژمارەیەکیش لە ژنەکانی کۆشکەکەم و ئەمیرە شۆلیان و ئەلەهدی کوڕی، کە ئەوکاتە تەمەنی گەیشتبووە هەشت ساڵان. بۆ کەناری دەریاچەی ئورمیا هاتن بۆ لام.. بۆئەوەی وەرزی زستان لەوێداو لە شاری تەبریزی خنجیلانەدا ببەنەسەر. ئەو شارەی کە خۆشی و بەختیاری و ژیانی ئاسوودەیی باڵی بەسەردا کێشابوو. لەم وەرزی زستانەدا شاری تەبریز زۆر سارد بوو بەفرێکی ئێجگار زۆر باری و ڕێگاوبانەکانی پڕکرد.

منیش لە ماوەی مانگەکانی ئەو زستانەدا دەستمکرد بە ڕێکخستن و بەهێزکردن و ئامادەکردنی لەشکرەکەم.

هەروەها کۆمەڵێك پیاوی ئایینیو کۆیلەم ئامادەکردو بە دزییەوە ناردمنە ناو ڕیزەکانی لەشکری تورکەوە. بۆئەوەی لەو شارانەی کەوتوونەتە کەناری دەریای ڕەشو ئەو شوێنانەی لە نزیك کەناری دەریای سپی ناوەڕاستەوەن کاربکەنو هەواڵو دەنگوباسم بۆ بنێرنەوە. کاتێك وەرزی هاوین بەسەردا هات ئەو کاتە من ژمارەیەکی ئێجگار زۆر جەنگاوەرم کۆکردبۆوە کە لەم هەوڵەمدا بە دڵنیاییو مسۆگەرییەوە بتوانم بەسەر تەفتەمیشدا زاڵ ببمو بە تەواوی لەناوی بەرم.

پاش ئەوەی وەرزێکی تەواوم لە مەشقکردنی لەشکرەکەمدا بردە سەرو سەرکردەو سەرتیپی تەواوم بۆ ئەم هەڵمەتە بەرفراوانەم دانا بۆئەوەی خۆم سەرکردایەتییان بکەمو هەڵمەت بەرمە سەر تەفتەمیشو بە تەواوی خۆیو نەتەوەکانیو لەشکرو شارەکانی وێران بکەمو لەناویان بەرم.

گەرچی تەندروستی ئەمیرە شۆلیان لە وەرزی زستاندا زۆر چاك بوو. بەڵام هەر کە وەرزی هاوین هات. تەندروستی بە تەواوی تێکچوو. تووشی ئێشو ئازارێکی هێندە زۆر بوو. بە تەواوی ژیانی خستە مەترسییەوە.

یەك مانگ پێش ئەوەی دەست بە هەڵمەتەکەم بکەم ئەمیرە شۆلیان مەلەك لەو شوێنەی ئەلەهدی کوڕی تیا لەدایك بوو، گیانی لەدەست داو مرد.. تەرمەکەیم بۆ سەمەرقەند ناردەوەو بە شارەزاترین ئەندازیارەکانی ئاسیام ڕاگەیاند کە جوانترینو گەورەترین گومەز لەسەر گۆڕەکەی بنیات بنێن. لە هەفتەی دووەمی مانگی سەفەردا، لەشکرەکەم بەرەو باکوور بردو بەرەو شاری دیربند کەوتمەڕێ.

شەمسەدینم بۆ گفتوگۆو ڕاوێژ نارد بۆ لای تەفتەمیشو داوام لێکرد بە وردی بیر لەم کارە بکاتەوەو بڕیاری تەواوو کۆتایی بدات.

یان بێتو پەیوەندیم پێوە بکات، یاخود خۆی بۆ شەڕکردن لەگەڵمدا ئامادە بکات. داوام لە تەفتەمیش کرد خێرا بڕیاری خۆیم بۆ دەربخاتو چی دەزانێت، پێم ڕابگەیەنێتو بۆم ڕوون بکاتەوە. چونکە من ڕێگای پێنادەم خۆی لە کاروباری سنووری وڵاتەکەمدا هەڵقورتێنێت، و کاتم لێ تێك بدات. چونکە من لەشکرەکەم بۆ شەڕێکی قورسو گران لەگەڵ بایەزیدی سوڵتانی تورکیادا ئامادە کردووە.

کاتێك گەیشتمە شاری دیربند، شەمسەدینیش لای تەفتەمیش گەڕایەوەو پێی ڕاگەیاندم کە تەفتەمیشی قایل کردووە خۆی بە دەستەوە بدات. بەڵام هەندێ لە سەرکردەکانی تەفتەمیش کە بە هۆی شەڕو کوشتارەوە قازانجو دەستکەوتی زۆریان دەستدەکەوت. قایل نەبوون خۆیان بدەن

به دهستهوهو. تهقتهمیشیشیان مهجبوور کرد له بریتی ئهوهی سهرم بۆ شۆڕ بکاتو خۆی بداته دهستمهوه، له رووما راوهستاو بهرامبهرم بۆ شهڕ وهستایهوه. منیش ههرچی ژنهکانم ههبوون ناردمن بۆ شاری سوڵتانیه، چونکه ئهویّ هێمنو ئاسایش باڵی بهسهردا کێشابوو.

خۆشم به لهشکرهکهمهوه بهرهو شاری باکۆ کهوتمهڕێو داگیرم کردو تاڵانم کردو پاشان وێرانم کردو سووتاندم.

ئینجا ڕوومکرده دۆڵو دهربهندهکانی قهفقاسو ههرچی شارو گوند لهو ناوچه شاخاوییانهدا بوو داگیرم کردو تاڵانم کردو خهڵکهکهیم کوشتو لهناوم بردنو شارو گوندهکانیشم سووتاند.

پاش ئهوه بهرهو باکوور کهوتمهڕێ. بهڵام سهرکردهی درنده تهقتهمیش لهگهڵ لهشکرهکهیدا بهرهو جۆرجیا کشایهوه. بۆئهوهی له پشتهوه کتوپڕی ههڵمهتم بۆ بهرێتو هێرش بکاته سهر لهشکرهکهمو لهناوم بهرێت.

ههر که له پلانهکهی گهیشتین.. مهحمود سوڵتان که سهرکردایهتی ناوجهرگهی لهشکرهکهمی دهکرد. بۆ شهڕکردنو رووبهڕووبوونهوهی ڕاوهستاو بۆسهی بۆ نایهوه.. سهنگهری لێداو خۆی تیادا حهشاردا بۆ بهرههڵستی ئهو هێرشه بهرفراوانهی تهقتهمیش.

منیش چهند ساڵێك بوو نهچووبوومه ناو کۆڕی شهڕو کوشتارهوه. بهڵام ئهمجارهیان وهك سهرکردهی تیپهکانی تر هاوبهشی شهڕو کوشتارم کرد. شهڕی ئهم جاره بهڕاستی شهڕێکی سهختو گهرمو خوێناوی بوو. پیاوه جهنگاوهره ئهبهزهکانم ئهعرهتهیان دهکێشاو به ههموو دهنگی خۆیان به دهورمدا هاواریان دهکردو ئهبهردانه خۆیان به کوشت دهدا.

لهم شهڕهدا ئهسپهکهم تیرێکی بهرکهوتو مردو ڕمهکهشم شکا. جهنگاوهرهکانم ههر که ئهمهیان بینی. ده کهسی تیرهاوێژو دلێریان له دهورم کۆبوونهوهو دهستیان کرد به تیرباران بهسهر ئهو دوژمنه زۆرهدا، که بهردهوام بهرهو رووم هێرشیان دههێنا. لهبهرئهوهی نووره‌ددین نهیدهتوانی خۆیو هێزهکهی هێرش بکهنه ناوجهرگهی دوژمنهوه. خێرا خۆیو کۆمهڵێکی ئازاو دلێری جهنگاوهرانی له هێزهکهیان جیابوونهوهو هاتن به هاناو فریاکهوتنمهوه. له کاتی ههڵمهتهکهیدا توانی سێ گالیسکه له دوژمن داگیربکاتو بهرهو لای من کێشی کرد. ئهوانهی پارێزگارییان دهکردم، دوای ئهوهی من هیچ تیرێك له تیردانهکهمدا نهما، به دهورمدا کردیان به سهنگهر.

پیاوهکانی ئهوو پیاوهکانی خۆشم قهڵغانهکانیان به دهورمدا کرد به سووپهرو منیان پێ پاراستو نهیانهێشت ئازارم پێبگات.

هەر لەم کاتەدا سەرکردە حسێن کە سەرکردایەتی فەوجی دووی هێزەکانی ئەمیر محەممەدی دەکرد توانی لە لای باڵی ڕاستی لەشکرەکەی تەفتەمیشەوە، دڕ بە دوژمن بداتو خۆی بگەیەنێتە تیپە بچووکەکەی منو بە هانامانەوە بێت. بەڵام جەنگاوەرانی تەفتەمیش دڕیان بە ڕیزەکانی هێزەکەی نووڕەددیندا و هێرشێکی توندو تیژی خوێناوییان کردە سەرمان.

شەڕو کوشتارێکی توندو خوێناوی لە نێوانماندا بۆ ماوەی سەعاتێك بەردەوام بوو. دوای ئەوە جیهانشای سوارچاك کە سەرکردایەتی باڵی چەپی هێزەکانی ئەمیر موحەممەدی دەکرد. توانی هێزەکانی دوژمن بشکێنێتو تێکوپێکیان بدات. جەنگاوەرەکانیش بە هاوارو هەل هەلە لێدانەوە بۆ بە هاناهاتنو ڕزگارکردنم بە پیرمەوە هاتن.

ئەم هێرشە سەرکەوتووە، توانی وا لە هێزەکانم بکات کە سەرلەنوێ یەك بگرنەوەو ڕیزەکانی خۆیان ڕێکوپێك بکەنەوە.

هەروەها هێزەکەی مەحمود سوڵتانیش کە لەناو خەندەقو سەنگەرەکاندا خۆیان ڕاگرتبوو، زیانێکی ئێجگار زۆریان تووش هاتبوو. توانیان ڕاست ببنەوەو یەك بگرنەوەو پەیوەندیمان پێوە بکەن.

ئیتر دوای ئەوە ئاڵای سەرکەوتنی ئێمە بەرزبۆوەو شەکایەوەو بە تەواوی سەرکەوتین، تەفتەمیش بۆ خۆشی هەڵات. بەڵام ئەمیر موحەممەد ڕاوی ناو کەوتە شوێنی. ژمارەیەکی زۆر زۆریش لە شازادەو سەرکردەکانی دوژمن کوژران. ئەوانەی کە نەشکوژران ڕایانکردو سەری خۆیان هەڵگرتو ژیانیان بە شێوەیەك بردە سەر کە جارێکی تر، ڕوویان نەیەت لە بەردەم میللەتەکەی خۆیاندا سەربەرز بکەنەوە.

ئەو نەتەوانەشی کە لە کەناری دەریای فولگادا بوونو لەگەڵماندا دەجەنگین، هەر هەموویانم بە تەواوی لەناوبردو تەفروتونام کردن.

منیش زیانێکی ئێجگار گەورەو گرانم لێکەوت. شێخ عومەر کە سەرکردایەتی ئەو هێزە سەربەخۆیانەی دەکرد کە لە جەنگدا هاوکارییان دەکردم. یەکێك لە تیرهاوێژەکانی دوژمن تیرێکی ژەهراوی دا لە شێخ عومەرو کوشتی.

هەر کە مردنی شێخ عومەرم بیست. زۆر زۆر خەمبارو دڵگران بوومو خەمو دڵتەنگی دایگرتمو بێ ئارام بووم. کاتێك تەرمەکەیم ناردەوە بۆ شەهری سیبز بۆئەوەی لەگەڵ جیهانگیری برایدا لەناو گومەزەکەیدا بینێژن. زۆر بە کوڵ دەستم کرد بە گریانو شیوەنێکی گەرمو گوڕم بۆ کرد.

لەشکرەکەشم بەردەوام بەناو خاکی جۆرجیاو قەفقاسدا دەڕۆیشت و هەرچی شارو گوندی هەبوو، هەر هەموویانمان وێران کردو هەرچی بەرهەمێکی زستانەیان هەبوو، هەموویمان سووتاندو ڕێگاو بانەکانمان تێك و پێك داو وێرانمان کرد.

بە هەر شوێنێکدا ڕەت دەبووین کاول و وێرانمان دەکرد. هەتا ئەو وڵاتە داری بەسەر بەردییەوە نەماو لەگەڵ زەویدا تەخت بوو. وەك بیابانی لێهات.

دوای ئەوە بڕوای تەواوم هێنا کە جارێکی تر میللەتەکەی تا من بەڵکو تا نەوەکانیشم لە ژیاندا بێت هەرگیز سەربەرز ناکاتەوە.

دوای ئەوە بەرەو شاری ئەستراخان کشام کە ڕووباری فولگای پیادا ڕەت دەبێت لەوێ مامەوەو چاوەڕوانم کرد تاکو کوڕەکەم و کوڕەزاکەم لە ڕاونانی تەقتەمیش و پاشماوەی نەتەوەکانی فولگا دەگەڕێنەوە. ئەو ڕووبارە تا ئەم کاتە بەستبووی. کاتێك شاری ئەستراخانم داگیر کرد.

فەرمانڕەواکەشیم تیادا دەستگیر کرد. بینیم لە ترساندا زیرەی کردبوو، دەلەرزی وەك ئاوی ڕووبارەکە لە شوێنەکەی خۆیدا ڕەق ببوو، ناحەقی نەبوو، لاشم سەیر نەبوو. چونکە هەر ئەم فەرمانڕەوای ئەم شارە بوو، هەڵمەتی بردبووە سەر شاری بوخاری و داگیری کردبوو.

لە ناو شارەکەدا تاڵان و ڕاوو ڕووت و ئەتکی تێدا کردبوو. هەر ئەمیش بوو کۆشکەکەی منی لەم شارەدا سووتاندو وێرانی کردبوو.

بە منیشی وتبوو، سەگە شەلی سەمەرقەند..

نەمدەزانی بە چ شێوەیەك تۆڵە لەم فەرمانڕەوایە بکەمەوە..!! و پاداشی کردەوە خراپەکانی بدەمەوە. یەکەم جار بڕیارم دا بیسووتێنم، هەروەك چۆن ئەو لە بوخارادا کۆشکەکەی منی سووتاندبوو.

بەڵام کات و کەژو بایەکە زۆر سارد بوو، سووتەمەنیش لەو کاتەدا شتێکی بەنرخ و گران بوو. دوایی بیرم لە ڕێگایەکی باش و پڕسوود کردەوە. هەندێ پیاوی خۆمم نارد بۆ سەر ڕووباری فولگاو پێم ڕاگەیاندن سەهۆڵی سەر ڕووبارەکە بشکێنن و کونی تێبکەن. ئینجا منیش ئەو فەرمانڕەوایەم لەگەڵ خۆمدا بردو سەریم خستە ناو کونەکەوەو پێ لەقەیەکم لێداو لە کونەکەوە خستمە ناو بنی ئاوەکەوەو لەژێر سەهۆڵەکەوە، ئاوەکە بردی بۆ ڕووباری قەزوین. تاکو لەوێدا ماسی و حوت و ئاژەڵی ناو ڕووبارەکە بیخوات.

دوای ئەوە زۆری نەخایاند ئەمیر موحەممەدو شاهڕووخ گەڕانەوەو پێیان ڕاگەیاندم کە بە هەموو خاکی ڕووسیادا بە دوای تەقتەمیشدا گەڕاون و تەقتەمیشیان نەدۆزیوەتەوە.

منیش پێم وتن، لێی گەڕێن با لە کونەکەی خۆیدا بێت. چونکە جارێکی تر ناوێرێت لەو کونەدا بێتە دەرەوە..!! ئیتر منیش فەرمانم دا چادرەکان لێك هەڵوەشێنن‌و گەڕامەوە بۆ شاری سەمەرقەند.

* * *

## هەڵمەتێك بۆ سەر هیند

کاتێك بۆ سەمەرقەند گەڕامەوە، ماوەیەکی دوورو درێژم بە حەسانەوەو ئارام گرتنەوە بردە سەر. هیچ گوێم بە کاروباری ئیمپراتۆرییەت نەداو خۆم تێنەدەگەیاند. چونکە بە هۆی ئەو هەڵمەتە بەرفراوانەی لە وڵاتی قەفقاس‌و جۆرجیا بردمە سەر، زۆر هیلاك‌و ماندوو شەکەت بووم‌و هێزو توانام لێبڕابوو.

هەروەها لە کاتی ئەو شەڕە خوێناوییەدا کە هێزەکانی تەقتەمیشمان شکاندو بە تەواوی لەناومان برد. تەندروستیم زۆر زۆر تێکچووبوو. بەڵام ئەمە ماوەیەکی زۆری نەخایاند، بە تەواوی تەندروستیم چاك بۆوەو هێزو توانام وەك خۆی لێهاتەوەو دەستم کردەوە بە جێبەجێکردنی کاروباری ئیمپراتۆرییەتەکەم.

کاتەکانی خۆمم بە چاککردن‌و ڕێکخستنی شاری سەمەرقەندەوە دەبردە سەر.

هەروەها مەزارێکم لە بەردی مەرمەڕی سپی لەسەر گۆڕی ئەمیرە شۆلیان مەلەك دروستکرد. بۆ زیاتر ڕێزلێنانی ئەمیرە مزگەوتێکی گەورەشم لە تەنیشت مەزارەکەیەوە دروستکرد بە ناوی ئەمیرە شۆلیان مەلەکەوە.

هەروەها گومەزو مەزارەکەی جیهانگیریشم فراوان کرد. چونکە تەرم‌و گۆڕی شێخ عومەری براشی تێدابوو.

هەروەها لەسەر گۆڕەکانی جاکۆو ئیلشی‌و شێخ عەلی‌و سەیفەددین‌و کۆمەڵێك شازادەو سەرکردەو جەنگاوەران‌و ئەوانەی لە پێناوی مندا گیانیان بەخت کردبوو، وە بە پاکی‌و دڵسۆزییەوە خزمەتیان کردبووم، گومەزو مەزاری شیاوو جوانم بۆ دروستکردن.

بەڵام لەناو ئەمانەدا تەنها مەزاری ئەلجای لە هەموویان زیاتر هەستی سۆزو خۆشەویستی‌و خەمباری جووڵاندم. ئەمەش شتێکی سەیرو سەرسوڕمێن نەبوو. چونکە ئەلجای بەڕاستی تاکە ژنێکم بوو لە هەموو کاتێکدا دڵمەوە خۆشم دەویست‌و ڕێزم دەگرت. وە هەر یادو بیرەوەری ئەویشە هەتا هەتایە لە مێشك‌و دەروونمدا دەمێنێتەوەو لە پێش چاومدا ون نابێت. لەبەرئەوەی من بڕیارم دابوو، گەورەیی‌و سەرکەشی‌و لووتبەرزی سوڵتانی تورکی بایەزید بشکێنم. دەستمکرد

بە بیرکردنەوە بۆ دۆزینەوەی ڕێگایەك کە مسۆگەرم کات بەسەر ئەو هێزە زۆرو زەبەندو نەبڕاوەیەو سەربازە ئینکیشارییە نەبەزەکانیدا زاڵم بکات.

هیچ ئەوەندەی نەخایاند بیرێکی باش‌و شیاوم بە بیردا هات.

ئەویش ئەوە بوو، بڕیارم دا لەم هەڵمەتەمدا بۆ سەر وڵاتی تورکان فیل بەکاربهێنم. بەڵام ئەوەی ڕێگای لە من دەگرت کە نەتوانم فیل بەکاربهێنم ئەوە بوو، لە وڵاتی ئێمەدا فیل نەبوو. بۆ وەدەستهێنانی فیلیش ڕێ بەستێکی خەتەرو ناهەموار لە پێشمدا بوو. چونکە فیل تەنها لە وڵاتی هیندا هەبوو.

جا بۆ دەستکەوتنی فیلیش پێویست بوون بچم بۆ وڵاتی هیندو لەوێدا فیل پەیدا بکەم‌و دەستمکەوێت.

وڵاتی هیندیش لەو کاتەدا هێزو توانایەکی ئەوتۆی نەبوو. چونکە پاش ئەوەی شاهێنشا بەهێزەکەیانم -فەیرۆزشا- مرد. جێگرو شازادەکانی لەناو خۆیاندا لەسەر جێگاو شانشینەکەی، لەناو خۆیاندا تێکچووبوون‌و زۆر ناکۆك بوون. جا لەبەرئەوە لێم ڕوون بوو، من دەتوانم ئەو ئەمیرانە بەئاسانی بشکێنم‌و وڵاتی هیند داگیر بکەم‌و لەوێدا فیلم دەستکەوێت.

پێش ئەوەی هەڵمەتەکەم بۆ سەر هیند دەستپێبکەم. حەزمکرد کارێك بکەم لە وڵاتەکەمدا شوێنەوارو کاریگەرییەکی باشی هەبێت.

لەبەرئەوەی دڵشاد لە کاتی هەڵمەتەکەی سەر باکووردا بۆ سەر تەختەمیش هێمن‌و ئاسایشی لە شاری سەمەرقەندا پاراستبوو. وە لە ڕابوردووشدا بە پاکی‌و دڵسۆزییەوە خزمەتی کردبووم.

بڕیارم دا پاداشی ئەو کارو کردەوەو چاکانەی بدەمەوە.

لە کاتێکدا بە تەنها لەگەڵیدا دانیشتم. پێم وت:

-دڵشاد.. من بڕیارم داوە شاهرووخی کوڕت بکەم بە سوڵتانی خۆراسان‌و هەموو وڵاتی فارسەکان.

سەرەتا دڵشاد بڕوای بە قسەکانم نەکرد. بەڵام من پێم وت:

-شاهرووخ لەم شەڕانەدا نازایەتییەکی بێ وێنەی نواندووەو ئەو نەبەردی‌و نەترسی‌و دەستکەوتانەی وای لێدەکات نەك تەنها ببێت بە سوڵتانی خۆراسان‌و وڵاتی فارس، بەڵکو شایانی ئەوەیە ببێت بە سوڵتان‌و فەرمانڕەوای هەموو وڵاتەکەی منیش.

ئیتر دڵشاد هەر کە لەڕاستی قسەکانم بێگومان بوو. لە خۆشیاندا دەستی بە گریان کرد.

دوای چەند ڕۆژێك سەمەرقەندم جێهێشت و ڕوومکردە شاری هیرات و لەگەڵ خۆشمدا دڵشادو شاهرووخ و ژمارەیەکی زۆر لە سەردارو شازادەکانم برد.

لە شاری هیراتدا تاجم کردە سەر شاهرووخ و کردم بە سوڵتانی خۆراسان و هەموو وڵاتی فارسەکان. بۆ ماوەی مانگێکی تەواو ئاهەنگ و شایی و دەعواتم سازکرد. شارەکەم بە شتی جوانی ڕەنگاوڕەنگ ڕازاندەوە. شارەکە هێند جوان و قەشەنگ بوو، دەتوت بووکە.

منیش لەم چوونەمدا بۆ هیرات سوودێکی زۆرم بینی و بە تەواوی ماندوویم حەسایەوەو هێزو توانای لاوێتیم پێداهاتەوە.

کاتێك گەڕامەوە بۆ سەمەرقەند بینیم هەموو کاروبارێك و پێداویستییەکانی جەنگ بۆ هەڵمەت بردنە سەر هیند ئامادە کراوە.

پێش ئەوەی لەشکرەکەم بەرەو ئەو وڵاتە بخەمەڕێ. تیپێکی نوێم لە کۆیلەو ڕەش پێستەکان پێکهێناو ناوی ئەو تیپەم نا تیپی ڕەشەکان و سەرکردایەتی ئەو تیپەم دایە دەست ئەمیریسی کوڕم کە لە نۆبجای ژنم بمبوو.

من دەمزانی پێکهێنانی ئەم تیپە دەنگ و سەداو کاریگەرییەکی زۆرباشی دەبێت لەناو ئەو وڵاتانەی کە لە ئەسفەهانەوە درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە قاهیرە. چونکە لەو ناوچەو هەرێمانەدا ژمارەیەکی ئێجگار زۆری کۆیلەو ڕەش پێستی تێدا دەژی و لەو هەرێمانەشدا ئەو کۆیلەو ڕەش پێستانە بە دەستی ئاغاو گەورەکانیانەوە ناخۆشترین ئەشکەنجەو دەردیسەری دەچێژن. کاتێك ئەو تیپە دەبینن، ئەو کاتە من بە ڕزگارکەری کۆیلەو ڕەش پێستەکان دەزانن و ئیتر بە ڕێگای ئەهێنی یارمەتیم دەدەن بۆ شکاندن و لەناوبردنی سوڵتانی تورکی.

بەو شێوەیە لە کاتی ڕۆیشتن و هەڵمەتەکەمدا بۆ سەر هیند دوای خۆم پاراستنی شاری سەمەرقەندم بەو تیپە ڕەشەو ئەمیریسی سەرکردەیان سپارد.

* * *

کاتێك گەیشتمە سنووری وڵاتی هیند هەستم بە ترس و لەرزێکی زۆر کرد. گەرچی من پێشەوایەتی لەشکرێکی لە بنەمەهاتووی زۆرو کارامەو شارەزا لە کاروباری جەنگ و کوشتاردا دەکرد.. بەڵام...

هۆی ترس و لەرزەکەشم ئەوە بوو هیند وڵاتێکی گەورەو بەرفراوان بوو. ژمارەیەکی ئێجگار زۆریش خەڵکی تێدا دەژیا. بەڵام ئەو جاسووسانەی کە لە پێش خۆمدا ناردبوومن بۆ ئەوێ.

دڵنیایان کردمو پێیان ڕاگەیاندم فەرمانڕەوایەکی وا بەهێزو توانا لە هیندا نییە کە بتوانێت ڕووبەڕووم ڕاوەستێتەوەو بەرهەڵستیم بکات.

بەڵام من زۆر دڵنیا نەبووم لە قسەی جاسووسەکانمو دەمویست سەرکەوتن مسۆگەر بکەمو لەوێشدا فیلم دەستکەوێت. لەبەرئەوە بڕیارم دا پەنا ببەمە بەر فێڵو تەڵەکەبازیو بەرتیل دان.

عەبدوڵڵای نۆکەریشم لەم هەڵمەتەمدا لەگەڵدا بوو. داوام لە عەبدوڵڵا کرد، هەرچی خزمەتکارو کارکەرێك لە ژوورەکەمدا هەیە، مەرەخەسیان بکاتو خۆی بە تەنها بمێنێتەوە!!

کاتێك ئەوەم پێڕاگەیاندو کارکەرەکانی مەرەخەس کرد. زۆر ترساو سەری سووڕما. چونکە وای دەزانی من ئازاری دەدەم یان خراپەیەکی لەگەڵدا دەکەم. بەڵام کاتێك مەبەستو پلانەکەی خۆم تێگەیاند، سەری ڕەزامەندی بۆ لەقاندو پێی وتم:

-سەرداری گەورەو بەڕێزم تۆ خۆت باش دەزانیت من هەردەم بە پاکیو دڵسۆزیو وەفاوە خزمەتم کردوویتو ئەم جارەش هەروەکو جارەکانی ترم چۆنم تێگەیشتوویت هەروا دەبمو نۆکەرێکی گوێڕایەڵو ئەڵقەلەگوێو بەوەفاو دڵسۆزت دەبم.

لەو کاتانەشدا ئەو فیلانەی بۆ شەڕو کوشتار پەروەردە کرابوون. لەژێر دەستی ئەمیر مەحمود تۆغلوکدا بوو. کە ئەویش دەستەڵاتی تەواوی بەسەر زۆربەی زۆری وڵاتی هیندا هەبوو.

عەبدوڵڵام بۆ پایتەختی ئەو سەردارە ناردو ئەویش بە نهێنی پەیوەندییە مەیتەرەوانەکانی فیلەکانەوە کردو لەگەڵیاندا کۆبۆوەو بەڵێنو پەیمانی دانێ ئەگەر لە شەڕو کوشتاردا پاشەکشە بکەنو لە هێنانی فیلەکاندا بۆ کۆڕی جەنگ خۆیان دوابخەنو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەمیر مەحمود نەکەن، ئەوا خەڵاتو پاداشتێکی زۆرو بێپایانیان دەدەمێ.

زۆر سەرم سووڕماو لام سەیر بوو کاتێك تێگەیشتم ئەو مەیتەری فیلانە بە بەڵێنەکانی عەبدوڵڵا قایل بوون. بەڵام بە مەرجێك خەڵاتو پاداشەکانیان ژنو کچەکانی شازادەکانی هیند بێت..!!

کاتێك عەبدوڵڵا گەڕایەوە بۆ لامو بۆ ئەم کارە ڕاوێژی پێکردم. پێم ڕاگەیاند من بە هەموو مەرجەکانیان ڕازیمو داوام لێکرد، بەڵێنی ئاڵتوونی زۆریشیان پێبدات. ئیتر بەم جۆرە، کاتێك شەڕ لە نێوان ئێمەو ئەمیر مەحمود تۆغلوکدا هەڵگیرسا ئێمە بەسەریدا سەرکەوتینو ئەمیر مەحمود تۆغلۆك خۆی کوژراو لەشکرەکەشی بە تەواوی شکێنراو سەربازەکانیش زۆربەی زۆریان کوژرانو لەناوچوون. مەیتەرەکانیش فیلەکانیان بۆ هێنام.

دوای ئەوە دەستم کرد بە تالآنی شارەکانی هیندو دەستم گرت بەسەر سامانو زێرو نەختینەو گەنجینەکانیانداو دوای ئەوە وێرانم کردنو ئاگرم تێبەردانو کچەکەی ئەمیر مەحمود تۆغلوکم بە دیل گرت.

لەڕاستیدا کچەکەی ئەمیر مەحمود لە هەرەتی جوانیو لاویو شۆخو شەنگیدا بوو. قەدو بالآیەکی جوانو ڕێكو ڕەوانو باریکی پێوە بوو. هەتا بلێی جوانو ناسكو نازدارو سەرنجڕاکێش بوو. لەگەڵ ئەوەی ئەسمەر بوو، بەڵام پێستی لەشی نەرمو نیانو ناسك بوو.

لە کاتێکدا هێنایانە بەردەمم لە ترساندا خەریك بوو زیڕە بکاتو هەموو گیانی بە توندی دەلەرزی، پێم وت: شازادە شالێرا مەترسە.. شازادە بچکۆلەکە مەترسە.. گەرچی من پیاوێکی پیرو بەساڵاچووم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من دەستو دڵێکی پاكو باشو بەرەحمم هەیە. بڕوات بێت من بە هیچ جۆرێك ئازارو زیانت پێناگەیەنم.

وتی: سەرداری گەورەم.. کەواتە چیم لێدەکەیت..؟!!

وەڵامم دایەوە: من کوڕێکی ڕەشو لاوچاکم هەیە. دەمەوێت لەگەڵ خۆمدا بتبەمەوە بۆئەوەی وەك دیارییەك، بەڵکو وەك بووکێك تۆی پێشکەش بکەم.

ها.. شالێرا بەوە ڕازی دەبیتو بڕیاری لەسەر دەدەیت..؟!

سەری داخستو بێدەنگ بوو. بەڵام ئەوەندەی نەخایاند زۆر بە نازاییو نەترسییەوە لێی پرسیمو وتی:

-گەورەم.. ناوی چییە..؟ ئایا ئەویش وەك تۆ ئازاو نەبەردە..؟!!

وتم: ئەمیریس.. ئەو ئازاترینو نەبەردترین شازادەیەکی ڕەشە لەم وڵاتەدا.

وتی: ئەمیریس.. زۆر چاکە.. لە کانگای دڵمەوە پێی ڕازیمو بە دڵ پێشوازی دەکەم. ئیتر بەم جۆرە پاش ئەوەی فیلەکانم دەستکەوت. چونکە من لەبەر ئەوانە هاتبووم بۆ وڵاتی هیند.. داوام لە لەشکرەکەم کرد خۆیان بۆ گەڕانەوەی نیشتمانەکەمان ئامادە بکەن. چەند ڕۆژێکی زۆری نەخایاند لێشاوی لەشکرەکەم بەرەو نیشتمان کەوتەڕێ، بەڵام من لە کاتی گەڕانەوەمدا تووشی گرانەتاو ئازارێکی زۆر بووم.

لەرزو تایەکی وا توندو گرانم تووش بوو. خۆ ئەگەر، ئەو چاودێریو سەرپەرشتییە زۆرو باشەی شالێرای کچی ئەمیر مەحمودو بووکی ئەمیریسی کوڕم نەبوایە.. لەوانە بوو بمردمایە..!!

هەر کە ئەو لێشاوی کاروانە گەورەیەی من لە سەمەرقەند نزیك بۆوە، هەر هەموو خەڵکانی ناو شار، ڕژانە ناو شەقامو کۆڵانەکانی شارەوە، پێشوازییەکی گەرمو گوڕی گەورەی وایان لێکردم،

وێنەی نەبوو. شاریان بە گوڵو شتی جوانو ڕەنگاوڕەنگ ڕازاندبۆوە. زۆر بە خۆشییەوە پێشوازی ئەو سەرکەوتنە جوانو مەزنەیان کردمو بە پەرۆش بوون بۆئەوەی ئەو فیلە گەورانە ببینن و ئەو ماڵو سامانە زۆرو زەوەندەو ئەو تەختینو گەنجینە بەنرخانە ببینن کە لە وڵاتی هیندا دەستکەوتووەو لەگەڵ خۆمدا هێناومەتەوە..!!

## داگیرکردنی دیمەشقو سووتاندنی

خۆم هەڵناکێشمو درۆش ناکەم، ئەگەر بڵێم لە هەموو مێژووی ژیانی سەمەرقەندا وەك هاوینی ئەو ساڵە جووڵەی خانوو دروستکردنو ئاوەدانی بە خۆیەوە بینیبێت. چونکە دوای ئەوەی بەنناکانو کرێکارەکانو شارەزایانو ئەندازیارەکان لە دروستکردنی خانووبەرەدا فێربوون فیل بەکاربهێنن. دەیانتوانی لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا خانووی گەورە گەورە دروستبکەن. کە ئەو خانوانە لەمەوپێش بۆ دروستکردنو تەواوکردنی چەند ساڵێکی زۆری دەویست.

هەروەها ئەو بیناو پرۆژانەی لەمەوپێش پلانم بۆ دانابوون زۆر بە زووییو لە پێش کاتی دەستنیشانکراوی خۆیدا تەواو بوون.

لە هەموو لایەکی شاردا بازاڕو دووکانی نوێ دروستکران. شەقامی گەورە گەورە لەناو شاردا دروستکرانو ئەملاو ئەولای ئەو شەقامانە بە درەختی هەمەجۆرە ڕازێنرانەوە.

بەڵام مزگەوتی ئەمیرە شۆلیانو ئەو مزگەوتەی بە ناوی خۆمەوە ناوم نابوو مزگەوتی تەیموور لەو هاوینەدا تەواو نەبوون. چونکە من دەمویست ئەو دوو مزگەوتە بە شێوەیەك بێت لە هونەری بیناسازیو جوانکاریو گەورەییو وردەکاریدا بێ وێنەو بێ هاوتا بن. لەبەرئەوە دروستکردنو تەواوکردنیو ماوەیەکی زۆرتری ویست.

ئا بەم شێوەیە ئاواتی سەمەرقەند هاتەدیو لە هەموو جیهانی ڕۆژهەڵاتدا بوو بە گەوهەرێکی جوانو ڕازاوەو پرشنگدار.

لە کاتێکدا سەرکردەکانی لەشکرەکەمو شازادەو ئاودارەکان سەرقاڵی ئاهەنگ گێڕان بوونو میوانداری گەورەو ئاوازەو فێستیڤاڵی جوانو قەشەنگیان دەگێڕاو ساز دەکرد بە بۆنەی ژنهێنانی شازادە ئەمیریسو شووکردنو گواستنەوەی شازادە شالیراوە بۆی. من لەو کاتانەدا زۆربەی کاتی خۆم لە خەڵوەتنشینی زاناو شارەزاکانی زانستدا لەگەڵ ئەو زانایانەدا بەسەر دەبرد.

وە لە جیاتی ئەوەی هاوبەشی ئەو فێستیڤاڵ‌و ئاهەنگ‌و میوانداریانەدا بکەم. من هانی زاناو شارەزاکانی خۆم دەدا کە ڕێگای تازەو هۆی باشتر بدۆزنەوە بۆئەوەی لە کاتی شەڕو کوشتاردا چاکترو باشتر سوودو کەڵك لەو هێزە لەبن نەهاتووەی ئەو فیلانە وەربگرین.

هەروەها داوام لێدەکردن‌و هانم دەدان، نەهێنی دروستکردنی بارود بدۆزنەوەو بزانن چۆن دروست دەکرێت.

من زۆر حەزم دەکردو ئارەزووم لەسەر ئەوە بوو، کە چەکێکی هێرشبردنی ترسناك بۆ شەڕ دروست بکەم. کە تاکو ئێستا جیهان شتی وای بە خۆیەوە نەدیبێت. هەر کە وەرزی هاوین کۆتایی هات داوام لە سەرکردە جەنگیکانم‌و لە پلاندانەری سەربازییەکانم کرد، زۆر بە وردی‌و سەرنجەوە تەماشای قەڵاو سەنگەرەکانی دیفون بکەن‌و لێی بکۆڵنەوە. چونکە من وام نیازە وڵاتی ئەفرەنجە -ئینگلتەرە- و دوورگەکانی ئینگلتەرە داگیر بکەم.

زۆربەی زۆری وەچەکانیشم گەورە ببوون‌و لەناو لەشکرەکەمدا ببوون بە ئەفسەرو سەرکردەو چاك شارەزای قەڵاو سەنگەرەکانی دیفون ببوون. چونکە زۆر جار هاتبوون لە شەقام‌و کۆڵانەکانیدا یاری شەڕو کوشتاریان تێدا کردبوو. شارەزاکانیشم لە بیناسازی‌و قەڵا دروستکردندا هاتن لە دەرەوەی شوورای شارەکەدا قەڵایەکیان بە وێنەی دیفون دروستکردو زۆربەی کاتی خۆیان بە تاقیکردنەوەی ئەو چەك‌و ئامێری گەمارۆدانانەی هەمان بوو لە دژی ئەو قەڵاو سەنگەرانەی ئەفرەنجییەکاندا دەیانبردە سەرو تەماشای کاریگەری ئەو ئامێرانانەیان دەکرد.

لەو کاتانەشدا بەردەوام سەردانی ئالی سۆنم دەکردو دەچووم بۆ لای. چونکە کاتی ئەوە هاتبوو بەڵێنەکەی خۆم ببەمە سەرو، بیبەمەوە بۆ ئینگلتەرەی نیشتمانی‌و لە وڵاتەکەی خۆیدا بیکەم بە شاو لەسەر تەختی شانشینی شاهانە دایبنێم. کاتێك باسی ئەوەم لا کرد پێی وتم:

-تەیموور من بیر لەوە ناکەمەوە ببم بە شاژنی وڵاتەکەم. بەڵکو من تەنها ئارەزووی ئەوە دەکەم، جارێکی تر دیفونی ڕاستەقینە بەچاو ببینمەوەو لە هۆڵە گەورە سەرەکییەکەیدا لەگەڵ دۆست‌و برادەرە دێرینەکانمدا لەبەردەم کوورەی ئاگرەکەدا جارێکی تر دابنیشمەوە..!!

وتم: زۆرچاکە، خۆ ئەگەر بە ئاویش بێت هەر دەتکەم بە شاژن‌و لەسەر تەختی شانشینی دات دەنێم‌و لە گوندەکەی خۆتدا بە شادی‌و خۆشی بژیت.

وتی: تەیموور من ئێستا نازانم دیفونی ڕاستی چۆنە..!!

ڕەنگە ئێستا زۆر گۆڕابێت. هەر دەبێت گۆڕابێت. بەڵام کاتێك دیفونی ڕاستەقینە دەبینمو تیایدا ژیان دەبەمە سەر. ئیتر ئەو کاتە بیرو خەیاڵو دڵم بۆ ئەو دیفونە لێدەدات کە تۆ بە تایبەت بۆ منت دروستکردبوو.

دوای ئەوەی ئالی سۆن سەری داخستو کەوتە بیرکردنەوە بەڵام زۆری نەخایاندو سەری بەرز کردەوەو هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو دەستی بە قسە کردەوەو وتی:

-ڕەنگە لەو ماوەی ڕابوردووەدا شەڕو کوشتاری زۆر ڕوویدابێتو دەردو بەڵاو نەخۆشی زۆریش بڵاوبووبێتەوەو گۆڕانکاری زۆری بەسەردا هاتبێت. وەك تۆ چۆن بەرگریو پارێزگاری تەواوت لەم دیفونە کردووەو لە وێرانکردن پاراستووتە. ڕەنگە کەس وا نەبووبێت پارێزگاریو بەرگری لە دیفونی ڕاستەقینە کردبێت. وە لەبەرئەوەی دیفونی ڕاستەقینەش گوندێکی بچووك بوو. ڕەنگە هەر پشتگوێش خرابێتو کەسیش بەرگری لێنەکردبێتو بە تەواوی وێران بووبێتو لەسەر زەویدا هەر نەشمابێت.!!

-ئەگەر وێرانیش بووبێت من هەمدیسان سەرلەنوێ وەك ئەم دیفونەی ئێستا بۆت دروست دەکەمەوەو بڕوات بێت هەر دەبێت بچیتەوە ئەو دیفونەی خۆت دەتەوێتو ئارەزووت لێیە.

-بەڵێ تەیموور من بە تەواوی بڕوام بەوە هەیە، کە تۆ دیفون دروست دەکەیتەوە وەك چۆن بەڵێنو پەیمانی خۆت بردە سەرو ئەم دیفونەی ئێستات بۆ دروستکردم. ئەم دیفونەش بە تەواوی کتومت لە دیفونی ئینگلتەرە دەچێت.

ئینجا ئالی سۆن دەستی بۆ درێژکردمو دەستی گرتمو زەردەخەنەیەکی جوانو ناسکی بۆ کردم کە لەو زەردەخەنەیەدا هەموو مانای خۆشەویستیو دڵنەرمیو بەوەفایی دەگەیاند. منیش دەستیم گوشی بۆئەوەی بەڕاستی خۆشەویستیو سۆزی خۆمی بۆ دەربڕم.

بەڵام ئەوەندەی نەخایاند، هەمدیسان کەوتەوە قسەو پێی وتم:

-تەیموور ئینگلتەرە وێران مەکە..!! ئەگەر دەتەوێت ئەو دوورگەیە بگریتو وێرانی بکەیتو بیسووتێنیتو تاڵانی بکەیت. من هەرگیزو بە هیچ جۆرێك حەزناکەمو ئارەزووی ئەوە ناکەم لەگەڵتدا بێم.

-خۆشەویستەکەم من هیچ کات ئارەزوو و ئاواتی ئەوەم نییە. من بڕیارم داوە چۆن بیتر بنێرم بۆ شانشینی مەلیك شارل شای ئینگلتەرە، چونکە بایەزیدی سوڵتانی تورك لە ئەستەمولدا دوژمنی شارل شایەو هەروەها دوژمنی مانویلی ئیمپراتۆری ڕۆمیشە وە دوژمنی هەر هەموو

مەسیحییەکانیشە. ڕەنگە بەم بۆنەیەوە پەیمانێکی دۆستانە لەگەڵ شارلدا ببەستین‌و بە ئاشتی‌و برایەتی بچینە ناو وڵاتەکەی تۆوە.

-بەڕاستی، دەتەوێت فەشە جۆن بکەیت بە باڵیۆزو نوێنەری خۆت‌و بۆ شانشینی مەلیک شارلی بنێریت..؟

-بەڵێ.. تۆش ئەگەر حەزبکەیت دەتوانیت لەگەڵیدا بڕۆیت. منیش لە پاشاندا سەردانی دۆستایەتیتان دەکەم.

منیش لەوە دڵنیابووم ئەم کردەوە چاکەی من کاردەکاتە سەری‌و ڕێزێکی تایبەتیم لە ئاستیدا بۆ پەیدا دەکات. و پاشان لای ئەفرەنجییەکان بە دڵ‌و بە گیان نوێنەرایەتیمان دەکات‌و لە جۆن بیتری گوری زیاتر دڵسۆزترم دەبێت. هەروەها ئەو سەروەت‌و سامانە زۆرەی لەگەڵ خۆیدا دەیبات لە وڵاتی ئینگلتەرەدا زیاتر ناوو ناوبانگی بۆ پەیدا دەکات. منیش دوای ئەوە دەتوانم بچم بۆ لای‌و پەیوەندی پێوە بکەم. جا بە ڕێگای شەڕو کوشتار بێت یان بە ڕێگای ئاشتی‌و دۆستایەتییەوە بێت.

زاناکانی منیش نەیانتوانی لە بواری دۆزینەوەی بارووددا هیچ پێشکەوتنێك بەدەستبهێنن.

ئا بەم جۆرە هەر کە وەرزی پاییز هات. دوو سندووقی گەورەی ئاسنم دروستکردو لەگەڵ خۆمدا بردم بۆ تاقیگەی نهێنی زاناکان. لەبەرئەوەی ئامێری تاقیگاکە لە دۆزینەوەی بارووددا هیچ سوودو کەڵکێکی نەبوو. هێنام هەڵموەشاندو هەر هەموویم کردە ناو دوو سندووقە ئاسنەکەوە بۆنەوەی قورس‌و گران بن.

کاتێك سندووقەکانم پڕکرد لە ئامێرو ئامڕازە قورسەکان. هاتم هەر هەموو زاناو داهێنەرەکانم بۆ ژووری خەڵوەتی بەرزاییەکە بانگ کرد.

کاتێك هەموویان هاتن‌و لەبەردەستمدا دانیشتن. ڕووم تێکردن‌و پێم وتن:

-ئێوە نەتانتوانی لە کارە پیرۆزەکەتاندا سەرکەون‌و هیچ ئەنجامێکتان نەبوو. وە ئەوەتان سەلماند، ئێوە زانست‌و زانیاری‌و شارەزاییتان زۆر لە ئەفرەنجی‌و چینییەکان کەمترەو نەشارەزان.

منیش لەبەرئەوە زانای تەمەڵ‌و تەوەزەل‌و بێتوانا ڕاناگرم‌و ناشم دەوێن.

هەر دوای ئەوە پاسەوانەکانم هاتنە ژوورەکەو زاناکانیان گرت‌و پێش ئەوەی بێنە قسەو باسی هۆی سەرنەکەوتن‌و دروستکردنی بارووود بکەن. زمانی هەموویانیان بڕی. ئینجا فەرمان دا بە سەربازەکانم. دوو سندووقە ئاسنەکە هەڵبگرن‌و زاناکانیش بێنن بۆ گۆڕەپانە گشتییەکە.

کاتێك سەردارو شازادەکانو پیاوانی ئاینیو زانایانی شەریعەتو ئیمامو گەورەپیاوانی ئایینی ئیسلامو خەڵقێکی زۆر لە گۆڕەپانی گشتیدا کۆبوونەوە.

بە ڕوویەکی گرژو مۆنو تووڕەو بە زمانێکی ڕەقەوە ڕووم تێکردنو پێم وتن:

-ئا ئەم زانا ناپاكو خائینانەو دوژمنانی مرۆڤو مرۆڤایەتییانە. بە دزییەوەو بێ ئەوەی من ئاگام لێبێت. هاتوون ئەو ماددە شەیتانیو حەرامو قەدەغەکراوە ترسناکە، واتە بارووتیان دروست کردووە. ئا ئەمانە توانیویانە ئەو مادە دۆزەخییە دروست بکەن.

هەروەها ئامێرێکی قورسو گرانیشیان دروست کردووە، پڕی دەکەن لەو بارووتەو دەیهاوێژنە بەردەم ئەو شوێنەوە کە دەیانەوێت وێرانی بکەن. لەوێدا دەتەقێتو ئەو شوێنە بە تەواوی وێران دەبێتو هەرچی تێدایە دەیکوژێت!! ئا ئەم دوو سندووقە، دەبینن پڕە لەو بارووتەی کە دروستیان کردووە. ئێوەش خۆتان بیروڕای منو سەرنجی من دەربارەی ئەو بارووتە دەزانن چییە.. بارووتیش مادەیەکی حەرامەو خوا پێی خۆش نییە کەس بەکاری بهێنێت. ئەم پیاوانەش لە دژ ویستو ئارەزووی خوادا وەستاونەتەوەو لە فەرمانی خوا دەرچوون!!

جا لەبەرئەوە پێویستە هەر هەموویان بکوژرێنو سەریان ببەڕێنن.

پاشان تۆزێك لەسەر قسەکانم ڕاوەستام. وەك مرۆڤێکی بە دینی لەخواترس خۆم نیشان دا.. هەمدیسان کەوتمەوە قسەو وتم:

-زۆر خەمو پەژارەم خوارد بە هۆی ئەم ئامێرە دۆزەخییەی ئەم زانایانە دروستیان کردووە. منیش داواکارم لە خوای گەورە، پەنام بداتو مەجبوور نەبم بەکاری بهێنم. مەگەر دوژمنەکانم مەجبورم کەنو لە پێناوی خوادا بەکاری بهێنمو دەمکوتی تۆپە لاوازەکانی دوژمنی پێبکەمو وردوخاشو تەفروتونایان بکەم.

بەڵام پێویستە لەسەر من ئەم دوو سندووقە لای خۆم هەڵبگرمو نەهێڵم کەس بەکاری بهێنێت.!!

جا منیش داواکارم لە ئێوە لەگەڵ مندا لە خوا بپاڕێنەوە کە ئەم ئامێرە بەکارنەهێنین. ئیمام هەستاو دەستی کرد بە نوێژکردنو پاڕانەوە لە خودا.

پیاوە ئاینییەکانی ترو شازادەکانیش بە پەرۆشو سەرسووڕمانەوە تەماشای جەللادەکانیان دەکرد. کە سەری زاناو داهێنەرەکانیان یەك لە دوای یەك دەپەڕاندو لە لاشەیان جیایان دەکردنەوە.

کاتێک لە سەرەتای وەرزی پاییزدا ئەو هێزە بێشومارەم، کە ژمارەیان زیاد لە نیو ملیۆن سەرباز دەبوو. بەرەو باشوور کەوتەڕێو لە ناویاندا هەموو ژنەکانی خۆمو ژنانی شازادەو پیاوە ناودارەکانمو سەرکردەکانمو هەزارەها کۆیلەی تێدا بوو. ئەو دوو سندووقە گەورەیەش بە سەرپەرشتی دوو فیلی گەورەوە بوو.

سەربازو جەنگاوەرەکانم بڕوای تەواویان پێبوو. غیرەتو ئازایی پێ پەیدا کردبوونو زۆریش پشت ئەستوور بوون پێی. فەرمانم بە سەربازەکانم دا ئاگاداریو چاودێری ئەم ئامێرە نەهێنییە بکەن. چونکە من ئەم چەکەم بە چەکێکی گەورەو گران دادەنا کە بە دەستمەوەیەو هەڕەشەی پێ لەو کاربەدەستو فەرمانڕەوایانە دەکەم کە لە فیلەکانم ناترسێنو گوێیان پێنەدەدا.

منیش خۆم زۆر دڵنیا بووم لەوەی لە پاشەڕۆژدا سوودێکی گەورە لەم چەکە دەبینمو پاشەڕۆژیش دەست بەسەر ئەو زانا بیانییانەدا دەگرم کە نهێنی بارووت دەزاننو زۆریان لێدەکەم ئەو مادە ترسناکە بەکاربهێننو چەکێکی کوشندەو ترسناکی لێ دروست بکەن، هیچ کەسێک لەمەوپێش هەر خەویشی پێوە نەدیبێ.

شاهرووخ لە هیراتەوە بە خۆیو لەشکرەکەیەوە هاتو لە شاری مەشهەدا پەیوەندی پێوە کردمو لەو کاتەوە ئیتر دڵشاد لەگەڵ کوڕەکەیدا بۆ هەر کوێیەک بڕۆیشتایە ئەویش لەگەڵیدا دەڕۆیشت.

نۆبجاش لە سەرەتای ڕۆیشتنمانەوە ئەویش لەگەڵ ئەمیریسی کوڕیدا بوو. لەبەرئەوە من خۆم محەممەد سوڵتانم لە سەمەرقەندا جێهێشتبوو بۆ پارێزگاریکردنی لە هەر دەستدرێژییەک کە لە باکوورەوە بۆی بکرایە.

لەبەرئەوە سەرکردایەتی ئەو فەوجەی وەختی خۆی محەممەد سوڵتان دەیکرد دامە دەست خەلیل سوڵتانی برای. خەلیل سوڵتان شازادە سیفینی دایکیشی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو. من خۆشم نەمدەویستو حەزم نەدەکرد سیفین لەگەڵ کوڕەکەیدا لە سەمەرقەندا بمێنێتەوە. لە ترسی ئەوەی نەوەک پێکەوە پیلانێک بنێنەوە بە تایبەتیش کە دڵشاد لە سەمەرقەندا نەبوو تاکو بتوانێت ئەو پیلانە پووچەڵ بکاتەوە.

شادیە مۆلخ لەگەڵ خەلیل سوڵتاندا هاتبوو. هەروەک دڵشاد دەیوت جوانی ئەم کچە ببوو بە دڕکێک لە دڵو گیانی شازادە سیفیندا چەقیبوو.

ئەم کچەش کچێکی بێڕەوشت بوو منیش وام لە خەلیل سوڵتان گەیاندبوو دایکی، نەك من بۆتە بەرهەڵستیو ناهێڵێت ئەم کچە فارسییەی بۆ بێنمو ناهێڵێت ئاهەنگو شاییەکی ژن گواستنەوەی فەشەنگو بێ وێنەی بۆ بگێڕم.

هەروەها ئالی سۆنیش لەم ڕۆیشتنەماندا بەرەو باشوور لەگەڵماندا بوو. هەتا جۆن بیتری کوری هاتە پاڵمانو پەیوەندی پێوە کردین. لەڕاستیدا ئالی سۆن لە کوڕەکەی زیاتر بیری لە هیچ شتێکی تر نەدەکردەوە. ئالی سۆن لە کاتێکدا چادرەکانمان هەڵداو حەساینەوە، بەردەوام دەچوو بۆ سەردانی شازادە نۆبجا، هەروەها شازادە ڕەشەکەش واتە نۆبجا بەردەوام دەهاتو سەردانی چادرەکەی منی دەکرد. چونکە ئالی سۆنی تێدابوو. منیش پاش ئەوەی کاروباری سەربازیم جێبەجێ دەکردو کاروباری خۆشم تەواو دەکرد، کاتێکی زۆرم لەگەڵ ئەلەهدیدا دەبردە سەرو ببوو بە برادەری هەمیشەیی من. کاتو زەمانیش لەبار بوو بۆئەوەی مێژووی ژیانم بنووسم. بۆ ئەم مەبەستەش ئەلەهدی ئەم کارەی خستبووە سەرشانی خۆی. گەرچی ئەلەهدی هێشتا تەمەنی لە شانزە ساڵان تێپەڕ نەببوو. بەڵام مامۆستاکانی پێیان دەوتم ئەلەهدی لاوێکی بەتواناو ژیرو شارەزایە.

ئیتر کاتێك ئەلەهدی هەموو پێداویستێکی نووسینی ئامادە کرد هات بۆ ناو چادرەکەی من کە بە چراو مەشخەڵ ڕووناك کرابۆوە. بە ئارەزوویەکی زۆرەوە لێی پرسیم وتی:

-باوکە.. لە کوێوە دەست پێبکەین..؟

وتم: کوڕەکەم لەو ڕۆژەوە دەستپێدەکەین کە بۆ یەکەمجار شێرە جوانو ئاپابەکەم بینی.. لەو ڕۆژەوە کە ڕێگای خۆمم دۆزییەوە، کە دەبێت لە سەری بڕۆم ڕێگای چەكو شمشێر..

وتی: باوکە.. کەواتە ئەو ڕۆژە ڕۆژی سەرەتایە.. وا نییە..؟

وەڵامم دایەوە: بەڵێ.. کوڕەکەم..

بەردەوام مێژوو و بیرەوەری ژیانی خۆم بۆ ئەلەهدی دەگێڕایەوەو ئەلەهدیش تا درەنگانێکی شەو دەینووسی. تاکو زەیت لە چراکاندا نەماو خەریکبوو مەشخەڵەکان دەکوژانەوە. چاوەکانی ئەلەهدی سوورهەڵگەڕابوو.. هیلاك ببوو.. پەنجەکانی لەگۆ کەوتبوونو بە تەواوی شەکەتو ماندوو ببوون. هەتا وای لێهات پێنووسەکەی داناو لە نووسینەوە وازی هێناو بۆ حەسانەوە دانیشت. منیش چوومە ناو نوێنەکانمەوەو نووستمو خەوم بە ڕۆژانی لاوێتیمەوە دەبینی.

لەڕاستیدا بۆ مرۆڤ کارێکی ئاسان نییە سەرکردایەتیو پێشەوایی لەشکرێکی گەورەو گران بکات وەك لەشکرەکەی منو بە بیاباندا بیبات کە لەو شوێنەشدا دەستکەوتنی ئاو شتێکی ئاسان

نییەو مرۆڤ ناتوانێت ئەوەندە ناوی دەستکەوێت بەشی خواردنەوەی ئەو هەموو سەربازو ئەسپو ئاژەڵانە بکاتو تێرئاویان بکات.

کاتێك گەیشتمە شاری ورمێو دەریاچەی ورمێ لەوێدا بۆ ماوەی شەش مانگ سەربازگەمان داناو حەساینەوە. جگە لەو سوودو کەڵکەی لەو دەنگوباسەی بڵاوم کردەوە کە بارووددم دەستکەوتووەو نامێری سەیرو گرانم پێیە. سوودو کەڵکی زۆری تریشم دەستکەوت.

سوڵتانی میرنشینەکانی قاهیرە دۆستو برادەرێکی دڵسۆزی سوڵتانی بەغداد، سوڵتان ئەحمەد بوو. ژمارەیەکی زۆر سەربازو ژنی دابوویە. سوڵتانی قاهیرە، سوڵتان ئەحمەدی ناردبۆوە بۆ بەغدادو داگیری کردبۆوەو لە شوێنی خۆیدا دایبنابۆوە.

منیش لە کاتی هەڵمەتەکەمدا بۆ سەر هیند هێزێکی کەمم لە بەغدادا جێهێشتبوو، سوڵتان ئەحمەدو ئەمیر کارا یوسف کە هێزێکی ئازاو نەبەردی زۆری تورکمانی لەگەڵدا بوو لە ئەرمینیاو کوردستاندا. هەردووکیان ملکەچی خۆیان بۆ سوڵتانی تورکی بایەزید دەربڕیو خۆیان خستە ژێر سایەو بەزەیی ئەوەوە.

پاشاکانی میرنشینەکانی سوریا لەشکرو هێزی ئازاو بەتوانایان هەبوو. ڕەنگە یەکێك لەو پاشای میرنشینانە بیتوانیایە، ڕێگام لێبگرێتو بیشکاندمایەو نەیهێشتایە بگەمە وڵاتی بایەزید یا هەر نەبوایە بەرهەڵستی لەشکرەکەمی بکردایەو نەیهێشتایە بڕۆم بۆ پێشەوەو دوای بخستمایە. تاکو بایەزید بانگەوازی لەشکرەکەی خۆی دەکردو لە ئەوروپا دەیهێنانەوە. چونکە ئەو کاتە گەمارۆیەکی بەهێزو پتەوی لە دەوری ئەستەمبوڵدا دانابوو. وە لە زۆر لاوە شەڕی لەگەڵ ئەوروپییەکاندا دەکردو لە زۆر جێگاشدا لەگەڵ یۆنانو بولغاریادا لە جەنگدا بوو.

منیش نامەیەکم نووسیو ناردم بۆ سوڵتان بایەزیدو لە نامەکەمدا ئەوەم دەربڕیبوو. من بەم لەشکرەمەوە هاتووم، تۆڵە لە سوڵتان ئەحمەد بکەمەوە، چونکە ئەو لە بەغداددا ئەو پیاوانەی منی کوشتووە کە من لە دوای خۆم لەوێدا جێمهێشتووە. هەروەها بۆئەوەی تۆڵە لە ئەمیر کارا یوسف بکەمەوە، چونکە زۆرجار لە سنووری خوارەزمەوە هێرشی کردۆتە سەر سنووری وڵاتەکەم. وە داوام لە سوڵتانی تورکی کرد، ئەو دوو پیاوە تاوانبارانەم بداتەوە دەستو خۆی لە شەڕو کوشتار لە بەرامبەر مندا دووربخاتەوە، چونکە ئەو شەڕە لەسەر هەردوو لامان زیانێکی زۆر دەکەوێت.

داوام لێکرد بێتە پاڵ منو یارمەتیم بدات بۆ ئەو هەوڵە پیرۆزە کە لە پێناوی بەکارنەهێنانی بارووددا دەیکەم.

لەو ماوەیەدا کە چاوەڕوانی وەڵامی سوڵتان بایەزید بووم. کۆمەڵێك بەکرێگراوو جاسووسی خۆم نارده ناو سەربازە تورکەکانەوە. بە تایبەت بۆ ناو ئەوانەی لە بنەچەدا لە ڕەسەنی تەتەر بوون. بۆ ئەوەی داوایان لێبکەن‌و هانیان بدەن گوێڕایەڵی ڕەسەنایەتی خۆیان‌و ئاینی پیرۆزی ئیسلام بکەن‌و نەهێڵن بایەزید ئەو بیروباوەڕەی ئیسلام پیس بکات‌و هاوبەشی بۆ یەکتایی خوا پەیدابکات.

هەروەها چەند کاتێکم لەگەڵ ئەلەهەدیدا دەبردە سەرو مێژووی ژیانی خۆمم پێدەنووسییەوەو لەگەڵ خۆمدا دەمبردو دەچووین بۆ ئەو شوێنەی تیا لەدایك ببووم.. هەروەها دەمبرد بۆ ئەو باخچەو دۆڵ‌و شاخەی ئەمیرە شولیانی دایکی دڵی تیادا دەکرایەوەو حەزی لێدەکرد.

پاشان وەڵامی بایەزیدم پێگەیشت. ئەو وەڵامەش وەڵامێکی دۆستانەو جوان نەبوو لە نامەکەیدا منی ناوبردبوو بە دزی هیچ‌و پووچ‌و ئاژاوەچی بیابان وە لە نامەکەیدا نووسیبووی کە من لەو شەڕانەی کردبوومن، تەنها لەبەر بێهێزی دوژمنەکانم سەرکەوتووم. یان بە هۆی غەدرو ناپاکی‌و دووبەرەکی‌و درۆو دەلەسەوە سەرکەوتووم.

لە نامەکەیدا گاڵتەی پێکردبووم‌و وتبووی:

شێرو تیری تەتەرە ترسنۆکەکان چی پێدەکرێت لە بەرامبەر ئەو شێرو تەورە گەورانەی سەربازە ئینکیشارییە ئازاو نەبەردەکاندا. ئەو سەربازانەی هەرگیز لە جەنگدا نابەزن..

هەروەها ئەو سوڵتانی تورکە ڤین لە دڵە قایل نەبوو ئەو دوژمنانەم بداتەوە دەست‌و تەسلیمم بکات.

ئەمجارەش وەك جاری پێشووتری پشتی بە دەنگوباس‌و زانیاری ناڕاست‌و نادروست‌و درۆو دەلەسە بەستبوو.

وە لە نامەکەیدا پێی لەسەر ئەوە داگرتبوو، گوایە من هیچ دەلیل‌و بەڵگەیەکی شەرعیم بە دەستەوە نییە کە دەڵێم.. سوڵتان ئەحمەدو کارا یوسف زەرەرو زیانیان پێگەیاندووم. وە من خۆم بەغدادم داگیرکردووەو لە سوڵتانی شەرعی خۆیم زەوت کردووەو لەژێر دەستیدا دەرمهێناوە.

هەروەها من بە زۆر خوارەزمم داگیرکردووەو لەژێر دەستی خزم‌و کەسوکارەکانی کارا یوسفدا دەرم هێناوە. هەروەها بە زۆرو ناڕەوا ئۆرغانج‌و خیفام لە سەردارو شازادەکانی داگیر کردووە.

وا دیاربوو نەشیبیستبوو وە نەیدەزانی من شازادە شالێرام پێشکەش بە ئەمیریسی کوڕم کردووەو لێم مارە کردووەو وە ڕەنگیشە زانیبێتیشیو بڕوای پێنەکردبێت، چونکە لە نامەکەیدا وا باسی کردبوو کە ژنی من بێت. چونکە نووسیبوویو وتبووی دەبێت لەبەرچاوی خۆت لە خۆمی مارە بکەم. ئەم قسەیەشی چەند ساڵێك لەمەوبەر دەربارەی ئەمیرە شولیان کردبوو.

جا لەبەرئەوە بڕیارم دا لە کاتی گونجاوی خۆیدا دەبێت ئەمیریس خۆی تۆڵەی ئەو قسە ناڕەواو سووکایەتییە بکاتەوە.

هەروەها بایەزید لە وەڵامی نامەکەیدا ناوو ناتۆرەی زۆرو ناشیرینی لێنابووم‌و ناوی بردبووم بە "تەیموورە شەل..!! و تەیمووری سەگ.. و..!!" بەم جۆرە بڕیارم دا باروبارگەو چادرەکان تێکدەین‌و بە هەرێمی کوردستاندا بڕۆین‌و ڕەو بکەین.

کاتێك گەیشتمە دوا خاڵی سنووری وڵاتەکەم‌و چاوەڕوانی شەڕهەڵگیرساندنم دەکرد، هەرچی ژنەکانم هەبوون، هەر هەموویانم ناردەوە بۆ پایتەختەکەم بۆئەوەی شەرەف‌و نامووسیان بپارێزم.

بەڵام نۆبجا ژیانی خۆی خستە مەترسییەوەو بڕیاری دا لەگەڵ ئەمیریسی کوڕیدا بێت‌و نەگەڕایەوەو بە هیوای ئەوە بگاتەوە ئەفریقاو لەوێدا ببێتەوە بە شاژنی ئەوەی نەتەوەکەی خۆی.

منیش وام لە ئالی سۆن چاوەڕوان دەکرد، لەگەڵمدا بمێنێتەوەو بێت هەتا دەگەینە بەندەرو لەوێوە بە دەریادا بچێتەوە بۆ نیشتمانەکەی خۆی.

بەڵام ئەویش بڕیاری دا لەم ڕێ‌و ڕۆیشتنەدا نەیەت لەگەڵماندا‌و حەزی کرد بگەڕێتەوە بۆ شاری سەمەرقەند.

کاتێك گەیشتینە کاراباغ. دەستم کرد بە ڕێکخستن‌و چاککردنی لەشکرەکەم‌و شاهرووخ‌و هێزەکەیم ڕاسپارد لە هۆزەکانی تورکمانەکان بدەن‌و لەناویان بەرن‌و پرزەیان لێببڕن.

پاشان بە نزیك دەریاچەی ڤان غولودا ڕەت بووم‌و بە لەشکرەکەمەوە بە هەرێمی کوردستانی شاخاویدا ڕۆیشتم.

پاش شەڕو کوشتارێکی کەم کە چەند مانگێکی خایاند دەستم گرت بەسەر شاری ئەرزڕووم‌و ئەرزینکان‌و توکان‌و سیفاسدا.

پاش ئەوە بەرەو باکوور کەوتمەڕێ‌و بەلای نیوە دوورگەی تورکیاوە ڕۆیشتم‌و گەیشتمە شاری حەڵەب لە سوریا.

لەبەرئـەوەی بـە چـاکی دەمزانــی جـاریکی تــر بەســەر ئــەو ڕیگاوبانــەدا ناڕۆمــەوە. وە نـەشمدەتوانی لـەو ناوچەو هەرێمانـەدا ژمارەیـەکی زۆر لـە هێزە داگیرکەرەکەم جێبـهێڵم. هیـچ کەسم لە دیلەکان لەگەڵ خۆمدا نەهێناو هەرچی پیاوێکیش بۆ کاروبـاری سـەربازی دەستی دەداو لەش و لاریان ساغ و تەواو بوون هەر هەموویانم کوشت و لەناوم بردن.

پاش ئەوەی ئەو سەربازو سەربازگە میسرییە بـەهێزەی لـە حەلـەبدا بـوون، هـەر هـەموویانم کوشـت و لـەناوم بـردن. بــەرەو دیمەشـق کەوتمــەڕێ. والی میرنشـینەکان هــات بــۆ لام و داوای ئاشتبوونەوەو ڕێکـەوتنی لێکـردم. منیـش لـە دەرەوەی شـووراکانی شاری دیمەشقەوە بــۆ مـاوەی مانگێکی تەواو سەربازگەم دانا.

لە کاتێکدا لەگەڵ والیدا وتووێژو ڕێکەوتنم دەکرد. بۆم دەرکەوت ئەو والییە دەیەوێت کاتی دەستکەوێت و بە دزییەوە داوای لە سوڵتانی میرنشینەکانی قاهیرە کردووە، بە هانایەوە بێن. وە لەبەرئـەوەی لەشکرەکەم دوو ساڵی تـەواو لـە شـەڕو کوشـتارێکی تونـدو تیـژدا بـوون. ڕێـم بـە بەشـێکی زۆریـان دا بـۆ ماوەیـەکی کـەم دانیشن و بحەسێنەوە. بـەڵام نوورەددیـن لەگـەڵ هـێزێکی گەورەدا کەوتـەڕێ و ڕۆیشت بۆئەوەی گەمارۆی بەغداد بدات.

هێزێکی ترم خستەڕێ بۆئەوەی دوای ئەو پاشماوانەی میرنشینەکان بکەون کە لـە حەڵەبـەوە هەڵاتبوون و ڕایانکردبوو بۆ فەڵەستین. وە لەبەرئەوەی قەشە -جۆن بیـتر- زۆر ئـارەزووی لێبـوو، بچێت بۆ زیارەتی ئەو خاکە پیرۆزەی خودا. بە تایبەت بۆ شاری قودسی پیرۆز لەبەرئـەوە لەگەڵ ئەو هێزەدا ڕۆیشت بۆ ئەوێ.

پاش ئەوەی سەرکردەی هێزەکەی من لەشکرەکەی میرنشینەکانی لـە عـەکادا شکاند. قەشـە جۆن بیتر چوو بۆ قودسی پیرۆزو لەوێوە چوو بۆ یافا و لەوێشەوە بە دەریادا کەوتـەڕێ و ڕۆیشت بۆ وڵاتی فرنجە -ئینگلتەرە-.

ماوەیەکی تر لە دەری شووراکانی دیمەشقدا مامەوەو لەو ماوەیەدا چیرۆکی ژیـانی خۆمـم بـۆ ئەلەهدی کوڕم دەگێڕایەوەو ئەویش دەینووسی.

لەبەرئـەوەی بیابـانی شـام لـە کـاتی نیـوەڕۆدا زۆر گـەرم بـوو. ئێمـە لـەناو چادرەکانمـاندا دەماینـەوەو نەدەچووینـە دەرەوە. تەنـها لـە بـەیانی و شـەواندا دەچووینـە دەرەوەو لـە بـەردەم چادرەکەی خۆمـدا دادەنیشـتین. ئـەو کاتانـە چیرۆک و بـیرەوەری ژیـانی خـۆم و بیرەوەرییـەکانم لەگەڵ ئەلجایدا بۆ ئەلەهدی دەگێڕایەوە.

لە کاتێکدا باسی ئەلجایم دەکرد، چاوم بڕیبووە گومەزە جوانەکەی مزگەوتی ئەمەوی لەناو شاری دیمەشقدا.

ئەو گومەزە دەتوت خونچەیەکی گەورەی گوڵە سەوسەنێکی جوانەو بەسەر شاری دیمەشقدا بەرزبووبێتەوە..

سەرم لەوە سووڕمابوو، ئایا ئەمە تراویلکە[7]یە یان چاوە کزەکانی من وا دەکات. و وامدەزانی ئەو گومەزە لە هەمان مادە دروستکراوە کە هەوری لێ پێکهاتووە. چونکە لەسەر شووراکانەوە وا خۆی دەنواند لە ئاسماندایەو بەبێ کۆڵەکە لەسەر زەویدا ڕاوەستاوە.

پاش ئەوەی بە جوانی تێمڕوانی بۆم دەرکەوت لە دنیادا لە هیچ شتێک ناچێت لە شازادە ئەلجای نەبێت. چونکە وەکو ئەلجای ڕێك‌و ڕەوان‌و جوان‌و باڵابەرزو سەرنجڕاکێش بوو.

فەرمانم بە ئەندازیارەکانی خۆم دا بە وردی لە شێوەو چۆنێتی ئەو گومەزە بکۆڵنەوەو بزانن چۆن دروستکراوە.

بۆ ئەم مەبەستەش ژمارەیەکیانم بە هۆی عەبدوڵلاو بە کرێگیراوەکانەوە ناردە ناو شارەکەوەو داوام لێکردن -واتە لە ئەندازیارەکان- بە وردیو دووروو درێژی لێکۆڵینەوە لەسەر چۆنێتی ڕێگای دروستکردنی بکەن‌و بزانن چۆن دروستکراوە.

پاش ئەوەی کارەکەیان جێبەجێ کردو تێگەیشتن چۆنەو چۆن دروست دەکرێت. دەیەها ئەندازیارم ناردەوە بۆ سەمەرقەند بۆ ئەوەی لەسەر مزگەوتەکەی ئەمیرە شۆلیان کە تازە لە سەمەرقەندا دروستکرابوو. گومەزی وەك ئەم گومەزەی مزگەوتی ئەمەوییە لەسەر مزگەوتەکەی دروستبکەن. هەروەها پێم ڕاگەیاندن وەك ئەم گومەزە لەسەر گۆڕەکەی ئەلجای‌و جیهانگیرو شێخ عومەر لە شاری شەهری سیبزیشدا دروست بکەن. دوای ئەوە فەرمانمدا، بەسەر ئەو مزگەوتانەی تازە لە هەموو لایەکی ئیمپراتۆریەتەکەمدا دروستدەکرێت. گومەزی لەم جۆرەیان لەسەر دروست بکەن.

ئاخری کاربەدەستی دیمەشق بە مەرجەکانی من قایل بوو. بەم شێوەیە کاتێك ئەو هێزەی بە دوای لەشکرە پەراگەندەکەی میرنشینەکاندا بۆ فەلەستین چووبوون.. گەڕانەوە. لەشکرەکەم باروبارگەو چادرەکانیان پێچایەوەو دەستمان کرد بە گەڕانەوە.

بەڵام ئەو کۆمەك‌و هێزەی سوڵتانی میرنشینەکان‌و تورکەکان ناردبوویان بۆ دیمەشق لە کاتی گەڕانەوەماندا لە دواوە پەلاماری هێزەکەی دواوەمانی داو لەشکرەکەی منیش بۆیان گەڕانەوەو

---

[7] تراویلکە: سەراب (سراب).

لێیان ڕاپەڕینو شەڕێکی ترسناکیان لەگەڵدا کردن. چونکە لەشکرەکەی من لە لایەن چەكو ژمارەی سەربازەوە لەوان باشترو بەهێزتر بوون. توانیان بە تەواوی بەسەریاندا زاڵ بنو بە تەواوی تەفروتونایان کردنو هەر هەموویانیان لەناوبردنو کوشتیانن.

وە بۆئەوەی تۆڵە لە فەرمانڕەوای شاری دیمەشق بسێنمەوە. فەرمان دا بە پیاوو سەربازەکانم شارەکە تاڵان بکەنو چۆن دەتوانن وێرانی بکەنو خەڵکەکەی ئازار بدەنو ئەتکیان بکەن.

لەبەرئەوەی پیاوە جەنگاوەرەکانم ماوەیەکی زۆر بوو لە چادرەکانیاندا بوونو لەوێدا مابوونەوە. ماوەی سێ ڕۆژی تەواو ڕاوڕووتو تاڵانی ماڵو سامانی ناو شارەکەیان کرد. و هەرچی ژنو کچێکیان هەبوو، هەر هەموویان ئەتك کردن.

پاش ئەوەی سكو ئارەزوویان بە تەواوی تێر بوو. لە هەموو لایەکەوە ئاگریان لە شارەکە بەرداو وێرانیان کرد.

منیش لەگەڵ ئەل مەهدیدا ڕاوەستابوومو سەرنجی گڕو بڵێسەی سووتاندنو ڕماندنی مزگەوتو گومەزەکەی ئەمەویم دەدا..!!

بەڵام هیچ هەستم بە ناخۆشیو پەژارە نەکرد بەوەی ئەو گومەزە دەسووتێت، چونکە من لەوە دڵنیابووم شێوەی ئەوە لە شاری تردا دەبینمەوە. واتە لە شارەکانی خۆمدا. هەروەك چۆن ئەلجایم لە ژنێکی تردا بینییەوە..!!

* * *

## قینو تۆڵە

بایەزید هێزەکەی لە ئەورووپادا بە گەرووی بۆسفور-دا کشاندەوە. لەبەرئەوەی لە کاتی ئەو هێرشەدا کە کردیانە سەر هێزەکانم، ژمارەو توانای هێزی تورکەکانم بۆ دەرکەوتبوو. خێرا گەڕامەوە بۆ شاری سەنەب بۆئەوەی لەشکرەکەم بە چاکی ڕێك بخەمەوەو ئامادەیان بکەم بۆ هێرشکردنە سەر سەنگەرو بنکە سەرەکییەکانی تورکەکان.

پاشان نامەیەکم بۆ محەمەد سوڵتان ناردو داوام لێکرد. بە زوویی خۆیو ئەو هێزەی لە سەمەرقەندان بە هاناو کۆمەکیمەوە بێت.

هەروەها داواشم لە شاهرووخ کرد خۆیو هێزەکەی هیرات کە ئەو کاتە بۆ سەرکوتکردنی هۆزە تورکمانەکان لە جەنگدا بوو. بۆ یارمەتیو کۆمەکیمان بێن. وەك من چاوەڕوانم لە نوورەددین دەکرد، نەیتوانی بە خێرایی بەغداد داگیر بکات. گەرچی سوڵتانە ترسنۆکەکەی

بەغداد، سوڵتان ئەحمەد دووبارە لە شارەکە ڕایکردبوّەو هەمدیسان پەنای بردبوّەوە بوّ قاهیرە. ڕێنمایی سەرکردەکانی خوّی کردبوو، بە هیچ جوّرێك شار نەدەن بە دەستەوە، هەتا من خوّم هێرش نەکەمە سەر شارەکە.

ئا بەم شێوەیە من لە نێوان دووڕیانێکدا بووم. یان دەبوایە بە بێ هێزەکەی نوورەددین. بە هێزێکی کەمەوە، ڕووبەڕووی هێزەکەی بایەزید بوەستمەوە یان ئەوەتا بە خێرایی هەڵمەت بەرمە سەر بەغدادو پاشان بە هەموو هێزەکەمەوە بگەڕێمەوەو بەرەنگاری تورکەکان ببمەوە.

لە کاتێکدا چاوەڕوانی گەیشتنی شاهرووخ و ئامێرە گەورەو گرانەکانی گەمارۆدانم دەکرد، کە لای شاهرووخ بوون. بە وردی بیرم لەو ئامێرانە دەکردەوە. چونکە بوّ شەڕکردن زوّر پێویستم پێیان بوو. جا بوّ شەڕ لە دژی بایەزید بێت یان دژی بەغداد بێت.

بەردەوام لەسەرخوّو بە ژیری کاروباری ئیمپراتوّرییەتەکەمم بەڕێوە دەبردو بە هوّی نامەوە پەیوەندیم بە سەمەرقەندو هیندەوە دەکردو پاشماوەی بەشەکانی بیرەوەری مێژووی ژیانی خوّم بە ئەلەهدی دەنووسییەوە.

لەم کاتەدا زانایەکی ئاینی هات بوّ لام‌و داوای لێکردم پەنای بدەم‌و لەژێر سایەمدا کاربکات. کاتێك باسی بەسەرهاتی خوّیم لێ پرسی.

پێی وتم، لە میسرەوە هاتووم‌و لەمەوپێش لە شانشینی سوڵتانی میرنشینەکاندا کارم دەکردو ئێستا هاتووم بوّ ژێر سایەو چادرەکەی توّو داخوازی لێکردم‌و لێم پاڕایەوە مافی پەناهێندەیی بدەمێ. چونکە سووکایەتی بە سوڵتان کردوودو ناچار بووە لە قاهیرەوە هەڵبێت‌و بێت بوّ لای من.

کاتێك لە بەردەممدا دانیشت بە ڕێزو گەورەییەوە پێی وتم:

-ئەی سەرداری گەورەو بەڕێزم..!! من هەموو کاتێك بە پەروّش بووم کە سەرکەوتن‌و دلێرییەکانت بنووسمەوەو مێژووی ژیانت توّمەربکەم.

بەڵام وەك خوّت دەزانیت، سوڵتانی میرنشینەکان، دوژمنێکی ڤین لە دلّو سەرسەختی توّیە. ئەو نەیدەهێشت من توّ ببینم‌و ڕێگای لێدەگرتم.

-ئەی زانای بەڕێز.. توّش ئێستا لە شانشینەکەی ئەوەوە هەڵاتوویت‌و پەنات بوّ لای من هێناوە.. وا نییە..؟

- بەڵێ سەرداری گەورەم..!!

چاوەکانی ئەو پیاوە سوورو دەرپۆقیبوو. گەرچی چاوەکانم کزو بێ هێزیش ببوو. لەگەڵ ئەوەشدا هەستم کرد چاوەکانی ئەو پیاوە بە هۆی زۆر خواردن و بەردەوامبوونی تلیاک و حەشیشەوە، وا سوورهەڵگەڕاون و دەرپۆقیوو داقڵیشاون. لە ڕاستیشدا ئەو پیاوە بە شێوەیەکی پچرپچڕو بە شێوەی مرۆڤێکی سەرخۆش و حەشیشەخۆرەوە قسەی لەگەڵدا دەکردم و دەتوت سەرخۆشە. ناوبەناو دەمبینی بە دەستەسڕەکەی دەموچاوی خۆی دەسڕی و بە دزییەوە پارچە حەشیشەیەکی دەخستە ناو دەمییەوە.

هەستم کرد گیرفانی هەڵاوساوەو بەرزبۆتەوە. تێگەیشتم ئەو گیرفانە خەنجەرێکی تیژی تێدایە. نەک پێویستی زانایەکی نووسەر.

لەبەرئەوە تەماشای پاسەوانەکانی خۆمم کردو بە چاو ئاگاداری پاسەوانەکانم کردو ئاماژەم بۆ کردن وریایی و ئاگاداری ئەم پیاوە بن.

ئینجا ڕوومکردە کابراو پێم وت:

-کەواتە.. ئەی زانای بەڕێز.. خۆت بە دەستی ئەنقەست ڕاتکردووەو هاتوویت بۆ لای من.. وا نییە..؟

-بەڵێ سەرداری گەورەم..

-هاتوویت بۆئەوەی..

-بۆئەوەی بتبینم و بنووسم و بۆ.. ئەوەی.. بۆئەوەی.. بتکوژم ئەی وەحشی دڕندە..!!

بە دەنگێکی ترسناکەوە قیژانی و خێرا خەنجەرێکی تیژی دەرهێناو بە قینەوە هەڵمەتی بۆ هێنام..!!

بەڵام پێش ئەوەی سێ هەنگاو بنێت و بێتە پێشەوە. خێرا پاسەوانەکانم هەڵمەتیان کردە سەری و کردیان بە دووکەرتەوەو پارچە پارچەیان کرد.

ئەی لەو سوڵتانی میرنشینە بێ مێشک و نەفامە.. هێشتا فێر نەبووە چۆن زانا بۆ کاتی جەنگ و کوشتار بەکاربهێنێت.. ئا لەبەر ئەوە ئیتر هیچ ترسێکم لە سوڵتانی میسر نەما..!! چونکە تێگەیشتم لە پیاوێکی بێمێشک و نەفام زیاتر هیچی تر نییە..

بەڵام سوڵتان بایەزید، کانزایەکی تر بوو. زۆر جیاوازی هەبوو لەگەڵ سوڵتانی میرنشینەکانی میسردا.

کاتێک شاهرووخ و هێزەکەی گەیشتنە حەلەب بڕیارمدا بەرەو بەغداد بکەوینەڕێ و سەرکەشی نەکەم و خۆم نەخەمە مەترسییەوە هەتا بە تەواوی هەموو لەشکرەکەم

کۆنەکەمەوەو هێزە ئازاو دلێرەکەی سەمەرقەند نەیەت. بەرەنگاری هێزەکەی سوڵتانی تورکی نەبمەوە.

لە وەرزی هاویندا بە دۆڵی رووباری فوراتدا ڕەت بووین‌و پاشان بە سەر ڕووباری دیجلەدا پەڕینەوەو گەیشتینە باکووری بەغدادەوە.

چەند میلێکمان مابوو بگەینە ئەوێ.

گەرماش ئەوەندە بەتین بوو خەریکبوو لاشەی سەربازو جەنگاوەرەکانم لەژێر زرێکانیاندا ببرژێت، لە گەرمادا هەندێ ئەسپ‌و ولاخمان تۆپین‌و باڵندە لە ئاسمانەوە دەکەوتنە خوارێ‌و دەمردن. بەلام من هەر هێزەکەم بەرەو شاری بەغداد برد.

ماوەی هەفتەیەکی تەواو گەمارۆی شارەکەمان دا. لەبەر گەرما تەنها لە بەیانیان‌و شەواندا هێرشمان بۆ دەکردن. هەر کە خۆر دەردەکەوت دەگەڕاینەوە بۆ ژێر سێبەری چادرەکانمان.

لە ڕۆژی هەشتەمدا کاتی چێشتەنگاو هێرشمان کردەوە سەری‌و هەمدیسان گەڕاینەوە دواوە. بەلام ئەم جارە لە نیوەڕۆدا هێزەکەم بۆیان چوونەوە لە هەموو لایەکەوە هێرشیان کردە سەری‌و بەو ئامێری گەمارۆدانانەی سەر ئاودەکەون پردمان لەسەر ڕووباری دیجلە دروستکردو پەڕینەوە ئەوبەری دیجلە. ئەو ڕووبارەی شاری بەغدادی کردبوو بە دوو بەشەوە.

نوورەددین هێرشێکی گەورەی بردە سەر دەرگاکان‌و دوژمنانی ڕامالی‌و ئالای خۆی بەسەر بورجی چاودێری سەر دەرگاکەوە چەقاند.

هەر لەم کاتەشدا لە هەموو لایەکەوە پەیژە نران بە دیواری شووراکانەوەو ئاگری ئامێری مەنجەنیق‌و ئامێرەکانی تری گەمارۆ ژمارەیەکی یەکجار زۆر قونبەلەی نەوت‌و بەردێکی ئێجگار گەورەو گرانیان بەسەر شارەکەدا مالی.

لەسەر پشتی فیلە گەورەکانیشەوە تیرئەندازەکان‌و تیرهاوێژە گەورەکانیش دەستیان کرد بە تیر تەقاندن‌و تیرباران کردنێکی سەختی دوژمن.

لە ماوەی چەند چرکەیەکی کەمدا، هەر هەموو پاسەوانانی سەر شووراکان کوژران‌و لەناوچوون، ئیتر هێزەکەی من پێش ئەوەی هێزە یەدەکییەکەی بەغداد ڕاستببێتەوەو بێتە کۆڕی جەنگەوە، هێرشیان کردە ناو شارەوەو شارەکەیان بە تەواوی داگیر کرد.

جاری پێشوو کە داگیرم کردو دەستم بەسەریدا گرت. نەمهێشت شارەکە وێران بێت‌و تێکم نەدا. و لە گەڵیاندا بە نەرمی‌و هێمنی جوولامەوە.

بەڵام ئەو جارەیان لەسەر ئەو نەرمیو چاکییەی منەوە کە وەختی خۆی لەگەڵیاندا کردبووم لێم هەڵگەڕانەوەو بەرامبەرم ڕاوەستانەوە. جا لەبەرئەوە ئەم جارە فەرمانم بە سەربازەکانم دا، شارەکە بسووتێنن‌و وێرانی بکەن.

هیچ چوار ڕۆژی نەخایاند لەشکرەکەم شاری بەغدادی بەناوبانگیان تەخت‌و وێران کرد. ئەو شارەی لە جیهانی ئیسلامدا جێگای شانازی زانست‌و ئەدەب‌و شارستانییەت بوو.

پاشان فەرمانم بە سەربازەکانم دا سەد هەزار پیاو لەناو شاری بەغدادا بگرن‌و بیانکوژن‌و کەللە سەرەکانیان بۆ لای من بهێنن.

کاتێك کەللە سەری ئەو خەڵکانەیان بۆ هێنام هەرەمێکی گەورەم بە دەوری شووورای شاری بەغدادا پێ دروست کردو لاشەی سەربڕاوەکانیشم فڕێدایە ناو ئەو خەندەقەوە کە بە دەوری شارەکەدا دروستکرابوو. وە بە سەر پشتی فیلەکانیش لە بیابانەکەوە خۆڵ‌و گڵم هێناو کردم بەسەر ئەو لاشانەداو پێم داپۆشین.

ئەوکاتە ئەوەی زیاتر سەرنجی ڕاکێشام ڕووباری دیجلە بوو.

چونکە ئاوەکەی لەبەر ئەو خوێنە زۆرەی تێیڕژابوو سوور سوور ببوو. پیاو وایدەزانی ئەم ڕووبارە لە دەریاچەیەکی گەورەی خوێنینەوە هەڵدەقوڵێت.

ماوەی دە ڕۆژ زیاتر ئاوی دیجلە سوور ببوو. پاشان لەبەر ئەو خانوو و کۆشکە سووتاوە زۆرەی وێران دەبوون‌و دەڕمان‌و دەکەوتنە ناو ڕووبارەکەوە ئاوەکەی ڕەش هەڵگەڕاو مەبەستی من لە سووتان‌و وێرانکردنی بەغدادو دروستکردنی هەرەم لە کەللەسەری ئینسان ڕوون‌و ئاشکرایە.

دەنگوباسی بێبەزەیی‌و دڵڕەقی من لە هەموو لایەکی جیهاندا بڵاوبۆوەو ئەو ترس‌و لەرزەی ڕووخاندن‌و وێرانکارییە زۆر سوودی پێگەیاندم‌و کەڵکم لێوەرگرت.

بەڵام ئەمانە لای من زۆر گرنگ نەبوو. وە کاری نەکردە سەر من. چونکە من کاری وام زۆر دیبوو، زۆریشم کردبوو. زۆر وێرانکاری‌و سووتاندنی لەو جۆرەم کردبوو. کە سەری منداڵی پێ سپی دەبوو.

من سووتاندن‌و وێرانکاری بەغدادم بە کارێکی تۆڵەسەندن‌و ڕەواو پێویست دادەنا. ئینجا دوای ئەوە پێشەوایی هێزە تایبەتییەکەی خۆم‌و فەرماندەو گەورە ئەفسەرە جەنگییەکانم کردو کتوپڕ بەرەو شاری تەبریز کەوتمەڕێ بۆئەوەی لەوێدا پلان بۆ بەرەنگاربوونەوەی سوڵتان

بایەزید دابنێم. لەشکرەکەشم بە دوامدا هات. لە کاتی ڕۆیشتنیاندا کاتی خۆیان بە ڕاوکردنو ڕاونانی خێڵو هۆزو چەتەو ڕێگرە بچووکەکانەوە دەبردە سەر.

لە سەمەرقەندیشەوە، محەمەد سوڵتان کەوتبووە ڕێو هاتبوو بۆ ئەوەی پەیوەندیم پێوە بکاتو بێتە پاڵم.

منیش بە درێژایی ڕۆژ لە کاردا بوومو ئەو نامەو نووسراوانەم دەخوێندەوە کە جاسووسەکانم بۆیان دەناردمو لەگەڵ فەرماندەو گەورە ئەفسەرەکانمدا گفتوگۆو لێکۆڵینەوەی پلانی جەنگیم دەکردو بە کرێگیراوو جاسووسی زۆرترم بۆ ناو تورکەکان دەناردو پروپاگەندەی نوێم فێردەکردن بۆئەوەی لەناو تورکەکاندا بڵاوی بکەنەوە.

لە لایەن ئەوروپاییە گەمارۆدراوەکانی ناو ئەستەنبولو سمیرناوە بەڵێنو پەیمانی زۆرم بۆ هات کە پشتگیریو یارمەتیم بدەن. هەروەها بازرگانەکانی بوندوقییەو جەنەوا دڵنیایان کردمو بەڵێنیان پێدام کە ڕێکەوتننامەی بازرگانیم لەگەڵدا دەکەن.

هەندێ هەواڵو قسەوباسم پێگەیشت، گوایە تورکەکان چەند ژمارەیەك تۆپیان هەیە. بەڵام ئەم قسەوباسانە لە لایەن هیچ کەسێکەوە پشتگیری نەکرا. کە بە چاوی خۆی بینیبێتی..

پاشان لەشکرەکەم گەیشتە شاری تەبرێزو لەوێدا بارو بارگەو چادرمان هەڵداو سەرزەویمان داپۆشی.

لە محەمەد سوڵتانەوە نامەیەکم پێگەیشتو پێی ڕاگەیاندم کەوا چەند میلێك لێمەوە دوورە..

بۆ ڕۆژی دوایی لەشکرەکەم نمایشێکی جوانیان کردو خۆیان بۆ پێشوازیو بەخێرهاتنی هێزەکەی سەمەرقەند ئامادە کرد.

هێزەکەی محەمەد سوڵتان گەیشتو هێزەکەی زۆر جوانو شۆخو شەنگ بوون سەربازو جەنگاوەکانی جلی زۆر جوانو ڕێکوپێكو دڵگیریان لەبەردا بوو. بەسواری ئەسپی جوانو ڕەسەنەوە بوون. لەش ساغو شۆخو شەنگ بوونو ماندوبوونیان پێوە دیار نەبوو. چونکە لە کاتی پاراستنی شاری سەمەرقەندو ئوترارد هیچ ناخۆشیو بەسەرهاتێکی ناخۆشو ترسناکیان بەسەردا نەهاتبوو.

ئەو جلوبەرگانەی لەبەریاندا بوو، جوانترینو نایابترین جلوبەرگی سەربازی بوو کە هیچ لەشکرێکی جیهان جلوبەرگی وا نایابو ڕێکوپێكو جوانیان بە خۆیانەوە نەدیبوو.

هەموو فەوجێك لە جلوبەرگدا لەگەلْ فەوجەکەی تردا جیاواز بوون. چونکە هەر فەوجێك جلوبەرگی تایبەتی ئاوریشمی ڕەنگاوڕەنگی خۆی لەبەردا بوو. زۆر جیاوازتر بوو لەوی دیکە. هەر فەوجەش کلاّو زرێو تیردانو قەلْغانو زینەکانیان لە ڕەنگو چۆنێتیدا وەك یەك بوون.

کاتێك پیاوانی لەشکرەکەم ئەم خۆشیو شادیو پۆشتەو پەرداخییەی ئەم لەشکرەیان بینی وا لە ئیسراحەتدانو ئەمانیش شەڕو کوشتار هیلاكو ماندووی کردوونو پرزەی لیْ بڕیبوون. حەپەسانو دەدانیان لیْ جیڕ دەکردنەوەو سەریان لیْ بادەدان.

بەلاّم کاتێك فەرمانم دا بە بەرگدروومکانی شاری تەبریز کە وەك جلوبەرگی سەربازەکانی محەممەد سولْتان بۆ هەریەکە لە سەربازەکانی منیش جلوبەرگی لەو جۆرەیان بۆ دروست بکەن.

ئیتر دوای ئەوە هیچ سەربازێکم نەبینی خۆی بدزێتەوەو ددان جیڕبکاتەوەو سەر ڕاوەشێنێت..!!

ئینجا سەربازەکانم زۆر بە دلْ گەرمییەوە هەل هەلەیان لێدەداو بە دلْو بە گیان خۆیان ئامادەی شەڕو پێکدادانێکی نوێ دەکرد.

ئا بەم شێوەیە دووبارە بەرەو سیڤاس کەوتمەوە ڕێو سەرکردایەتی گەورەترینو ئازاترین لەشکرم کرد کە لە مێژووی ژیانمدا دیبێتم.

ئەوکاتە هەستم کردو بۆم دەرکەوت هیچ لەشکرێك من ناشکێنێت.. مەگەر لەشکرێك بێت لە ژمارەدا لە لەشکرەکەی من زیاتر بێت. یاخود لەشکرێك بێت کە هەزارەها تۆپو تۆپخانەی هەبێت. لە ڕاستیشدا من لە تۆپ زۆر نەدەترسام -گەرچی بە ڕاستیش نەمدەزانی خەتەریاتی چۆنە- چونکە بەڕاستی لەو باوەڕەدا بووم تەنها ئەو هێزە دەتوانێت بەرەنگاری من بکاتو بمشکێنێت، ئەو هێزەیە کە فیلی زیاترو گەورەتری لە فیلەکانی من هەبێت.

بەلاّم من یەقینو بڕوای تەواوم هەبوو. سولْتان بایەزید ئەو هێزو توانایەی نییەو ناشتوانێت هێزو توانایەکی گەورەو بەهێزی وەکو منی هەبێت. وە لە سیڤاسدا جاسووسەکانم پێیان ڕاگەیاندم بایەزید چادری خۆی لە ڕۆژهەلاّتی دەشتی ئەنفواردا هەلْداوەو لەشکرەکەی خۆی بردووە بۆ ناوچە شاخاوییەکانو دەیەوێت لەو ناوچانەدا بەرەنگارم ببێتەوە.

بە هۆی بەکرێگراوو جاسووسەکانمو ئەو بازرگانانەی ئەو ناوچانە شارەزا بوون تێگەیشتم دامێنی ئەو شاخو گردانە پڕە لە دارو درەختو ئەم دارو درەختانەش زۆر چاكو لەبارە بۆ سەربازی پیادە، هێزە سەرەکییەکەی بایەزیدیش پێکهاتبوو لەو سەربازە پیادە ئینکیشاریو صەباحیە ئازاو نەبەردەکانی کە دەیانتوانی بە ئاسانی خۆیانی تێدا بۆسە بدەنو تیرە گەورەو

بچووکەکانیان بتەقێنن‌و لەناو دارو دەوەنەکاندا خۆیان بشارنەوەو بە ئاسانی هاتوچۆ بکەن، بێ ئەوەی کەس بیانبینێت.

جا لەبەرئەوە بەم لای -سیفاس-دا وەرچەرخامەوەو ڕێڕەوەکەم گۆڕی‌و بە تەنیشت ڕووباری - هالیسدا- ڕۆیشتم.

بەردەوام بە کەناری ڕووبارەکەدا دەڕۆیشتم هەتا ئەو شوێنەی لار دەبێتەوەو بە -کیسری- و -کوسیهیر-دا دەڕوات‌و دەگاتە دەریاچەی -طوس- کە دووبارە بەرەو باکوور دەچێت‌و بە نێوان - ئەنفوار- و -بۆزغات-ەوە ڕەتدەبێت.

کێلگەو مەزراکان بە تەواوی پێگەیشتبوون‌و کاتی ڕنینەوەو دروێنەکردنی هاتبوو.

لەبەرئەوەی ئاوی ڕووبارەکەی شیرین نەبوو. لەشکرەکەم بە ئاسانی‌و زۆر بە خێراییەوە دەڕۆیشت. خواردنی زۆرو ئالفی چاک‌و بەسوودی بۆ ئەسپ‌و وڵاخەکانیش دەستدەکەوت.

ئەو ڕێگایەی گرتبوومانەبەر، بە ماوەی سێ ڕۆژ بڕیمان‌و گەیشتینە چادرەکانی -سوڵتان بایەزید- و ژمارەیەکی زۆر کەم لە سەربازەکانی پاسەوانیان دەکرد.

لەشکرەکەشی بەرەو پێشەوە ڕۆیشتبوون بۆئەوەی بەرەنگاری‌و بەرهەڵستی لەشکرەکەی من بکەنەوە. بەڵام ئەوان نەیاندەزانی‌و ئاگایان لەوە نەبوو من ڕێڕەوی لەشکرەکەی خۆمم گۆڕیوە.

هەر ئەوکاتە خێرا نوورەددینم نارد بۆئەوەی گەمارۆی ئەنفوار بدات. محەممەد سوڵتانیشم نارد بۆئەوەی ئەو زەوی‌و مەزرایانە بسووتێنێت کە هێزەکەی بایەزیدی پیادا دەگەڕێتەوە، بۆ شەڕکردن‌و هێرشکردنە سەر هێزەکەی من.

هێزو پاسەوانەکانی دواوە کە -بوغای سپی- سەرکردایەتی دەکردن _ بوغای سپی سەرکردەیەکی ڕووسی بوو لە کاتی تێکشکاندنی تەقتەمیشدا هاتە پاڵ لەشکرەکەمەوەو پەیوەندی پێوە کردم- لەگەڵ کۆمەڵێکدا کە کوڕەکەی بایەزید سەرکردایەتی دەکردن. لە شوێنێکی نزیک کیسری دا کەوتنە شەڕو پێکدادانەوەو بوغای سپی بەرەو باشوور ڕایکرد. بۆئەوەی سولەیمانی کوڕی بایەزید بخاتە بۆسەوەو لەناوی بەرێت.

کاتێک بایەزید زانی من لە سیفاس نیم هێزێکی نارد بۆ باشوور. بێ ئەوەی بزانێت من لە نزیک ئەنفوارەوە دەستم بەسەر چادرەکانیدا گرتووە. هەر کە ئەوەی زانی خێرا گەڕایەوە. بەڵام لەم گەڕانەوەیەیدا تووشی ئەهامەتی بوو، چونکە ئەو ڕێگایەی پیادا گەڕایەوە هەمووی سووتابوو.

هەرچی خواردنو عەلەفێکی تێدابوو هەر هەمووی سووتابوونو لەناوچووبوون. ئاوەکەشی بەربەست کرابوو. پیس ببوو بە کەڵکی خواردنەوە نەمابوو. بە تایبەت سەربازە پیادەکانی بە هۆی ئەو زەرەرو زیانە زۆرەو بە هۆی تینوێتیو برسێتییەوەو پێش ئەوەی لەو کارەساتو ناهەمواریە گەورەیەی تووشیان ببوو خۆیان ڕزگار بکەن، سەدەها کەسیان تێداچوو. چونکە خواردەمەنیو ئاو تەنها لە پشت ڕیزەکانی منەوە هەبوو.

ئا لەبەرئەمە بایەزید ناچار بوو لەو دەشتە ڕووتەنییە بەربلاوەدا، بکەوێتە شەڕەوە. ئەو زەوییەی ئەو سوارانە حەزیان پێدەکرد کە ئامێری جەنگییەکانیان بەسەر پشتی فیلەوە بوو. واتە ئەو زەوییەی هێزەکەی من پێیان خۆش بوو. وە ئارەزووی شەڕکردنیان تیادا هەبوو.

بە درێژایی پانزە میل مەیدانی شەڕو کوشتار بوو. کۆڕی جەنگ لە نزیك گردە دوورەکەوە کە شاە مالك= کوڕە گەورەکەی شێخ عومەری تیادا دامەزرابوو. درێژببۆوە هەتا دەگەیشتە ڕووبارەکە. کە نوورەددینی تیادا دامەزرابوو. محەمەد سوڵتانیش سەرکردایەتی ناوجەرگەی لەشکرەکەمی دەکرد.

بوغای سپیش سەرکردایەتی هێزێکی یەدەگی دەکرد، و دانرابوو بۆ پشتگیری هێزەکەی محەمەد سوڵتان کە لەناوجەرگەدا بوو.

تەنها هەشتا فەوج لەناوجەرگەی لەشکرەکەمدا شەڕیان دەکرد. لە کاتی چێشتەنگاودا سولەیمانی کوڕی بایەزید هێرشێکی کردە سەر هێزەکەی نوورەددین. بەڵام لە لایەن ئەو هێزەی لە دواوە دامەزرابوون. بەرهەڵستییەکی باش کرانو بەو تیرو ئامێرە گەورانەی پێیان بوو لە هەموو لایەکەوە فونبەلەی نەوتیان بەسەردا دابارینو بەربەستیان کردنو ڕایانگرتن.

بەرامبەر ئەم هێرشە سوارچاکانی هێزەکەی نوورەددین هێرشێکی دژ بەوانیان کردو هێزەکەی تورکەکانیان مەجبور کرد بگەڕێنەوە.

لەولاشەوە سوارچاکانی شاە مالك هێرشێکی قارەمانانەیان کردە سەر دەستەڕاستی دوژمن کە بایەزید خۆی سەرکردایەتی دەکردن.

بەڵام هێزەکەی شاە مالك تووشی بەرهەڵستییەکی بەهێز بوو. گەرچی شاهرووخیش بە خۆیو فەوجەکەیەوە ئەوانیش هێرشیان کردە سەر دەستەڕاستی هێزەکەی بایەزید.

ئا لەم کاتەدا دوو فەوجی تورکمان کە بە کرێگیراوە نەهێنییەکانی من دڵخۆشیان دابوونەوەو هەڵیانخەڵەتاندبوون. لە لەشکرەکەی بایەزید جیابوونەوەو هاتنە ناو لەشکرەکەی منەوە.

سوڵتان بایەزیدیش هێزێکی پیادەی سربی بە سەرکردایەتی بیتر لازاروس ناردە ناوەڕاستو کۆڕی جەنگەوە.

موسای کوڕی دووەمی بایەزید زۆر وریا بوو. سەرکردایەتی لەشکرەکەی ناوەڕاستی باوکی دەکرد. ئەو کوڕە دەیویست هێزەکەی من بۆ لای خۆی ڕابکێشێتو دەیویست شەڕو پێکدادانەکە لەبەردەم هێزو سەربازەکانی ئەودا بێت. نەیدەویست هێزەکەی بێتە پێشەوە. لە ترسی ئەوەی نەکو هێزەکەی من گەمارۆیان بدەنو بیانخەنە بۆسەوە یان بەرەنگاری ئەو هێزە نادیارو شاراوەیەی من ببنەوە کە لەناو ئەو دوو سندووقە ئاسنە گەورانەدا شاردرابوونەوە.

لەم کاتەدا محەمەد سوڵتان هات بۆلای کەژاوەکەی منو داوای لێکردم ڕێگای پێبدەم لەم کاتەدا هێرش بکاتە ناوجەرگەی لەشکرەکەی بایەزیدەوە. بەڵام من لە جیاتی ئەوە فەرمانم پێدا، بچێت بۆ یارمەتی شاە مالك کەوا گەمارۆی ئەو گردەی داوە کە سوڵتان بایەزیدو ئەو سەربازە پیادەو نەبەردانەی زۆر بە ئازاییو نەترسییەوە تیادا دامەزراونو بەرگری لێدەکەن.

بیتر لازاروس کوژراو سەربازە سربییەکانیش لەبەردەم هێزەکەی هیراتدا کە شاهرووخ سەرکردایەتی دەکردن. خۆیان پێڕانەگیراو شکانو هەڵاتن.

نوورەددینو هێزەکەی، فەوجەکەی سولەیمانی کوڕی بایەزیدیان شکاندو بۆ دواوە ڕاویان نان. هێزی لای دەستە ڕاستی لەشکرەکەمو هێزی لای دەستەچەپی لەشکرەکەم پێکگەیشتنو بە هەردووکیان گەمارۆی سەربازەکانی تورکیان داو تەنگیان پێهەڵچنین. وەك چۆن بەسەر تەفتەمیشی سەرکردەی ڕووسیدا هاتو تەنگیان پێهەڵچنینو هێزەکەی بە تەواوی کوژرانو لەناوچوون. هەردوولای هێزەکانم وەك مقاش هاتنەوە یەكو وردە وردە نزیك یەکتر بوونەوە. هەتا وای لێهات هەر هەموو هێزەکەی تورك بە تەواوی کەوتنە ناوەڕاستی لەشکرەکەمەوە. موسای کوڕی بایەزید لە ترسانداو لە ترسی فیلەکانم نەیدەوێرا هێرش بکاتە سەر هێزەکەمو بینیم پەیتاپەیتا هەندێ کەسی لە سەربازەکانی دەنێرێت بۆ دواوەی لەشکرەکەی بۆئەوەی تەماشا بکەنو بزانن ڕێگا هەیە ڕابکەن بۆ بۆزغات.

منیش ئەوکاتە فەرمانم بە هێزەکەم دا هێرشێکی گەورە بکەنو دوژمن لەگەڵ خۆیاندا ڕاماڵن. شەیپوور لێدەرەکان لە هەموو لایەکەوە بە توندی فوویان کرد بە شەیپوورەکانیاندا. دوای ئەوە زۆر بە خێراییو بە شێوەیەکی سەیردوە هەر هەموو فیلەکان بۆ پێشەوە غاریان داو تورکەکانیش لە ترساندا زیرەیان لێکردنو دەیانقیژاندو دەکەوتنو دەکەوتنە ژێر پێی فیلەکانەوە.

هێزه یەدەکییەکەی بوغای سپی ڕێی هەڵاتنی لە دوژمنان گرت. هێشتا نیوەڕۆ نەهاتبوو زۆربەی زۆری لەشکرەکەی بایەزید تەفروتونا کران و کوژران. لە هیچ لایەکی ڕیزەکانی دوژمنیشەوە ئاسەواری هیچ تۆپێك دەرنەکەوت. دوای ئەوە گەڕامەوە ناو چادرە داگیرکراوەکانی بایەزیدو فەرمانم بە کاردەکەرو چێشتلێنەرەکانم دا خواردنی ئێواره ئامادە بکەن و دوو سندووقە گەورە ئاسنینەکانیشم لەسەر پشتی فیلەکان داگرت. ئەم فیلانەش یەکسەر لە دوای کەژاوەکەی منەوە بوون و هەمدیسان خستمنە ژێر چاودێری و ئاگاداری پاسەوانەکانمەوە. بۆئەوکاتەی هەمدیسان لە دژی ئەفرەنجییەکان پێویستم پێی دەبێت. چونکە زۆرباش دەمزانی ئەوان تۆپ و باروودیان هەیە.

بایەزید هەتا دوای نیوەڕۆ شەڕی دەکردو پارێزگاری لە گردەکە دەکرد. بەڵام کاتێك کۆمەکی زیاترم بۆ جەنگاوەرەکانم نارد. بینیم بارودۆخ زۆر ناهەموارە. بێئومێدو بێزار بوو، سواری ئەسپەکەی بوو، ویستی لە نێوان ڕیزەکانی منەوە قووتار بێت و ڕابکات.

بەڵام شاه مالك توانی ئەسپەکەی بایەزید بکوژێت و لەسەر پشتی ئەسپەکەی بیهێنێتە خوارەوەو بە دیلی ئەو سوڵتانی تورکە بگرێت. و بۆ بارەگاکەی منی هێنا. من و شاهرووخیش لەو کاتەداو دوای ئەو شەڕو کوشتارە توندوتیژو تاڵە، لە ناو چادرەکەمدا خۆمان بە شەترەنجەوە خەریك کردبوو.گەرچی سوڵتان بایەزید بە لایەنی کەمەوە، دە ساڵ لە من بچووکتر بوو، بەڵام لە پیاوێکی پیری پەککەوتە دەچوو.

لە شوێنەکەی خۆم هەستام و بەرەو دەرگای چادرەکەم چووم و سڵاوم لە سوڵتانی گەورە کرد. کاتێك بایەزید دانیشت بە گاڵتەپێکردنێکەوە پێم وت:

-بەڕاستی ئەمە شتێکی سەیرو پێکەنیناوییە.. دەبێت بایەزیدی گەورەو بەتوانا خۆی بدات بە دەست پیرێکی بێتوانای شەل وەك منەوە؟!

بایەزید خۆی چاك کردو سەری بەرزکردەوەو بە شێوەیەکی تەکەببورو ویقارو خۆ بەزل زانینەوە وەڵامی دامەوە:

-تۆ ئەی تەیموورە شەل هێزێکی ئازاو ئەبەردو ئەفسەری بەتوانات هەیە ئەگەر بێتو من و تۆ پێکەوە شان بە شانی یەکتر شەڕ بکەین. دەتوانین هەرچی مەسیحییەکی کافر هەیە لەسەر ڕووی زەویدا نەیهێڵین و لەناویان بەرین، کاتێك بێئابڕوانە پێی وتم تەیموورە شەل زۆر قینم لێی هەستاو گرژو تووڕە بووم، وتم:

-ئەمە قسەی هیچو پووچو بێمانایە. ئێمە هەرگیز پێکەوە ناتوانین هیچ شتێك بکەین. چونکە تۆ پەنای دوژمنەکانی منت داوەو هێرشت کردۆتە سەر سنووری ولآتەکەمو بە ناشیرینو نابەجێترین شێوە سووکایەتیو ناوو ناتۆرەو قسەی خراپو نارەوات بە ژنە باشو بە حەیاو حورمەتەکانی منت وتووە. جا لەبەرئەوە پێویستە ئێستا پاداشتی ئەو کردەوەو قسە نابەجێیانەی خۆت بدەیتەوە..!!

-ئەی شمشێری تیژی ئیسلام. من ئامادەم هەرچییەکم هەیە بیخەمە ژێردەستتەوەو یارمەتیت بدەمو هاوبەشیت لەگەڵدا بکەم.

-هەرچییەکت هەیە هەر دەبێت بیدەیت. گەرچی ئەوەی هەشتە هیچ نرخێکیشی نییە. ئەوەش بزانە هیچ شتێکت بە دەستەوە نەماوە. چونکە ئێستا شاری ئەنفوار کەوتە ژێر دەستی هێزەکانمەوە. ئا ئەوەتا نوورەددینیش وا خەریکە بگاتە شاری بۆرسەو ئێستاش هیچت بە دەستەوە نەماوە بیدەیت. جگە لە ژیانو ڕۆحە پیسەکەی خۆت نەبێت..!!

-ژیانم..!!؟.. و ڕۆحم..؟!!

-بۆچی شكو گومانت لەوە هەیە..؟ ئەگەر ئەمڕۆ لەم جەنگەدا تۆ سەربکەوتیتایە، دەبوایە من چاوەڕوانی چیم لە ژیانو بەسەرهاتی خۆم بکردایە؟ پاشان بەسەر ئاماژەم بۆ شاە مالك کرد، کە بایەزید لەگەڵ خۆیدا بەرێت. هەمدیسان لەگەڵ شاهرووخدا دەستمان کردەوە بە شەترەنج.

کاتێك نوورەددین لە بۆرسە گەڕایەوە بۆ لام. فیلەکانمی بە سەروەتو سامانو ژنەکانی بایەزیدەوە پێش خۆی دابوو.

منیش دوای ئەوە بەرەو ئەنفوارو کۆشکی تورکەکان کەوتمە ڕێ.

بایەزیدم هێنا خستمە ناو قەفەزێکی زێڕینەوە. ئەو ژنەی لە هەموو ژنەکانی تری لای بەڕێزتر بوو ناوی دیسبینا بوو. ئەمەش خوشکی بیتر لازارۆس بوو. هێنام ڕووتو قووتم کردەوەو هیچ جلوبەرگێکم لەبەردا نەهێشتو بە ڕووتو قووتییەوە بە دوای خۆمدا هێنام. و بەسەرکەوتویی خۆم کرد بەناو شارەکەدا. بە دەستی ئەنقەست وامکرد بەم نمایشەوە بە ڕێگایەکی دوورو درێژو خوارو خێچدا بردم. بۆنەوەی هەلێك بدەم بەدەست تورکەکانەوە، تاکو سوڵتانە لەسەر کارلابراوەکەی خۆیان بەم شێوەیە ببینن و گاڵتەی پێبکەنو بەم شێوەیەش ژنە جوانەکەی ببینن و گاڵتەی پێبکەن. کە لەمەوپێش هەر لە دەرەوەی کۆشکی ژنانیشدا نەیاندیبوو. ئینجا ڕێم بە بایەزید دا کە جلە پاشاییەکانی لەبەردا بوو، وە سەوڵەجانی

ئیمپراتۆرییەتەکەشی، بە دەستەوە بوو لەم ئاهەنگ‌و میوانداریییەدا کە لە هۆڵەکەدا بۆ خۆشی‌و ڕێزگرتنی ئەم سەرکەوتنە گەورەیەی خۆم سازم کردبوو، دەوری خاوەن ماڵ بگێڕێت.

لەم ئاهەنگ‌و میوانداریییەدا بایەزید خۆی فەرمانی بە ژنەکانی دەدا جلەکانیان دابکەنن‌و خۆیان ڕووت بکەنەوەو بەناو سەردارو شازادەکانمدا بێن‌و بچن‌و مەی‌و خواردنەوەیان بۆ بکەنە ناو پێکەکانیانەوە.

کاتێك نانی نیوەڕۆمان دەخوارد. یاریدەدەرەکەم هەستاو ڕایگەیاند. هەموو کوڕەکانی بایەزید کوژراون. بێجگە لە موسا نەبێت کە ئەویش لە تورکیادا نەماوەو هەڵاتووە. بەڵام من هیچ کوڕێکم نەکوژرابوو، بێجگە لە موحەمەد سوڵتان نەبێت کە ئەویش زۆر بە سەختی بریندار کرابوو.

ئاخری بایەزید بە تەواوی لە پەل‌و پۆ کەوت‌و کەوتە سەر زەوی‌و داوای لێکردم‌و لێم پاڕایەوە لێی ببوورم.

منیش داواکارییەکەیم قبووڵ کردو لەگەڵیدا ڕۆیشتم بۆ ژوورەکەی خۆی کە لەمەوپێش لەو ژوورەدا کەیف‌و ڕابواردنی تێدا دەکرد.

کاتێك لە کۆشکی ژناندا، ئەو کۆشکەی هەموو هۆیەکی خۆشی‌و ڕابواردنی تێدابوو. پێکەوە دانیشتین. ڕووم تێکردو پێم وت:

-بایەزید دەزانیت هێشتا قەرزی ترت لاماوەو دەبێت ئەو قەرزەش بدەیتەوە؟!

-قەرزی تر..؟!! تەیموور.. بۆچی هێشتا قەرزی تر ماوە..؟!!

-بەڵێ.. تۆ کاتی خۆی هەڕەشەی ئەوەت لێدەکردم، ئەمیرە شولیانی ژنم لەبەرچاوی خۆمدا لە خۆت مارە بکەیت‌و شالێرای ژنی ئەمیریسی کوڕیشم هەر لەبەرچاوی خۆمدا لە خۆت مارە بکەیت.. وا نەبوو..؟!!..

-بەڵێ.. بەڵێ..

-زۆر چاکە.. پێویستە ئەوە بزانیت‌و دڵنیابیت لێی من لەبەر ئەو هەڕەشەو گوڕەشە هیچ‌و پووچانە قینم لێت نییە..!!

چونکە هەموو کاتێك دەمزانی تۆ ناتوانیت‌و دەستەڵاتی ئەوەت نابێت ئەو قسانەی دەتوت جێبەجێی بکەیت.. بەڵام ئایا هیچ شایەك لە جیهاندا هەیە بتوانێت چاو لەو سووکایەتییانە بپۆشێت کە دەربارەی دەیکەن‌و تۆڵە لەو دوژمنە نەکاتەوە کە ئەو سووکایەتی‌و قسە نابەجێیانەی دەربارە کردووە..؟

جا لەبەرئەوە پێویستە ئەو شایە ڕووبەڕووی ژێردەستەکانی خۆی ببێتەوەو لەبەرچاوی ئەواندا تۆڵەی شەرەفو کەرامەتی خۆی بکاتەوە..!!

-بەڵام.. تەیموور.. ئایا ئەوە دەزانیت، پیاوەکانت ژنەکانمیان ئەتك کردو ئیشی خراپەیان لەگەڵدا کردن..؟!!

-بایەزید.. من هیچ کات ئەفسی خۆم، هەتا بە لەشی جوانترین ژنو خێزانەکانیشت پیس ناکەمو کوڕەکانیشم هەرگیز بەوە ڕازی نینو ئەوانیش خۆیان پیس ناکەن. بەڵام من لەو باوەڕەدام بۆ ئەمە چارەسەرێکی باشو ژیرانە هەیە..!!

دوای ئەوە چەپڵەیەکم لێداو چوار کۆیلە هاتنە ژوورەوەو ئەو قەفەزەی بۆ بایەزیدم دروست کردبوو، لەگەڵ خۆیاندا هێنایانە ژوورەوە..

ڕەنگو ڕووی بایەزید تێکچوو.. ترسو لەرزێك بەسەر سیمایدا هاتو بە ترسو لەرزێکی زۆرو دوودڵییەوە لێی پرسیم:

-ئەمیر تەیموور.. چی.. چی دەکەیت..؟!!

-یارییەکی جوانو پێکەنیناوی..!!

ئەو یارییە چییە..؟ پاشان بە چاوی خۆت دەیبینیت..!!

ئینجا فەرمانم بە کۆیلەکان دا بایەزید بخەنە ناو قەفەزەکەوە.

ئا لەم کاتەدا ئەمیریسو ژمارەیەك لە تیپە ڕەشەکەی هاتنو دیسبینای ژنی بایەزیدی سوڵتانی عوسمانییان لەگەڵ خۆیاندا هێنا.

پاشان ڕووم کردە بایەزیدو پێم وت:

-ئا ئەوە ئەمیریسە.. دەیناسیت..؟!!

-نەخێر.. گەورەم.. بەڵام..

-ئەمە ئەو کوڕەمە کە بە قسە بێنابڕوو. و، هەڕەشە ناشیرینو نابەجێکانت سووکایەتیت بە ژنەکەی کردبوو..

-بایەزید سەری داخستبوو لە تەریقیو شڵەژاویدا بێدەنگ ببوو. نقەی لە دەم نەدەهاتە دەرەوە..

چوار کۆیلەکە هەستان بە داکەندنی جلەکانی دیسبیناو ڕووتکردنەوەی..!! پاشان هەڵیانگرتو لەسەر ئەو جێگایەی وەختی خۆی بایەزید لەگەڵ ژنو خێزانەکانیدا پاڵدەکەوتو

رایدەبوارد، دایاننا هەر لەم کاتەدا هەشت سەربازی ڕەش جلەکانی خۆیان داکەندو ڕاوەستان. چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد من چییان پێبڵێم جێبەجێی بکەن..!!

پاشان بە ڤینو تووڕەییو ڕاشکاوییەوە ڕووم کردە بایەزیدو پێم وت:

-بایەزید دیسبینا لە دوایدا پێمان دەڵێت، لەم هەشت سەربازە ڕەشە کامیان ڕەحمەتی دەکاتو کەفو کوڵی دادەمرکێنێتەوە ئەو کاتەش دیسبینا پاداشتێکی گەورە وەردەگرێت!! هەروەك چۆن منو تۆ پاداشتی ئەو کچانەمان دەدایەوە، کە لە هەموو ژنێك زیاتر خۆشیمان لێدەبینینو کەیفو ئارەزوومانی زیاتر دادەمرکاندەوە.

بایەزید لەناو قەفەزەکەدا دەستی کرد بە ڤیزە ڤیزو هاوار هاوارو جنێوی پیسو ناشیرینی دەداو نەیدەویست ئەو سەربازانە لە پێش چاویدا لەگەڵ ژنە جوانو ناسکەکەیدا پاڵ بکەونو سواری ببن. بەڵام من بە هیچ جۆرێك گوێم پێنەداو ڕووم کردە ئەمیریسو پێم وت:

-کوڕی خۆم تۆڵەی خۆتی باش لێ بسێنەوەو با ئەم سەربازانە ئەم ژنە باش ڕازی بکەنو کەفو کوڵی چاك دابمرکێننەوە.. با کەفو کوڵی بایەزیدیش دابمرکێننەوە.

بایەزید لە تەریقیو شەرمەزاریدا دەستی بە دەمو چاوی خۆیدا گرتبوو.. منیش بەو شێوەیە جێمهێشتو لە ژوورەکە هاتمە دەرەوە..!!

* * *

لە ڕۆژی دواییدا بیانییەکانم بینی ئاڵاکەم بەسەر شووراکانی ئەستەمبووڵدا دادەچەقێنن. هەروەها بیستم ئاڵاکانی بەسەر شووراکانی بیراو شووراکانی ئەو ناوچانەی لە دەوروبەری پایتەختی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمی مانۆیلیشدا بەرزبۆتەوەو دەشەکێتەوە..

-جۆن بیتریش بە گەرووی -بۆسفۆر-دا گەڕایەوەو لە شاری ئەسکۆدادا پێم گەیشتەوەو پەیوەندی پێوە کردمو پێکەوە بۆ شاری بۆرسە گەڕاینەوەو هەواڵو دەنگوباسی سەفەرەکەی خۆی لە وڵاتی ئەفرەنجیەکاندا بۆ گێڕامەوە. پێی وتم: باوکە.. هیچ پێویست ناکات ڕوویکەیتە ئەوروپاو داگیری بکەیت. چونکە هەرچی سامانێك لە ئەورووپادا هەیە ناگاتە ئەو سامانانەی لە یەکێك لە شارە گەورەکانی وەك شاری تەبریز یان هێرات یاخود شاری سەمەرقەندی تۆدا هەیە.

وتم: کوڕەکەم تۆ خراپ لە من گەیشتوویت، من بە دوای سامانو دەوڵەمەندیدا ناگەڕێم.

وتی: پیاوەکانیشت لەوێدا ناتوانن ژنی جوانیان دەستکەوێت. چونکە ژنانی ئەورووپا لە پێناو شەرەفو نامووسیاندا بۆئەوەی بە خاوێنی بمێننەوە خۆیان بە کوشت دەدەنو هەرگیز خۆیان

نادەن بە دەستەوە، مەگەر بە کوشتن نەبێت. حەزیش بە ژیانی ناو کۆشکی ژنان ناکەن‌و لە دەستی ڕادەکەن.

وتم: من ئەوە دەزانم، چونکە دایکت یەکێك بوو لەوانە.. من لە پێناو سەربازو پیاوەکانمدا بە دوای ژناندا ناگەڕێم.

وتی: شارەکانی ئەوروپا لە گوندێکی گەورە زیاتر هیچی تر نییە.. ئەوەتا شاری پاریس ژمارەی دانیشتوانی لە شەست هەزار کەس زیاتر نییە.. بەڵام شاری لەندەن‌و مەدرید ژمارەی دانیشتوانیان لە ژمارەی دانیشتوانی شاری پاریس کەمترە.

وتم: کوڕم واز لەم دەمەتەقێ‌و چەلەحانەیە بهێنەو تەنها باسی خەڵقیم بۆ بکە کاتێك گەنجێکی وەکو تۆیان بە جلوبەرگی قەشەییەوە بینی سەریان سووڕ نەماو نەحەپەسان..؟

وەڵامی دایەوە: نەخێر.. وایان دەزانی من قەشە جۆنم هەندێکیان لەو باوەڕەدان، قەشەو کاهینەکانیان نامرن‌و پیرو پەککەوتە نابن.. لەڕاستیدا زۆر دواکەوتوون‌و بڕوای تەواویان بە شتی ئەفسانە هەیە.. کاتێکی زۆریان لەگەڵدا خەریك بووم هەتا تێمگەیاندن‌و قایلم کردن، من جۆن بیتری قەشەی شاری سوڵتانیەم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دڵنیا نەبووم ئایا بەڕاستی بڕوایان کرد، یان نا..

بە کورتی ئەوانە هیچ شتێك دەربارەی ئاسیا نازانن.

وتم: ئەشێ ئەوە وا بێت.. بۆ نموونە، من.. هیچ شتێك دەربارەی وڵاتی ئینگلتەرە نازانم..

چاك بۆم باس بکە.. خەڵکی لەوێدا چۆن دەژین؟ حاڵ‌و ژیانیان چۆنە؟

وتی: باوکە وڵاتی ئینگلتەرەییەکان زۆر هەژارو نەدارایە..

شەڕی سەد ساڵە نەخۆشی‌و تاعون‌و نەزانین باڵی بەسەریاندا کێشاوە. خەڵکی چییان هەبووە، لە پێناوی لەشکری چوارمێخەکاندا خەرجیان کردووە.. چییان هەبووە لە پێناو شەڕو ناکۆکی نێوان شا بچووکەکانیاندا بەختیان کردووە.

وتم: شای بچووك.. بۆچی شاهێنشاو فەرمانڕەوای گەورەیان نییە..؟ من وام دەزانی شارل شاهێنشایەکی گەورەو بەتوانایە..؟

وتی: نەخێر.. باوکە.. گەورەترین شایان لەوێدا هێندەی یەکێك لە سەردار، یان شازادەکانی تۆ هێزو تواناو ماڵ‌و سامانی نییە.. هەروەها لە وڵاتی ئینگلتەرەییەکاندا، هیچ سەردارێکی دنیاییان نییە، بەڵکو پاپا یونیفیس لە ڕۆمادا تەنها سەرکردەی ئاینی‌و ڕۆحییە. وە هەر ئەو بە

تەنها گەورەترین‌و بەهێزترین هێزێکە لە وڵاتی ڕۆژئاوادا.. بەڵام ئەویش بە هۆی ئەو دووبەرەکییە ترسناکەوە کە لە نێوان قەشەکانیدا ڕووی دا، هێزو توانای کەم بۆتەوە.

لە هەندێ ناوچەشدا دانیان ناوە بەو پاپایەدا کە لە دژی ئەو ڕاستبۆتەوەو ئێستا ئەو پاپایە لە شاری ئەفینیوندا لەو جیابۆتەوە..

وتم: هەرچۆنێك بێت.. ئێستا باسی پاپا یونیفیسم بۆ بکە.. ئایا ئەو هەژارو نەدارایە..؟ تەندروستە.. یان نەخۆشە؟

وتی: نەخێر باوکە.. کۆشکەکەی پاپا یونیفیس ئێستا لە باخچەکانی نیروندا دروستکراوە. کۆشکەکەشی، کۆشکێکی زۆر جوان‌و ڕازاوەیە.. لە جوانی‌و قەشەنگیدا هیچی لە کۆشکی شادی دڵانی شاری سەمەرقەندی تۆ کەمتر نییە..

وتم: ئەی ژنەکانی چۆنە..؟ سەرکردەو شازادەکانی چۆنن..؟

وتی: ژنەکانی..؟ ژنی چی.. ژنی نییە.. بەڵکو تەنها ڕەبەندی هەیە.

وتم: ڕەبەند..؟ ڕەبەند مانای چییە..؟

وتی: ڕەبەند.. کۆمەڵە کچێکی پاکیزەن‌و شوویان نەکردووە، ژیانی خۆیان بۆ خزمەتی ئایینی تەرخان کردووە.. ئەو کچانە بە داوێن پاکی‌و هەژاری دەژین. هەروەك چۆن پاپا خۆی‌و هەر هەموو قەشەو کەهانەکانی بە هەژاری دەژین.

-ئایا پاپا یونیفیس پیاوێکی زیرەك‌و وریاو تێگەیشتووە؟

-بێگومان.. باوکە.. بێگومان پاپا مێژووی ئایین لە تۆ زۆر چاکتر دەزانێت.. پاپا ژیانی خۆی لە پێناو لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی پەرتووکی پیرۆزدا بردۆتە سەر.

-باشە کوڕم ئەوە ڕاستە..؟

-بەڵێ.. باوکە..

بڕوام بە قسەکانی کوڕەکەم کرد. چونکە ئالی سۆنی دایکی زۆر ڕێزێکی گەورەی لە ڕاستی دەگرت. و تۆوی ڕاستگۆیشی لەناو دڵ‌و دەروونی کوڕەکەشیدا ناشتبوو. لە ڕاستیشدا جۆن بیتر لە هەموو کارو کردەوەو قسەیەکیدا ڕاستگۆو خاوێن‌و داوێن پاك‌و دوور بوو لە ناپاکییەوە.

سەرنجی قسەکانیم داو بیرم لێکردەوە. لە قسەکانیدا بۆم دەرکەوت ئەو شا بچووکانەی لە وڵاتی ئەفرەنجییەکاندان‌و ئەو پاپایانەی لەناو یەکدا ناکۆکن‌و بە شێوەیەکی کوێرانەو داخ لە دڵانە وەك خۆرە بەربوونەتە گیانی یەکترو ئەوانن وڵاتیان بە جارێك خستۆتە ناو داوی هەژاری‌و کوێرەوەری‌و ژێردەستەییەوەو وڵاتیان وێران‌و دواکەوتوو کردووە!!

خواش لەم حاڵەتە برسێتیو هەژارییەیان ڕازییە کە خەڵکی وڵاتی ئینگلتەرە تێیدا دەژین!!

بەڵام ژیانی منیش وا خەریکە بەرەو کۆتایی نزیك دەبێتەوە..

هیچ سەردارو فەرمانڕەوایەکی گەورەش نەماوە ڕێگای ڕاستی نەدیبێتو لەسەری نەڕۆیشتبێت، جگە لە ئیمپراتۆرییەتی چین نەبێت.

جا لەبەرئەوە لەو باوەڕەدا بووم پێویستە وڵاتی چین ڕابکێشرێت بۆ سەر ڕێگای ڕاستی خواپەرستی.. نەك وڵاتی ئینگلتەرە..

هەروەها منیش دەتوانم لەو وڵاتەدا دەست بەسەر ئەو زانایانەدا بگرم کە ئەهێنی دروستکردنی باروود دەزانن.

پاشان ڕووم کردە جۆن بیترو پێم وت:

زۆر چاکە کوڕی خۆم.. من بڕوام بە قسەکانت هەیەو باوەڕیان پێدەکەم. لەبەرئەوە لە گەرووی بۆسفۆر ناپەڕمەوە. هەرکاتێك وڵاتی ئینگلتەرە لە ژێردەستو فەرمانڕەوایی پاپا یونیفیسدا ڕزگاریان بوو. ئەو کاتە پێویست دەکات کە نەتەوەو گەلەکەی من شیری ئاگراوی هەڵبگرنو بچنو سەرلەنوێ وڵاتی ڕۆژئاوای پێ ڕووناك بکەنەوە..

بەڵام ئێستا کاتی ئەوە نەهاتووە. جا لەبەرئەوە پێویستە لە سەرم چاوەڕوان بکەم هەتا ئەو هەلە زێڕینە دێتە پێشەوە. ئێستاش پێویست ناکات من بچم وڵاتی ئینگلتەرە داگیر بکەمو بیخەمە ژێردەستمەوە[٨]..

وتی: باوکە بەڕاستی ئەوەت مەبەستە..؟ ئایا بەڕاستی بڕیارت داوە وڵاتی ئینگلتەرە داگیر نەکەیت..؟!!

وەڵامم دایەوە: بەڵێ.. ئێستاش تۆ دەتوانیت بگەڕێیتەوە بۆ شاری سوڵتانیەو بە دایکیشت بڵێ من ئەو نانێرمەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی بۆ ئینگلتەرە.

وتی: دایکم بەو هەواڵە شادو دڵخۆش دەبێت.. بەڵام باوکە من لە تۆ نەگەیشتمو لەو باوەڕەدا نەبووم هیچ شتێك بتوانێت تۆ ڕابگرێتو نەیەڵێت ئەو وڵاتە داگیربکەیت..!!

---

[٨] ماوەی پێنج سەد ساڵ مێژوونووسان لەناو خۆیاندا مشتومڕیان لەسەر ئەوە بوو کە لەبەر چ هۆیەك بوو تەیموور لە بورسەوە گەڕایەوەو وای لێکردو نەیویست ئەورووپا داگیر بکات. زۆربەی زۆری مێژوونووسان لە وڵاتی ئینگلتەرەدا بڕوایان وابوو. نوێژو دوعاکانی پاپا یونیفیس بوو. تەیموری پیرەمێردی گەڕانەوەو نەیهێشت لە گەرووی بۆسفۆردا بپەڕێتەوە.

وتم: کورم هەوڵی ئەوە مەدە، با نەیزانیت. چونکە کەنیسە چاوەکانتی کوێر کردووەو هەتا دنیاش بە باشی نابێت. وە ئەوانەش ئیمان و بڕوایان بە ئاینەکەی تۆ هەیە، ناتوانن ڕێگای ڕاست ببینن. تۆش هێشتا لە پاپا یونیفیس باش نەگەیشتوویت..

بەڵام ئەوە گرنگ نییە.. بڕۆ دەرەوە بۆ لای دایکت و باسی سەفەرەکەی خۆتی بۆ بکەو هەواڵ و باسی خۆتی بۆ بگێڕەوەو پێی بڵێ منیش پاش چەند هەفتەیەکی تر دەگەڕێمەوە بۆ لای.

جۆن بیتر نێوچەوانی گرژ کردبوو، بەڵام هێشتا لە چاوەکانیدا تروسکەی ڕووناکی دەدرەوشایەوە.

بەڵام هێشتا بە تەواوی هەڵنەستابووە سەرپێ برۆات لێم پرسی:

وتم: خەڵکی وڵاتی ئینگلتەرە ناوی من چۆن دەبەن..؟

وتی: ئەوان ناوی تۆ بە تەیموور لین دەبەن.

وتم: تەیموور لین..؟ بێگومان ئەمە واتەی تەیموور لەنگە وا نییە..؟

وتی: بەڵێ.. باوکە، بەڵام تێناگەن مانای ئەو وشەیە چییە.. لەم وشەیە هیچ مەبەستیان ئەوە نییە گاڵتەت پێبکەن.. ئەوان بە چاوێکی ڕێزو گەورەییەوە تەماشای ناوەکەت دەکەن.. ئەوان بە وتنی ئەو وشەیە نایانەوێت سووکایەتیت پێبکەن و بە ناشیرنی ناوت بەرن یان بەو وشەیە بیانەوێت توورەت بکەن..

وتم: باشە.. کورەکەم.. نائارام مەبە.. توورە نابم.. لە بیروڕاو بڕیاری خۆشم پاشگەز نابمەوە بەوەی بڕیارم داوە نەچم وڵاتی ئینگلتەرە داگیر بکەم.

بەڵام لەو بڕوادا بووم، پاش ئەوەی دەست بەسەر زاناکانی چیندا دەگرم. ئەو زانایانەی ئەهێنی بارووت دەزانن. ڕەنگە خۆم.. یان یەکێك لە کوڕەکانم یاخود کوڕەزاکانم لە پاشەڕۆژدا ئەو وڵاتە داگیر بکات. جۆن بیتر تەماشایەکی کردم و زەردەخەنەیەکی ناسکی کردو خێرا بەرەو ئەو کاروانە ڕۆیشت کە بەردو شاری تەبرێزو شاری سوڵتانیە کەوتبووەڕێ.

بۆم دەرکەوت و تێگەیشتم ئینگلتەرەییەکان فینیان لێم نییە.. لە لایەن مەلیك شارلی پاشای شەشەمی ئەفرەنجییەکانەوە..

نامەیەکی دۆستانەی جوان و ناسکم پێگەیشت.

هەروەها نامەیەکی دۆستایەتی جوان و ناسکیشم لە هێزی چوارەمی شای ئینگلتەرەشەوە پێگەیشت. هەروەها شاری هەرێمی کاستیلیش. هێنری سێیەم دوو سوارچاکی لە باشترین سوارچاکەکانی ئیسپان. بۆ لام نارد. ئەویش بالادی سانتومایور فرناندو بالازو بوون.

بۆئەوەی ڕێزو پێزانینی خۆیان بۆ گەورەییو جێگاو شوێنی من دەربڕن. ئەم دوو سوارچاکانەش لە لایەنگرانی پاپا یونیفیس بوون. گەرچی ئەو سوارەیەش زۆر پابەند بوون بە ئاینی مەسیحییەوە.

کاتێك ئەو دوو کچە شازادانەم پێشکەش کردن. کە وەختی خۆی لەناو کۆشکی ژنانی سوڵتانی بایەزیدی سوڵتانی تورکییەوە دەستم کەوتبوون. ئەو دوو کچەش شازادەی ڕۆمی ماریاو شازادە ئەنجیلینای خوشکی دۆقی هەنگاریا بوون.

ئەو دوو سوارچاکە ئیسپانییانە، زۆر ڕێزیان بۆ پاکیو پاکیزەیی ئەو دوو کچە دانەنا. بەڵام زۆر ڕێزو پێزانینی ئەو شارەزاییە زۆرەی ئەو دوو کچەیان کرد. کە لە هونەری سەرنجڕاکێشاندا هەیانبوو. ئەم هونەرەش لەناو کۆشکی ژنانی سوڵتانی تورکی بایەزیدەوە فێرببوون.

کاتێك بۆ ئەنقۆڕا گەڕامەوە، لەوێدا پێمزانی کارایوسف ڕایکردووە بۆ نیوەدوورگەی عەرەبیو سوڵتان ئەحمەدیش، سوڵتانی میرنشینەکانی قاهیرە گرتوویەتیو خستوویەتییە بەندیخانەوە. سوڵتانی قاهیرە هێزو توانای منی بە چاکی بۆ دەرکەوتبوو. لەبەرئەوە بڕیاری دابوو ببێتە پشتو پەناو لایەنگیری من.

لەشکرەکەشم لە دەریاوە هەندێ شوێنی داگیرکرد. و نووردەدینیش لە ماوەی دوو هەفتەدا سمیرنای داگیرکرد. لە کاتێکدا ئەوروپییەکان ماوەی سێ ساڵ لەسەر یەك بەرهەڵستی تورکەکانیان تیادا کردو دەیانگەڕاندنەوە دواوەو نەیاندەهێشت داگیری بکەن.

هەر ئەو کاتە ئەمیریسم کرد بە سەردارو فەرمانڕەوای شاری ئەنقۆڕا. کاتێك خۆم ئامادەی گەڕانەوە کرد. ئۆبجا هات بۆ لامو تکای لێکردم، وازی لێبێنم کە لەگەڵ کوڕەکەیدا بمێنێتەوە. چونکە ئیتر هیچ کەڵکێکی پێوە نەماوەو لە سەمەرقەندیشدا هیچ سوودێکم پێناگەیەنێت. منیش لەبەرئەوەی ژنەکەی ئە یریس سپی بوو لەبەرئەوە ناتوانێت دێرایەتیو فەرمانبەرداری کۆیلەو کوخ نشینەکان لە ئاسیای بچووك دا بۆ من ڕابکێشێت. ڕازی بوومو ئاواتو خواستەکەیم قبووڵ کردو نازناوی شاژنو گەورەی خانەوادەی شاهانەم پێبەخشی.

لەڕاستیدا هەڵمەتەکەم دژی بایەزید سەرکەوتنێکی گەورەو بێ زیان نەبوو.. پێش هەفتەیەك لە گەڕانەوەمدا بۆ شاری سەمەرقەند، محەمەد سوڵتان مردو کۆچی دوایی کرد.. ئیتر لەبەرئەوە لە کاتی گەڕانەوەمدا بۆ خاکی نیشتمان ئەو ڕێ ڕۆیشتنە دوورو درێژەمان بوو بە ڕێو ڕۆیشتنێکی خەمباری بە دوای تەرمی کوڕەزا لاوەکەمدا.

بەڵام کاتێك گەیشتمەوە ناو خاکی نیشتمان. تەواو لەوە دڵنیا بووم، من تاقە کەسێکی گەورەم لە سەرانسەری ئەو زەوییەی لە ڕۆژئاوای دەریای سپی ناوەڕاستەوە درێژدەبێتەوە تا دەگاتە دیواری گەورەی چین، لە ڕۆژهەڵاتەوە. لە ڕۆخی ڕووباری فولگای بەستەڵۆك بەرەو باکوورو هەتا کەناری نۆڤیانووسی هیندی لە باکوورەوە.

بەڵام ئەو وڵاتەی لە هەموو کیشوەری ئاسیادا تاکو ئێستا نەکەوتبووە ژێر دەستەڵاتو فەرمانڕەوایی منەوە، تەنها وڵاتی چین بوو. بەڵام نۆبەی چینیش هەر دێت.

* * *

پاش ئەوەی تەرمی محەممەد سوڵتانمان بە خاك سپارد. شیرو شەیپوورەکانیمان شکاندو کۆتاییمان بە پرسەو سەرەخۆشیو خەم هێنا..

دوای ئەوە ڕێم بە خەڵقی دا ئاهەنگو میوانداریو شایی بۆ ماوەی دوو مانگی تەواو لە سەمەرقەندندا بگێڕن.

لەبەرئەوەی کۆشكو ساختمانەکان لە سەمەرقەندندا هەر هەمووی تەواو ببوون.

مزگەوتە گەورەکەی ئەمیرە شۆلیانیش کە خەڵقی سەرسام دەکرد. ئەویش تەواو ببوو. شاری سەمەرقەند لە ڕۆژهەڵاتدا لە جوانیو قەشەنگیدا بوو بە گەوهەرو مرواریيەکی بێ وێنە..

لەڕاستیدا جێگای گاڵتەو پێکەنین نییە، بڵێم لە هەموو دنیادا، سەمەرقەند جوانترینو ڕازاوەترینو شۆخو شەنگترین شاری جیهان بوو.

ئەو کاتە چاوم کز ببوو، شتم بە باشی نەدەبینیو نەشمدەتوانی جوانیو ئەفسوونو خۆشیو قەشەنگی شارەکە بەو ڕاستیو جوانییەی خۆی ببینم.

چونکە من هەستم بەوە کردبوو، ئەو پیاوانەی لە ژیاندا تەماعیان بۆ وەدەستهێنانی سەروەریو گەورەیی هەیە، ناتوانن بە دەستی بهێنن مەگەر لە کاتێکی زۆر دوورو درەنگدا نەبێت[٩]. ئەو کاتەش ناتوانن سوودو کەڵكو خۆشی لەو سەروەریو گەورەییە ببینن..!!

ناوبەناو لەو ئاهەنگو میواندارییانەی لە شانشیندا دەکرا.. دەردەکەوتم.. وەگەر نا، چونکە من زۆربەی کاتەکانی خۆم لە خەڵوەتخانەی دۆڵەکەدا دەبردە سەرو لەوێدا پلانی هەڵمەتێکی گەورەو گرانم بۆ سەر چین دادەڕشت.

---

[٩] ئەویش کاتی پیرییە..

یان لەگەڵ سەردارو سەرکردە جەنگییەکانمدا بۆ کۆشکەکەی ئەمیرە شۆلیان دەچووم. بۆئەوەی لەو جۆرە بینایانە بکۆڵینەوە کە لە داهاتوودا لە چیندا تووشمان دەبێتو هێرش دەکەینە سەریان.

تەنها کەمێك لە ئەفسەرو سەرکردەکانم دەیانزانی من بیر لە هەڵمەتێکی گەورەو گران دەکەمەوە بۆ سەر وڵاتی چینی مەزن.

کاتێك نوورەددین هاتو بە تەنها لەگەڵمدا دانیشت، پێی وتم:

-سەرداری گەورەو بەڕێز ئەمیر تەیموور لەشکرەکەت هیلاکەو لە پەلوپۆ کەوتووە، خۆشت ئەی ئەمیر تەیموور پیرو پەککەوتە بوویتو وا خەریکە تەمەنت دەگاتە حەفتاو یەك ساڵ.

وتم: بەڵکو حەفتاو دووش.. تا ئەمەیە پاڵم پێوە دەنێت لەمە زیاتر دوانەکەوم.

وتی: ئەمە وا لە سەرت پێویست دەکات ماوەیەك پشوو بدەیتو بحەسێیتەوە. وەرزی زستانیش وا خەریکە نزیك دەبێتەوە. ئەوکاتەش هەموو وڵاتەکانی باکوور لەسەرمادا دەیبەستێت. سەرداری گەورەم هەر نەبێت تۆزێك چاوەڕوان بکە، تا وەرزی بەهار دادێت.

وتم: نەخێر.. ئەم هەڵمەتەمان هەڵمەتێك نییە لە پێناو داگیرکردن، یان لە پێناو گەڕان بە دوای دەستکەوتی کەسێتیدا. ئێمە کۆمەڵێکی هەڵبژاردەینو پێویستی سەرشانیشمان پێویستییەکی پیرۆزەو کارەکەشمان کارێکی پیرۆزە. تۆ خۆت باشترینو چاکترین کەسێکیت لای من کە خوا هەڵیبژاردوویتو دەستنیشانی کردوویت کە بە هۆی تۆوە ڕێگا ڕاستو ئارەزووەکانی لەسەر زەویدا بڵاوبکەیتەوە. ئێستاش جگە لە چین هیچ وڵاتێك نەماوە لەژێر دەستەڵاتو ڕکێفی ئێمەدا نەبێت.

نوورەددین سەری ڕەزامەندی بۆ ڕاوەشاندم.

هیچ ئەفسەرێکیش لە ئەفسەرەکانم بەرهەڵستیو نارەزایی دەرنەدەبڕی. ئێمەش بەردەوام کۆبوونەوەمان دەکردو پلانمان دادەناو لێکۆڵینەوەمان لەسەر دەکرد.

لەولاشەوە پیاوەکانی تریشم سەرگەرمی ئاهەنگو میوانداری بوون. لە مانگی داهاتوودا سەردانێکی شاری شەهری سیبزم کرد بۆئەوەی چاوم بەو گومەزە زێڕینە بکەوێت کە بەسەر مەزارەکەی ئەلجایدا بەرزبۆوە.

هەروەها بۆئەوەی چاویشم بەو گومەزە جوانو ڕازاوەیە بکەوێت کە بەسەر ئەو مەزارەوە بوون کە جیهانگیرو شێخ عومەری تێدا ڕاکشابوون.

ئەو گومەزەی بەسەر مەزارەکەی ئەلجایدا بەرزببۆوە "گەرچی لە گومەزی سەر مەزارەکەی ئەمیرە شولیانیش دەچوو". بەلآم لە پێش چاومدا ئەو زۆر جوان و ڕازاوەو گەورەتر بوو.. دەتوت ئەلجای خۆیەتی. پاش ئەوەی ئەو گومەزەم بینی. بەملادا وەرچەرخامەوە بۆ ناو باخەکەو بەسەر ئەو بەفرە سپییە نەرمەدا کە لەو بەفرە دەچوو، چل ساڵ لەمەوپێش کردمان بەسەر مەزارەکەی ئەلجایداو دەستم بە پیاسەکردن کرد.

بڕیارم دا خێراو هەر ئێستا بکەومەڕێ. خۆ ئەگەر کۆتایی ژیانم نزیك بۆتەوە، باشتر وایە لە ڕێگای چیندا بمرم، وەك لەوەی بە تەمەڵ و تەوەزەلی و لەناو نوێن و کۆشکە جوان و ڕازاوەکەی سەمەرقەندمدا بمرم. بەڵێ بۆ من وا چاکترە لە ڕێگای چیندا بمرم.

کاتێك پێشەوایی ئەو تیپە گەورەو دلێرانەم کردو لە شاری سەمەرقەند هاتینە دەرەوە. لەگەڵ ئەو ساردو سەرما زۆرەی ئەو زستانەدا هەرچی خەڵکی شار هەبوو، بە گەورەو بچووکیانەوە بۆ خوداحافیزی کردنم لە ماڵ و حاڵی خۆیان هاتبوونە دەرەوە. جۆن بیترو ئالی سۆنیش پێکەوە لە دیفونەوە هاتن.

جۆن بیتر لغاوی ئەسپێکی سپی جوانی بە دەستەوە بوو. کاتێك ویستم سواری ئەو کەژاوەیە ببم کە لە پێش کاروانەکەوە بوو. دوو سندووقە ئەهێنییە گەورەکانیش لە دوامەوە بوون. جۆن بیتر ڕووی تێکردم و پێی وتم:

-باوکە ئەم ئەسپە سپییە پێشکەش بە تۆ کراوە..!!

وتم: بۆ.. من..؟!!. جۆن ئەمەت لەکوێوە هێناوە..؟

وتی: بەڵێ.. باوکە.. دایکم بۆ تۆی ناردووە.. و دەڵێت لە ژیانیدا تاکو ئێستا نەیتوانیوە هیچ شتێکت پێشکەش بکات. گەرچی تۆ لە ژیانیدا هەموو شتێکت پێشکەش کردووە. گەرچی ئالی سۆن زۆر حەزو ئارەزووی لێبوو. خۆی قسەم لەگەڵدا بکات. بەلآم چاوەکانی لەبەر ئەو ساردو سەرمەو زریانەدا دەیمشاو فرمێسکی زۆری پیادا دەهاتە خوارەوەو جوانترین هەست و گەورەترین دەربڕینی بەو فرمێسکانە دەردەخست.

وەلآمی جۆن بیترم دایەوە، وتم:

-کوڕم ئەم قسەیە، قسەیەکی هیچ و پووچ و بێمانایە..!! دایکت لە ژیانیدا هەموو شتێکی پێبەخشیوم. کوڕم تەنها ئەوەندەی بەسە.. کە تۆی پێبەخشیوم..!! ئەم قسەیە وەك شتێکی نایاب و گرانبەها نەبوو بۆ من.. بەلآم دەمزانی لە پاشاندا خۆشی و شادی دەخاتە دڵی دایکییەوە.

پاشان جۆن بیتر هەناسەیەکی شادی و خۆشی هەڵکێشاو وتی:

-باوکە.. ئەم ئەسپە باشترین و رەسەنترین ئەسپە بۆ تۆمان کڕیوە.

دایکیشم ناوی ناوە ئاك رۆکش واتە ئەسپی سپی.

وتم: زۆرچاکە کورەکەم.. منیش وەختی خۆی لەمەوپێش ئەسپێکی سپی وەهام هەبوو. ئەویش ناوی ئاك رۆکش بوو..

وتی: کەواتە تۆش ئەم ئەسپە ناوبنێ ئاك رۆکشی دووەم..

وتم: کورم.. باشە.. تۆ چۆن دەڵێیت باوا بێت..

جۆن تەماشایەکی کردم و زەردەخەنەیەکی جوان و ناسکی بۆ کردم و پاشان روویکردە دایکی.. دایکیشی لەسەر بەفرەکە بە چۆکدا هات و دەستەکانمی گرت و نووساندی بە دەمییەوەو ماچی کرد.

ئیتر دوای ئەوە لە فیلەکە دوورکەوتمەوەو قەڵبۆزی زینی ئەسپەکەم گرت و قاچم خستە ناو ئاوزەنگییەکەوەو سواری پشتی ئاك رۆکشی دووەم بووم.

ئینجا رووەکردە هێزەکانم و بە دەنگێکی بەرز قیژاندم.. بۆ پێشەوە.."

بەسەر شەقامی سەرکەوتندا کە دەچوو بۆ یەکێك لە دەروازەکانی دەرەوەی شاری سەمەرقەند کەوتینەڕێ..

هەر کە تۆزێك لە شاری سەمەرقەند دووركەوتمەوە.. لەسەر پشتی ئەسپەکەم ڕاستبوومەوەو ئاوڕێکم بۆ دوای خۆم و بۆ شارەکە دایەوە. گومەزی مزگەوتەکەی ئەمیرە شۆلیان مەلەکم بینی لەسەر شارەکەوە وەك خونچەیەکی گەورەی گوڵە سەوسەنێکی جوان لە ئاسمانی شارەکەدا مەلەی دەکرد.. لە ڕێ ڕۆیشتنەکەماندا گەیشتینە شاری تەشقەندو بەفرێکی ئێجگار زۆر باری و ڕێگای ڕۆیشتنی لێگرتین.

هەفتەیەکی تەواو لە چادرەکانی خەلیل سوڵتاندا ماینەوە. کاتێك بەفرەکە خۆشی کردەوە. سەردارو ئەمیرەکانم هاتن بۆ لام و داوایان لێکردم لە تەشقەنددا بمێنینەوەو لەوێدا چاوەڕوان بکەین تا وەرزی بەهار دێت.

ئەوان دەیانوت، ناتوانین بە ڕێگادا بڕۆین و ناتوانین بە ناوچە شاخاوییەکاندا ڕەت ببین..

بەڵام ئەمانیش وەك بایەزید بیریان لە فیلەکانم نەکردبۆوەو هیچ حسابێکیان بۆ نەکردبوون..

منیش فەرمانم بە سەربازەکانم دا فەرش و بەڕە بەسەر بەفرەکەدا ڕابخەن با فیلەکان بەسەریاندا بڕۆن و بەفرەکە بە پێ بپەستنەوەو ڕێگا خۆش بکەن بۆ ڕۆیشتنی ئەسپ و حوشترو گاو مانگاو گوێدرێژو هێسترو ئەو ئاژەڵانەی سمی تیژیان هەیە..

دوای ئەوە ئێمەش بە هێواشی و لەسەرخۆ دەستمانکرد بە ڕۆیشتن‌و سێ میل یان چوار میلمان بە ماوەی ڕۆژێك دەبڕی.

بەم شێوەیە بەسەر ڕووباری سیرداریای بەستەڵەکدا ڕەتبووین تا گەیشتینە نوترارو ئەو کۆشکە دارە گەرمەی وەختی خۆی بۆ شێخ عومەرم دروستکردبوو.

بەڵام لەوێدا ئیتر نەمتوانی لەسەر ڕۆیشتنەکەم بەردەوام بم‌و بڕۆم، چونکە هەمدیسان نەخۆش کەوتم. وەك ئەو نەخۆشییەی جاری پێشوو، ماوەی چل ڕۆژ لە تەشقەنداو لە کاتی هەڵمەتەکەمدا بۆ سەر تەفتەمیش تووشم بوو.

ئەمجارمیان بە هۆی ئەو دڵەتەپێ‌و هەناسەسوارییەی لە سنگمدا تووشم هات. تێگەیشتم نەخۆشی ئەمجارەم نەخۆشی چل ڕۆژە نییە..

پزیشك هات بۆ لام‌و بە وردی تێڕوانیم‌و سەرنجیدام. لێوی خۆی کرۆشت‌و سەری ڕاوەشاند. پاشان زەردەخەنەیەکی دڵنیایی ساردو هیچ‌و پووچی کرد. کاتێك خاتوو دڵشاد لە سەمەرقەندەوە هات بۆ لام. تێگەیشتم مردنم نزیکەو کۆتایی ژیانمە.

هەستمکرد سەردانی شازادەی کۆشك تەنها بۆ سەردان‌و چاوپێکەوتن نییە.. بەڵکو بۆ کارێکی گەورەو پیرۆزە. کاتێك لە تەنیشتمەوە دانیشت وا خۆی پیشاندا شادو دڵخۆشەو لەگەڵمدا کەوتە قسەو هەواڵ پرسین.

پاشان لە ژوورەکەم چووە دەرەوەو چرپاندی بە گوێی نوورەددیندا وتی:

-شازادە سیفین ئێستا وا لەگەڵ خەلیل سوڵتانی کوڕیداو هەردووکیان پێکەوە نەخشەی پیلان دەکێشن..

بەڵام تکات لێدەکەم هەرگیز ئەوەی پێنەڵێیت..

منیش سەرم ڕاوەشاندو لە دڵی خۆمدا وتم:

-هەرگیز ئەوەی پێنەڵێیت..!! ئای لەم هیچ‌و پووچییە..

وا چاوم کز بووە.. خۆ گوێم کەڕ نەبووە.. قەیناکە با سیفین‌و خەلیل سوڵتان چۆن دەتوانن با پیلان[10] دابنێن.

---

[10] خەلیل سوڵتان‌و سیفینی دایکی بۆ ماوەیەك توانیان لەو پلانەیاندا سەرکەون، خێرا دەستیان گرت بەسەر سەمەرقەندداو هەتا نەشیانهێشت تەرمەکەی تەیمووریش بهێننەوەو لەناو شووراکانی شاری سەمەرقەندا بنێژرێت. ئەو لەشکرەشیان شکاند کە ئەمیر موحەمەد لە هیندەوە بۆ تۆڵەسەندنەوە هێنایە

فەرمانم دا هەرچی کەسێك لە ژوورەکەمدایە بچنە دەرەوە، عەبدوڵڵای نۆکەرمم بانگ کرد. ئەویش پیرو پەککەوتەو ڕیش سپی ببوو. دەموچاوی چرچو لۆچ ببوو. تەمەنیشی خۆی دابوو لە حەفتا ساڵان.

کاتێك هاتە ژوورەوەو پێکەوە بە تەنها بووین. لێمپرسی:

وتم: عەبدوڵڵا وا بزانم لە ڕێگای نهێنی دەزانیت کە بتوانیت لەوێوە لە ئوترار بچیتە دەرەوە بێ ئەوەی کەس پێتبزانێت.. وا نییە.. عەبدوڵڵا..؟

وەڵامی دامەوە: بەڵێ سەرداری گەورەم..

وتم: زۆر چاکە.. عەبدوڵڵا ئیشێکی ترم پێت هەیەو پێویستە بیکەیت.. ئایا چەند کۆیلەیەکی کوێرو کەڕو لاڵ شك دەبەیت..؟!!

وتی: بەڵێ.. هەندێکم لەوانە هەیە..

وتم: زۆر چاکە.. ئەوەی من دەمەوێت ئەمەیە.. عەبدوڵڵا ئەم کلیلە، کلیلی ئەو ژوورە نهێنییەیە کە دوو سندووقە ئاسنە نهێنییەکەم تێدا داناوە. زۆر بە نهێنیو بە دزییەوە بچۆ بۆ ئەو ژوورە. با کۆیلە کەڕو لاڵو کوێرەکان چی لە سندووقەکاندا هەیە دەریانبهێننو خاڵییان بکەنو بە قوماشێکی ئەستوور، بیانپێچنەوە. هەرچی لەناو سندووقەکاندا هەیە بیان بەن بۆ دەشتو بیابانێکی دوورو لەوێدا چاڵیان بۆ هەڵبکەننو تیایدا بشارنەوە.

هەر پارچەیەکیش دەیشاریتەوە با لەوی ترەوە دووربێت.

بۆ شاردنەوەی هەر پارچەیەکیش ڕێگای جیاواز بگرەو لەسەریەك ڕێگادا نەبێت.

ئایا دەتوانیت ئەوە بکەیتو کەسیش پێت نەزانێت..؟

-بەڵێ سەرداری گەورەم.. لەو باوەڕەدامو دەتوانم ئەوەی تۆ دەتەوێت بیکەم..

-عەبدوڵڵا دوای ئەوە، بێنە دوو سندووقەکە بشکێنەو پارچە پارچەی بکەو بیبە بۆ شوێنێکی دوورو هەر پارچەیەکیشی بخەرە ناو چاڵێکی قووڵەوە خۆ ئەگەر هاتو ژوورەکەمیان کردەوە. من دەمەوێت بە خاڵیتی ببینن. و هیچی تێدا نەبێت. و هەتا دوو سندووقەکەش بە خاڵیتی تێدا نەبینن.. تێگەیشتیت چی دەڵێم..؟!!

-بەڵێ سەرداری گەورەم..

-هەرکاتێکیش کارەکەت تەواو کرد کلیلەکانم بۆ بهێنەرەوە..

---

سەریان. بەڵام ئاخری شاهرووخ بە هانە هانەی دڵشادی دایکی توانی خەلیل سوڵتان بشکێنێتو خۆی لەسەر تەختی شاهانەی سەمەرقەند دانیشێتو میراتی ئیمپراتۆریەتی تەیموری باوکی بگرێتە دەست.

-بەڵێ باشە سەرداری گەورەم..

ئیتر عەبدوڵڵا لە ژوورەکەم چووە دەرەوەو نەمبینییەوە، پاش چەند ڕۆژێك نەبێت..

لەو ماوەیەشدا چیرۆکی ژیانی خۆم بە ئەلەهدی کوڕم دەنووسییەوە.

ئەمیر موحەممەدی کوڕی جیهانگیری کوڕم‌و شازادە سیفینم لەسەر تەخت‌و شانشینەکەمدا کرد بە جێگری خۆم.

شازادە دڵشاد، ئەمیر موحەممەدی زۆر خۆش دەویست‌و ڕێزی لێدەگرت.

منیش لەو باوەڕەدا بووم ئەمیر موحەممەد باشترین کەسێکە بتوانێت لە دوای من لەسەر کورسی شانشینەکەم دابنیشێت[11].

کاتێك عەبدوڵڵا هاتەوەو کلیلەکانی بۆ هێنامەوە. ئەلەهدی بەردەوام چیرۆك‌و بیرەوەرییەکانی منی دەنووسییەوە. کاتێك عەبدوڵڵا باسی جێبەجێکردنی کارەکەی خۆی بۆ گێڕامەوە، لەو زیاتر کەسی تر لە ژوورەکەمدا نەبوو.. بێگومان ئەو کاتە ئەلەهدی لە هەموو شتێك تێگەیشت.

زۆر بە گومان‌و دوودڵییەوە لە عەبدوڵڵام پرسی:

-عەبدوڵڵا کارەکەت جێبەجێ کرد..؟

وەڵامی دایەوە:

-بەڵێ سەرداری گەورەم.. بە بێ کەموکوڕی‌و بە شێوەیەکی چاك..

وتم: هیچ ئاسەوارێکت لە دوای خۆت جێ نەهێشتووە..؟!!

وتی: بێگومان هیچ ئاسەوارێکم لە دوای خۆم جێنەهێشتووە..

وتم: هیچ کەسێك نەیزانیوە چی لەناو ئەو دوو سندووقەدایە..

بەڵێ کەس نازانێت جگە لە من‌و تۆ نەبێت.. ناشهێڵم کەس بزانێت چییان تێدا بووە..

---

[11] بۆیە ئەمیر تەیموور لە دوای خۆی ئەمیر موحەممەدی هەڵبژارد. چونکە ئەمیر موحەممەد چاکترین‌و بەتواناترین ئەوەو جێگری تەیموور بوو. گەرچی لە کاتێکدا ویستی سەمەرقەند بگرێتەوەو خەلیل سوڵتان دەربکات. لەو هەڵمەتەیدا سەرنەکەوت‌و شکا. بەڵام موحەممەد سوڵتان دوای خۆی ئەوەی وای لە پاش بەجێما، فەرمانڕەوایی هیندیان کرد هەتا ئینگلیزەکان لە ساڵی ١٨٦٥دا هاتن‌و هیندیان داگیر کرد. ئیمپراتۆریەتی تەیموریش لە سەمەرقەنددا لە دوای هاتنە سەر تەختی شانشینی، کوڕەکان‌و وەچەکانی شاهرووخدا ڕووخا.

ئینجا بە بێتاقەتیو بێهێزیو لاوازییەوە.. چەپڵەیەکم لێدا.. کتوپڕ هەندێ پاسەوان هاتنە ناو ژوورەکەمەوە..

بە سەرکردەی پاسەوانەکانم وت:

-عەبدوڵلای نۆکەرم خیانەتی لەگەڵدا کردووم.. دەی لە ژوورەکەم بیبەنە دەرەوەو بیکوژن..!!

سەرەك پاسەوانەکان بە حەپەساوییەکی سەیرو ترسێکی زۆرەوە لێی پرسیم:

-سەرداری گەورەم.. بەڕاستی عەبدوڵلای نۆکەرت خیانەتی لێکردوویت..؟

وتم: بەڵێ.. ئەی سەرکردە.. بەڵێ..

سەرەك پاسەوانەکان وتی:

-گەورەم عەبدوڵلا ناچێتە ژێر ئەو تاوانو تۆمەتەوە، دەڵێت من شتی وام نەکردووە.

وتم: گوێ مەدەرە قسەکانی لەسەری بدەو سەری بپەڕێنە..

کاتێك پاسەوانەکان باڵی عەبدوڵلایان گرت. بە خەمبارییەوە، زەردەخەنەیەکی کردو ڕووی تێکردمو وتی:

-گەورەم شتێك هەیە دەمەوێت پێت بڵێم.. سەرداری گەورەم تۆ چۆن لە جلوبەرگی سەروەریو شادیدا ژیایت. منیش هەروەها وەك تۆ لە جلوبەرگی سەروەریو شادیدا ژیام.. لەبەرئەوە تۆ چۆن دەمریت پێویستە منیش وەك تۆ بمرم. گەورەم تۆ ئێستا لە گیانەڵادایتو دەمریت..!!

پاشان عەبدوڵلا نێوچەوانی هێنایەوە یەكو چاوەکانی بچووك بۆوەو هاتەوە یەكو زەردەخەنەیەکی ساردو سڕی کردو پێی وتم:

-گەورەم.. پزیشکەکان دەڵێن.. بەم زووانە تۆ دەمریت.. ڕەنگە تەنها هەر ئەمشەویشت لە ژیاندا مابێت..!!

ئاماژەم بۆ کردنو دەستم بۆ ڕاوەشاندن.. پاسەوانەکان عەبدوڵلایان بردە دەرەوە..!!

کتوپڕ چەند کەسێك لە پیاوەکانم هاتنە ژوورە.. بەڵام.. هیچ کەسێکیانم نەبینیو نەمزانی کێن.. چونکە بینایی چاوەکانم بە تەواوی کوژانەوەو بەری چاوم تاریك بوو..

قیژاندم بەسەریانداو بە تووڕەییەوە وتم:

.-بڕۆنە دەرەوە.. لێرە بڕۆنە دەرەوە، من کارم هەیەو دەمەوێت تەواوی بکەم ئیمامە لە خواترسەکە هاتە لامەوە پێی وتم:

-سەرداری گەورەم.. ئایا حەزدەکەیت سوورەتێکی قورئانی پیرۆزت بۆ بخوێنم.. بە قین و توورەییەوە وەلامم دایەوە..

-نەخێر.. من کارم هەیەو پێویستە تەواوی بکەم..

بە دلتەنگیو خەمبارییەوە ڕوومکردە ئەلەهدی کوڕم.. پێم وت:

-کوڕی خۆم.. نووسینەکانت بهێنەو ئەو بەشەم بۆ بخوێنەرەوە کە دەربارەی ئەلجای نووسیوتە..!!

کوڕم.. هەتا تواناى گوێگرتنم هەیە.. بتوانم قسە بکەم یا نەتوانم..!! و هەتا تواناى دەست جوولاندم هەیە.. هەر ئەو بەشەم بۆ بخوێنەرەوە کە لەسەر ئەلجای نووسیوتە..

لەم کاتەدا هەستم کرد گوێم گران بوو.. گوێم لە هیچ نەماو نەشمتوانی زمانم بجوڵێنمو قسەی پێبکەم..

تێگەیشتم دوا چرکەی ژیانم نزیک بۆتەوە.. و دوا وەرەقەی تەمەنی ژیانم لە درەختی کەسکی ژیان وەری..

هێشتا ئەلەهدی ئەوەی لەسەر ئەلجای نووسیبوو، تەواو نەکردبوو دڵی منیش لە لێدان کەوت..

لە ڕۆژی ١٩٩٧/٤/١ ز دا تەواوم کرد.

# ناوەڕۆك